پڕۆژەی پیت

بۆ وەرگێڕانی سەرجەم کتێبەکانی فەرموودە




# موطأ الإمام مالك

## بەکوردی


**نووسینی: الإمام مالك بن أنس عبدالله الأصبحي**

**وەرگێڕانــی : د.زانــا عیســا عەبابکر**

**دیزاینی ناوەوە : زەردەشت کاوانی**

**چاپــی یەکـەم : ١٤٤٥ك - ٢٠٢٤ز**

**٥٤٠ لاپـــــەڕە**

**٢٤ × ١٧ ســـم**

**بابـەت : ئــاییینی**

لە بەڕێوەبەرایەتی گشتی کتێبخانە گشتییەکان - هەرێمی کوردستان

ژمارە سپاردنی (   )ـی ساڵی ٢٠٢٣ پێدراوە



















# موطأ الإمام مالك

## بەکوردی




نووسینی

الإمام مالك بن أنس عبدالله الأصبحي

وەرگێڕان

د.زانـا عیسـا عەبابکر



بِسۡمِ ٱللَّهِ ٱلرَّحۡمَٰنِ ٱلرَّحِيمِ

پاش ستایشی شایستە بۆ خوای بەخشندە، صەڵات و سەلام بڕژێ بەسەر باشترین بەندەی خوا موحەممەد ﷺ و هاوەڵانی و شوێنکەوتوانی تا ڕۆژی دوایی....

لە خزمەتدابوونی پێغەمبەری خۆشەویستمان ﷺ بە هەر شێوازێك شەرەف و گەورەییەکی زۆرە بۆ خزمەتکارەکەی.

ئێمە وەك ستافی پیت، بە هاوکاری کۆمەڵێك مامۆستای قەدر گران و ئەهلی عیلم و خاوەن توانا و خاوەن عەزم، بڕیارماندا لە ماوەیەکی دیاری کراو بە پشتیوانی خوای پەروەردگار سەرجەم کتێبەکانی فەرموودە وەربگێڕین بۆ زمانی شیرینی کوردی لەبەر ئەم هۆکارانەی خوارەوە:

١- نەبوونی ئاشنایەتی ئەم نەوە نوێیە بە زمانی عەرەبی، کە ئەمەش دواجار دەبێتە بێ بەشبوونی نەوەی داهاتوو لە گەورەترین زانست کە میراتی پێغەمبەری خوایە ﷺ.

٢- هەژاری کتێبخانەی کوردی لە کتێبەکانی فەرموودەی پێغەمبەری خوا ﷺ، کە تا ئێستا وەك پێویست کاریان لەسەر نەکراوە و وەرنەگێڕدراون.

لە ڕاستییدا ئەم پڕۆژەیە بە هیچ جۆرێك ئامانجی بازرگانی و قازانجی ماددیی لە نیەتدا نیە.

داوای تەوفیق و هاوکاری لە خوای پەروەردگار دەکەین، لە دوعای خێری خۆتان ئەم ستافە و کارەکەی لە بیر مەکەن.

**ســـــتافی پیت**

٢٠٢٢/٠١/٢٢




## پێشەكی وەرگێڕ

ستاییشی بێپایان بۆ خوای پەروەردگار لەسەر جوانی و گەورەیی سیفەتە بەرزەكانی، كە ئەو گەردوونە سەرسووڕهێنەرەی پێ نەخشاندووە، بەشێوەیەك وەك پەلكەزێڕینە بە هەموو ڕەنگێك خۆیان دەنوێنن و، بەزمانی حاڵ سەرسووڕمانی خۆیان دەردەبڕن و زیكری (سبحان الله) دەكەن! [تُسَبِّحُ لَهُ السَّمَاوَاتُ السَّبْعُ وَالْأَرْضُ وَمَنْ فِيهِنَّ وَإِنْ مِنْ شَيْءٍ إِلَّا يُسَبِّحُ بِحَمْدِهِ وَلَكِنْ لَا تَفْقَهُونَ تَسْبِيحَهُمْ إِنَّهُ كَانَ حَلِيمًا غَفُورًا] [الإسراء: ٤٤].

جا شاهێدی دەدەم كە هیچ پەرستراوێك شایستەی پەرستن نییە جگە لەو خوایە مەزنە، وە شاهێدی دەدەم بەوەی (محمد ﷺ) بەندە و نێردراو و خۆشەویستی خوایە: ﴿ قُلْ إِن كُنتُمْ تُحِبُّونَ ٱللَّهَ فَٱتَّبِعُونِى يُحْبِبْكُمُ ٱللَّهُ وَيَغْفِرْ لَكُمْ ذُنُوبَكُمْ ۗ وَٱللَّهُ غَفُورٌ رَّحِيمٌ ﴿٣١﴾ ﴾ آل عمران.

دەسا پەروەردگارا! صەڵات و سەلام وەك نمەی باران بڕژێنە سەر گەورە و سەروەر و نووری چاومان (محمد ﷺ)، پاشان بە فەزڵی خۆت خانەوادەی پێغەمبەری خوا ﷺو گشت هاوەڵان و مسوڵمانان بخەرە ژێر ڕەحمەتی ئەو صەڵات و سەلامە بەفەڕەو، بیكە مایەی بەرزكردنەوەی پلەی گشت مسوڵمانێكی گوێڕایەڵی خوا و پێغەمبەرەكەی ﷺ، اللهم آمین.

**پاشان:**

زۆر خۆم بە بەختیار دەزانم بەوەی خوای پەروەردگار وەك خزمەتكارێكی زۆر بچووك، تەوفیقی دام بۆ ئەوەی ئەو ماوەیە لە خزمەتی پەڕاوەكانی شەریعەت بەسەر ببەم، كە ئەوەش فەزڵی خالیقی زەوی و ئاسمانەكانە: ﴿ وَمَا بِكُم مِّن نِّعْمَةٍ فَمِنَ ٱللَّهِ ﴿٥٣﴾ ﴾النحل، كەچی لەگەڵ ئەوەی گشت تەوفیق و نیعمەتەكان هی خۆیەتی پاداشتیشی لەسەر دەبەخشێت! گەورەیی هەر شایستەی تۆیە پەروەردگارا.

جا دوای ئەوەی خوای پەروەردگار تەوفیقی دام بۆ وەرگێڕانی (سنن الدارمي)، دووباره لەلایەن بەڕێزان لە (ستافی پیت) داوام لێکرا بەوەی ئەمجارەیان کتێبی (موطأ)ی ئیمامی مالیك وەربگێڕمە سەر زمانی شیرینی کوردی، منیش بە پشتبەستن بە خوای پەروەردگار پشتم قایم کرد، پەروەردگاریش تەوفیقی دام و باری شوکرانە بژێری قورستر کردم.

**خوێنەری خۆشەویست:**

خوێندنەوە و تێگەیشتن و لە خزمەتبوونی قورئان و فەرموودەی پێغەمبەری خوا ﷺ، گەورەترین خۆشبەختییە بۆ مرۆڤی مسوڵمان، چونکە قورئان و فەرموودە هەر یەکەیان لایێکی ئەو چاویلکەن کە ئێمەی مسوڵمان دونیایێکی شایستەی نەخشێنراو بە گشت جوانییێکی پێ دەبینین، بۆیە هەر کەسێك ئەو چاویلکەیەی لە چاو نەبێت کوێرە و حەقیقەتەکان وەك خۆی نابینێ، کەواتە کاتێك لە خزمەتی پەرتووکێکی فەرموودەین، دەبێ بزانین خەریکین کەتەلۆکی پیشەکەمان دەخوێنینەوە، کە بریتییە لە جێنشینییەکی صاڵیحانە لەسەر زەوی، بەرهەمەکەشی بریتییە لە گەیشتن بە ڕەزامەندی خوا و بەهەشتە ڕازاوەکەی، بۆیە با کەمتەرخەمی تێدا نەکەین، بەڵکو: ﴿وَفِي ذَٰلِكَ فَلْيَتَنَافَسِ ٱلْمُتَنَٰفِسُونَ ﴿٢٦﴾﴾المطففين.

**ئەو کارانەی بەندە لەم وەرگێڕانەدا کردوویەتی:**

١)- لە وەرگێڕانەکەدا ڕیوایەتی (يحيى بن يحيى الليثي)مان هەڵبژاردووە.

٢)- هەڵساوم بە وەرگێڕانی دەقاودەقی فەرموودەکان، بە شێوەیەك هەوڵمداوە وەرگێڕانەکە پڕ بە پێستی خۆی بێ، بۆ ئەوەی خوێنەر ئەگەر ویستی بە ئاسانی ماناکان بۆ عەرەبییەکە بگێڕێتەوە.

٣)- لەناو وەرگێڕانە دەقاودەقەکە لە نێوان دوو کەوانە () شەرح و ڕوونکردنەوەم تێهەڵکێشی دەقەکان کردووە، بۆ ئەوەی نەبێتە وەرگێڕانێکی حەرفی و لەبەینچوونی مانا و مەبەستی فەرموودە و ئەسەرەکان کە ئەوەش مەبەستە سەرەکیەکەیە، بۆیە دەتوانین ناوی نیمچە شەرحێکی لێ بنێین.




٤)- فەرمووده و ئەسەرەکانم لەسەر مەبەست و تێگەیشتنی ئیمامی مالیك ﷬ لێکداوەتەوە، چونکە یەکێك لە ئەمانەتە زانستییەکان ئەوەیە دەبێ پەرتووك بەپێی مەبەستی نووسەر لێك بدرێتەوە.

٥)- لە زۆرێك لەو شوێنانەی فەتوای ئیمامی مالیك جیاوازە لەگەڵ مەزهەبی ئیمامی شافیعی لە پەراوێز ڕوونم کردۆتەوە و ئاماژەم بە فەتوای ئیمامی شافیعی کردووە، تاوەکو لەلای مسوڵمانان تێکەڵی و ناحاڵیبوون ڕوو نەدات و، فەتوای مەزهەبی خۆمان بزانین لەو شوێنانە، چونکە فەتوای ئەو زانایە گەورانە هەمووی لەسەر بنەمای قورئان و سوننەتە و لە ڕووی حەقەوە جیاوازی نییە، هەمووی هەر ئیجتیهادە.

٦)- ڕوونکردنەوەی پلەی گشت فەرموودەکانم لە تەحقیقی شێخ (محمد صبحي بن حسن الحلاق) وەرگرتووە و لە پەراوێز دامناوە، هەرچەندە دەبێ ئەوە بزانین بە پێی مەرجی ئیمامی مالیك هەموو فەرموودە و ئەسەرەکان صەحیح و مەقبولن.

٧)- تەخریجی گشت فەرموودە و ئەسەرەکانم لە تەحقیقی ئەعزەمییەوە وەرگرتووە و لە پەراوێز دامناوە.

٨)- هەوڵمداوە ئەو وشە نامۆیانە ڕوون بکەمەوە کە دەبێتە بەربەست لە تێگەیشتنی تەواوی دەقەکان.

٩)- لەم وەرگێڕانەدا گەڕاومەتەوە سەر شەرحی زانایان و لە خۆمەوە لێکم نەداوەتەوە پەنا بەخوا، جا ئەو شەرحانەی زۆرترین سوودیان پێگەیاندووم بریتین لە: (المنتقى شرح الموطأ)ی ئیمام باجی و (الإستذكار الجامع لمذاهب فقهاء الأمصار)ي ئیمام ئیبنو عەبدولبەڕ، و (التمهيد لِما في الموطأ من المعاني والأسانيد)ي ئیمام ئیبنو عەبدولبەڕ، بەڵام ئەو شەرحەی لە هەموویان زیاتر سوودم لێ بینیوە و بە تەواوی لەگەڵی ڕۆیشتووم بریتییە لە شەرحە ناوازەکەی ئیمامی زەڕقانی (شرح الزرقاني على الموطأ)، جا ئەوەی لەم وەرگێڕانە دەستت دەکەوێ بەدەر نییە لە زانیاری ئەو پەرتووکانە، تەنها شتانێکی زۆر کەم نەبێت.

## سوپاس و پێزانین

له سۆنگه‌ی فه‌رمووده‌ی پێغه‌مبه‌ری خواوه ﷺ كه فه‌رموویه‌تی: (مَنْ لَمْ يَشْكُرْ النَّاسَ لَمْ يَشْكُرْ اللَّهَ)، به واجبی ده‌زانم سوپاس و پێزانینی به‌بێ ئه‌ندازه ئاڕاسته‌ی ستافی (پێـیـت) بكه‌م، كه ده‌ستی خزمه‌تیان بۆ په‌رتووكه‌كانی فه‌رمووده درێژ كردو جوانترین خزمه‌تیان كرده دیاری مسوڵمانانی كوردستان، وه بوونه هۆی واڵاكردنه‌وه‌ی ده‌رگای فه‌رمووده به ڕووی شه‌یدایانی سونه‌تی پێغه‌مبه‌ری خوادا ﷺ.

ئه‌گه‌ر هیممه‌تی ئه‌وان نه‌بووایه، كه خوای په‌روه‌ردگار كردنی به هۆكار، ئه‌وه خامه‌ی ئێمه ڕه‌نگه جوڵه‌ی نه‌كردایه، ئه‌و خزمه‌ته له ئه‌ندێشه‌ی ئێمه زۆر دوور بووایه، به‌ڵام ئه‌وان ده‌ستیان دایه ئه‌و پڕۆژه‌یه و قۆڵی هیممه‌تیان لێ هه‌ڵماڵی و، ئه‌و خزمه‌ته‌یان له‌لا گه‌ڵاڵه كردین و به ماددی و مه‌عنه‌وی پشتگیرییان كردین، بۆ ئه‌وه‌ی به‌گڕ و تینه‌وه خامه‌كانمان بجوڵێ.

دوای ته‌واوبوونی په‌رتووكه‌كانیش به چه‌ندین شێوازی نایاب پێداچوونه‌وه بۆ په‌رتووكه‌كان ده‌كه‌ن و، جوانترین به‌رگی چاپی به‌به‌ردا ده‌كه‌ن و جێی په‌نجه‌یان وه‌ك مانگی چوارده به‌سه‌ر په‌رتووكه‌كانه‌وه دیاره، بۆیه داوا له خوای په‌روه‌ردگار ده‌كه‌م ته‌وفیقی زیاتریان بدات و ئیستیقامه‌یان پێ ببه‌خشێت له‌سه‌ر ئه‌و خزمه‌ته جوانه و، بۆیان بكاته توێشووی دواڕۆژیان و، پۆشاكی ڕه‌زامه‌ندی بكاته كاڵای باڵایان.

هه‌روه‌ها سوپاس و ستاییشی بێپایانم بۆ مامۆستا (محمد گرده‌شێخاڵی) هه‌یه، كه خاوه‌نی وه‌رگێڕانی شه‌رحی شه‌مائیله به‌به‌شداری له‌گه‌ڵ مامۆستا (سیروان كاكه أحمد)، مامۆستا (محمد) جوانترین پێداچوونه‌وه‌ی بۆ په‌رتووكه‌كه كردووه، وشه به وشه‌ی وه‌رگێڕانه‌كه‌ی له‌گه‌ڵ ده‌قه عه‌ره‌بییه‌كه به‌راورد كردووه، به تێبینییه‌كانی سوودی زۆری پێگه‌یاندووم، بۆیه كاره‌كه‌ی زۆر به گه‌وره ده‌نرخێنم و داواكارم له خوای په‌روه‌ردگار ڕه‌زامه‌ندی خۆی پێ عه‌تا بكات و له‌گه‌ڵ كۆمه‌ڵه‌ی زانایان حه‌شری بكات.




هەروەها زۆر سوپاسی مامۆستاکەم دکتۆر مامۆستا مەلا (سامی حاجی سورچی) دەکەم، کە لە حوجرەی خالیدی کوڕی وەلید لە خزمەتی ئەو فێری زۆربەی ئەو کتێب و زانستە شەرعییانە بووم کە خوێندوومە، هەر ئەوەش بوو بە هۆکار تا بتوانین شتێك لە کتێبی زانایان تێبگەین و، ئەو کتێبە وەربگێڕین، داواکارم بە خوێندنەوەی هەر پیتێکی ئەم پەرتووکە لەلایەن مسوڵمانانەوە خوای پەروەردگار پاداشتەکەی بگەیەنێتە گشت مامۆستاکانم و پلەیان پێ بەرزتر بکاتەوە.

هەروەها زۆر سوپاسی دایك و باوکم دەکەم، کە زۆر پەرۆش و هاندەرم بوون و هەموو هەوڵێکیان ئەوە بووە ببینە خزمەتکارێکی بچووکی ئەو ئیسلامە، داواکارم لە خوای پەروەردگار فەزڵی ئەوەمان پێ ببەخشێت دایك و باوکمان لە دواڕۆژ سوودمان لێ ببین، بەیەکەوە لە خۆشترین شوێنی بەهەشتە جوانەکەی کۆمان بکاتەوە.

هەروەها زۆر سوپاسی خێزانم دەکەم، کە یارمەتیدەرێکی زۆر گەورەبوو و، دەرفەتی زۆری بۆ ڕەخساندم تاوەکوو کتێبەکە بە ئاکام بگات، نەك هەر ئەوەندە بەڵکو تا کۆتایی کتێبەکە لەگەڵم بەشدار بوو لە خوێندنەوەی حوکمی فەرموودەکان، هیوادارم لە ژیانی ئەبەدیش بەیەکەوە شاد بینەوە.

هەروەها زۆر سوپاسی هەموو خزم و دۆست و خۆشەویستان دەکەم کە بەردەوام بە دوعای خێر و لێپێچینەوە و دڵپێخۆشبوون لەگەڵم بوون و بەتامەزرۆییەوە چاوەڕێی دەرچوونی پەرتووکەکە بوون، خۆشەویستییەکەیان بەرز دەنرخێنم و داواکارم لە خوای پەروەردگار لەناو کۆمەڵەی خۆشەویستان لەژێر سێبەری عەرشی خۆی کۆمان بکاتەوە.

# ژیاننامەی ئیمامی مالیك ﷫

## نـاو و ڕەچـەڵەکی:

شەیخی ئیسلام، حوججەی ئوممەت ئیمامی دارول هیجرە ناوی: (مالیکی کوڕی ئەنەسی کوڕی مالیکی کوڕی ئەبو عامیر ـ نافیع ـ ی کوڕی عەمری کوڕی حاریسە)، لە هۆزی ئەصبەحیە کە هۆزێکی گەورەی حیمیەرە.

جا باوکی ئیمامی مالیك واتە: ئەنەسی کوڕی مالیك، فەرموودەی لە باوکیەوە مالیکی کوڕی ئەبو عامیر گێڕاوەتەوە، کە یەکێك بووە لە زاناکانی تابیعینە گەورەکان و فەرموودەی لە هاوەڵە گەورەکانی پێغەمبەری خوا ﷺ وەرگرتووە، وەك: ئیمامی عومەر و عوسمان و تەڵحەی کوڕی عوبەیدوڵڵا و عائیشە و ئەبو هورەیرە و حەسسانی کوڕی سابیت و عەقیلی کوڕی ئەبو تاڵیب (خوا لە گشتیان ڕازی بێ).

وە ئەبو عامیر کە ناوی نافیعە و، باپیرەی دووەمی ئیمامی مالیکە ﷫ هەندێك دەڵێن: هاوەڵی پێغەمبەری خوا ﷺ بووەو، لە گشت غەزاکان لەگەڵ پێغەمبەری خوا ﷺ بەشداری کردووە، بەڵام هەندێکی دیکە گوتوویانە: لە سەردەمی پێغەمبەری خوا ﷺ بووە، بەڵام نەیبینیوە، بە هەرحاڵ فەرموودەی لە هاوەڵانەوە گێڕاوەتەوە.

##ساڵی لە دایکبوونی:

لەسەر ڕاستترین بۆچوون مالیکی کوڕی ئەنەس ﷫ لە ساڵی نەوەت و سێ (٩٣)ی کۆچی لە دایك بووە، لە هەمان ئەو ساڵەی تیایدا ئەنەسی کوڕی مالیکی خزمەتکار و هاوەڵی پێغەمبەری خوا ﷺ وەفاتی کرد، واتە: خزمەتکارێکی فەرموودە وەفاتی کردو خزمەتکارێکی دیکە لە دایك بوو! ئەنەسی کوڕی مالیك وەفاتی کرد و مالیکی کوڕی ئەنەس هاتە دونیاوە!.



**زانست وەرگرتنی:**

ئیمامی مالیك ﷺ ئەو کاتەی دەستی بە وەرگرتنی زانست کردووە تەمەنی دە ساڵ بەسەرەوە بووە، وە ئەو کاتەی بۆتە شایستەی فەتوادان و بۆ فەتوادان دانیشتووە تەمەنی بیست و یەك ساڵ بووە، جا خەڵك فەرموودەی لێ گێڕاوەتەوە، لە کاتێکدا گەنجێکی تازەپێگەیشتوو بووە و، لەوپەڕی سنووری دەوڵەتەکەی ئەبو جەعفەری مەنصورەوە قوتابییانی زانست ڕێیان کوتاوەتەوە بۆ خزمەتی، وە لە سەردەمی خەلافەتی هاروونە ڕەشیددا خەڵك بە شەپۆڵ دەڕژانە کۆڕ و مەجلیسەکانی.

زانستی لە زانایانی مەدینە وەرگرتووە، حەوت ساڵ لە خزمەتی ئیبنو هورموز ماوەتەوە، وە زۆر چۆتە خزمەتی جەعفەری صادق و، لە گەورە زانایانی دیکەش زانستی وەرگرتووە، وەك: ئەبو زیناد و ڕەبیعەی ڕەئی و یەحیای کوڕی سەعیدی ئەنصاری و ئیبنو شیهاب، وە لە ڕێگەی نافیعی باپیریەوە شارەزای فەتواکانی عەبدوڵڵای کوڕی عەمەر بووە، لەو ڕێگەیەشەوە گەیشتووە بە فیقهی زەیدی کوڕی سابیت و عەبدوڵڵای کوڕی عومەر.

**مەجلیسە زانستییەکانی:**

ئیمامی مالیك ﷺ عادەتی وا بووە چەند ڕۆژێکی تەرخان کردبوو بۆ گێڕانەوەی فەرموودە و چەند ڕۆژێکیش بۆ فەتوا و بابەت و پرسیاری فیقهی، جا سەرەتا لە مزگەوت دەرسی دەگوتەوە، بەڵام لە کۆتاییەکان لەماڵەوە دەیگوتەوە.

جا دەیگوت: دەبێ قوتابی زانست لە کاتی داواکردنی زانست ویقاڕ و ئارامی و ترسی بەسەرەوە دیار بێت و شوێنکەوتەی پێشینە بێ، وە دەبێ کەسی خاوەن زانست گاڵتە لەخۆی دوور بخاتەوە بەتایبەت ئەو کاتەی باسی زانست دەکرێ.

جا ئیمامی مالیك ﷺ زۆر بەتوندی دەستی بەو سیفەتانەوە گرتبوو، بەشێوەیەك نزیکەی پەنجا ساڵ دەرسی گوتەوە یەك پێکەنینی بەدەنگیان لێ نەبینی، ئەوەش لەبەر ڕژدی سروشتی نەبوو، بەڵکو لەبەر ڕێزگرتنی بوو بۆ زانست، یەکێك لە




قوتابییەکانی دەڵێ: کاتێ ئیمامی مالیك لە مەجلیسی ئاساییدا لەگەڵ ئێمە دادەنیشت وەك کەسێك لە ئێمە وا بوو، لە ئێمە خۆبەکەمزانتر بوو، جا کاتێ فەرموودەیەکی بگێڕابایەوە دەگۆڕا و سامان لە هەیبەت و قسە و گێڕانەوەکەی دەکرد، وەك ئەوە وا بوو نەماننناسێ و نەیناسین!

جا هەیبەتەکەی وایکردبوو تەنانەت کاتێ کەسێك دەهاتە مەجلیسەکەی و سەلامی دەکرد، کەس نەیدەتوانی بەدەنگ وەڵامی سەلامەکەی بداتەوە لەبەر هەیبەتی ئیمامی مالیك، بەڵکو زۆر بە هێمنی و لەسەرخۆیی وەڵامیان دەدایەوە و زوو ئاماژەیان بۆ دەکرد قسە نەکات.

**شێوە و سیفەتەکانی ئیمامی مالیك:**

**لە ڕووی شکڵ و شێوەوە:**

ئیمامی مالیك پیاوێکی باڵابەرزی چوارشانەی زۆر سپی سووورباوی شێوە زۆر جوانی چاوشین بووە.

عیسای کوڕی عەمری مەدەنی گوتوویەتی: هەرگیز هیچ سپییەتییەکم نەبینیوە لە ڕوخساری ئیمامی مالیك جوانتر بووبێ، ڕیشیشی درێژ و پان بوو.

مووەکانی سمێڵی لە دەورەی لێوی هەڵدەگرت و نەیدەتاشی و تاشینی پێ هەتککردن بوو، دوو ڕۆخە سمێڵەکانی بەدرێژی دەهێشتەوە، بەڵگەی بۆ ئەوە بە ئیمامی عومەر دەهێنایەوە، کە هەیبووە و، لە کاتی تێفکرین لە بابەتێك دەستی پێدا دەهێنا و بایدەدا (واتە ئیمامی عومەر).

موصعەبی زوبەیری گوتوویەتی: ئیمامی مالیك ڕوخساری لە جوانترینی مرۆڤەکان بوو، وە چاوەکانی لە ڕێکترین و جوانترینەکان بوو، وە سپییەتییەکەی لە ڕوون و سافترین سپییەتی بوو، وە درێژییەکەی تەواوترین بوو، وە سەرە پڕ زانستەکەی زۆر ڕێك و گەورە بوو، بە گەنجی قژی بەملاولادا دوولەت دەکرد.

**لە ڕووی پۆشاکەوە:**

ئیمامی مالیك ﷺ گرنگی زۆری بە پۆشاکەکانی دەدا، پێی وا بوو ئەوە ڕێزگرتنە لە زانست و پلەی زانایەتی، وە دەیگوت لە مروئەت و کەسایەتی زاناو شارەزا لە ئایین ئەوەیە پۆشاکی جوان هەڵبژێرێ و جوان دەربکەوێ، وە نابێ چاوەکان ببینن تەنها بە جلی جوانەوە نەبێ، وە دەبێ عەمامەکەشی جوان و چاك بێ، بۆیە خۆی جوانترین و گرانبەهاترین جلی دەپۆشی، وە ڕەنگی سپی دەپۆشی.

**ئەنگوستیلەکەی دەستی (گوستیلەی دەستی):**

ئەو کاتەی ئیمامی مالیك وەفاتی کرد، ئەنگوستیلەیەکی زیوی لە پەنجەدا بوو، سەرەکەی بەردێکی ڕەش بوو، لەسەری نووسرابوو: (حسبنا الله ونعم الوكيل).

جا موتەڕڕیف دەربارەی هەڵبژاردنی ئەو ڕستەیە پرسیاری لێکرد، ئیمامی مالیکیش گوتی: خوای پەروەردگار دەفەرموێ: (وقالوا حسبنا الله ونعم الوكيل) موتەڕڕیف دەڵێ: منیش ئەنگوستیلەیەکم بە دروستکردندا بەو نووسراوە (حسبنا الله ونعم الوكيل).

**دەربارەی ڕێزگرتنی لە پێغەمبەری خوا ﷺ:**

ئیمامی مالیك ﷺ ئەوەندە ڕێزی لە فەخری کائینات و نووری چاومان گرتووە، بە ئەندازەیەك لە مەدینە سواری وڵاخ نەدەبوو، حەزی نەکردووە بە وڵاخەکەی پێ لە خۆڵی ئەو خاکە بنێ کە پێغەمبەری خوا ﷺ لەسەری ژیاوە و تێیدا نێژراوە! وە کاتێ فەموودەی دەگێڕایەوە گاڵتە و پێکەنینی نەدەما و مرۆڤ هەیبەت و سامی لێ دەکرد!

**شوێنی مانەوەی و چۆنیەتی ڕەوشتی لەگەڵ خانەوادەکەی:**

ئیمامی مالیك سەرەتا لە عەقیق نیشتەجێ بوو دواتر چوو بۆ مەدینە، پێی گوترا: بۆچی لە عەقیق نیشتەجێی؟ بۆ تۆ زەحمەت و ناخۆش و قورسە بۆ مزگەوت؟ گوتی: پێم گەیشتووە پێغەمبەری خوا ﷺ عەقیقی خۆشویستووە و هاتووە بۆی،




وە زانیومە یەكێك لە ئەنصارییەكان ویستوویەتی ماڵەكەی لە عەقیق بگوازێتەوە بۆ نزیك مزگەوت، پێغەمبەری خوا ﷺ پێی فەرمووە: ئایا هەنگاوەكانی حیساب ناكەن (كە ئەجریان یەجگار زۆرە، نەیهێشتووە بیگوازێتەوە).

ئیمامی مالیك لە ژیانیدا خانووی خۆی نەبووە، بەڵكو لە خانوێكی كرێدا نیشتەجێ بوو. وە دەگوترێ ئەو ماڵەی لە مەدینە تێیدا نیشتەجێ بوو خانووی عەبدوڵڵای كوڕی مەسعود بوو ﷺ، جا ئیمامی مالیك لەسەر دەرگای خانووەكەی نووسیبوو (ما شاء الله)، جا پرسیاری لێكرا دەربارەی ئەوە، ئەویش گوتی: خوای پەروەردگار فەرموویەتی: ﴿ وَلَوْلَآ إِذْ دَخَلْتَ جَنَّتَكَ قُلْتَ مَا شَآءَ ٱللَّهُ ﴿٣٩﴾ ﴾ الكهف.

جا منداڵەكانی و خوشكی و خێزانی لە ماڵەكەدا دەژیان و جوانترین ڕەوشت و مامەڵەی هەبووە لەگەڵیان، وە دەیگوت: باشبوون لەگەڵیاندا ڕەزامەندی خوا ﷻ و درێژبوونەوەی ئەجەل دەبەخشێ.

### كــار و كەســابەتی:

ئیمامی مالیك بۆ ماوەیەكی كورت زیندوور بووە (واتە: زینی وڵاخی دووریوە و چاكی كردووە)، بەڵام دواتر بازرگانی قوماشی كردووە لەگەڵ براكەی كە ناوی (نضر) بووە.

جا دوای ئەوەی بوو بە ئیمام بۆ پاراستنی پێگەكەی، بەخۆی شتەكانی نەدەكڕی و نەیدەفرۆشت و دەیگوت: زانا پێویستە بەخۆی شتەكان لە بازاڕ نەكڕێ، هەرچەندە ماڵەكەی بەوە كەم دەكات، بەڵام ئەگەر خۆی لە بازاڕ بسوڕێتەوە و شت بكڕێت و بفرۆشێت عەوام قەدری نازانێت.

### مــنداڵــەكانی:

ئیمامی مالیك چوار منداڵی هەبووە بە ناوەكانی: یەحیا و موحەممەد و حەماد و فاتیمە.



**مەدح و ستایشی ئیمــامی مالیك:**

سەرەتا فەرموودەیەك:

فەرموودەیەكیان هەیە ئیمامی ئەحمەد و ترمزی و نەسائی و حاكم لە پێغەمبەری خواوە ﷺ گێڕاویانەتەوە بەوەی فەرموویەتی: (نزیكە خەڵك لەبن كەوشی وڵاخ و تەرۆكی وشتر بدەن (واتە زۆر بەخێرایی بە وڵاخ گەشت بكەن) بۆ وەرگرتنی زانست (لە هەموو شوێنێك)، جا هیچ زانایێكیان دەست نەكەوێ زاناتر بێت لە زاناكەی مەدینە). ئیمامی ترمزی گوتوویەتی: فەرموودەیەكی حەسەنە.

جا دەربارەی مانای ئەو فەرموودەیە كە ئاخۆ ئەو زانایە كێیە كە پێغەمبەری خوا ﷺ مەدحی كردووە؟

سوفیانی كوڕی عویەینە و عەبدوڕەزاق گوتوویانە: ئەو زانایە ئیمامی مالیكی كوڕی ئەنەسە رحمه الله.

ئیمامی زەهەبی دەڵێ: لە مەدینە لەدوای تابعین كەس نەبووە لە مالیك بچێت لە زانست و فیقهو گەورایەتی و لەبەركردن، لە كاتێكدا مەدینە كەسانی وەكوو: سەعیدی كوڕی موسەییەب و حەوت شەرعزانەكان (فوقەهای سەبعە) و قاسم و سالم و عیكریمە و نافیع و جیلی ئەوانی لێبووە، دواتریش زەیدی كوڕی ئەسلەم و ئیبنو شیهابی زوهری و ئەبو زیناد و یەحیای كوڕی سەعید و صەفوانی كوڕی سولەیم و ڕەبیعەی كوڕی ئەبو عەبدوڕڕەحمان و جیلی ئەوانەی لێ بووە، كاتێ وەفاتیان كردووە، ناوی ئیمامی مالیك ناوبانگی هەبووە، وە ئیبنو ئەبو زوئەیب و دەڕاوەردی و جیلی ئەوان هەبووە، جا ئیمامی مالیك بەڕەهایی پێش گشتیان خراوە، وە ئەو بریتی بووە لەو كەسەی لەوپەڕی دونیا بە سواری وڵاخ پەلەی بۆلا دەكرا و دەچوونە خزمەتی (كە لە فەرموودەكەدا ئاماژەی پێكراوە).

**دەربارەی مەدح و ستاییشی زانایانیش:**

* ئیبنو شیهابی زوهری رحمه الله ـ كە مامۆستای ئیمامی مالیكە ـ بە ئیمامی مالیكی گوتووە: تۆ یەكێكی لە خەزنە و هەڵگرانی زانست و چاكترین شوێنی هەڵگرتنی




زانستی (واتە تۆ شایستەی ئەوەی ئەو زانستەی کە ئەمانەتە لەلای ئێمە ڕادەستی تۆی بکەین کە چاکترین شوێنە بۆ دانانی ئەو زانست و ئەمانەتەی لامانە)!

ئیبنو هورموز ﷺ ـ کە ئەویش مامۆستایەتی ـ جارێکیان بە جارییەکەی دەڵێ: کێ لەبەر دەرگایە؟ ئەویش کەس نابینێ جگە لە مالیك و پێی دەڵێت مالیکە، ئەویش دەڵێ: مالیك زانای گشت خەڵکییە. لە کاتێکدا تەمەنی لە بیست و پێنج ساڵ تێپەڕی نەکردبوو!

* ئیمامی جەعفەری صادق ﷺ ـ کە یەکێك بووە لە مامۆستاکانی ـ خەڵکی کوفە لە کاتی مردنی پرسیاری لێ دەکەن کەسێکیان بۆ دیاری بکات تا دوای ئەو بۆ بابەتی شەرعی و فەتوا بگەڕێنەوە بۆ لای، گوتوویەتی: دەست بە فەتوای ئەهلی مەدینەوە بگرن، چونکە مەدینە پیسی لەناو خۆی لادەبات چۆن کورە پیسی و ژەنگ و ژاری ئاسن لادەبات، دواتر باسی ئیمامی مالیکی کرد گوتی: دەست بەو منەتبەسەرداکراو و یارمەتیدراو و بەرەکەتدارەی ئیسلامەوە بگرن، کە شوێنکەوتەی فەرموودەکانی پێغەمبەری خوایە ﷺ، من ئەوم تاقیکردۆتەوە، بۆم دەرکەوتووە شەرعزان و گەورەو شوێنکەوتە و تاکە، هەوا و نەفس لاینادا، ئەو زۆر زەروور و پێویستە، فەرموودە لە کەس ناگێڕێتەوە تەنها لە زانا گەورەکانی هاوەڵی پێغەمبەری خوا ﷺ نەبێ، جا ئەگەر شوێنی ئەو پیاوە کەوتن ئەوە دەستتان گرتووە بە پشکی خۆتان لە ئیسلام، وە ئەگەر پێچەوانەی ئەوتان کرد، ئەوە گومڕا بوون و لەناو چوون، ئایا ئێوە ناڵێن و (شاهێدی نادەن بەوەی): من زانستێکم بۆ ڕەخساوە پێویستم بە کەس نییە، دەی ئەو مالیکە ئەوەی پێویست بێت لە زانست لە منی وەرگرتووە، جا نەکەن هەوا و نەفس لاتان بدات و لەناو بچن، من دەتانترسێنم بە سزای خوا لە ڕۆژی دوایی، کە خوای پەروەردگار دەربارەی ئەو ڕۆژە فەرموویەتی: ﴿يَوْمَ لَا يَنفَعُ مَالٌ وَلَا بَنُونَ ﴿٨٨﴾ إِلَّا مَنْ أَتَى اللَّهَ بِقَلْبٍ سَلِيمٍ ﴿٨٩﴾﴾ الشعراء، دەتانترسێنم و ئاگادارتان دەکەمەوە ئەوە من ڕێم نیشان دان بۆ لای پیاوێك کە بۆم دیاری کردن، ئەو ئەمین و خۆشەویستە لە سەردەمی خۆیدا، ئەوانیش گوتیان: ئەوە کێیە هێندە باسی دەکەی بۆمانی ڕوون بکەوە؟ گوتی: ئەوە مالیکی کوڕی ئەنەسە!




* ئیمامی ئەوزاعی ﷬- کاتێ باسی ئیمامی مالیك دەکرا - دەیگوت: زانای هەموو زانایان و زانای زانایانی مەدینە، وە بە ئەوزاعی گوتراوە: ئیمامی مالیکت چۆن بینی؟ گوتی: بە پیاوێکی زۆر زانا بینیم.

* سوفیانی کوڕی عویەینە ﷬ دەربارەی بەراوردکردنی خۆی و ئیمامی مالیك گوتوویەتی: ئێمە چین لەچاو مالیك؟ ئێمە شوێنکەوتەی فەرموودەکانی مالیکین، ئەگەر ئەو لە زانایێك فەرموودە وەربگرێت ئێمەش لێی وەردەگرین (واتە تەقلیدی ئەو دەکەین لە فەرموودەدا).

* ئیبنو ماجیشون ﷬ کە جارێکیان ئیبنو وەهب ﷬ پرسیاری لێکرد دەربارەی بابەتێك، ئەویش گوتی: وەڵامم پێ نییە، بەڵام پرسیار لە مالیك بکە و هەواڵم پێ بدە بەوەی وەڵامت دەداتەوە، جا پرسیارم لێ کرد و هەواڵەکەم پێ دایەوە، جا ئیبنو ماجیشون گوتی: مالیك گەورە و زانامانە. وە جارێکیان ئیبنو ماجیشون بابەتێکی باس کرد ڕاجیایی تیا بوو لە نێوان باوکی ئیبنو ماجیشون و ئیمامی مالیك، جا ئیبنو ماجیشون گوتی: قسەی ئیمامی مالیك وەردەگرم و بۆ لای مالیك دەشکێمەوە بۆ هەر لایەك بشکێتەوە، چونکە ئەو زۆر موەففەقە.

* ئەبو یوسف ﷬ قوتابی ئەبو حەنیفە ﷬ گوتوویەتی: کەسم نەبینیوە زاناتر بێت لە سێ کەس: مالیك، ئیبنو ئەبی لەیلا، ئەبو حەنیفە.

* ئیمامی شافیعی ﷬ گوتوویەتی: ئەگەر باسی فەرموودە هاتە گۆڕێ ئەوە مالیك ئەستێرەکەیە (واتە: ئەو ئەستێرەی خوای پەروەردگار دەربارەی فەرموویەتی: ﴿ وَعَلَـٰمَـٰتٍۚ وَبِٱلنَّجۡمِ هُمۡ يَهۡتَدُونَ ١٦ ﴾النحل، وە گوتوویەتی: دوای تابیعین مالیك حوججەتی خوایە بەسەر بەندەکانی. وە گوتوویەتی: مالیك لە دێر زەمانەوە لەلایەن زانایان پێش خراوە لە مەدینە و حیجاز و عێراق، گەورەیی ئەو لەپێشترە، لەلایەن زانایان ناوبانگی هەیە لە تۆکمەیی لە فەرموودە و دانیشتن لە خزمەتی زانایە گەورەکان. وە گوتوویەتی: ئەگەر مالیك و سوفیان نەبانە، ئەوە زانستی حیجاز نەدەما. وە گوتوویەتی: ئەگەر فەرموودەیەکت لە مالیکەوە پێ گەیشت ئەوە

توند دەستی پێوە بگرە. وە گوتوویەتی: هەر کەسێك فەرموودەی بووێ پێویستی بە مالیکە. وە گوتوویەتی: مالیکی کوڕی ئەنەس مامۆستای منە و کەس نییە منەتی زیاتری بەسەر منەوە هەبێت لە مالیك.

وە بە ئیمامی شافیعی ﷬ گوتراوە: ئەی ئەبو عەبدوڵڵا کەست بینیوە وەکو مالیکی کوڕی ئەنەس بێت؟ ئیمامی شافیعی گوتی: گوێم لەو کەسانە بووە کە لە تەمەن و زانست لە پێش ئێمەوە بوون دەیانگوت: کەسمان نەبینیوە وەکو مالیك بێ، جا ئێمە چۆن کەسی وەکو ئەو دەبینین؟!

وە گوتوویەتی: هەر کەسێك فەرموودەی صەحیحی دەوێ با دەست بە مالیکەوە بگرێ.

وە گوتوویەتی: زانست لەدەوری سێ کەس دەخوولێتەوە: مالیکی کوڕی ئەنەس و سوفیانی کوڕی عویەینە و لەیسی کوڕی سەعد.

* یەحیای کوڕی سەعیدی قەتتان ﷬ ـ کە قوتابی ئیمامی مالیکە ـ گوتوویەتی: کەس پێش مالیك ناخەم لە سەردەمی خۆیدا.

* وهەیبی کوڕی خالید ﷬ ـ کە یەکێك بووە لە هەرە زانا شارەزاکانی فەرموودە ـ گوتوویەتی: چووم بۆ مەدینە، هەموو زانایێك دەناسرا و نەدەناسرا تەنها مالیك و یەحیای کوڕی سەعید نەبێ (حەتمەن دەناسرا). جا وهەیب کەسی بە هاوشانی مالیك دانەدەنا.

* ئیبنو مەهدی ﷬ گوتوویەتی: کەسم نەبینیوە عەقڵ و لۆژیکی پتەوتر بێت لە مالیك.

عەبدوڵڵای کوڕی موبارەك گوتوویەتی: ئەگەر پێم بگوترێت پێشەوایێك بۆ ئوممەت هەڵبژێرە، ئەوە مالیکی بۆ هەڵدەبژێرم.

* ئیبنو وەهب ﷬ گوتوویەتی: ئەگەر خوای پەروەردگار بە مالیك و لەیس ڕزگاری نەکردباین ئەوە گومڕا دەبووین.





وە گوتوویەتی: ئەگەر پێم بگوترێت زانایێك بۆ ئوممەت دیاری بکە، ئەوە مالیکیان بۆ دیاری دەکەم.

* ئیمامی ئەحمەد ﷬ گوتوویەتی: دڵ بە فەرموودە و فەتواکانی مالیك ئۆقرە دەگرێ، وە شایستەشە ئۆقرەی پێ بگرێ، مالیك لەلای ئێمە حوججەیە، چونکە زۆر بەتوندی شوێنکەوتەی ئەو فەرموودانەیە کە لەلای ئەو صەحیحن.

* ئیمامی نەسائی ﷬ گوتوویەتی: لەلای من دوای تابیعین کەس نییە گەورەتر و جێی متمانەتر بێت لە مالیك.

* ئیمامی ئەبو داود ﷬ گوتوویەتی: ڕەحمەتی خوا لە مالیك بەڕاستی ئیمام بووە، ڕەحمەتی خوا لە شافیعی بەڕاستی ئیمام بووە، ڕەحمەتی خوا لە ئەبو حەنیفە بەڕاستی ئیمام بووە.

* ئیمامی بوخاریی و ئەبو زورعە و موحەممەدی کوڕی حەکەم و ئەبو عەبدوڵڵای کوڕی سەید و جگە لەوانیش (خوا لێیان ڕازی بی) گوتوویانە: مالیکی کوڕی ئەنەس ئیمامێکی گەورەیە.

* مەدحی خەلیفە ئەبو مەنصور ﷬، ئەبو موصعەب دەڵێ: گوێم لە ئیمامی مالیك بوو دەیگوت: چووم بۆ لای گەورەی باوەڕداران ئەبو جەعفەری مەنصور لە کاتێکدا لەسەر ڕایەخێك دانیشتبوو و دوو وڵاغیش (بۆ جوانی) لەسەر ڕایەخەکە داندرابوون میز و پیساییان نەدەکرد (ڕاهێنراو بوون)، جا منداڵێك هاتە دەرەوە و گەڕایەوە، ئەبو جەعفەریش گوتی: ئایا دەزانی ئەو منداڵە کێیە؟ منیش گوتم: نەخێر، گوتی: ئەوە کوڕی منە، لە هەیبەتی تۆ ترسا بۆیە گەڕایەوە، دواتر ئەبو جەعفەر پرسیاری دەربارەی شتانێك لێ کردم هەندێکیان حەڕام بوون و هەندێکیشیان حەڵاڵ بوون، دواتر پێی گوتم: سوێند بە خوا تۆ عاقڵمەندترین و زاناترین کەسی، منیش گوتم: بە خوا نەخێر ئەی گەورەی بڕواداران، ئەویش گوتی: بۆنا، بەڵام دەیشاریتەوە، دواتر گوتی: ئەگەر بمێنم وتەی تۆ وەك قورئان دەنووسمەوە و دەینێرمە ئەوپەڕی ناوچەکانی دەوڵەت و خەڵکی دەبێ ئیشی پێ بکەن.

**هەندێ لە وتە و مەوقیفەکانی ژیانی ئیمامی مالیك:**

هەیسەمی کوڕی جەمیل ﷺ گوتوویەتی: لەلای ئیمامی مالیك بووم چل و هەشت پرسیاری لێ کرا، لە سی و دوویان گوتی: نازانم.

موسەننای کوڕی سەعیدی قەصیر ﷺ گوتوویەتی: گوێم لە ئیمامی مالیك بوو گوتی: هیچ شەوێك نەبووە بخەوم حەتمەن پێغەمبەری خوام ﷺ لە خەودا بینیوە.

خەلەف دەڵێ: چووم بۆ لای ئیمامی مالیك، ئەویش گوتی سەیرکە بزانە چی دەبینی لە ژێر بەرماڵەکەم؟ جا سەیرم کرد بینیم خەونی یەکێك لە دۆستانی ئیمامی مالیکە خەونێکی خۆی بۆ ئیمامی مالیك ناردووە دەیگوت: پێغەمبەری خوام ﷺ لە خەو بینی لە مزگەوت بوو و خەڵك بۆی کۆببوویەوە، ئەویش بە خەڵکەکەی فەرموو: بۆنی خۆشم ـ یان فەرمووی زانستم ـ لە ژێر مینبەرەکەم شاردۆتەوە و فەرمانم بە مالیك کردووە بەسەر خەڵکیدا دابەشی بکات، جا خەڵکەکە دەڕۆیشتن و دەیانگوت: کەواتە مالیك ئەوە جێبەجێ دەکات کە پێغەمبەری خوا ﷺ فەرمانی پێ کرد، جا ئیمامی مالیك (بە گوێبیستبوونی ئەو خەونە) گریا، منیش لە خزمەتی هەڵسام.

ئیمامی شافیعی گوتوویەتی: ئەگەر کەسێکی گومڕاکەر بهاتبایە بۆ لای ئیمامی مالیك، ئیمام پێی دەگوت: من لەسەر ڕێگەی ڕوونی پەروەردگار و دینەکەمم، تۆش کەسێکی دوودڵ و خاوەن گومانی، بڕۆ لای کەسێکی دوودڵی وەك خۆت و موناقەشە لەگەڵ ئەو بکە (موناقەشە لەگەڵ من مەکە).

وە خالیدی کوڕی نزار گوتوویەتی: گوێم لە ئیمامی مالیك بوو بە گەنجێکی قوڕەیشی دەگوت: ئەی برازام خۆت فێری ئەدەب و ڕەوشت بکە پێش ئەوەی خۆت فێری زانست بکەی.

وە هارونی کوڕی عەلی حەزرەمی گوتوویەتی: ئیمامی مالیك دەربارەی کەسی زەلیل پرسیاری لێ کرا کە ئاخۆ کێیە؟ ئەویش گوتی: ئەگەر کەسێك بەدوای زانستەوە نەبێت ئەوە زەلیلە، چونکە لە پێغەمبەری خواوە ﷺ گێڕدراوەتەوە

فەرموویەتی: ئەگەر خوای پەروەردگار بیەوێ کەسێك زەلیل بکات زانستی لەسەر دەگرێتەوە.

وە جارێکیان ئیمامی مالیك ﷺ لە فەتوایێك ناپێکێت و ئیمامی شافیعی ﷺ فەتواکە ڕاست دەکاتەوە، ئیمامی مالیك بەو هەموو گەورەییەوە لەسەر دیواری مزگەوت دەنووسێ:

مَنْ أَرادَ العِلْمَ النَّفِيْسَ        فَعَلَيْـهِ بِمُحَمَّدِ بْنِ إِدْرِيْسَ

واتە: هەر کەسێك زانستی گرنگ و گرانبەها و ناوازەی دەوێ، با دەست بە موحەممەدی کوڕی ئیدریسەوە بگرێ (واتە ئیمامی شافیعی)!

جا ئیمامی شافیعی ﷺ دێت و نووسینەکە لەسەر دیوار دەبینێ، دەڵێ: ئەوە کێ نووسیویەتی؟ دەڵێن: ئیمامی مالیك ﷺ نووسیویەتی، ئەویش لە ژێر نووسینەکەی ئەو بۆی دەنووسێت:

كَيْـفَ يَكُـوْنُ ذلِكْ        وَهُـوِ تِلْمِيْذُكَ يا مالِـكْ

واتە: چۆن شتی وا دەبێ لە کاتێکدا ئەو قوتابی تۆیە ئەی مالیك!

**کۆچی دوایی ئیمامی مالیك ﷺ :**

ئیمامی مالیك ﷺ دوای ئەوەی بیست و دوو ڕۆژ نەخۆش دەکەوێت لە ساڵی (١٩٧)ی کۆچی لە تەمەنی (٨٧) ساڵی چاوە جوانەکانی لێکدەنێ و کۆچی دوایی دەکات.

ئیمامی شافیعی ﷺ دەڵێ: لە مەککە بووین پورم گوتی: ئەمشەو شتێکی سەیرم بینی، منیش گوتم: شتەکە چییە؟ گوتی: خەونم بینی کەسێك گوتی: ئەمشەو زاناترینی خەڵکی سەر زەوی کۆچی دوایی کرد، ئیمامی شافیعی ﷺ دەڵێ: جا ڕۆژەکەمان دیاری کرد (دواتر هەواڵی کۆچی دوایی ئیمامی مالیك گەیشت) جا هەمان ڕۆژ بوو کە خەونەکەی تێدا بینرابوو!

## دەربارەی کتێبی (الموطأ)

**دەستپێك:**

کاتێك باسی (موطأ) دەکرێ، ئیمامی مالیك ﷺ دێتەوە یاد و پێی گەورە دەبێ، کاتێکیش باسی ئیمامی مالیك ﷺ دەکرێ (موطأ) دێتەوە یاد و پێی گەورە دەبێ، بەیەکەوە پەیوەستن وەك هەر شتێك و سێبەرەکەی، وە بەو جۆر و شکڵ و تەرتیبە کۆنترین سەرچاوەی فەرموودەیە، کە بریتییە لە تێکەڵەیەکی فەرموودە و ئەسەر و فەتوا و ڕوونکردنەوەی بابەتە پێویستەکانی فیقهی ئیسلامی بە تێگەیشتنی ئیمامی مالیك، جا وەك ڕوون و ئاشکرایە لە پێشی پێشەوەی ئەو پەرتووکانەیە کە گرنگییەکی زۆری پێدراوە و لە زۆر ڕووەوە خزمەت کراوە.

**مانـای وشـەی (مـوطـأ):**

(موطأ) لە زمانی عەرەبیدا بە مانای: ڕامهاتوو و ئامادەکراو و ئاسان دێ، جا بەپێی ئەو مانایە بێت بۆیە ناوی لێنراوە، چونکە تێگەیشتنەکەی ئاسانە و خەڵك بە ئاسانی تێیدەگەن.

قسەیەکی دیکە هەیە، بەوەی لە ئیمامی مالیکەوە گێڕدراوەتەوە گوتوویەتی: ئەو پەرتووکەم پیشانی حەفتا شەرعزان و زانای مەدینەدا، گشتیان لەگەڵم کۆك بوون و موافەقەیان کرد، بۆیە ناوم لێنا (موطأ)، جا بەو واتایە بێت مانای کۆکبوون و یەکدەنگی دەگەیەنێ.

گێڕانەوەیەکی دیکە هەیە دەڵێ: کاتێ ئیمامی مالیك ﷺ ویستی کتێبەکە بنووسێ، هەر بیری دەکردەوە ناوی چی لێ بنێ؟! دەڵێ: ئیتر خەوتم و پێغەمبەری خوام ﷺ لە خەو بینی و پێی فەرمووم: (وطِّئْ للناس هذا العلم) ئەو زانستە بۆ خەڵکی بە ئاسانی و ئامادەکراوی بخەرە بەردەست، جا ناوی لە پەرتووکەکە نا (موطأ).

دوای ئەوەی ئیمامی مالیك ﷬ کتێبەکەی خۆی نووسی، خەڵکێکی زۆریش وەك ئەو دەستیان کرد بە نووسینی (موطأ)، ویستیان مونافەسەی ئەو بکەن، جا گوترا: ئەی ئیمام خەڵکێکی زۆر (موطأ)یان نووسیوە، ئەویش گوتی: ئا دەی (موطأ)ـەکانم بۆ بێنن، جا سەیری کردن و گوتی: دە بزانن هیچ بۆ لای خوای پەروەردگار بەرز نابێتەوە، تەنها ئەوە نەبێ کە بۆ ڕەزامەندی ئەوە و لە پێناوی ئەوە، ئیمامی ئیبنو عەبدولبەر دەڵێ: وەك بڵێی ئەو (موطأ)ـانە خراونەتە ناو بیر، دوای ئەوە کەس گوێی لە ناوی ئەوان نەبووە، بۆیە هەر باسی (موطأ) بکرێ، یەکسەر ئیمامی مالیك باس دەکرێ (تەنها هی ئەو ماوەتەوەو ناوبانگی پەیدا کردووە).

**ماوەی نووسینی ئەو کتێبە:**

نووسینی ئەو کتێبە یازدە ساڵی خایاندووە، چونکە ساڵی ١٤٨ه ئەبو جەعفەری مەنصور داوای نوسینەوەی لێ کرد، ئیمامی مالیکیش ساڵی ١٥٩ه لەناو خەڵکی بڵاوی کردەوە.

بەڵام زیادکردن و کەم کردن و پاڵفتەکردنی زیاتر لە چل ساڵ درێژەی خایاندووە، ئیمامی مالیك ﷬ لە کاتی گفتوگۆ کردن لەگەڵ خەڵکانێك گوتوویەتی: من بە چل ساڵ ئەو کتێبەم نووسیوە، ئێوەش بە چل ڕۆژ وەریدەگرن! بۆیە لە کەمێکی تێدەگەن.

جارێکی دیکە گوتوویەتی: شەست ساڵ، بەڵام لێرەدا مەبەستی ئەوەیە بڵێ: ئەو کتێبە بەرهەمی تەمەنێکی تەواوە کە لە سەرەتای داواکردنی زانستەوە دەست پێدەکات، کەچی ئێوە دەتانەوێ بە ماوەیەکی کورت تێی بگەن و پەی پێ ببەن!

ئیمامی دەڕاوەردی گوتوویەتی: من لە ڕەوزەی پێغەمبەری خوا ﷺ لە نێوان گۆڕی پێغەمبەری خوا ﷺ و مینبەر خەوتبووم، جا پێغەمبەری خوام ﷺ لە خەو بینی لە گۆڕ دەرچوو، شانی دابووە سەر ئیمامی ئەبو بەکر و ئیمامی عومەر، گوتم: ئەی پێغەمبەری خوا ﷺ بۆ کوێ چووبووی؟ فەرمووی: چووم بۆ لای مالیکی کوڕی ئەنەس و خستمە سەر ڕێگای ڕاست، دەڵێ: جا چووم بۆ لای ئیمامی مالیك




ﷺ بینیم (موطأ) دەنووسێ، کە هەواڵەکەم پێداو باسی خەونەکەم بۆ کرد، دەستی بە گریان کرد.

**مـەدح و ستایشی (موطــأ):**

ئیمامی شافیعی ﷺ گوتوویەتی: لەسەر زەوی پەرتووکێك نییە دوای پەرتووکی خوای پەروەردگار بەسوودتر بێ لە (موطأ)ی ئیمامی مالیك، وە کاتێك فەرموودە و ئەسەرێك لە (موطأ) دێ، ئەوە لەوپەڕی بەرزیدایە.

وە گوتوویەتی: دوای پەرتووکی خوا هیچ پەرتووکێك ڕاستتر نییە لە (موطأ)ی ئیمامی مالیك.

هەروەها گوتوویەتی: لەسەر زەویدا کتێبێك دانەندراوە نزیکتر بێ لە قورئان لە کتێبەکەی ئیمامی مالیك.

ئیبنو مەهدی گوتوویەتی: لە زانستی ئیسلام نەمزانیوە دوای قورئان ڕاستتر هەبێت لە (موطأ)ی ئیمامی مالیك.

ئیبنو وەهب گوتوویەتی: هەر کەسێك (موطأ)ی ئیمامی مالیکی نووسیبێتەوە و لەلای بێ، پێویستی نییە هیچ شتێك دەربارەی حەڵاڵ و حەڕام بنووسێتەوە (چونکە بڕاندوویەتەوە).

ئیمامی ئەبو زورعە گوتوویەتی: ئەگەر پیاوێك سوێند بە تەڵاق بخوات لەسەر فەرموودەکانی (موطأ) بەوەی گشتیان صەحیحن، ئەوە سوێندی ناکەوێ، بەڵام ئەگەر سوێند لەسەر کتێبی دیکە بخوات سوێند و تەڵاقی دەکەوێ.

عومەری کوڕی ئەبو سەلەمە گوتوویەتی: هەر کاتێك فەرموودەکانی (موطأ)م خوێندبێتەوە حەتمەن کەسێك هاتۆتە خەونم و گوتوویەتی: بەدڵنیایی ئەوە فەرموودەی پێغەمبەری خوایە ﷺ.

ئەبو موسای ئەنصاری گوتوویەتی: ئاگر کەوتەوە لەماڵی پیاوێك، هەموو شتێك لە ماڵەکەدا سوتا، جگە لە قورئان و (موطأ)ی ئیمامی مالیك!

## ڕاوی و گێڕەرەوەکانی (موطأ):

قازی عیاز باسی ژمارەی ئەو کەسانەی کردووە کە (موطأ)یان گێڕاوەتەوە، شەست و هەندێکن.

حافیز موحەممەدی کوڕی عەبدوڵڵای دیمەشقی کە ناسراوە بە (ابن ناصر الدين) ژمارەی گێڕەرەوەکانی (موطأ)ی لە کتێبەکەیدا (إتحاف السالك برواة الموطأ عن مالك) گەیاندۆتە هەشتا و سێ کەس.

بەڵام هەرچی گێڕەرەوە بەناوبانگ و ناسراوەکانە زەرقانی دەربارەیان گوتوویەتی: ئەوەی بەناوبانگن لە نوسخەکانی (موطأ) لەوانەی لێیان گێڕاونەتەوە، یان بینیومانە، یان لە ڕیوایەتی مامۆستاکانمان بوونیان هەیە، یان خاوەنی (موطأ)ـە جیاوازەکان نەقڵیان کردووە، نزیکەی بیست نوسخەن.

لە کتێبی (کشف الظنون)دا هاتووە: ئەبو قاسمی کوڕی موحەممەدی کوڕی حوسەینی شافیعی گوتوویەتی: (موطأ)ـە ناسراو و بەناوبانگەکان بریتین لە یازدە دانە، گشتیان زۆر لێك نزیکن (جیاوازی کەمیان هەیە)، وە ئەوەی کاری پێ دەکرێ چوارن: ڕیوایەتی یەحیای کوڕی یەحیای لەیسی، ڕیوایەتی ئیبنو بوکەیر، ڕیوایەتی ئەبو موصعەبی زوهری، ڕیوایەتی ئیبنو وەهب.

## کام ڕیوایەتی (موطأ) چاکترینە؟

یەحیای کوڕی مەعین و ئیبنو مەدینی و نەسائی پێیان وا بووە ڕیوایەتی قەعنەبی چاکترینە.

ئیمامی ئەحمەد ڕیوایەتی ئیبنو مەهدی و شافیعی هەڵبژاردووە، بوخاری ڕیوایەتی تەنیسی هەڵبژاردووە، موسلیم ڕیوایەتی یەحیای کوڕی یەحیای نەیسابووری هەڵبژاردووە، ئەبو داود ڕیوایەتی قەعنەبی هەڵبژاردووە، نەسائی ڕیوایەتی قوتەیبەی کوڕی سەعیدی هەڵبژاردووە.




بەڵام زۆربەی زانایان ڕیوایەتی یەحیای کوڕی یەحیای لەیسیان پێ چاکترینە، بە شێوەیەك ئەگەر بە ڕەهایی باسی (موطأ) بکرێ، هەر ئەو دەگرێتەوە و بیر بۆ ئەو دەچێ، لەلای زانایانی فەرموودە بە ناوبانگترینە و کارپێکردنی جگە لەویان بە لاواز داناوە.

جا ئیمامی ئیبنو عەبدولبەڕ دەربارەی یەحیای کوڕی یەحیای لەیسی گوتوویەتی: لە ئەندەلوس دوای عیسای کوڕی دینار، فەتوا بۆ یەحیای کوڕی یەحیای لەیسی دەگەڕایەوە و کاربەدەست و عەوام بۆچوونیان لەو وەردەگرت، شەرعزانێکی بۆچوون چاك و جێی متمانە و عاقڵمەند و ڕێباز جوان و ڕەوشت جوان بوو، لە ڕەجەبی ساڵی (٢٣٤ هـ) کۆچی دوایی کردووە.

### هۆکاری جیاوازی نێوان نوسخەکانی (موطأ):

هۆکاری ئەو جیاوازییەی لە نێوان (موطأ)ـەکان هەیە دەگەڕێتەوە بۆ ئەوەی ئیمامی مالیك پەرتووکەکەی بە تایبەت بۆ خۆی نووسیوە، تاوەکو بەهەڵە بۆ خەڵکی نەیخوێنێتەوە (واتە: لەسەر پەرتووکەکە خوێندوویەتەوە)، بۆیە زیادی دەکرد و کەمی دەکرد (لەو فەرموودانەی لەبەری بوون) بە گوێرەی ئەوەی پێی باش بوو لەو کات و ساتەدا، بۆیە هەندێك جیاوازی لە نێوان (موطأ)ـەکان هەیە لە ڕووی ڕیزبەندی و، سەرەباس و زیادە و کەمی و ئیس[illegible] و مورسەلەوە، بەپێی مەجلیسەکان گۆڕاوە (بەڵام لە کۆتاییدا گشتیان فەرموودەی زاری ئیمامی مالیکن و بە ناوی (موطأ) بە قوتابیەکانی ڕاگەیاندووە).

### ژمارەی فەرموودەکانی (موطأ):

سەرەتا دەبێ بزانین ئیمامی مالیك نەیویستووە هەموو ئەو فەرموودە صەحیحانە بنوسێتەوە کە لەلای هەبووە، بەڵکو ئەوەی نوسیوەتەوە کە پێی وابووە دەبێ ڕەفتار بەوە بکرێ و ئەوانە گرینگەکانن بۆ موسوڵمانان.

جا دەربارەی ژمارەی فەرموودەکانی (موطأ) ئیبنو لەبباد گوتوویەتی: ئیمامی مالیك سەد هەزار فەرموودەی گێڕاوەتەوە، دە هەزاری لە (موطأ)دا کۆکردەوە،



دواتر بەردەوام لەگەڵ قورئان و فەرموودەی دیکە بەراوردی دەکرد تا بوو بە پێنج سەت.

ئەحمەدی کوڕی صاڵح گوتوویەتی: سەیری پەرتووکەکەی ئیمامی مالیکم کردووە، نزیکەی دوازدە هەزار فەرموودەی تێدا بووە.

ئیلکیای هەڕاسی گوتوویەتی: (موطأ)ی ئیمامی مالیك نۆ هەزار فەرموودە بووە، دواتر بەردەوام پاڵفتەی کردووە و تا بۆتە حەوت سەد.

سولەیمانی کوڕی بیلال گوتوویەتی: ئیمامی مالیك (موطأ)ی نووسی لە کاتێکدا چوار هەزار فەرموودە یان زیاتری تێدابوو، کاتێك وەفاتی کرد هەزار و هەندێکی تێدا بوو، ساڵ بە ساڵ پوختەی دەکرد بە گوێرەی ئەوەی چاکترە بۆ مسوڵمانان و باشترینە لە دیندا.

جا ئیمامی مالیك ﷺ یەکێك بووە لەو زانایانەی زۆرترین وردبینی و توندی هەبووە، ئەگەر لەبەر ئەو هۆکارە نەبووایە، ئێستا کتێبێکی زۆر گەورەمان لەبەر دەست دەبوو، کە دەیان هەزار فەرموودەی لەخۆ دەگرت، بەڵام وردبینی و توندی ئیمامی مالیك ڕێگەی بەوە نەداوە، کەچی لەگەڵ ئەوەشدا دەبینین لە (موطأ)دا فەرموودەی موڕسەل و مونقەتیع و و بەلاغات هەیە، ڕەنگە بۆیە ئەو فەرموودانەی هێنابێ، چونکە ئەو کات لەلای ئوممەت سابیت و زانراو بووبن و مەتنەکە لەلای زانایان بە شێواز و تەڕیقی دیکە ڕاست و دروست بێت و درۆش لە فەرموودەدا کەم بووە.

**ژمارەی شێخەکانی ئیمامی مالیك لە (موطأ)دا:**

شێخ و مامۆستاکانی ئیمامی مالیك هەزار مامۆستای جێی متمانە ڕەت دەدەن، بەڵام ئەوانەی ئیمامی مالیك لە (موطأ)دا ڕیوایەتی لێکردوون بریتین لە نەوەت و پێنج (٩٥) شێخ، وەك ئیمامی دارولقوتنی لە کتێبەکەیدا (أحاديث الموطأ) باسی کردووە.

**پلەی (موطأ) لەناو کتێبەکانی فەرموودەدا:**

ئەو بابەتەی گومانی تێدا نییە ئەوەیە (موطأ)ی ئیمامی مالیك ﷺ یەکەم پەرتووکە فەرموودە و ئەسەر و فیقە بەیەکەوە کۆ بکاتەوە، بەڵێ بەر لەو پەرتووکی دیکە نووسراون، بەڵام بەو شێواز و پاڵفتەیی و تەرتیبە نەبووە، نوسینی (موطأ) دەرگای شێوازێکی نمونەیی واڵا کرد بۆ زانایانی دوای خۆی.

جا دەربارەی پلەبەندی (موطأ) لەناو کتێبەکانی فەرموودە، زانایان ڕای جیاوازیان هەیە لەو بارەیەوە:

ئیمامی ئیبنو عەڕەبی مالیکی لە شەرحی تیرمزیدا دەڵێ: (موطأ) سەرچاوەی یەکەم و کڕۆکەکەیە، بوخاری سەرچاوەی دووەمە، لەسەر ئەو دوو سەرچاوانەش ئەوانەی دیکە بونیات نراون وەك موسلیم و ترمزی.

حافز موغلەتای جەخت لەسەر ئەوە دەکاتەوە بەوەی (موطأ) ناوی (صەحیح) ی بۆ بەکاردێت و جیاوازی لە نێوان موطأ و بوخاریدا نییە، لەبەر ئەوەی بوخاریش موعەللەقات و شتی دیکەی تێدایە (کە وەك زیادە ڕوونکردنەوە هێناویەتی و زەرەر لە فەرموودە سەرەکییەکان نادات کە گشتیان صەحیحن، (موطأ)یش بەهەمان شێوەیە).

بەڵام ئیمامی ئیبنو حەجەری عەسقەلانی (کە بۆچوونەکانی سەنگی مەحەکە)، جیاوازی خستۆتە نێوان بوخاری و (موطأ) و گوتوویەتی: لەلای هەندێك لە زانایان بەڕاستتر دانانی بوخاری بەسەر (موطأ) بۆتە ئیشکال لەگەڵ ئەوەی هەردووکیان مەرجی صەحیحی و ڕاستییان بۆ فەرموودەکانیان داناوە و لە پەرتووکەکەیان هێناویانەتەجێ لەگەڵ ئەوپەڕی بەدواداچوون و دڵنیابوونەوە، بەوەش ناکرێ بگوترێ ئەو صەحیحە لەوە چاکترە! جا وەڵامەکە ئەوەیە: ئەو قسە ڕاستە بۆ ئەصڵی بە مەرجگرتنی صەحیحیەت، ئیمامی مالیك (بەپێی ڕێبازی خۆی) پێی وا نەبووە قەتع و پچڕان لە ئیسناددا ئیشکالی هەبێت بۆ ڕاستی فەرموودە، بۆیە فەرموودەی موڕسەل و مونقەتیع و بەلاغاتی لە ئەصل و بنچینە و بابەتە سەرەکییەکانی کتێبەکەی هێناوە، بەڵام ئیمامی بوخاری (بەپێی ڕێبازی خۆی) پێی





وا بووە ئینقیتاع و پچڕانی سەنەد عیللەتە، بۆیە هەر فەرموودەیەك ئەوەی تێدابێت لە بابەتە سەرەکییەکان نەیهێناوە (بەڵکو لەو شوێنانە هێناویەتی کە سەرەکی نین). جا بێگومان هەرچەندە مونقەتیع لەلای هەندێك لە زانایان لەو فەرموودانەن کە پشتیان پێ دەبەسترێ، بەڵام خۆ موتتەصیل کە پچڕانی تێدا نییە بەهێزترە، کەواتە لەو ڕوانگەوە دەتوانرێ بگوترێ بوخاری لە (موطأ) صەحیحترە.

کەواتە: ڕوون بۆیەوە بەوەی گشت فەرموودەکانی (موطأ) صەحیح و دروستن، بەپێی مەرجی ئیمامی مالیك، بەڵام ئەگەر بە پێی مەرجی فەرموودەناسی دیکە بەراوردی بکەین، ئەوە ڕوون و ئاشکرایە مەرجی هەندێکیانی لێ نایەتەجێ، چونکە هەر موجتەهیدێك شێواز و ڕێبازێکی هەیە و لەسەری دەڕوات.

بەڵام لەگەڵ ئەوەش وەك ئیمامی ئیبنو عەبدولبەر گوتوویەتی: ئەو فەرمودانەی بەلاغاتن و قەتعیان تێدایە شەست و یەك فەرموودەن، بەڵام گشتیان لە ڕێگەی دیکەوە بە موسنەدی هاتوون و ڕاستن، تەنها چوار دانەیان نەبێ، لە ڕێگەی دیکەوە نەدۆزراونەتەوە (ڕەنگە هەر لەلای ئەو هەبووبێ، یان بەدەستمان نەگەیشتبێ، بەڵام دەبێ ئەوە بزانین ئیمامی مالیك فەرموودە لە کەسی ناڕاست ناگێڕێتەوە بە گەواهیدانی زانایانی ئوممەت).

عەللامە موحەممەدی کوڕی جەعفەری کەتتانی مالیکی گوتوویەتی: (موطأ)م لەلایە و خەتی ئیمامی مالیکیشی لەسەرە، لەگەڵ ئەوەش ناتوانین لەگەڵ بوخاری لە یەك ئاست دایبنێین، لەو ڕووەی ئیمامی بوخاری تەنها و تەنها فەرموودەی صەحیحی هێناوە (کە بە مەرجی هەموو زانایەك صەحیحن)، بەڵام لە ڕووی پێشەنگییەوە فەزڵ و گەورەیی و پێشەنگی بۆ ئەو کەسەیە کە لە زەمان لە پێشترە (واتە لەو ڕووەوە (موطأ) ی ئیمامی مالیك گەورەتر و لە پێشترە، چونکە سەرچاوەیە بۆ بوخاریش).

هەروەها گوتوویەتی: (موطأ)ی ئیمامی مالیك لە پلەبەندیدا دوای صەحیحی موسلیمە لەسەر ڕاستترین بۆچوون.

هەندێکی دیکەش لە زانایان دەیخەنە ئاستی ئەبو داود و ترمزی.

## ئایا ئەحكامی شەرعی لە كێ وەردەگیرێ؟

**خوێنەری بەڕێز، مسوڵمانی خۆشەویست!**

زۆر بە پێویستم زانی هەڵوەستەیەك بكەین لەسەر چۆنییەتی وەرگرتنی ئەحكامی شەرعی و كارپێكردنی ئەم كتێبە بەپێزە، چونكە لە ڕۆژگاری ئەمڕۆماندا خەڵكانێكی ناحاڵی بانگەشەی لێزانینی ئەحكامی شەرعی و ئیجتیهاد و فەتوا دەكەن و، خۆیان لە ورد و درشت ناپارێزن، بەڵكو حوكم و فەتوای وا دەدەن، ئەگەر حەفتا زانا لە هاوەڵانی پێغەمبەری ﷺ بۆ كۆ بكرێتەوە ناوێرن ئەو بڕیار و فەتوایە دەربكەن، بەڵگەكەشیان تەنها بینینی فەرموودەیەكە! یان تەنها ئایەتێكیان بینیوە و زاهیرەكەی وا دەخوازێ!

لە كاتێكدا لەولاوە فەرموودەی دیكە هەیە، پێچەوانەی ئەو فەرموودەیەیە كە ئەوان پشتیان پێ بەستووە، ئاگایان لێ نییە، وە جاری وا هەیە عەمەلی صەحابە هەیە بە جۆرێكی دیكەیە، یان فەرموودەیەك هەیە لاوازە و صەریحە، لە بەرانبەری ئەودا فەرموودەی دیكە هەیە صەحیحە، بەڵام صەریح نییە بە ئاماژە حوكمی پێچەوانەی ئەوەی دیكە دەگەیەنێ، وە فەرموودە هەیە سەنەدەكەی صەحیحە و مەتنەكەی موزتەڕەبە، لەولاوە فەرموودەی دژی ئەو هەیە سەنەدەكەی زەعیفەو مەتنەكەی سەحیحە و لەگەڵ قەواعیدی شەریعەت تێكدەكاتەوە، یان فەرموودەیەك هەیە جۆرە حوكمێكی لێ وەردەگیرێ، بەڵام ڕاوی فەرموودەكە خۆی كاری بە زاهیری فەرموودەكە نەكردووە، یان فەرموودەیەك هەیە بەپێی مەزهەبی نەحوی عەرەبی چەند مانای جیاواز دەگەیەنێ، یان فەرموودەیەك هەیە و لەولاشەوە ئیجماعێك هەیە پێچەوانەی زاهیری ئەو فەرموودەیەیە.

جا ئایا تۆ دەتوانی كامیان پێش كامیان بخەی؟ دەتوانیت بە ڕێگەیەكی ئوصوڵی فیقهی تایبەت بە خۆت جەمع لە نێوانی ئەو بەڵگە دژبەیەكانە بكەی؟

ئایا خۆت دەزانی لەناو ئایەت و فەرموودەكان جیاكاری بكەی، بەوەی كام دەقە موتڵەقە و كامیان موقەییەدە و چ جۆرە موقەییەدێكە و كامیان عامە و كامیان خاصە،





کامیان مەنسوخە یان خاصە، وە کام دەقە زاهیرە و کامیان نەصە، کامیان موفەسەرە و کامیان موحکەمە، کامیان خەفییە و کامیان موشکەلە، کامیان موجمەلە و کامیان موتەشابیهە، کامیان عیبارەتول نەصە و کامیان ئیشارەتول نەصە، کامیان دەلالەتول نەصە، کامیان ئیقتیزائول نەصە، کامیان مەفهومی موخالەفە دەبەخشێ و مەفهومی موخالەفە لە چ پلەیەکە، یان لە قوادیحی قیاسدا ئایا دەزانی: نەقز چییە، یان کەسر، یان عەکس، یان عەدەمی تەئسیر، یان قەلب، یان قەول بە موجیب، یان قەدحی موناسەبە یان فەرق، یان فەسادی وەزع، یان فەسادی ئیعتیبار، یان مەنعی عیللییەتی وەسف، یان مەنعی وەسفی عیللە، یان ئیختیلافی زابیت لە ئەصڵ و فەرعدا یان تەقسیم؟

ئایا پێناسەی ئەو زاراوانە دەزانیت و دەتوانیت کاتێك دەقێکت هاتە پێش هەموو ئەو بابەتانە جیابکەیتەوە و، دواتریش ڕێگەی تایبەت بە خۆتت هەبێت بۆ تەرجیحی هەندێ لەو ڕێچکانە بەسەر ڕێچکەی دیکەی ئیستینبات و خۆت یەکلایی بکەیتەوە کە مەوقیفت چۆنە بەرانبەر سەددی زەریعە و، عورف و، عەمەلی صەحابە و، قیاس و، ئیستیحسان و، ئیستیصلاح و شەرعی ئوممەتانی پێش ئێمە و وردەکاری زانستی ڕیوایە و دیرایەی حەدیس و، شارەزایی لە هەموو عیلەلەکان و، ڕیزبەندی بەهێزی ئەو دەلیلانەی ئوصوڵی فیقە و هەڵبژاردنیان بەسەر دەلیلی دیکەی ئوصوڵی و تواناداری لەسەر موناقەشەکردنی بابەتەکان لەگەڵ زانایە موجتەهیدەکان و پارێزگاریکردن لەو ڕێبازە ئیستینباتیی لەسەری دەڕۆی؟!

ئەوە تەنها چەند بابەتێکی ئوصوڵی فیقە بوو، ئەی چەند لە زانستە شەرعیەکان و زانستە عەرەبیەکان پسپۆڕی و زانای دانپێنراوی لەلای ئەهلی عیلم؟ تا بۆت گونجاوبێ قسە لەسەر دەقەکان بکەی و فەتوا نەقڵ بکەی و بگوترێ بەڵێ لە دەق و ڕونکردنەوەی زانایان تێدەگا؟!

ئایا گەیشتووی بە پلەی ئیجتیهاد، کێ دانی پێداناوی؟ چەندە شارەزای قورئان و فەرموودەی؟

موحەممەدی کوڕی عەبدوڵڵای کوڕی مونادی گوتوویەتی: گوێم لە پیاوێك بوو پرسیاری لە ئیمامی ئەحمەد کرد: بەوەی ئەگەر کەسێك سەد هەزار فەرموودە

لەبەر بکات ئایا دەبێتە شەرعزان؟ گوتی: نەخێر، گوتی: ئەدی دوو سەد هەزار؟ گوتی: نەخێر، گوتی: ئەدی سێ سەد هەزار؟ گوتی: نەخێر، گوتی: ئەدی چوار سەد هەزار؟ ئینجا بە دەستی ئاماژەی کرد و گوتی: لەوانەیە!

باشە سەیر و سەمەرە و مارکاولی نییە کەسانی عەوام و بانگخواز و قوتابی پێنەگەیشتوو و تازە پێگەیشتوو و ...هتد، خەریکن خۆیان لە پەرێزی پیشەی موجتەهیدان دەدەن و خۆیان و خەڵکی خواوەوەی خۆیان گومڕا و مارکاول دەکەن بە فەتوا بێ زانستەکانیان و حیساب نەکردنیان بۆ زانایانی موجتەهیدی ئوممەت!!!

باشە بۆ پرسیار ناکەین، بۆچی گشت موجتەهیدە هەرە گەورەکان لەسەر مەزهەب ڕۆیشتوون؟

کێ زاناترە لە ئیمامی تەحاوی و زەیلەعی و موحەممەدی کوڕی حەسەنی شەیبانی و نەسەفی و بەزدەوی و دەبوسی و سەمەرقەندی و تەنوخی و بابرتی و موصلی و عینی و لەکنەوی و صەدری شەریعە و مەلا عەلی قاری و سەرخەسی و ئالوسی و کاسانی و هەزاران زانای دیکە کە لەسەر ئوصوڵی فیقهی حەنەفی ڕۆیشتوون.

وە کێ زاناترە لە ئیمامی ئیبنو کەسیر و ئیبنو جەزەری و ئیبنو حەجەری عەسقەلانی و هەیسەمی و ئین حیببان و ئیبنو عەساکیر و ئیبنو صلاح و ئیبنو دەقیقی عید و زەکەریای ئەنصاری و عیزی کوڕی عەبدوسسەلام و ئیجی و ئامێدی و مەحەللی و حافزی عێراقی و ئیبنو جەماعە و نەوەوی و مەنناوی و ڕەمەلی و سەخاوی و جوەینی و غەزالی و بەیهەقی و شیرازی و ئیسفیراییني و ڕافیعی و شەهرستانی و قەففالی شاشی و عبدولقاهیری بەغدادی و عەبدولقاهیری جورجانی و شەعرانی و خەتیبی بەغدادی و شەربینی و سیوتی و هەزاران زانای دیکە! کە لەسەر ئوصوڵی فیقهی شافیعی ڕۆیشتوون.

وە کێ زاناترە لە ئیمامی ئیبنو وەهب و ئیبنو ماجیشون و قەڕافی و قورتوبی و شاتبی و ئیبنول عەڕەبی و باجی و ئیبنو بەتتاڵ و ئیبنو عەڕەفە و ئیبنو خەلدون و

ئەبو زەڕی هەڕەوی و ئیبنو حاجیب و دەردیر و لەقانی و مەڕزوقی و صاوی و عەبدولباقی زەرقانی و محمد زەڕقانی و ئیبنو عاشوڕ و ئیبنو بادیس و سەنوسی و قازی عیاز و ئیبنو بەتوتە و ئیبنو فەڕەحون و ئەبو بەکری باقلانی و هەزاران زانای دیکە کە لەسەر ئوصوڵی فیقهی مالیکی ڕۆیشتوون.

وە کێ زاناترە لە ئیمامی ئیبنو قودامە و ئیبنو قەیم و ئیبنو تەیمیەی نەوە و ئیبنو تەیمیەی باب و ئیبنو تەیمیەی باپیر و حازمی و ئیبنو جەوزی و بەهوتی و حەجاوی و هەزاران زانای دیکە کە لەسەر ئوصوڵی فیقهی حەنبەلی ڕۆیشتوون.

ئایا خەڵکی عەوام و بانگخواز و وتاربێژ و دەرچوویەکی شەریعە و چەند کەسێکی بەناو ئەکادیمی لەو هەموو زانایە شارەزاترن! ئایا ئەوانە موجتەهیدن؟!!! کوانێ ئوصوڵی ئیجتیهادیان!

بۆیە خوێنەری ئازیز!

ئەگەر فەرموودەیەکت لە پەرتووکێکی فەرموودەدا بینی دەربارەی ئەحکام، ئەوە نابێ خۆت شەرح و تێگەیشتن و حوکمی لێ وەربگری و بیکەیتە هەموو دین و پێت وابێ بۆچونی تر نییە، یان بۆچونی تر بەڵگەی نییە، یان لەسەر قوڕئان و سوننەت نییە هەر ئەوە نەبێ، بەڵکو دەبێ بگەڕێیتەوە بۆ لای زانایانی موجتەهیدی ئوممەت و لەسەر فەتوای ئەوان بڕۆیت، چونکە قوڕئان و فەرموودە بەڵگەیە بۆ کەسی موجتەهید نەك غەیری موجتەهید، غەیری موجتەهید قوڕئان و فەرموودەی بۆ نییە لە بابەتە ئەحکامەکاندا، بەڵکو فەتوای موجتەهیدانی بۆ هەیە کە بە بەڵگەی قوڕئان و فەرموودە داویانە بە پێی جێبەجێکردنی ئوصوڵی فیقهی تایبەتی خۆیان بۆ تێگەیشتنی ئەو قوڕئان و سوننەتە.

وە دەبێ لەوە تێبگەین حەتمەن دەبێ لەسەر (أصول الفقه)ێك بڕۆین، چوار مەزهەبەکەش ئەوەیان بڕاندۆتەوە بۆیە گشت موجتەهیدە گەورەکان دوای دامەزراندنی ئوصوڵی فیقهی ئەو چار مەزهەبە ئیجتیهادیان لە چوارچێوەی ئەو چوار مەزهەبە سەرەکیە کردووە.



وە دەبێ ئەوەش بزانین بۆچوونی جیاواز دروست نابێ ئەگەر بەڵگەی جیاواز بوونی نەبێ، کەواتە بزانە هیچ موجتەهیدێك نییە بەڵگەی نەبێ، وە دەبێ لەوەش حاڵی بین و بزانین موجتەهید بە (أصول الفقه) ئیجتیهاد لە بەڵگەکاندا دەکات، ئەوەی ئەمڕۆ خەڵك دەستی داوەتێ و خۆی بە ئایەتێك و فەرموودەیەك دەیبڕێنێتەوە و خۆی بەسەر مەزهەبەکان و زانایان فەرز دەکات، ئەوە کارەساتێکی گەورەیە و عاقیبەتەکەی زۆر سەختە، پەنا بە خوا.

بەڕاستی سەیرە خەڵکانێك هەن موجتەهید نین و پێیان وایە خۆیان دەتوانن شوێنی قورئان و فەرموودە بکەون لەکاتێکدا ڕەنگە تەنها تەرجەمە بزانن هەشە ئەوەش نازانێ و پێی وایە شوێنکەوتنی زانایانی پێویست نییە! ئەدی زانایان بۆ چین؟!!! إنا لله وإنا إليه راجعون.

اللهم وفقنا لما تحبه وترضاه، وفقّهنا في دينك، وارزقنا اتباع عبادك العلماء في فهم كتابك وسنة نبيك

[فَاسْأَلُوا أَهْلَ الذِّكْرِ إِنْ كُنْتُمْ لَا تَعْلَمُونَ] [النحل:٤٣]



# پەرتووکی

# کاتەکانی نوێژ[1]



---

(١) ـ كِتَابُ وُقُوتِ الصَّلَاةِ.

تێبینی: بۆیە ئیمامی مالیك (رحمه الله) بە «کاتەکانی نوێژ» دەست بە کتێبەکەی دەکات، نەك بە باسی تەهارەت و پاککردنەوە، چونکە هەتا کاتی نوێژ نەیێت مرۆڤی مسوڵمان نوێژی لەسەر واجب نابێت و پێویستی بە خۆپاککردنەوە و ئامادەکاری نابێت بۆ نوێژ، کەواتە کات سەرەتای بابەتەکەیە.




## ١- دەربارەی کاتەکانی نوێژ[١]

١- عَنِ ابْنِ شِهَابٍ ﷺ، أَنَّ عُمَرَ بْنَ عَبْدِ الْعَزِيزِ ﷺ أَخَّرَ الصَّلَاةَ يَوْمًا، فَدَخَلَ عَلَيْهِ عُرْوَةُ بْنُ الزُّبَيْرِ ﷺ، فَأَخْبَرَهُ أَنَّ الْمُغِيرَةَ بْنَ شُعْبَةَ ﷺ أَخَّرَ الصَّلَاةَ يَوْمًا - وَهُوَ بِالْكُوفَةِ - فَدَخَلَ عَلَيْهِ أَبُو مَسْعُودٍ الأَنْصَارِيُّ ﷺ فَقَالَ: مَا هَذَا يَا مُغِيرَةُ؟ أَلَيْسَ قَدْ عَلِمْتَ أَنَّ جِبْرِيلَ نَزَلَ فَصَلَّى، فَصَلَّى رَسُولُ اللَّهِ ﷺ، ثُمَّ صَلَّى، فَصَلَّى رَسُولُ اللَّهِ ﷺ، ثُمَّ صَلَّى، فَصَلَّى رَسُولُ اللَّهِ ﷺ، ثُمَّ صَلَّى، فَصَلَّى رَسُولُ اللَّهِ ﷺ، ثُمَّ صَلَّى، فَصَلَّى رَسُولُ اللَّهِ ﷺ ثُمَّ قَالَ: بِهَذَا أُمِرْتُ، فَقَالَ عُمَرُ بْنُ عَبْدِ الْعَزِيزِ: اعْلَمْ مَا تُحَدِّثُ بِهِ يَا عُرْوَةُ، أَوَ إِنَّ جِبْرِيلَ هُوَ الَّذِي أَقَامَ لِرَسُولِ اللَّهِ ﷺ وَقْتَ الصَّلَاةِ؟ قَالَ عُرْوَةُ: كَذَلِكَ كَانَ بَشِيرُ بْنُ أَبِي مَسْعُودٍ الأَنْصَارِيُّ، يُحَدِّثُ عَنْ أَبِيهِ[٢].

واتە: لە ئیبنو شیهابەوە ﷺ گێردراوەتەوە، گوتوویەتی: عومەری کوڕی عەبدولعەزیز ﷺ ڕۆژێك نوێژی دواخست، عورِوەی کوڕی زوبەیریش ﷺ چوو بۆ لای و پێی ڕاگەیاند بەوەی موغیرەی کوڕی شوعبە ﷺ ڕۆژێك نوێژی دواخست (کە لە کوفە بوو)، ئەبو مەسعودی ئەنصاریش ﷺ چوو بۆ لای و گوتی: ئەوە چییە ئەی موغیرە؟ ئایا نەتزانیوە کە جبریل ﷺ دابەزیوە بۆ لای پێغەمبەری خوا ﷺ و نوێژی کردووە، پێغەمبەری خواش ﷺ نوێژی کردووە، دواتر نوێژێکی دیکەی کردووە، پێغەمبەری خواش ﷺ نوێژی کردووە، دواتر نوێژێکی دیکەی کردووە، پێغەمبەری خواش ﷺ نوێژی کردووە، دواتر نوێژێکی دیکەی کردووە، پێغەمبەری خواش ﷺ نوێژی کردووە، دواتر نوێژێکی دیکەی کردووە، پێغەمبەری خواش ﷺ نوێژی کردووە، دواتر جبریل ﷺ فەرمووی: بەوە فەرمانم پێکراوە (کە بەو شێوەیە نوێژت بۆ ڕوون بکەمەوە)، عومەری کوڕی عەبدولعەزیز ﷺ گوتی: جوان ئاگاداربە بەوەی دەیگێڕیتەوە ئەی عورِوە ﷺ، ئایا جبریل ﷺ کاتی نوێژی بۆ پێغەمبەری خوا ﷺ دیاری کردووە؟ (عورِوە ﷺ) گوتی: (بەڵێ)، بەشیری کوڕی ئەبو مەسعود ﷺ لە باوکیەوە ئاوا دەگێڕێتەوە.

---

(١) ـ بابُ وُقُوتِ الصَّلَاةِ.

(٢) ـ صحيح. أخرجه أبو مصعب الزهري: ١؛ والحدثاني: ٢؛ وابن حنبل: ٢٢٤٠٧؛ والبخاري: ٥٢١؛ ومسلم: ١٦٧؛ وابن حبان: ١٤٥٠؛ والدارمي: ١١٨٥؛ والقابسي: ٤٥، كلهم عن مالك.




٢- قَالَ عُرْوَةُ ﵀: وَلَقَدْ حَدَّثَتْنِي عَائِشَةُ ﵂ زَوْجُ النَّبِيِّ ﷺ، أَنَّ رَسُولَ اللَّهِ ﷺ كَانَ يُصَلِّي الْعَصْرَ، قَبْلَ أَنْ تَظْهَرَ[1].

واتە: عورِوە ﵀ گوتوویەتی: بەدڵنیایی عائیشە ﵂ بۆی گێڕامەوە کە پێغەمبەری خوا ﷺ نوێژی عەسری دەکرد (لە کاتێکدا هێشتا تیشکی خۆر لە ژوورەکەی عائیشە ﵂ بوو)، پێش ئەوەی بەرزبێتەوە و لابچێ (واتە: لە سەرەتای کات نوێژی عەسری کردووە).

٣- عَنْ عَطَاءِ بْنِ يَسَارٍ ﵀، أَنَّهُ قَالَ: جَاءَ رَجُلٌ إِلَى رَسُولِ اللَّهِ ﷺ، فَسَأَلَهُ عَنْ وَقْتِ صَلاَةِ الصُّبْحِ. قَالَ: فَسَكَتَ عَنْهُ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ حَتَّى إِذَا كَانَ مِنَ الْغَدِ، صَلَّى الصُّبْحَ حِينَ طَلَعَ الْفَجْرُ، ثُمَّ صَلَّى الصُّبْحَ مِنَ الْغَدِ بَعْدَ أَنْ أَسْفَرَ. ثُمَّ قَالَ: أَيْنَ السَّائِلُ عَنْ وَقْتِ الصَّلاَةِ؟ قَالَ: هَأَنَذَا يَا رَسُولَ اللَّهِ فَقَالَ: مَا بَيْنَ هَذَيْنِ وَقْتٌ[2].

واتە: لە عەتائی کوڕی یەسارەوە ﵀ گێڕدراوەتەوە، گوتوویەتی: پیاوێك هات بۆ لای پێغەمبەری خوا ﷺ و پرسیاری لێکرد دەربارەی کاتی نوێژی بەیانی، دەڵێ: پێغەمبەری خوا ﷺ لێی بێدەنگ بوو، تا کاتێ ڕۆژی دواتر داهات، نوێژی بەیانی کرد لەو کاتەی بەیان هەڵدێ، دواتر بۆ ڕۆژی دواتر نوێژی بەیانی کرد کاتێك دونیا ڕووناك داهات، دواتر فەرمووی: کوانێ پرسیارکەرەکە دەربارەی کاتی نوێژ (ی بەیانی)؟ (پیاوەکە) گوتی: ئەوەتا لێرەم ئەی پێغەمبەری خوا، پێغەمبەری خوا ﷺ فەرمووی: کاتی بەیانی لەنێوان ئەم دوو کاتەیە[3].

---

(١) - صحيح. أخرجه أبو مصعب الزهري: ٢؛ والشيباني: ٢؛ والبخاري: ٥٢١؛ ومسلم: ١٦٨،١٦٦؛ وأبو داود: ٤٠٧. كلهم عن مالك.

(٢) - صحيح لغيره. أخرجه أبو مصعب الزهري: ٣؛ والحدثاني: ٣؛ والنسائي: ٥٤٤، ٦٤٢. كلهم عن مالك به.

(٣) ـ تێبینی: واتە کاتی سەرەتا بریتییە لەو کاتەی بەیان هەڵدێ، کاتی کۆتاییش بریتییە لەو کاتەی ڕووناك دادێ، پێش خۆرهەڵاتن.




٤- عَنْ عَائِشَةَ ﵂ زَوْجِ النَّبِيِّ ﷺ، أَنَّهَا قَالَتْ: إِنْ كَانَ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ لَيُصَلِّي الصُّبْحَ، فَيَنْصَرِفُ النِّسَاءُ مُتَلَفِّعَاتٍ بِمُرُوطِهِنَّ، مَا يُعْرَفْنَ مِنَ الْغَلَسِ(١).

واتە: لە عائیشەی ﵂ خێزانی پێغەمبەرەوە ﷺ گێردراوەتەوە گوتوویەتی: پێغەمبەری خوا ﷺ نوێژی بەیانی دەکرد، ئافرەتان دەگەڕانەوە ماڵەوە (لە نوێژی بە کۆمەڵ) سەراپا خۆیان دەپێچایەوە بە جلەکانیان، نەدەناسرانەوە (نەدەزانرا ئاخۆ پیاون یان ئافرەتن، یانیش نەدەناسرانەوە کامیان کام ئافرەتەیە) لەبەر تاریکی کۆتایی شەو(٢).

٥- عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ ﵁، أَنَّ رَسُولَ اللَّهِ ﷺ قَالَ: مَنْ أَدْرَكَ رَكْعَةً مِنَ الصُّبْحِ، قَبْلَ أَنْ تَطْلُعَ الشَّمْسُ فَقَدْ أَدْرَكَ الصُّبْحَ، وَمَنْ أَدْرَكَ رَكْعَةً مِنَ الْعَصْرِ قَبْلَ أَنْ تَغْرُبَ الشَّمْسُ فَقَدْ أَدْرَكَ الْعَصْرَ(٣).

واتە: لە ئەبو هورەیرەوە ﵁ گێردراوەتەوە (گوتوویەتی): پێغەمبەری خوا ﷺ فەرموویەتی: هەر کەسێك بە ڕکاتێك ڕابگات لە نوێژی بەیانی پێش ئەوەی ڕۆژ هەڵبێ، ئەوە بە نوێژی بەیانی ڕاگەیشتووە، وە هەر کەسێك بە ڕکاتێك ڕابگات لە نوێژی عەسر پێش ئەوەی ڕۆژ ئاوا ببێ، ئەوە بە نوێژی عەسر ڕاگەیشتووە(٤).

---

(١) - صحيح. أخرجه أبو مصعب الزهري: ٤؛ والحدثاني: ٤؛ والشافعي: ١١٢؛ وابن حنبل: ٢٥٤٩٣؛ والبخاري: ٨٦٧؛ ومسلم: المساجد: ٢٣٢؛ والنسائي: ٥٤٥؛ وأبو داود: ٤٢٣؛ والترمذي: ١٥٣؛ وابن حبان: ١٤٩٨؛ والقابسي: ٤٩٤، كلهم عن مالك به.

(٢) ـ تێبینی: واتە مەبەستی ئەوەیە زوو نوێژی بەیانی ئەنجام دراوە بە کاتی تاریکی، ڕاستەوخۆ دوای هەڵاتنی بەیان، ئەوەش تێکگیران دروست ناکا لەگەڵ ئەو فەرموودەی دەڵێ: کەسی تەنیشتەخۆمان دەناسیەوە، چونکە ئەوە لە حاڵەتی نزیکی و لێ وردبونەوەیە.

(٣) - صحيح. أخرجه أبو مصعب الزهري: ٥؛ والحدثاني: ٤؛ والشيباني: ١٨٥؛ وابن حنبل: ٩٩٥٥؛ والبخاري: ٥٧٩؛ ومسلم: ٦٠٨؛ والنسائي: ٥١٧؛ والترمذي: ١٨٦؛ وابن حبان: ١٥٥٧؛ والدارمي: ١٢٢٢؛ وشرح معاني الآثار: ٩١٣، كلهم عن مالك به.

(٤) ـ تێبینی: مەبەست ئەوەیە کاتی بەیانی دەمێنێ تا خۆرهەڵاتن، کاتی عەسریش دەمێنێ تا خۆرئاوابوون.





٦- عَنْ نَافِعٍ مَوْلَى عَبْدِ اللَّهِ بْنِ عُمَرَ ﵄، أَنَّ عُمَرَ بْنَ الْخَطَّابِ ﵁ كَتَبَ إِلَى عُمَّالِهِ: إِنَّ أَهَمَّ أَمْرِكُمْ عِنْدِي الصَّلاَةُ، فَمَنْ حَفِظَهَا وَحَافَظَ عَلَيْهَا، حَفِظَ دِينَهُ، وَمَنْ ضَيَّعَهَا فَهُوَ لِمَا سِوَاهَا أَضْيَعُ، ثُمَّ كَتَبَ: أَنْ صَلُّوا الظُّهْرَ، إِذَا كَانَ الْفَيْءُ ذِرَاعًا، إِلَى أَنْ يَكُونَ ظِلُّ أَحَدِكُمْ مِثْلَهُ، وَالْعَصْرَ وَالشَّمْسُ مُرْتَفِعَةٌ بَيْضَاءُ نَقِيَّةٌ، قَدْرَ مَا يَسِيرُ الرَّاكِبُ فَرْسَخَيْنِ أَوْ ثَلاَثَةً، قَبْلَ غُرُوبِ الشَّمْسِ، وَالْمَغْرِبَ إِذَا غَرَبَتِ الشَّمْسُ، وَالْعِشَاءَ إِذَا غَابَ الشَّفَقُ إِلَى ثُلُثِ اللَّيْلِ، فَمَنْ نَامَ فَلاَ نَامَتْ عَيْنُهُ، فَمَنْ نَامَ فَلاَ نَامَتْ عَيْنُهُ فَمَنْ نَامَ فَلاَ نَامَتْ عَيْنُهُ، وَالصُّبْحَ وَالنُّجُومُ بَادِيَةٌ مُشْتَبِكَةٌ[1].

واتە: لە نافیعی خزمەتكاری ئازادكراوی عەبدوڵڵای كوڕی عومەرەوە ﵄ گێڕدراوەتەوە (گوتوویەتی): عومەری كوڕی خەتتاب ﵁ بۆ فەرمانبەرەكانی خۆی نووسی: گرنگترین كارتان لەلای من نوێژە، هەر كەسێك كاتەكانیان لەبەر بكات و پارێزگاری لە ئەنجامدانیان بكات ئەوە ئایینی خۆی پاراستووە، هەركەسێكیش بیانفەوتێنێ (واتە: كەمتەرخەمی بكات: بە دواخستن یان چوواندنیان)، ئەوە شتی دیكە زیاتر بە زایە دەدات، (چونكە ئەگەر واجب و سوننەتی بچووكتری نەفاوتاندبێ، بوێری ئەوە ناكات ئەو واجبە گەورانە بفەوتێنێ)، دواتر نووسی: نوێژی نیوەڕۆ ئەنجام بدەن كاتێ سێبەر باڵێك درێژ دەبێتەوە (دوای لادانی ڕۆژ لە ناوەڕاستی ئاسمان) تا سێبەری هەر یەكێكتان هێندەی خۆی درێژ دەبێتەوە (كاتەكەی هەر دەمێنێ)، وە نوێژی عەسریش بكەن لە كاتێكدا خۆر بەرز و ڕوون و بەتینە (هێشتا لێڵ نەبووە بۆ ئاوابوون)، بە ئەندازەی ڕۆیشتنی كەسی سوار دوو یان سێ فەرسەخ، پێش خۆر ئاوابوون، نوێژی مەغریبیش كاتێك بكەن كە خۆر ئاوا دەبێ، نوێژی عیشاش بكەن كاتێ سوورایەتی ئاسمان ون دەبێ تا سێیەكی شەو، جا هەر كەسێك (پێشی نوێژی عیشا) بخەوێ دەك چاوی نەچێتە خەو (ئیسراحەت نەكات)، هەر كەسێك بخەوێ دەك چاوی نەچێتە خەو، هەر كەسێك بخەوێ دەك چاوی نەچێتە خەو، نوێژی بەیانیش بكەن لە كاتێكدا ئەستێرەكان دیار و تێكەڵ و بەناویەكدا پرژاون.

---

(١) - ضعيف. أخرجه أبو مصعب الزهري: ٦؛ والحدثاني: ٥، عن مالك به.




٧- أَنَّ عُمَرَ بْنَ الْخَطَّابِ ﷺ كَتَبَ إِلَى أَبِي مُوسَى ﷺ: أَنْ صَلِّ الظُّهْرَ، إِذَا زَاغَتِ الشَّمْسُ، وَالْعَصْرَ وَالشَّمْسُ بَيْضَاءُ نَقِيَّةٌ، قَبْلَ أَنْ يَدْخُلَهَا صُفْرَةٌ، وَالْمَغْرِبَ إِذَا غَرَبَتِ الشَّمْسُ، وَأَخِّرِ الْعِشَاءَ مَا لَمْ تَنَمْ، وَصَلِّ الصُّبْحَ، وَالنُّجُومُ بَادِيَةٌ مُشْتَبِكَةٌ، وَاقْرَأْ فِيهَا بِسُورَتَيْنِ طَوِيلَتَيْنِ مِنَ الْمُفَصَّلِ(١).

واتە: عومەری کوڕی خەتتاب ﷺ بۆ ئەبو موسای ﷺ نووسی: نوێژی نیوەڕۆ بکە کاتێك خۆر لادەدات لە ناوەڕاستی ئاسمان، نوێژی عەسریش بکە لە کاتێکدا خۆر ڕووناك و ساف و بەتینە، پێش ئەوەی زەردایەتی بکەوێتە ناو، وە نوێژی مەغریب بکە کاتێك خۆر ئاوا دەبێ، وە نوێژی عیشا دوا بخە مادەم ناخەوی، وە نوێژی بەیانی بکە لە کاتێکدا ئەستێرەکان دیارن و تێکەڵن، جا تیایدا دوو سوڕەتی درێژ لە موفەصصەڵەکان بخوێنە(٢).

٨- عَنْ هِشَامِ بْنِ عُرْوَةَ ﷺ، عَنْ أَبِيهِ ﷺ، أَنَّ عُمَرَ بْنَ الْخَطَّابِ ﷺ كَتَبَ إِلَى أَبِي مُوسَى الأَشْعَرِيِّ ﷺ أَنْ صَلِّ الْعَصْرَ وَالشَّمْسُ بَيْضَاءُ نَقِيَّةٌ، قَدْرَ مَا يَسِيرُ الرَّاكِبُ ثَلاَثَةَ فَرَاسِخَ، وَأَنْ صَلِّ الْعِشَاءَ، مَا بَيْنَكَ وَبَيْنَ ثُلُثِ اللَّيْلِ، فَإِنْ أَخَّرْتَ فَإِلَى شَطْرِ اللَّيْلِ، وَلاَ تَكُنْ مِنَ الْغَافِلِينَ(٣).

واتە: لە هیشامی کوڕی عوڕووەوە ﷺ گێڕدراوەتەوە، ئەویش لە باوکیەوە ﷺ گێڕاویەتەوە (گوتوویەتی): عومەری کوڕی خەتتاب ﷺ بۆ ئەبو موسای ﷺ نووسی: نوێژی عەسر بکە لە کاتێکدا خۆر ساف و بەتینە (جا دوای ئەوەش کاتەکەی هەر بەردەوام دەمێنێ) تا کەسی سوار سێ فەرسەخ ڕێ دەکات (کە گەیشت بەو کاتە دەبێتە نوێژی مەغریب)، نوێژی عیشا بکە لە کاتێکدا لەناو سێیەکی یەکەمی شەوی، جا ئەگەر ویستت زیاتر دوای بخەی با هەتا نیوەی شەو بێت (لەوە زیاتر دوای مەخە)، وە (ئاگاداربە) نەبیتە یەکێك لە بێئاگایان (بەوەی کەمتەرخەمی لە کات و چۆنییەتی نوێژەکانت بکەی).

---

(١) - صحيح. أخرجه أبو مصعب الزهري: ٧ في وقوت الصلاة؛ والحدثاني: ٦ في المواقيت، عن مالك به.

(٢) ـ تێبینی: سوڕەتە موفەصصەڵەکان بریتین لەو سوڕەتانەی ئایەتیان کورتن و فەصڵی زۆریان تێدایە، کە لە سوڕەتی قافەوە دەست پێ دەکات تا کۆتایی قورئان.

(٣) - ضعيف. أخرجه أبو مصعب الزهري: ٨ في وقوت الصلاة؛ والحدثاني: ٦ أ في المواقيت، عن مالك به.



٩- عَنْ عَبْدِ اللَّهِ بْنِ رَافِعٍ مَوْلَى أُمِّ سَلَمَةَ ﵂، زَوْجِ النَّبِيِّ ﷺ، أَنَّهُ سَأَلَ أَبَا هُرَيْرَةَ ﵁ عَنْ وَقْتِ الصَّلَاةِ؟ فَقَالَ أَبُو هُرَيْرَةَ ﵁: أَنَا أُخْبِرُكَ صَلِّ الظُّهْرَ إِذَا كَانَ ظِلُّكَ مِثْلَكَ وَالْعَصْرَ إِذَا كَانَ ظِلُّكَ مِثْلَيْكَ، وَالْمَغْرِبَ إِذَا غَرَبَتِ الشَّمْسُ، وَالْعِشَاءَ مَا بَيْنَكَ وَبَيْنَ ثُلُثِ اللَّيْلِ، وَصَلِّ الصُّبْحَ بِغَبَشٍ يَعْنِي الْغَلَسَ[١].

واتە: لە عەبدوڵڵای کوڕی ڕافیعی خزمەتکاری ئازادکراوی ئوممو سەلەمەی ﵂ خێزانی پێغەمبەرەوە ﷺ گێڕدراوەتەوە، پرسیاری لە ئەبو هوڕەیڕە ﵁ کرد دەربارەی کاتی نوێژ؟ ئەبو هوڕەیڕەش ﵁ گوتی: من هەواڵت پێدەدەم، نوێژی نیوەڕۆ لەو کاتەدا بکە کە سێبەری خۆت بە ئەندازەی خۆتی لێهات، وە نوێژی عەسر لەو کاتەدا بکە کە سێبەری خۆت دوو هێندەی خۆتی لێ هات، وە نوێژی مەغریبیش لەو کاتەدا بکە کە خۆر بە تەواوی ئاوا دەبێ، وە نوێژی عیشا بکە لە سێیەکی (یەکەمی) شەودا، وە نوێژی بەیانیش بە تاریك و ڕونی بکە (ئەو کاتەی دونیا هێشتا تاریك و ڕونە).

١٠- عَنْ أَنَسِ بْنِ مالِكٍ ﵁ أَنَّهُ قَالَ: كُنَّا نُصَلِّي الْعَصْرَ، ثُمَّ يَخْرُجُ الإِنْسَانُ إِلَى بَنِي عَمْرِو بْنِ عَوْفٍ، فَيَجِدُهُمْ يُصَلُّونَ الْعَصْرَ[٢].

واتە: ئەنەسی کوڕی مالیك ﵁ گوتوویەتی: ئێمە نوێژی عەسرمان دەکرد (لە سەرەتای کاتی عەسر)، دواتر کەسێك دەردەچوو بۆ لای بەنو عەمری کوڕی عەوف (کە ماڵەکانیان دوو میل لە مەدینەوە دوور بوو)، دەیبینی ئەوان نوێژی عەسر دەکەن (مەبەست ئەوەیە لە مزگەوتی پێغەمبەری خوا ﷺ لە سەرەتای عەسردا نوێژەکەیان کردووە)[٣].

---

(١) - صحيح. أخرجه أبو مصعب الزهري: ١٠ في وقوت الصلاة؛ والحدثاني: ٧أفي المواقيت؛ والشيباني: ١ في الصلاة، كلهم عن مالك به.

(٢) - صحيح. أخرجه أبو مصعب الزهري: ٩ في وقوت الصلاة؛ والحدثاني: ٧ في المواقيت؛ والشيباني: ٤ في الصلاة؛ والبخاري: ٥٤٨ في مواقيت الصلاة عن طريق عبد الله ابن مسلمة؛ ومسلم: المساجد: ١٩٤ عن طريق يحيى بن يحيى؛ والقابسي: ١٢٢، كلهم عن مالك به.

(٣) ـ تێبینی: دوو میل دەکاتە سێ کیلۆمەتر و هەندێك، جا لە مزگەوتیش تا کۆتایی مەدینە جگە لەو سێ کیلۆمەترە مەودایێکی دیکەش هەبووە.

**١١-** عَنْ أَنَسِ بْنِ مالِكٍ ﷺ أَنَّهُ قَالَ: كُنَّا نُصَلِّي الْعَصْرَ، ثُمَّ يَذْهَبُ الذَّاهِبُ إِلَى قُبَاءٍ، فَيَأْتِيهِمْ وَالشَّمْسُ مُرْتَفِعَةٌ(١).

واتە: ئەنەسی كوڕی مالیك ﷺ گوتوویەتی: ئێمە نوێژی عەسرمان دەكرد، دواتر كەسێك دەچوو بۆ قوبا (كە فەرسەخێك لە مەدینەوە دوورە)، جا دەچووە لایان لە كاتێكدا دەگەیشتنە لایان هێشتا خۆر بەرز بوو(٢).

**١٢-** عَنِ الْقَاسِمِ بْنِ مُحَمَّدٍ ﷺ أَنَّهُ قَالَ: مَا أَدْرَكْتُ النَّاسَ إِلاَّ وَهُمْ يُصَلُّونَ الظُّهْرَ بِعَشِيٍّ(٣).

واتە: لە قاسمی كوڕی موحەممەدەوە ﷺ گێڕدراوەتەوە گوتوویەتی: ئەوەندەی گەیشتووم بە خەڵكی هەر نوێژی نیوەڕۆیان كردووە، لە دوای ئەوەی خۆر باڵێك لە ناوەڕاستی ئاسمان لایداوە.

## ٢- كاتی هەینی(٤)

**١٣-** عَنْ مَالِكٍ ﷺ عَنْ عَمِّهِ أَبِي سُهَيلِ بْنِ مَالِكٍ، عَنْ أَبِيهِ، أَنَّهُ قَالَ: كُنتُ أَرَى طِنْفَسَةً لِعَقِيلِ بنِ أَبِي طَالِبٍ ﷺ، يومَ الْجُمُعَةِ تُطرَحُ إلى جِدَارِ الْمَسْجِدِ الْغَرْبِيِّ، فَإِذَا غَشِيَ الطِّنْفِسَةَ كُلَّهَا ظِلُّ الْجِدَارِ خَرَجَ عُمَرُ بْنُ الْخَطَّابِ وَصَلَّى الْجُمُعَةَ.

قَالَ مَالِكٌ وَالِدُ أَبِي سُهَيلٍ ﷺ: ثُمَّ نَرْجِعُ بَعْدَ صَلاَةِ الْجُمُعَةِ فَنَقِيلُ قَائِلَةَ الضَّحَاءِ(٥).

واتە: ئیمامی مالیك ﷺ لە مامیەوە ئەبو سوهەیلی كوڕی مالیكەوە گێڕاویەتەوە، ئەویش لە باوكیەوە گێڕاویەتەوە گوتوویەتی: من بەڕ یان لاكێشەیەكی بچكۆلانەم

---

(١) ـ صحيح. أخرجه أبو مصعب الزهري: ١١ في وقوت الصلاة؛ والشيباني: ٣ في الصلاة؛ والبخاري: ٥٥١ في مواقيت الصلاة؛ ومسلم: المساجد: ١٩٣؛ والنسائي: ٥٠٦ في المواقيت؛ والقابسي: ٥، كلهم عن مالك به.

(٢) ـ تێبینی: فەرسەخێك دەكاتە نزیكەی شەش كیلۆمەتر.

(٣) ـ صحيح. أخرجه أبو مصعب الزهري: ١٢ في وقوت الصلاة؛ والحدثاني: ٨ في المواقيت، عن مالك به.

(٤) ـ وَقْتُ الْجُمُعَةِ.

(٥) ـ مقطوع صحيح. أخرجه أبو مصعب الزهري: ١٣ في وقوت الصلاة؛ والحدثاني: ٩ في المواقيت؛ والشيباني: ٢٢٣ في الصلاة، كلهم عن مالك به.

دەبینی هی عەقیلی کوڕی ئەبو تاڵیب ﷺ بوو، لە ڕۆژی هەینیدا هەڵدەدرایە ژێر دیواری خۆرئاوای مزگەوت (ی پێغەمبەری خوا ﷺ)، جا کاتێك سێبەری دیوارەکە گشت لاکێشەکەی دادەپۆشی، ئیمامی عومەر ﷺ دەهاتە دەرەوە و نوێژی هەینی دەکرد.

مالیکی باوکی ئەبو سوهەیل ﷺ (کە دەکاتە باپیری ئیمامی مالیك) گوتوویەتی: ئێمە دوای نوێژی هەینی دەگەڕاینەوە و قەیلولەی پێش نیوەڕۆمان قەرەبوو دەکردەوە و کەمێك دەخەوتین[(١)].

١٤- أَنَّ عُثْمَانَ بْنَ عَفَّانَ ﷺ صَلَّى الْجُمُعَةَ بِالْمَدِينَةِ، وَصَلَّى الْعَصْرَ بِمَلَلٍ.

قَالَ مَالِكٌ ﷺ: وَذَلِكَ لِلتَّهْجِيرِ وَسُرْعَةِ السَّيْرِ[(٢)].

واتە: عوسمانی کوڕی عەففان ﷺ نوێژی هەینی لە مەدینە کرد و نوێژی عەسریشی لە مەلەل کرد[(٣)].

ئیمامی مالیك ﷺ گوتوویەتی: لەبەر ئەوە توانیویەتی بە نوێژی عەسر ڕابگات لە مەلەل، چونکە لە سەرەتای نیوەڕۆ (کە دەکاتە دوای لادانی خۆر بەرەو خۆرئاوا) هەینی کردووە و خێراش ڕۆیشتووە[(٤)].

---

(١) ـ (کە شوێنێکە دەکەوێتە نێوان مەککە و مەدینە، حەڤدە میل لە مەدینەوە دوورە) تێبینی: مەبەستی فەرموودەکە ئەوەیە: ئیمامی عوسمان ﷺ نوێژی هەینی دوای هاتنی کاتی نوێژی نیوەڕۆ ئەنجامداوە.

(٢) ـ موقوف حسن. أخرجه أبو مصعب الزهري: ١٤ في وقوت الصلاة؛ والحدثاني: ٩ أ في المواقيت، عن مالك به.

(٣) ـ تێبینی: حەڤدە میل دەکاتە نزیکەی بیست و حەوت کیلۆمەتر و نیو.

(٤) ـ تێبینی: مەبەستی فەرموودەکە ئەوەیە: ئیمامی عومەر ﷺ ڕاستەوخۆ نوێژی هەینی دوای هاتنی کاتی نوێژی نیوەڕۆ ئەنجام داوە.

## ٣- بابەت: هەر کەسێك بگات بە ڕکاتێك لە نوێژ[١]

**١٥- عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ ﷺ أَنَّ رَسُولَ اللَّهِ ﷺ قَالَ: مَنْ أَدْرَكَ رَكْعَةً مِنَ الصَّلاَةِ فَقَدْ أَدْرَكَ الصَّلاَةَ[٢].**

واتە: لە ئەبو هوڕەیڕەوە ﷺ گێڕدراوەتەوە گوتوویەتی: پێغەمبەری خوا ﷺ فەرموویەتی: هەر کەسێك بگات بە ڕکاتێکی نوێژ، ئەوە بەو نوێژە ڕاگەیشتووە.

**١٦- عَنْ نَافِعٍ ﷺ، أَنَّ عَبْدَ اللهِ بْنَ عُمَرَ بْنِ الْخَطَّابِ ﷺ كَانَ يَقُولُ: إِذَا فَاتَتْكَ الرَّكْعَةُ فَقَدْ فَاتَتْكَ السَّجْدَةُ[٣].**

واتە: لە نافیعەوە ﷺ گێڕدراوەتەوە (گوتوویەتی) عەبدوڵڵای کوڕی عومەری کوڕی خەتتاب ﷺ دەیگوت: ئەگەر ڕکوعت لەدەست چوو (واتە لە نوێژی بەکۆمەڵ لە ڕکوعدا نەگەیشتی بە ئیمام) ئەوە سوژدەکەشت بەفیڕۆ چووە (چونکە حیسابی بۆ ناکرێ هەرچەندە ئەنجامیشی بدەی).

**١٧- أَنَّ عَبْدَ اللهِ بْنَ عُمَرَ وَزَيْدَ بْنَ ثَابِتٍ ﷺ كَانَا يَقُولاَنِ: مَنْ أَدْرَكَ الرَّكْعَةَ فَقَدْ أَدْرَكَ السَّجْدَةَ[٤].**

واتە: لە عەبدوڵڵای کوڕی عومەر و زەیدی کوڕی سابیتەوە ﷺ گێڕدراوەتەوە دەیانگوت: هەر کەسێك بگات بە ڕکوع (واتە لە نوێژی بەکۆمەڵ لە ڕکوعدا بگات بە ئیمام) ئەوە گەیشتووە بە سوژدەکەش (واتە سوژدەکەی جێگای خۆی گرتووە و لێی هەڵنەوەشاوەتەوە بەهۆی نەگەیشتن بە فاتیحە).

---

(١) ـ مَنْ أَدْرَكَ رَكْعَةً مِنَ الصَّلاَةِ.

(٢) ـ صحيح. أخرجه أبو مصعب الزهري: ١٦ في وقوت الصلاة؛ والحدثاني: ١٠ في المواقيت؛ والشيباني: ١٣١ في الصلاة؛ والبخاري: ٥٨٠ في مواقيت الصلاة؛ ومسلم: المساجد: ١٦١؛ والنسائي: ٥٥٣ في المواقيت؛ وأبو داود: ١١٢١ في الجمعة؛ وابن حبان: ١٤٨٣؛ والقابسي: ٢٣، كلهم عن مالك به.

(٣) ـ صحيح. أخرجه أبو مصعب الزهري: ١٧ في وقوت الصلاة؛ والحدثاني: ١٠ أ في المواقيت؛ والشيباني: ١٣٢ في الصلاة، كلهم عن مالك به.

(٤) ـ ضعيف. أخرجه أبو مصعب الزهري: ١٨ في وقوت الصلاة؛ والحدثاني: ١٠ ب في المواقيت، عن مالك به.



**١٨**- أَنَّ أَبَا هُرَيْرَةَ ﷺ كَانَ يَقُولُ: مَنْ أَدْرَكَ الرَّكْعَةَ فَقَدْ أَدْرَكَ السَّجْدَةَ، وَمَنْ فَاتَهُ قِرَاءَةُ أُمِّ الْقُرْآنِ فَقَدْ فَاتَهُ خَيْرٌ كَثِيرٌ(١).

واتە: لە ئەبو هورەیرەوە ﷺ گێردراوەتەوە دەیگوت: هەر کەسێك بگات بە ڕکوع (واتە لە نوێژی بەکۆمەڵ لە ڕکوعدا بگات بە ئیمام) ئەوە گەیشتووە بە سوژدەکەش (واتە سوژدەکەی جێگای خۆی گرتووە و لێی هەڵنەوەشاوەتەوە بەهۆی نەگەیشتن بە فاتیحە)، وە هەر کەسێك خوێندنی سوڕەتی فاتیحەی لەدەست بچێت (تەنها بە ڕکوع ڕابگات)، ئەوە چاکەی زۆری لەدەست چووە (واتە بە ڕکاتەکە ڕاگەیشتووە بەڵام پاداشتی فاتیحە و تەکبیر و سوننەتەکانی پێش ڕکوعی لەدەست چووە).

## ٤- ئەوەی هاتووە دەربارەی (دُلُوك الشَّمْسِ) و (غَسَقِ اللَّيْلِ)(٢)

**١٩**- أَنَّ عَبْدَ اللهِ بْنَ عُمَرَ ﷺ كَانَ يَقُولُ: دُلُوكُ الشَّمْسِ مَيْلُهَا(٣).

واتە: عەبدوڵڵای کوڕی عومەر ﷺ دەیگوت: (دُلُوكُ الشَّمْسِ) ـ کە لە قوڕئاندا هاتووە، ماناکەی بریتییە لە ـ لادانی خۆر (بۆ خۆرئاوا، کە دەکاتە کاتی نوێژی نیوەڕۆ).

**٢٠**- أَنَّ عَبْدَ اللهِ بْنَ عَبَّاسٍ ﷺ كَانَ يَقُولُ: دُلُوكُ الشَّمْسِ إِذَا فَاءَ الْفَيْءُ، وَغَسَقُ اللَّيْلِ اجْتِمَاعُ اللَّيْلِ وَظُلْمَتُهُ(٤).

واتە: عەبدوڵڵای کوڕی عەبباس ﷺ دەیگوت: (دُلُوكُ الشَّمْس) کاتێکە کە سێبەر دەگەڕێتەوە بۆ لای ڕۆژهەڵات (بە هۆی لادانی ڕۆژ لە ناوەڕاستی ئاسمان بەرەو ڕۆژئاوا)، وە (غَسَقُ اللَّيْل) هاتنی شەو و تاریکییەکەیەتی.

---

(١) ـ ضعيف. أخرجه أبو مصعب الزهري: ١٩ في وقوت الصلاة؛ وفي: ٢٣٢ في النداء والصلاة؛ والحدثاني، ١٠ج في المواقيت؛ والحدثاني: ٨٩ أ في الصلاة، كلهم عن مالك به.

(٢) ـ مَا جَاءَ فِي دُلُوكِ الشَّمْسِ وَغَسَقِ اللَّيْلِ.

(٣) ـ صحيح. أخرجه أبو مصعب الزهري: ٢٠ في وقوت الصلاة؛ والحدثاني: ١١ في المواقيت؛ والشيباني: ١٠٠٦ في العتاق، كلهم عن مالك به.

(٤) ـ ضعيف. أخرجه أبو مصعب الزهري: ٢١ في وقوت الصلاة؛ والحدثاني: ١١أفي المواقيت؛ والشيباني: ١٠٠٧ في العتاق؛ ومصنف ابن أبي شيبة: ٦٢٧١ في الصلوات، كلهم عن مالك به.




## ٥- بابەتی جۆراوجۆر دەربارەی كاتەكان[١]

**٢١-** عَنْ عَبْدِ اللهِ بْنِ عُمَرَ ﭭ؛ أَنَّ رَسُولَ اللهِ ﷺ قَالَ: الَّذِي تَفُوتُهُ صَلَاةُ الْعَصْرِ كَأَنَّمَا وُتِرَ أَهْلَهُ وَمَالَهُ[٢].

واتە: لە عەبدوڵڵای كوڕی عومەرەوە ﭭ گێڕدراوەتەوە (گوتوویەتی): پێغەمبەری خوا ﷺ فەرموویەتی: ئەو كەسەی (پاداشتی) نوێژی عەسری لەدەست دەچێت (جا بە دواخستنی بێ، یان بە لەدەستدانی نوێژەكە، یان بە لەدەستدانی جەماعەت لە نوێژەكەدا)، ئەوە (پەشیمانی و حەسرەتەكەی لە ڕۆژی دواییدا) وەك ئەو كەسە وایە كە خێزان و ماڵ و منداڵی لەدەست داوە (كاتێك پاداشتی ئەنجامدانی ئەو نوێژە دەبینێت بەجەماعەت لە كاتی خۆیدا).

**٢٢-** عَنْ يَحْيَى بْنِ سَعِيدٍ ﵀، أَنَّ عُمَرَ بْنَ الْخَطَّابِ ﵁ انْصَرَفَ مِنْ صَلَاةِ الْعَصْرِ، فَلَقِيَ رَجُلاً لَمْ يَشْهَدِ الْعَصْرَ، فَقَالَ عُمَرُ ﵁: مَا حَبَسَكَ عَنْ صَلَاةِ الْعَصْرِ؟ فَذَكَرَ لَهُ الرَّجُلُ عُذْرًا، فَقَالَ عُمَرُ ﵁: طَفَّفْتَ.

قَالَ يَحْيَى ﵀: قَالَ مَالِكٌ ﵀: وَيُقَالُ: لِكُلِّ شَيْءٍ وَفَاءٌ وَتَطْفِيفٌ[٣].

واتە: لە یەحیای كوڕی سەعیدەوە ﵀ گێڕدراوەتەوە (گوتوویەتی): عومەری كوڕی خەتتاب ﵁ لە نوێژی عەسر گەڕایەوە، جا گەیشت بە پیاوێك نەهاتبوو بۆ نوێژی عەسر، ئیمامی عومەریش ﵁ گوتی: چی ڕێگری لێ كردی لە نوێژی عەسر (بۆ نەهاتی)؟ پیاوەكەش عوزرێكی بۆ باس كرد، ئیمامی عومەریش ﵁ گوتی: (خەرمانی چاكەی خۆت) سووك كرد.

---

(١) ـ جَامِعِ الْوُقُوتِ.

(٢) ـ صحيح. أخرجه أبو مصعب الزهري: ٢٢ في وقوت الصلاة؛ وفي: ٥٧٩ في الجمعة؛ والحدثاني: ١٢ في المواقيت؛ والشيباني: ٢٢٢ في الصلاة؛ وابن حنبل: ٥٣١٣؛ والبخاري: ٥٥٢ في مواقيت الصلاة؛ ومسلم: المساجد: ٢٠٠؛ وأبو داود: ٤١٤ في الصلاة؛ وابن حبان: ١٤٦٩؛ والقابسي: ١٩٥، كلهم عن مالك به.

(٣) ـ ضعيف. أخرجه أبو مصعب الزهري: ٢٣ في وقوت الصلاة؛ والحدثاني: ١٢ أ في المواقيت، عن مالك به.




یەحیا ﷺ دەڵێ: ئیمامی مالیك ﷺ ـ لە لێكدانەوەی ئەو قسەی ئیمامی عومەر ـ گوتی: هەموو شتێك تەواوی و كەمی هەیە (واتە كابرا لەو بابەتەدا لایەنە كەمەكەی بەركەوت، بۆیە تەرازووەكەی لەو بابەتە سووك بوو).

٢٣- عَنْ يَحْيَى بْنِ سَعِيدٍ ﷺ، أَنَّهُ كَانَ يَقُولُ: إِنَّ الْمُصَلِّيَ لَيُصَلِّي الصَّلاَةَ وَمَا فَاتَهُ وَقْتُهَا، وَلَمَا فَاتَهُ مِنْ وَقْتِهَا أَعْظَمُ، أَوْ أَفْضَلُ مِنْ أَهْلِهِ وَمَالِهِ[١].

قَالَ يَحْيَى ﷺ: قَالَ مَالِكٌ ﷺ: مَنْ أَدْرَكَ الْوَقْتَ وَهُوَ فِي سَفَرٍ، فَأَخَّرَ الصَّلاَةَ سَاهِيًا أَوْ نَاسِيًا، حَتَّى قَدِمَ عَلَى أَهْلِهِ، أَنَّهُ إِنْ كَانَ قَدِمَ عَلَى أَهْلِهِ وَهُوَ فِي الْوَقْتِ، فَلْيُصَلِّ صَلاَةَ الْمُقِيمِ، وَإِنْ كَانَ قَدْ قَدِمَ وَقَدْ ذَهَبَ الْوَقْتُ، فَلْيُصَلِّ صَلاَةَ الْمُسَافِرِ، لأَنَّهُ إِنَّمَا يَقْضِي مِثْلَ الَّذِي كَانَ عَلَيْهِ.

قَالَ مَالِكٌ ﷺ: وَهَذَا الأَمْرُ هُوَ الَّذِي أَدْرَكْتُ عَلَيْهِ النَّاسَ وَأَهْلَ الْعِلْمِ بِبَلَدِنَا[٢].

وقَالَ مَالِكٌ ﷺ: الشَّفَقُ الْحُمْرَةُ الَّتِي فِي الْمَغْرِبِ، فَإِذَا ذَهَبَتِ الْحُمْرَةُ، فَقَدْ وَجَبَتْ صَلاَةُ الْعِشَاءِ، وَخَرَجْتَ مِنْ وَقْتِ الْمَغْرِبِ[٣].

واتە: لە یەحیای كوڕی سەعیدەوە ﷺ گێڕدراوەتەوە دەیگوت: نوێژخوێن (كاتێك) نوێژ دەكات كە هێشتا نوێژەكە كاتەكەی بەسەر نەچووە (بەڵام هەندێك لە كاتەكەی لەدەست داوە)، ئەوە ئەو ئەندازەیەی لەدەستی داوە گەورەتر و گرنگتر و چاكترە لە خێزان و ماڵ و منداڵی.

یەحیا ﷺ گوتوویەتی: ئیمامی مالیك ﷺ گوتوویەتی: هەر كەسێك گەیشت بە كاتی نوێژێك لە كاتێكدا لە سەفەردا بوو جا بەهەڵە یان بەلەبیرچوونەوە نوێژەكەی دوا خست (لە سەفەرەكەیدا نەیكرد) تا گەیشتەوە ناو ماڵ و منداڵی لە كاتێكدا هێشتا هەر لەناو كاتەكەدا بوو، ئەوە با نوێژی كەسی نیشتەجێ بكات (با كورتی نەكاتەوە)، وە ئەگەر گەڕایەوە لە كاتێكدا كاتەكە تێپەڕ ببوو، ئەوە با نوێژی كەسی

---

(١) ـ أخرجه أبو مصعب الزهري: ٢٤ في وقوت الصلاة، عن مالك به.

(٢) ـ أخرجه أبو مصعب الزهري: ٢٥ في وقوت الصلاة؛ والحدثاني: ١٣ في المواقيت، عن مالك به.

(٣) ـ مقطوع صحيح. أخرجه أبو مصعب الزهري: ٢٧ في وقوت الصلاة، عن مالك به.





گەشتیار بکات (نوێژەکە کورت بکاتەوە)، چونکە دەبێ نوێژێك قەزا بکاتەوە کە وەك ئەو نوێژە بێت کە کەوتۆتە ئەستۆی.

ئیمامی مالیك ﵀ گوتوویەتی: ئا لەسەر ئەو شێوازە خەڵکی و زانایانم بینیوە لە مەملەکەتی ئێمە (واتە لە مەدینە).

هەروەها ئیمامی مالیك ﵀ گوتوویەتی: شەفەق ئەو سوورایییەیە کە لە کاتی مەغریبدا هەیە، جا ئەگەر سورایییەکە نەما ئەوە نوێژی عیشا واجب دەبێت و کاتی مەغریب تێ دەپەڕێت.

**٢٤- عَنْ نَافِعٍ ﵀، أَنَّ عَبْدَ اللهِ بْنَ عُمَرَ ﵄ أُغْمِيَ عَلَيْهِ، فَذَهَبَ عَقْلُهُ، فَلَمْ يَقْضِ الصَّلَاةَ.**

**قَالَ مَالِكٌ ﵀: وَذَلِكَ فِيمَا نَرَى وَاللهُ أَعْلَمُ، أَنَّ الْوَقْتَ قَدْ ذَهَبَ، فَأَمَّا مَنْ أَفَاقَ فِي الْوَقْتِ، فَإِنَّهُ يُصَلِّي[1].**

واتە: لە نافیعەوە ﵀ گێڕدراوەتەوە (گوتوویەتی): عەبدوڵلای کوڕی عومەر ﵄ لەهۆشخۆی چوو و بێهۆش بوو، (دواتر کە بەهۆشخۆی هاتەوە) ئەو نوێژەی نەگێڕایەوە کە (لە کاتی بێهۆشییەکە) لێی فەوتا بوو.

ئیمامی مالیك ﵀ گوتوویەتی: ئێمە بۆچوونمان وایە ئەوە لە کاتێکدا بوو کە کاتەکە تێپەڕیوە و کاتی نوێژەکە نەماوە، بەڵام هەرچی ئەو کەسەیە کە بەهۆشخۆی دێتەوە لەناو کاتەکەدا، ئەوە دەبێ نوێژەکە بکات.

---

(١) ـ صحيح. أخرجه أبو مصعب الزهري: ٢٨ في وقوت الصلاة؛ والحدثاني: ١٤ في المواقيت؛ والشيباني: ٢٧٨ في الصلاة، كلهم عن مالك به.

## ٦- نوستن بەسەر نوێژەوە[١]

**٢٥-** عَنْ سَعِيدِ بْنِ الْمُسَيَّبِ ﷺ، أَنَّ رَسُولَ اللهِ ﷺ حِينَ قَفَلَ مِنْ خَيْبَرَ، أَسْرَى حَتَّى إِذَا كَانَ مِنْ آخِرِ اللَّيْلِ عَرَّسَ، وَقَالَ لِبِلاَلٍ ﷺ: اكْلأْ لَنَا الصُّبْحَ، وَنَامَ رَسُولُ اللهِ ﷺ وَأَصْحَابُهُ، وَكَلأَ بِلاَلٌ ﷺ مَا قُدِّرَ لَهُ، ثُمَّ اسْتَنَدَ إِلَى رَاحِلَتِهِ، وَهُوَ مُقَابِلُ الْفَجْرِ، فَغَلَبَتْهُ عَيْنَاهُ، فَلَمْ يَسْتَيْقِظْ رَسُولُ اللهِ ﷺ، وَلاَ بِلاَلٌ ﷺ، وَلاَ أَحَدٌ مِنَ الرَّكْبِ، حَتَّى ضَرَبَتْهُمُ الشَّمْسُ، فَفَزِعَ رَسُولُ اللهِ ﷺ، فَقَالَ بِلاَلٌ ﷺ: يَا رَسُولَ اللهِ، أَخَذَ بِنَفْسِي الَّذِي أَخَذَ بِنَفْسِكَ، فَقَالَ رَسُولُ اللهِ ﷺ: اقْتَادُوا، فَبَعَثُوا رَوَاحِلَهُمْ وَاقْتَادُوا شَيْئًا، ثُمَّ أَمَرَ رَسُولُ اللهِ ﷺ بِلاَلاً ﷺ فَأَقَامَ الصَّلاَةَ، فَصَلَّى بِهِمْ رَسُولُ اللهِ ﷺ الصُّبْحَ، ثُمَّ قَالَ حِينَ قَضَى الصَّلاَةَ: مَنْ نَسِيَ الصَّلاَةَ فَلْيُصَلِّهَا إِذَا ذَكَرَهَا، فَإِنَّ اللهَ ﷻ يَقُولُ فِي كِتَابِهِ: ﴿وَأَقِمِ ٱلصَّلَوٰةَ لِذِكۡرِيٓ ١٤﴾ طه[٢].

واتە: لە سەعیدی کوڕی موسەیەبەوە ﷺ گێڕدراوەتەوە (گوتوویەتی): کاتێ پێغەمبەری خوا ﷺ لە خەیبەر گەڕایەوە بە شەو ڕێی کرد تا بوو بە کۆتایی شەو، دابەزی بۆ پشوودان و بە بیلالی ﷺ فەرمووی: چاودێری و پارێزگاریمان بۆ بکە بۆ نوێژی بەیانی (خەبەرمان بکەرەوە با نوێژمان نەچێ)، جا پێغەمبەری خوا ﷺ و هاوەڵەکانی ﷺ خەوتن، بیلالیش ﷺ ئەوەندەی خوا بۆی تەقدیر کردبوو چاودێری کرد، دواتر پاڵی دا بە ئاژەڵەکەی لە کاتێکدا ڕووی کردبووە ئەو ئاڕاستەی کە بەیان لێیەوە هەڵدێ (تا ئەگەر بەیان هەڵهات ئاگاداریان بکاتەوە بۆ نوێژ)، جا خەو بەسەریدا زاڵ بوو، (بەم شێوەیە) نە پێغەمبەری خوا ﷺ و نە بیلال ﷺ و نە هیچێك لە کۆمەڵەکە بەخەبەر نەهاتن، تا خۆر لێیدان، جا پێغەمبەری خوا ﷺ بەپەرۆشەوە ڕاپەڕی، بیلالیش ﷺ گوتی: ئەی پێغەمبەری خوا ﷺ ئەو کەسەی نەفسی تۆی گرتەوە نەفسی منیشی گرتەوە (کە خوای پەروەردگارە)، پێغەمبەری خواش ﷺ فەرمووی: ئێرە بەجێ بێڵن، جا ئاژەڵەکانیان وروژاند تا هەڵسن، جا تۆزێك دوورکەوتنەوە، دواتر پێغەمبەری خوا ﷺ فەرمانی بە بیلال ﷺ

---

(١) ـ النَّوْمُ عَنِ الصَّلَاةِ.

(٢) ـ صحيح. أخرجه أبو مصعب الزهري: ٢٩ في وقوت الصلاة؛ والحدثاني: ١٤أفي المواقيت؛ والشيباني: ١٨٤ في الصلاة؛ والشافعي: ٨٠٨، كلهم عن مالك به.





کرد قامەت بۆ نوێژ بکات، جا پێغەمبەری خوا ﷺ نوێژی بەیانی بۆ کردن، پاشان دوای ئەوەی نوێژەکەی تەواو کرد فەرمووی: هەر کەسێك نوێژێکی لەیاد چوو (یان لە نوێژێك بێئاگا بوو بەهۆی خەو یان هەر شتێکی دیکە) ئەوە با ئەو کاتە ئەنجامی بدات کە هاتەوە یادی (یان ئەو کاتەی بەئاگا هاتەوە)، چونکە خوای پەروەردگار دەفەرموێ: ﴿وَأَقِمِ ٱلصَّلَوٰةَ لِذِكۡرِيٓ ١٤﴾طه، واتە: ((نوێژ ئەنجام بدە بۆ یادی من)). (کەواتە کەی نوێژت هاتەوە یاد ئەو کات ئەنجامی بدە، ئەگەر لە کاتی خۆی لەیادت کردبوو).

**٢٦-** عَنْ زَيْدِ بْنِ أَسْلَمَ ﷺ، أَنَّهُ قَالَ: عَرَّسَ رَسُولُ اللهِ ﷺ لَيْلَةً بِطَرِيقِ مَكَّةَ، وَوَكَّلَ بِلاَلاً ﷺ أَنْ يُوقِظَهُمْ لِلصَّلاَةِ، فَرَقَدَ بِلاَلٌ ﷺ وَرَقَدُوا، حَتَّى اسْتَيْقَظُوا وَقَدْ طَلَعَتْ عَلَيْهِمُ الشَّمْسُ، فَاسْتَيْقَظَ الْقَوْمُ وَقَدْ فَزِعُوا، فَأَمَرَهُمْ رَسُولُ اللهِ ﷺ أَنْ يَرْكَبُوا، حَتَّى يَخْرُجُوا مِنْ ذَلِكَ الْوَادِي، وَقَالَ: إِنَّ هَذَا وَادٍ بِهِ شَيْطَانٌ، فَرَكِبُوا حَتَّى خَرَجُوا مِنْ ذَلِكَ الْوَادِي، ثُمَّ أَمَرَهُمْ رَسُولُ اللهِ ﷺ أَنْ يَنْزِلُوا، وَأَنْ يَتَوَضَّؤُوا، وَأَمَرَ بِلاَلاً ﷺ أَنْ يُنَادِيَ بِالصَّلاَةِ، أَوْ يُقِيمَ، فَصَلَّى رَسُولُ اللهِ ﷺ بِالنَّاسِ، ثُمَّ انْصَرَفَ إِلَيْهِمْ، وَقَدْ رَأَى مِنْ فَزَعِهِمْ، فَقَالَ: يَا أَيُّهَا النَّاسُ، إِنَّ اللهَ قَبَضَ أَرْوَاحَنَا، وَلَوْ شَاءَ لَرَدَّهَا إِلَيْنَا فِي حِينٍ غَيْرِ هَذَا، فَإِذَا رَقَدَ أَحَدُكُمْ عَنِ الصَّلاَةِ أَوْ نَسِيَهَا، ثُمَّ فَزِعَ إِلَيْهَا، فَلْيُصَلِّهَا كَمَا كَانَ يُصَلِّيهَا فِي وَقْتِهَا.

ثُمَّ الْتَفَتَ رَسُولُ اللهِ ﷺ إِلَى أَبِي بَكْرٍ ﷺ، فَقَالَ: إِنَّ الشَّيْطَانَ أَتَى بِلاَلاً ﷺ وَهُوَ قَائِمٌ يُصَلِّي، فَأَضْجَعَهُ، فَلَمْ يَزَلْ يُهَدِّئُهُ كَمَا يُهَدَّأُ الصَّبِيُّ حَتَّى نَامَ، ثُمَّ دَعَا رَسُولُ اللهِ بِلاَلاً، فَأَخْبَرَ بِلاَلٌ ﷺ رَسُولَ اللهِ ﷺ، مِثْلَ الَّذِي أَخْبَرَ رَسُولُ اللهِ ﷺ أَبَا بَكْرٍ، فَقَالَ أَبُو بَكْرٍ ﷺ: أَشْهَدُ أَنَّكَ رَسُولُ اللهِ[1].

واتە: لە زەیدی کوڕی ئەسلەمەوە ﷺ گێردراوەتەوە گوتوویەتی: پێغەمبەری خوا ﷺ شەوێکیان (لە سەفەرێکدا) لە ڕێگەی مەککە لە کۆتایی شەودا دابەزی (بۆ پشوودان و خەوتن)، جا بیلالی ﷺ ڕاسپارد بەوەی خەبەریان بکاتەوە بۆ نوێژی بەیانی، جا بیلال ﷺ خەوت و ئەوانیش (پێشی بیلال ﷺ) خەوتن، تا کاتێك هەڵسان خۆریان بەسەردا هەڵاتبوو، جا خەڵکەکە بەتاسان و داخەوە

---

(١) ـ حسن لغيره. أخرجه أبو مصعب الزهري: ٣٠ في وقوت الصلاة؛ والحدثاني: ١٦ في المواقيت، عن مالك به.

هەستان، پێغەمبەری خواش ﷺ فەرمانی پێ کردن سواری ئاژەڵەکانیان بن، تا لە دۆڵەکە دەرچوون، جا فەرمووی: ئەمە دۆڵێکە شەیتانی تیایە، دواتر (کە لە دۆڵەکە دەرچوون) فەرمانی پێ کردن دابەزن و دەستنوێژ بشۆرن، وە فەرمانی بە بیلال ؓ کرد بانگ بدات ـ یان قامەت بکات ـ بۆ نوێژکردن، جا پێغەمبەری خوا ﷺ نوێژی بۆ کردن، دواتر ڕووی تێکردن لە کاتێکدا بینی خەڵکەکە تاساو و بەداخن (وا دەزانن تاوانبار دەبن کاتێ نوێژیان بفەوتێت بەهۆی شتێك کە کەمتەرخەمی ئەوانی تیا نییە) جا فەرمووی: ئەی خەڵکینە، خوای پەروەردگار ڕووحی ئێمەی گرتەوە (لە خەودا)، جا ئەگەر بیویستایە بۆی دەگەڕاندینەوە لە غەیری ئەم کاتە، جا ئەگەر هەر یەکێك لە ئێوە بەسەر نوێژێکەوە خەوت یان لەیادی چوو دواتر بە ئاگا هاتەوە یان یادی کەوتەوە ئەوە با نوێژەکە ئەنجام بدات بەو شێوەیەی کە لە کاتی خۆی ئەنجامی دەدات.

دواتر پێغەمبەری خوا ﷺ ڕووی وەرگێڕا بۆ لای ئیمامی ئەبو بەکر ؓ و فەرمووی: شەیتان هاتە لای بیلال ؓ لە کاتێکدا نوێژی دەکرد، وای لێکرد پاڵکەوێ، جا بەردەوام دەیلاواندەوە وەك چۆن دایك منداڵ هێور دەکاتەوە و دەیلاوێنێتەوە، تا خەوت، دواتر پێغەمبەری خوا ﷺ بانگی بیلالی ؓ کرد (پێی وترا چۆن بوو خەوتی؟)، بیلالیش ؓ هەواڵی دا بە پێغەمبەری خوا ﷺ بەم شێوەیەی پێغەمبەری خوا ﷺ هەواڵی دا بە ئەبو بەکر ؓ (واتە بیلال ؓ باسی ئەوەی کرد کە هەستی کردووە دەیلاوێننەوە و بەهۆی ئەوەوە خەوتووە)، ئیمامی ئەبو بەکریش ؓ گوتی: شایەتی دەدەم کە تۆ پێغەمبەری خوای ﷺ.




## ٧- نەهیکردن لە نوێژکردن لە کاتی قرچەی گەرمای نیوەڕۆ[١]

**٢٧- عَنْ عَطَاءِ بْنِ يَسَارٍ ﷺ، أَنَّ رَسُولَ اللهِ ﷺ قَالَ: إِنَّ شِدَّةَ الْحَرِّ مِنْ فَيْحِ جَهَنَّمَ، فَإِذَا اشْتَدَّ الْحَرُّ، فَأَبْرِدُوا عَنِ الصَّلاَةِ، وَقَالَ: اشْتَكَتِ النَّارُ إِلَى رَبِّهَا، فَقَالَتْ: يَا رَبِّ أَكَلَ بَعْضِي بَعْضًا، فَأَذِنَ لَهَا بِنَفَسَيْنِ فِي كُلِّ عَامٍ: نَفَسٍ فِي الشِّتَاءِ، وَنَفَسٍ فِي الصَّيْفِ[٢].**

واتە: لە عەتائی کوڕی یەسارەوە ﷺ گێڕدراوەتەوە (گوتوویەتی): پێغەمبەری خوا ﷺ فەرموویەتی: گەرمای زۆر و سەخت بەشێکە لە برك و نەفەسی دۆزەخ، جا ئەگەر گەرما زۆر و سەخت بوو ئەوە بۆ نوێژ ساردی بکەنەوە (واتە نوێژ تۆزێك دوا بخەن تا فێنك دادێت)، وە فەرموویەتی: ئاگر شکاتی حاڵی خۆی لەلای پەروەردگاری کرد، گوتی: هەندێکم هەندێکی تری خوارد، پەروەردگاریش مۆڵەتی پێ دا بە دوو نەفەس لە گشت ساڵێکدا: نەفەسێك لە زستان و نەفەسێك لە هاویندا.

**٢٨- عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ ﷺ، أَنَّ رَسُولَ اللهِ ﷺ قَالَ: إِذَا اشْتَدَّ الْحَرُّ، فَأَبْرِدُوا عَنِ الصَّلاَةِ، فَإِنَّ شِدَّةَ الْحَرِّ مِنْ فَيْحِ جَهَنَّمَ.**

**وَذَكَرَ: أَنَّ النَّارَ اشْتَكَتْ إِلَى رَبِّهَا، فَأَذِنَ لَهَا فِي كُلِّ عَامٍ بِنَفَسَيْنِ: نَفَسٍ فِي الشِّتَاءِ، وَنَفَسٍ فِي الصَّيْفِ[٣].**

واتە: لە ئەبو هورەیرەوە ﷺ گێڕدراوەتەوە (گوتوویەتی): پێغەمبەری خوا ﷺ فەرموویەتی: هەر کاتێ گەرما بەهێز بوو ئەوە ساردی بکەنەوە بۆ نوێژ (واتە نوێژ مەکەن تا فێنك دادێت)، چونکە گەرمای زۆر بەشێکە لە برك و نەفەسی دۆزەخ (خەڵکی ئازار دەدات).

وە باسی کردووە (گوتوویەتی): ئاگر شکاتی حاڵی خۆی لەلای پەروەردگاری کرد (بەوەی خەریکە هەندێکی هەندێکی دیکەی بخواتەوە)، پەروەردگاریش ﷻ مۆڵەتی پێ دا بە دوو نەفەس: نەفەسێك لە زستان و نەفەسێك لە هاوین.

---

(١) ـ النَّهْيُ عَنِ الصَّلاَةِ بِالْهَاجِرَةِ.

(٢) ـ صحيح لغيره. أخرجه أبو مصعب الزهري: ٣٨ في وقوت الصلاة؛ والحدثاني: ٢١ في المواقيت؛ والقابسي: ٣٢٣، كلهم عن مالك به.

(٣) ـ صحيح. أخرجه أبو مصعب الزهري: ٣٩ في وقوت الصلاة؛ والحدثاني: ٢١ أ في المواقيت؛ والشيباني: ١٨٣ في الصلاة؛ وابن حنبل: ٩٩٥٦؛ ومسلم: المساجد: ١٨٦؛ وابن حبان: ١٥١٠؛ والقابسي: ٢٧٦، كلهم عن مالك به.




**٢٩**- عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ ﷺ، أَنَّ رَسُولَ اللهِ ﷺ قَالَ: إِذَا اشْتَدَّ الْحَرُّ، فَأَبْرِدُوا عَنِ الصَّلَاةِ، فَإِنَّ شِدَّةَ الْحَرِّ مِنْ فَيْحِ جَهَنَّمَ[١].

واتە: لە ئەبو هورەیرەوە ﷺ گێڕدراوەتەوە (گوتوویەتی): پێغەمبەری خوا ﷺ فەرموویەتی: هەر کاتێ گەرما بەهێز بوو ئەوە ساردی بکەنەوە بۆ نوێژ (واتە نوێژ مەکەن تا فێنك دادێت)، چونکە گەرمای زۆر بەشێکە لە برك و نەفەسی دۆزەخ (خەڵکی ئازار دەدات).

## ٨- نەهیکردن لە چوونە مزگەوت بە بۆنی سیرەوە و، داپۆشینی دەم[٢]

**٣٠**- عَنْ سَعِيدِ بْنِ الْمُسَيَّبِ ﷺ، أَنَّ رَسُولَ اللهِ ﷺ قَالَ: مَنْ أَكَلَ مِنْ هَذِهِ الشَّجَرَةِ، فَلاَ يَقْرُبْ مَسَاجِدَنَا، يُؤْذِينَا بِرِيحِ الثُّومِ[٣].

واتە: لە سەعیدی کوڕی موسەیەبەوە ﷺ گێڕدراوەتەوە (گوتوویەتی): پێغەمبەری خوا ﷺ فەرموویەتی: هەر کەسێك لەم ڕووەکە بخوات (واتە ڕووەکی سیر) ئەوە با نزیکی مزگەوتەکانمان نەکەوێتەوە، (چونکە) ئازارمان دەدات بە بۆنی سیر.

**٣١**- عَنْ عَبْدِ الرَّحْمَنِ بْنِ الْمُجَبَّرِ ﷺ، أَنَّهُ كَانَ يَرَى سَالِمَ بْنَ عَبْدِ اللهِ ﷺ، إِذَا رَأَى الإِنْسَانَ يُغَطِّي فَاهُ وَهُوَ يُصَلِّي، جَبَذَ الثَّوْبَ عَنْ فِيهِ جَبْذًا شَدِيدًا، حَتَّى يَنْزِعَهُ عَنْ فِيهِ[٤].

واتە: لە عەبدوڕڕەحمانی کوڕی موجەببەڕەوە ﷺ گێڕدراوەتەوە، دەیبینی سالمی کوڕی عەبدوڵڵا ﷺ کاتێ کەسێکی ببینیایە دەمی داپۆشیوە لە کاتێکدا نوێژ دەکات، ئەوە جلەکەی لە دەمی ڕادەکێشا بەڕاکیشانێکی توند، تا لە دەمی دەکردەوە.

---

(١) ـ صحيح. أخرجه أبو مصعب الزهري: ٤٠ في وقوت الصلاة؛ والحدثاني: ٢١ب في المواقيت؛ والشافعي: ١٠٣؛ وفي: ١٠٢١؛ وابن حنبل: ٩٩٥٧؛ وابن ماجه: ٦٦٠ في مواقيت الصلاة؛ والقابسي: ٣٢٣، عن مالك به.

(٢) ـ النَّهْيُ عَنْ دُخُولِ الْمَسْجِدِ بِرِيحِ الثُّومِ وَتَغْطِيَةِ الْفَمِ.

(٣) ـ صحيح. أخرجه أبو مصعب الزهري: ٤١ في وقوت الصلاة؛ والحدثاني: ٢٢ في المواقيت؛ والشيباني: ٩٢٠ في العتاق، كلهم عن مالك به.

(٤) ـ مقطوع صحيح. أخرجه أبو مصعب الزهري: ٤٢ في وقوت الصلاة؛ والحدثاني: ٢٢ أ في المواقيت؛ ومصنف ابن أبي شيبة: ٧٣٠٠ في الصلوات، كلهم عن مالك به.

## ١- كرداری دەستنوێژ[١]

٣٢- عَنْ عَمْرِو بْنِ يَحْيَى الْمَازِنِيِّ ﷺ، عَنْ أَبِيهِ ﷺ، أَنَّهُ قَالَ لِعَبْدِ اللهِ بْنِ زَيْدِ بْنِ عَاصِمٍ، وَهُوَ جَدُّ عَمْرِو بْنِ يَحْيَى ﷺ، وَكَانَ مِنْ أَصْحَابِ رَسُولِ اللهِ ﷺ: هَلْ تَسْتَطِيعُ أَنْ تُرِيَنِي كَيْفَ كَانَ رَسُولُ اللهِ ﷺ يَتَوَضَّأُ؟ فَقَالَ عَبْدُ اللهِ بْنُ زَيْدِ بْنِ عَاصِمٍ: نَعَمْ، فَدَعَا بِوَضُوءٍ، فَأَفْرَغَ عَلَى يَدِهِ، فَغَسَلَ يَدَيْهِ مَرَّتَيْنِ مَرَّتَيْنِ، ثُمَّ تَمَضْمَضَ، وَاسْتَنْثَرَ ثَلاَثًا، ثُمَّ غَسَلَ وَجْهَهُ ثَلاَثًا، ثُمَّ غَسَلَ يَدَيْهِ مَرَّتَيْنِ مَرَّتَيْنِ، إِلَى الْمِرْفَقَيْنِ، ثُمَّ مَسَحَ رَأْسَهُ بِيَدَيْهِ، فَأَقْبَلَ بِهِمَا وَأَدْبَرَ، بَدَأَ بِمُقَدَّمِ رَأْسِهِ، ثُمَّ ذَهَبَ بِهِمَا إِلَى قَفَاهُ، ثُمَّ رَدَّهُمَا حَتَّى رَجَعَ إِلَى الْمَكَانِ الَّذِي بَدَأَ مِنْهُ، ثُمَّ غَسَلَ رِجْلَيْهِ[٢].

واتە: لە عەمری كوڕی یەحیای مازینییەوە ﷺ گێڕدراوەتەوە، ئەویش لە باوكیەوە ﷺ گێڕاویەتەوە بەوەی بە عەبدوڵڵای كوڕی زەیدی كوڕی عاصیمی گوتووە - كە دەكاتە باپیری عەمری كوڕی یەحیا ﷺ كە یەكێك بووە لە هاوەڵانی پێغەمبەری خوا ﷺ -: ئایا دەتوانی پێم نیشان بدەی كە پێغەمبەری خوا ﷺ چۆن دەستنوێژی شۆردووە؟ عەبدوڵڵاش ﷺ گوتی: بەڵێ، جا داوای ئاوی دەستنوێژی كرد و هەندێكی ڕشتە سەر دەستی و دەستەكانی دوو جار دوو جار شۆرد، دواتر سێ جار ئاوی لە دەم و لوتی وەركرد و ئاوەكەی فن كردەوە، دواتر سێ جار ڕوخساری شۆرد، دواتر دوو جار دوو جار دەست و باسكەكانی لەگەڵ ئانیشكەكانی شۆرد، دواتر بە هەردوو دەستەكانی سەری مەسح كرد (بەم شێوەیە): دەستەكانی بردە پێشەوەی سەر و دواوەی، بە پێشەسەری دەستی پێكرد و دواتر بردنی بۆ دواوەی سەری و دواتر گەڕاندنیەوە بۆ ئەو شوێنەی سەرەتا لێوەی دەستی پێكردبوو، دواتر قاچەكانی شۆرد.

---

(١) ـ الْعَمَلُ فِي الْوُضُوءِ.

(٢) ـ صحيح. أخرجه أبو مصعب الزهري: ٤٣ في الوضوء؛ والحدثاني: ٢٣ في الطهارة؛ والشيباني: ٥ في الصلاة؛ والشافعي: ٤٦؛ وابن حنبل، ١٦٤٧٨، وفي: ١٦٤٨٥، وفي: ١٦٤٩٠؛ والبخاري: ١٨٥ في الوضوء؛ ومسلم: الطهارة: ٢١٨؛ والنسائي: ٩٧ في الطهارة؛ وأبو داود: ١١٨ في الطهارة؛ والترمذي: ٣٢ في الطهارة؛ وابن ماجه: ٤٥٢ في الطهارة؛ وابن حبان: ١٠٨٤؛ والقابسي: ٤٠١، كلهم عن مالك به.



**٣٣-** عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ ﷺ، أَنَّ رَسُولَ اللهِ ﷺ قَالَ: إِذَا تَوَضَّأَ أَحَدُكُمْ فَلْيَجْعَلْ فِي أَنْفِهِ مَاءً، ثُمَّ لِيَنْثِرْ، وَمَنِ اسْتَجْمَرَ فَلْيُوتِرْ[1].

واتە: لە ئەبو هورەیرەوە ﷺ گێردراوەتەوە (گوتوویەتی): پێغەمبەری خوا ﷺ فەرموویەتی: کاتێ یەکێك لە ئێوە دەستنوێژی شۆرد، با ئاو بخاتە ناو لووتیەوە، دواتر ئاوەکە لە لووتی بخاتە دەرەوە (فنی بکاتەوە)، وە هەر کەسێك تارەتی بە بەرد کرد، ئەوە با بە تاك ئەنجامی بدات.

**٣٤-** عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ ﷺ، أَنَّ رَسُولَ اللهِ ﷺ قَالَ: مَنْ تَوَضَّأَ فَلْيَسْتَنْثِرْ، وَمَنِ اسْتَجْمَرَ فَلْيُوتِرْ[2].

واتە: لە ئەبو هورەیرەوە ﷺ گێردراوەتەوە (گوتوویەتی): پێغەمبەری خوا ﷺ فەرموویەتی: هەر کەسێك ویستی دەستنوێژ بشۆرێ (و ئاوی کردە ناو لووتیەوە) با ئاوەکەی ناو لووتی بخاتە دەرەوە (فنی بکاتەوە)، وە هەر کەسێك تارەتی بە بەرد کرد، ئەوە با بە تاك ئەنجامی بدات.

**٣٥-** **[فتوى]** قَالَ يَحْيَى ﷺ: سَمِعْتُ مَالِكًا ﷺ يَقُولُ فِي الرَّجُلِ يَتَمَضْمَضُ وَيَسْتَنْثِرُ مِنْ غَرْفَةٍ وَاحِدَةٍ: إِنَّهُ لاَ بَأْسَ بِذَلِكَ.

(فەتوا): یەحیا ﷺ گوتوویەتی: گوێم لە ئیمامی مالیك ﷺ بوو دەربارەی ئەو کەسەی بە یەك گۆنمە ئاو (بە یەك مشت) ئاو لە دەم و لووتی دەردەکات، دەیگوت: هیچ کێشەی تیا نییە.

**٣٦-** أَنَّ عَبْدَ الرَّحْمَنِ بْنَ أَبِي بَكْرٍ ﷺ قَدْ دَخَلَ عَلَى عَائِشَةَ ﷺ زَوْجِ النَّبِيِّ ﷺ، يَوْمَ مَاتَ سَعْدُ بْنُ أَبِي وَقَّاصٍ ﷺ، فَدَعَا بِوَضُوءٍ، فَقَالَتْ لَهُ عَائِشَةُ ﷺ: يَا عَبْدَ الرَّحْمَنِ أَسْبِغِ الْوُضُوءَ، فَإِنِّي سَمِعْتُ رَسُولَ اللهِ ﷺ يَقُولُ: وَيْلٌ لِلأَعْقَابِ مِنَ النَّارِ[3].

---

(١) ـ صحيح. أخرجه أبو مصعب الزهري: ٤٤ في الوضوء؛ والحدثاني: ٢٣أفي الطهارة؛ والشيباني: ٦ في الصلاة؛ وابن حنبل: ٧٢٢٠، وفي: ٧٧٣٢؛ والنسائي: ٨٦ في الطهارة؛ وأبو داود: ١٤٠ في الطهارة؛ وابن حبان: ١٤٣٩؛ والمنتقى لابن الجارود: ٣٩؛ والقابسي: ٣٢٠، كلهم عن مالك به.

(٢) ـ صحيح. أخرجه أبو مصعب الزهري: ٤٦ في الوضوء؛ والشيباني: ٧ في الصلاة؛ ومسلم: الطهارة: ٢٢ عن طريق يحيى بن يحيى؛ والنسائي: ٨٨ في الطهارة؛ وابن ماجه: ٤٢٦ في الطهارة؛ والقابسي: ٧٥، كلهم عن مالك به.

(٣) ـ صحيح. أخرجه أبو مصعب الزهري: ٤٥ في الوضوء، عن مالك به.

واتە: عەبدوڕڕەحمانی کوڕی ئەبو بەکر ﭭ هات بۆ لای عائیشەی ﭭ خێزانی پێغەمبەری خوا ﷺ لەو ڕۆژەی سەعدی کوڕی ئەبی وەقاص ﭬ وەفاتی کرد، جا داوای ئاوی دەستنوێژی کرد، عائیشەش ﭭ پێی گوت: ئەی عەبدوڕڕەحمان جوان دەستنوێژ بشۆرە، من گوێم لە پێغەمبەری خوا ﷺ بوو دەیفەرموو: وەیل و سزای سەخت بۆ پاژنەپێیەکان لە ئاگر (کاتێك بەجوانی ناشۆردرێن و بەوشکی دەمێننەوە).

**٣٧-** عَنْ عُثْمَانَ بْنِ عَبْدِ الرَّحْمَنِ ﵀، أَنَّ أَبَاهُ حَدَّثَهُ، أَنَّهُ سَمِعَ عُمَرَ بْنَ الْخَطَّابِ ﭬ يَتَوَضَّأُ بِالْمَاءِ وُضُوءً لِمَا تَحْتَ إِزَارِهِ[١].

واتە: لە عوسمانی کوڕی عەبدوڕڕەحمانەوە ﵀ گێڕدراوەتەوە باوکی بۆی باس کردووە، بەوەی گوێی لە عومەری کوڕی خەتتاب ﭬ بووە تارەتی بە ئاو کردووە.

**٣٨- [فتوى]** قَالَ يَحْيَى ﵀: سُئِلَ مَالِكٌ ﵀ عَنْ رَجُلٍ تَوَضَّأَ فَنَسِيَ فَغَسَلَ وَجْهَهُ قَبْلَ أَنْ يَتَمَضْمَضَ، أَوْ غَسَلَ ذِرَاعَيْهِ قَبْلَ أَنْ يَغْسِلَ وَجْهَهُ؟ فَقَالَ: أَمَّا الَّذِي غَسَلَ وَجْهَهُ قَبْلَ أَنْ يَتَمَضْمَضَ، فَلْيُمَضْمِضْ وَلاَ يُعِدْ غَسْلَ وَجْهِهِ، وَأَمَّا الَّذِي غَسَلَ ذِرَاعَيْهِ قَبْلَ وَجْهِهِ، فَلْيَغْسِلْ وَجْهَهُ ثُمَّ لْيُعِدْ غَسْلَ ذِرَاعَيْهِ، حَتَّى يَكُونَ غَسْلُهُمَا بَعْدَ وَجْهِهِ، إِذَا كَانَ فِي مَكَانِهِ، أَوْ بِحَضْرَةِ ذَلِكَ[٢].

(فەتوا): یەحیا ﵀ گوتوویەتی: ئیمامی مالیك ﵀ پرسیاری لێ کرا دەربارەی کەسێك (کاتێ) دەستنوێژ دەشۆرێ لە یاد دەکات: ڕوخساری دەشۆرێ بەر لەوەی ئاو لە دەمی وەربکات، یان باسکەکانی دەشۆرێ بەر لەوەی ڕوخساری بشۆرێت؟ (ئیمامی مالیك ﵀) گوتی: هەرچی ئەو کەسەیە کە ڕوخساری شۆردووە بەر لەوەی ئاو لە دەمی وەربکات، ئەوە با ئاو لە دەمی وەربکات و شۆردنی ڕوخساری دووبارە نەکاتەوە (چونکە تەرتیب و ڕیزبەندی لە نێوان ئەو دووانە سوننەتە، واجب نییە)، وە هەرچی ئەو کەسەشە کە باسکەکانی شۆردووە بەر لە ڕوخساری، ئەوە با ڕوخساری بشۆرێ دواتر شۆردنی باسکەکانی دووبارە بکاتەوە، تاوەکوو شۆردنی

---

(١) ـ موقوف حسن. أخرجه أبو مصعب الزهري: ٤٧ في الوضوء؛ والشيباني: ١٠ في الصلاة، عن مالك به.

(٢) ـ أخرجه أبو مصعب الزهري: ٤٨ في الوضوء؛ والحدثاني: ٢٤ في الطهارة، عن مالك به.




باسکەکانی بکەوێتە دوای شۆردنی ڕوخساری (چونکە تەرتیب و ڕیزبەندی لە نێوان ئەو دووانە واجبە)، (ئەمە لە کاتێکدایە) ئەگەر هەر لە شوێنەکەی خۆی بوو، یان هەر خەریکی ئەوە بوو (واتە ڕێککردنەوەی ڕیزبەندییەکە لە کاتێکدا کەڵکی دەبێ و بەردەکەوێ ئەگەر موالات هەبوو، ئەگەر ئەندامە شۆراوەکانی دەستنوێژ هێشتا تەڕ بوون، ئەگەرنا دەبێ دەستنوێژەکە دووبارە بکاتەوە).

٣٩- **[فتوى]** قَالَ يَحْيَى ﷺ: وَسُئِلَ مَالِكٌ ﷺ عَنْ رَجُلٍ نَسِيَ أَنْ يَتَمَضْمَضَ وَيَسْتَنْثِرَ حَتَّى صَلَّى، قَالَ: لَيْسَ عَلَيْهِ أَنْ يُعِيدَ صَلاَتَهُ، وَلْيُمَضْمِضْ وَيَسْتَنْثِرْ مَا يَسْتَقْبِلُ إِنْ كَانَ يُرِيدُ أَنْ يُصَلِّيَ[1].

(فەتوا): یەحیا ﷺ گوتوویەتی: ئیمامی مالیك ﷺ پرسیاری لێکرا دەربارەی کەسێك کە لەیاد دەکات ئاو لە دەم و لووتی دەربکات تا نوێژ دەکات (ئینجا دێتەوە یادی)، (ئیمامی مالیك) گوتی: لەسەری واجب نییە نوێژەکە دووبارە بکاتەوە، (بەڵام) با ئاو لە دەم و لووتی دەربکات بۆ نوێژەکانی دیکە ئەگەر ویستی بە هەمان دەستنوێژ ئەنجامیان بدات.

## ٢- دەستنوێژی کەسی خەوتوو کاتێ هەڵدەستێ بۆ نوێژ[2]

٤٠- عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ ﷺ، أَنَّ رَسُولَ اللهِ ﷺ قَالَ: إِذَا اسْتَيْقَظَ أَحَدُكُمْ مِنْ نَوْمِهِ فَلْيَغْسِلْ يَدَهُ قَبْلَ أَنْ يُدْخِلَهَا فِي وَضُوئِهِ، فَإِنَّ أَحَدَكُمْ لاَ يَدْرِي أَيْنَ بَاتَتْ يَدُهُ[3].

واتە: لە ئەبو هورەیرەوە ﷺ گێردراوەتەوە (گوتوویەتی): پێغەمبەری خوا ﷺ فەرموویەتی: کاتێ یەکێك لە ئێوە لە خەوەکەی هەڵسا، با دەستی بشۆرێ پێش ئەوەی بیخاتە ناو ئاوی دەستنوێژەکەی، چونکە کەس لە ئێوە نازانێ دەستی لە کوێ بووە، (چونکە ڕەنگە دەستی بەر پیسییێك کەوتبێ لە کاتی خەوەکەی).

---

(١) ـ أخرجه أبو مصعب الزهري: ٤٩ في الوضوء؛ والحدثاني: ٢٤أفي الطهارة، عن مالك به.

(٢) ـ وُضُوءُ النَّائِمِ إِذَا قَامَ إِلَىَ الصَّلاَةِ.

(٣) ـ صحيح. أخرجه أبو مصعب الزهري: ٥٠ في الوضوء؛ والحدثاني: ٢٥ في الطهارة؛ والشيباني: ٩ في الصلاة؛ والشافعي: ٤١؛ وابن حنبل: ٩٩٩٧؛ والبخاري: ١٦٢ في الوضوء؛ وابن حبان: ١٠٦٣؛ والقابسي: ٣١٩، كلهم عن مالك به.

٤١- أَنَّ عُمَرَ بْنَ الْخَطَّابِ ﷺ قَالَ: إِذَا نَامَ أَحَدُكُمْ مُضْطَجِعًا فَلْيَتَوَضَّأْ[١].

واتە: عومەری کوڕی خەتتاب ﷺ گوتوویەتی: ئەگەر یەکێك لە ئێوە بە قوڵی خەوت، ئەوە با دەستنوێژ بشواتەوە[٢].

٤٢- عَنْ زَيْدِ بْنِ أَسْلَمَ ﷺ، أَنَّ تَفْسِيرَ هَذِهِ الآيَةِ: ﴿يَـٰٓأَيُّهَا ٱلَّذِينَ ءَامَنُوٓاْ إِذَا قُمْتُمْ إِلَى ٱلصَّلَوٰةِ فَٱغْسِلُواْ وُجُوهَكُمْ وَأَيْدِيَكُمْ إِلَى ٱلْمَرَافِقِ وَٱمْسَحُواْ بِرُءُوسِكُمْ وَأَرْجُلَكُمْ إِلَى ٱلْكَعْبَيْنِ ۝٦﴾ المائدة، أَنَّ ذَلِكَ إِذَا قُمْتُمْ مِنَ الْمَضَاجِعِ، يَعْنِي النَّوْمَ[٣].

واتە: لە زەیدی کوڕی ئەسلەمەوە ﷺ گێڕدراوەتەوە (گوتوویەتی): تەفسیری ئەو ئایەتەی دەفەرمووێ: ﴿يَـٰٓأَيُّهَا ٱلَّذِينَ ءَامَنُوٓاْ إِذَا قُمْتُمْ إِلَى ٱلصَّلَوٰةِ فَٱغْسِلُواْ وُجُوهَكُمْ وَأَيْدِيَكُمْ إِلَى ٱلْمَرَافِقِ وَٱمْسَحُواْ بِرُءُوسِكُمْ وَأَرْجُلَكُمْ إِلَى ٱلْكَعْبَيْنِ ۝٦﴾ المائدة، (واتە: ئەی ئەوانەی باوەڕتان هێناوە کاتێك ویستتان هەستن بۆ نوێژ، ئەوە سەرەتا ڕوخسارتان بشۆرن، ئینجا دەستەکانتان لەگەڵ ئانیشکەکانتان، پاشان دەستی تەڕ بهێنن بەسەر سەرتاندا، قاچەکانیشتان بشۆرن لەگەڵ گۆزینگەکانتاندا).

(گوتوویەتی: مەبەست بە ڕستەی: «ئەگەر هەستان» لە ئایەتەکەدا) ئەو کاتەیە کە لەسەر جێگە هەڵسان، واتە کاتێك لەخەو هەڵسان (چونکە دەستنوێژ نامێنێت و پێویستە بشۆرێتەوە).

---

(١) ـ ضعيف. أخرجه الحدثاني: ٢٥ أ في الطهارة؛ والشيباني: ٧٩ في الصلاة، عن مالك به.

(٢) ـ تێبینی: ئەو فەرموودەیە لەلای ئیمامی شافیعی لێکدانەوەکەی بەو شێوەیە نییە، چونکە وشەی «مُضْطَجِعًا» لەلای ئەو سیفەتی کەسی خەوتووە، نەك سیفەتی خەوەکە، کەواتە ماناکەی لای ئیمامی شافیعی ئاوایە: ئەگەر یەکێك لە ئێوە بەپاڵکەوتوویی خەوت، ئەوە با دەستنوێژ بشواتەوە (چونکە بە خەوتنی پاڵکەوتن ئەندامی دواوەی مرۆڤ خاو دەبێتەوە و ڕەنگە بای لێ دەرچووبێت) ئەو پێی وایە بەو شێوەیە،

(٣) ـ مقطوع صحيح. أخرجه أبو مصعب الزهري: ٥١ في الوضوء؛ والحدثاني: ٢٦ في الطهارة، عن مالك به.




**٤٣- [فتوى]** قَالَ مالِكٌ ﷺ: الأَمْرُ عِنْدَنَا أَنَّهُ لاَ يَتَوَضَّأُ مِنْ رُعَافٍ وَلاَ مِنْ دَمٍ وَلاَ مِنْ قَيْحٍ يَسِيلُ مِنَ الْجَسَدِ، وَلاَ يَتَوَضَّأُ إِلاَّ مِنْ حَدَثٍ يَخْرُجُ مِنْ ذَكَرٍ أَوْ دُبُرٍ أَوْ نَوْمٍ[١].

(فەتوا): ئیمامی مالیك ﷺ گوتوویەتی: لەلای ئێمە (نوێژخوێن) نە لە لووت بەخوێنهاتن و نە لە خوێن و نە لە کێم؛ کە لەبەر جەستەی بڕوا دەستنوێژ ناشۆرێتەوە (ئەمانە دەستنوێژ ناشکێنن)، وە دەستنوێژ ناشۆرێ تەنها لە دەستنوێژ شکانێك نەبێت بەهۆی دەرچوونی شتێك لە ئەندامی: پێشەوە و دواوە، یان بەهۆی نوستن.

**٤٤-** أَنَّ ابْنَ عُمَرَ ﷺ كَانَ يَنَامُ جَالِسًا ثُمَّ يُصَلِّي وَلاَ يَتَوَضَّأُ[٢].

واتە: ئیبنو عومەر ﷺ بەدانیشتن دەخەوت، دواتر نوێژی دەکرد و دەستنوێژی نەدەشۆردەوە.

## ٣- ئاو بۆ دەستنوێژ[٣]

**٤٥-** عَنِ الْمُغِيرَةِ بْنِ أَبِي بُرْدَةَ ﷺ، وَهُوَ مِنْ بَنِي عَبْدِ الدَّارِ، أَنَّهُ سَمِعَ أَبَا هُرَيْرَةَ ﷺ يَقُولُ: جَاءَ رَجُلٌ إِلَى رَسُولِ اللهِ ﷺ، فَقَالَ: يَا رَسُولَ اللهِ، إِنَّا نَرْكَبُ الْبَحْرَ وَنَحْمِلُ مَعَنَا الْقَلِيلَ مِنَ الْمَاءِ، فَإِنْ تَوَضَّأْنَا بِهِ عَطِشْنَا، أَفَنَتَوَضَّأُ مِنْ مَاءِ الْبَحْرِ، فَقَالَ رَسُولُ اللهِ ﷺ: هُوَ الطَّهُورُ مَاؤُهُ، الْحِلُّ مَيْتَتُهُ[٤].

---

(١) ـ أخرجه أبو مصعب الزهري: ٥٢ في الوضوء؛ وفي: ١٠٠ في الوضوء؛ والحدثاني:٢٦ أ في الطهارة، كلهم عن مالك به.

(٢) ـ صحيح. أخرجه أبو مصعب الزهري: ٥٨ في الوضوء؛ والحدثاني: ٣٠ في الطهارة؛ والشيباني: ٨٠ في الصلاة؛ والشافعي: ٢٦، كلهم عن مالك به.

(٣) ـ الطَّهُورُ لِلْوُضُوءِ.

(٤) ـ صحيح. أخرجه أبو مصعب الزهري: ٥٣ في الوضوء؛ والشيباني: ٤٦ في الصلاة؛ والشافعي: ١؛ وابن حنبل: ٧٢٣٢، وفي: ٨٧٢٠؛ والنسائي: ٥٩ في الطهارة، وفي: ٣٣٢ في المياه، وفي: ٤٣٥٠ في الصيد؛ وأبو داود: ٨٣ في الطهارة؛ والترمذي: ٦٩ في الطهارة؛ وابن ماجه: ٤٠٠ في الطهارة، وفي: ٣٢٨٧ في الصيد؛ وابن حبان: ١٢٤٣، وفي: ٥٢٥٨؛ والمنتقى لابن الجارود: ٤٣؛ والدارمي: ٢٠١١ في الصيد؛ ومصنف ابن أبي شيبة: ١٣٩٢ في الطهارات؛ والقابسي: ٢٧٢، كلهم عن مالك به.




واتە: لە موغیرەی کوڕی ئەبو بوردەوە ﷺ گێردراوەتەوە، کە لە هۆزی عەبدوددارە، گوێی لە ئەبو هورەیرە ﷺ بووە دەیگوت: پیاوێك هات بۆ لای پێغەمبەری خواﷺ و گوتی: ئەی پێغەمبەری خوا ئێمە سواری کەشتی دەبین لەناو دەریا و کەمێك ئاو لەگەڵ خۆمان هەڵدەگرین، جا ئەگەر بە ئاوەکە دەستنوێژ بشۆرین تینوومان دەبێ (واتە بۆ خواردنەوە پێویستمان دەبێ)، جا ئایا لە ئاوی دەریا دەستنوێژ هەڵبگرین (دروستە)؟ پێغەمبەری خواش ﷺ فەرمووی: دەریا ئاوەکەی پاك و پاککەرەوەیە و مردارەوەبووەکەشی حەڵاڵە.

٤٦- عَنْ حُمَيْدَةَ بِنْتِ أَبِي عُبَيْدَةَ بْنِ فَرْوَةَ ﷺ، عَنْ خالتِها كَبْشَةَ بِنْتِ كَعْبِ بْنِ مَالِكٍ ﷺ، وَكَانَتْ تَحْتَ ابْنِ أَبِي قَتَادَةَ الأَنْصَارِيِّ ﷺ، أَنَّهَا أَخْبَرَتْهَا: أَنَّ أَبَا قَتَادَةَ ﷺ دَخَلَ عَلَيْهَا، فَسَكَبَتْ لَهُ وَضُوءًا، فَجَاءَتْ هِرَّةٌ لِتَشْرَبَ مِنْهُ، فَأَصْغَى لَهَا الإِنَاءَ حَتَّى شَرِبَتْ.

قَالَتْ كَبْشَةُ ﷺ: فَرَآنِي أَنْظُرُ إِلَيْهِ، فَقَالَ: أَتَعْجَبِينَ يَا ابْنَةَ أَخِي؟ قَالَتْ: فَقُلْتُ: نَعَمْ، فَقَالَ: إِنَّ رَسُولَ اللهِ ﷺ قَالَ: إِنَّهَا لَيْسَتْ بِنَجَسٍ، إِنَّمَا هِيَ مِنَ الطَّوَّافِينَ عَلَيْكُمْ أَوِ الطَّوَّافَاتِ[١].

قَالَ يَحْيَى ﷺ: قَالَ مَالِكٌ ﷺ: لاَ بَأْسَ بِهِ، إِلاَّ أَنْ يُرَى عَلَى فَمِهَا نَجَاسَةٌ.

واتە: لە حومەیدەی کچی ئەبو عوبەیدەی کوڕی فەڕوەوە ﷺ گێردراوەتەوە، ئەویش لە خوشکی دایکیەوە کە کەبشەی کچی کەعبی کوڕی مالیکە ﷺ کە لەژێر نیکاحی کوڕی ئەبو قەتادەی ئەنصاری ﷺ بووە (واتە خێزانی بووە) گێڕاویەتەوە، هەواڵی پێداوە گوتوویەتی: (جارێکیان) ئەبو قەتادە ﷺ (کە خەزوریەتی) هاتووە بۆ لای ئەویش هەندێك ئاوی بۆ ڕشتە ناو جامێکەوە و پشیلەیەکیش هات تا لە ئاوەکە بخواتەوە، ئەبو قەتادەش ﷺ جامەکەی بۆ لار کردەوە تا خواردیەوە، کەبشە ﷺ دەڵێت: ئەبو قەتادە ﷺ منی بینی (بەسەرسوڕمانەوە) سەیری دەکەم، بۆیە گوتی: ئەی کچی برام پێت سەیرە؟ گوتم: بەڵێ، گوتی: پێغەمبەری خوا ﷺ

---

(١) ـ صحيح. أخرجه أبو مصعب الزهري: ٥٤ في الوضوء؛ والشيباني: ٩٠ في الصلاة؛ والشافعي: ١٠؛ وابن حنبل: ٢٢٦٣٣، وفي: ٢٢٦٨٩؛ والنسائي: ٦٨ في الطهارة، وفي: ٣٤٠ في المياه؛ وأبو داود: ٧٥ في الطهارة؛ والترمذي: ٩٢ في الطهارة؛ وابن ماجه: ٣٧٩ في الطهارة؛ وابن حبان: ١٢٩٩؛ والمنتقى لابن الجارود: ٦٠؛ ومصنف ابن أبي شيبة: ٣٢٥ في الطهارات، وفي: ٣٦٣٣٧ في الرد على أبي حنيفة؛ والقابسي: ١٢٣، كلهم عن مالك به.



فەرموویەتی: پشیلە پیس نییە، بەڵكوو یەكێكە لەو ئاژەڵ و زیندەوەرە پاكانەی كە زۆر بەسەرتاندا دەسوڕێنەوە و هاموشۆتان دەكەن (وەك مەڕ و بزن و مانگا و باڵندە... هتد، وایە).

یەحیا ﷺ گوتوویەتی: ئیمامی مالیك ﷺ گوتوویەتی: (بە بەڵگەی ئەم فەرموودەیە، پاشماوەی دەمی پشیلە) هیچ كێشەی نییە، تەنها لە كاتێكدا نەبێت كە پیسییەك بەدەمیەوە ببینرێت.

**٤٧-** أَنَّ عُمَرَ بْنَ الْخَطَّابِ ﷺ خَرَجَ فِي رَكْبٍ فِيهِمْ عَمْرُو بْنُ الْعَاصِ ﷺ، حَتَّى وَرَدُوا حَوْضًا، فَقَالَ عَمْرُو بْنُ الْعَاصِ ﷺ لِصَاحِبِ الْحَوْضِ: يَا صَاحِبَ الْحَوْضِ، هَلْ تَرِدُ حَوْضَكَ السِّبَاعُ؟ فَقَالَ عُمَرُ بْنُ الْخَطَّابِ ﷺ: يَا صَاحِبَ الْحَوْضِ لاَ تُخْبِرْنَا، فَإِنَّا نَرِدُ عَلَى السِّبَاعِ، وَتَرِدُ عَلَيْنَا[(١)].

واتە: عومەری كوڕی خەتتاب ﷺ لەگەڵ كاروانێك دەرچوو عەمری كوڕی عاصیشیان ﷺ تیا بوو، (ڕۆیشتن) تا چوونە سەر حەوزێك، عەمری كوڕی عاص ﷺ بە خاوەنی حەوزەكەی گوت: ئەی خاوەنی حەوز ئایا ئاژەڵان دێن بۆ سەر حەوزەكەت؟ عومەری كوڕی خەتتابیش ﷺ گوتی: ئەی خاوەنی حەوز پێمان مەڵێ (پێویست ناكات)، چونكە ئێمە دەچینە سەر شتەكانی ئاژەڵان و ئەوانیش دێن بۆ سەر شتەكانی ئێمە (كەواتە ئاوخواردنەوەیان لەم حەوزە پیسی ناكات).

**٤٨-** أَنَّ عَبْدَ اللهِ بْنَ عُمَرَ ﷺ كَانَ يَقُولُ: إِنْ كَانَ الرِّجَالُ وَالنِّسَاءُ فِي زَمَانِ رَسُولِ اللهِ ﷺ لَيَتَوَضَّؤُونَ جَمِيعًا[(٢)].

واتە: عەبدوڵڵای كوڕی عومەر ﷺ دەیگوت: پیاو و ئافرەت (ی مەحرەمی یەكدی) لە سەردەمی پێغەمبەری خوا ﷺ بەیەكەوە (لە ئاوی یەك تەشت) دەستنوێژیان دەشۆرد (لە تەشتەكە بە دەستەكانیان ئاویان بۆ خۆیان دەردەهێنا).

---

(١) ـ ضعيف. أخرجه أبو مصعب الزهري: ٥٥ في الوضوء؛ والشيباني: ٤٥ في الصلاة، عن مالك به.

(٢) ـ صحيح. أخرجه أبو مصعب الزهري: ٥٦ في الوضوء؛ والحدثاني: ٢٨أفي الطهارة؛ والشيباني: ٣٥ في الصلاة؛ والشافعي: ١٣؛ وابن حنبل: ٥٩٢٨؛ والبخاري: ١٩٣ في الوضوء؛ والنسائي: ٧١ في الطهارة، وفي: ٣٤٢ في المياه؛ وأبو داود: ٧٩ في الطهارة؛ وابن ماجه: ٣٩٤ في الطهارة؛ وابن حبان: ١٢٦٥؛ والقابسي: ٢٠٦، كلهم عن مالك به.





## ٤- ئەو شتانەی دەستنوێژشۆردنەوەیان بۆ واجب نییە[١]

٤٩- عَنْ أُمِّ وَلَدٍ لإِبْرَاهِيمَ بْنِ عَبْدِ الرَّحْمَنِ بْنِ عَوْفٍ ﷺ، أَنَّهَا سَأَلَتْ أُمَّ سَلَمَةَ ﵂، زَوْجَ النَّبِيِّ ﷺ، فَقَالَتْ: إِنِّي امْرَأَةٌ أُطِيلُ ذَيْلِي، وَأَمْشِي فِي الْمَكَانِ الْقَذِرِ، قَالَتْ أُمُّ سَلَمَةَ ﵂: قَالَ رَسُولُ اللهِ ﷺ: يُطَهِّرُهُ مَا بَعْدَهُ[٢].

واتە: لە ئافرەتێکی کەنیزەکی ئیبراهیمی کوڕی عەبدوڕڕەحمانی کوڕی عەوفەوە ﷺ گێڕدراوەتەوە پرسیاری لە ئوممو سەلەمەی ﵂ خێزانی پێغەمبەری خوا ﷺ کردووە و گوتوویەتی: من ئافرەتێکم دامەنی کراسەکەم درێژ دەکەم و بە شوێنی پیسدا تێ دەپەڕم، ئوم سەلەمەش ﵂ گوتی: پێغەمبەری خوا ﷺ فەرموویەتی: (خۆڵی پاکی) دواتر پاکی دەکاتەوە (واتە: ئەو زەوییە پاکەی کە دواتر دامێنی پۆشاکەکەی لێ دەخشێت پاکی دەکاتەوە و شوشتنی ناوێ، بەڵام لەلای ئیمامی مالیك و ئیمامی شافیعی و زۆربەی زانایان تایبەتە بە پیسایی وشك نەك پیسایی تەڕ، وەك خۆڵی پیس و شتی لەو جۆرە، چونکە پیسایی تەڕ تەنها بە ئاو خاوێن دەبێتەوە).

٥٠- عَنْ مالِكٍ ﵀، أَنَّهُ رَأَى رَبِيعَةَ بْنَ أَبِي عَبْدِ الرَّحْمَنِ يَقْلِسُ مِرَارًا وَهُوَ فِي الْمَسْجِدِ، فَلاَ يَنْصَرِفُ، وَلاَ يَتَوَضَّأُ، حَتَّى يُصَلِّيَ[٣].

واتە: لە ئیمامی مالیکەوە ﵀ گێڕدراوەتەوە بەوەی ڕەبیعەی کوڕی ئەبو عەبدوڕڕەحمانی بینیوە چەندین جار لەناو مزگەوت خواردنی هاتۆتەوە (واتە یەك جار ئیستفراقی کردووە وەك ڕشانەوە خواردن لە گەدەی هاتۆتە دەرەوە، بەڵام یەك جار بووە، وەك ڕشانەوە چەند جارێك لەسەر یەك نەبووە)، جا نەڕۆیشتۆتە دەرەوە و دەستنوێژی نەشۆردۆتەوە تا نوێژی کردووە.

---

(١) ـ مَا لَا يَجِبُ مِنْهُ الْوُضُوءُ.

(٢) ـ صحيح لغيره. أخرجه أبو مصعب الزهري: ٥٧ في الوضوء؛ وفي: ١٩١٨ في الجامع؛ والحدثاني: ٢٩ في الطهارة؛ والشيباني: ٢٩٩ في الصلاة؛ والشافعي: ٢٠٨؛ وأبو داود: ٣٨٣ في الطهارة؛ والترمذي: ١٤٣ في الطهارة؛ وابن ماجه: ٥٥٣ في الطهارة؛ والدارمي: ٧٤٢ في الطهارة؛ والقابسي: ٩٥، كلهم عن مالك به.

(٣) ـ مقطوع صحيح. أخرجه أبو مصعب الزهري: ٦٠ في الوضوء؛ والحدثاني: ٣٢ في الطهارة، عن مالك به.

٥١- [فتوى] قَالَ يَحْيَى ﷺ: وَسُئِلَ مَالِكٌ ﷺ عَنْ رَجُلٍ قَلَسَ طَعَامًا، هَلْ عَلَيْهِ وُضُوءٌ؟ فَقَالَ: لَيْسَ عَلَيْهِ وُضُوءٌ، وَلْيَتَمَضْمَضْ مِنْ ذَلِكَ، وَلْيَغْسِلْ فَاهُ[1].

(فەتوا): یەحیا ﷺ گوتوویەتی: ئیمامی مالیك ﷺ پرسیاری لێکرا دەربارەی پیاوێك ئیستفراق بکات و خواردن بهێنێتەوە (وەك ڕشانەوە، بەڵام یەك جار بێت ئیستفراق بێت نەك ڕشانەوە) ئایا دەستنوێژشۆردنەوەی لەسەرە؟ گوتی: دەستنوێژشۆردنەوەی لەسەر نییە، با ئاو لە دەمی وەربکات بەهۆی ئەمەوە، وە با دەمیشی بشۆرێ.

٥٢- عَنْ نَافِعٍ ﷺ، أَنَّ عَبْدَ اللهِ بْنَ عُمَرَ ﷺ حَنَّطَ ابْنًا لِسَعِيدِ بْنِ زَيْدٍ ﷺ وَحَمَلَهُ، ثُمَّ دَخَلَ الْمَسْجِدَ، فَصَلَّى وَلَمْ يَتَوَضَّأْ[2].

واتە: لە نافیعەوە ﷺ گێڕدراوەتەوە (گوتوویەتی): عەبدوڵڵای کوڕی عومەر ﷺ کوڕێکی سەعدی کوڕی زەیدی ﷺ بۆنخۆش کرد و هەڵیگرت (کە مردبوو)، دواتر چوو بۆ مزگەوت و نوێژی کرد و دەستنوێژیشی نەشۆردەوە (واتە هەڵگرتنی مردوو دەستنوێژ ناشکێنێ).

٥٣- [فتوى] قَالَ يَحْيَى ﷺ: وَسُئِلَ مَالِكٌ ﷺ، هَلْ فِي الْقَيْءِ وُضُوءٌ؟ قَالَ: لاَ، وَلَكِنْ لِيَتَمَضْمَضْ مِنْ ذَلِكَ، وَلْيَغْسِلْ فَاهُ، وَلَيْسَ عَلَيْهِ وُضُوءٌ.

(فەتوا): یەحیا ﷺ گوتوویەتی: ئیمامی مالیك ﷺ پرسیاری لێ کرا: ئایا لە ڕشانەوەدا دەستنوێژ شۆردنەوە هەیە؟ گوتی: نەخێر، بەڵام بۆ ئەوە با ئاو لە دەمی وەربکات، وە دەمیشی بشۆری، دەستنوێژیشی لەسەر نییە (دەستنوێژ ناشکێنێ).

---

(١) ـ أخرجه أبو مصعب الزهري: ٦١ في الوضوء، عن مالك به.

(٢) ـ صحيح. أخرجه أبو مصعب الزهري: ٥٩ في الوضوء؛ والحدثاني: ٣١ في الطهارة؛ والشيباني: ٣١٥ في الجنائز، كلهم عن مالك به.




## ٥- نەشۆردنەوەی دەستنوێژ لەو خواردنانەی ئاگر کاری تێکردوون[١]

٥٤- عَنْ عَبْدِ اللهِ بْنِ عَبَّاسٍ ، أَنَّ رَسُولَ اللهِ ﷺ أَكَلَ كَتِفَ شَاةٍ، ثُمَّ صَلَّى وَلَمْ يَتَوَضَّأْ[٢].

واتە: لە عەبدوڵڵای کوڕی عەبباسەوە  گێڕدراوەتەوە (گوتوویەتی): پێغەمبەری خوا ﷺ لە گۆشتی پیلی مەڕێکی خوارد، دواتر نوێژی کرد و دەستنوێژی نەشۆردەوە.

٥٥- عَنْ بُشَيْرِ بْنِ يَسَارٍ ، مَوْلَى بَنِي حَارِثَةَ، عَنْ سُوَيْدِ بْنِ النُّعْمَانِ ، أَنَّهُ أَخْبَرَهُ، أَنَّهُ خَرَجَ مَعَ رَسُولِ اللهِ ﷺ عَامَ خَيْبَرَ، حَتَّى إِذَا كَانُوا بِالصَّهْبَاءِ، وَهِيَ مِنْ أَدْنَى خَيْبَرَ، نَزَلَ رَسُولُ اللهِ ﷺ فَصَلَّى الْعَصْرَ، ثُمَّ دَعَا بِالأَزْوَادِ، فَلَمْ يُؤْتَ إِلاَّ بِالسَّوِيقِ، فَأَمَرَ بِهِ فَثُرِّيَ، فَأَكَلَ رَسُولُ اللهِ ﷺ، وَأَكَلْنَا، ثُمَّ قَامَ إِلَى الْمَغْرِبِ، فَمَضْمَضَ وَمَضْمَضْنَا، ثُمَّ صَلَّى وَلَمْ يَتَوَضَّأْ[٣].

واتە: لە بوشەیری کوڕی یەسار خزمەتکاری بەنی حاریسەوە  گێڕدراوەتەوە، ئەویش سوەیدی کوڕی نوعمان  هەواڵی پێ داوە کە خۆی لەگەڵ پێغەمبەری خوا ﷺ دەرچوو لە ساڵی فەتحی خەیبەر تا گەیشتن بە صەهبا کە لە خواری خوارەوەی خەیبەرە (لە لای مەدینە)، جا پێغەمبەری خوا ﷺ دابەزی نوێژی عەسری کرد، دواتر داوای زاد و خۆراکی کرد، جا تەنها سەویقیان بۆ هێنا (هیچی دیکەیان پێ نەبوو، سەویق ئاردی جۆی برژاوە وەك مەحلەبی لێدەکرێ)، فەرمانی کرد بە ئاو تەڕ کرا (بە ئاو ڕشاندیان)، جا پێغەمبەری خوا ﷺ خواردی و ئێمەش خواردمان، دواتر بۆ نوێژی مەغریب هەڵسا و ئاوی لە دەمی وەرکرد و ئێمەش ئاومان لە دەمان وەرکرد، دواتر نوێژی کرد و دەستنوێژی نەشۆردەوە.

---

(١) ـ تَرْكُ الْوُضُوءِ مِماَّ مَسَّتِ النَّارُ.

(٢) ـ صحيح. أخرجه أبو مصعب الزهري: ٦٢ في الوضوء؛ والحدثاني: ٣٣ في الطهارة؛ والشيباني: ٣٠ في الصلاة؛ وابن حنبل: ١٩٨٨؛ والبخاري: ٢٠٧ في الوضوء؛ ومسلم: الحيض: ٩١؛ وأبو داود: ١٨٧ في الطهارة؛ وابن حبان: ١١٤٣، وفي: ١١٤٤؛ وشرح معاني الآثار: ٣٦٧؛ والقابسي: ١٧٠، كلهم عن مالك به.

(٣) ـ صحيح. أخرجه أبو مصعب الزهري: ٦٣ في الوضوء؛ والحدثاني: ٣٣ أ في الطهارة؛ والشيباني: ٣٤ في الصلاة؛ والبخاري: ٢٠٩ في الوضوء، وفي: ٤١٩٥ في المغازي؛ والنسائي: ١٨٦ في الطهارة؛ وابن حبان: ١١٥٥؛ والقابسي: ٥٠٠، كلهم عن مالك به.




٥٦- عَنْ رَبِيعَةَ بْنِ عَبْدِ اللهِ بْنِ الْهُدَيْرِ ﵀، أَنَّهُ تَعَشَّى مَعَ عُمَرَ بْنِ الْخَطَّابِ ﵁، ثُمَّ صَلَّى وَلَمْ يَتَوَضَّأْ[١].

واتە: لە ڕەبیعەی کوڕی عەبدوڵڵای کوڕی هودەیرەوە ﵀ گێڕدراوەتەوە، نانی ئێوارەی لەگەڵ عومەری کوڕی خەتتاب ﵁ خواردووە (لە کاتێکدا خواردنی کوڵاو هەبوو) دواتر نوێژی کرد و دەستنوێژی نەشۆردەوە.

٥٧- أَنَّ عُثْمَانَ بْنَ عَفَّانَ ﵁ أَكَلَ خُبْزًا وَلَحْمًا، ثُمَّ مَضْمَضَ وَغَسَلَ يَدَيْهِ، وَمَسَحَ بِهِمَا وَجْهَهُ، ثُمَّ صَلَّى وَلَمْ يَتَوَضَّأْ[٢].

واتە: عوسمانی عوڕی عەففان ﵁ نان و گۆشتی خوارد، دواتر ئاوی لە دەمی وەرکرد و دەستەکانی شۆرد و بە ڕوخساریدا هێنا، دواتر نوێژی کرد و دەستنوێژی نەشۆردەوە.

٥٨- أَنَّ عَلِيَّ بْنَ أَبِي طَالِبٍ وَعَبْدَ اللهِ بْنَ عَبَّاسٍ ﵄ كَانَا لاَ يَتَوَضَّآنِ مِمَّا مَسَّتِ النَّارُ[٣].

واتە: عەلی کوڕی ئەبی تاڵیب و عەبدوڵڵای کوڕی عەبباس ﵄ دەستنوێژیان نەدەشۆردەوە بەهۆی خواردنی خۆراکێك کە ئاگر کاری تێ کردبێت.

٥٩- عَنْ يَحْيَى بْنِ سَعِيدٍ ﵀، أَنَّهُ سَأَلَ عَبْدَ اللهِ بْنَ عَامِرِ بْنِ رَبِيعَةَ ﵀ عَنِ الرَّجُلِ يَتَوَضَّأُ لِلصَّلاَةِ، ثُمَّ يُصِيبُ طَعَامًا قَدْ مَسَّتْهُ النَّارُ، أَيَتَوَضَّأُ؟ قَالَ: رَأَيْتُ أَبِي يَفْعَلُ ذَلِكَ وَلاَ يَتَوَضَّأُ[٤].

واتە: لە یەحیای کوڕی سەعیدەوە ﵀ گێڕدراوەتەوە پرسیاری لە عەبدوڵڵای کوڕی عامیری کوڕی ڕەبیعە ﵀ کرد دەربارەی کەسێك دەستنوێژ بۆ نوێژ هەڵدەگرێ دواتر خواردنێك دەخوا کە ئاگر کاری تێ کردووە، ئایا دەستنوێژ دەشۆرێتەوە؟

---

(١) ـ صحيح. أخرجه أبو مصعب الزهري: ٦٤ في الوضوء؛ والحدثاني: ٣٤ في الطهارة؛ والشيباني: ٣١ في **الصلاة**، كلهم عن مالك به.

(٢) ـ صحيح. أخرجه أبو مصعب الزهري: ٦٥ في الوضوء؛ والحدثاني: ٣٤أفي الطهارة؛ والشيباني: ٣٢ في **الصلاة**، كلهم عن مالك به.

(٣) ـ صحيح لغيره. أخرجه أبو مصعب الزهري: ٦٦ في الوضوء؛ والحدثاني: ٣٥ في الطهارة، عن مالك به.

(٤) ـ صحيح. أخرجه أبو مصعب الزهري: ٦٧ في الوضوء؛ والشيباني: ٣٣ في الصلاة، عن مالك به.




عەبدوڵڵا ﷺ گوتی: باوکمم بینیوە ئاوای دەکرد (واتە: ئەو خواردنانەی دەخوارد کە ئاگر کاری تێدەکرد) و دەستنوێژیشی نەدەشۆردەوە.

٦٠- عَنْ أَبِي نُعَيْمٍ وَهْبِ بْنِ كَيْسَانَ ﷺ، أَنَّهُ سَمِعَ جَابِرَ بْنَ عَبْدِ اللهِ الأَنْصَارِيَّ ﷺ يَقُولُ: رَأَيْتُ أَبَا بَكْرٍ الصِّدِّيقَ ﷺ أَكَلَ لَحْمًا، ثُمَّ صَلَّى وَلَمْ يَتَوَضَّأْ[1].

واتە: لە ئەبو نوعەیم کە دەکاتە وەهبی کوڕی کیسان ﷺ گێڕدراوەتەوە، گوێی لە جابری کوڕی عەبدوڵڵای ئەنصاری ﷺ بوو دەیگوت: ئەبو بەکری صددیقم ﷺ بینی گۆشتی خوارد، دواتر نوێژی کرد و دەستنوێژی نەشۆردەوە.

٦١- عَنْ مُحَمَّدِ بْنِ الْمُنْكَدِرِ ﷺ، أَنَّ رَسُولَ اللهِ ﷺ دُعِيَ لِطَعَامٍ، فَقُرِّبَ إِلَيْهِ خُبْزٌ وَلَحْمٌ، فَأَكَلَ مِنْهُ، ثُمَّ تَوَضَّأَ، ثُمَّ صَلَّى، ثُمَّ أُتِيَ بِفَضْلِ ذَلِكَ الطَّعَامِ فَأَكَلَ مِنْهُ، ثُمَّ صَلَّى وَلَمْ يَتَوَضَّأْ[2].

واتە: لە موحەممەدی کوڕی مونکەدیرەوە ﷺ گێڕدراوەتەوە (گوتوویەتی): پێغەمبەری خوا ﷺ بۆ خواردنێك بانگ کرا، جا نان و گۆشتی هێنرایە پێش و لێی خوارد، دواتر دەستنوێژی شۆرد و نوێژی کرد، دواتر (بۆ نوێژی داهاتوو) ئەوەی مابویەوە لە خواردنەکە دووبارە بۆی هێنرا و لێی خوارد، دواتر نوێژی کرد و دەستنوێژی نەشۆردەوە.

٦٢- عَنْ عَبْدِ الرَّحْمَنِ بْنِ زَيْدٍ الأَنْصَارِيِّ ﷺ، أَنَّ أَنَسَ بْنَ مَالِكٍ ﷺ قَدِمَ مِنَ الْعِرَاقِ، فَدَخَلَ عَلَيْهِ أَبُو طَلْحَةَ وَأُبَيُّ بْنُ كَعْبٍ ﷺ، فَقَرَّبَ لَهُمَا طَعَامًا قَدْ مَسَّتْهُ النَّارُ، فَأَكَلُوا مِنْهُ، فَقَامَ أَنَسٌ ﷺ فَتَوَضَّأَ، فَقَالَ أَبُو طَلْحَةَ وَأُبَيُّ بْنُ كَعْبٍ ﷺ: مَا هَذَا يَا أَنَسُ أَعِرَاقِيَّةٌ؟ فَقَالَ أَنَسٌ: لَيْتَنِي لَمْ أَفْعَلْ، وَقَامَ أَبُو طَلْحَةَ وَأُبَيُّ بْنُ كَعْبٍ ﷺ، فَصَلَّيَا وَلَمْ يَتَوَضَّآ[3].

واتە: لە عەبدوڕڕەحمانی کوڕی زەیدی ئەنصاریەوە ﷺ گێڕدراوەتەوە (گوتوویەتی): ئەنەسی کوڕی مالیك ﷺ لە عێراق هاتەوە و ئەبو تەڵحە و ئوبەی کوڕی کەعب ﷺ چوونە ژوورەوە بۆ لای، ئەنەسیش ﷺ خواردنێکی هێنانە

---

(١) ـ صحيح. أخرجه أبو مصعب الزهري: ٦٩ في الوضوء؛ والحدثاني: ٣٥ب في الطهارة؛ والشيباني: ٢٩ في الصلاة، عن مالك به.

(٢) ـ صحيح. أخرجه أبو مصعب الزهري: ٦٨ في الوضوء؛ والحدثاني: ٣٥ أ في الطهارة، عن مالك به.

(٣) ـ موقوف حسن. أخرجه أبو مصعب الزهري: ٧٠ في الوضوء، عن مالك به.




بەردەم کە ئاگر کاری تێکردبوو، هەرسێکیان لێیان خوارد، جا ئەنەس ﷺ هەڵسا و دەستنوێژی شۆرد، (ئەوانیش وایانزانی لەبەر خواردنە کوڵاوەکە دەستنوێژ دەشواتەوە، کەچی لەبەر ئەوەشی نەبوو)، جا ئەبو تەڵحە و ئوبەی کوڕی کەعب ﷺ (بە ڕەخنە) گوتیان: ئەوە چییە ئەی ئەنەس زانستێکی عێراقییە؟! ئەنەسیش ﷺ گوتی: خۆزگە وامنەکردایە (خۆ مەبەستم ئەوە نەبوو)، جا ئەبو تەڵحە و ئوبەی کوڕی کەعب ﷺ هەڵسان نوێژیان کرد و دەستنوێژیان نەشۆردەوە.

## ٦- بابەتی جۆراوجۆر دەربارەی دەستنوێژ[١]

٦٣- عَنْ هِشَامِ بْنِ عُرْوَةَ ﷺ، عَنْ أَبِيهِ ﷺ، أَنَّ رَسُولَ اللهِ ﷺ سُئِلَ عَنِ الاِسْتِطَابَةِ، فَقَالَ: أَوَلاَ يَجِدُ أَحَدُكُمْ ثَلاَثَةَ أَحْجَارٍ؟[٢].

واتە: لە هیشامی کوڕی عوڕوەوە ﷺ گێڕدراوەتەوە، ئەویش لە باوکیەوە ﷺ گێڕاویەتەوە (گوتوویەتی): پێغەمبەری خوا ﷺ پرسیاری لێکرا دەربارەی خۆپاککردنەوە (تارەتکردن)، ئەویش فەرمووی: مەگەر کەسێك لە ئێوە سێ بەردی دەستناکەوێ؟ (واتە لانی کەم بە سێ بەرد خۆتان پاك بکەنەوە).

٦٤- عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ ﷺ، أَنَّ رَسُولَ اللهِ ﷺ خَرَجَ إِلَى الْمَقْبَرَةِ، فَقَالَ: السَّلاَمُ عَلَيْكُمْ دَارَ قَوْمٍ مُؤْمِنِينَ، وَإِنَّا إِنْ شَاءَ اللهُ بِكُمْ لاَحِقُونَ، وَدِدْتُ أَنِّي قَدْ رَأَيْتُ إِخْوَانَنَا، فَقَالُوا: يَا رَسُولَ اللهِ، أَلَسْنَا بِإِخْوَانِكَ؟ قَالَ: بَلْ أَنْتُمْ أَصْحَابِي، وَإِخْوَانُنَا الَّذِينَ لَمْ يَأْتُوا بَعْدُ، وَأَنَا فَرَطُهُمْ عَلَى الْحَوْضِ، فَقَالُوا: يَا رَسُولَ اللهِ، كَيْفَ تَعْرِفُ مَنْ يَأْتِي بَعْدَكَ مِنْ أُمَّتِكَ؟ قَالَ: أَرَأَيْتَ لَوْ كَانَ لِرَجُلٍ خَيْلٌ غُرٌّ مُحَجَّلَةٌ فِي خَيْلٍ دُهْمٍ بُهْمٍ أَلاَ يَعْرِفُ خَيْلَهُ؟ قَالُوا: بَلَى، يَا رَسُولَ اللهِ، قَالَ: فَإِنَّهُمْ يَأْتُونَ يَوْمَ الْقِيَامَةِ غُرًّا مُحَجَّلِينَ مِنَ الْوُضُوءِ، وَأَنَا فَرَطُهُمْ عَلَى الْحَوْضِ، فَلاَ يُذَادَنَّ رَجُلٌ عَنْ حَوْضِي كَمَا يُذَادُ الْبَعِيرُ الضَّالُّ، أُنَادِيهِمْ: أَلاَ هَلُمَّ، أَلاَ هَلُمَّ، أَلاَ هَلُمَّ، فَيُقَالُ: إِنَّهُمْ قَدْ بَدَّلُوا بَعْدَكَ، فَأَقُولُ: فَسُحْقًا، فَسُحْقًا، فَسُحْقًا[٣].

---

(١) ـ جَامِعُ الْوُضُوءِ.

(٢) ـ صحيح لغيره. أخرجه أبو مصعب الزهري: ٧١ في الوضوء، عن مالك به.

(٣) ـ صحيح. أخرجه أبو مصعب الزهري: ٧٢ في الوضوء؛ وابن حنبل: ٨٨٦٥؛ ومسلم: الطهارة: ١: ٣٩؛




واتە: لە ئەبو هورەیرەوە ﷺ گێردراوەتەوە (گوتوویەتی): پێغەمبەری خوا ﷺ دەرچوو بۆ گۆڕستان و فەرمووی: ((السَّلاَمُ عَلَيْكُمْ دَارَ قَوْمٍ مُؤْمِنِينَ، وَإِنَّا إِنْ شَاءَ اللهُ بِكُمْ لاَحِقُونَ)) واتە: ((سڵاوی خواتان لێ بێ ئەی ماڵی کۆمەڵی بڕواداران، وە ئێمەش هەر کاتێ خوا ویستی لێ بێ بەئێوە دەگەینەوە))، (دواتر فەرمووی): حەزم دەکرد براکانی خۆمانمان ببینیایە، هاوەڵەکانیش (خوا لێیان ڕازی بێ) گوتیان: ئەی پێغەمبەری خوا ﷺ مەگەر ئێمە براکانت نین؟ فەرمووی: (نەخێر) بەڵکوو ئێوە هاوەڵمن، براکانمان ئەوانەن هێشتا نەهاتوون (لە دایك نەبوون)، من پێشیان دەکەوم بۆ سەر حەوزی کەوسەر (لەوێ پێشوازیان لێ دەکەم بۆ نۆشین و پێدانی ئاوە زوڵاڵەکەی حەوزی کەوسەر)، هاوەڵانیش (خوا لێیان ڕازی بێ) گوتیان: ئەی پێغەمبەری خوا ﷺ چۆن ئەوانە دەناسیتەوە کە لەمەودوا دێن لە ئوممەتەکەت؟ فەرمووی: پێم بڵێن ئەگەر پیاوێك ئەسپێکی هەبێت ناوچەوان و سێ قاچی سپی بێت لەناو کۆمەڵە ئەسپێکی سەرتاپا ڕەش بێت ئایا ئەسپەکەی خۆی ناناسێتەوە؟ گوتیان: بۆنا ئەی پێغەمبەری خوا ﷺ، پێغەمبەری خواش ﷺ فەرمووی: ئەوان لە ڕۆژی دواییدا بە ناوچەوان و دەست و قاچی سپی و ڕووناکەوە دێن، بەهۆی دەستنوێژەوە، وە من پێشیان دەکەوم بۆ سەر حەوزی کەوسەر (کە دێن من لەوێ چاوەڕێیان دەکەم)، هەر کەسێك (لەوانەی شوێنەواری دەستنوێژیان پێوەیە، لەلایەن فریشتەکانەوە) دەربکرێن لەسەر حەوزەکەم وەك وشتری بێخاوەن، ئەوە من بانگیان دەکەم: وەرن وەرن وەرن، جا دەگوترێت: ئەوانە ڕێبازی تۆیان گۆڕی (واتە: بەرەو کوفر و نیفاق و ڕێبازی نابەجێ ڕۆیشتن، کە هەمووی گۆڕینی ڕێبازی پێغەمبەری خوایە ﷺ)، منیش دەڵێم: دەك دوور بن (لە ڕەحمەتی خوا) دوور بن دوور بن.

**٦٥-** عَنْ حُمْرَانَ، مَوْلَى عُثْمَانَ بْنِ عَفَّانَ ﷺ، أَنَّ عُثْمَانَ بْنَ عَفَّانَ ﷺ جَلَسَ عَلَى الْمَقَاعِدِ، فَجَاءَ الْمُؤَذِّنُ فَآذَنَهُ بِصَلاَةِ الْعَصْرِ، فَدَعَا بِمَاءٍ فَتَوَضَّأَ، ثُمَّ قَالَ: وَاللَّهِ لأُحَدِّثَنَّكُمْ حَدِيثًا، لَوْلاَ أَنَّهُ فِي كِتَابِ اللهِ مَا حَدَّثْتُكُمُوهُ، ثُمَّ قَالَ: سَمِعْتُ رَسُولَ اللهِ ﷺ يَقُولُ: مَا مِنِ امْرِئٍ يَتَوَضَّأُ، فَيُحْسِنُ وُضُوءَهُ، ثُمَّ يُصَلِّي الصَّلاَةَ، إِلاَّ غُفِرَ لَهُ مَا بَيْنَهُ وَبَيْنَ الصَّلاَةِ الأُخْرَى حَتَّى يُصَلِّيَهَا[1].

---

والنسائي: ١٥٠ في الطهارة؛ وأبو داود: ٣٢٣٧ في الجنائز؛ وابن حبان: ١٠٤٦، وفي: ٣١٧١، وفي: ٧٢٤٠؛ والقابسي: ١٣٣، كلهم عن مالك به.

(١) ـ صحيح. أخرجه أبو مصعب الزهري: ٧٣ في الوضوء؛ والحدثاني: ٣٦ في الطهارة؛ والنسائي: ١٤٦ في




قَالَ يَحْيَى ﷺ: قَالَ مَالِكٌ ﷺ: أُرَاهُ يُرِيدُ هَذِهِ الآيَةَ: ﴿ وَأَقِمِ ٱلصَّلَوٰةَ طَرَفَىِ ٱلنَّهَارِ وَزُلَفًا مِّنَ ٱلَّيۡلِۚ إِنَّ ٱلۡحَسَنَٰتِ يُذۡهِبۡنَ ٱلسَّيِّـَٔاتِۚ ذَٰلِكَ ذِكۡرَىٰ لِلذَّٰكِرِينَ ﴿١١٤﴾ ﴾ هود.

واتە: لە حومرانی خزمەتکاری ئازادکراوی عوسمانی کوڕی عەففانەوە ﷺ گێردراوەتەوە (گوتوویەتی): عوسمانی کوڕی عەففان ﷺ لەسەر سەکۆیەکان دانیشتبوو (کە خەڵك لەسەری دادەنیشتن بۆ کۆبوونەوە لەدەورەی یەکتری و پرسیارکردن و گفتوگۆ)، جا بانگبێژەکە هات بە ئیمامی عوسمانی ڕاگەیاند ﷺ بەوەی کاتی نوێژی عەسر نزیکە، ئەویش داوای ئاوی کرد و دەستنوێژی شۆرد، دواتر گوتی: سوێند بە خوا قسەیەکتان بۆ دەکەم ئەگەر لە پەرتووکی خوادا ﷻ نەبووایە بۆم باس نەدەکردن (لە ترسی ئەوەی تەمەڵی لە کردەوەی چاك بکەن)، دواتر گوتی: گوێم لە پێغەمبەری خوا ﷺ بوو دەیفەرموو: هەر کەسێك دەستنوێژ بشۆرێ بەشێوەیەکی تێروتەسەل و جوان، دواتر نوێژ بکات، حەتمەن لە تاوانە بچووکەکانی نێوانی ئەو نوێژە تا نوێژێکی دیکەی دەبوردرێت تا نوێژەکەی دیکەی ئەنجام دەدات (واتە سەرەتا و کۆتایی لێخۆشبوونەکە هاوکاتە لەگەڵ ئەنجامدانی نوێژەکە نەك لەگەڵ سەرەتای کاتی نوێژەکە).

یەحیا ﷺ دەڵێ: ئیمامی مالیك ﷺ گوتوویەتی: پێم وایە ئیمامی عوسمان ﷺ (کە گوتی لە پەرتووکی خوا باسکراوە) مەبەستی ئەو ئایەتەیە: ﴿ وَأَقِمِ ٱلصَّلَوٰةَ طَرَفَىِ ٱلنَّهَارِ وَزُلَفًا مِّنَ ٱلَّيۡلِۚ إِنَّ ٱلۡحَسَنَٰتِ يُذۡهِبۡنَ ٱلسَّيِّـَٔاتِۚ ذَٰلِكَ ذِكۡرَىٰ لِلذَّٰكِرِينَ ﴿١١٤﴾ ﴾ (چونکە لەدوای فەرمانکردن بە نوێژەکان دەفەرمووێ: چاکەکان خراپەکان لادەبەن و دەسڕنەوە).

٦٦- عَنْ عَبْدِ اللهِ الصُّنَابِحِيِّ ﷺ، أَنَّ رَسُولَ اللهِ ﷺ قَالَ: إِذَا تَوَضَّأَ الْعَبْدُ الْمُؤْمِنُ، فَتَمَضْمَضَ خَرَجَتِ الْخَطَايَا مِنْ فِيهِ، وَإِذَا اسْتَنْثَرَ خَرَجَتِ الْخَطَايَا مِنْ أَنْفِهِ، فَإِذَا غَسَلَ وَجْهَهُ خَرَجَتِ الْخَطَايَا مِنْ وَجْهِهِ، حَتَّى تَخْرُجَ مِنْ تَحْتِ أَشْفَارِ عَيْنَيْهِ، فَإِذَا غَسَلَ يَدَيْهِ خَرَجَتِ الْخَطَايَا مِنْ يَدَيْهِ، حَتَّى تَخْرُجَ مِنْ تَحْتِ أَظْفَارِ يَدَيْهِ، فَإِذَا مَسَحَ بِرَأْسِهِ خَرَجَتِ الْخَطَايَا مِنْ رَأْسِهِ، حَتَّى

---

الطهارة؛ وابن حبان: ١٠٤١؛ والقابسي: ٤٧٦، كلهم عن مالك به.




تَخْرُجَ مِنْ أُذُنَيْهِ، فَإِذَا غَسَلَ رِجْلَيْهِ خَرَجَتِ الْخَطَايَا مِنْ رِجْلَيْهِ، حَتَّى تَخْرُجَ مِنْ تَحْتِ أَظْفَارِ رِجْلَيْهِ، قَالَ: ثُمَّ كَانَ مَشْيُهُ إِلَى الْمَسْجِدِ وَصَلَاتُهُ نَافِلَةً لَهُ[(١)].

واتە: لە عەبدوڵڵای صونابیحییەوە ﷺ گێڕدراوەتەوە (گوتوویەتی): پێغەمبەری خوا ﷺ فەرموویەتی: کاتێ بەندەی بڕوادار دەستنوێژی شۆرد، کە ئاوی لەدەمی وەردەکا تاوانەکانی لە دەمی دەردەچن (واتە لێخۆشبوونی خوا بۆ ئەو کردەوانەی دەردەچێت کە بە دەمی ئەنجامی داوە)، وە کاتێ ئاو (لە لووتی وەردەکا) و دەیڕشتەوە و فنی دەکات تاوانەکانی لە لووتی دەردەچن، وە کاتێ ڕوخساری دەشۆرێ تاوانەکانی لە ڕوخساری دەردەچن، بە شێوەیەك تاوەنەکان لەژێر پێڵووی چاوەکانی دەردەچن، وە کاتێ دەست و باسکەکانی دەشۆرێ تاوانەکانی لە دەست و باسکەکانی دەردەچن، بەشێوەیەك لەژێر نینۆکی دەستەکانی دەردەچن، وە کاتێ سەری مەسح دەکات تاوانەکانی لە سەری دەردەچن، بەشێوەیەك لە گوێچکەکانی دەردەچن، وە کاتێ قاچەکانی دەشۆرێ تاوانەکانی لە قاچەکانی دەردەچن، بەشێوەیەك لەژێر نینۆکەکانی قاچی دەردەچن، فەرمووی: دواتر (پاداشتی) ڕۆیشتنی بۆ مزگەوت و (پاداشتی) ئەنجامدانی نوێژەکەی لە زیادە بۆ دەمێنێتەوە.

٦٧- عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ ﷺ، أَنَّ رَسُولَ اللهِ ﷺ قَالَ: إِذَا تَوَضَّأَ الْعَبْدُ الْمُسْلِمُ أَوِ الْمُؤْمِنُ فَغَسَلَ وَجْهَهُ، خَرَجَتْ مِنْ وَجْهِهِ كُلُّ خَطِيئَةٍ نَظَرَ إِلَيْهَا بِعَيْنَيْهِ مَعَ الْمَاءِ أَوْ مَعَ آخِرِ قَطْرِ الْمَاءِ أَوْ نَحْوَ هَذَا، فَإِذَا غَسَلَ يَدَيْهِ، خَرَجَتْ مِنْ يَدَيْهِ كُلُّ خَطِيئَةٍ بَطَشَتْهُمَا يَدَاهُ مَعَ الْمَاءِ أَوْ مَعَ آخِرِ قَطْرِ الْمَاءِ، حَتَّى يَخْرُجَ نَقِيًّا مِنَ الذُّنُوبِ[(٢)].

واتە: لە ئەبو هورەیرەوە ﷺ گێڕدراوەتەوە (گوتوویەتی): پێغەمبەری خوا ﷺ فەرموویەتی: ئەگەر بەندەی مسوڵمان یان ئیماندار دەستنوێژی شۆرد، کاتێك ڕوخساری دەشۆرێ گشت تاوانەکانی کە بە چاوەکانی ئەجامی داوە لەگەڵ ئاوەکە یان لەگەڵ

---

(١) ـ صحيح لغيره. أخرجه أبو مصعب الزهري: ٧٤ في الوضوء؛ والحدثاني: ٣٧ في الطهارة؛ وابن حنبل: ١٩٠٩١؛ والنسائي: ١٠٣ في الطهارة، كلهم عن مالك به.

(٢) ـ صحيح. أخرجه أبو مصعب الزهري: ٧٥ في الوضوء؛ والحدثاني: ٢٨ في الطهارة؛ وابن حنبل: ٨٠٠٧؛ ومسلم: لطهارة: ٣٢؛ والترمذي: ٢ في الطهارة؛ وابن حبان: ١٠٤٠؛ والدارمي: ٧١٨ في الطهارة؛ والقابسي، ٤٣٩، كلهم عن مالك به.

کۆتا دڵۆپی ئاوەکە یان شتێکی لەم جۆرە دەردەچن، وە کاتێ دەست و باسکەکانی دەشۆرێ گشت تاوانێك کە بە دەست و باسکەکانی ئەنجامی داون لەگەڵ ئاوەکە یان لەگەڵ کۆتا دڵۆپی ئاوەکە دەردەچن، تاوەکوو بەپاکی لە تاوانەکان دەردەچێت.

٦٨- عَنْ أَنَسِ بْنِ مَالِكٍ ﷺ، أَنَّهُ قَالَ: رَأَيْتُ رَسُولَ اللهِ ﷺ، وَحَانَتْ صَلاَةُ الْعَصْرِ، فَالْتَمَسَ النَّاسُ وَضُوءًا فَلَمْ يَجِدُوهُ، فَأُتِيَ رَسُولُ اللهِ ﷺ بِوَضُوءٍ فِي إِنَاءٍ، فَوَضَعَ رَسُولُ اللهِ ﷺ فِي ذَلِكَ الإِنَاءِ يَدَهُ، ثُمَّ أَمَرَ النَّاسَ يَتَوَضَّؤُونَ مِنْهُ، قَالَ أَنَسٌ ﷺ: فَرَأَيْتُ الْمَاءَ يَنْبُعُ مِنْ تَحْتِ أَصَابِعِهِ، فَتَوَضَّأَ النَّاسُ، حَتَّى تَوَضَّؤُوا مِنْ عِنْدِ آخِرِهِمْ[1].

واتە: لە ئەنەسی کوڕی مالیکەوە ﷺ گێڕدراوەتەوە گوتوویەتی: (جارێکیان) پێغەمبەری خوام ﷺ بینی لە کاتێکدا کاتی نوێژی عەسر هات، خەڵکەکەش بەدوای دەستخستنی ئاوی دەستنوێژەوە بوون و دەستیان نەکەوت، جا هەندێك ئاو بۆ دەستنوێژ لەناو دەفرێکدا هێنرا بۆ لای پێغەمبەری خوا ﷺ، پێغەمبەری خواش ﷺ دەستی موبارەکی خستە ناو دەفرەکە، دواتر فەرمانی بە خەڵکی کرد دەستنوێژی لێ بشۆرن، ئەنەس ﷺ دەڵێ: بینیم ئاو لە نێوانی پەنجە موبارەکەکانی هەڵدەقوڵا، خەڵکەکەش دەستنوێژیان شۆرد، (بەشی گشتیانی کرد) تا کۆتا کەسیان دەستنوێژیان شۆرد[2].

٦٩- عَنْ نُعَيْمِ بْنِ عَبْدِ اللهِ الْمَدَنِيِّ الْمُجْمِرِ ﷺ، أَنَّهُ سَمِعَ أَبَا هُرَيْرَةَ ﷺ يَقُولُ: مَنْ تَوَضَّأَ فَأَحْسَنَ وُضُوءَهُ، ثُمَّ خَرَجَ عَامِدًا إِلَى الصَّلاَةِ، فَإِنَّهُ فِي صَلاَةٍ مَا كَانَ يَعْمِدُ إِلَى الصَّلاَةِ، وَإِنَّهُ يُكْتَبُ لَهُ بِإِحْدَى خُطوتيهِ حَسَنَةٌ، وَيُمْحَى عَنْهُ بِالأُخْرَى سَيِّئَةٌ، فَإِذَا سَمِعَ أَحَدُكُمُ الإِقَامَةَ فَلاَ يَسْعَ، فَإِنَّ أَعْظَمَكُمْ أَجْرًا أَبْعَدُكُمْ دَارًا، قَالُوا: لِمَ يَا أَبَا هُرَيْرَةَ؟ قَالَ: مِنْ أَجْلِ كَثْرَةِ الْخُطَا[3].

---

(١) ـ صحيح. أخرجه أبو مصعب الزهري: ٧٦ في الوضوء؛ والشافعي: ٤٨؛ وابن حنبل: ١٢٣٧٠؛ والبخاري: ١٦٩، وفي: ٣٥٧٣ في المناقب؛ ومسلم: فضائل النبي: ٥؛ والنسائي: ٧٦ في الطهارة؛ والترمذي: ٣٦٣١؛ وابن حبان: ٦٥٣٩؛ والقابسي: ١١٤، كلهم عن مالك به.

(٢) ـ تێبینی: ئەو فەرموودەیە ئەوە دەگەیەنێ کە ئاو دەرهێنان بە دەست لەلایەن ئەو کەسەی دەیەوێ دەستنوێژ بشۆرێ ئاوەکە ناکاتە بەکارهاتوو و لەکار ناکەوێ، ئەگەر مەبەستی دەرهێنان بێت.

(٣) ـ صحيح. أخرجه أبو مصعب الزهري: ٧٨ في الوضوء؛ والحدثاني: ٣٩ في الطهارة؛ والشيباني: ٨ في الصلاة، كلهم عن مالك به.





واتە: لە نوعەیمی کوڕی عەبدوڵڵای مەدەنی موجمیرەوە ﷺ گێڕدراوەتەوە گوێی لە ئەبو هوڕەیرە ﷺ بووە دەیگوت: هەر کەسێك بەشێوەیەکی جوان دەستنوێژەکەی بشۆرێ، دواتر بە مەبەستی نوێژ دەربچێ، ئەوە لەناو نوێژدایە تا ئەو کاتەی هێشتا تەنها و تەنها مەبەستی نوێژی لە دڵدایە، بە هەر هەنگاوێکی یەکێك لە دوو قاچەکانی چاکەیەکی بۆ دەنووسرێ، وە بە هەر هەنگاوێکی قاچەکەی تری تاوانێکی دەسڕدرێتەوە، جا کاتێ یەکێك لە ئێوە گوێبیستی قامەت بوو با پەلە نەکات و ڕانەکات (و هەنگاوی درێژ نەنێت)، چونکە گەورەترینتان لە ڕووی پاداشتەوە ئەوەتانە کە ماڵی دوورترینە، گوتیان: بۆچی ئەی ئەبو هوڕەیرە؟ گوتی: لەبەر زۆری هەنگاو.

**٧٠-** عَنْ يَحْيَى بْنِ سَعِيدٍ ﷺ، أَنَّهُ سَمِعَ سَعِيدَ بْنَ الْمُسَيَّبِ ﷺ يُسْأَلُ عَنِ الْوُضُوءِ مِنَ الْغَائِطِ بِالْمَاءِ، فَقَالَ سَعِيدٌ ﷺ: إِنَّمَا ذَلِكَ وُضُوءُ النِّسَاءِ[١].

واتە: لە یەحیای کوڕی سەعیدەوە ﷺ گێڕدراوەتەوە گوێی لە سەعیدی کوڕی موسەییەب ﷺ بووە پرسیاری لێکراوە دەربارەی تارەتکردن بە ئاو، سەعیدیش ﷺ گوتی: ئەوە (عادەتی) ئافرەتانە لە تارەتکردن[٢].

**٧١-** عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ ﷺ، أَنَّ رَسُولَ اللهِ ﷺ قَالَ: إِذَا شَرِبَ الْكَلْبُ فِي إِنَاءِ أَحَدِكُمْ، فَلْيَغْسِلْهُ سَبْعَ مَرَّاتٍ[٣].

واتە: لە ئەبو هوڕیرەوە ﷺ گێڕدراوەتەوە (گوتوویەتی): پێغەمبەری خوا ﷺ فەرموویەتی: ئەگەر سەگ لە دەفر و کەلوپەلی یەکێك لە ئێوەی خواردەوە، ئەوە با حەوت جار بیشۆرێ.

---

(١) ـ مقطوع صحيح. أخرجه أبو مصعب الزهري: ٧٩ في الوضوء، عن مالك به.

(٢) ـ تێبینی: لە سەردەمی کۆندا لەبەر ئەوەی ئاو کەم بوو و پیاوان زیاتر دەگەڕان و کاروکاسبی و گەشتیان دەکرد، بۆیە لە هەموو شوێنێك ئاویان لەلا نەبوو، ئەگەر لەلاشیان بووایە بۆ کاری پێویستتر هەڵیان دەگرت بۆیە تارەتیان زۆر بە ئاو نەدەکرد، بەڵام هەرچی ئافرەتان بوون زۆربەی کات لە ماڵ و شوێنی نیشتەجێیان بوون و ئاویان لەلا بوو، بۆیە ئەوان زیاتر تارەتیان بە ئاو دەکرد، ئەگینا هەر بە ئاو چاکترە.

(٣) ـ صحيح. أخرجه أبو مصعب الزهري: ٨٠ في الوضوء؛ والشافعي: ٣؛ وابن حنبل: ٩٩٣١؛ والبخاري: ١٧٢؛ ومسلم: الطهارة: ٩٠؛ والنسائي: ٦٣ في الطهارة؛ وابن ماجه: ٣٧٦ في الطهارة؛ والمنتقى لابن الجارود: ٥٠؛ والقابسي: ٣٢٢، كلهم عن مالك به.




**٧٢- عَنْ مَالِكٍ ﷺ؛ أَنَّهُ بَلَغَهُ، أَنَّ رَسُولَ اللهِ ﷺ قَالَ: اسْتَقِيمُوا وَلَنْ تُحْصُوا، وَاعْمَلُوا، وَخَيْرُ أَعْمَالِكُمُ الصَّلاَةُ، وَلاَ يُحَافِظُ عَلَى الْوُضُوءِ إِلاَّ مُؤْمِنٌ[١].**

واتە: لە ئیمامی مالیکەوە ﷺ گێڕدراوەتەوە پێی گەیشتووە بەوەی پێغەمبەری خوا ﷺ فەرموویەتی: بەردەوامیتان هەبێت (لەسەر عیبادەت و چاکە) ناشگەنە ئەوپەڕی (بە جۆرێك هەموو كات و ساتێك گەرموگوڕ بن لەسەر عیبادەت، ئەوەتان پێ ناكرێ)، وە كردەوە ئەنجام بدەن، وە چاكترین كردەوەی ئێوە نوێژە، وە كەس پارێزگاری لە دەستنوێژ ناكات بەبەردەوامی جگە لە كەسی بڕوادار.

## ٧- ئەوەی هاتووە دەربارەی مەسح كردنی سەر و گوێچكەكان[٢]

**٧٣- عَنْ نَافِعٍ ﷺ، أَنَّ عَبْدَ اللهِ بْنَ عُمَرَ ﷺ كَانَ يَأْخُذُ الْمَاءَ بِأُصْبُعَيْهِ لأُذُنَيْهِ[٣].**

واتە: لە نافیعەوە ﷺ گێڕدراوەتەوە (گوتوویەتی): عەبدوڵڵای كوڕی عومەر ﷺ هەموو جار بە دوو پەنجەكانی ئاوی بۆ مەسحكردنی گوێچكەكانی دەگواستەوە، (واتە بۆ مەسحی گوێیەكانی ئاوی تازەی بە دەستیدا دەكرد، نەك ئەو ئاوەی بەدەستیەوە ماوەتەوە دوای شۆردنی ڕوخسار).

**٧٤- أَنَّ جَابِرَ بْنَ عَبْدِ اللهِ الأَنْصَارِيَّ ﷺ سُئِلَ عَنِ الْمَسْحِ عَلَى الْعِمَامَةِ؟ فَقَالَ: لاَ، حَتَّى يُمْسَحَ الشَّعْرُ بِالْمَاءِ[٤].**

واتە: جابری كوڕی عەبدوڵڵای ئەنصاری ﷺ پرسیاری لێكرا دەربارەی مەسح لەسەر مەندیل (كە ئاخۆ دروستە)؟ ئەویش گوتی: نەخێر، تاوەكوو قژ تەڕ دەكرێت بە ئاو.

---

(١) ـ صحيح لغيره. أخرجه أبو مصعب الزهري: ٨١ في الوضوء، عن مالك به.

(٢) ـ مَا جَاءَ فِي الْمَسْحِ بِالرَّأْسِ وَالأُذُنَيْنِ.

(٣) ـ صحيح. أخرجه أبو مصعب الزهري: ٨٢ في الوضوء؛ والحدثاني: ٤٠ في الطهارة، عن مالك به.

(٤) ـ ضعيف. أخرجه أبو مصعب الزهري: ٨٣ في الوضوء؛ والحدثاني: ٤٠ أ في الطهارة؛ والشيباني: ٥٢ في الصلاة، كلهم عن مالك به.




**٧٥-** عَنْ هِشَامِ بْنِ عُرْوَةَ ﷺ، أَنَّ أَبَاهُ عُرْوَةَ بْنَ الزُّبَيْرِ ﷺ كَانَ يَنْزِعُ الْعِمَامَةَ، وَيَمْسَحُ رَأْسَهُ بِالْمَاءِ[١].

واتە: لە هیشامی کوڕی عوڕوەوە ﷺ گێڕدراوەتەوە بەوەی عوڕوەی کوڕی زوبەیری باوکی ﷺ هەموو جار مەندیلەکەی دادەکەند و سەری بە ئاو مەسح دەکرد.

**٧٦-** عَنْ نَافِعٍ ﷺ، أَنَّهُ رَأَى صَفِيَّةَ بِنْتَ أَبِي عُبَيْدٍ، امْرَأَةَ عَبْدِ اللهِ بْنِ عُمَرَ ﷺ تَنْزِعُ خِمَارَهَا وتَمْسَحُ عَلَى رَأْسِهَا بِالْمَاءِ، وَنَافِعٌ يَوْمَئِذٍ صَغِيرٌ[٢].

واتە: لە نافیعەوە ﷺ گێڕدراوەتەوە بەوەی صەفییەی کچی ئەبو عوبەیدی خێزانی عەبدوڵڵای کوڕی عومەری ﷺ بینیوە لەچکەکەی لاداوە و مەسحی لەسەر سەری کردووە بە ئاو، لەو ڕۆژگارەدا نافیع بچووك بووە.

**٧٧-** **[فتوى]** وَسُئِلَ مَالِكٌ ﷺ عَنِ الْمَسْحِ عَلَى الْعِمَامَةِ وَالْخِمَارِ، فَقَالَ: لاَ يَنْبَغِي أَنْ يَمْسَحَ الرَّجُلُ وَلاَ الْمَرْأَةُ عَلَى عِمَامَةٍ وَلاَ خِمَارٍ، وَلْيَمْسَحَا عَلَى رُؤُوسِهِمَا.

(فەتوا): ئیمامی مالیك ﷺ پرسیاری لێکرا دەربارەی مەسحکردن لەسەر مەندیل و لەچك، ئەویش گوتی: نابێ نە پیاو و نە ئافرەت مەسح لەسەر مەندیل و لەچك بکەن، بەڵکوو دەبێ سەریان مەسح بکەن.

**٧٨-** **[فتوى]** وَسُئِلَ مالكٌ ﷺ عَنْ رَجُلٍ تَوَضَّأَ فَنَسِيَ أَنْ يَمْسَحَ عَلَى رَأْسِهِ، حَتَّى جَفَّ وَضُوءُهُ؟ قَالَ: أَرَى أَنْ يَمْسَحَ بِرَأْسِهِ، وَإِنْ كَانَ قَدْ صَلَّى، أَنْ يُعِيدَ الصَّلاَةَ[٣].

(فەتوا): ئیمامی مالیك ﷺ پرسیاری لێکرا دەربارەی پیاوێك کە دەستنوێژ دەشۆرێت و لەیاد دەکات سەری مەسح بکات تاوەکوو دەستنوێژەکەی وشك دەبێتەوە، وتی: بۆچوونم وایە دەبێ سەری مەسح بکاتەوە (ئەندامەکانی دواتریش بشواتەوە)، وە ئەگەر نوێژی کردبوو نوێژەکەی دووبارە بکاتەوە.

---

(١) ـ مقطوع صحيح. أخرجه أبو مصعب الزهري: ٨٤ في الوضوء؛ والحدثاني: ٤٠ج في الطهارة؛ ومصنف ابن أبي شيبة: ٢٣٦ في الطهارات، كلهم عن مالك به.

(٢) ـ مقطوع صحيح. أخرجه أبو مصعب الزهري: ٨٥ في الوضوء؛ والحدثاني: ٤٠ب في الطهارة؛ والشيباني: ٥٣ في الصلاة، كلهم عن مالك به.

(٣) ـ أخرجه أبو مصعب الزهري: ٨٦ في الوضوء؛ والحدثاني: ٢٤ أ في الطهارة، عن مالك به.




## ٨- ئەوەی هاتووە دەربارەی مەسحکردن لەسەر خوفەکان[١]

**٧٩-** عَنْ عَبَّادِ بْنِ زِيَادٍ ﷺ، مِنْ وَلَدِ الْمُغِيرَةِ بْنِ شُعْبَةَ، عَنْ أَبِيهِ الْمُغِيرَةِ بْنِ شُعْبَةَ ﷺ، أَنَّ رَسُولَ اللهِ ﷺ ذَهَبَ لِحَاجَتِهِ فِي غَزْوَةِ تَبُوكَ، قَالَ الْمُغِيرَةُ ﷺ: فَذَهَبْتُ مَعَهُ بِمَاءٍ، فَجَاءَ رَسُولُ اللهِ ﷺ، فَسَكَبْتُ عَلَيْهِ الْمَاءَ، فَغَسَلَ وَجْهَهُ، ثُمَّ ذَهَبَ يُخْرِجُ يَدَيْهِ مِنْ كُمَّيْ جُبَّتِهِ، فَلَمْ يَسْتَطِعْ مِنْ ضِيقِ كُمَّيِ الْجُبَّةِ، فَأَخْرَجَهُمَا مِنْ تَحْتِ الْجُبَّةِ، فَغَسَلَ يَدَيْهِ، وَمَسَحَ بِرَأْسِهِ، وَمَسَحَ عَلَى الْخُفَّيْنِ، فَجَاءَ رَسُولُ اللهِ ﷺ، وَعَبْدُ الرَّحْمَنِ بْنُ عَوْفٍ ﷺ يَؤُمُّهُمْ، وَقَدْ صَلَّى بِهِمْ رَكْعَةً، فَصَلَّى رَسُولُ اللهِ ﷺ الرَّكْعَةَ، الَّتِي بَقِيَتْ عَلَيْهِمْ، فَفَزِعَ النَّاسُ، فَلَمَّا قَضَى رَسُولُ اللهِ ﷺ، قَالَ: أَحْسَنْتُمْ[٢].

واتە: لە عەبادی کوڕی زیادەوە ﷺ گێردراوەتەوە کە یەکێکە لە کوڕەکانی موغیرەی کوڕی شوعبەیە ﷺ لە باوکیەوە گێراویەتەوە (گوتوویەتی): پێغەمبەری خوا ﷺ لە غەزای تەبوك ڕۆیشت بۆ سەرئاو، موغیرە ﷺ دەڵێ: منیش بە ئاوەوە لەگەڵی چووم، جا پێغەمبەری خوا ﷺ (دوای تەواوبوونی) هات و منیش ئاوم بۆ پێدا دەکرد (بۆ دەستنوێژشۆردن)، جا ڕوخساری شۆرد دواتر ویستی دەست و باسکی لە قۆڵەکانی جوبەکەی دەربکات نەیتوانی لەبەر تەسکی قۆڵی جوبەکەی، بۆیە لە ژێر جوبەکەوە دەریهێنان، جا دەست و باسکی شۆرد و سەری مەسح کرد و مەسحی لەسەر خوفەکانی کرد، جا پێغەمبەری خوا ﷺ هات لە کاتێکدا عەبدوڕڕەحمانی کوڕی عەوف ﷺ (لە جێگەی پێغەمبەری خوا ﷺ) ئیمامەتی کردبوو و ڕکاتێکی بە مسوڵمانان کردبوو، جا پێغەمبەری خوا ﷺ ئەو ڕکاتەی مابوو لەگەڵ عەبدوڕڕەحمانی کوڕی عەوفدا ﷺ کردی (بۆ ڕکاتەکەی خۆیشی هەڵسایەوە) جا کە خەڵك بینییان پەشۆکان، جا کە نوێژەکەی تەواو کرد فەرمووی: چاکتان کرد.

---

(١) ـ مَا جَاءَ فِي الْمَسْحِ عَلَى الْخُفَّيْنِ.

(٢) ـ صحيح. أخرجه أبو مصعب الزهري: ٨٧ في الوضوء؛ والشيباني: ٤٧ في الصلاة؛ والشافعي: ١٠٩١؛ وابن حنبل: ١٨١٨٥، كلهم عن مالك به.





**٨٠-** عَنْ مَالِكٍ ﷺ، عَنْ نَافِعٍ، وَعَبْدِ اللهِ بْنِ دِينَارٍ، أَنَّهُمَا أَخْبَرَاهُ، أَنَّ عَبْدَ اللهِ بْنَ عُمَرَ ﷺ قَدِمَ الْكُوفَةَ عَلَى سَعْدِ بْنِ أَبِي وَقَّاصٍ ﷺ، وَهُوَ أَمِيرُهَا، فَرَآهُ عَبْدُ اللهِ بْنُ عُمَرَ ﷺ يَمْسَحُ عَلَى الْخُفَّيْنِ، فَأَنْكَرَ ذَلِكَ عَلَيْهِ، فَقَالَ لَهُ سَعْدٌ ﷺ: سَلْ أَبَاكَ إِذَا قَدِمْتَ عَلَيْهِ، فَقَدِمَ عَبْدُ اللهِ ﷺ، فَنَسِيَ أَنْ يَسْأَلَ عُمَرَ ﷺ عَنْ ذَلِكَ، حَتَّى قَدِمَ سَعْدٌ، فَقَالَ: أَسَأَلْتَ أَبَاكَ؟ فَقَالَ: لاَ، فَسَأَلَهُ عَبْدُ اللهِ ﷺ، فَقَالَ عُمَرُ ﷺ: إِذَا أَدْخَلْتَ رِجْلَيْكَ فِي الْخُفَّيْنِ وَهُمَا طَاهِرَتَانِ، فَامْسَحْ عَلَيْهِمَا، قَالَ عَبْدُ اللهِ: وَإِنْ جَاءَ أَحَدُنَا مِنَ الْغَائِطِ؟ فَقَالَ عُمَرُ ﷺ: نَعَمْ، وَإِنْ جَاءَ أَحَدُكُمْ مِنَ الْغَائِطِ[١].

واتە: لە ئیمامی مالیکەوە ﷺ گێردراوەتەوە بەوەی نافیع و عەبدوڵڵای کوڕی دینار بۆیان گێڕاوەتەوە (گوتویانە): عەبدوڵڵای کوڕی عومەر ﷺ چووە کوفە بۆ لای سەعدی کوڕی ئەبی وەقاص ﷺ کە کاربەدەستی ئەوێ بوو، جا عەبدوڵڵای کوڕی عومەر ﷺ بینی سەعد مەسح لەسەر خوفەکانی دەکات، ئەویش ناڕەزایی خۆی لەسەر دەربڕی، سەعدیش ﷺ پێی گوت: پرسیار لە باوکت بکە کاتێ چوویتەوە لای، جا لەیادی کرد دەربارەی ئەوە پرسیار لە ئیمامی عومەری باوکی بکات، تا سەعد هات و گوتی: ئایا پرسیارت لە باوکت کرد؟ گوتی: نەخێر، جا عەبدوڵڵا ﷺ پرسیاری لە باوکی کرد، ئیمامی عومەریش ﷺ گوتی: ئەگەر قاچەکانت خستە ناو خوفەکان لە کاتێکدا قاچەکانت پاك بوون (واتە دەستنوێژت هەبوو) ئەوە مەسحیان لەسەر بکە (بۆ دەستنوێژی دیکە)، عەبدوڵڵاش ﷺ گوتی: ئەگەرچی یەکێك لە ئێمە سەرئاویشی کردبێت (دوای لەپێ کردنی خوفەکان)؟ ئیمامی عومەریش ﷺ گوتی: بەڵێ، هەرچەندە یەکێك لە ئێوە چووبێتە سەرئاویش (دوای لەپێ کردنی خوفەکان).

**٨١-** عَنْ نَافِعٍ ﷺ، أَنَّ عَبْدَ اللهِ بْنَ عُمَرَ ﷺ بَالَ فِي السُّوقِ، ثُمَّ تَوَضَّأَ، فَغَسَلَ وَجْهَهُ، وَيَدَيْهِ، وَمَسَحَ بِرَأْسِهِ، ثُمَّ دُعِيَ لِجَنَازَةٍ لِيُصَلِّيَ عَلَيْهَا حِينَ دَخَلَ الْمَسْجِدَ، فَمَسَحَ عَلَى خُفَّيْهِ، ثُمَّ صَلَّى عَلَيْهَا[٢].

---

(١) ـ صحيح. أخرجه أبو مصعب الزهري: ٨٨ في الوضوء؛ والحدثاني: ٤١ في الطهارة؛ والشيباني: ٤٩ في الصلاة؛ والشافعي: ١٠٩٢، كلهم عن مالك به.

(٢) ـ صحيح. أخرجه أبو مصعب الزهري: ٨٩ في الوضوء؛ والحدثاني: ٤١أفي الطهارة؛ والشيباني: ٥٠ في الصلاة؛ والشافعي: ٤٩؛ وفي: ١٠٩٣؛ وفي: ١١٢٩، كلهم عن مالك به.





واتە: لە نافیعەوە ﷺ گێردراوەتەوە (گوتوویەتی): عەبدوڵڵای كوڕی عومەر ﷺ لە بازاڕ بوو چوو سەرئاوی كرد، دواتر دەستنوێژی شۆرد، جا (دەستنوێژشۆردنەكەی بەم جۆرە بوو) ڕوخسار و هەردوو باسكەكانی شۆرد و سەریشی مەسح كرد، دواتر بانگ كرا بۆ تەرمێك تا كاتێك هاتە مزگەوت نوێژی لەسەر بكات (وتی: باشە)، پاشان مەسحی لەسەر خوفەكانی كرد، پاشان نوێژی لەسەر مردووەكە كرد.

**٨٢-** عَنْ سَعِيدِ بْنِ عَبْدِ الرَّحْمَنِ بْنِ رُقَيْشٍ ﷺ، أَنَّهُ قَالَ: رَأَيْتُ أَنَسَ بْنَ مَالِكٍ ﷺ أَتَى قُبَاءَ فَبَالَ، ثُمَّ أُتِيَ بِوَضُوءٍ فَتَوَضَّأَ، فَغَسَلَ وَجْهَهُ وَيَدَيْهِ إِلَى الْمِرْفَقَيْنِ، وَمَسَحَ بِرَأْسِهِ، وَمَسَحَ عَلَى الْخُفَّيْنِ، ثُمَّ جَاءَ الْمَسْجِدَ فَصَلَّى[١].

واتە: لە سەعیدی كوڕ عەبدوڕڕەحمانی كوڕی ڕوقەیشەوە ﷺ گێردراوەتەوە گوتوویەتی: ئەنەسی كوڕی مالیكم ﷺ بینی هات بۆ قوباء لەوێ سەرئاوی كرد، دواتر ئاوی دەستنوێژی بۆ هێنرا و دەستنوێژی شۆرد، جا ڕوخسار و دەستەكانی لەگەڵ ئەنیشكەكانی شۆرد و سەری مەسح كرد و مەسحی لەسەر دوو خوفەكانی كرد، دواتر هاتە مزگەوت و نوێژی كرد.

**٨٣- [فتوى]** قَالَ يَحْيَى ﷺ: وَسُئِلَ مَالِكٌ ﷺ عَنْ رَجُلٍ تَوَضَّأَ وُضُوءَ الصَّلاَةِ، ثُمَّ لَبِسَ خُفَّيْهِ، ثُمَّ بَالَ، ثُمَّ نَزَعَهُمَا، ثُمَّ رَدَّهُمَا فِي رِجْلَيْهِ، أَيَسْتَأْنِفُ الْوُضُوءَ؟ فَقَالَ: لِيَنْزِعْ خُفَّيْهِ، ثُمَّ لِيَتَوَضَّأْ وَلْيَغْسِلْ رِجْلَيْهِ، وَإِنَّمَا يَمْسَحُ عَلَى الْخُفَّيْنِ مَنْ أَدْخَلَ رِجْلَيْهِ فِي الْخُفَّيْنِ وَهُمَا طَاهِرَتَانِ بِطُهْرِ الْوُضُوءِ، فَأَمَّا مَنْ أَدْخَلَ رِجْلَيْهِ فِي الْخُفَّيْنِ وَهُمَا غَيْرُ طَاهِرَتَيْنِ بِطُهْرِ الْوُضُوءِ، فَلاَ يَمْسَحُ عَلَى الْخُفَّيْنِ[٢].

(فەتوا): یەحیا ﷺ گوتوویەتی: ئیمامی مالیك ﷺ پرسیاری لێكرا دەربارەی كەسێك دەستنوێژی نوێژ هەڵدەگرێ، دواتر خوفەكانی دەكاتە پێ، دواتر سەرئاو دەكات، دواتر خوفەكانی دادەكەنێ، دواتر خوفەكانی دەكاتە پێیەكانی، ئایا گشت دەستنوێژەكەی دووبارە دەكاتەوە (بەهۆی داكەندنی خوفەكان و دەستنوێژ

---

(١) ـ صحيح. أخرجه أبو مصعب الزهري: ٩٠ في الوضوء؛ والشيباني: ٤٨ في الصلاة؛ والشافعي: ١٠٩٤، كلهم عن مالك به.

(٢) ـ أخرجه أبو مصعب الزهري: ٩١ في الوضوء، عن مالك به.

شکانی)؟ ئیمامی مالیك ﷺ گوتی: با خوفەکانی دابکەنێ، دواتر دەستنوێژ بشۆرێ و قاچەکانیشی بشۆرێتەوە (لەبەر ئەوەی پاکییەتی قاچەکانی لەدەست داوە بەهۆی سەرئاوکردنەکەیەوە)، چونکە تەنها کەسێك مەسح لەسەر خوفەکانی دەکات کە قاچەکانی خستبنە ناو خوفەکان لە کاتێکدا قاچەکانی پاك بن بەپاکییەتی دەستنوێژی تەواو، بەڵام هەرچی ئەو کەسەیە کە قاچەکانی دەخاتە ناو خوفەکان لە کاتێکدا قاچەکانی پاك نییە بەپاکییەتی دەستنوێژی تەواو ئەوە مەسح لەسەر خوفەکانی ناکات (بۆی دروست نییە).

٨٤- **[فتوى]** وَسُئِلَ مَالِكٌ ﷺ عَنْ رَجُلٍ تَوَضَّأَ وَعَلَيْهِ خُفَّاهُ، فَسَهَا عَنِ الْمَسْحِ عَلَى الْخُفَّيْنِ، حَتَّى جَفَّ وَضُوءُهُ وَصَلَّى، قَالَ: لِيَمْسَحْ عَلَى خُفَّيْهِ، وَلْيُعِدِ الصَّلاَةَ، وَلاَ يُعِيدُ الْوُضُوءَ[1].

(فەتوا): ئیمامی مالیك ﷺ پرسیاری لێکرا دەربارەی کەسێك دەستنوێژ دەشۆرێ لە کاتێکدا خوفی لەپێیە، جا مەسح کردنی خوفەکانی لەیاد کرد تاوەکوو دەستنوێژەکەی وشك بۆیەوە و نوێژی کرد، ئیمامی مالیك ﷺ گوتی: با (تەنها) مەسح لەسەر خوفەکانی بکات و نوێژەکەی دووبارە بکاتەوە، بەڵام دەستنوێژەکەی دووبارە ناکاتەوە.

٨٥- **[فتوى]** وَسُئِلَ مَالِكٌ ﷺ عَنْ رَجُلٍ غَسَلَ قَدَمَيْهِ، ثُمَّ لَبِسَ خُفَّيْهِ، ثُمَّ اسْتَأْنَفَ الْوُضُوءَ، فَقَالَ: لِيَنْزِعْ خُفَّيْهِ، ثُمَّ لْيَتَوَضَّأْ، وَلْيَغْسِلْ رِجْلَيْهِ.

(فەتوا): ئیمامی مالیك ﷺ پرسیاری لێکرا دەربارەی کەسێك (دەستنوێژی نییە، جا تەنها) قاچەکانی دەشۆرێ (و پاکیان دەکاتەوە)، دواتر خوفەکانی لەپێ دەکات، دواتر لە سەرەتاوە کە دەستنوێژ دەشۆرێ (ئایا قاچەکانی دەشۆرێتەوە)؟ ئیمامی مالیك ﷺ گوتی: با خوفەکانی دابکەنێ، دواتر دەستنوێژ بشۆرێ و قاچەکانیشی بشۆرێتەوە (چونکە بۆ بابەتی خوف مەرجە قاچ خاوێن بن، بە خاوێنی دەستنوێژ نەك خاوێنی شۆرین).

---

(١) ـ أخرجه أبو مصعب الزهري: ٩٢ في الوضوء، عن مالك به.

## ٩- کرداری مەسحکردن لەسەر دوو خوفەکان[١]

٨٦- عَنْ هِشَامِ بْنِ عُرْوَةَ ﷺ، أَنَّهُ رَأَى أَبَاهُ يَمْسَحُ عَلَى الْخُفَّيْنِ، قَالَ: وَكَانَ لاَ يَزِيدُ إِذَا مَسَحَ عَلَى الْخُفَّيْنِ عَلَى أَنْ يَمْسَحَ ظُهُورَهُمَا، وَلاَ يَمْسَحُ بُطُونَهُمَا[٢].

واتە: لە هیشامی کوڕی عورووەوە ﷺ گێڕدراوەتەوە باوکی خۆی بینیوە مەسحی لەسەر خوفەکان کردووە، گوتوویەتی: کاتێ مەسحی لەسەر خوفەکان دەکرد لە ڕووی سەرەوە بترازێ مەسحی نەدەکرد، ژێرەوەیانی مەسح نەدەکرد.

٨٧- عَنْ مَالِكٍ ﷺ، أَنَّهُ سَأَلَ ابْنَ شِهَابٍ ﷺ عَنِ الْمَسْحِ عَلَى الْخُفَّيْنِ كَيْفَ هُوَ؟ فَأَدْخَلَ ابْنُ شِهَابٍ ﷺ إِحْدَى يَدَيْهِ تَحْتَ الْخُفِّ، وَالأُخْرَى فَوْقَهُ، ثُمَّ أَمَرَّهُمَا.

قَالَ يَحْيَى ﷺ: قَالَ مالِكٍ ﷺ: وَقَوْلُ ابْنِ شِهَابٍ أَحَبُّ مَا سَمِعْتُ إِلَيَّ فِي ذَلِكَ[٣].

واتە: لە ئیمامی مالیکەوە ﷺ گێڕدراوەتەوە پرسیاری لە ئیبنو شیهاب ﷺ کردووە دەربارەی مەسحکردن لەسەر خوف، کە ئاخۆ چۆنە؟ ئیبنو شیهابیش ﷺ دەستێکی خستە ژێر خوفەکە و دەستەکەی دیکەشی لەسەرەوە دانا، دواتر هەردوو دەستەکانی پێداهێنا.

یەحیا ﷺ دەڵێ: ئیمامی مالیك ﷺ گوتی: وتەکەی ئیبنو شیهاب خۆشەویستترین وتەیە لەلام کە گوێم لێ بووە لەم بارەیەوە.

---

(١) ـ الْعَمَلُ فِي الْمَسْحِ عَلَى الْخُفَّيْنِ.

(٢) ـ مقطوع صحيح. أخرجه أبو مصعب الزهري: ٩٣ في الوضوء؛ والحدثاني: ٤٢ في الطهارة؛ والشيباني: ٥١ في الصلاة، كلهم عن مالك به.

(٣) ـ مقطوع صحيح. أخرجه أبو مصعب الزهري: ٩٤ في الوضوء، عن مالك به.




## ١٠- ئەوەی هاتووە دەربارەی خوێنبەربوونی لووت (کەپوو داڕسان)(١)

٨٨- عَنْ نَافِعٍ ﷺ، أَنَّ عَبْدَ اللهِ بْنَ عُمَرَ ﷺ كَانَ إِذَا رَعَفَ انْصَرَفَ فَتَوَضَّأَ، ثُمَّ رَجَعَ فَبَنَى وَلَمْ يَتَكَلَّمْ(٢).

واتە: لە نافیعەوە ﷺ گێڕدراوەتەوە (گوتوویەتی): عەبدوڵڵای کوڕی عومەر ﷺ هەموو جار ئەگەر (لەناو نوێژ) لووتی خوێنی لێ هاتبا، ئەوە وازی لە نوێژەکە دەهێنا و خوێنەکەی دەشۆرد، دواتر دەگەڕایەوە (بۆ نوێژەکەی) و لەوێوە دەستی پێ دەکردەوە و هیچ قسەیەکیشی نەدەکرد (چونکە پێی وابوو هەر لەناو نوێژدایە).

٨٩- أَنَّ عَبْدَ اللهِ بْنَ عَبَّاسٍ ﷺ كَانَ يَرْعُفُ فَيَخْرُجُ فَيَغْسِلُ الدَّمَ، ثُمَّ يَرْجِعُ فَيَبْنِي عَلَى مَا قَدْ صَلَّى(٣).

واتە: عەبدوڵڵای کوڕی عەبباس ﷺ خوێن لە لووتی دەهات، جا دەچووە دەرەوە و خوێنەکەی دەشۆرد و دەگەڕایەوە و تا کوێ ئەنجامی دابوو لەوێوە دەستی پێدەکرد، (واتە لە سەرەتاوە دەستی پێ نەدەکردەوە).

٩٠- عَنْ يَزِيدَ بْنِ عَبْدِ اللهِ بْنِ قُسَيْطٍ اللَّيْثِيِّ ﷺ، أَنَّهُ رَأَى سَعِيدَ بْنَ الْمُسَيَّبِ ﷺ رَعَفَ وَهُوَ يُصَلِّي، فَأَتَى حُجْرَةَ أُمِّ سَلَمَةَ ﷺ زَوْجِ النَّبِيِّ ﷺ، فَأُتِيَ بِوَضُوءٍ فَتَوَضَّأَ، ثُمَّ رَجَعَ فَبَنَى عَلَى مَا قَدْ صَلَّى(٤).

واتە: لە یەزیدی کوڕی عەبدوڵڵای کوڕی قوسەیتی لەیسییەوە ﷺ گێڕدراوەتەوە، بەوەی سەعیدی کوڕی موسەییەبی ﷺ بینیوە لووتی داڕساوە (لووتی تووشی خوێنبەربوون بوو)، لە کاتێکدا نوێژی دەکرد، جا هات بۆ ژوورەکەی ئوممو

---

(١) ـ مَا جَاءَ فِي الرُّعَافِ.

(٢) ـ صحيح. أخرجه أبو مصعب الزهري: ٩٥ في الوضوء؛ والشيباني: ٣٦ في الصلاة؛ والشافعي: ١١١٨، كلهم عن مالك به.

(٣) ـ ضعيف. أخرجه أبو مصعب الزهري: ٩٦ في الوضوء؛ والحدثاني: ٤٣ في الطهارة، عن مالك به.

(٤) مقطوع صحيح. أخرجه أبو مصعب الزهري: ٩٧ في الوضوء؛ والحدثاني: ٤٣أفي الطهارة؛ والشيباني: ٣٧ في الصلاة، كلهم عن مالك به.




سەلەمەی ﵄ خێزانی پێغەمبەر ﷺ و ئاوی بۆ هێنرا و خوێنەکەی شۆرد، دواتر گەڕایەوە بۆ نوێژەکەی و تا کوێ ئەنجامی دابوو لەوێوە دەستی پێ کرد (واتە لە سەرەتاوە دەستی پێ نەکردەوە و دەستنوێژیشی نەشۆردەوە).

## ١١- (دەربارەی چۆنییەتی) ڕەفتارکردن لە کاتی خوێنبەربوونی لووت (کەپوو داڕسان)[١]

**٩١-** عَنْ عَبْدِ الرَّحْمَنِ بْنِ حَرْمَلَةَ الأَسْلَمِيِّ ﵀ أَنَّهُ قَالَ: رَأَيْتُ سَعِيدَ بْنَ الْمُسَيَّبِ ﵀ يَرْعُفُ، فَيَخْرُجُ مِنْهُ الدَّمُ، حَتَّى تَخْتَضِبَ أَصَابِعُهُ مِنَ الدَّمِ الَّذِي يَخْرُجُ مِنْ أَنْفِهِ، ثُمَّ يُصَلِّي وَلاَ يَتَوَضَّأُ[٢].

واتە: لە عەبدوڕڕەحمانی کوڕی حەڕمەلەی ئەسلەمییەوە ﵀ گێڕدراوەتەوە گوتوویەتی: سەعیدی کوڕی موسەیەبم ﵀ بینی لووتی داڕسابوو و خوێنی لێ دەهات، (بە جۆرێك) پەنجەکانی سوور بوون بەو خوێنەی لە لووتیەوە دەهاتە دەرەوە، دواتر (دوای شۆردنی خوێنەکە) نوێژی کرد و دەستنوێژی نەشۆردەوە.

**٩٢-** عَنْ عَبْدِ الرَّحْمَنِ بْنِ الْمُجَبَّرِ ﵀، أَنَّهُ رَأَى سَالِمَ بْنَ عَبْدِ اللهِ ﵁ يَخْرُجُ مِنْ أَنْفِهِ الدَّمُ، حَتَّى تَخْتَضِبَ أَصَابِعُهُ، ثُمَّ يَفْتِلُهُ ثُمَّ يُصَلِّي وَلاَ يَتَوَضَّأُ[٣].

واتە: لە عەبدوڕڕەحمانی کوڕی موجەبەرەوە ﵀ گێڕدراوەتەوە کە سالمی کوڕی عەبدوڵڵای ﵁ بینیوە خوێن لە لووتی دەهات، تا پەنجەکانی سوور دەکرد، دواتر (پەنجەکانی) ڕادەوەشاند (تا دڵۆپی خوێنەکە بکەونە خوارەوە و پەنجەکانی وشکبێتەوە و خوێنەکە جلەکانی و شوێنی کڕنووشی پیس نەکات)، دواتر نوێژی دەکرد و دەستنوێژی نەدەشۆردەوە.

---

(١) ـ الْعَمَلُ فِي الرُّعَافِ.

(٢) ـ مقطوع حسن. أخرجه أبو مصعب الزهري: ٩٨ في الوضوء، عن مالك به.

(٣) ـ مقطوع صحيح. أخرجه أبو مصعب الزهري: ٩٩ في الوضوء؛ والشيباني: ٣٩ في الصلاة، عن مالك به.





## ١٢- کرداری ئەو کەسەی خوێن بەسەریدا زاڵ دەبێت (ناوەستێت) لە برین یان لە خوێنبەربونی لوت[١]

**٩٣-** عَنْ هِشَامِ بْنِ عُرْوَةَ ﷺ، عَنْ أَبِيهِ ﷺ، أَنَّ الْمِسْوَرَ بْنَ مَخْرَمَةَ ﷺ أَخْبَرَهُ، أَنَّهُ دَخَلَ عَلَى عُمَرَ بْنِ الْخَطَّابِ ﷺ مِنَ اللَّيْلَةِ الَّتِي طُعِنَ فِيهَا، فَأَيْقَظَ عُمَرَ ﷺ لِصَلاَةِ الصُّبْحِ، فَقَالَ عُمَرُ ﷺ: نَعَمْ، وَلاَ حَظَّ فِي الإِسْلاَمِ لِمَنْ تَرَكَ الصَّلاَةَ، فَصَلَّى عُمَرُ ﷺ، وَجُرْحُهُ يَثْعَبُ دَمًا[٢].

واتە: لە هیشامی کوڕی عوڕوەوە ﷺ گێڕدراوەتەوە، ئەویش لە باوکیەوە ﷺ گێڕاویەتەوە (گوتوویەتی): میسوەری کوڕی مەخرەمە ﷺ هەواڵی پێداوە بەوەی چۆتە ژوورەوە بۆ لای عومەری کوڕی خەتتاب ﷺ لەو شەوەی تیایدا پێکرا (بە خەنجەر لێی درا)، ئیمامی عومەری ﷺ بەخەبەر کردەوە بۆ نوێژی بەیانی، ئیمامی عومەریش ﷺ گوتی: بەڵێ (کارێکی چاکت کرد)، ئەو کەسەی نوێژ وازلێدەهێنێ هیچ پشکێکی لە ئیسلامەتی نییە، (کافرە ئەگەر باوەڕی پێ نەبێ، ئەگەر باوەڕیشی پێ هەبێ زۆر خێر لە کردەوەکانی دیکەی نابینێ)، جا ئیمامی عومەر ﷺ نوێژی کرد لە کاتێکدا برینەکەی خوێنی لێ دەچۆڕا.

**٩٤-** عَنْ يَحْيَى بْنِ سَعِيدٍ ﷺ، أَنَّ سَعِيدَ بْنَ الْمُسَيَّبِ ﷺ قَالَ: مَا تَرَوْنَ فِيمَنْ غَلَبَهُ الدَّمُ مِنْ رُعَافٍ فَلَمْ يَنْقَطِعْ عَنْهُ؟ قَالَ مَالِكٌ ﷺ: قَالَ يَحْيَى بْنُ سَعِيدٍ ﷺ: ثُمَّ قَالَ سَعِيدُ بْنُ الْمُسَيَّبِ ﷺ: أَرَى أَنْ يُومِئَ بِرَأْسِهِ إِيمَاءً[٣].

قَالَ يَحْيَى ﷺ: قَالَ مَالِكٌ ﷺ: وَذَلِكَ أَحَبُّ مَا سَمِعْتُ إِلَيَّ فِي ذَلِكَ.

واتە: لە یەحیای کوڕی سەعیدەوە ﷺ گێڕدراوەتەوە (گوتوویەتی): سەعیدی کوڕی موسەیەب ﷺ گوتی: چی دەڵێن دەربارەی زاڵبوونی خوێنبەربوونی لووت کە نەوەستێت؟ ئیمامی مالیك ﷺ گوتی: یەحیای کوڕی سەعید ﷺ گوتی: دواتر

---

(١) ـ الْعَمَلُ فِيمَنْ غَلَبَهُ الدَّمُ مِنْ جُرْحٍ أَوْ رُعَافٍ.

(٢) ـ صحيح. أخرجه أبو مصعب الزهري: ١٠١ في الوضوء؛ والحدثاني: ٤٤ في الطهارة، عن مالك به.

(٣) ـ مقطوع صحيح. أخرجه أبو مصعب الزهري: ١٠٢ في الوضوء؛ والحدثاني: ٤٤ أ في الطهارة؛ والشيباني: ٣٨ في الصلاة؛ ومصنف ابن أبي شيبة: ٨٣٨٥ في الصلوات، كلهم عن مالك به.

سەعیدی كوڕی موسەیەب ﷺ (هەر خۆی وەڵامی دایەوە) گوتی: پێم وایە دەبێ سەری تۆزێك دابخات (تا جلەكانی و شوێنی كڕنووشی پیس نەبن بە خوێنەكە و بتوانێ لە نوێژەكە بەردەوام بێت).

یەحیا ﷺ دەڵێ: ئیمامی مالیك ﷺ گوتوویەتی: ئەوە خۆشەویسترینی ئەوەیە كە گوێبیستی بووم لەم بارەیەوە.

## ١٣- دەستنوێژ شۆردنەوە لە مەزی[1]

٩٥- عَنِ الْمِقْدَادِ بْنِ الأَسْوَدِ ﷺ، أَنَّ عَلِيَّ بْنَ أَبِي طَالِبٍ ﷺ أَمَرَهُ أَنْ يَسْأَلَ لَهُ رَسُولَ اللهِ ﷺ عَنِ الرَّجُلِ إِذَا دَنَا مِنْ أَهْلِهِ فَخَرَجَ مِنْهُ الْمَذْيُ، مَاذَا عَلَيْهِ؟ قَالَ عَلِيٌّ ﷺ: فَإِنَّ عِنْدِي ابْنَةَ رَسُولِ اللهِ ﷺ، وَأَنَا أَسْتَحِي أَنْ أَسْأَلَهُ، قَالَ الْمِقْدَادُ ﷺ: فَسَأَلْتُ رَسُولَ اللهِ ﷺ عَنْ ذَلِكَ، فَقَالَ: إِذَا وَجَدَ ذَلِكَ أَحَدُكُمْ، فَلْيَنْضَحْ فَرْجَهُ بِالْمَاءِ، وَلْيَتَوَضَّأْ وُضُوءَهُ لِلصَّلاَةِ[2].

واتە: لە میقدادی كوڕی ئەسوەدەوە ﷺ گێڕدراوەتەوە (گوتوویەتی): عەلی كوڕی ئەبو تاڵیب ﷺ فەرمانی پێكردووە پرسیار لە پێغەمبەری خوا ﷺ بكات دەربارەی پیاوێك كاتێك لە خێزانی نزیك دەبێتەوە و مەزی لێ دەردەچێ، ئایا چی لەسەرە؟ عەلی ﷺ پێی گوتووە، چونكە كچی پێغەمبەری خوا ﷺ خێزانمە، من شەرم دەكەم خۆم پرسیاری لێ بكەم، میقداد ﷺ دەڵێ: منیش پرسیارم لە پێغەمبەری خوا ﷺ كرد، ئەویش فەرمووی: ئەگەر یەكێك لە ئێوە ئاوای بەسەر هات، ئەوە با دامێن و شەرمگای بشۆرێت و دەستنوێژ بشۆرێ بەهەمان دەستنوێژشۆردنی بۆ نوێژ.

---

(١) ـ الْوُضُوءُ مِنَ الْمَذْيِ.

تێبینی: مەزی ئاوێكی ڕوونی لینجە لە كاتی وروژانی شەهوەت دەردەدرێ.

(٢) ـ صحيح لغيره. أخرجه أبو مصعب الزهري: ١٠٦ في الوضوء؛ والحدثاني: ٤٦ في الطهارة؛ والشيباني: ٤٢ في الصلاة؛ والشافعي: ٣١؛ وابن حنبل: ٢٣٨٧٠، وفي: ٢٣٨٨٠، وفي: ٢٣٨٨٠؛ والنسائي: ٤٤٠؛ وأبو داود: ٢٠٧ في الطهارة؛ وابن ماجه: ٥٢٤ في الطهارة؛ وابن حبان: ١١٠١، وفي: ١١٠٦؛ والمنتقى لابن الجارود: ٥؛ والقابسي: ٤٢٠، كلهم عن مالك به.

**٩٦- أَنَّ عُمَرَ بْنَ الْخَطَّابِ ﷺ قَالَ: إِنِّي لأَجِدُهُ يَنْحَدِرُ مِنِّي مِثْلَ الْخُرَيْزَةِ، فَإِذَا وَجَدَ ذَلِكَ أَحَدُكُمْ فَلْيَغْسِلْ ذَكَرَهُ، وَلْيَتَوَضَّأْ وُضُوءَهُ لِلصَّلاَةِ، يَعْنِي الْمَذْيَ(١).**

واتە: عومەری کوڕی خەتتاب ﷺ ـ دەربارەی مەزی ـ گوتوویەتی: من هەستی پێدەکەم وەك بەردی بچووکی مەرجان لێم دێتە خوارەوە (واتە: قەترە قەترە لێم دێتە خوارەوە)، جا ئەگەر یەکێك لە ئێوە هەستی بەوە کرد، ئەوە با دامێنی (و شوێنی مەزیەکە بە جلەکەیەوە) بشۆرێ و دەستنوێژ بشۆرێ وەك دەستنوێژشۆردنی بۆ نوێژ، واتە مەبەستی مەزی بوو (کەواتە دەستنوێژ دەشکێنێ، بەڵام خۆشۆردن واجب ناکات).

**٩٧- عَنْ جُنْدُبٍ، مَوْلَى عَبْدِ اللهِ بْنِ عَيَّاشٍ ﷺ، أَنَّهُ قَالَ: سَأَلْتُ عَبْدَ اللهِ بْنَ عُمَرَ ﷺ عَنِ الْمَذْيِ، فَقَالَ: إِذَا وَجَدْتَهُ فَاغْسِلْ فَرْجَكَ، وَتَوَضَّأْ وُضُوءَكَ لِلصَّلاَةِ(٢).**

واتە: لە جوندوبی خزمەتکاری عەبدوڵڵای کوڕی عەیاشەوە ﷺ گێڕدراوەتەوە گوتوویەتی: پرسیارم لە عەبدوڵڵای کوڕی عومەر ﷺ کرد دەربارەی مەزی، ئەویش گوتی: ئەگەر هەستت پێکرد و بینیت ئەوە دامێنت (و ئەو شوێنەی کەزیەکەی بەرکەوتووە) بشۆرە و دەستنوێژ بشۆرە وەك دەستنوێژشۆردنت بۆ نوێژ.

## ١٤- ڕوخسەتدان لە نەشۆردنەوەی دەستنوێژ لە مەزی (بۆ حاڵەتی تایبەت).(٣)

**٩٨- عَنْ يَحْيَى بْنِ سَعِيدٍ ﷺ، عَنْ سَعِيدِ بْنِ الْمُسَيَّبِ ﷺ، أَنَّهُ سَمِعَهُ وَرَجُلٌ يَسْأَلُهُ فَقَالَ: إِنِّي لأَجِدُ الْبَلَلَ وَأَنَا أُصَلِّي أَفَأَنْصَرِفُ؟ فَقَالَ لَهُ سَعِيدٌ ﷺ: لَوْ سَالَ عَلَى فَخِذِي مَا انْصَرَفْتُ حَتَّى أَقْضِيَ صَلاَتِي(٤).**

---

(١) ـ صحيح. أخرجه أبو مصعب الزهري: ١٠٨ في الوضوء؛ والحدثاني: ٤٦أفي الطهارة؛ والشيباني: ٤٣ في الصلاة، كلهم عن مالك به.

(٢) ـ ضعيف. أخرجه أبو مصعب الزهري: ١٠٧ في الوضوء، عن مالك به.

(٣) ـ الرُّخْصَةُ فِي تَرْكِ الْوُضُوءِ مِنَ الْمَذْيِ.

(٤) ـ مقطوع صحيح. أخرجه أبو مصعب الزهري: ١٠٩ في الوضوء؛ والحدثاني: ٤٧ في الطهارة، عن مالك به.

واتە: لە یەحیای کوڕی سەعیدەوە ﷺ گێردراوەتەوە، ئەویش لە سەعیدی کوڕی موسەیەبەوە ﷺ گێراویەتەوە، جا کە یەحیا ﷺ گوێی لە سەعید ﷺ بوو کە پیاوێك پرسیاری لێکرد و گوتی: من هەست بە تەڕایەتی (مەزی) دەکەم لە کاتێکدا نوێژ دەکەم (لەناو نوێژم)، جا ئایا واز لە نوێژەکە بێنم؟ سەعیدیش ﷺ پێی گوت: ئەگەر بەسەر ڕانیشمدا بێتە خوارەوە واز لە نوێژەکەم ناهێنم تا نوێژەکەم تەواو دەکەم.

٩٩- عَنِ الصَّلْتِ بْنِ زُيَيْدٍ ﷺ، أَنَّهُ قَالَ: سَأَلْتُ سُلَيْمَانَ بْنَ يَسَارٍ ﷺ عَنِ الْبَلَلِ أَجِدُهُ، فَقَالَ: انْضَحْ مَا تَحْتَ ثَوْبِكَ بِالْمَاءِ وَالْهُ عَنْهُ[١].

واتە: لە صەڵتی کوڕی زویەیدەوە ﷺ گێردراوەتەوە گوتوویەتی: پرسیارم لە سولەیمانی کوڕی یەسار ﷺ کرد دەربارەی تەڕایەتی کە هەستی پێ دەکەم (ئایا دەبێ دەستنوێژ بشۆمەوە؟)، ئەویش گوتی: ژێر جلەکەت ئاوڕشێن بکە و خۆت بە شتێکی دیکەوە سەرقاڵ بکە (واتە: هیچی تیا نییە، لە خۆتی مەکە بە وەسوەسە).

## ١٥- دەستنوێژشۆردنەوە بەهۆی دەستدان لە دامێن[٢]

١٠٠- عَنْ مُحَمَّدِ بْنِ عَمْرِو بْنِ حَزْمٍ ﷺ، أَنَّهُ سَمِعَ عُرْوَةَ بْنَ الزُّبَيْرِ ﷺ يَقُولُ: دَخَلْتُ عَلَى مَرْوَانَ بْنِ الْحَكَمِ ﷺ، فَتَذَاكَرْنَا مَا يَكُونُ مِنْهُ الْوُضُوءُ، فَقَالَ مَرْوَانُ ﷺ: وَمِنْ مَسِّ الذَّكَرِ الْوُضُوءُ، فَقَالَ عُرْوَةُ مَا عَلِمْتُ هَذَا، فَقَالَ مَرْوَانُ بْنُ الْحَكَمِ: أَخْبَرَتْنِي بُسْرَةُ بِنْتُ صَفْوَانَ ﷺ، أَنَّهَا سَمِعَتْ رَسُولَ اللهِ ﷺ يَقُولُ: إِذَا مَسَّ أَحَدُكُمْ ذَكَرَهُ فَلْيَتَوَضَّأْ[٣].

واتە: لە موحەممەدی کوڕی عەمری کوڕی حەزمەوە ﷺ گێردراوەتەوە، گوێی لە عورووەی کوڕی زوبەیر ﷺ بوو دەیگوت: چوومە ژوورەوە بۆ لای مەڕوانی کوڕی حەکەم ﷺ و بەیەکەوە باسی ئەو شتانەمان کرد کە دەستنوێژشۆردنەوە پێویست دەکەن،

---

(١) ـ مقطوع صحيح. أخرجه أبو مصعب الزهري: ١١٠ في الوضوء؛ والحدثاني: ٤٧ أ في الطهارة؛ والشيباني: ٤٤ في الصلاة، كلهم عن مالك به.

(٢) ـ الْوُضُوءُ مِنْ مَسِّ الْفَرْجِ.

(٣) ـ صحيح. أخرجه أبو مصعب الزهري: ١١١ في الوضوء؛ والحدثاني: ٤٨ في الطهارة؛ والشافعي: ٣٢؛ والنسائي: ١٦٣ في الطهارة؛ وأبو داود: ١٨١ في الطهارة؛ وابن حبان: ١١١٢؛ والقابسي: ٣٠٤، كلهم عن مالك به.





جا مەڕوان ﷺ گوتی: دەستنوێژشۆردنەوە لە دەست بەر عەورەت کەوتنیش واجبە، عوڕوەش ﷺ گوتی: ئەوەم نەزانیوە، مەڕوانی کوڕی حەکەمیش ﷺ گوتی: بوسرەی کچی صەفوان ﷺ هەواڵی پێداوم کە گوێی لە پێغەمبەری خوا ﷺ بووە دەیفەرموو: ئەگەر یەکێك لە ئێوە دەستی دا لە دامێنی خۆی ئەوە با دەستنوێژ بشۆرێتەوە.

١٠١- عَنْ مُصْعَبِ بْنِ سَعْدِ بْنِ أَبِي وَقَّاصٍ ﷺ، أَنَّهُ قَالَ: كُنْتُ أُمْسِكُ الْمُصْحَفَ عَلَى سَعْدِ بْنِ أَبِي وَقَّاصٍ ﷺ، فَاحْتَكَكْتُ، فَقَالَ سَعْدٌ ﷺ: لَعَلَّكَ مَسِسْتَ ذَكَرَكَ؟ قَالَ: فَقُلْتُ: نَعَمْ، فَقَالَ: قُمْ، فَتَوَضَّأْ، فَقُمْتُ، فَتَوَضَّأْتُ، ثُمَّ رَجَعْتُ[١].

واتە: لە موصعەبی کوڕی سەعدی کوڕی ئەبی وەقاصەوە ﷺ گێڕدراوەتەوە گوتوویەتی: من قورئانم بۆ (باوکم) سەعدی کوڕی ئەبو وەقاص ﷺ دەگرت، جا (جارێکیان) خۆمم خوراند، سەعدیش ﷺ گوتی: ڕەنگە دەستت دابێت لە دامێنت (لە کاتی خوراندنەکە)؟ دەڵێ: منیش گوتم: بەڵێ، ئەویش گوتی: هەڵسە دەستنوێژ بشۆرەوە، منیش دەستنوێژم شۆردەوە و گەڕامەوە.

١٠٢- أَنَّ عَبْدَ اللهِ بْنَ عُمَرَ ﷺ كَانَ يَقُولُ: إِذَا مَسَّ أَحَدُكُمْ ذَكَرَهُ، فَقَدْ وَجَبَ عَلَيْهِ الْوُضُوءُ[٢].

واتە: عەبدوڵڵای کوڕی عومەر ﷺ دەیگوت: کاتێ یەکێك لە ئێوە دەستی دا لە دامێنی، ئەوە دەستنوێژشۆردنەوەی لەسەر پێویست دەبێت.

١٠٣- عَنْ هِشَامِ بْنِ عُرْوَةَ ﷺ، عَنْ أَبِيهِ ﷺ، أَنَّهُ كَانَ يَقُولُ: مَنْ مَسَّ ذَكَرَهُ، فَقَدْ وَجَبَ عَلَيْهِ الْوُضُوءُ[٣].

واتە: لە هیشامی کوڕی عوڕوەوە ﷺ گێڕدراوەتەوە، ئەویش لە باوکیەوە ﷺ گێڕاویەتەوە دەیگوت: هەر کەسێك دەستی دا لە دامێنی، ئەوە دەستنوێژشۆردنەوەی لەسەر واجب بووە.

---

(١) ـ صحيح. أخرجه أبو مصعب الزهري: ١١٢ في الوضوء؛ والحدثاني: ٤٨أفي الطهارة؛ والشيباني: ١١ في الصلاة، كلهم عن مالك به.

(٢) ـ صحيح. أخرجه أبو مصعب الزهري: ١١٣ في الوضوء؛ والحدثاني: ٤٨ ب في الطهارة، عن مالك به.

(٣) ـ مقطوع صحيح. أخرجه أبو مصعب الزهري: ١١٦ في الوضوء، عن مالك به.

١٠٤- عَنْ سَالِمِ بْنِ عَبْدِ اللهِ ﷺ أَنَّهُ قَالَ: رَأَيْتُ أَبِي عَبْدَ اللهِ بْنَ عُمَرَ ﷺ يَغْتَسِلُ ثُمَّ يَتَوَضَّأُ، فَقُلْتُ لَهُ: يَا أَبَتِ أَمَا يَجْزِيكَ الْغُسْلُ مِنَ الْوُضُوءِ؟ قَالَ: بَلَى، وَلَكِنِّي أَحْيَانًا أَمَسُّ ذَكَرِي فَأَتَوَضَّأُ[1].

واتە: لە سالمی كوڕی عەبدوڵڵاوە ﷺ گێڕدراوەتەوە گوتوویەتی: باوكم عەبدوڵڵای كوڕی عومەرم ﷺ بینی خۆی دەشۆرد و دواتر دەستنوێژیشی دەشۆرد، منیش پێم گوت: ئەی باوكە ئایا خۆشۆردن دەستنوێژت بۆ بەبەرناخات (ئایا خۆشۆردن بەس نییە بۆ دەستنوێژ)؟ گوتی: بۆنا، بەڵام من هەندێ جار دەستم بەر دامێنم دەكەوێت بۆیە دەستنوێژ دەشۆمەوە.

١٠٥- عَنْ سَالِمِ بْنِ عَبْدِ اللهِ ﷺ، أَنَّهُ قَالَ: كُنْتُ مَعَ عَبْدِ اللهِ بْنِ عُمَرَ ﷺ فِي سَفَرٍ، فَرَأَيْتُهُ بَعْدَ أَنْ طَلَعَتِ الشَّمْسُ، تَوَضَّأَ ثُمَّ صَلَّى، قَالَ: فَقُلْتُ لَهُ: إِنَّ هَذِهِ لَصَلاَةٌ مَا كُنْتَ تُصَلِّيهَا، قَالَ: إِنِّي بَعْدَ أَنْ تَوَضَّأْتُ لِصَلاَةِ الصُّبْحِ مَسِسْتُ فَرْجِي، ثُمَّ نَسِيتُ أَنْ أَتَوَضَّأَ، فَتَوَضَّأْتُ وَعُدْتُ لِصَلاَتِي[2].

واتە: لە سالمی كوڕی عەبدوڵڵاوە ﷺ گێڕدراوەتەوە گوتوویەتی: لەگەڵ (باوكم) عەبدوڵڵای كوڕی عومەر ﷺ بووم لە سەفەرێكدا، جا بینیم پاش ئەوەی خۆر هەڵهات دەستنوێژی شۆرد و نوێژی كرد، دەڵێ: منیش پێم گوت: ئەوە نوێژێكە تۆ پێشتر نەتكردووە، گوتی: من دوای ئەوەی دەستنوێژم شۆرد بۆ نوێژی بەیانی (لەبەر هۆكارێك) دەستم دا لە دامێنم و دواتریش لە یادم چوو دەستنوێژ بشۆرمەوە (بەبێ دەستنوێژ نوێژم كرد)، جا بۆیە ئێستا دەستنوێژم شۆرد و گەڕامەوە بۆ نوێژەكەم (دووبارە ئەنجامم دایەوە).

---

(١) ـ صحيح. أخرجه أبو مصعب الزهري: ١١٤ في الوضوء؛ والشيباني: ١٢ في الصلاة، عن مالك به.

(٢) ـ صحيح. أخرجه أبو مصعب الزهري: ١١٥ في الوضوء، عن مالك به.

## ١٦- دەستنوێژشۆردنەوە بەهۆی ماچکردنی پیاو لە خێزانەکەی[١]

**١٠٦-** عَنْ سَالِمِ بْنِ عَبْدِ اللهِ ﷺ، عَنْ أَبِيهِ عَبْدِ اللهِ بْنِ عُمَرَ ﷺ، أَنَّهُ كَانَ يَقُولُ: قُبْلَةُ الرَّجُلِ امْرَأَتَهُ، وَجَسُّهَا بِيَدِهِ، مِنَ الْمُلَامَسَةِ، فَمَنْ قَبَّلَ امْرَأَتَهُ، أَوْ جَسَّهَا بِيَدِهِ، فَعَلَيْهِ الْوُضُوءُ[٢].

واتە: لە سالمی کوڕی عەبدوڵڵاوە ﷺ گێڕدراوەتەوە، ئەویش لە عەبدوڵڵای کوڕی عومەری باوکیەوە ﷺ گێڕاویەتەوە دەیگوت: ماچکردنی پیاو لە ئافرەتەکەی و دەستلێدانی بەشێکە لە مولامەسە (کە خوای پەروەردگار ﷻ باسی کردووە دەستنوێژ دەشکێنێ)، بۆیە هەر کەسێك خیزانی خۆی ماچ کرد یان دەستی لێ دا، ئەوە دەستنوێژشۆردنەوەی لەسەر واجبە[٣].

**١٠٧-** أَنَّ عَبْدَ اللهِ بْنَ مَسْعُودٍ ﷺ كَانَ يَقُولُ: مِنْ قُبْلَةِ الرَّجُلِ امْرَأَتَهُ الْوُضُوءُ[٤].

واتە: عەبدوڵڵای کوڕی مەسعود ﷺ دەیگوت: لە ماچکردنی پیاو لە خێزانەکەی دەستنوێژشۆردنەوە هەیە.

**١٠٨-** عَنِ ابْنِ شِهَابٍ ﷺ، أَنَّهُ كَانَ يَقُولُ: مِنْ قُبْلَةِ الرَّجُلِ امْرَأَتَهُ الْوُضُوءُ[٥].

واتە: لە ئیبنو شیهابەوە ﷺ گێڕدراوەتەوە دەیگوت: ماچکردنی پیاو بۆ ژنەکەی دەستنوێژشۆردنەوە واجب دەکات.

---

(١) ـ الْوُضُوءُ مِنْ قُبْلَةِ الرَّجُلِ امْرَأَتَهُ.

(٢) ـ صحيح. أخرجه أبو مصعب الزهري: ١١٧ في الوضوء؛ والحدثاني: ٤٩ في الطهارة؛ والشافعي: ٢٧، كلهم عن مالك به.

(٣) ـ تێبینی: لەلای ئیمامی مالیك دەستلێدانەکە مەرجە بەشەهوەت بێ، بەڵام لەلای ئیمامی شافیعی تەنها بە دەستلێدان دەشکێ، بە بەڵگەی زاهیری قسەی ئیبن عومەر و گشتاندنی لە ئایەتەکە و یەکدەنگی زانایان لەسەر شکانی دەستنوێژی ئەو ئافرەتەی زۆری لێ دەکرێ، یان خەوتووە و کەسێك جیماعی لەگەڵ دەکات، لەو کاتەدا لە یەکەم ساتی بەیەکگەیشتنی دامێنیان دەستنوێژ دەشکێ، کەچی بۆ ئافرەتەکە شەهوەت و چێژی تێدا نەبووە لە یەکەم ساتەوە کەچی بە ئیجماعی زانایان دەستنوێژی دەشکێ کەچی دەستلێدانی عەورەتیشی تێدا نیە بەڵکو تەنها پێستی دوو شوێنی جەستەیان بەریەك کەوتووە.

(٤) ـ صحيح. أخرجه أبو مصعب الزهري: ١١٨ في الوضوء؛ والحدثاني: ٤٩ أ في الطهارة، عن مالك به.

(٥) ـ مقطوع صحيح.




## ١٧- كرداری خۆشۆردنی جەنابەت (لەشگرانی)[(١)]

**١٠٩-** عَنْ عَائِشَةَ أُمِّ الْمُؤْمِنِينَ ﵂، أَنَّ رَسُولَ اللهِ ﷺ كَانَ إِذَا اغْتَسَلَ مِنَ الْجَنَابَةِ، بَدَأَ فَغَسَلَ يَدَيْهِ، ثُمَّ تَوَضَّأَ كَمَا يَتَوَضَّأُ لِلصَّلَاةِ، ثُمَّ يُدْخِلُ أَصَابِعَهُ فِي الْمَاءِ، فَيُخَلِّلُ بِهَا أُصُولَ شَعَرِهِ، ثُمَّ يَصُبُّ عَلَى رَأْسِهِ ثَلَاثَ غَرَفَاتٍ بِيَدَيْهِ، ثُمَّ يُفِيضُ الْمَاءَ عَلَى جِلْدِهِ كُلِّهِ[(٢)].

واتە: لە عائیشەی دایكی بڕوادارانەوە ﵂ گێڕدراوەتەوە (گوتوویەتی): پێغەمبەری خوا ﷺ كاتێ خۆی بشۆردایە لە جەنابەت، سەرەتا دەستی دەكرد بە شۆردنی دەستەكانی، دواتر دەستنوێژی دەشۆرد وەك چۆن دەستنوێژی دەشۆرد بۆ نوێژ، دواتر پەنجەكانی دەخستە ناو ئاوەكە و دەیهێنا بە ناو مووەكانی سەری (سەری پێ هەڵدەپشاوت، تاوەكوو ژێرەوەی مووەكان تەڕ ببن)، دواتر سێ چەنگە ئاوی بە هەردوو دەستەكانی دەڕشتە سەر سەری، دواتر ئاوی دەكرد بە گشت جەستەیدا.

**١١٠-** عَنْ عَائِشَةَ أُمِّ الْمُؤْمِنِينَ ﵂، أَنَّ رَسُولَ اللهِ ﷺ كَانَ يَغْتَسِلُ مِنْ إِنَاءٍ هُوَ الْفَرَقُ مِنَ الْجَنَابَةِ[(٣)].

واتە: لە عائیشەی دایكی بڕوادارانەوە ﵂ گێڕدراوەتەوە (گوتوویەتی): پێغەمبەری خوا ﷺ لە جەنابەت خۆی بە ئاوی تەشتێك دەشۆرد كە فەڕەقێك ئاوی دەگرت (فەڕەق پێوانەیەكە حەوت لیتر و نیو ئاو دەگرێت).

**١١١-** أَنَّ عَبْدَ اللهِ بْنَ عُمَرَ ﵄ كَانَ إِذَا اغْتَسَلَ مِنَ الْجَنَابَةِ، بَدَأَ فَأَفْرَغَ عَلَى يَدِهِ الْيُمْنَى، فَغَسَلَهَا، ثُمَّ غَسَلَ فَرْجَهُ، ثُمَّ مَضْمَضَ وَاسْتَنْثَرَ، ثُمَّ غَسَلَ وَجْهَهُ، وَنَضَحَ فِي عَيْنَيْهِ، ثُمَّ غَسَلَ يَدَهُ الْيُمْنَى، ثُمَّ الْيُسْرَى، ثُمَّ غَسَلَ رَأْسَهُ، ثُمَّ اغْتَسَلَ وَأَفَاضَ عَلَيْهِ الْمَاءَ[(٤)].

---

(١) ـ الْعَمَلُ فِي غُسْلِ الْجَنَابَةِ.

(٢) ـ صحيح. أخرجه أبو مصعب الزهري: ١٢٠ في الوضوء؛ والحدثاني: ٥٠ في الطهارة؛ والشافعي: ٦٢؛ والبخاري: ٢٤٨ في الغسل؛ والنسائي: ٢٤٧ في الطهارة؛ وابن حبان: ١١٩٦؛ والقابسي: ٤٤٩، كلهم عن مالك به.

(٣) ـ صحيح. أخرجه أبو مصعب الزهري: ١٢١ في الوضوء؛ ومسلم: الحيض: ٤٠؛ وأبو داود: ٢٣٨ في الطهارة؛ وابن حبان: ١٢٠١؛ والقابسي: ٣٤، كلهم عن مالك به.

(٤) ـ صحيح. أخرجه أبو مصعب الزهري: ١٢٢ في الوضوء؛ وفي: ١٢٤ في الوضوء؛ والحدثاني: ٥١ في الطهارة؛ والشيباني: ٥٤ في الصلاة، كلهم عن مالك به.





واتە: عەبدوڵڵای کوڕی عومەر ﷺ کاتێ خۆی بشۆردایە لە جەنابەت (بەم شێوەیەی دەکرد): سەرەتا ئاوی بەسەر دەستی ڕاستەی و دەیشۆری، دواتر دامێنی دەشۆری، دواتر ئاوی لە دەم و لووتی وەردەکرد و فڕێی دەدایەوە دەرەوە، دواتر ڕوخساری دەشۆرد و ئاوی دەپرژاندە ناو چاوەکانی، دواتر دەست و قۆڵی ڕاستی دەشۆرد، دواتر چەپەی، دواتر سەری دەشۆرد، دواتر ئاوی دەڕشتە سەر گشت جەستەی.

**١١٢-** أَنَّ عَائِشَةَ أُمَّ الْمُؤْمِنِينَ ﷺ سُئِلَتْ عَنْ غُسْلِ الْمَرْأَةِ مِنَ الْجَنَابَةِ، فَقَالَتْ: لِتَحْفِنْ عَلَى رَأْسِهَا ثَلاَثَ حَفَنَاتٍ مِنَ الْمَاءِ، وَلْتَضْغَثْ رَأْسَهَا بِيَدَيْهَا[١].

واتە: عائیشەی دایکی بڕواداران ﷺ پرسیاری لێکراوە دەربارەی خۆشۆردنی ئافرەت لە جەنابەت، ئەویش گوتوویەتی: با سێ گۆنمە ئاو بەسەر سەری دابکات و سەری هەڵپشێوێ بە دەستەکانی (و مووەکانی لێکبدات تا ئاو بچێتە ژێرەوەیان و جوان تەڕ ببن).

## ١٨- واجببوونی خۆشۆردن کاتێ دوو شوێنەکانی خەتەنەی پیاو و ئافرەت بەیەك دەگەن (واتە کاتێ جووتبوون ڕوو دەدات)[٢]

**١١٣-** عَنْ سَعِيدِ بْنِ الْمُسَيَّبِ ﷺ، أَنَّ عُمَرَ بْنَ الْخَطَّابِ، وَعُثْمَانَ بْنَ عَفَّانَ ، وَعَائِشَةَ ﷺ زَوْجَ النَّبِيِّ ﷺ كَانُوا يَقُولُونَ: إِذَا مَسَّ الْخِتَانُ الْخِتَانَ فَقَدْ وَجَبَ الْغُسْلُ[٣].

واتە: لە سەعیدی کوڕی موسەیەبەوە ﷺ گێڕدراوەتەوە (گوتوویەتی): عومەری کوڕی خەتتاب و عوسمانی کوڕی عەففان و عائیشەی ﷺ خێزانی پێغەمبەری خوا ﷺ دەیانگوت: ئەگەر شوێنی خەتەنەکردنی پیاو و ئافرەت بەیەکتری گەیشت (واتە جیماع ڕووی دا) ئەوە خۆشۆردن واجب دەبێت.

---

(١) ـ صحيح. أخرجه أبو مصعب الزهري: ١٢٣ في الوضوء، عن مالك به.

(٢) ـ وَاجِبُ الْغُسْلِ إِذَا الْتَقَى الْخِتَانَانِ.

(٣) ـ صحيح. أخرجه أبو مصعب الزهري: ١٢٥ في الوضوء؛ والحدثاني: ٥٢ في الطهارة؛ والشيباني: ٧٦ في الصلاة، كلهم عن مالك به.





**١١٤- عَنْ أَبِي سَلَمَةَ بْنِ عَبْدِ الرَّحْمَنِ بْنِ عَوْفٍ ﷺ أَنَّهُ قَالَ: سَأَلْتُ عَائِشَةَ ﷺ، زَوْجَ النَّبِيِّ ﷺ مَا يُوجِبُ الْغُسْلَ؟ فَقَالَتْ: هَلْ تَدْرِي مَا مَثَلُكَ يَا أَبَا سَلَمَةَ، مَثَلُ الْفَرُّوجِ يَسْمَعُ الدِّيَكَةَ تَصْرُخُ فَيَصْرُخُ مَعَهَا، إِذَا جَاوَزَ الْخِتَانُ الْخِتَانَ فَقَدْ وَجَبَ الْغُسْلُ[١].**

واتە: لە ئەبو سەلەمەی کوڕی عەبدوڕڕەحمانی کوڕی عەوفەوە ﷺ گێڕدراوەتەوە گوتوویەتی: پرسیارم لە عائیشەی ﷺ خێزانی پێغەمبەر ﷺ کرد (گوتم): چ شتێك خۆشۆردن واجب دەکات؟ ئەویش گوتی: ئەی ئەبو سەلەمە دەزانی نموونەی تۆ وەك چییە؟ وەك جوجەڵە وایە کاتێ گوێی لە کەڵەشێر دەبێ دەقوقێنێ ئەویش لەگەڵی دەقوقێنێ (واتە تۆ هێشتا بچووکی و باڵغ نەبووی تا لەو بابەتە تێبگەی، بەڵام دەتوانی لاسایی گەوران بکەیتەوە و بە قسە بیزانی و بیگێڕیتەوە، بۆیە بۆت ڕوون دەکەمەوە)، ئەگەر شوێنی خەتەنەکردنی پیاو لە شوێنی خەتەنەکردنی ئافرەت تێپەڕی (واتە جووتبوون ڕووی دا) ئەوە خۆشۆردن واجب دەبێت.

**١١٥- عَنْ سَعِيدِ بْنِ الْمُسَيَّبِ ﷺ، أَنَّ أَبَا مُوسَى الأَشْعَرِيَّ ﷺ أَتَى عَائِشَةَ ﷺ، زَوْجَ النَّبِيِّ ﷺ، فَقَالَ لَهَا: لَقَدْ شَقَّ عَلَيَّ اخْتِلاَفُ أَصْحَابِ النَّبِيِّ ﷺ فِي أَمْرٍ، إِنِّي لأُعْظِمُ أَنْ أَسْتَقْبِلَكِ بِهِ، فَقَالَتْ مَا هُوَ؟ مَا كُنْتَ سَائِلاً عَنْهُ أُمَّكَ، فَسَلْنِي عَنْهُ، فَقَالَ: الرَّجُلُ يُصِيبُ أَهْلَهُ ثُمَّ يُكْسِلُ وَلاَ يُنْزِلُ؟ فَقَالَتْ: إِذَا جَاوَزَ الْخِتَانُ الْخِتَانَ فَقَدْ وَجَبَ الْغُسْلُ، فَقَالَ أَبُو مُوسَى الأَشْعَرِيُّ ﷺ: لاَ أَسْأَلُ عَنْ هَذَا أَحَدًا بَعْدَكِ أَبَدًا[٢].**

واتە: لە سەعیدی کوڕی موسەیەبەوە ﷺ گێڕدراوەتەوە (گوتوویەتی): ئەبو موسای ئەشعەری ﷺ هات بۆ لای عائیشەی ﷺ خێزانی پێغەمبەر ﷺ و پێی گوت: لەسەرم قورس و گرانە ڕاجیایی هاوەڵانی پێغەمبەری خوا ﷺ لەسەر بابەتێك، (جا قەناعەتم بە تۆ هەیە) پێشم گەورە و نابەجێیە ڕووبەڕووی تۆی بکەمەوە (شەرم دەکەم)، عائیشەش ﷺ گوتی: بابەتەکە چییە؟ پرسیار لە دایکت بکە (واتە: بۆ شەرم دەکەی مەگەر من دایکی بڕواداران نیم؟) دەی پرسیارم دەربارەی لێ بکە، ئەبو موساش ﷺ گوتی: کاتێ پیاو جیماع لەگەڵ خێزانی دەکات و دواتر بێتاقەت

---

(١) ـ صحيح. أخرجه أبو مصعب الزهري: ١٢٦ في الوضوء؛ والشيباني: ٧٧ في الصلاة، عن مالك به.

(٢) ـ صحيح. أخرجه أبو مصعب الزهري: ١٢٧ في الوضوء؛ والشافعي: ٧٧٠، عن مالك به.





دەبێ و (کارەکەی پێ تەواو ناکرێ) و ئاوی نایەتەوە (ئایا خۆشۆردنی لەسەرە)؟ عائیشەش ﵂ گوتی: ئەگەر ئەندامی خەتەنەکردنی پیاو و ئافرەت لێك تێپەڕین ئەوە خۆشۆردن واجب دەبێ، ئەبو موسای ئەشعەریش ﵁ گوتی: لە دوای تۆ دەربارەی ئەو بابەتە هەرگیز پرسیار لە هیچ کەس ناکەم (وەڵامەکەم وەرگرت).

١١٦- عَنْ عَبْدِ اللهِ بْنِ كَعْبٍ، مَوْلَى عُثْمَانَ بْنِ عَفَّانَ ﵁، أَنَّ مَحْمُودَ بْنَ لَبِيدٍ الأَنْصَارِيَّ ﵁ سَأَلَ زَيْدَ بْنَ ثَابِتٍ ﵁ عَنِ الرَّجُلِ يُصِيبُ أَهْلَهُ ثُمَّ يُكْسِلُ وَلاَ يُنْزِلُ؟ فَقَالَ زَيْدٌ ﵁: يَغْتَسِلُ، فَقَالَ لَهُ مَحْمُودٌ: إِنَّ أُبَيَّ بْنَ كَعْبٍ ﵁ كَانَ لاَ يَرَى الْغُسْلَ، فَقَالَ لَهُ زَيْدُ بْنُ ثَابِتٍ ﵁: إِنَّ أُبَيَّ بْنَ كَعْبٍ نَزَعَ عَنْ ذَلِكَ قَبْلَ أَنْ يَمُوتَ[١].

واتە: لە عەبدوڵڵای کوڕی کەعبی خزمەتکاری ئازادکراوی عوسمانی کوڕی عەففانەوە ﵁ گێردراوەتەوە (گوتوویەتی): مەحمودی کوڕی لەبیدی ئەنصاری ﵁ پرسیاری لە زەیدی کوڕی سابیت ﵁ کرد دەربارەی پیاوێك کە جیماع لەگەڵ خێزانی دەکات و دواتر خاو و خلیچکی دەیگرێت (جیماعەکەی پێ تەواو ناکرێت) و مەنی و تۆوی نایێت (ئایا خۆشۆردنی لەسەر واجبە)؟ زەیدیش ﵁ گوتی: خۆی دەشۆرێت (واجبە خۆی بشوات)، مەحمودیش ﵁ پێی گوت: ئوبەی کوڕی کەعب ﵁ پێی وا نییە خۆشۆردنی لەسەر واجب بێ، زەیدیش ﵁ پێی گوت: ئوبەی کوڕی کەعب ﵁ وازی لەو بۆچوونە هێنا و پەشیمان بویەوە پێش ئەوەی بمرێت (واتە ئەویش هاتە سەر ئەو بۆچونەی خۆشۆردن واجب دەبێت).

١١٧- أَنَّ عَبْدَ اللهِ بْنَ عُمَرَ ﵄ كَانَ يَقُولُ: إِذَا جَاوَزَ الْخِتَانُ الْخِتَانَ فَقَدْ وَجَبَ الْغُسْلُ[٢].

واتە: عەبدوڵڵای کوڕی عومەر ﵄ دەیگوت: ئەگەر شوێنی خەتەنەکردنی پیاو لە شوێنی خەتەنەکردنی ئافرەت تێپەڕی (واتە جووتبوون ڕووی دا) ئەوە خۆشۆردن واجب دەبێت.

---

(١) ـ موقوف حسن. أخرجه أبو مصعب الزهري: ١٢٨ في الوضوء؛ والشيباني: ٧٨ في الصلاة، عن مالك به.

(٢) ـ صحيح. أخرجه أبو مصعب الزهري: ١٢٩ في الوضوء، عن مالك به.

## ١٩- دەستنوێژشۆردنی کەسی جەنابەتدار
## کاتێ دەیەوێ بخەوێ یان نان بخوا بەر لەوەی خۆی بشۆرێ[١]

**١١٨-** عَنْ عَبْدِ اللهِ بْنِ عُمَرَ ﭭ، أَنَّهُ قَالَ: ذَكَرَ عُمَرُ بْنُ الْخَطَّابِ ﭬ لِرَسُولِ اللهِ ﷺ أَنَّهُ تُصِيبُهُ جَنَابَةٌ مِنَ اللَّيْلِ، فَقَالَ لَهُ رَسُولُ اللهِ ﷺ: تَوَضَّأْ، وَاغْسِلْ ذَكَرَكَ، ثُمَّ نَمْ[٢].

واتە: لە عەبدوڵڵای کوڕی عومەرەوە ﭭ گێڕدراوەتەوە گوتوویەتی: عومەری کوڕی خەتتاب ﭬ بۆ پێغەمبەری خوای ﷺ باس کرد بەوەی تووشی جەنابەت دەبێت بە شەو، پێغەمبەری خواش ﷺ پێی فەرموو: (ئەندامەکانی) دەستنوێژ بشۆرە و دامێنت بشۆرە دواتر بخەوە.

**١١٩-** عَنْ عَائِشَةَ ﭫ، زَوْجِ النَّبِيِّ ﷺ، أَنَّهَا كَانَتْ تَقُولُ: إِذَا أَصَابَ أَحَدُكُمُ الْمَرْأَةَ، ثُمَّ أَرَادَ أَنْ يَنَامَ قَبْلَ أَنْ يَغْتَسِلَ، فَلاَ يَنَمْ حَتَّى يَتَوَضَّأَ وُضُوءَهُ لِلصَّلاَةِ[٣].

واتە: لە عائیشەی ﭫ خێزانی پێغەمبەری خواوە ﷺ گێڕدراوەتەوە هەموو جار دەیگوت: ئەگەر یەکێك لە ئێوە لەگەڵ خێزانەکەی جووت بوو، دواتر ویستی بخەوێ بەر لەوەی خۆی بشۆرێ، ئەوە با نەخەوێ تا دەستنوێژ دەشۆرێ وەك دەستنوێژشۆردنی بۆ نوێژ.

**١٢٠-** عَنْ نَافِعٍ ﭬ، أَنَّ عَبْدَ اللهِ بْنَ عُمَرَ ﭭ كَانَ إِذَا أَرَادَ أَنْ يَنَامَ أَوْ يَطْعَمَ وَهُوَ جُنُبٌ غَسَلَ وَجْهَهُ وَيَدَيْهِ إِلَى الْمِرْفَقَيْنِ، وَمَسَحَ بِرَأْسِهِ، ثُمَّ طَعِمَ، أَوْ نَامَ[٤].

واتە: لە نافیعەوە ﭬ گێڕدراوەتەوە (گوتوویەتی): عەبدوڵڵای کوڕی عومەر ﭭ کاتێ بیویستایە بخەوێ یان نان بخوا لە کاتێکدا جەنابەتدار بووایە، ئەوە

---

(١) ـ وُضُوءُ الْجُنُبِ إِذَا أَرَادَ أَنْ يَنَامَ أَوْ يَطْعَمَ قَبْلَ أَنْ يَغْتَسِلَ.

(٢) ـ صحيح. أخرجه أبو مصعب الزهري: ١٣٠ في الوضوء؛ والحدثاني: ٥٣ في الطهارة؛ والشيباني: ٥٥ في الصلاة؛ وابن حنبل: ٥٣١٤؛ والبخاري: ٢٩٠ في الغسل؛ ومسلم: الحيض: ٢٥؛ والنسائي: ٢٦٠ في الطهارة؛ وأبو داود: ٢٢١ في الطهارة؛ وابن حبان: ١٢١٣؛ والقابسي، ٢٨٠، كلهم عن مالك به.

(٣) ـ صحيح. أخرجه أبو مصعب الزهري: ١٣١ في الوضوء؛ والحدثاني: ٥٣ أ في الطهارة، عن مالك به.

(٤) ـ صحيح. أخرجه أبو مصعب الزهري: ١٣٢ في الوضوء؛ والحدثاني: ٥٣ ب في الطهارة، عن مالك به.

ڕوخسار و دەستەكانی تا ئانیشكەكانی دەشۆرد و سەری مەسح دەكرد، دواتر نانی دەخوارد یان دەخەوت.

## ٢٠- دووبارەكردنەوەی نوێژ لەلایەن كەسی جەنابەتدار و خۆشۆردنی نوێژی كرد و لەیادی نەبوو جەنابەتدارە، هەروەها باسی شۆردنی جلەكەی[١]

**١٢١-** أَنَّ عَطَاءَ بْنَ يَسَارٍ ﷺ أَخْبَرَهُ، أَنَّ رَسُولَ اللهِ ﷺ كَبَّرَ فِي صَلاَةٍ مِنَ الصَّلَوَاتِ، ثُمَّ أَشَارَ إِلَيْهِمْ بِيَدِهِ أَنِ امْكُثُوا، فَذَهَبَ، ثُمَّ رَجَعَ وَعَلَى جِلْدِهِ أَثَرُ الْمَاءِ[٢].

واتە: عەتائی كوڕی یەسار ﷺ گێڕاویەتەوە (گوتوویەتی): پێغەمبەری خوا ﷺ (الله أكبر)ی كرد و یەكێك لە نوێژەكانی دەست پێكرد، دواتر ئاماژەی بۆ كردن بەوەی بمێننەوە، جا ڕۆیشت، دواتر گەڕایەوە لە كاتێكدا پێستی شوێنەواری ئاوی پێوە بوو (واتە چوو خۆی شۆرد لەبەر ئەوەی لە یادی چووبوو جەنابەتی لەسەرە)[٣].

**١٢٢-** عَنْ زُيَيْدِ بْنِ الصَّلْتِ ﷺ، أَنَّهُ قَالَ: خَرَجْتُ مَعَ عُمَرَ بْنِ الْخَطَّابِ ﷺ إِلَى الْجُرُفِ، فَنَظَرَ، فَإِذَا هُوَ قَدِ احْتَلَمَ، وَصَلَّى وَلَمْ يَغْتَسِلْ، فَقَالَ: وَاللَّهِ مَا أَرَانِي إِلاَّ قَدِ احْتَلَمْتُ وَمَا شَعَرْتُ، وَصَلَّيْتُ وَمَا اغْتَسَلْتُ، قَالَ: فَاغْتَسَلَ، وَغَسَلَ مَا رَأَى فِي ثَوْبِهِ، وَنَضَحَ مَا لَمْ يَرَ، وَأَذَّنَ أَوْ أَقَامَ، ثُمَّ صَلَّى بَعْدَ ارْتِفَاعِ الضُّحَى مُتَمَكِّنًا[٤].

---

(١) ـ إِعَادَةُ الْجُنُبِ الصَّلاَةَ، وَغُسْلِهِ إِذَا صَلىَّ وَلَمْ يَذْكُرْ، وَغَسْلِهِ ثَوْبَهُ.

(٢) ـ صحيح لغيره. أخرجه أبو مصعب الزهري: ١٣٣ في الوضوء؛ والحدثاني: ٥٤ في الطهارة؛ والشيباني: ١٧١ في الصلاة؛ والشافعي: ٢٤٢، كلهم عن مالك به.

(٣) ـ تێبینی یەكەم: هەندێك لە زانایان فەرموویانە: پێغەمبەری خوا ﷺ نوێژەكەی دەست پێ نەكرد، بەڵكوو ویستی دەست پێ بكات، وەك لە ڕیوایەتی دیكەدا هاتووە، جا بیری كەوتەوە جەنابەتی لەسەرە، بۆیە فەرمووی: ڕاوەستن، جا چوو خۆی شۆرد و گەڕایەوە، ئینجا نوێژەكەی دەست پێ كرد.
تێبینی دووەم: وە ئیمامی مالیك (رحمه الله) گوتوویەتی: ئەگەر دوای قامەت لە نوێژ دووركەوتەوە و دەستی پێ نەكرد بەبێ هۆیەكی شەرعی، ئەوە هەر دەبێ قامەتەكە دووبارە بكرێتەوە، بەڵام ئەگەر بۆ عوزرێكی شەرعی بوو ئەوە ئەگەر نێوانەكە زۆر نەبوو كێشە نییە دووبارەی ناكاتەوە، بەڵام ئەگەر نێوانەكە زۆر بوو قامەت دووبارە دەكرێتەوە.

(٤) ـ صحيح. أخرجه أبو مصعب الزهري: ١٣٤ في الوضوء؛ والحدثاني: ٥٤ أ في الطهارة؛ والشافعي: ٦٠، عن مالك به.




واتە: لە زویەیدی کوڕی صەلتەوە ﷺ گێردراوەتەوە گوتوویەتی: لەگەل عومەری کوڕی خەتتاب ﷺ دەرچووم بۆ جوڕوف (کە شوێنێکە سێ میل لە مەدینەوە دوورە)[١]، جا سەیری خۆی کرد بینی لە خەودا جەنابەتدار بووە (شوێنەواری مەنی دیار بوو، خەونەکەشی بیر چووبۆیەوە)، لە کاتێکدا نوێژی (بەیانی) کردبوو خۆشی نەشۆردبوو، جا گوتی: سوێند بە خوا پێم وایە بێگومان خەوی جەنابەتم بینیوە و نەمزانیوە، وە نوێژم کردووە و خۆم نەشۆردووە، (زویەید) ﷺ دەڵێ: جا خۆی شۆرد و ئەو مەنییەشی شۆرد کە بە جلەکەیەوە بینی و ئەو شوێنانەشی ئاوپڕژێن کرد کە هیچی پێوە نەبینی بوو (بەڵام گومانی هەبوو مەنی بەرکەوتبێت)، وە بانگی دا ـ یان قامەتی کرد ـ، دواتر نوێژی کرد دوای بەرزبوونەوەی ڕۆژ بەتەواوی لە کاتی چێشتەنگاودا.

**١٢٣- عَنْ سُلَيْمَانَ بْنِ يَسَارٍ ﷺ، أَنَّ عُمَرَ بْنَ الْخَطَّابِ ﷺ غَدَا إِلَى أَرْضِهِ بِالْجُرُفِ، فَرَأَى فِي ثَوْبِهِ احْتِلاَمًا، فَقَالَ: لَقَدِ ابْتُلِيتُ بِالاِحْتِلاَمِ مُنْذُ وُلِّيتُ أَمْرَ النَّاسِ، فَاغْتَسَلَ، وَغَسَلَ مَا رَأَى فِي ثَوْبِهِ مِنَ الاِحْتِلاَمِ، ثُمَّ صَلَّى بَعْدَ أَنْ طَلَعَتِ الشَّمْسُ[٢].**

واتە: لە سولەیمانی کوڕی یەسارەوە ﷺ گێردراوەتەوە (گوتوویەتی): عومەری کوڕی خەتتاب ﷺ بەیانییەکی زوو چوو بۆ زەوییەکەی خۆی لە جوڕوف (کە شوێنێکە ئەو کات پێنج کیلۆمەتر لە مەدینەوە دوور بووە)[٣]، جا (شوێنەواری) جەنابەتداری بەخۆیەوە بینی کە بەهۆی خەونەوە تووش ببوو، جا گوتی: لەوەتەی کاروباری مسوڵمانانم دراوەتە دەست گیرۆدەی تاقیکردنەوە بووم بە خەوی جەنابەتداری، جا خۆی شۆرد و شوێنی ئەو مەنییەشی شۆرد کە بە جلەکەیەوە بینی، دواتر نوێژی بەیانی کرد دوای ئەوەی خۆر هەڵاتبوو (واتە نوێژەکەی قەزا کردەوە، چونکە پێشتر بە لەشی جەنابەتدارەوە ئەنجامی دابوو و نەیزانیبوو).

---

(١) ـ تێبینی: سێ میل دەکاتە نزیکەی پێنج کیلۆمەتر.

(٢) ـ ضعيف. أخرجه أبو مصعب الزهري: ١٣٥ في الوضوء؛ والحدثاني: ٥٥ في الطهارة؛ والشيباني: ٢٨٤ في الصلاة، عن مالك به.

(٣) ـ تێبینی: سێ میل دەکاتە نزیکەی پێنج کیلۆمەتر.

**١٢٤- عَنْ سُلَيْمَانَ بْنِ يَسَارٍ ﷺ، أَنَّ عُمَرَ بْنَ الْخَطَّابِ ﷺ صَلَّى بِالنَّاسِ الصُّبْحَ، ثُمَّ غَدَا إِلَى أَرْضِهِ بِالْجُرُفِ، فَوَجَدَ فِي ثَوْبِهِ احْتِلَامًا، فَقَالَ: إِنَّا لَمَّا أَصَبْنَا الْوَدَكَ لَانَتِ الْعُرُوقُ، فَاغْتَسَلَ، وَغَسَلَ الاِحْتِلَامَ مِنْ ثَوْبِهِ، وَعَادَ لِصَلَاتِهِ[1].**

واتە: لە سولەیمانی کوڕی یەسارەوە ﷺ گێردراوەتەوە (گوتوویەتی): عومەری کوڕی خەتتاب ﷺ نوێژی بەیانی بۆ خەڵکی کرد، دواتر بەیانی زوو چوو بۆ زەوییەکەی لە جوڕوف (کە شوێنێکە ئەو کات پێنج کیلۆمەتر لە مەدینەوە دوور بووە) جا شوێنەواری جەنابەتداری بە جلەکەیەوە بینی کە بەهۆی خەونەوە تووشی ببوو، جا گوتی: ئێمە کاتێ گۆشتی چەور دەخۆین دەمارەکان نەرم دەبن (بەئاسانی ڕژێنەکان دەردەدەن)، جا خۆی شۆرد و مەنییەکەشی لە جلەکەی شۆرد، دواتر بۆ نوێژەکەی گەڕایەوە (واتە نوێژەکەی گێڕایەوە و قەزای کردەوە)[2].

**١٢٥- عَنْ يَحْيَى بْنِ عَبْدِ الرَّحْمَنِ بْنِ حَاطِبٍ ﷺ، أَنَّهُ اعْتَمَرَ مَعَ عُمَرَ بْنِ الْخَطَّابِ ﷺ فِي رَكْبٍ فِيهِمْ عَمْرُو بْنُ الْعَاصِ ﷺ، وَأَنَّ عُمَرَ بْنَ الْخَطَّابِ ﷺ عَرَّسَ بِبَعْضِ الطَّرِيقِ قَرِيبًا مِنْ بَعْضِ الْمِيَاهِ، فَاحْتَلَمَ عُمَرُ ﷺ وَقَدْ كَادَ أَنْ يُصْبِحَ، فَلَمْ يَجِدْ مَعَ الرَّكْبِ مَاءً، فَرَكِبَ، حَتَّى جَاءَ الْمَاءَ، فَجَعَلَ يَغْسِلُ مَا رَأَى مِنْ ذَلِكَ الاِحْتِلَامِ، حَتَّى أَسْفَرَ، فَقَالَ لَهُ عَمْرُو بْنُ الْعَاصِ ﷺ: أَصْبَحْتَ وَمَعَنَا ثِيَابٌ، فَدَعْ ثَوْبَكَ يُغْسَلُ، فَقَالَ عُمَرُ بْنُ الْخَطَّابِ ﷺ: وَاعَجَبًا لَكَ يَا ابْنَ الْعَاصِ، لَئِنْ كُنْتَ تَجِدُ ثِيَابًا أَفَكُلُّ النَّاسِ يَجِدُ ثِيَابًا؟ وَاللَّهِ لَوْ فَعَلْتُهَا لَكَانَتْ سُنَّةً، بَلْ أَغْسِلُ مَا رَأَيْتُ، وَأَنْضِحُ مَا لَمْ أَرَ[3].**

واتە: لە یەحیای کوڕی عەبدوڕڕەحمانی کوڕی حاتیبەوە ﷺ گێردراوەتەوە کە عەمرەی لەگەڵ ئیمامی عومەردا ﷺ کردووە، هەردووکیان لەناو کۆمەڵێك بوون عەمری کوڕی عاصیشیان ﷺ تیا بوو، جا ئیمامی عومەر ﷺ (لە سەفەرەکەدا) لە

---

(١) ـ ضعيف. أخرجه أبو مصعب الزهري: ١٣٦ في الوضوء، عن مالك به.

(٢) ـ تێبینی: لێرەدا ئیمامی عومەر ﷺ کە ئیمام بووە تەنها خۆی نوێژەکەی گێڕاوەتەوە، خەڵکەکە نوێژەکەیان نەگێڕاوەتەوە و فەرمانیان پێ نەکراوە، چونکە خەڵکەکە نەیانزانیوە جەنابەتدارە، بەڵام ئەگەر بزانن دەبێ دووبارەی بکەنەوە، وەك ئیمامی مالیك و شافیعی گوتوویانە.

(٣) ـ صحيح. أخرجه أبو مصعب الزهري: ١٣٧ في الوضوء، عن مالك به.

کۆتایی شەو لە یەکێك لە ڕێگەکان لە نزیك ئاوێك دابەزی بۆ پشوودان و خەوتن، جا لە خەودا جەنابەتی کەوتە سەر لە کاتێکدا خەریك بوو نوێژی بەیانی ببێ، جا لەناو کاروانەکە ئاوی دەست نەکەوت و سواری وڵاغەکەی بوو تا چوو بۆ لای ئاوەکە، جا هەر خەریك بوو ئەو شوێنانەی لە جلەکەی دەشۆرد کە شوێنەواری لەشگرانی پێوە دیار بوو، تا ڕووناك داهات، جا عەمری کوڕی عاص ﷺ پێی گوت: ئەوە بەیانیت داهێنا جلمان لەلایە واز لە جلەکەت بێنە با بۆت بشۆردرێ، ئیمامی عومەری کوڕی خەتتابیش ﷺ گوتی: عەجایب لە تۆ ئەی کوڕی عاص ﷺ، ئەگەر تۆ جلت دەست بکەوێت مەگەر هەموو خەڵکی جلیان دەست دەکەوێت؟ (واتە من دەمەوێ خەڵك بزانێ کاتێ جلت لەلا نییە چی دەکەی)، سوێند بە خوا ئەگەر جلەکەم بگۆڕم ئەوە ڕێگایەکی چاکە (بەڵام هەموو کەسێك ئەوەی نییە)، بەڵکوو ئەوە دەشۆم کە بەرچاوم کەوت و ئەوەش ئاوڕشێن دەکەم کە بەرچاوم نەکەوت (لەو شوێنانەی گومانم هەیە مەنی و مەزی بەرکەوتبێت).

١٢٦- **[فتوى]** قَالَ مَالِكٌ ﷺ فِي رَجُلٍ وَجَدَ فِي ثَوْبِهِ أَثَرَ احْتِلاَمٍ وَلاَ يَدْرِي مَتَى كَانَ؟ وَلاَ يَذْكُرُ شَيْئًا رَأَى فِي مَنَامِهِ، قَالَ: لِيَغْتَسِلْ مِنْ أَحْدَثِ نَوْمٍ نَامَهُ، فَإِنْ كَانَ صَلَّى بَعْدَ ذَلِكَ النَّوْمِ، فَلْيُعِدْ مَا كَانَ صَلَّى بَعْدَ ذَلِكَ النَّوْمِ، مِنْ أَجْلِ أَنَّ الرَّجُلَ رُبَّمَا احْتَلَمَ، وَلاَ يَرَى شَيْئًا، وَيَرَى وَلاَ يَحْتَلِمُ، فَإِذَا وَجَدَ فِي ثَوْبِهِ مَاءً، فَعَلَيْهِ الْغُسْلُ، وَذَلِكَ أَنَّ عُمَرَ ﷺ أَعَادَ مَا كَانَ صَلَّى، لآخِرِ نَوْمٍ نَامَهُ، وَلَمْ يُعِدْ مَا كَانَ قَبْلَهُ[1].

(فەتوا): ئیمامی مالیك ﷺ دەربارەی ئەو پیاوەی شوێنەواری جەنابەت بە جلەکەیەوە دەبینێ و نازانێ هی کەیە (کەی خەوەکەی بینیوە)؟ وە هیچ شتێکی لەیاد نییە کە بینیویەتی لە خەوەکەی، گوتوویەتی: با خۆی بشۆرێ بەهۆی نزیکترین خەوتنی، جا ئەگەر نوێژی کردبوو دوای ئەو خەوە ئەوە با ئەو نوێژە بگێڕێتەوە کە دوای ئەو خەوە ئەنجامی داوە، لەبەر ئەوەی جاری وا هەیە مرۆڤ جەنابەتدار دەبێت لە خەوداو (خەویش) نابینێ (یان بیری نامێنێ)، وە (جاریواش هەیە خەون) دەبینێ و جەنابەتدار نابێ، جا ئەگەر مەنی بە جلەکەیەوە بینی، ئەوە

---

(١) ـ أخرجه أبو مصعب الزهري: ١٣٨ في الوضوء، عن مالك به.





خۆشۆردنی لەسەر واجبە، لەبەر ئەوەشە ئیمامی عومەر ﷺ ئەو نوێژەی گێڕاوەتەوە کە ئەنجامی داوە دوای کۆتا خەوی کە خەوتووە و ئەو نوێژەی نەگێڕاوەتەوە کە بەر لە کۆتا خەو ئەنجامی داوە (واتە جەنابەتەکەی بۆ کۆتا خەو گێڕاوەتەوە ئەگەر بیری نەمابێ لە کام خەو تووشی بووە).

## ٢١- خۆشۆردنی ئافرەت کاتێ لە خەو ئەو شتە دەبینێ کە پیاو دەیبینێ (واتە کاتێ بەهۆی خەونەوە وەك پیاو جەنابەتی دەکەوێتە سەر)[١]

**١٢٧-** عَنْ عُرْوَةَ بْنِ الزُّبَيْرِ ﷺ، أَنَّ أُمَّ سُلَيْمٍ ﷺ قَالَتْ لِرَسُولِ اللهِ ﷺ: الْمَرْأَةُ تَرَى فِي الْمَنَامِ مِثْلَ مَا يَرَى الرَّجُلُ، أَتَغْتَسِلُ؟ فَقَالَ لَهَا رَسُولُ اللهِ ﷺ: نَعَمْ، فَلْتَغْتَسِلْ. فَقَالَتْ لَهَا عَائِشَةُ ﷺ: أُفٍّ لَكِ، وَهَلْ تَرَى ذَلِكَ الْمَرْأَةُ؟ فَقَالَ لَهَا رَسُولُ اللهِ ﷺ: تَرِبَتْ يَمِينُكِ، وَمِنْ أَيْنَ يَكُونُ الشَّبَهُ؟[٢].

واتە: لە عورِوەی کوڕی زوبەیرەوە ﷺ گێڕدراوەتەوە (گوتوویەتی): ئوممو سولەیم ﷺ بە پێغەمبەری خوای ﷺ گوت: ئافرەتیش ئەوە لە خەودا دەبینێ کە پیاو دەیبینێ (واتە کاتێ لە خەو لەشگران دەبێ)، ئایا خۆی بشۆرێ؟ پێغەمبەری خواش ﷺ فەرمووی: بەڵێ، با خۆی بشۆرێ، جا عائیشە ﷺ بە ئوم سولەیمی ﷺ گوت: ئۆف لە تۆ، بۆ مەگەر ئافرەت شتی وا دەبینێ؟! پێغەمبەری خواش ﷺ بە عائیشەی ﷺ فەرموو: مارکاول، ئەدی وێکچوون لەچی ڕوودەدات (واتە ئەگەر ئافرەتیش مەنی و تۆوی نەبێت چۆن مناڵ لەو دەچێت؟).

**١٢٨-** عَنْ أُمِّ سَلَمَةَ ﷺ، زَوْجِ النَّبِيِّ ﷺ، أَنَّهَا قَالَتْ: جَاءَتْ أُمُّ سُلَيْمٍ، امْرَأَةُ أَبِي طَلْحَةَ الأَنْصَارِيِّ ﷺ، إِلَى رَسُولِ اللهِ ﷺ، فَقَالَتْ: يَا رَسُولَ اللهِ، إِنَّ اللهَ لاَ يَسْتَحْيِي مِنَ الْحَقِّ، هَلْ عَلَى الْمَرْأَةِ مِنْ غُسْلٍ إِذَا هِيَ احْتَلَمَتْ؟ فَقَالَ: نَعَمْ، إِذَا رَأَتِ الْمَاءَ[٣].

---

(١) ـ غُسْلُ الْمَرْأَةِ إِذَا رَأَتْ فِي الْمَنَامِ مِثْلَ مَا يَرَى الرَّجُلُ.

(٢) ـ صحيح لغيره. أخرجه أبو مصعب الزهري: ١٣٩ في الوضوء؛ والحدثاني: ٥٦ في الطهارة؛ والشيباني: ٨١ في الصلاة، عن مالك به.

(٣) ـ صحيح. أخرجه أبو مصعب الزهري: ١٤٠ في الوضوء؛ والشافعي: ٥٩؛ والبخاري: ٢٨٢ في الغسل، وفي: ٦١٢١ في الأدب؛ وابن حبان: ١١٦٥، وفي: ١١٦٧؛ والقابسي: ٤٧٧، كلهم عن مالك به.

واتە: لە ئوممو سەلەمەی ﵂ خێزانی پێغەمبەرەوە ﷺ گێڕدراوەتەوە گوتوویەتی: ئوم سولەیمی خێزانی ئەبو تەڵحەی ئەنصاری ﵂ هات بۆ لای پێغەمبەری خوا ﷺ و گوتی: ئەی پێغەمبەری خوا ﷺ خوای پەروەردگار شەرم لە حەق ناکا (بۆیە ئەو پرسیارە دەکەم)، ئایا ئافرەت خۆشۆردنی لەسەر واجبە کاتێ لە خەو جەنابەتدار دەبێت؟ پێغەمبەری خواش ﷺ فەرمووی: بەڵێ، ئەگەر مەنی و تۆوی بینی.

## ٢٢- بابەتی جۆراوجۆر دەربارەی خۆشۆردنی جەنابەت[١]

**١٢٩- عَنْ نَافِعٍ ﵀، أَنَّ عَبْدَ اللهِ بْنَ عُمَرَ ﵄ كَانَ يَقُولُ: لاَ بَأْسَ أَنْ يُغْتَسَلَ بِفَضْلِ الْمَرْأَةِ مَا لَمْ تَكُنْ حَائِضًا أَوْ جُنُبًا[٢].**

واتە: لە نافیعەوە ﵀ گێڕدراوەتەوە (گوتوویەتی): ئیبنو عومەر ﵁ دەیگوت: هیچ کێشەیەك نییە خۆشۆردن ئەنجام بدرێت بە پاشماوەی ئاوی ئافرەت مادەم حەیزدار یان جەنابەتدار نەبێت.

**١٣٠- عَنْ نَافِعٍ ﵀، أَنَّ عَبْدَ اللهِ بْنَ عُمَرَ ﵄ كَانَ يَعْرَقُ فِي الثَّوْبِ وَهُوَ جُنُبٌ ثُمَّ يُصَلِّي فِيهِ[٣].**

واتە: لە نافیعەوە ﵀ گێڕدراوەتەوە (گوتوویەتی): عەبدوڵڵای کوڕی عومەر ﵄ ئارەقەی بە جلێکەوە دەکرد لە کاتێکدا جەنابەتی لەسەر بوو، دواتریش (دوای خۆشۆردن) نوێژی پێوە دەکرد (واتە ئارەقەی کەسی جەنابەتدار پیس نییە).

**١٣١- أَنَّ عَبْدَ اللهِ بْنَ عُمَرَ ﵄ كَانَ يَغْسِلُ جَوَارِيهِ رِجْلَيْهِ، وَيُعْطِينَهُ الْخُمْرَةَ وَهُنَّ حُيَّضٌ[٤].**

---

(١) ـ جَامِعُ غُسْلِ الْجَنَابَةِ.

(٢) ـ صحيح. أخرجه أبو مصعب الزهري: ١٤٢ في الوضوء؛ والحدثاني: ٥٧ أ في الطهارة؛ والشيباني: ٨٩ في الصلاة، كلهم عن مالك به.

(٣) ـ صحيح. أخرجه أبو مصعب الزهري: ١٤١ في الوضوء؛ والحدثاني: ٥٧ في الطهارة؛ والشيباني: ٢٨٢ في الصلاة؛ والدارمي: ١٠٣٠ في الطهارة؛ ومصنف ابن أبي شيبة: ٢٠١٠ في الطهارات، كلهم عن مالك به.

(٤) ـ صحيح. أخرجه أبو مصعب الزهري: ١٧٠ في الوضوء؛ والحدثاني: ٦٦أفي الطهارة؛ والشيباني: ٨٧ في الصلاة؛ والدارمي: ١٠٦٠ في الطهارة، كلهم عن مالك به.

واتە: عەبدوڵڵای کوڕی عومەر ﷺ زۆر جار کچۆڵەکان قاچەکانیان دەشۆرد و بەرماڵیان پێ دەدا لە کاتێکدا لە حەیزدا بوون.

**١٣٢- [فتوى]** وَسُئِلَ مَالِكٌ ﷺ عَنْ رَجُلٍ لَهُ نِسْوَةٌ وَجَوَارِي، هَلْ يَطَؤُهُنَّ جَمِيعًا قَبْلَ أَنْ يَغْتَسِلَ؟ فَقَالَ: لاَ بَأْسَ بِأَنْ يُصِيبَ الرَّجُلُ جَارِيَتَيْهِ قَبْلَ أَنْ يَغْتَسِلَ، فَأَمَّا النِّسَاءُ الْحَرَائِرُ، فَيُكْرَهُ أَنْ يُصِيبَ الرَّجُلُ الْمَرْأَةَ الْحُرَّةَ فِي يَوْمِ الأُخْرَى، فَأَمَّا أَنْ يُصِيبَ الرَّجُلُ الْجَارِيَةَ، ثُمَّ يُصِيبَ الأُخْرَى وَهُوَ جُنُبٌ فَلاَ بَأْسَ بِذَلِكَ[1].

(فەتوا): ئیمامی مالیك ﷺ پرسیاری لێ کرا دەربارەی پیاوێك کە چەند خێزان و جارییەیەکی هەیە، ئایا جیماع لەگەڵ گشتیان بکات پێش ئەوەی خۆی بشۆرێ (ئایا دروستە)؟ گوتی: هیچ کێشە نییە پیاو جیماع لەگەڵ دوو جارییەیدا بکات پێش ئەوەی خۆی بشۆرێ، بەڵام هەرچی ئافرەتی ئازادە مەکڕوهە پیاو جیماع لەگەڵ خێزانێکی ئازاددا بکات دواتر لەگەڵ یەکێکی دیکەش بیکات لە هەمان ڕۆژدا (چونکە نۆبەتیان تێك دەچێت و دادپەروەری نایێتە جێ)، بەڵام کێشەی تیا نییە پیاو جیماع لەگەڵ جارییەیەکیدا بکات و دواتر لەگەڵ جارییەکی دیکە بکات لە کاتێکدا کە جەنابەتدارە.

**١٣٣- [فتوى]** وَسُئِلَ مَالِكٌ ﷺ عَنْ رَجُلٍ جُنُبٍ، وُضِعَ لَهُ مَاءٌ يَغْتَسِلُ بِهِ، فَسَهَا، فَأَدْخَلَ أُصْبُعَهُ فِيهِ، لِيَعْرِفَ حَرَّ الْمَاءِ مِنْ بَرْدِهِ، قَالَ مَالِكٌ ﷺ: إِنْ لَمْ يَكُنْ أَصَابَ أُصْبُعَهُ أَذًى، فَلاَ أَرَى ذَلِكَ يُنَجِّسُ عَلَيْهِ الْمَاءَ[2].

(فەتوا): ئیمامی مالیك ﷺ پرسیاری لێ کرا دەربارەی پیاوێکی جەنابەتدار کە ئاوی بۆ دادەنرێت تا خۆی پێ بشۆرێ، جا هەڵە دەکات (بیری دەچێتەوە کە جەنابەتی لەسەرە) پەنجەی دەخاتە ناو ئاوەکە تا گەرمی و ساردی ئاوەکە بزانێ، ئیمامی مالیك ﷺ گوتی: ئەگەر پیسی بەر پەنجەکەی نەکەوتبێ پێم وا نییە ئاوەکەی لێ پیس بکات.

---

(١) ـ أخرجه أبو مصعب الزهري: ١٤٣ في الوضوء، عن مالك به.

(٢) ـ أخرجه أبو مصعب الزهري: ١٤٤ في الوضوء، عن مالك به.




## ٢٣- تەیموم[1]

**١٣٤- عَنْ عَائِشَةَ أُمِّ الْمُؤْمِنِينَ ﵂، أَنَّهَا قَالَتْ: خَرَجْنَا مَعَ رَسُولِ اللهِ ﷺ فِي بَعْضِ أَسْفَارِهِ، حَتَّى إِذَا كُنَّا بِالْبَيْدَاءِ، أَوْ بِذَاتِ الْجَيْشِ، انْقَطَعَ عِقْدٌ لِي، فَأَقَامَ رَسُولُ اللهِ ﷺ عَلَى الْتِمَاسِهِ، وَأَقَامَ النَّاسُ مَعَهُ، وَلَيْسُوا عَلَى مَاءٍ، وَلَيْسَ مَعَهُمْ مَاءٌ، فَأَتَى النَّاسُ إِلَى أَبِي بَكْرٍ الصِّدِّيقِ ﵁ فَقَالُوا: أَلاَ تَرَى مَا صَنَعَتْ عَائِشَةُ؟ أَقَامَتْ بِرَسُولِ اللهِ ﷺ، وَبِالنَّاسِ، وَلَيْسُوا عَلَى مَاءٍ وَلَيْسَ مَعَهُمْ مَاءٌ، قَالَتْ عَائِشَةُ ﵂: فَجَاءَ أَبُو بَكْرٍ ﵁، وَرَسُولُ اللهِ ﷺ وَاضِعٌ رَأْسَهُ عَلَى فَخِذِي، قَدْ نَامَ، فَقَالَ: حَبَسْتِ رَسُولَ اللهِ ﷺ وَالنَّاسَ، وَلَيْسُوا عَلَى مَاءٍ، وَلَيْسَ مَعَهُمْ مَاءٌ، قَالَتْ عَائِشَةُ ﵂: فَعَاتَبَنِي أَبُو بَكْرٍ، فَقَالَ مَا شَاءَ اللهُ أَنْ يَقُولَ، وَجَعَلَ يَطْعُنُ بِيَدِهِ فِي خَاصِرَتِي، فَلاَ يَمْنَعُنِي مِنَ التَّحَرُّكِ، إِلاَّ مَكَانُ رَأْسِ رَسُولِ اللهِ ﷺ عَلَى فَخِذِي، فَنَامَ رَسُولُ اللهِ ﷺ حَتَّى أَصْبَحَ عَلَى غَيْرِ مَاءٍ، فَأَنْزَلَ اللهُ ﷻ آيَةَ التَّيَمُّمِ، فَقَالَ أُسَيْدُ بْنُ حُضَيْرٍ: مَا هِيَ بِأَوَّلِ بَرَكَتِكُمْ يَا آلَ أَبِي بَكْرٍ، قَالَتْ: فَبَعَثْنَا الْبَعِيرَ الَّذِي كُنْتُ عَلَيْهِ، فَوَجَدْنَا الْعِقْدَ تَحْتَهُ[2].**

واتە: لە عائیشەی دایكی بڕوادارانەوە ﵂ گێڕدراوەتەوە گوتوویەتی: لەگەڵ پێغەمبەری خوا ﷺ دەرچووین لە یەكێك لە سەفەرەكان تا گەیشتین بە بەیداء (كە شوێنێكە لە پێشەوەی ذول حولەیفە لەسەر ڕێگەی مەككە) یان ذات الجیش (كە شوێنێكە نزیكەی بیست كیلۆمەتر و نیو لە مەدینەوە دوورە)، ملوانكەكەم پچڕا (ون بوو)، پێغەمبەری خواش ﷺ هەڵسا بە بەدواگەڕانی، خەڵكیش لەگەڵی هەڵسان بە بەدواگەڕانی، لە كاتێكدا ئەو شوێنە ئاوی لێ نەبوو، ئاویشیان پێ نەبوو، جا خەڵك هاتن بۆ لای ئەبو بەكری صدیق ﵁ و گوتیان: نابینی عائیشە ﵂ چی كرد، پێغەمبەری خوا ﷺ و خەڵكی هەڵساند لە كاتێكدا نە لەلای ئاون و نە ئاویان پێیە، عائیشە ﵂ دەڵێ: جا ئەبەبەكر ﵁ هات لە كاتێكدا پێغەمبەری خوا ﷺ سەری لەسەر ڕانی من دانابوو و خەوتبوو، گوتی: پێغەمبەری خوا ﷺ و

---

(١) ـ التَّيَمُّمِ.

(٢) ـ صحيح. أخرجه أبو مصعب الزهري: ١٤٧ في الوضوء؛ والحدثاني: ٥٩ في الطهارة؛ والشيباني: ٧٢ في الصلاة؛ والشافعي: ٧٧٦؛ وابن حنبل: ٢٥٤٩٤؛ والبخاري: ٣٣٤ في التيمم، وفي: ٣٦٧٢ في فضائل الصحابة، وفي: ٤٦٠٧ في التفسير، وفي: ٥٢٥٠ في النكاح، وفي: ٦٨٤٤ في المحاربين؛ ومسلم: الحيض: ١٠٨؛ والنسائي: ٣١٠ في الطهارة؛ وابن حبان: ١٣٠٠، وفي: ١٣١٧؛ والقابسي: ٣٨٤، كلهم عن مالك به.




خەڵکت هێشتۆتەوە لە کاتێکدا نە لەلای ئاون و نە ئاویان پێیە، عائیشە ﵂ دەڵێ: جا ئەبو بەکر ﵁ سەرزەنشتی کردم و ئەوەی خوا ویستی لەسەر بوو گوتی و هەر بە دەستیشی لە کەلاکە و نێرکەکانی دەدام، جا هیچ نەبووە ڕێگر لەوەی بجولێم تەنها لەبەر سەری پێغەمبەری خوا ﷺ نەبێ کە لەسەر ڕانم بوو (لەبەر خاتری ئەو نەجولام)، جا پێغەمبەری خوا ﷺ هەر خەوت تا کەوتە ناو کاتی نوێژی بەیانی، ئاویش نییە، جا خوای پەروەردگار ﷻ ئایەتی تەیمومی دابەزاند، جا ئوسەیدی کوڕی حوضەیر ﵁ گوتی: ئەوە یەکەم بەرەکەتتان نییە ئەی خانەوادەی ئەبو بەکر (واتە هەموو کاروبارێکتان دەبێتە خێر و بەرەکەت و ڕوونکردنەوەی شەریعەت)، عائیشە ﵂ دەڵێ: جا ئەو وشترەمان هەڵساند کە من لەسەری بووم، ملوانکەکەمان لەژێرەوەی دۆزییەوە.

١٣٥- **[فتوى]** وَسُئِلَ مَالِكٌ ﵀ عَنْ رَجُلٍ تَيَمَّمَ لِصَلاَةٍ حَضَرَتْ، ثُمَّ حَضَرَتْ صَلاَةٌ أُخْرَى، أَيَتَيَمَّمُ لَهَا أَمْ يَكْفِيهِ تَيَمُّمُهُ ذَلِكَ؟ فَقَالَ: بَلْ يَتَيَمَّمُ لِكُلِّ صَلاَةٍ، لأَنَّ عَلَيْهِ أَنْ يَبْتَغِيَ الْمَاءَ لِكُلِّ صَلاَةٍ، فَمَنِ ابْتَغَى الْمَاءَ فَلَمْ يَجِدْهُ، فَإِنَّهُ يَتَيَمَّمُ[1].

(فەتوا): ئیمامی مالیك ﵀ پرسیاری لێکرا دەربارەی کەسێك تەیموم بکات بۆ نوێژێك کە کاتەکەی هاتووە، دواتر کاتی نوێژێکی دیکە دێ، ئایا (بۆ نوێژی دووەم) تەیموم دەکات یان تەیمومەکەی نوێژی پێشووی بەسە؟ ئەویش گوتی: بەڵکوو تەیموم دەکات بۆ گشت نوێژێك، چونکە دەبێ بۆ گشت نوێژێك بەدوای ئاودا بگەڕێ، جا هەر کەسێك بەدوای ئاودا گەڕا و دەستی نەکەوت، ئەوە تەیموم دەکات.

١٣٦- **[فتوى]** وَسُئِلَ مَالِكٌ ﵀ عنْ رَجُلٍ تَيَمَّمَ أَيَؤُمُّ أَصْحَابَهُ وَهُمْ عَلَى وُضُوءٍ؟ قَالَ: يَؤُمُّهُمْ غَيْرُهُ أَحَبُّ إِلَيَّ، وَلَوْ أَمَّهُمْ هُوَ لَمْ أَرَ بِذَلِكَ بَأْسًا[2].

(فەتوا): ئیمامی مالیك ﵀ پرسیاری لێکرا دەربارەی پیاوێك کە تەیموم دەکات، ئایا پێشنوێژی بۆ هاوەڵەکانی دەکات لە کاتێکدا ئەوان دەستنوێژیان شۆردووە

---

(١) ـ أخرجه أبو مصعب الزهري: ١٤٨ في الوضوء، عن مالك به.

(٢) ـ أخرجه أبو مصعب الزهري: ١٤٩ في الوضوء، عن مالك به.

(واتە ئایا دروستە کەسی خاوەن تەیموم پێشنوێژی بۆ کەسی خاوەن دەستنوێژ بکات)؟ گوتی: کەسی جگە لەو پێشنوێژی بکات پێم چاکترە، وە ئەگەر ئەو پێشنوێژی بۆ کردن پێم وایە هیچ کێشەیەکی تیا نییە (بەڵام دەستنوێژ لە تەیموم بەهێزترە، خاوەنی دەستنوێژ پێشنوێژی لە خاوەنی تەیموم چاکترە).

١٣٧- **[فتوى]** قَالَ مَالِكٌ ﷺ: فِي رَجُلٍ تَيَمَّمَ حِينَ لَمْ يَجِدْ الْمَاءَ، فَقَامَ وَكَبَّرَ، وَدَخَلَ فِي الصَّلاَةِ، فَطَلَعَ عَلَيْهِ إِنْسَانٌ مَعَهُ مَاءٌ؟ قَالَ: لاَ يَقْطَعُ صَلاَتَهُ، بَلْ يُتِمُّهَا بِالتَّيَمُّمِ، وَلْيَتَوَضَّأْ لِمَا يُسْتَقْبَلُ مِنَ الصَّلَوَاتِ[1].

(فەتوا): ئیمامی مالیك ﷺ دەربارەی پیاوێك کە تەیموم دەکات کاتێ ئاوی دەست ناکەوێت و هەڵدەستێت و الله أكبر دەکات (نوێژ دەست پێ دەکات)، جا (لەناو نوێژەکەدا) کەسێکی لێ دەردەکەوێت کە ئاوی پێیە (ئایا نوێژەکەی دەبڕێت بۆ دەستنوێژ شۆردن)؟ گوتی: نوێژەکەی نابڕێ، بەڵکوو بە تەیمومەوە تەواوی دەکات، وە با دەستنوێژ بشۆرێت بۆ ئەو نوێژانەی لەمەودوا دێن.

١٣٨- **[فتوى]** قَالَ مَالِكٌ ﷺ: مَنْ قَامَ إِلَى الصَّلاَةِ فَلَمْ يَجِدْ مَاءً، فَعَمِلَ بِمَا أَمَرَهُ اللهُ بِهِ مِنَ التَّيَمُّمِ، فَقَدْ أَطَاعَ اللهَ، وَلَيْسَ الَّذِي وَجَدَ الْمَاءَ بِأَطْهَرَ مِنْهُ، وَلاَ أَتَمَّ صَلاَةً، لأَنَّهُمَا أُمِرَا جَمِيعًا، فَكُلٌّ عَمِلَ بِمَا أَمَرَهُ اللهُ بِهِ، وَإِنَّمَا الْعَمَلُ بِمَا أَمَرَ اللهُ بِهِ مِنَ الْوُضُوءِ لِمَنْ وَجَدَ الْمَاءَ، وَالتَّيَمُّمِ لِمَنْ لَمْ يَجِدِ الْمَاءَ، قَبْلَ أَنْ يَدْخُلَ فِي الصَّلاَةِ[2].

(فەتوا): ئیمامی مالیك ﷺ گوتوویەتی: هەر کەسێك هەڵسێت بۆ نوێژکردن و ئاوی دەست نەکەوێ، جا ئەوە بکات کە خوای پەروەردگار فەرمانی پێ کردووە لە تەیموم، ئەوە گوێڕایەڵی خوای کردووە، جا ئەو کەسەی ئاوی دەست دەکەوێت لەو کەسە پاك و بە دەستنوێژتر و نوێژ کاملتر نییە کە تەیموم دەکات، (چونکە) گشتیان کاریان کردووە بەوەی خوای پەروەردگار فەرمانی پێ کردووە، جا دەستنوێژ کە خوای پەروەردگار فەرمانی پێکردووە بۆ کەسێکە کە ئاوی دەست

---

(١) ـ أخرجه أبو مصعب الزهري: ١٥٠ في الوضوء، عن مالك به.

(٢) ـ أخرجه أبو مصعب الزهري: ١٥١ في الوضوء، عن مالك به.




دەكەوێ، تەیمومیش بۆ ئەو كەسەیە كە ئاوی دەستناكەوێ پێش ئەوەی بچێتە ناو نوێژ (كەواتە هەردوولا فەرمانی پەروەردگارن هیچیان لەویدی گەورەتر نییە لە ڕووی نوێژ قبوڵبوون و دروستییەوە).

**١٣٩-** وقَالَ مَالِكٌ ﷺ فِي الرَّجُلِ الْجُنُبِ: إِنَّهُ يَتَيَمَّمُ وَيَقْرَأُ حِزْبَهُ مِنَ الْقُرْآنِ، وَيَتَنَفَّلُ، مَا لَمْ يَجِدْ مَاءً، وَإِنَّمَا ذَلِكَ فِي الْمَكَانِ الَّذِي يَجُوزُ لَهُ أَنْ يُصَلِّيَ فِيهِ بِالتَّيَمُّمِ[1].

واتە: ئیمامی مالیك ﷺ دەربارەی كەسی جەنابەتدار گوتوویەتی: تەیموم دەكات و (ئەگەر ویردی قورئانخوێندنی ڕۆژانەی هەبێت) ئەندازەی ڕۆژانەی خۆی قورئان دەخوێنێت و نوێژی سوننەتی پێ ئەنجام دەدات، مادەم ئاوی دەست نەكەوێ، ئەمەش تەنها لەو كات و شوێنەدا دەبێت كە بۆی دروستە تیایدا بەتەیموم نوێژ بكات.

## ٢٤- كرداری تەیموم[2]

**١٤٠-** عَنْ نَافِعٍ ﷺ، أَنَّهُ أَقْبَلَ هُوَ وَعَبْدُ اللهِ بْنُ عُمَرَ ﷺ مِنَ الْجُرُفِ، حَتَّى إِذَا كَانَا بِالْمِرْبَدِ، نَزَلَ عَبْدُ اللهِ فَتَيَمَّمَ صَعِيدًا طَيِّبًا، فَمَسَحَ وَجْهَهُ وَيَدَيْهِ إِلَى الْمِرْفَقَيْنِ، ثُمَّ صَلَّى[3].

واتە: لە نافیعەوە ﷺ گێردراوەتەوە خۆی و عەبدوڵڵای كوڕی عومەر ﷺ لە جوڕوفەوە هاتنەوە (كە ئەو كات پێنج كیلۆمەتر لە مەدینەوە دوور بووە)، تا گەیشتنە میربەد (كە یەك دوو میل لە مەدینەوە دوورە)، عەبدوڵڵا دابەزی و تەیمومی بە خۆڵێكی پاك كرد، ڕوخسار و دەستەكانی تا ئانیشكەكانی مەسح كرد، دواتر نوێژی كرد.

---

(١) ـ أخرجه أبو مصعب الزهري: ١٥٢ في الوضوء، عن مالك به.

(٢) ـ الْعَمَلُ فِي التَّيَمُّمِ.

(٣) ـ صحيح. أخرجه أبو مصعب الزهري: ١٥٣ في الوضوء؛ والحدثاني: ٦١ في الطهارة؛ والشيباني: ٧١ في الصلاة، كلهم عن مالك به.



**١٤١-** عَنْ نَافِعٍ ﷺ، أَنَّ عَبْدَ اللهِ بْنَ عُمَرَ ﷺ كَانَ يَتَيَمَّمُ إِلَى الْمِرْفَقَيْنِ[1].

واتە: لە نافیعەوە ﷺ گێڕدراوەتەوە (گوتوویەتی): عەبدوڵڵای كوڕی عومەر ﷺ تەیمومی دەستەكانی تا ئانیشكەكانی دەكرد.

**١٤٢- [فتوى]** وَسُئِلَ مَالِكٌ ﷺ كَيْفَ التَّيَمُّمُ وَأَيْنَ يَبْلُغُ بِهِ؟ فَقَالَ: يَضْرِبُ ضَرْبَةً لِلْوَجْهِ، وَضَرْبَةً لِلْيَدَيْنِ، وَيَمْسَحُهُمَا إِلَى الْمِرْفَقَيْنِ[2].

(فەتوا): ئیمامی مالیك ﷺ پرسیاری لێكرا: تەیموم چۆنە و تا كوێ دەیكات؟ ئەویش گوتی: جارێك دەست لە خۆڵەكە دەدات بۆ ڕوخساری، جارێكیش بۆ دەست و باسكەكانی، مەسحیان دەكات تا ئانیشكەكان.

## ٢٥- تەیمومكردنی كەسی جەنابەتدار[3]

**١٤٣-** عَنْ عَبْدِ الرَّحْمَنِ بْنِ حَرْمَلَةَ ﷺ، أَنَّ رَجُلاً سَأَلَ سَعِيدَ بْنَ الْمُسَيَّبِ ﷺ عَنِ الرَّجُلِ الْجُنُبِ يَتَيَمَّمُ ثُمَّ يُدْرِكُ الْمَاءَ؟ فَقَالَ سَعِيدٌ ﷺ: إِذَا أَدْرَكَ الْمَاءَ، فَعَلَيْهِ الْغُسْلُ لِمَا يُسْتَقْبَلُ[4].

واتە: لە عەبدوڵڵای كوڕی حەرمەلەوە ﷺ گێڕدراوەتەوە (گوتوویەتی): پیاوێك پرسیاری لە سەعیدی كوڕی موسەییەب ﷺ كرد دەربارەی كەسێكی جەنابەتدار كە تەیموم دەكات و دواتریش دەگات بە ئاو؟ سەعید ﷺ گوتی: ئەگەر گەیشت بە ئاو ئەوە بۆ نوێژەكانی داهاتوو خۆشۆردنی لەسەر واجبە.

**١٤٤- [فتوى]** قَالَ مَالِكٌ ﷺ: فِيمَنِ احْتَلَمَ وَهُوَ فِي سَفَرٍ وَلاَ يَقْدِرُ عَلَى الْمَاءِ، إِلاَّ قَدْرَ الْوُضُوءِ وَهُوَ لاَ يَعْطَشُ حَتَّى يَأْتِيَ الْمَاءَ، قَالَ: يَغْسِلُ بِذَلِكَ فَرْجَهُ وَمَا أَصَابَهُ مِنْ ذَلِكَ الأَذَى، ثُمَّ يَتَيَمَّمُ صَعِيدًا طَيِّبًا كَمَا أَمَرَهُ اللهُ[5].

---

(١) ـ صحيح. أخرجه أبو مصعب الزهري: ١٥٥ في الوضوء؛ والحدثاني: ٦١ أ في الطهارة، عن مالك به.

(٢) ـ أخرجه أبو مصعب الزهري: ١٥٤ في الوضوء؛ والحدثاني: ٦١ ب في الطهارة، عن مالك به.

(٣) ـ تَيَمُّم الْجُنُبِ.

(٤) ـ مقطوع حسن. أخرجه أبو مصعب الزهري: ١٥٦ في الوضوء، عن مالك به.

(٥) ـ أخرجه أبو مصعب الزهري: ١٥٧ في الوضوء، عن مالك به.




(فەتوا): ئیمامی مالیك ﷺ دەربارەی ئەو کەسەی جەنابەتی تووش دەبێت لە کاتێکدا لە سەفەردایە و ئاوی دەست ناکەوێ تەنها بە ئەندازەی دەستنوێژشۆردن نەبێ، وە (دەزانێت) تینووی نابێت تا دەگاتە ئاو، (دەربارەی ئەو کەسە) گوتوویەتی: بەو کەمە ئاوەی لەلایەتی دامێن و ئەوەی بەریکەوتوە لە پیسی دەیشۆرێ، دواتر بە خۆڵێکی پاك تەیموم دەکات وەك چۆن خوای پەروەردگار فەرمانی کردووە.

**١٤٥-** [فتوى] وَسُئِلَ مَالِكٌ ﷺ عَنْ رَجُلٍ جُنُبٍ، أَرَادَ أَنْ يَتَيَمَّمَ فَلَمْ يَجِدْ تُرَابًا إِلاَّ تُرَابَ سَبَخَةٍ، هَلْ يَتَيَمَّمُ بِالسِّبَاخِ؟ وَهَلْ تُكْرَهُ الصَّلاَةُ فِي السِّبَاخِ؟

قَالَ مَالِكٌ ﷺ: لاَ بَأْسَ بِالصَّلاَةِ فِي السِّبَاخِ وَالتَّيَمُّمِ مِنْهَا، لأَنَّ اللهَ ﷻ قَالَ: ﴿ **فَتَيَمَّمُوا صَعِيدًا طَيِّبًا** ﴿٤٣﴾ ﴾ النساء، فَكُلُّ مَا كَانَ صَعِيدًا فَهُوَ يُتَيَمَّمُ بِهِ سِبَاخًا كَانَ أَوْ غَيْرَهُ[1].

(فەتوا): ئیمامی مالیك ﷺ پرسیاری لێکرا دەربارەی پیاوێکی جەنابەتدار کە دەیەوێ تەیموم بکات، هیچ خۆڵێکیشی دەست ناکەوێ جگە لە خۆڵی زەوییەکی خوێاوی، ئایا بە خۆڵی زەوییە خوێاوییەکە تەیموم بکات؟ ئایا نوێژکردنیش کەڕاهەتی هەیە لە زەوی خوێاوی؟ ئیمامی مالیك ﷺ گوتی: نوێژکردن و تەیمومکردن هیچ کێشەیەکی تیا نییە لە زەوی خوێاوی، لەبەر ئەوەی خوای پەروەردگار فەرموویەتی: ﴿ **فَتَيَمَّمُوا صَعِيدًا طَيِّبًا** ﴿٤٣﴾ ﴾، جا هەر خۆڵێك بێت تەیمومی پێ دەکرێ، خوێاوی بێت یان غەیری ئەو.

## ٢٦- ئەوەی بۆ پیاو حەڵاڵە لە ئافرەتەکەی لە کاتێکدا حەیزدارە[2]

**١٤٦-** عَنْ زَيْدِ بْنِ أَسْلَمَ ﷺ، أَنَّ رَجُلاً سَأَلَ رَسُولَ اللهِ ﷺ فَقَالَ: مَا يَحِلُّ لِي مِنِ امْرَأَتِي وَهِيَ حَائِضٌ؟ فَقَالَ: رَسُولُ اللهِ ﷺ: لِتَشُدَّ عَلَيْهَا إِزَارَهَا ثُمَّ شَأْنَكَ بِأَعْلاَهَا[3].

---

(١) ـ أخرجه أبو مصعب الزهري: ١٥٨ في الوضوء، عن مالك به.

(٢) ـ مَا يَحِلُّ لِلرَّجُلِ مِنِ امْرَأَتِهِ وَهِيَ حَائِضٌ.

(٣) ـ صحيح لغيره. أخرجه أبو مصعب الزهري: ١٥٩ في الوضوء؛ والحدثاني: ٦٣ في الطهارة؛ والشيباني: ٧٥ في الصلاة، كلهم عن مالك به.

واتە: لە زەیدی كوڕی ئەسلەمەوە ﷺ گێڕدراوەتەوە (گوتوویەتی): پیاوێك پرسیاری لە پێغەمبەری خوا ﷺ كردو گوتی: چ شتێكی ئافرەتەكەم بۆ حەڵاڵە لە كاتێكدا حەیزدارە؟ پێغەمبەری خواش ﷺ فەرمووی: با جلی خوارەوەی (واتە لە كەمەری بە خواری) لەسەر خۆی توند بكات، دواتر سەرەوەی حەڵاڵە و بە كەیفی خۆتە.

**١٤٧-** أَنَّ عَائِشَةَ ﷺ، زَوْجَ النَّبِيِّ ﷺ، كَانَتْ مُضْطَجِعَةً مَعَ رَسُولِ اللهِ ﷺ فِي ثَوْبٍ وَاحِدٍ، وَإِنَّهَا قَدْ وَثَبَتْ وَثْبَةً شَدِيدَةً، فَقَالَ لَهَا رَسُولُ اللهِ ﷺ: مَا لَكِ؟ لَعَلَّكِ نَفِسْتِ، يَعْنِي الْحَيْضَةَ، فَقَالَتْ: نَعَمْ، قَالَ: شُدِّي عَلَى نَفْسِكِ إِزَارَكِ ثُمَّ عُودِي إِلَى مَضْجَعِكِ[1].

واتە: (جارێكیان) عائیشەی ﷺ خێزانی پێغەمبەری خوا ﷺ لەگەڵ پێغەمبەری خوا ﷺ پاڵكەوتبوو لە ژێر یەك لێفە، جا لە ناكاو بە توندی دەرپەڕی (لەناو جێگاكە هاتە دەرەوە)، پێغەمبەری خواش ﷺ پێی فەرموو: چیت بەسەر هاتووە؟ لەوانەیە خوێنی حەیزت هاتبێ؟ ئەویش گوتی: بەڵێ، پێغەمبەری خواش ﷺ فەرمووی: جلی خوارەوەت لەسەر خۆت توند بكە، دواتر بگەڕێوە بۆ جێگاكەت.

**١٤٨-** أَنَّ عُبَيْدَ اللهِ بْنَ عَبْدِ اللهِ بْنِ عُمَرَ ﷺ أَرْسَلَ إِلَى عَائِشَةَ ﷺ يَسْأَلُهَا: هَلْ يُبَاشِرُ الرَّجُلُ امْرَأَتَهُ وَهِيَ حَائِضٌ؟ فَقَالَتْ: لِتَشُدَّ إِزَارَهَا عَلَى أَسْفَلِهَا ثُمَّ يُبَاشِرُهَا إِنْ شَاءَ[2].

واتە: عوبەیدوڵلای كوڕی عەبدوڵلای كوڕی عومەر ﷺ كەسێكی نارد بۆ لای عائیشە ﷺ تا پرسیاری لێ بكات: ئایا پیاو دەستەگەمە لەگەڵ خێزانەكەی بكات لە كاتێكدا حەیزدارە؟ ئەویش گوتی: با ئافرەتەكە جلی خوارەوەی توند لە خوارەوەی خۆی ببەستێ، (واتە جلێك لەلای خوارەوەی جەستەی لەبەر بكات بە توندوتۆڵی بەشێوەیەك لە كاتی دەستەگەمە نەكەونە ناو جیاعەوە)، دواتر دەستەگەمەی لەگەڵ دەكات ئەگەر بیەوێ.

---

(١) ـ صحيح لغيره. أخرجه أبو مصعب الزهري: في الوضوء؛ والحدثاني، ٦٣ أ في الطهارة، عن مالك به.

(٢) ـ صحيح. أخرجه أبو مصعب الزهري: ١٦١ في الوضوء؛ والحدثاني: ٦٣ ب في الطهارة؛ والشيباني: ٧٣ في الصلاة؛ والشافعي: ١٣٣٣؛ والدارمي: ١٠٣٣ في الطهارة، كلهم عن مالك به.




**١٤٩-** أَنَّ سَالِمَ بْنَ عَبْدِ اللهِ، وَسُلَيْمَانَ بْنَ يَسَارٍ ﷺ سُئِلاَ عَنِ الْحَائِضِ؛ هَلْ يُصِيبُهَا زَوْجُهَا إِذَا رَأَتِ الطُّهْرَ قَبْلَ أَنْ تَغْتَسِلَ؟ فَقَالاَ: لاَ حَتَّى تَغْتَسِلَ[1].

واتە: سالمی کوڕی عەبدوڵڵا و سولەیمانی کوڕی یەسار ﷺ پرسیاریان لێ کرا دەربارەی ئافرەتی حەیزدار، کە ئایا مێردەکەی بچێتە لای ئەگەر ئافرەتەکە پاکبوونەوەی بینی، بەڵام هێشتا خۆی نەشۆردبوو؟ گوتیان: نەخێر، تا ئافرەتەکە خۆی دەشۆرێ.

## ٢٧- خاوێنبوونەوەی ئافرەتی حەیزدار[2]

**١٥٠-** عَنْ عَلْقَمَةَ بْنِ أَبِي عَلْقَمَةَ ﷺ، عَنْ أُمِّهِ، مَوْلاَةِ عَائِشَةَ أُمِّ الْمُؤْمِنِينَ ﷺ، أَنَّهَا قَالَتْ: كَانَ النِّسَاءُ يَبْعَثْنَ إِلَى عَائِشَةَ أُمِّ الْمُؤْمِنِينَ ﷺ بِالدِّرَجَةِ فِيهَا الْكُرْسُفُ، فِيهِ الصُّفْرَةُ مِنْ دَمِ الْحَيْضَةِ، يَسْأَلْنَهَا عَنِ الصَّلاَةِ، فَتَقُولُ لَهُنَّ: لاَ تَعْجَلْنَ حَتَّى تَرَيْنَ الْقَصَّةَ الْبَيْضَاءَ، تُرِيدُ بِذَلِكَ الطُّهْرَ مِنَ الْحَيْضَةِ[3].

واتە: لە عەلقەمەی کوڕی ئەبو عەلقەمەوە ﷺ گێردراوەتەوە، ئەویش لە دایکی خۆی کە خزمەتکاری عائیشەی دایکی بڕواداران ﷺ بووە گێڕاویەتەوە و گوتوویەتی: ئافرەتان لۆکەی شوێنی حەیزیان لەناو کیسەیەك یان لەناو پارچە پەڕۆیەك بۆ عائیشە ﷺ دەنارد، زەرداتی خوێنی حەیزی پێوە بوو، پرسیاریان لێ دەکرد لە نوێژکردن (کە ئاخۆ ئەو زەردایەتییە بە پاکبوونەوە ئەژمار دەکرێ و نوێژ بکەن؟)، ئەویش پێیانی دەگوت: پەلە مەکەن تا ئاوە ڕوونەکە دەبینن (کە ڕەحم دەریدەدات لە کاتی تەواو پاکبوونەوە لە حەیزدا)، مەبەستی عائیشە ﷺ بەوە تەواو خاوێنبوونەوە بوو لە حەیز.

---

(١) ـ مقطوع صحيح لغيره. أخرجه أبو مصعب الزهري: ١٦٢ في الوضوء؛ والشيباني: ٧٤ في الصلاة، عن مالك به.

(٢) ـ طُهْرُ الْحَائِضِ.

(٣) ـ صحيح لغيره. أخرجه أبو مصعب الزهري: ١٦٣ في الوضوء؛ والحدثاني: ٦٤ في الطهارة؛ والشيباني: ٨٥ في الصلاة، كلهم عن مالك به.

١٥١- عَنِ ابْنَةِ زَيْدِ بْنِ ثَابِتٍ ﷺ، أَنَّهُ بَلَغَهَا أَنَّ نِسَاءً كُنَّ يَدْعُونَ بِالْمَصَابِيحِ مِنْ جَوْفِ اللَّيْلِ يَنْظُرْنَ إِلَى الطُّهْرِ، فَكَانَتْ تَعِيبُ ذَلِكَ عَلَيْهِنَّ، وَتَقُولُ: مَا كَانَ النِّسَاءُ يَصْنَعْنَ هَذَا[١].

واتە: لە کچی زەیدی کوڕی سابیتەوە ﷺ گێردراوەتەوە پێی گەیشتووە هەندێ لە ئافرەتان داوای چرایان دەکرد، لە پێش نوێژی بەیانی (لەخەو هەڵدەستان) سەیری خاوێنی حەیزەکانیان دەکرد، جا کچی زەیدی کوڕی سابیت ڕەخنەی لێ دەگرتن و لۆمەی دەکردن دەیگوت: ئافرەتە هاوەڵەکانی پێغەمبەری خوا ﷺ ئاوایان نەدەکرد (واتە ئەو تەکلیفەیان لەخۆیان نەدەکرد).

١٥٢- [فتوى] وَسُئِلَ مَالِكٌ ﷺ: عَنِ الْحَائِضِ تَطْهُرُ فَلاَ تَجِدُ مَاءً، هَلْ تَتَيَمَّمُ؟ قَالَ: نَعَمْ لِتَتَيَمَّمْ، فَإِنَّ مِثْلَهَا مِثْلُ الْجُنُبِ إِذَا لَمْ يَجِدْ مَاءً تَيَمَّمَ[٢].

(فەتوا): ئیمامی مالیك ﷺ پرسیاری لێکرا دەربارەی ئافرەتی حەیزدار کە پاك دەبێتەوە و ئاوی دەست ناکەوێ، ئایا (لەجیاتی غوسل) تەیموم بکات؟ گوتی: بەڵێ با تەیموم بکات، چونکە وەکوو کەسی جەنابەتدارە کاتێ ئاوی دەست ناکەوێ تەیموم دەکات.

## ٢٨- بابەتی جۆراوجۆر دەربارەی حەیز[٣]

١٥٣- عَنْ مَالِكٍ ﷺ؛ أَنَّهُ بَلَغَهُ أَنَّ عَائِشَةَ ﷺ، زَوْجَ النَّبِيِّ ﷺ، قَالَتْ فِي الْمَرْأَةِ الْحَامِلِ تَرَى الدَّمَ: أَنَّهَا تَدَعُ الصَّلاَةَ[٤].

واتە: لە ئیمامی مالیکەوە ﷺ گێردراوەتەوە پێی گەیشتووە عائیشەی ﷺ خێزانی پێغەمبەری خوا ﷺ دەربارەی ئافرەتی سکپڕ کە خوێن دەبینێ گوتوویەتی: واز لە نوێژ دەهێنێ (چونکە بە حەیز حیسابە هەرچەندە حەملیشی هەبێ).

---

(١) ـ مقطوع ضعيف. أخرجه أبو مصعب الزهري: ١٦٤ في الوضوء؛ والحدثاني: ٦٤ أ في الطهارة؛ والشيباني: ٨٦ في الصلاة؛ ومصنف ابن أبي شيبة: ١٠٠٨ في الطهارات، كلهم عن مالك به.

(٢) ـ أخرجه أبو مصعب الزهري: ١٦٥ في الوضوء؛ والحدثاني: ٦٤ب في الطهارة، كلهم عن مالك به.

(٣) ـ جَامِعُ الْحَيْضَةِ.

(٤) ـ موقوف حسن. أخرجه أبو مصعب الزهري: ١٦٧ في الوضوء؛ والحدثاني: ٦٥ أ في الطهارة؛ عن مالك به.

١٥٤- عَنْ مَالِكٍ ﵀، أَنَّهُ سَأَلَ ابْنَ شِهَابٍ ﵀، عَنِ الْمَرْأَةِ الْحَامِلِ تَرَى الدَّمَ؟ قَالَ: تَكُفُّ عَنِ الصَّلاَةِ[١].

قَالَ يَحْيَى ﵀: قَالَ مَالِكٌ ﵀: وَذَلِكَ الأَمْرُ عِنْدَنَا.

واتە: لە ئیمامی مالیکەوە ﵀ گێڕدراوەتەوە پرسیاری لە ئیبنو شیهاب ﵀ کردووە دەربارەی ئافرەتی سکپڕ کە خوێن دەبینێ؟ گوتوویەتی: واز لە نوێژ دەهێنێ (چونکە حەیزە).

یەحیا ﵀ گوتوویەتی: ئیمامی مالیك ﵀ گوتوویەتی: بابەتەکە لەلای ئێمەش هەر بەم شێوەیەیە.

١٥٥- عَنْ عَائِشَةَ ﵂، زَوْجِ النَّبِيِّ ﷺ، أَنَّهَا قَالَتْ: كُنْتُ أُرَجِّلُ رَأْسَ رَسُولِ اللهِ ﷺ وَأَنَا حَائِضٌ[٢].

واتە: لە عائیشەی ﵂ خێزانی پێغەمبەری خواوە ﷺ گێڕدراوەتەوە گوتوویەتی: سەری پێغەمبەری خوام ﷺ شانە دەکرد لە کاتێکدا لە حەیزدا بووم.

١٥٦- عَنْ أَسْمَاءَ بِنْتِ أَبِي بَكْرٍ الصِّدِّيقِ ﵄ أَنَّهَا قَالَتْ: سَأَلَتِ امْرَأَةٌ رَسُولَ اللهِ ﷺ، فَقَالَتْ: أَرَأَيْتَ إِحْدَانَا إِذَا أَصَابَ ثَوْبَهَا الدَّمُ مِنَ الْحَيْضَةِ كَيْفَ تَصْنَعُ؟ فَقَالَ رَسُولُ اللهِ ﷺ: إِذَا أَصَابَ ثَوْبَ إِحْدَاكُنَّ الدَّمُ مِنَ الْحَيْضَةِ فَلْتَقْرُصْهُ ثُمَّ لِتَنْضِحْهُ بِالْمَاءِ ثُمَّ لِتُصَلِّ فِيهِ[٣].

واتە: لە ئەسمائی کچی ئەبو بەکری صدیقەوە ﵄ گێڕدراوەتەوە گوتوویەتی: ئافرەتێك پرسیاری لە پێغەمبەری خوا ﷺ کرد و گوتی: ئایا پێم دەفەرمووی کاتێ یەکێك لە ئێمە خوێنی حەیز بەر جلەکەی دەکەوێ چی بکات؟ پێغەمبەری خواش

---

(١) ـ مقطوع صحيح. أخرجه الدارمي: ٩٢١ في الطهارة؛ ومصنف ابن أبي شيبة: ٦٠٥٢ في الصلوات، كلهم عن مالك به.

(٢) ـ صحيح. أخرجه أبو مصعب الزهري: ١٦٨ في الوضوء؛ والحدثاني: ٦٦ في الطهارة؛ والشيباني: ٨٨ في الصلاة؛ والبخاري: ٢٩٥ في الحيض، وفي: ٥٩٢٥ في اللباس؛ والنسائي: ٢٧٧ في الطهارة، وفي: ٣٨٩ في الحيض؛ وابن حبان: ١٣٥٩؛ والدارمي: ١٠٥٨ في الطهارة، وفي: ١٠٥٩ في الطهارة؛ والقابسي: ٤٦٢، كلهم عن مالك به.

(٣) ـ صحيح. أخرجه أبو مصعب الزهري: ١٦٦ في الوضوء؛ والحدثاني: ٦٥ في الطهارة؛ والشافعي: ٨؛ والبخاري: ٣٠٧ في الحيض؛ وأبو داود: ٣٦١ في الطهارة؛ والقابسي: ٤٨٠، كلهم عن مالك به.

ﷺ فەرمووی: ئەگەر جلی یەکێك لە ئێوە خوێنی حەیزی بەرکەوت با بە پەنجەکانی شوێنی خوێنەکە لەگەڵ ئاو هەڵکرێنێ و هەڵپشێوێ (جوان بیشۆرێ)، دواتر نوێژی پێوە بکات.

## ٢٩- ئەو ئافرەتەی خوێنچرکەی نەخۆشی هەیە (کە لە غەیری کاتەکانی حەیز خوێن دەبینێ)[١]

**١٥٧**- عَنْ عَائِشَةَ رضي الله عنها، زَوْجِ النَّبِيِّ ﷺ، أَنَّهَا قَالَتْ: قَالَتْ فَاطِمَةُ بِنْتُ أَبِي حُبَيْشٍ: يَا رَسُولَ اللهِ، إِنِّي لاَ أَطْهُرُ، أَفَأَدَعُ الصَّلاَةَ؟ فَقَالَ لَهَا رَسُولُ اللهِ ﷺ: إِنَّمَا ذَلِكِ عِرْقٌ وَلَيْسَتْ بِالْحَيْضَةِ، فَإِذَا أَقْبَلَتِ الْحَيْضَةُ فَاتْرُكِي الصَّلاَةَ، فَإِذَا ذَهَبَ قَدْرُهَا، فَاغْسِلِي الدَّمَ عَنْكِ وَصَلِّي[٢].

واتە: لە عائیشەی رضي الله عنها خێزانی پێغەمبەری خواوە ﷺ گێردراوەتەوە گوتوویەتی: فاتیمەی کچی ئەبو حوبەیش گوتی: ئەی پێغەمبەری خوا ﷺ من پاك نابمەوە (بەردەوام حوێن دەبینم) جا ئایا واز لە نوێژ بێنم؟ پێغەمبەری خواش ﷺ پێی فەرموو: ئەوە تەنها دەمارێکە (خوێنچرکە دەکا، نەخۆشیە) و حەیز نییە، جا ئەگەر کاتی عادەتی حەیزت هات نوێژ واز لێ بێنە، کاتێ ماوەکەشی (بەپێی عادەتی پێشووی خۆت) تێپەڕی خوێنەکە لە خۆت بشۆرە و (دەستنوێژ بشۆرە و) نوێژ بکە.

**١٥٨**- عَنْ أُمِّ سَلَمَةَ رضي الله عنها، زَوْجِ النَّبِيِّ ﷺ، أَنَّ امْرَأَةً كَانَتْ تُهَرَاقُ الدِّمَاءَ فِي عَهْدِ رَسُولِ اللهِ ﷺ، فَاسْتَفْتَتْ لَهَا أُمُّ سَلَمَةَ رضي الله عنها رَسُولَ اللهِ ﷺ، فَقَالَ: لِتَنْظُرْ إِلَى عَدَدِ اللَّيَالِي وَالأَيَّامِ الَّتِي كَانَتْ تَحِيضُهُنَّ مِنَ الشَّهْرِ، قَبْلَ أَنْ يُصِيبَهَا الَّذِي أَصَابَهَا، فَلْتَتْرُكِ الصَّلاَةَ قَدْرَ ذَلِكَ مِنَ الشَّهْرِ، فَإِذَا خَلَّفَتْ ذَلِكَ فَلْتَغْتَسِلْ، ثُمَّ لِتَسْتَثْفِرْ بِثَوْبٍ ثُمَّ لِتُصَلِّي[٣].

---

(١) ـ الْمُسْتَحَاضَةُ.

(٢) ـ صحيح. أخرجه أبو مصعب الزهري: ١٧١ في الوضوء؛ والشافعي: ١٤٧٢؛ والبخاري: ٣٠٦ في الحيض؛ والنسائي: ٢١٨ في الطهارة، وفي: ٣٦٦ في الحيض؛ وأبو داود: ٢٨٣ في الطهارة؛ وابن حبان: ١٣٥٠؛ والقابسي: ٤٥١، كلهم عن مالك به.

(٣) ـ صحيح. أخرجه أبو مصعب الزهري: ١٧٢ في الوضوء؛ والحدثاني: ٦٧ في الطهارة؛ والشيباني: ٨٢ في الصلاة؛ والشافعي: ١٠٥٢؛ وفي: ١٤٧٤؛ وابن حنبل: ٢٦٧٥٩؛ والنسائي: ٢٠٨ في الطهارة، وفي: ٣٥٥ في الحيض؛ وأبو داود: ٢٧٤ في الطهارة، كلهم عن مالك به.




واتە: لە ئوممو سەلەمەی ﷺ خێزانی پێغەمبەری خواوە ﷺ گێڕدراوەتەوە (گوتوویەتی): ئافرەتێك لە سەردەمی پێغەمبەری خوادا ﷺ هەر خوێنی دەهات، جا ئوممو سەلەمە ﷺ پرسیاری بۆ لە پێغەمبەری خوا ﷺ کرد، ئەویش ﷺ فەرمووی: با تەرکیز بخاتە سەر ژمارەی ئەو شەو و ڕۆژانەی کە پێشتر تیایدا دەکەوتە حەیز لە مانگێکدا، پێش ئەوەی تووشی ئەوە بێت کە تووشی بووە (لە خوێنچرکەکە)، وە با واز لە نوێژ بێنێ بە ئەندازەی ماوەی حەیزەکەی لە مانگێکدا، جا ئەگەر (ماوەی عادەتی) حەیزەکە تەواو بوو، ئەوە با خۆی بشۆرێ، دواتر دامێنی بە پەڕۆیەك بپێچێت و (دەستنوێژ بۆ نوێژەکان بشۆرێتەوەو) نوێژ بکات[١].

١٥٩- عَنْ زَيْنَبَ بِنْتِ أَبِي سَلَمَةَ ﷺ، أَنَّهَا رَأَتْ زَيْنَبَ بِنْتَ جَحْشٍ ﷺ الَّتِي كَانَتْ تَحْتَ عَبْدِ الرَّحْمَنِ بْنِ عَوْفٍ وَكَانَتْ تُسْتَحَاضُ، فَكَانَتْ تَغْتَسِلُ وَتُصَلِّي[٢].

واتە: لە زەینەبی کچی ئەبو سەلەمەوە ﷺ گێڕدراوەتەوە بەوەی زەینەبی کچی جەحشی ﷺ بینیوە کە خێزانی عەبدوڕڕەحمانی کوڕی عەوف بووە، خوێنچرکەی نەخۆشی هەبووە، جا خۆی دەشۆرد و نوێژی دەکرد.

١٦٠- عَنْ سُمَيٍّ، مَوْلَى أَبِي بَكْرِ بْنِ عَبْدِ الرَّحْمَنِ ﷺ، أَنَّ الْقَعْقَاعَ بْنَ حَكِيمٍ، وَزَيْدَ بْنَ أَسْلَمَ أَرْسَلَاهُ إِلَى سَعِيدِ بْنِ الْمُسَيَّبِ ﷺ، يَسْأَلُهُ كَيْفَ تَغْتَسِلُ الْمُسْتَحَاضَةُ؟ فَقَالَ: تَغْتَسِلُ مِنْ طُهْرٍ إِلَى طُهْرٍ، وَتَتَوَضَّأُ لِكُلِّ صَلَاةٍ، فَإِنْ غَلَبَهَا الدَّمُ اسْتَثْفَرَتْ[٣].

واتە: لە سومەیی خزمەتکاری ئازادکراوی ئەبو بەکری کوڕی عەبدوڕڕەحمانەوە ﷺ گێڕدراوەتەوە (جارێکیان) قەعقاعی کوڕی حەکیم و زەیدی کوڕی ئەسلەم (رحمهما الله) ناردوویانە بۆ لای سەعیدی کوڕی موسەیەب ﷺ تا پرسیاری لێ

---

(١) ـ تێبینی: کەواتە لە ماوەی خوێنچرکەکەی ئەوەندە ڕۆژانەی بە عادەتی خۆی پێشتر دەکەوتە حەیز، ئەوەندە بە حەیز حیساب دەکات و واز لە نوێژ و جیماع و حەرامکراوەکان دێنێ، بەڵام دوای ئەو ماوەیە وەك ئافرەتێکی خاوێن حیسابی بۆ دەکرێت و نوێژ و ڕۆژوو دەگرێت و پابەند نابێت بە حەرامکراوەکانی حەیز.

(٢) ـ صحيح. أخرجه أبو مصعب الزهري: ١٧٣ في الوضوء، عن مالك به.

(٣) ـ مقطوع صحيح. أخرجه أبو مصعب الزهري: ١٧٤ في الوضوء؛ والحدثاني: ٦٨ في الطهارة؛ والشيباني: ٨٣ في الصلاة؛ وأبو داود: ٣٠١ في الطهارة، كلهم عن مالك به.

بكات كە ئاخۆ ئەو ئافرەتەی خوێنچركەی نەخۆشی هەیە چۆن خۆی دەشۆرێ؟ ئەویش گوتی: خۆی دەشۆرێ لە پاكبوونەوەیەك بۆ پاكبوونەوەیەكی دیكە و بۆ گشت نوێژێك دەستنوێژ دەشۆرێ، جا ئەگەر هەر خوێن نەوەستا ئەوە با پارچە پەڕۆیەك (لە شوێنی خوێنەكە) دابنێ و لە خۆی ببەستێ.

١٦١- عَنْ هِشَامِ بْنِ عُرْوَةَ ﷺ، عَنْ أَبِيهِ ﷺ، أَنَّهُ قَالَ: لَيْسَ عَلَى الْمُسْتَحَاضَةِ إِلاَّ أَنْ تَغْتَسِلَ غُسْلاً وَاحِدًا، ثُمَّ تَتَوَضَّأُ بَعْدَ ذَلِكَ لِكُلِّ صَلاَةٍ[١].

واتە: لە هیشامی كوڕی عورووەوە ﷺ گێڕدراوەتەوە، ئەویش لە باوكیەوە ﷺ گێڕاویەتەوە گوتوویەتی: ئەو ئافرەتەی خوێنچركەی نەخۆشی هەیە هیچ خۆشۆردنێكی لەسەر نییە جگە لە یەك خۆشۆردن، دواتر دوای ئەوە دەستنوێژ بۆ هەموو نوێژێك دەشۆرێت.

١٦٢- **[فتوى]** قَالَ يَحْيَى ﷺ: قَالَ مَالِكٌ ﷺ: الأَمْرُ عِنْدَنَا، أَنَّ الْمُسْتَحَاضَةَ إِذَا صَلَّتْ، أَنَّ لِزَوْجِهَا أَنْ يُصِيبَهَا، وَكَذَلِكَ النُّفَسَاءُ إِذَا بَلَغَتْ أَقْصَى مَا يُمْسِكُ النِّسَاءَ الدَّمُ، فَإِنْ رَأَتِ الدَّمَ بَعْدَ ذَلِكَ، فَإِنَّهُ يُصِيبُهَا زَوْجُهَا، وَإِنَّمَا هِيَ بِمَنْزِلَةِ الْمُسْتَحَاضَةِ[٢].

(فەتوا): یەحیا ﷺ گوتوویەتی: ئیمامی مالیك ﷺ گوتوویەتی: فەتوا لەلای ئێمە ئەوەیە ئەو ئافرەتەی خوێنچركەی نەخۆشی هەیە كاتێ نوێژی كرد بۆ مێردەكەی دروستە سەرجێیی لەگەڵ بكات، هەروەها ئەو ئافرەتەی منداڵیشی بووە و خوێنی منداڵبوون دەبینێ هەمان حوكمی هەیە كاتێ گەیشت بە ئەوپەڕی ئەو ماوەیەی كە عادەتە ئافرەتانی منداڵبوو خوێنیان ببچڕێ، جا ئەگەر لە دوای ئەوە خوێنی بینی ئەوە بۆ پیاوەكەی دروستە سەرجێیی لەگەڵ بكات (دوای خۆشۆردن)، چونكە وەك ئەو ئافرەتە وایە كە خوێنچركەی نەخۆشی دەبینێت.

١٦٣- **[فتوى]** قَالَ يَحْيَى ﷺ: قَالَ مَالِكٌ ﷺ: الأَمْرُ عِنْدَنَا فِي الْمُسْتَحَاضَةِ عَلَى حَدِيثِ هِشَامِ بْنِ عُرْوَةَ ﷺ، عَنْ أَبِيهِ، وَهُوَ أَحَبُّ مَا سَمِعْتُ إِلَيَّ فِي ذَلِكَ[٣].

---

(١) ـ مقطوع صحيح. أخرجه أبو مصعب الزهري: ١٧٥ في الوضوء؛ والشيباني: ٨٤ في الصلاة، عن مالك به.

(٢) ـ أخرجه أبو مصعب الزهري: ١٧٧ في الوضوء؛ وفي: ١٧٨ في الوضوء، كلهم عن مالك به.

(٣) ـ أخرجه أبو مصعب الزهري: ١٧٦ في الوضوء، عن مالك به.





(فەتوا): واتە: یەحیا ﷺ گوتوویەتی: ئیمامی مالیك ﷺ گوتوویەتی: فەتوا لەلای ئێمە دەربارەی ئەو ئافرەتەكەی خوێنچركەی نەخۆشی هەیە لەسەر فەرموودەی هیشامی كوڕی عورِوەیە ﷺ كە لە باوكیەوە گێڕاویەتەوە، جا ئەو فەرموودەیە خۆشەویسترین شتێكە كە گوێبیستی بووبم دەربارەی ئەم بابەتە (كە گوتی: یەك جار خۆشۆردنی لەسەرە و دواتر بۆ هەموو نوێژێك تەنها دەستنوێژ دەشۆرێت).

## ٣٠- ئەوەی هاتووە دەربارەی میزی منداڵی شیرەخۆرەی كوڕ[١]

**١٦٤- عَنْ عَائِشَةَ ﷺ، زَوْجِ النَّبِيِّ ﷺ، أَنَّهَا قَالَتْ: أُتِيَ رَسُولُ اللهِ ﷺ بِصَبِيٍّ، فَبَالَ عَلَى ثَوْبِهِ، فَدَعَا رَسُولُ اللهِ ﷺ بِمَاءٍ فَأَتْبَعَهُ إِيَّاهُ[٢].**

واتە: لە عائیشەی ﷺ خێزانی پێغەمبەرەوە ﷺ گێڕدراوەتەوە گوتوویەتی: منداڵێكی كوڕ كە شیرەخۆرە بوو هێنرا بۆ لای پێغەمبەری خوا ﷺ و میزی كرد بەسەر جلەكەی پێغەمبەری خوادا ﷺ، پێغەمبەری خواش ﷺ داوای ئاوی كرد و بەدوای شوێنی میزەكەوە بوو و ئاوی دەكرد بەسەردا.

**١٦٥- عَنْ أُمِّ قَيْسٍ بِنْتِ مِحْصَنٍ ﷺ، أَنَّهَا أَتَتْ بِابْنٍ لَهَا صَغِيرٍ، لَمْ يَأْكُلِ الطَّعَامَ، إِلَى رَسُولِ اللهِ ﷺ، فَأَجْلَسَهُ فِي حَجْرِهِ، فَبَالَ عَلَى ثَوْبِهِ، فَدَعَا رَسُولُ اللهِ ﷺ بِمَاءٍ، فَنَضَحَهُ وَلَمْ يَغْسِلْهُ[٣].**

واتە: لە ئوممو قەیسی كچی میحصەنەوە ﷺ گێڕدراوەتەوە بەوەی كوڕێكی شیرەخۆرەی خۆی هێناوە بۆ لای پێغەمبەری خوا ﷺ كە خواردنی نەخواردبوو (لەوە بچووكتر بوو خواردنی پێ بدرێ)، پێغەمبەری خواش ﷺ لەناو كۆشی خۆی

---

(١) ـ مَا جَاءَ فِي بَوْلِ الصَّبِيِّ.

(٢) ـ صحيح. أخرجه أبو مصعب الزهري: ٥١٢ في الجمعة؛ والحدثاني: ١٦٧ في الصلاة؛ والشيباني: ٤١ في الصلاة؛ والبخاري: ٢٢٢ في الوضوء؛ والنسائي: ٣٠٣ في الطهارة؛ والقابسي: ٤٦١، كلهم عن مالك به.

(٣) ـ صحيح. أخرجه أبو مصعب الزهري: ٥١٣ في الجمعة؛ والحدثاني: ١٦٧أفي الصلاة؛ والشيباني: ٤٠ في الصلاة؛ والبخاري: ٢٢٣ في الوضوء؛ والنسائي: ٣٠٢ في الطهارة؛ وأبو داود: ٣٧٤ في الطهارة؛ والدارمي: ٧٤١ في الطهارة؛ وشرح معاني الآثار: ٥٩٣؛ والقابسي: ٥٦، كلهم عن مالك به.

داینا و میزی كرد بەسەر جلەكانی، پێغەمبەری خواش ﷺ داوای ئاوی كرد و شوێنی میزەكەی ئاوپڕژێن كرد و نەیشۆری.

## ٣١- ئەوەی هاتووە دەربارەی میزكردن بەپێوە و دەربارەی شتی دیكەش (وەك تارەتكردن)[١]

١٦٦- عَنْ يَحْيَى بْنِ سَعِيدٍ ﷺ أَنَّهُ قَالَ: دَخَلَ أَعْرَابِيٌّ الْمَسْجِدَ، فَكَشَفَ عَنْ فَرْجِهِ لِيَبُولَ، فَصَاحَ النَّاسُ بِهِ، حَتَّى عَلاَ الصَّوْتُ، فَقَالَ رَسُولُ اللهِ ﷺ: اتْرُكُوهُ، فَتَرَكُوهُ، فَبَالَ، ثُمَّ أَمَرَ رَسُولُ اللهِ ﷺ بِذَنُوبٍ مِنْ مَاءٍ، فَصُبَّ عَلَى ذَلِكَ الْمَكَانِ[٢].

واتە: لە یەحیای كوڕی سەعیدەوە ﷺ گێڕدراوەتەوە گوتوویەتی: پیاوێكی دەشتەكی هاتە ناو مزگەوت و عەوڕەتی خۆی دەرهێنا تا میز بكات، خەڵكیش لێیان هاوار كرد، تا (لە هەموو لایێك) دەنگە دەنگ بەرزبۆیەوە، پێغەمبەری خواش ﷺ فەرمووی: وازی لێ بێنن، وازی لێ بێنن، جا میزی كرد، پاشان پێغەمبەری خوا ﷺ فەرمانی كرد بە هێنانی دۆلكەیەك لە ئاو و ڕژێنرایە سەر شوێنەكە.

١٦٧- عَنْ عَبْدِ اللهِ بْنِ دِينَارٍ ﷺ، أَنَّهُ قَالَ: رَأَيْتُ عَبْدَ اللهِ بْنَ عُمَرَ ﷺ يَبُولُ قَائِمًا[٣].

واتە: لە عەبدوڵڵای كوڕی دینارەوە ﷺ گێڕدراوەتەوە گوتوویەتی: عەبدوڵڵای كوڕی عومەرم ﷺ بینی بەپێوە میزی دەكرد.

١٦٨- قَالَ يَحْيَى ﷺ: وَسُئِلَ مَالِكٌ ﷺ، عَنْ غَسْلِ الْفَرْجِ مِنَ الْبَوْلِ وَالْغَائِطِ، هَلْ جَاءَ فِيهِ أَثَرٌ؟ فَقَالَ: بَلَغَنِي أَنَّ بَعْضَ مَنْ مَضَى كَانُوا يَتَوَضَّؤُونَ مِنَ الْغَائِطِ، وَأَنَا أُحِبُّ أَنْ أَغْسِلَ الْفَرْجَ مِنَ الْبَوْلِ[٤].

---

(١) ـ مَا جَاءَ فِي الْبَوْلِ قَائِمًا وَغَيْرِهِ.

(٢) ـ ضعيف بهذا اللفظ. أخرجه أبو مصعب الزهري: ٥٠٩ في الجمعة، عن مالك به.

(٣) ـ صحيح. أخرجه أبو مصعب الزهري: ٥١٠ في الجمعة؛ والحدثاني: ١٦٦ في الصلاة؛ والشيباني: ٩٩٥ في العتاق؛ وشرح معاني الآثار: ٦٨١٧، كلهم عن مالك به.

(٤) ـ أخرجه أبو مصعب الزهري: ٥١١ في الجمعة؛ والحدثاني: ١٦٦ أ في الصلاة، كلهم عن مالك به.



واتە: یەحیا ﷺ گوتوویەتی: ئیمامی مالیك ﷺ پرسیاری لێکرا دەربارەی شۆردنی دامێن لە میز و پیسایی، بەوەی ئایا هیچ فەرمووده و کرداری هاوەڵانی لەسەرە (کە بەکارهێنانی ئاو سوننەت بێت بۆ دوو ئەندامەکە)؟ ئەویش گوتی: پێم گەیشتووە هەندێك لە پێشینە چاکەکان تەنها دامێنیان لە پیسایی شۆردووە، وە من پێم چاکە دامێن لە میزیش بشۆرم و ئاو بەکاربێنم (لەگەڵ ئەوەی تەنها بە بەردیش هەر دروستە).

## ٣٢- ئەوەی هاتووە دەربارەی سیواك[١]

**١٦٩- عَنِ ابْنِ السَّبَّاقِ ﷺ، أَنَّ رَسُولَ اللهِ ﷺ قَالَ فِي جُمُعَةٍ مِنَ الْجُمَعِ: يَا مَعْشَرَ الْمُسْلِمِينَ إِنَّ هَذَا يَوْمٌ جَعَلَهُ اللهُ عِيدًا فَاغْتَسِلُوا، وَمَنْ كَانَ عِنْدَهُ طِيبٌ فَلاَ يَضُرُّهُ أَنْ يَمَسَّ مِنْهُ، وَعَلَيْكُمْ بِالسِّوَاكِ[٢].**

واتە: لە ئیبنو سەبباقەوە ﷺ گێردراوەتەوە (گوتوویەتی): پێغەمبەری خوا ﷺ لە هەینییەك لە هەینییەکان فەرمووی: ئەی کۆمەڵی مسوڵمانان ئەوە ڕۆژێکە خوا کردوویەتی بە جەژن کەواتە خۆتان بشۆرن، هەر کەسێك بۆنی خۆشی هەیە خۆ چ زیانی پێ ناگەیەنێ لە خۆی بدات و خۆی بۆنخۆش بکات، هەروەها دەست بگرن بە سیواککردنیش.

**١٧٠- عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ ﷺ، أَنَّ رَسُولَ اللهِ ﷺ قَالَ: لَوْلاَ أَنْ أَشُقَّ عَلَى أُمَّتِي لأَمَرْتُهُمْ بِالسِّوَاكِ[٣].**

واتە: لە ئەبو هورەیرەوە ﷺ گێردراوەتەوە (گوتوویەتی): پێغەمبەری خوا ﷺ فەرموویەتی: ئەگەر لەبەر ئەوە نەبێ گرانی و قورسی لەسەر ئوممەتەکەم دروست دەکەم ئەوە فەرمانم پێ دەکردن بە سیواککردن (بە شێوەی واجب).

---

(١) ـ مَا جَاءَ فِي السِّوَاكِ.

(٢) ـ ضعيف. أخرجه أبو مصعب الزهري: ٤٥٢ في الجمعة؛ والحدثاني: ١٣٧ في الصلاة؛ والشيباني: ٥٩ في الصلاة؛ والشافعي: ٢٧٠، كلهم عن مالك به.

(٣) ـ صحيح. أخرجه أبو مصعب الزهري: ٤٥٣ في الجمعة؛ والحدثاني: ١٣٧أفي الصلاة؛ والبخاري: ٨٨٧ في الجمعة؛ والنسائي: ٧ في الطهارة؛ وابن حبان: ١٠٦٨؛ والقابسي: ٣٢١، كلهم عن مالك به.




**١٧١- عنْ أَبِي هُرَيْرَةَ ﷺ أَنَّهُ قَالَ: لوْلاَ أَنْ يَشُقَّ عَلَى أُمَّتِهِ لأَمَرَهُمْ بِالسِّوَاكِ مَعَ كُلِّ وُضُوءٍ[1].**

واتە: لە ئەبو هورەیرەوە ﷺ گێردراوەتەوە (گوتوویەتی): پێغەمبەری خوا ﷺ فەرموویەتی: ئەگەر لەبەر ئەوە نەبا گرانی و قورسی لەسەر ئوممەتەکەی دروست دەبێت ئەوە پێغەمبەری خوا ﷺ فەرمانی دەکردن بە سیواککردن لەگەڵ گشت دەستنوێژێك (بە شێوەی واجب).

---

(١) ـ صحيح، وقد صح مرفوعا. أخرجه أبو مصعب الزهري: ٤٥٤ في الجمعة؛ وابن حنبل: ٩٩٣٠، وفي: ١٠٧٠٧؛ والمنتقى لابن الجارود: ٦٣؛ وشرح معاني الآثار: ٢٣٤؛ والقابسي: ٣٢، كلهم عن مالك به.

## ١- ئەوەی هاتووە دەربارەی بانگدان بۆ نوێژ[١]

**١٧٢-** عَنْ يَحْيَى بْنِ سَعِيدٍ ﷺ أَنَّهُ قَالَ: كَانَ رَسُولُ اللهِ ﷺ قَدْ أَرَادَ أَنْ يَتَّخِذَ خَشَبَتَيْنِ، يُضْرَبُ بِهِمَا لِيَجْتَمِعَ النَّاسُ لِلصَّلاَةِ، فَأُرِيَ عَبْدُ اللهِ بْنُ زَيْدٍ الأَنْصَارِيُّ ﷺ، ثُمَّ مِنْ بَنِي الْحَارِثِ بْنِ الْخَزْرَجِ خَشَبَتَيْنِ فِي النَّوْمِ، فَقَالَ: إِنَّ هَاتَيْنِ لَنَحْوٌ مِمَّا يُرِيدُ رَسُولُ اللهِ ﷺ، فَقِيلَ: أَلاَ تُؤَذِّنُونَ لِلصَّلاَةِ؟ فَأَتَى رَسُولَ اللهِ ﷺ حِينَ اسْتَيْقَظَ، فَذَكَرَ لَهُ ذَلِكَ، فَأَمَرَ رَسُولُ اللهِ ﷺ بِالأَذَانِ[٢].

واتە: لە یەحیای کوڕی سەعیدەوە ﷺ گێڕدراوەتەوە گوتوویەتی: پێغەمبەری خوا ﷺ ویستی دوو پارچە دار دابنێت تا لێك بدرێن (بۆ ئەوەی وەك تەپڵ دەنگ دەربکات) تا خەڵکی کۆببنەوە بۆ نوێژ، جا عەبدوڵڵای کوڕی زەیدی ئەنصاری ﷺ کە لە نەوەکانی حاریسی کوڕی خەزرەجە، لە خەودا دوو پارچە دارەکەی پێ نیشان درا، ئەویش گوتی: ئەو دوو پارچە دارە هەمان ئەوەیە کە پێغەمبەری خوا ﷺ دەیەوێ، جا (هەر لە خەوەکە) پێی گوترا: بۆچی بانگ نادەن بۆ نوێژ؟ (چۆنییەتییەکەشی فێر کرا) جا کاتێ لە خەوەکەی خەبەری بۆیەوە هاتە لای پێغەمبەری خوا ﷺ و ئەوەی بۆ باسکرد، پێغەمبەری خواش ﷺ فەرمانی کرد بە بانگدان.

**١٧٣-** عَنْ أَبِي سَعِيدٍ الْخُدْرِيِّ ﷺ، أَنَّ رَسُولَ اللهِ ﷺ قَالَ: إِذَا سَمِعْتُمُ النِّدَاءَ فَقُولُوا مِثْلَ مَا يَقُولُ الْمُؤَذِّنُ[٣].

واتە: لە ئەبو سەعیدی خودرییەوە ﷺ گێڕدراوەتەوە (گوتوویەتی): پێغەمبەری خوا ﷺ فەرموویەتی: کاتێ گوێتان لە بانگ بوو بانگەکە بڵێنەوە وەك چۆن بانگبێژ دەیڵێت.

---

(١) ـ مَا جَاءَ فِي النِّدَاءِ لِلصَّلاَةِ.

(٢) ـ مرسل صحيح الإسناد. أخرجه أبو مصعب الزهري: ١٧٩ في النداء والصلاة؛ والحدثاني: ٦٩ في الصلاة، كلهم عن مالك به.

(٣) ـ صحيح. أخرجه أبو مصعب الزهري: ١٨٠ في النداء والصلاة؛ والشافعي: ١٣٠؛ وابن حنبل: ١١٠٣٣، وفي: ١١٥٢٢، وفي: ١١٥٢٢، وفي: ١١٧٥٩؛ والبخاري: ٦١١ في الأذان؛ ومسلم: الصلاة: ١٠؛ والنسائي: ٦٧٣ في الأذان؛ وأبو داود: ٥٢٢ في الصلاة؛ والترمذي: ٢٠٨ في الصلاة؛ وابن ماجه: ٧٠٥ في الأذان؛ وابن حبان: ١٦٨٦؛ وأبي يعلى الموصلي: ١١٨٩؛ والقابسي: ٧٧، كلهم عن مالك به.





**١٧٤-** عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ ﷺ، أَنَّ رَسُولَ اللهِ ﷺ قَالَ: لَوْ يَعْلَمُ النَّاسُ مَا فِي النِّدَاءِ وَالصَّفِّ الأَوَّلِ، ثُمَّ لَمْ يَجِدُوا إِلاَّ أَنْ يَسْتَهِمُوا عَلَيْهِ لاَسْتَهَمُوا، وَلَوْ يَعْلَمُونَ مَا فِي التَّهْجِيرِ لاَسْتَبَقُوا إِلَيْهِ، وَلَوْ يَعْلَمُونَ مَا فِي الْعَتَمَةِ وَالصُّبْحِ لأَتَوْهُمَا وَلَوْ حَبْوًا[١].

واتە: لە ئەبو هورەیرەوە ﷺ گێردراوەتەوە (گوتوویەتی): پێغەمبەری خوا ﷺ گوتوویەتی: ئەگەر خەڵك بیانزانیایە چ (پاداشتێك) لە بانگدان و ڕیزی یەكەمی نوێژدایە، دواتر دەستیان نەكەوتایە (بەهۆی ئەوەی هەموویان بەیەكەوە ئامادەبان و پێشبڕكێیان بكردایە و كارەكە یەكلا نەبووبایەوە) تەنها بەوە نەبێت كە تیروپشك بكەن، ئەوە تیروپشكیان دەكرد، وە ئەگەر بیانزانیایە چ (پاداشتێك) هەیە لە زوو ڕۆیشتن بۆ نوێژەكان و چاوەڕێكردنیان، ئەوە گشتیان ڕوویان دەكردە زوو ئامادە بوون، وە ئەگەر بیانزانیایە چ (پاداشتێك) لە نوێژی بە كۆمەڵدا هەیە لە نوێژی عیشا و بەیانیدا، ئەوە بۆی دەهاتن ئەگەر بە گاگۆڵەش بووایە (واتە ئەگەر بێهێز و نەخۆش و تەمبەڵیش بووانایە هەر خۆیان دەگەیاند پێی).

**١٧٥-** أَنَّ أَبَا هُرَيْرَةَ ﷺ يَقُولُ: قَالَ رَسُولُ اللهِ ﷺ: إِذَا ثُوِّبَ بِالصَّلاَةِ فَلاَ تَأْتُوهَا وَأَنْتُمْ تَسْعَوْنَ، وَأْتُوهَا وَعَلَيْكُمُ السَّكِينَةُ، فَمَا أَدْرَكْتُمْ فَصَلُّوا، وَمَا فَاتَكُمْ فَأَتِمُّوا، فَإِنَّ أَحَدَكُمْ فِي صَلاَةٍ مَا كَانَ يَعْمِدُ إِلَى الصَّلاَةِ[٢].

واتە: ئەبو هورەیرە ﷺ دەیگوت: پێغەمبەری خوا ﷺ فەرموویەتی: كاتێ قامەت كرا بۆ نوێژ (بە هەر شێوەیەك دەتانزانی كاتی قامەتە و هێشتا لە ماڵ یان لە ڕێگا بوون، جا بە پیادەبوون یان بە سواری یان بە سەیارە) ئەوە بەپەلەكردن بۆی مەیەن (چونكە پەلەكردن لە شەیتانەوەیە)، بەڵكوو بۆی وەرن لە كاتێكدا هێمنایەتیتان

---

(١) ـ صحيح. أخرجه أبو مصعب الزهري: ١٨١ في النداء والصلاة؛ والحدثاني: ٧٠ في الصلاة؛ وابن حنبل: ٧٢٢٥، وفي: ٧٧٢٤، وفي: ٨٠٠٩، وفي: ٨٨٥٩؛ والبخاري: ٦١٥ في الأذان، وفي: ٧٢٠ في الأذان: ٧٢، وفي: ٢٦٨٩ في الشهادات؛ ومسلم: الصلاة: ١٢٩؛ والنسائي: ٥٤٠ في المواقيت، وفي: ٦٧١ في الأذان؛ والترمذي: ٢٢٥ في الصلاة؛ وابن حبان: ١٦٥٩، وفي: ٢١٥٣، كلهم عن مالك به.

(٢) ـ صحيح. أخرجه أبو مصعب الزهري: ١٨٢ في النداء والصلاة؛ والحدثاني: ٧١ في الصلاة؛ والشيباني: ٩٣ في الصلاة؛ وابن حنبل: ٧٢٢٩، وفي: ٩٩٣٢، وفي: ٩٩٣٢، وفي: ١٠٨٥٩؛ وابن حبان: ٢١٤٨؛ وشرح معاني الآثار: ٢٣١٨؛ والقابسي: ١٣٥، كلهم عن مالك به.

پێوە دیار بێ، ئەوەی پێی گەیشتن (لە نوێژەکەدا لەگەڵ ئیمام) ئەوە ئەنجامی بدەن، ئەوەی لێشتان فەوتا (دوای سەلامدانەوەی ئیمام) تەواوی بکەن، چونکە هەر یەکێك لە ئێوە لە نوێژدایە (واتە پاداشتی نوێژی بۆ هەیە هەرچەندە لە ڕێگا و ماڵەوە بێت) مادەم مەبەستی وایە بچێتە شوێنی نوێژی بەکۆمەڵ و نوێژەکەی لەوێ ئەنجام بدات (کەواتە پێویست بە پەلە ناکات، پاداشتەکە بەدەست دێت و تووشی حاڵەتی نەخوازراویش نابن)[1].

**١٧٦- عَنْ عَبْدِ الرَّحْمَنِ بْنِ عَبْدِ اللهِ بْنِ عَبْدِ الرَّحْمَنِ بْنِ أَبِي صَعْصَعَةَ الأَنْصَارِيِّ، ثُمَّ الْمَازِنِيِّ ﷺ، عَنْ أَبِيهِ، أَنَّهُ أَخْبَرَهُ، أَنَّ أَبَا سَعِيدٍ الْخُدْرِيَّ ﷺ قَالَ لَهُ: إِنِّي أَرَاكَ تُحِبُّ الْغَنَمَ وَالْبَادِيَةَ، فَإِذَا كُنْتَ فِي غَنَمِكَ، أَوْ بَادِيَتِكَ، فَأَذَّنْتَ بِالصَّلاَةِ، فَارْفَعْ صَوْتَكَ بِالنِّدَاءِ، فَإِنَّهُ لاَ يَسْمَعُ مَدَى صَوْتِ الْمُؤَذِّنِ جِنٌّ، وَلاَ إِنْسٌ، وَلاَ شَيْءٌ، إِلاَّ شَهِدَ لَهُ يَوْمَ الْقِيَامَةِ.**

**قَالَ أَبُو سَعِيدٍ ﷺ: سَمِعْتُهُ مِنْ رَسُولِ اللهِ ﷺ[2].**

واتە: لە عەبدوڕڕەحمانی کوڕی عەبدوڵلای کوڕی عەبدوڕڕەحمانی کوڕی ئەبو صەعصەعەی ئەنصاری مازینییەوە ﷺ گێڕدراوەتەوە، ئەویش لە باوکیەوە گێڕاویەتەوە پێی ڕاگەیاندووە بەوەی ئەبو سەعیدی خودریی ﷺ پێی گوتووە: من دەتبینم حەزت لە مەڕوماڵات و دەشتە، جا ئەگەر لەناو مەڕوماڵاتەکەت بووی یان لەناو دەشتەکەت بووی (کە ئاژەڵەکانتی تیا دەلەوەڕێنی)، جا بۆخۆت بانگت دا بۆ نوێژ، ئەوە دەنگت بەرز بکە لە بانگدانەکەدا، چونکە هیچ یەکێك نییە لە جنۆکە و مرۆڤ (ی بڕوادار) و هەر شتێکی دیکە (لە گیانلەبەر و بێگیان) بەدرێژایی دەنگی بانگبێژ گوێبیستی بانگدانەکە بێت و دەنگی بانگەکە بەسەریدا تێپەڕ بێت حەتمەن لە ڕۆژی دواییدا شایەتی بۆ دەدات.

---

(١) ـ تێبینی: لەو فەرموودەیە ئەوەمان بۆ دەردەکەوێ، کە لە کاتی چوون بۆ نوێژ کە لە گەورەترین عیبادەتەکانە، لەو کاتەشدا ئاگاداری ڕەوشتە جوانەکان بین و فەرامۆشیان نەکەین، کە یەکێك لە ڕەوشتە جوانەکان هێمنی و ویقارِ و سەکینەت و لەسەرەخۆییە.

(٢) ـ صحيح. أخرجه أبو مصعب الزهري: ١٨٣ في النداء والصلاة؛ والحدثاني: ٧٢ في الصلاة؛ والشافعي: ١٢٨؛ وابن حنبل: ١١٣٢٣، وفي: ١١٤١١، وفي: ١١٤١١؛ والبخاري: ٦٠٩ في الأذان، وفي: ٣٢٩٦ في بدء الخلق، وفي: ٧٥٤٨ في التوحيد؛ والنسائي: ٦٤٤ في الأذان؛ وابن حبان: ١٦٦١؛ والقابسي: ٣٩٢، كلهم عن مالك به.

ئەبو سەعید ﷺ گوتوویەتی: لە پێغەمبەری خوام ﷺ بیستووە.

**١٧٧-** عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ ﷺ، أَنَّ رَسُولَ اللهِ ﷺ قَالَ: إِذَا نُودِيَ لِلصَّلاَةِ أَدْبَرَ الشَّيْطَانُ لَهُ ضُرَاطٌ، حَتَّى لاَ يَسْمَعَ النِّدَاءَ، فَإِذَا قُضِيَ النِّدَاءُ، أَقْبَلَ حَتَّى إِذَا ثُوِّبَ بِالصَّلاَةِ أَدْبَرَ، حَتَّى إِذَا قُضِيَ التَّثْوِيبُ أَقْبَلَ، حَتَّى يَخْطِرَ بَيْنَ الْمَرْءِ وَنَفْسِهِ، يَقُولُ: اذْكُرْ كَذَا، وَاذْكُرْ كَذَا، لِمَا لَمْ يَكُنْ يَذْكُرُ، حَتَّى يَظَلَّ الرَّجُلُ إِنْ يَدْرِي كَمْ صَلَّى[1].

واتە: لە ئەبو هورەیرەوە ﷺ گێردراوەتەوە (گوتوویەتی): پێغەمبەری خوا ﷺ فەرموویەتی: کاتێ بانگ دەدرێت بۆ نوێژ شەیتان پشت هەڵدەکات و ڕادەکات و با لە خۆی بەردەدات تا (بەهۆی دەنگی زۆری بایەکەی دامێنی) گوێبیستی بانگ نەبێ، جا کاتێ بانگ تەواو دەبێت دەگەڕێتەوە (بۆ وەسوەسە دروست کردن و لەخشتەبردنی نوێژخوێنان) تا ئەو کاتەی قامەت دەکرێ، (جا کە قامەت کرا) دووبارە هەڵدێ، تا ئەو کاتەی قامەت تەواو دەبێ، ئینجا دەگەڕێتەوە تاوەکوو خەیاڵ بۆ نوێژخوێنان دروست بکات و دەڵێت: فڵان شت و فڵان شتت بێتەوە یاد، شتانێکی دێنێتەوە یاد کە لە یادی نەبووە، تا نوێژخوێن وا لێ دەکا نازانێ چەند ڕکاتی کردووە.

**١٧٨-** عَنْ سَهْلِ بْنِ سَعْدٍ السَّاعِدِيِّ ﷺ أَنَّهُ قَالَ: سَاعَتَانِ يُفْتَحُ لَهُمَا أَبْوَابُ السَّمَاءِ، وَقَلَّ دَاعٍ تُرَدُّ عَلَيْهِ دَعْوَتُهُ: حَضْرَةُ النِّدَاءِ لِلصَّلاَةِ، وَالصَّفُّ فِي سَبِيلِ اللهِ[2].

واتە: لە سەهلی کوڕی سەعدی ساعیدییەوە ﷺ گێردراوەتەوە گوتوویەتی: دوو کات هەن دەرگاکانی ئاسمانیان بۆ دەکرێتەوە و کەم نزاکار هەیە دوعا و نزاکەی (لەم دوو کاتەدا) ڕەت بکرێتەوە (دوو کاتەکانیش ئەمانەن): کاتی بانگدان بۆ نوێژ و کاتی ڕیزبوون بۆ جیهاد لە پێناوی خوا ﷻ.

---

(١) ـ صحيح. أخرجه أبو مصعب الزهري: ١٨٤ في النداء والصلاة؛ والحدثاني: ٧٣ في الصلاة؛ وابن حنبل: ٩٩٣٣؛ والبخاري: ٦٠٨ في الأذان؛ والنسائي: ٦٧٠ في الأذان؛ وأبو داود: ٥١٦ في الصلاة؛ وابن حبان: ١٧٥٤؛ والقابسي: ٣٢٤، كلهم عن مالك به.

(٢) ـ صحيح. أخرجه أبو مصعب الزهري: ١٨٥ في النداء والصلاة؛ وابن حبان: ١٧٢٠، وفي: ١٧٦٤؛ ومصنف ابن أبي شيبة: ٢٩٢٣٣ في الدعاء، كلهم عن مالك به.




١٧٩- **[فتوى]** وَسُئِلَ مَالِكٌ ﷺ عَنِ النِّدَاءِ يَوْمَ الْجُمُعَةِ، هَلْ يَكُونُ قَبْلَ أَنْ يَحِلَّ الْوَقْتُ؟ فَقَالَ: لاَ يَكُونُ إِلاَّ بَعْدَ أَنْ تَزُولَ الشَّمْسُ(١).

(فەتوا): ئیمامی مالیك ﷺ پرسیاری لێکرا دەربارەی بانگدان لە ڕۆژی هەینی، کە ئاخۆ دروستە پێش ئەوەی کاتی نیوەڕۆ بێت؟ ئەویش گوتی: نابێت تەنها دوای ئەوە نەبێت کە خۆر لە ناوەڕاستی ئاسمان لادەدات(٢).

١٨٠- **[فتوى]** وَسُئِلَ مَالِكٌ ﷺ عَنْ تَثْنِيَةِ الأَذَانِ وَالإِقَامَةِ، وَمَتَى يَجِبُ الْقِيَامُ عَلَى النَّاسِ حِينَ تُقَامُ الصَّلاَةُ؟ فَقَالَ: لَمْ يَبْلُغْنِي فِي النِّدَاءِ وَالإِقَامَةِ إِلاَّ مَا أَدْرَكْتُ النَّاسَ عَلَيْهِ، فَأَمَّا الإِقَامَةُ، فَإِنَّهَا لاَ تُثَنَّى، وَذَلِكَ الَّذِي لَمْ يَزَلْ عَلَيْهِ أَهْلُ الْعِلْمِ بِبَلَدِنَا، وَأَمَّا قِيَامُ النَّاسِ حِينَ تُقَامُ الصَّلاَةُ، فَإِنِّي لَمْ أَسْمَعْ فِي ذَلِكَ بِحَدٍّ يُقَامُ لَهُ، إِلاَّ أَنِّي أَرَى ذَلِكَ عَلَى قَدْرِ طَاقَةِ النَّاسِ، فَإِنَّ مِنْهُمُ الثَّقِيلَ وَالْخَفِيفَ، وَلاَ يَسْتَطِيعُونَ أَنْ يَكُونُوا كَرَجُلٍ وَاحِدٍ(٣).

(فەتوا): ئیمامی مالیك ﷺ پرسیاری لێکرا دەربارەی گوتنی ڕستەکانی بانگ و قامەت بە دوو دوو، وە دەربارەی ئەوەی کەی واجبە لەسەر خەڵکی هەڵسن کاتێ قامەتی نوێژ دەکرێت؟ ئەویش گوتی: هیچم پێ نەگەیشتووە دەربارەی بانگ و قامەت تەنها ئەوە نەبێ کە زانایانم بینیوە لەسەری ڕۆیشتوون (کە بریتییە لە گوتنی ڕستەکانی بانگ بە دوو دوو) و، هەرچی قامەتیشە بە دوو دوو ناگوترێ، ئەوەش ئەو شێوازەیە کە بەردەوام خەڵکی خاوەنی زانست لەسەری ڕۆیشتوون لە شارەکەمان (مەدینە)، وە هەرچی دەربارەی هەڵسانی خەڵکیشە کاتێ قامەت دەکرێ، من دەربارەی ئەوە هیچ سنوورێکم نەبیستووە کە بخوازێ خەڵك لەو کاتە هەڵسن، بەڵام من پێم وایە ئەوە دەگەڕێتەوە بۆ تاقەت و هێزی خەڵکەکە، چونکە

---

(١) ـ أخرجه أبو مصعب الزهري: ١٨٨ في النداء والصلاة، عن مالك به.

(٢) ـ تێبینی: لەلای زۆربەی زانایان (رحمهم الله) دەستپێکردنی کاتی هەینی بریتییە لە لادانی خۆر بەرەو خۆرئاوا وەك نیوەڕۆ، هیچ جیاوازی نییە، کەواتە لای ئەوان دروست نییە بەر لەو کاتە بانگ بدرێ، بەڵام لە لای ئیمامی ئەحمەد (رحمه الله) دەستپێکردنی هەینی پێش لادانی خۆر لە ناوەڕاستی ئاسمان دروستە، واتە تۆزێك پێشی ئەو کاتە لای ئەو دروستە بانگ بدرێت.

(٣) ـ أخرجه أبو مصعب الزهري: ١٨٦ في النداء والصلاة؛ والحدثاني: ٣٦٢ب في الطلاق، عن مالك به.





تیایاندایە لە هەڵساندا قورس و گرانە و تیاشیاندایە سوکەڵەیە، گشتیان ناتوانن وەك یەك كەس بن (لە هەڵساندا).

**١٨١- [فتوى] وَسُئِلَ مَالِكٌ ﷺ عَنْ قَوْمٍ حُضُورٍ أَرَادُوا أَنْ يَجْمَعُوا الْمَكْتُوبَةَ، فَأَرَادُوا أَنْ يُقِيمُوا وَلاَ يُؤَذِّنُوا؟ قَالَ مَالِكٌ ﷺ: ذَلِكَ مُجْزِئٌ عَنْهُمْ، وَإِنَّمَا يَجِبُ النِّدَاءُ فِي مَسَاجِدِ الْجَمَاعَاتِ الَّتِي تُجْمَعُ فِيهَا الصَّلاَةُ[١].**

(فەتوا): ئیمامی مالیك ﷺ پرسیاری لێکرا دەربارەی خەڵکانێکی ئامادەبوو (لە شوێنێکی جگە لە مزگەوت، وەك بازار، شوێنی کار، کێلگە ... هتد)، ویستیان نوێژی فەرز بە جەماعەت بکەن، جا ویستیان قامەت بکەن و بانگ نەدەن (ئایا دروستە)؟ ئیمامی مالیك ﷺ گوتوویەتی: بۆیان دروستە، چونکە بانگدان تەنها لەو مزگەوتانەی نوێژیان بە جەماعەت تێدا دەکرێت پێویستە (بۆ بەجێهێنانی سوننەتی موئەککەدە و بانگکردنی خەڵکیە بۆ نوێژی بەکۆمەڵ).

**١٨٢- [فتوى] وَسُئِلَ مَالِكٌ ﷺ عَنْ تَسْلِيمِ الْمُؤَذِّنِ عَلَى الإِمَامِ، وَدُعَائِهِ إِيَّاهُ لِلصَّلاَةِ، وَمَنْ أَوَّلُ مَنْ سُلِّمَ عَلَيْهِ؟ فَقَالَ: لَمْ يَبْلُغْنِي أَنَّ التَّسْلِيمَ كَانَ فِي الزَّمَانِ الأَوَّلِ[٢].**

(فەتوا): ئیمامی مالیك ﷺ پرسیاری لێکرا دەربارەی سەلامکردنی بانگبێژ لە ئیمام، وە بانگکردنی ئیمام لەلایەن بانگبێژەوە، وە کێ سەرەتا سەلامی لێ دەکرێ؟ ئەویش گوتی: پێم نەگەیشتووە سەلامکردن لە سەردەمی هاوەڵان هەبووبێ (بەشێوەیەك بانگبێژ سەلامی لە ئیمام کردبێ).

**١٨٣- [فتوى] قَالَ يَحْيَى ﷺ: وَسُئِلَ مَالِكٌ ﷺ عَنْ مُؤَذِّنٍ أَذَّنَ لِقَوْمٍ، ثُمَّ انْتَظَرَ هَلْ يَأْتِيهِ أَحَدٌ؟ فَلَمْ يَأْتِهِ أَحَدٌ، فَأَقَامَ الصَّلاَةَ، وَصَلَّى وَحْدَهُ، ثُمَّ جَاءَ النَّاسُ بَعْدَ أَنْ فَرَغَ، أَيُعِيدُ الصَّلاَةَ مَعَهُمْ؟ قَالَ: لاَ يُعِيدُ الصَّلاَةَ، وَمَنْ جَاءَ بَعْدَ انْصِرَافِهِ، فَلْيُصَلِّ لِنَفْسِهِ وَحْدَهُ[٣].**

---

(١) ـ أخرجه أبو مصعب الزهري: ١٨٩ في النداء والصلاة، عن مالك به.

(٢) ـ أخرجه أبو مصعب الزهري: ١٩٠ في النداء والصلاة، عن مالك به.

(٣) ـ أخرجه أبو مصعب الزهري: ١٩٢ في النداء والصلاة، عن مالك به.




(فەتوا): یەحیا ﷺ گوتوویەتی: ئیمامی مالیك ﷺ پرسیاری لێکرا دەربارەی بانگبێژێك کە بانگ بدات بۆ خەڵکانێك (لێرەدا مەبەست بە بانگبێژ ئیمامی ڕەسمییە کاتێ خۆی بانگ بدات)، دواتر چاوەڕێ بکات بزانێ کەس دێت بۆ لای (بۆ نوێژکردن)، جا کەس نەهات بۆ لای و قامەتی بۆ نوێژ کرد و بەتەنها نوێژی کرد، دواتر خەڵك هاتن دوای ئەوەی ئەو تەواو بوو، ئایا نوێژەکە لەگەڵ ئەوان دووبارە دەکاتەوە؟ گوتی: نوێژەکە دووبارە ناکاتەوە، هەر کەسێك دوای تەواوبوونی ئەو هات با بە تەنها نوێژ بکات (چونکە دروست نییە کەس لە شوێنی ئیمامی ڕەسمی پێشنوێژی بکات)[1].

**١٨٤- [فتوى]** قَالَ يَحْيَى ﷺ: وَسُئِلَ مَالِكٌ ﷺ عَنْ مُؤَذِّنٍ أَذَّنَ لِقَوْمٍ، ثُمَّ تَنَفَّلَ، فَأَرَادُوا أَنْ يُصَلُّوا بِإِقَامَةِ غَيْرِهِ؟ فَقَالَ: لاَ بَأْسَ بِذَلِكَ، إِقَامَتُهُ وَإِقَامَةُ غَيْرِهِ سَوَاءٌ[2].

(فەتوا): یەحیا ﷺ گوتوویەتی: ئیمامی مالیك ﷺ پرسیاری لێکراوە دەربارەی بانگبێژێك کە بۆ خەڵکانێك بانگ بدات، دواتر دەست بە نوێژی سوننەت بکات و (کاتی قامەت بێت) جا خەڵکەکە ویستیان نوێژ بکەن بە قامەتکردنی کەسێکی جگە لە بانگبێژەکەی بانگی داوە (ئایا دروستە)؟ ئەویش گوتی: هیچ کێشەیەکی نییە، قامەتکردنی بانگبێژەکە و قامەتکردنی غەیری ئەو وەکو یەکە.

**١٨٥- [فتوى]** قَالَ يَحْيَى ﷺ: قَالَ مَالِكٌ ﷺ: لَمْ تَزَلِ الصُّبْحُ يُنَادَى لَهَا قَبْلَ الْفَجْرِ، فَأَمَّا غَيْرُهَا مِنَ الصَّلَوَاتِ، فَإِنَّا لَمْ نَرَهَا يُنَادَى لَهَا، إِلاَّ بَعْدَ أَنْ يَحِلَّ وَقْتُهَا[3].

(فەتوا): یەحیا ﷺ گوتوویەتی: ئیمامی مالیك ﷺ گوتوویەتی: بەردەوام بۆ نوێژی بەیانی بانگ دەدرێت پێش کاتی بەیانی (تا خەڵك بۆ شەونوێژ خەبەریان ببێتەوە)، بەڵام هەرچی نوێژەکانی دیکەی جگە لە نوێژی بەیانییە، ئەوە ئێمە پێمان وا نییە دروست بێت پێش کاتی خۆی بانگی بۆ بدرێ، تەنها دوای هاتنی کاتەکەی نەبێت.

---

(١) ـ تێبینی: بەڵام لەلای ئیمامی شافعی دروستە و کێشەی نیە.

(٢) ـ أخرجه أبو مصعب الزهري: ١٩١ في النداء والصلاة، عن مالك به.

(٣) ـ أخرجه أبو مصعب الزهري: ١٨٧ في النداء والصلاة؛ وفي: ٢٠٣ في النداء والصلاة، عن مالك به.

١٨٦- عَنْ مَالِكٍ ﷺ؛ أَنَّهُ بَلَغَهُ، أَنَّ الْمُؤَذِّنَ جَاءَ إِلَى عُمَرَ بْنِ الْخَطَّابِ ﷺ يُؤْذِنُهُ لِصَلَاةِ الصُّبْحِ، فَوَجَدَهُ نَائِمًا، فَقَالَ: الصَّلَاةُ خَيْرٌ مِنَ النَّوْمِ، فَأَمَرَهُ عُمَرُ أَنْ يَجْعَلَهَا فِي نِدَاءِ الصُّبْحِ[١].

واتە: لە ئیمامی مالیکەوە ﷺ گێڕدراوەتەوە پێی گەیشتووە جارێکیان بانگبێژ هاتووە بۆ لای عومەری کوڕی خەتتاب ﷺ تا بانگی بکات بۆ نوێژی بەیانی، جا بە خەوتوویی بینی و گوتی: (الصَّلَاةُ خَيْرٌ مِنَ النَّوْمِ) نوێژ چاکترە لە خەو، ئیمامی عومەریش ﷺ فەرمانی پێکرد ئەم ڕستەیە بخاتە ناو بانگدانی نوێژی بەیانییەوە.

١٨٧- عَنْ مَالِكٍ ﷺ، عَنْ عَمِّهِ أَبِي سُهَيْلِ بْنِ مَالِكٍ ﷺ، عَنْ أَبِيهِ ﷺ أَنَّهُ قَالَ: مَا أَعْرِفُ شَيْئًا مِمَّا أَدْرَكْتُ عَلَيْهِ النَّاسَ، إِلاَّ النِّدَاءَ بِالصَّلَاةِ[٢].

واتە: لە ئیمامی مالیکەوە ﷺ گێڕدراوەتەوە، ئەویش لە مامیەوە سوهەیلی کوڕی مالیکەوە ﷺ گێراویەتەوە، ئەویش لە باوکیەوە ﷺ گێراویەتەوە گوتوویەتی: ئێستا شتێك ناناسمەوە لەوەی هاوەڵان لەسەری بوون (گشتی گۆڕاوە) جگە لە بانگدان بۆ نوێژ (ئەویان وەکوو خۆی ماوە).

١٨٨- عَنْ نَافِعٍ ﷺ، أَنَّ عَبْدَ اللهِ بْنَ عُمَرَ ﷺ سَمِعَ الإِقَامَةَ وَهُوَ بِالْبَقِيعِ، فَأَسْرَعَ الْمَشْيَ إِلَى الْمَسْجِدِ[٣].

واتە: لە نافیعەوە ﷺ گێڕدراوەتەوە (گوتوویەتی): عەبدوڵڵای کوڕی عومەر ﷺ گوێبیستی قامەت بوو لە کاتێکدا لە بەقیع بوو، جا هەنگاوەکانی خێرا کرد بۆ چوونە مزگەوت (بەڵام پەلەپەل و ڕاکەڕاکەی نەکرد).

---

(١) ـ ضعيف. أخرجه أبو مصعب الزهري: ١٩٣ في النداء والصلاة، عن مالك به.

(٢) ـ مقطوع صحيح. أخرجه أبو مصعب الزهري: ١٩٤ في النداء والصلاة؛ والشيباني: ٩٦٩ في العتاق، عن مالك به.

(٣) ـ صحيح. أخرجه أبو مصعب الزهري: ١٩٥ في النداء والصلاة؛ والحدثاني: ٧٤ في الصلاة؛ والشيباني: ٩٤ في الصلاة، كلهم عن مالك به.

## ٢- بانگدان لە سەفەر و بانگدان بەبێ دەستنوێژ[(١)]

١٨٩- عَنْ نَافِعٍ ﷺ، أَنَّ عَبْدَ اللهِ بْنَ عُمَرَ ﷺ أَذَّنَ بِالصَّلاَةِ فِي لَيْلَةٍ ذَاتِ بَرْدٍ وَرِيحٍ، فَقَالَ: أَلاَ صَلُّوا فِي الرِّحَالِ، ثُمَّ قَالَ: إِنَّ رَسُولَ اللهِ ﷺ كَانَ يَأْمُرُ الْمُؤَذِّنَ، إِذَا كَانَتْ لَيْلَةٌ بَارِدَةٌ ذَاتُ مَطَرٍ يَقُولُ: أَلاَ صَلُّوا فِي الرِّحَالِ[(٢)].

واتە: لە نافیعەوە ﷺ گێڕدراوەتەوە (گوتوویەتی): عەبدوڵڵای کوڕی عومەر ﷺ ـ لە سەفەرێکدا ـ لە شەوێکی سارد کە بای دەهات بانگی دا بۆ نوێژ و گوتی: ئاگاداربن لەناو بارگە و شوێنەکانی خۆتان نوێژ بکەن، دواتر گوتی: پێغەمبەری خوا ﷺ فەرمانی بە بانگبێژ کردووە ئەگەر شەوێکی سارد و باراناوی بوو بڵێت: ئاگاداربن لە شوێنەکانتان نوێژ بکەن (مەیەن بۆ جەماعەت).

١٩٠- عَنْ نَافِعٍ ﷺ، أَنَّ عَبْدَ اللهِ بْنَ عُمَرَ ﷺ كَانَ لاَ يَزِيدُ عَلَى الإِقَامَةِ فِي السَّفَرِ إِلاَّ فِي الصُّبْحِ، فَإِنَّهُ كَانَ يُنَادِي فِيهَا، وَيُقِيمُ، وَكَانَ يَقُولُ: إِنَّمَا الأَذَانُ لِلإِمَامِ الَّذِي يَجْتَمِعُ النَّاسُ إِلَيْهِ[(٣)].

واتە: لە نافیعەوە ﷺ گێڕدراوەتەوە (گوتوویەتی): عەبدوڵڵای کوڕی عومەر ﷺ هەموو جار لە سەفەردا لە قامەت زیاتری نەدەکرد جگە لە نوێژی بەیانی، تیایدا بانگی دەدا و قامەتی دەکرد، دەیگوت: بانگدان تەنها بۆ نوێژی ئەو ئیمامەیە کە خەڵك بەردەوام لەلای کۆدەبنەوە بۆ نوێژی جەماعەت.

١٩١- عَنْ هِشَامِ بْنِ عُرْوَةَ ﷺ، أَنَّ أَبَاهُ قَالَ لَهُ: إِذَا كُنْتَ فِي سَفَرٍ، فَإِنْ شِئْتَ أَنْ تُؤَذِّنَ وَتُقِيمَ فَعَلْتَ، وَإِنْ شِئْتَ فَأَقِمْ وَلاَ تُؤَذِّنْ[(٤)].

---

(١) ـ النِّدَاءُ فِي السَّفَرِ وَعَلَى غَيْرِ وُضُوءٍ.

(٢) ـ صحيح. أخرجه أبو مصعب الزهري: ١٩٦ في النداء والصلاة؛ والحدثاني: ٧٥ في الصلاة؛ والشيباني: ١٨٦ في الصلاة؛ والشافعي: ١٢٩؛ وفي: ٢١٩؛ وابن حنبل: ٥٣٠٢؛ والبخاري: ٦٦٦ في الأذان؛ ومسلم: المسافرين: ٢٢؛ والنسائي: ٦٥٤ في الأذان؛ وأبو داود: ١٠٦٣ في الجمعة؛ وابن حبان: ٢٠٧٨؛ والقابسي: ١٩٨، كلهم عن مالك به.

(٣) ـ صحيح. أخرجه أبو مصعب الزهري: ١٩٧ في النداء والصلاة؛ والحدثاني: ٧٥ أ في الصلاة، عن مالك به.

(٤) ـ مقطوع صحيح. أخرجه أبو مصعب الزهري: ١٩٨ في النداء والصلاة؛ والحدثاني: ٧٦ في الصلاة، عن مالك به.

واتە: لە هیشامی کوڕی عورۆەوە ﷺ گێڕدراوەتەوە بەوەی باوکی پێی گوتووە: ئەگەر لە سەفەرێکدا بووی، ئەگەر ویستت بانگ بدەیت و قامەت بکەیت ئەوە بیکە (دروستە)، وە ئەگەر ویستت قامەت بکە و بانگ مەدە (ئەوەشیان دروستە).

**١٩٢-** قَالَ يَحْيَى ﷺ: سَمِعْتُ مَالِكاً ﷺ يَقُولُ: لاَ بَأْسَ أَنْ يُؤَذِّنَ الرَّجُلُ وَهُوَ رَاكِبٌ.

واتە: یەحیا ﷺ گوتوویەتی: گوێم لە ئیمامی مالیك ﷺ بوو دەیگوت: کێشە نییە مرۆڤ بانگ بدات لە کاتێکدا بەسوارییە (بەسەر وڵاغەوەیە).

**١٩٣-** عَنْ سَعِيدِ بْنِ الْمُسَيَّبِ ﷺ أَنَّهُ كَانَ يَقُولُ: مَنْ صَلَّى بِأَرْضِ فَلاَةٍ، صَلَّى عَنْ يَمِينِهِ مَلَكٌ، وَعَنْ شِمَالِهِ مَلَكٌ، فَإِذَا أَذَّنَ وَأَقَامَ الصَّلاَةَ أَوْ أَقَامَ، صَلَّى وَرَاءَهُ مِنَ الْمَلاَئِكَةِ أَمْثَالُ الْجِبَالِ[١].

واتە: لە سەعیدی کوڕی موسەیەبەوە ﷺ گێڕدراوەتەوە، دەیگوت: هەر کەسێك لە شوێنێکی چۆڵ نوێژ بکات، فریشتەیەك لەلای ڕاستیەوە لەگەڵی نوێژ دەکات و فریشتەیەکیش لەلای چەپ، جا ئەگەر بانگی دا و قامەتی بۆ نوێژ کرد، یان تەنها قامەتی کرد، فریشتەی زۆری مەزنی بەقەد کێو لەدواوەی نوێژ دەکەن.

### ٣- ئەندازەی کاتی پارشێو لە بانگدانی یەکەمەوە[٢]

**١٩٤-** عَنْ عَبْدِ اللهِ بْنِ عُمَرَ ﷺ: أَنَّ رَسُولَ اللهِ ﷺ قَالَ: إِنَّ بِلاَلاً يُنَادِي بِلَيْلٍ، فَكُلُوا وَاشْرَبُوا حَتَّى يُنَادِيَ ابْنُ أُمِّ مَكْتُومٍ[٣].

واتە: لە عەبدوڵڵای کوڕی عومەرەوە ﷺ گێڕدراوەتەوە (گوتوویەتی): پێغەمبەری خوا ﷺ فەرموویەتی: بیلال بە شەو بانگ دەدات (واتە ماوەیەك پێش

---

(١) ـ مقطوع صحيح. أخرجه أبو مصعب الزهري: ١٩٩ في النداء والصلاة؛ والحدثاني: ٧٦ أ في الصلاة، عن مالك به.

(٢) ـ قَدْرُ السُّحُورِ مِنَ النِّدَاءِ.

(٣) ـ صحيح. أخرجه أبو مصعب الزهري: ٢٠١ في النداء والصلاة؛ وفي: ٧٧٠ في الصيام؛ والحدثاني: **٧٧ في** الصلاة؛ وفي: ٤٥٤ أ في الصيام؛ والشيباني: ٣٤٧ في الصيام؛ وابن حنبل: ٥٣١٦؛ والبخاري: ٦٢٠ في **الأذان؛** والنسائي: ٦٣٧ في الأذان؛ والقابسي: ٢٨١، كلهم عن مالك به.

کاتی بەیانی بانگ دەدات بۆ هەڵسان بۆ شەونوێژ)، جا (ئەگەر ویستتان پارشێو بخۆن و بەڕۆژوو بن) بخۆن و بخۆنەوە تا ئیبنو ئوم مەکتوم بانگ دەدات.

**١٩٥- عَنْ سَالِمِ بْنِ عَبْدِ اللهِ ﷺ، أَنَّ رَسُولَ اللهِ ﷺ قَالَ: إِنَّ بِلاَلاً يُنَادِي بِلَيْلٍ، فَكُلُوا وَاشْرَبُوا حَتَّى يُنَادِيَ ابْنُ أُمِّ مَكْتُومٍ، قَالَ: وَكَانَ ابْنُ أُمِّ مَكْتُومٍ رَجُلاً أَعْمَى، لاَ يُنَادِي حَتَّى يُقَالَ لَهُ: أَصْبَحْتَ، أَصْبَحْتَ[1].**

واتە: لە سالمی کوڕی عەبدوڵڵاوە ﷺ گێڕدراوەتەوە (گوتوویەتی): پێغەمبەری خوا ﷺ فەرموویەتی: بیلال بە شەو بانگ دەدات (واتە ماوەیەك پێش کاتی بەیانی بۆ خەبەربوونەوە بۆ شەونوێژ)، جا بخۆن و بخۆنەوە تا ئیبنو ئوم مەکتوم بانگ دەدات، عەبدوڵڵا ﷺ دەڵێ: جا ئیبنو ئوم مەکتوم پیاوێکی نابینا بوو، بانگی نەدەدا تا پێی دەگوترا: خەریکە بکەوێتە ناو بەیانییەوە، خەریکە بکەوێتە ناو بەیانییەوە (هەڵسە بانگ بدە).

## ٤- دەستپێکردنی نوێژ[2]

**١٩٦- عَنْ عَبْدِ اللهِ بْنِ عُمَرَ ﷺ؛ أَنَّ رَسُولَ اللهِ ﷺ كَانَ إِذَا افْتَتَحَ الصَّلاَةَ، رَفَعَ يَدَيْهِ حَذْوَ مَنْكِبَيْهِ، وَإِذَا رَفَعَ رَأْسَهُ مِنَ الرُّكُوعِ، رَفَعَهُمَا كَذَلِكَ أَيْضًا، وَقَالَ: سَمِعَ اللهُ لِمَنْ حَمِدَهُ، رَبَّنَا وَلَكَ الْحَمْدُ، وَكَانَ لاَ يَفْعَلُ ذَلِكَ فِي السُّجُودِ[3].**

واتە: لە عەبدوڵڵای کوڕی عومەرەوە ﷺ گێڕدراوەتەوە (گوتوویەتی): پێغەمبەری خوا ﷺ هەموو جار کاتێ دەستی بە نوێژ دەکرد، دەستەکانی تا ڕاستی

---

(١) ـ صحيح. أخرجه أبو مصعب الزهري: ٢٠٢ في النداء والصلاة؛ وفي: ٧٦٩ في الصيام؛ والحدثاني: ٧٧ أ في الصلاة؛ وفي: ٤٥٤ في الصيام؛ والشيباني: ٣٤٨ في الصيام؛ والشافعي: ١٢٠؛ والبخاري: ٦١٧ في الأذان؛ وابن حبان: ٣٤٦٩؛ وشرح معاني الآثار: ٨٤٥، كلهم عن مالك به.

(٢) ـ افْتِتَاحُ الصَّلَاةِ.

(٣) ـ صحيح. أخرجه أبو مصعب الزهري: ٢٠٤ في النداء والصلاة؛ والشيباني: ٩٩ في الصلاة؛ والشافعي: ١٠٢٧؛ وابن حنبل: ٤٦٧٤، وفي: ٥٢٧٩؛ والبخاري: ٧٣٥ في الأذان؛ والنسائي: ٨٧٨ في الافتتاح، وفي: ١٠٥٧ في التطبيق، وفي: ١٠٥٩ في التطبيق؛ وابن حبان: ١٨٦١؛ والدارمي: ١٣٠٨ في الأذان؛ وأبي يعلى الموصلي: ٥٤٩٩؛ والقابسي: ٥٩، كلهم عن مالك به.

شانەکانی بەرز دەکردەوە، کاتێ سەری لە ڕکوع بەرز دەکردەوە بە هەمان شێوە دەستەکانی بەرز دەکردەوە و دەیگوت: (سَمِعَ اللهُ لِمَنْ حَمِدَهُ، رَبَّنَا وَلَكَ الْحَمْدُ)، بەڵام لە کڕنوشدا وای نەدەکرد (واتە دەستی بەرز نەدەکردەوە)[1].

**١٩٧- عَنْ عَلِيِّ بْنِ حُسَيْنِ بْنِ عَلِيِّ بْنِ أَبِي طَالِبٍ ﷺ، أَنَّهُ قَالَ: كَانَ رَسُولُ اللهِ ﷺ يُكَبِّرُ فِي الصَّلاَةِ كُلَّمَا خَفَضَ وَرَفَعَ، فَلَمْ تَزَلْ تِلْكَ صَلاَتَهُ حَتَّى لَقِيَ اللهَ[2].**

واتە: لە عەلی کوڕی حوسەینی کوڕی عەلی کوڕی ئەبی تاڵیبەوە ﷺ گێڕدراوەتەوە گوتوویەتی: پێغەمبەری خوا ﷺ هەر جارێك دادەبەزی و بەرزدەبۆیەوە (بۆ سوژدە و ڕکوع و ڕکاتەکان) الله أکبری دەکرد، جا بەردەوام ئەوە نوێژی بوو تا گەیشتەوە بە خوای پەروەردگار.

**١٩٨- عَنْ سُلَيْمَانَ بْنِ يَسَارٍ ﷺ، أَنَّ رَسُولَ اللهِ ﷺ كَانَ يَرْفَعُ يَدَيْهِ فِي الصَّلاَةِ[3].**

واتە: لە سولەیمانی کوڕی یەسارەوە ﷺ گێڕدراوەتەوە (گوتوویەتی): پێغەمبەری خوا ﷺ دەستەکانی بەرز دەکردەوە لە نوێژەکانیدا.

**١٩٩- عَنْ أَبِي سَلَمَةَ بْنِ عَبْدِ الرَّحْمَنِ بْنِ عَوْفٍ ﷺ أَنَّ أَبَا هُرَيْرَةَ ﷺ كَانَ يُصَلِّي لَهُمْ، فَيُكَبِّرُ كُلَّمَا خَفَضَ وَرَفَعَ، فَإِذَا انْصَرَفَ، قَالَ: وَاللَّهِ إِنِّي لَأَشْبَهُكُمْ بِصَلاَةِ رَسُولِ اللهِ[4] ﷺ.**

---

(١) ـ تێبینی: ئیمامی مالیك بە بەڵگەی فەرموودەی دیکە پێی وایە ئیمام تەنها دەڵێ: (سمع الله لمن حمده)، مەئمومیش تەنها دەڵێ: (ربنا ولك الحمد)، بەڵام لەلای ئیمامی شافیعی بۆ ئیمام سوننەتە هەردووکی بڵێ، بە بەڵگەی ئەو فەرموودەیە.

(٢) ـ صحيح لغيره. أخرجه أبو مصعب الزهري: ٢٠٥ في النداء والصلاة؛ والحدثاني: ٧٨ في الصلاة؛ والشيباني: ١٠٢ في الصلاة؛ والشافعي: ١٥٢، كلهم عن مالك به.

(٣) ـ صحيح لغيره. أخرجه أبو مصعب الزهري: ٢٠٦ في النداء والصلاة، عن مالك به.

(٤) ـ صحيح. أخرجه أبو مصعب الزهري: ٢٠٧ في النداء والصلاة؛ والحدثاني: ٧٩ في الصلاة؛ والشيباني: ١٠٣ في الصلاة؛ والشافعي: ١٥٣؛ وابن حنبل: ٧٢١٩؛ والبخاري: ٧٨٥ في الأذان؛ ومسلم: الصلاة: ٢٧؛ والنسائي: ١١٥٥ في التطبيق؛ وابن حبان: ١٧٦٦؛ والمنتقى لابن الجارود: ١٩١؛ وشرح معاني الآثار: ١٣٣١؛ والقابسي: ٢٢، كلهم عن مالك به.

واتە: لە ئەبو سەلەمەی کوڕی عەبدوڕڕەحمانی کوڕی عەوفەوە ﷺ گێڕدراوەتەوە (گوتوویەتی): ئەبو هوڕەیرە ﷺ پێشنوێژی بۆ دەکردن، جا هەموو جارێك کە (بۆ ڕکوع و سوژدە) دادەبەزی و بەرز دەبۆیەوە (الله أكبر)ی دەکرد، جا کاتێ تەواو دەبوو دەیگوت: سوێند بە خوا من نوێژم لە هەمووتان نزیکترە لە نوێژی پێغەمبەری خوا ﷺ.

**٢٠٠- عَنْ سَالِمِ بْنِ عَبْدِ اللهِ ﷺ، أَنَّ عَبْدَ اللهِ بْنَ عُمَرَ ﷺ كَانَ يُكَبِّرُ فِي الصَّلَاةِ كُلَّمَا خَفَضَ وَرَفَعَ[1].**

واتە: لە سالمی کوڕی عەبدوڵڵاوە ﷺ گێڕدراوەتەوە (گوتوویەتی): عەبدوڵڵای کوڕی عومەر ﷺ هەر جارێك دابەزیبایە و بەرز ببووایەوە (لە ڕکوع و سوژدە و قۆناغەکانی نوێژەکانیدا) الله أكبری دەکرد.

**٢٠١- عَنْ نَافِعٍ ﷺ، أَنَّ عَبْدَ اللهِ بْنَ عُمَرَ ﷺ كَانَ إِذَا افْتَتَحَ الصَّلَاةَ، رَفَعَ يَدَيْهِ حَذْوَ مَنْكِبَيْهِ، وَإِذَا رَفَعَ رَأْسَهُ مِنَ الرُّكُوعِ، رَفَعَهُمَا دُونَ ذَلِكَ[2].**

واتە: لە نافیعەوە ﷺ گێڕدراوەتەوە (گوتوویەتی): عەبدوڵڵای کوڕی عومەر ﷺ کاتێ نوێژی دەست پێ دەکرد، دەستەکانی بەرز دەکردەوە تا ئاستی شانەکانی، وە کاتێ سەری بەرز دەکردەوە لە ڕکوع دەستەکانی کەمتر بەرز دەکردنەوە.

**٢٠٢- عَنْ أَبِي نُعَيْمٍ وَهْبِ بْنِ كَيْسَانَ ﷺ، عَنْ جَابِرِ بْنِ عَبْدِ اللهِ ﷺ، أَنَّهُ كَانَ يُعَلِّمُهُمُ التَّكْبِيرَ فِي الصَّلَاةِ، قَالَ: فَكَانَ يَأْمُرُنَا أَنْ نُكَبِّرَ كُلَّمَا خَفَضْنَا وَرَفَعْنَا[3].**

واتە: لە ئەبو نوعەیم وەهبی کوڕی کەیسانەوە ﷺ گێڕدراوەتەوە، ئەویش لە جابری کوڕی عەبدوڵڵاوە ﷺ گێڕاویەتەوە کە فێری شوێنی گوتنی (الله أكبر)ی

---

(١) ـ صحيح. أخرجه أبو مصعب الزهري: ٢٠٩ في النداء والصلاة، عن مالك به.

(٢) ـ صحيح. أخرجه أبو مصعب الزهري: ٢١٠ في النداء والصلاة؛ والحدثاني: ٨٠ في الصلاة؛ والشيباني: ١٠٠ في الصلاة؛ والشافعي: ١٠٢٨؛ وأبو داود: ٧٤٢ في استفتاح الصلاة، كلهم عن مالك به.

(٣) ـ صحيح. أخرجه أبو مصعب الزهري: ٢١١ في النداء والصلاة؛ والحدثاني: ٨٠ أ في الصلاة؛ والشيباني: ١٠١ في الصلاة، كلهم عن مالك به.

دەكردن لە نوێژدا، گوتی: جا فەرمانی پێ دەكردین الله أكبر بكەین گشت جارێك كە نزم دەبینەوە و بەرز دەبینەوە (لە كردارەكانی نوێژدا).

**٢٠٣- عَنِ ابْنِ شِهَابٍ ﷺ، أَنَّهُ كَانَ يَقُولُ: إِذَا أَدْرَكَ الرَّجُلُ الرَّكْعَةَ فَكَبَّرَ تَكْبِيرَةً وَاحِدَةً، أَجْزَأَتْ عَنْهُ تِلْكَ التَّكْبِيرَةُ[1].**

**قَالَ مَالِكٌ ﷺ: وَذَلِكَ إِذَا نَوَى بِتِلْكَ التَّكْبِيرَةِ افْتِتَاحَ الصَّلَاةِ.**

واتە: لە ئیبنو شیهابەوە ﷺ گێردراوەتەوە دەیگوت: ئەگەر نوێژخوێن لە ڕكوع بگات بە نوێژ، جا یەك «الله أكبر» بكات، ئەوە ئەو «الله أكبر» كردنە بۆی بەردەكەوێت و ڕكاتەكەی بۆ دەستەبەر دەبێ.

ئیمامی مالیك ﷺ گوتوویەتی: ئەوە لە كاتێكدایە ئەگەر مەبەستی بەو «الله أكبر»ـە ئیحرام و دەستپێكردنی نوێژ بێ (نەك «الله أكبر»ی چوونە ڕكوع، چونكە «الله أكبر»ی ئیحرام ڕوكن و واجبە، ناچێتە ناو نوێژ تا ئەنجامی نەدات، بەڵام «الله أكبر»ی چوونە ڕكوع سوننەتە).

**٢٠٤- [فتوى] وَسُئِلَ مَالِكٌ ﷺ عَنْ رَجُلٍ دَخَلَ مَعَ الإِمَامِ، فَنَسِيَ تَكْبِيرَةَ الافْتِتَاحِ، وَتَكْبِيرَةَ الرُّكُوعِ، حَتَّى صَلَّى رَكْعَةً، ثُمَّ ذَكَرَ أَنَّهُ لَمْ يَكُنْ كَبَّرَ تَكْبِيرَةَ الافْتِتَاحِ، وَلاَ عِنْدَ الرُّكُوعِ، وَكَبَّرَ فِي الرَّكْعَةِ الثَّانِيَةِ؟ قَالَ: يَبْتَدِئُ صَلاَتَهُ أَحَبُّ إِلَيَّ، وَلَوْ سَهَا مَعَ الإِمَامِ عَنْ تَكْبِيرَةِ الافْتِتَاحِ، وَكَبَّرَ فِي الرُّكُوعِ الأَوَّلِ، رَأَيْتُ ذَلِكَ مُجْزِيًا عَنْهُ، إِذَا نَوَى بِهَا تَكْبِيرَةَ الافْتِتَاحِ[2].**

(فەتوا): ئیمامی مالیك ﷺ پرسیاری لێكرا دەربارەی پیاوێك كە لەگەڵ ئیمام دەچێتە ناو نوێژ، جا لە یاد دەكات «الله أكبر»ی نوێژ دەستپێكردن و «الله أكبر»ی چوونە ڕكوع بكات تا ڕكاتێك تەواو دەكات، دواتر بیری كەوتەوە كە «الله أكبر»ی دەستپێكردنی نوێژی نەكردووە، وە لە كاتی ڕكوعیش نەیكردووە، بەڵكو لە ڕكعەتی دووەمدا «الله أكبر»ی كرد؟ گوتی: نوێژەكەی لە سەرەتاوە دەست پێ دەكاتەوە، ئەگەر هەڵەی كرد لە كاتێكدا لەگەڵ ئیمامدایە بەوەی «الله أكبر»ی بۆ دەستپێكردنی

---

(١) ـ مقطوع صحيح. أخرجه أبو مصعب الزهري: ٢١٢ في النداء والصلاة، عن مالك به.

(٢) ـ أخرجه أبو مصعب الزهري: ٢١٤ في النداء والصلاة، عن مالك به.

نوێژەكە نەكرد، بەڵكوو لە ڕكوعی یەكەم (هاتەوە یادی) و كردی، ئەوە پێم وایە بەریدەكەوێ ئەگەر نیيەتی «الله أكبر»ی دەستپێكردن بێت[١].

**٢٠٥- [فتوى]** قَالَ مَالِكٌ ﷺ فِي الَّذِي يُصَلِّي لِنَفْسِهِ فَنَسِيَ تَكْبِيرَةَ الافْتِتَاحِ: إِنَّهُ يَسْتَأْنِفُ صَلاَتَهُ[٢].

(فەتوا): ئیمامی مالیك ﷺ دەربارەی ئەو كەسەی بۆ خۆی نوێژ دەكا (ئیمام نییە) و لەیاد دەكات «الله أكبر»ی دەستپێكردنی نوێژی بكات، گوتوویەتی: نوێژەكەی لە سەرەتاوە دەست پێ دەكاتەوە.

**٢٠٦- [فتوى]** وقَالَ مَالِكٌ ﷺ فِي الإِمَامِ يَنْسَى تَكْبِيرَةَ الافْتِتَاحِ حَتَّى يَفْرُغَ مِنْ صَلاَتِهِ، قَالَ: أَرَى أَنْ يُعِيدَ، وَيُعِيدُ مَنْ خَلْفَهُ الصَّلاَةَ، وَإِنْ كَانَ مَنْ خَلْفَهُ قَدْ كَبَّرُوا فَإِنَّهُمْ يُعِيدُونَ[٣].

(فەتوا): ئیمامی مالیك ﷺ دەربارەی ئەو ئیمامەی «الله أكبر»ی دەستپێكردنی نوێژی لەیاد دەچێت تا لە نوێژەكەی دەبێتەوە، گوتوویەتی: من پێم وایە دەبێ نوێژەكەی دووبارە بكاتەوە، وە ئەوانەشی كە لە دواوەی نوێژ دەكەن دەبێ دووبارەی بكەنەوە، هەرچەندە ئەوانەی لە دواوەی ئەو نوێژ دەكەن «الله أكبر»یان كردبێ، هەر دەبێ دووبارەی بكەنەوە.

## ٥- قورئانخوێندنی نوێژی مەغریب و عیشا[٤]

**٢٠٧-** عَنْ مُحَمَّدِ بْنِ جُبَيْرِ بْنِ مُطْعِمٍ ﷺ، عَنْ أَبِيهِ ﷺ أَنَّهُ قَالَ: سَمِعْتُ رَسُولَ اللهِ ﷺ قَرَأَ بِالطُّورِ فِي الْمَغْرِبِ[٥].

---

(١) تێبینی: بەڵام لە مەزهەبی ئیمامی شافیعی بەری ناكەوێت و پێویستە تەكبیری ئیحرام بەڕاوەستانەوە بگوترێ نەك لە حاڵەتی ڕكوع.

(٢) ـ أخرجه أبو مصعب الزهري: ٢١٥ في النداء والصلاة، عن مالك به.

(٣) ـ أخرجه أبو مصعب الزهري: ٢١٣ في النداء والصلاة، عن مالك به.

(٤) ـ الْقِرَاءَةُ فِي الْمَغْرِبِ وَالْعِشَاءِ.

(٥) ـ صحيح. أخرجه الحدثاني: ٨٢ في الصلاة؛ والشافعي: ١٠٤٥؛ والبخاري: ٧٦٥ في الأذان؛ وأبو داود: ٨١١ في استفتاح الصلاة؛ والقابسي: ٦٩، كلهم عن مالك به.

واتە: لە موحەممەدی کوڕی جوبەیری کوڕی موتعیمەوە ﷺ گێڕدراوەتەوە، ئەویش لە باوکیەوە ﷺ گێڕاویەتەوە گوتوویەتی: گوێم لە پێغەمبەری خوا ﷺ بوو سوڕەتی «طور»ی لە نوێژی مەغریبدا خوێند.

٢٠٨- عَنْ عَبْدِ اللهِ بْنِ عَبَّاسٍ ﷺ، أَنَّ أُمَّ الْفَضْلِ بِنْتَ الْحَارِثِ ﷺ سَمِعَتْهُ وَهُوَ يَقْرَأُ: ﴿ وَٱلْمُرْسَلَٰتِ عُرْفًا ۝١ ﴾ المرسلات، فَقَالَتْ لَهُ: يَا بُنَيَّ لَقَدْ ذَكَّرْتَنِي بِقِرَاءَتِكَ هَذِهِ السُّورَةَ، إِنَّهَا لآخِرُ مَا سَمِعْتُ رَسُولَ اللهِ ﷺ يَقْرَأُ بِهَا فِي الْمَغْرِبِ(1).

واتە: لە عەبدوڵڵای کوڕی عەبباسەوە ﷺ گێڕدراوەتەوە (گوتوویەتی): ئوممو فەزڵی کچی حاریس ﷺ گوێی لە عەبدوڵڵای کوڕی عەبباس ﷺ بوو لە کاتێکدا سوڕەتی: ﴿ وَٱلْمُرْسَلَٰتِ عُرْفًا ۝١ ﴾ ی دەخوێند، جا پێی گوت: ڕۆڵەکەم بە خوێندنی ئەم سوڕەتەت شتێکت بیرخستمەوە، ئەوە کۆتا سوڕەت بوو کە لە پێغەمبەری خواوە ﷺ گوێبیستی بووم لە نوێژی مەغریبدا خوێندی(2).

٢٠٩- عَنْ أَبِي عَبْدِ اللهِ الصُّنَابِحِيِّ ﷺ أَنَّهُ قَالَ: قَدِمْتُ الْمَدِينَةَ فِي خِلاَفَةِ أَبِي بَكْرٍ الصِّدِّيقِ ﷺ، فَصَلَّيْتُ وَرَاءَهُ الْمَغْرِبَ، فَقَرَأَ فِي الرَّكْعَتَيْنِ الأُولَيَيْنِ بِأُمِّ الْقُرْآنِ، وَسُورَةٍ: سُورَةٍ مِنْ قِصَارِ الْمُفَصَّلِ، ثُمَّ قَامَ فِي الثَّالِثَةِ، فَدَنَوْتُ مِنْهُ حَتَّى إِنَّ ثِيَابِي لَتَكَادُ أَنْ تَمَسَّ ثِيَابَهُ، فَسَمِعْتُهُ قَرَأَ بِأُمِّ الْقُرْآنِ وَبِهَذِهِ الآيَةِ: ﴿ رَبَّنَا لَا تُزِغْ قُلُوبَنَا بَعْدَ إِذْ هَدَيْتَنَا وَهَبْ لَنَا مِن لَّدُنكَ رَحْمَةً ۚ إِنَّكَ أَنتَ ٱلْوَهَّابُ ۝٨ ﴾ آل عمران(3).

واتە: لە ئەبو عەبدوڵڵای صونابیحییەوە ﷺ گێڕدراوەتەوە گوتوویەتی: لە سەردەمی خەلافەتی ئیمامی ئەبو بەکر ﷺ چووم بۆ مەدینە و نوێژی مەغریبم لەدوا

---

(١) ـ صحيح. أخرجه أبو مصعب الزهري: ٢١٦ في النداء والصلاة؛ وفي: ٢١٧ في النداء والصلاة؛ والحدثاني: ٨٢ أ في الصلاة؛ والشيباني: ٢٤٦ في الصلاة؛ والشافعي: ١٠٤٦؛ وابن حنبل: ٢٦٩٢٨؛ والبخاري: ٧٦٣ في الأذان؛ ومسلم: الصلاة: ١٧٣؛ وأبو داود: ٨١٠ في استفتاح الصلاة، وفي: ٨١١ في استفتاح الصلاة؛ وابن حبان: ١٨٣٢؛ والقابسي: ٤٩، كلهم عن مالك به.

(٢) ـ تێبینی: مالیکییەکان و شافیعییەکان گوتوویانە: خوێندنی ئەو دوو سوڕەتە لە مەغریبدا سوننەت نییە، دروستە، واتە گۆڕانکاری بەسەر دێت و بەردەوام ئەوەی نەخوێندووە.

(٣) ـ صحيح. أخرجه أبو مصعب الزهري: ٢١٨ في النداء والصلاة؛ والشافعي: ١٠٤٧، عن مالك به.




کرد، جا لە دوو ڕکاتەکانی سەرەتادا سوڕەتی فاتیحە و سوڕەتێکی دیکەی خوێند: سوڕەتێك بوو لە سوڕەتە کورتەکان (کە لەلای مالیکییەکان و شافیعییەکان سوڕەتی حوجوڕات بووە)، دواتر هەڵسایەوە بۆ ڕکاتی سێیەم و منیش زیاتر لێی نزیکبومەوە تاوەکوو خەریك بوو جلەکانم بەر جلەکانی بکەوێ، جا گوێم لێی بوو سوڕەتی فاتیحە و ئەو ئایەتەی خوێند: ﴿ رَبَّنَا لَا تُزِغْ قُلُوبَنَا بَعْدَ إِذْ هَدَيْتَنَا وَهَبْ لَنَا مِن لَّدُنكَ رَحْمَةً إِنَّكَ أَنتَ الْوَهَّابُ ﴿٨﴾ ﴾ آل عمران.

**٢١٠-** عَنْ نَافِعٍ ﷺ، أَنَّ عَبْدَ اللهِ بْنَ عُمَرَ ﷺ كَانَ إِذَا صَلَّى وَحْدَهُ، يَقْرَأُ فِي الأَرْبَعِ جَمِيعًا، فِي كُلِّ رَكْعَةٍ بِأُمِّ الْقُرْآنِ وَسُورَةٍ مِنَ الْقُرْآنِ، وَكَانَ يَقْرَأُ أَحْيَانًا بِالسُّورَتَيْنِ وَالثَّلَاثِ فِي الرَّكْعَةِ الْوَاحِدَةِ مِنْ صَلَاةِ الْفَرِيضَةِ، وَيَقْرَأُ فِي الرَّكْعَتَيْنِ مِنَ الْمَغْرِبِ كَذَلِكَ بِأُمِّ الْقُرْآنِ وَسُورَةٍ سُورَةٍ[1].

واتە: لە نافیعەوە ﷺ گێڕدراوەتەوە (گوتوویەتی): عەبدوڵڵای کوڕی عومەر ﷺ هەموو جار ئەگەر بە تەنها نوێژی بکردایە لە هەر چوار ڕکات قوڕئانی دەخوێند، لە گشت ڕکاتێکدا سوڕەتی فاتیحە و سوڕەتێکی دیکەی دەخوێند، هەندێ جاریش لە نوێژی فەڕزدا (جگە لە فاتیحە) دوو سوڕەت و سێ سوڕەتی لە یەك ڕکاتدا دەخوێند، وە لە دوو ڕکاتەکانی سەرەتای مەغریبیشدا بە هەمان شێوە سوڕەتی فاتیحە و سوڕەتێکی دیکەشی دەخوێند.

**٢١١-** عَنِ الْبَرَاءِ بْنِ عَازِبٍ ﷺ أَنَّهُ قَالَ: صَلَّيْتُ مَعَ رَسُولِ اللهِ ﷺ الْعِشَاءَ، فَقَرَأَ فِيهَا بِالتِّينِ وَالزَّيْتُونِ[2].

واتە: لە بەڕائی کوڕی عازیبەوە ﷺ گێڕدراوەتەوە گوتوویەتی: لەگەڵ پێغەمبەری خوا ﷺ نوێژی عیشام کرد، جا سوڕەتی [وبِالتِّينِ وَالزَّيْتُونِ]ی تیادا خوێند.

---

(١) ـ صحيح. أخرجه أبو مصعب الزهري: ٢١٩ في النداء والصلاة؛ والحدثاني: ٨٣ في الصلاة؛ والشيباني: ١٣٣ في الصلاة؛ وفي: ٢٩٨ في الصلاة؛ والشافعي: ١٠٤٨، كلهم عن مالك به.

(٢) ـ صحيح. أخرجه أبو مصعب الزهري: ٢٢٦ في النداء والصلاة؛ والحدثاني: ٨٦ في الصلاة؛ والنسائي: ١٠٠٠ في الافتتاح؛ والقابسي: ٤٨٧، كلهم عن مالك به.

## ٦- كردار (و چۆنییەتی) خوێندنی قورئان (لەناو نوێژدا)[١]

**٢١٢- عَنْ عَلِيِّ بْنِ أَبِي طَالِبٍ ﷺ، أَنَّ رَسُولَ اللهِ ﷺ نَهَى عَنْ لُبْسِ الْقَسِّيِّ، وَعَنْ تَخَتُّمِ الذَّهَبِ، وَعَنْ قِرَاءَةِ الْقُرْآنِ فِي الرُّكُوعِ[٢].**

واتە: لە عەلی كوڕی ئەبو تاڵیبەوە ﷺ گێڕدراوەتەوە (گوتوویەتی): پێغەمبەری خوا ﷺ نەهی كردووە لە پۆشینی جلی قەسسی و لە لەدەستكردنی گوستیلەی زێڕ و لە خوێندنی قورئان لە ڕكوعدا[٣].

**٢١٣- عَنِ الْبَيَاضِيِّ ﷺ، أَنَّ رَسُولَ اللهِ ﷺ خَرَجَ عَلَى النَّاسِ وَهُمْ يُصَلُّونَ، وَقَدْ عَلَتْ أَصْوَاتُهُمْ بِالْقِرَاءَةِ، فَقَالَ: إِنَّ الْمُصَلِّيَ يُنَاجِي رَبَّهُ، فَلْيَنْظُرْ بِمَا يُنَاجِيهِ بِهِ، وَلاَ يَجْهَرْ بَعْضُكُمْ عَلَى بَعْضٍ بِالْقُرْآنِ[٤].**

واتە: لە بەیاضییەوە ﷺ گێڕدراوەتەوە (گوتوویەتی): پێغەمبەری خوا ﷺ دەرچوو بۆ ناو خەڵكی لە كاتێكدا نوێژیان دەكرد و دەنگیان بەرز دەبۆیەوە بە خوێندنی قورئانی ناو نوێژ، پێغەمبەری خواش ﷺ فەرمووی: نوێژخوێن لە خزمەتی پەرستشی پەروەردگاریەتی، جا با سەیر بكات بزانێ بە چ شێوازێك موناجات لەگەڵ پەروەردگاری دەكات (واتە با خۆی تووشی حەڕام و مەكڕوە نەكات)، وە با هیچ كەسێك لە نوێژدا دەنگی بە قورئانخوێندن بەرز نەكاتەوە بەسەر كەسی دیكەدا.

---

(١) ـ الْعَمَلُ فِي الْقِرَاءَةِ.

(٢) ـ صحيح. أخرجه أبو مصعب الزهري: ٢٢٤ في النداء والصلاة؛ وفي: ١٩٠١ في الجامع؛ والشيباني: ٢٨٧ في الصلاة؛ وابن حنبل: ١٠٤٣؛ ومسلم: اللباس: ٢٩؛ والنسائي: ١٠٤٤ في التطبيق؛ وأبو داود: ٤٠٤٤ في اللباس؛ والترمذي: ٢٦٤ في الصلاة، وفي: ١٧٢٥ في اللباس؛ وابن حبان: ٥٤٤٠؛ والقابسي: ٢٦١، كلهم عن مالك به.

(٣) ـ تێبینی: جلی قەسسی بریتی بووە: لە جلێك كە خەتخەتی ئاوریشمی تیا بووە و لە میصر دروست كراوە.

(٤) ـ صحيح. أخرجه أبو مصعب الزهري: ٢٢٥ في النداء والصلاة؛ والحدثاني: ٨٥ أ في الصلاة؛ وابن حنبل: ١٩٠٤٤؛ والقابسي: ٤٩٠، كلهم عن مالك به.





**٢١٤- عَنْ أَنَسِ بْنِ مَالِكٍ ﷺ أَنَّهُ قَالَ: قُمْتُ وَرَاءَ أَبِي بَكْرٍ وَعُمَرَ وَعُثْمَانَ ﷺ، فَكُلُّهُمْ كَانَ لاَ يَقْرَأُ بِسْمِ اللهِ الرَّحْمَنِ الرَّحِيمِ إِذَا افْتَتَحُوا الصَّلاَةَ[١].**

واتە: لە ئەنەسی کوڕی مالیکەوە ﷺ گێڕدراوەتەوە گوتوویەتی: لە دوای ئیمامی ئەبو بەکر و عومەر و عوسمان ﷺ وەستاوم هیچیان «بسم الله الرحمن الرحيم»یان نەخوێندووە کاتێ دەستیان بە نوێژ دەکرد[٢].

**٢١٥- عَنْ أَبِي سُهَيْلِ بْنِ مَالِكٍ ﷺ، عَنْ أَبِيهِ ﷺ أَنَّهُ قَالَ: كُنَّا نَسْمَعُ قِرَاءَةَ عُمَرَ بْنِ الْخَطَّابِ ﷺ عِنْدَ دَارِ أَبِي جَهْمٍ بِالْبَلاَطِ[٣].**

واتە: لە ئەبو سوهەیلی کوڕی مالیکەوە ﷺ گێڕدراوەتەوە، ئەویش لەباوکیەوە ﷺ گێڕاویەتەوە گوتوویەتی: ئێمە لە بەلاطەوە (کە شوێنێك بووە لە نێوان مزگەوت و بازاڕ) گوێبیستی خوێندنی قورئانی عومەری کوڕی خەتتاب ﷺ دەبووین (لەناو نوێژدا) کە لە بەلاط لەلای ماڵی ئەبو جەهمەوە ﷺ دەیخوێند.

**٢١٦- عَنْ نَافِعٍ ﷺ، أَنَّ عَبْدَ اللهِ بْنَ عُمَرَ ﷺ كَانَ إِذَا فَاتَهُ شَيْءٌ مِنَ الصَّلاَةِ مَعَ الإِمَامِ، فِيمَا جَهَرَ فِيهِ الإِمَامُ بِالْقِرَاءَةِ، أَنَّهُ إِذَا سَلَّمَ الإِمَامُ، قَامَ عَبْدُ اللهِ بْنُ عُمَرَ ﷺ، فَقَرَأَ لِنَفْسِهِ فِيمَا يَقْضِي، وَجَهَرَ[٤].**

واتە: لە نافیعەوە ﷺ گێڕدراوەتەوە (گوتوویەتی): عەبدوڵڵای کوڕی عومەر ﷺ ئەگەر بەشێك لە نوێژی بە کۆمەڵی لەدەست چووبا لەو بەشەی ئیمام بە ئاشکرا و بە دەنگ دەیخوێنێ، کاتێ ئیمام سەلامی دەدایەوە عەبدوڵڵای کوڕی عومەر ﷺ

---

(١) ـ صحيح. أخرجه أبو مصعب الزهري: ٢٢٧ في النداء والصلاة؛ والحدثاني: ٨٦ أ في الصلاة، عن مالك به.

(٢) ـ تێبینی: ئەم فەرموودەیە بە چەندین شێوە هاتووە جگە لەم شێوەیە: هاتووە دەڵێ: بەدەنگ «بسم الله الرحمن الرحيم»یان دەخوێند، هاتووە دەڵێ: تەرکیان نەدەکرد، هاتووە دەڵێ: بەدەنگ نەیاندەخوێند، لێرەشدا دەڵێ نەیاندەخوێند.

(٣) ـ صحيح.

(٤) ـ صحيح. أخرجه أبو مصعب الزهري: ٢٢٩ في النداء والصلاة؛ والحدثاني: ٨٨ في الصلاة؛ والشيباني: ١٢٨ في الصلاة، كلهم عن مالك به.

هەڵدەستا و ئەوەی دەخوێند کە دەبوو قەزای بکاتەوە و دەنگی بەرز دەکردەوە (واتە: بەدەنگ ئەنجامی دەدا، چونکە بەدەنگەکەی لەکیس چووبوو)(١).

**٢١٧**- عَنْ يَزِيدَ بْنِ رُومَانَ ﷺ أَنَّهُ قَالَ: كُنْتُ أُصَلِّي إِلَى جَانِبِ نَافِعِ بْنِ جُبَيْرِ بْنِ مُطْعِمٍ ﷺ، فَيَغْمِزُنِي، فَأَفْتَحُ عَلَيْهِ وَنَحْنُ نُصَلِّي(٢).

واتە: لە یەزیدی کوڕی ڕومانەوە ﷺ گێڕدراوەتەوە گوتوویەتی: من لە تەنیشت نافیعی کوڕی جوبەیری کوڕی موتعیمەوە ﷺ نوێژم دەکرد، ئەویش ئاماژەی بۆ دەکردم و منیش دەروازەی خوێندنی قوڕئانم بۆ دەکردەوە (واتە کاتێ لە شوێنێك ڕاوەستابا و ئایەتەکەی بۆ نەهاتبا من بیرم دەخستەوە)، لە کاتێکدا لە نوێژدا بووین.

## ٧- قوڕئانخوێندنی نوێژی بەیانی(٣)

**٢١٨**- عَنْ هِشَامِ بْنِ عُرْوَةَ ﷺ، عَنْ أَبِيهِ ﷺ، أَنَّ أَبَا بَكْرٍ الصِّدِّيقَ ﷺ صَلَّى الصُّبْحَ، فَقَرَأَ فِيهَا سُورَةَ الْبَقَرَةِ، فِي الرَّكْعَتَيْنِ كِلْتَيْهِمَا(٤).

واتە: لە هیشامی کوڕی عوڕوەوە ﷺ گێڕدراوەتەوە، ئەویش لە باوکیەوە ﷺ گێڕاویەتەوە (گوتوویەتی): ئیمامی ئەبو بەکری صددیق ﷺ نوێژی بەیانی کرد، جا سوڕەتی بەقەڕەی لە دوو ڕکاتەکەدا خوێند.

**٢١٩**- عَنْ عَبْدِ اللهِ بْنَ عَامِرِ بْنِ رَبِيعَةَ ﷺ يَقُولُ: صَلَّيْنَا وَرَاءَ عُمَرَ بْنِ الْخَطَّابِ ﷺ الصُّبْحَ، فَقَرَأَ فِيهَا بِسُورَةِ يُوسُفَ، وَسُورَةِ الْحَجِّ، قِرَاءَةً بَطِيئَةً، فَقُلْتُ: وَاللَّهِ، إِذًا، لَقَدْ كَانَ يَقُومُ حِينَ يَطْلُعُ الْفَجْرُ، قَالَ: أَجَلْ(٥).

---

(١) ـ تێبینی: زەرقانی دەڵێ: دەکرێ لەبەر ئەوە ڕکاتە فەوتاوەکەی قەزا کردبێتەوە، چونکە ڕکاتە فەوتاوەکە هی نوێژی بەیانی بووبێت کاتێ ڕکاتێك دوا دەکەوێ، یان مەغریب بووبێت کاتێ دوو ڕکات دوا دەکەوێ، یان عیشا بووبێت کاتێ سێ ڕکات دوا دەکەوێ، کە گشتیان بەو شێوەیە سوننەتە بەدەنگ ئەنجام بدرێن.

(٢) ـ مقطوع صحيح. أخرجه أبو مصعب الزهري: ٢٣٠ في النداء والصلاة؛ والحدثاني: ٨٨ أ في الصلاة، عن مالك به.

(٣) ـ الْقِرَاءَةُ فِي الصُّبْحِ.

(٤) ـ صحيح لغيره. أخرجه أبو مصعب الزهري: ٢٢٠ في النداء والصلاة؛ والشافعي: ١٠٤٩، عن مالك به.

(٥) ـ صحيح. أخرجه أبو مصعب الزهري: ٢٢١ في النداء والصلاة؛ والشافعي: ١٠٥٠، عن مالك به.

واتە: لە عەبدوڵڵای کوڕی عامری کوڕی ڕەبیعەوە ﷺ گێردراوەتەوە دەیگوت: نوێژی بەیانیمان لە دوای عومەری کوڕی خەتتاب ﷺ کرد، جا سوڕەتی یوسف و سوڕەتی حەجی بە خوێندنێکی هێواش تیادا خوێند، (عوڕوە) دەڵێ گوتم: کەواتە سوێند بە خوا دەبێ لە سەرەتای بەیانییەوە دەستی پێ کردبێ (ئەگینا چۆن وێرادەگات)، (عەبدوڵڵای کوڕی عامر ﷺ)یش گوتی: بەڵێ وایە.

**٢٢٠-** عَنْ الْفُرَافِصَةَ بْنَ عُمَيْرٍ الْحَنَفِيَّ ﷺ قَالَ: مَا أَخَذْتُ سُورَةَ يُوسُفَ إِلاَّ مِنْ قِرَاءَةِ عُثْمَانَ بْنِ عَفَّانَ ﷺ إِيَّاهَا فِي الصُّبْحِ، مِنْ كَثْرَةِ مَا كَانَ يُرَدِّدُهَا لَنَا[١].

واتە: لە فوڕافیصەی کوڕی عومەیری حەنەفییەوە ﷺ گێردراوەتەوە گوتوویەتی: سوڕەتی یوسفم لە هیچ کەسێك وەرنەگرتووە و لەبەرم نەکردووە جگە لە خوێندنی عوسمانی کوڕی عەففان ﷺ کە لە نوێژی بەیانی دەیخوێند (گشت سوڕەتەکەم تەنها لەو ڕێگەیەوە لەبەر کرد)، لەبەر زۆر دووبارەکردنەوەی بۆمان (لە نوێژی بەیانیدا).

**٢٢١-** عَنْ نَافِعٍ ﷺ، أَنَّ عَبْدَ اللهِ بْنَ عُمَرَ ﷺ كَانَ يَقْرَأُ فِي الصُّبْحِ، فِي السَّفَرِ، بِالْعَشْرِ السُّوَرِ الأُوَلِ مِنَ الْمُفَصَّلِ، فِي كُلِّ رَكْعَةٍ، بِأُمِّ الْقُرْآنِ وَسُورَةٍ[٢].

واتە: لە نافیعەوە ﷺ گێردراوەتەوە (گوتوویەتی): عەبدوڵڵای کوڕی عومەر ﷺ لە سەفەردا لە نوێژی بەیانیدا لە دە سوڕەتە سەرەتاکانی سوڕەتە موفەصصەلەکانی دەخوێند، لە هەر ڕکاتێك فاتیحە و سوڕەتێکی (لە دە سوڕەتەکان) دەخوێند[٣].

---

(١) ـ موقوف حسن. أخرجه أبو مصعب الزهري: ٢٢٢ في النداء والصلاة؛ والشافعي: ١٠٥١، عن مالك به.

(٢) ـ صحيح. أخرجه أبو مصعب الزهري: ٢٢٣ في النداء والصلاة؛ والحدثاني: ٨٤ في الصلاة؛ والشيباني: ٢٠٠ في الصلاة؛ وفي: ٢٩٨ في الصلاة، كلهم عن مالك به.

(٣) ـ تێبینی: سوڕەتە موفەصصەڵەکان بریتین لەو سوڕەتانەی ئایەتیان کورتن و فەصڵی زۆریان تێدایە، لە سوڕەتی قافەوە دەست پێ دەکات تا کۆتایی قوڕئان، جا ئیبنو عومەر ﷺ لە نوێژی بەیانی لە دە سوڕەتەکانی سەرەتای ئەم جۆرە سوڕەتانەی دەخوێند، کە لە سوڕەتی قافەوە دەست پێ دەکات و بە سوڕەتی حەشر کۆتایی دێ، کە دەکاتە دە سوڕەت.

## ٨- ئەوەی هاتووە دەربارەی سورەتی فاتیحە[١]

٢٢٢- أَنَّ أَبَا سَعِيدٍ، مَوْلَى عَامِرِ بْنِ كُرَيْزٍ ﷺ، أَخْبَرَهُ؛ أَنَّ رَسُولَ اللهِ ﷺ نَادَى أُبَيَّ بْنَ كَعْبٍ ﷺ وَهُوَ يُصَلِّي، فَلَمَّا فَرَغَ مِنْ صَلاَتِهِ لَحِقَهُ، فَوَضَعَ رَسُولُ اللهِ ﷺ يَدَهُ عَلَى يَدِهِ، وَهُوَ يُرِيدُ أَنْ يَخْرُجَ مِنْ بَابِ الْمَسْجِدِ، فَقَالَ: إِنِّي لأَرْجُو أَنْ لاَ تَخْرُجَ مِنَ الْمَسْجِدِ حَتَّى تَعْلَمَ سُورَةً، مَا أَنْزَلَ اللهُ فِي التَّوْرَاةِ، وَلاَ فِي الإِنْجِيلِ، وَلاَ فِي الْفُرْقَانِ مِثْلَهَا، قَالَ أُبَيٌّ: فَجَعَلْتُ أُبْطِئُ فِي الْمَشْيِ رَجَاءَ ذَلِكَ، ثُمَّ قُلْتُ: يَا رَسُولَ اللهِ، السُّورَةَ الَّتِي وَعَدْتَنِي، قَالَ: كَيْفَ تَقْرَأُ إِذَا افْتَتَحْتَ الصَّلاَةَ؟ قَالَ: فَقَرَأْتُ عَلَيْهِ: ﴿ٱلْحَمْدُ لِلَّهِ رَبِّ ٱلْعَٰلَمِينَ ۝٢﴾الفاتحة، حَتَّى أَتَيْتُ عَلَى آخِرِهَا، فَقَالَ رَسُولُ اللهِ ﷺ: هِيَ هَذِهِ السُّورَةُ، وَهِيَ السَّبْعُ الْمَثَانِي، وَالْقُرْآنُ الْعَظِيمُ الَّذِي أُعْطِيتُ[٢].

واتە: ئەبو سەعیدی خزمەتکاری ئازادکراوی عامری کوڕی کوڕەیز ﷺ هەواڵی داوە بەوەی پێغەمبەری خوا ﷺ (جارێکیان) بانگی ئوبەی کوڕی کەعبی کرد ﷺ لە کاتێکدا نوێژی دەکرد، جا کاتێ لە نوێژەکەی تەواو بوو خۆی گەیاندەوە پێغەمبەری خوا ﷺ (تا بزانێ چی دەویست کاتێ لەناو نوێژ بانگی کرد)، جا پێغەمبەری خوا ﷺ دەستی ئوبەی کوڕی کەعبی گرت لە کاتێکدا دەیەویست لە دەرگای مزگەوت بچێتە دەرەوە، جا فەرمووی: من ئومێدم وایە و حەز دەکەم لە دەرگای مزگەوت نەچیتە دەرەوە تا سورەتێك فێر دەبی، کە خوای پەروەردگار نە لە تەورات و نە لە ئینجیل و نە لە قورئان وەك ئەو سورەتەی دانەبەزاندووە (بەو ئەندازەیە گەورەیە لای خوا)، ئوبەی دەڵێ: منیش هەر خاوەخاوم دەکرد لە ڕۆیشتن بەو ئومێدەوە (تا بەر لە چوونەدەر فێری ببم)، جا گوتم: ئەی پێغەمبەری خوا ﷺ سوورەتەکەی بەڵێنت پێ دام (پێم ناڵێی؟)، فەرمووی: چی دەخوێنی کاتێ دەست بە نوێژ دەکەیت؟ دەڵێ: منیش: ﴿ٱلْحَمْدُ لِلَّهِ رَبِّ ٱلْعَٰلَمِينَ ۝٢﴾م بەسەردا خوێندەوە تا گەیشتم بە کۆتاییەکەی، پێغەمبەری خوا ﷺ فەرمووی: ئەوەی باسم کرد دەربارەی ئەو سوورەتەیە، ئەوە سەبعول مەثانییە، ئەوە قورئانی گەورەیە، کە پێم بەخشراوە[٣].

---

(١) ـ مَا جَاءَ فِي أُمِّ الْقُرْآنِ.

(٢) ـ صحيح لغيره. أخرجه أبو مصعب الزهري: ٢٣١ في النداء والصلاة؛ والحدثاني: ٨٩ في الصلاة، عن مالك به.

(٣) ـ تێبینی: بۆیە پێی دەگوترێت «سبع المثاني» چونکە لە نوێژەکان دووبارە دەکرێتەوە، یان لەبەر ئەوەی

٢٢٣- عَنْ جَابِرِ بْنَ عَبْدِ اللهِ ﷺ يَقُولُ: مَنْ صَلَّى رَكْعَةً لَمْ يَقْرَأْ فِيهَا بِأُمِّ الْقُرْآنِ، فَلَمْ يُصَلِّ إِلاَّ وَرَاءَ الإِمَامِ[1].

واتە: لە جابری کوڕی عەبدوڵڵاوە ﷺ گێڕدراوەتەوە دەیگوت: هەرکەسێك ڕکاتێك بکات سوڕەتی فاتیحەی تیادا نەخوێنێ، ئەوە نوێژی نەکردووە، تەنها لەدوای ئیمامەوە نەبێ (بەبێ فاتیحە دروستە)[2].

## ٩- خوێندنی قورئان لەدوای ئیمام لەو نوێژ و ڕکاتانەی ئیمام بەدەنگ قورئانیان تیادا ناخوێنێ[3]

٢٢٤- أَنَّ أَبَا هُرَيْرَةَ ﷺ يَقُولُ: سَمِعْتُ رَسُولَ اللهِ ﷺ يَقُولُ: مَنْ صَلَّى صَلاَةً لَمْ يَقْرَأْ فِيهَا بِأُمِّ الْقُرْآنِ، فَهِيَ خِدَاجٌ، هِيَ خِدَاجٌ، هِيَ خِدَاجٌ، غَيْرُ تَمَامٍ، قَالَ: فَقُلْتُ: يَا أَبَا هُرَيْرَةَ، إِنِّي أَحْيَانًا أَكُونُ وَرَاءَ الإِمَامِ، قَالَ: فَغَمَزَ ذِرَاعِي، ثُمَّ قَالَ: اقْرَأْ بِهَا فِي نَفْسِكَ يَا فَارِسِيُّ، فَإِنِّي سَمِعْتُ رَسُولَ اللهِ ﷺ يَقُولُ: قَالَ اللهُ ﷻ: قَسَمْتُ الصَّلاَةَ بَيْنِي وَبَيْنَ عَبْدِي نِصْفَيْنِ، فَنِصْفُهَا لِي وَنِصْفُهَا لِعَبْدِي، وَلِعَبْدِي مَا سَأَلَ، قَالَ رَسُولُ اللهِ ﷺ: اقْرَؤُوا، يَقُولُ الْعَبْدُ: ﴿ٱلْحَمْدُ لِلَّهِ رَبِّ ٱلْعَٰلَمِينَ ۝٢﴾ الفاتحة، يَقُولُ اللهُ ﷻ: حَمِدَنِي عَبْدِي، يَقُولُ الْعَبْدُ: ﴿ٱلرَّحْمَٰنِ ٱلرَّحِيمِ ۝٣﴾ الفاتحة، يَقُولُ اللهُ: أَثْنَى عَلَيَّ عَبْدِي، يَقُولُ الْعَبْدُ: ﴿مَٰلِكِ يَوْمِ ٱلدِّينِ ۝٤﴾ الفاتحة، يَقُولُ اللهُ: مَجَّدَنِي عَبْدِي، يَقُولُ الْعَبْدُ: ﴿إِيَّاكَ نَعْبُدُ وَإِيَّاكَ نَسْتَعِينُ ۝٥﴾ الفاتحة، فَهَذِهِ الآيَةُ بَيْنِي

---

دوو جار دابەزیوە، وە پێی دەگوترێت: «القرآن العظيم» (قورئانی گەورە): چونکە فاتیحە هەموو مانا و مەبەستی قورئانی لەخۆ گرتووە.

(١) ـ صحيح. أخرجه أبو مصعب الزهري: ٢٣٣ في النداء والصلاة؛ والحدثاني: ٨٩ ب في الصلاة؛ والشيباني: ١١٣ في الصلاة؛ والترمذي: ٣١٣ في الصلاة؛ وشرح معاني الآثار: ١٣٠٠، كلهم عن مالك به.

(٢) ـ تێبینی: لە وتەی جابری کوڕی عەبدوڵڵاوە ﷺ یەکێك لەم دوو حوکمە وەردەگیرێ: یەکەم: یان مەبەستی ئەوەیە فاتیحە خوێندن لە نوێژی بەتەنها لە گشت ڕکاتێك واجبە، بەڵام لە نوێژی بەکۆمەڵ واجب نییە. دووەم: یان مەبەستی ئەوەیە هەر کەسێك لە نوێژێکدا لە هەر ڕکاتێك فاتیحە نەخوێنێ ئەوە نوێژەکەی دروست نییە، بەڵام ئەگەر لە نوێژی بەکۆمەڵ لە ڕکوعدا گەیشت بە ئیمام ئەوە بێ فاتیحە خوێندن ئەو ڕکاتەی هەر بەردەکەوێ. والله أعلم.

(٣) ـ الْقِرَاءَةُ خَلْفَ الإِمَامِ فِيماَ لاَ يُجْهَرُ فِيهِ بِالْقِرَاءَةِ.

وَبَيْنَ عَبْدِي، وَلِعَبْدِي مَا سَأَلَ، يَقُولُ الْعَبْدُ: ﴿ ٱهْدِنَا ٱلصِّرَٰطَ ٱلْمُسْتَقِيمَ ۝٦ صِرَٰطَ ٱلَّذِينَ أَنْعَمْتَ عَلَيْهِمْ غَيْرِ ٱلْمَغْضُوبِ عَلَيْهِمْ وَلَا ٱلضَّآلِّينَ ۝٧ ﴾ الفاتحة، فَهَؤُلَاءِ لِعَبْدِي، وَلِعَبْدِي مَا سَأَلَ[1].

واتە: ئەبو هورەیرە ﷺ دەیگوت: گوێم لە پێغەمبەری خوا ﷺ بوو دەیفەرموو: هەر کەسێك نوێژێك بکات فاتیحەی تیادا نەخوێنێ، ئەوە ناتەواوە ناتەواوە ناتەواوە، جا (ئەبو سائیب کە ئەو فەرموودەی لە ئەبو هورەیرەوە گوێ لێ بووە) دەڵێ: منیش گوتم: ئەی ئەبو هورەیرە من جاری وا هەیە لەدوای ئیمامم (واتە ئایا لە نوێژی بەکۆمەڵیش واجبە بیخوێنم؟)، دەڵێ: قۆڵی گوشیم و گوتی: ئەو کات لە دڵی خۆت بیخوێنە ئەی فارسی، من گوێم لە پێغەمبەری خوا ﷺ بوو دەیفەرموو: خوای پەروەردگار ﷻ فەرموویەتی: نوێژم لە نێوان خۆم و بەندەکەم کردووە بە دوو بەش، نیوەی بۆ منەو نیوەشی بۆ بەندەکەمە، وە ئەوە بۆ بەندەکەم هەیە کە داوای دەکات (واتە نزاکانی گیرا دەکەم)، پێغەمبەری خوا ﷺ فەرمووی: بیخوێنن، (کاتێ) بەندە دەڵێ: ﴿ ٱلْحَمْدُ لِلَّهِ رَبِّ ٱلْعَٰلَمِينَ ۝٢ ﴾ الفاتحة، خوای پەروەردگار ﷻ دەفەرموێ: بەندەکەم ستاییشی کردم، (کاتێ) بەندە دەڵێ: ﴿ ٱلرَّحْمَٰنِ ٱلرَّحِيمِ ۝٣ ﴾ الفاتحة، خوای پەروەردگار دەفەرموێ: بەندەکەم بەچاکە وەسفی کردم، (کاتێ) بەندە دەڵێ: ﴿ مَٰلِكِ يَوْمِ ٱلدِّينِ ۝٤ ﴾ الفاتحة، خوای پەروەردگار دەفەرموێ: بەندەکەم بەگەورەی گرتم، (کاتێ) بەندە دەڵێ: ﴿ إِيَّاكَ نَعْبُدُ وَإِيَّاكَ نَسْتَعِينُ ۝٥ ﴾ الفاتحة، خوای پەروەردگار دەفەرموێ: ئەم ئایەتە (بە نیوەیە) لە نێوان خۆم و بەندەکەم («إِيَّاكَ نَعْبُدُ» کە بریتییە لە پەرستش، ئەوەیان بۆ خوایە ﷻ، «وَإِيَّاكَ نَسْتَعِينُ»یش کە بریتییە لە داواکردنی پشتیوانی، ئەوەیان بۆ بەندەیە)، وە لێرەوە ئەوە بۆ بەندەکەم هەیە کە داوا دەکات، (جا کاتێ) بەندە دەڵێ: ﴿ ٱهْدِنَا ٱلصِّرَٰطَ ٱلْمُسْتَقِيمَ ۝٦ صِرَٰطَ ٱلَّذِينَ أَنْعَمْتَ عَلَيْهِمْ غَيْرِ ٱلْمَغْضُوبِ عَلَيْهِمْ وَلَا ٱلضَّآلِّينَ ۝٧ ﴾ الفاتحة، خوای پەروەردگار دەفەرموێ: ئەمانە بۆ بەندەکەمن و ئەوە بۆ بەندەکەم هەیە کە داوای دەکات (واتە ئەم نزایانەی بۆ گیرا دەکەم).

---

(١) ـ صحيح. أخرجه أبو مصعب الزهري: ٢٤٥ في النداء والصلاة؛ والشيباني: ١١٤ في الصلاة؛ وابن حنبل: ٩٩٣٤؛ ومسلم: الصلاة: ٣٩؛ والنسائي: ٩٠٩ في الافتتاح؛ وأبو داود: ٨٢١ في استفتاح الصلاة؛ وابن حبان: ١٧٨٤؛ والقابسي: ١٣٩، كلهم عن مالك به.

**٢٢٥-** عَنْ هِشَامِ بْنِ عُرْوَةَ ﷺ، عَنْ أَبِيهِ، أَنَّهُ كَانَ يَقْرَأُ خَلْفَ الإِمَامِ، فِيمَا لاَ يَجْهَرُ فِيهِ الإِمَامُ بِالْقِرَاءَةِ[١].

واتە: لە هیشامی کوڕی عوڕوەوە ﷺ گێڕدراوەتەوە، ئەویش لە باوکیەوە گێڕاویەتەوە بەوەی لەدوای ئیمام قوڕئانی دەخوێند لەو نوێژ و ڕکاتانەی کە ئیمام تیایدا قوڕئان بەدەنگ ناخوێنێ.

**٢٢٦-** وَعَنْ رَبِيعَةَ بْنِ أَبِي عَبْدِ الرَّحْمَنِ ﷺ، أَنَّ الْقَاسِمَ بْنَ مُحَمَّدٍ ﷺ كَانَ يَقْرَأُ خَلْفَ الإِمَامِ، فِيمَا لاَ يَجْهَرُ فِيهِ الإِمَامُ بِالْقِرَاءَةِ[٢].

واتە: لە ڕەبیعەی کوڕی ئەبو عەبدوڕڕەحمانەوە ﷺ گێڕدراوەتەوە (گوتوویەتی): قاسمی کوڕی موحەممەد ﷺ هەموو جار لە دوای ئیمام قوڕئانی دەخوێند لەو نوێژ و ڕکاتانەی کە ئیمام تیایدا قوڕئان بەدەنگ ناخوێنێ.

**٢٢٧-** عَنْ يَزِيدَ بْنِ رُومَانَ ﷺ، أَنَّ نَافِعَ بْنَ جُبَيْرِ بْنِ مُطْعِمٍ كَانَ يَقْرَأُ خَلْفَ الإِمَامِ، فِيمَا لاَ يَجْهَرُ فِيهِ الإِمَامِ بِالْقِرَاءَةِ[٣].

قَالَ مَالِكٌ ﷺ: وَذَلِكَ أَحَبُّ مَا سَمِعْتُ إِلَيَّ فِي ذَلِكَ.

واتە: لە یەزیدی کوڕی ڕومانەوە ﷺ گێڕدراوەتەوە (گوتوویەتی): نافیعی کوڕی جوبەیری کوڕی موتعیم لەدوای ئیمام قوڕئانی دەخوێند لەو نوێژ و ڕکاتانەی ئیمام تیایدا قوڕئان بەدەنگ ناخوێنێ.

مالیك ﷺ گوتوویەتی: ئەوە خۆشەویستترینی ئەوەیە کە بیستوومە دەربارەی ئەو بابەتە.

---

(١) ـ مقطوع صحيح. أخرجه أبو مصعب الزهري: ٢٤٦ في النداء والصلاة؛ والحدثاني: ٩٤ في الصلاة، عن مالك به.

(٢) ـ مقطوع صحيح. أخرجه أبو مصعب الزهري: ٢٤٦ في النداء والصلاة؛ وفي: ٢٤٩ في النداء والصلاة؛ والحدثاني: ٩٤ في الصلاة؛ وفي: ٩٤ أ في الصلاة، عن مالك به.

(٣) ـ مقطوع صحيح. أخرجه أبو مصعب الزهري: ٢٤٨ في النداء والصلاة؛ والحدثاني: ٩٤ في الصلاة؛ وفي: ٩٤ أ في الصلاة؛ وفي: ٩٤ج في الصلاة، عن مالك به.

## ١٠- نەخوێندنی قورئان لەدوای ئیمام لەو نوێژانەی ئیمام تیایدا بەدەنگ قورئان دەخوێنێ[1]

٢٢٨- عَنْ نَافِعٍ ﷺ، أَنَّ عَبْدَ اللهِ بْنَ عُمَرَ ﷺ كَانَ إِذَا سُئِلَ: هَلْ يَقْرَأُ أَحَدٌ خَلْفَ الإِمَامِ؟ قَالَ: إِذَا صَلَّى أَحَدُكُمْ خَلْفَ الإِمَامِ فَحَسْبُهُ قِرَاءَةُ الإِمَامِ، وَإِذَا صَلَّى وَحْدَهُ فَلْيَقْرَأْ، قَالَ: وَكَانَ عَبْدُ اللهِ بْنُ عُمَرَ ﷺ لاَ يَقْرَأُ خَلْفَ الإِمَامِ[2].

واتە: لە نافیعەوە ﷺ گێڕدراوەتەوە (گوتوویەتی): عەبدوڵڵای کوڕی عومەر ﷺ ئەگەر پرسیاری لێکرابا: ئایا دەبێت کەس (لە نوێژدا) لە دوای ئیمامەوە قورئان بخوێنێ؟ دەیگوت: ئەگەر یەکێك لە ئێوە نوێژی لەدوای ئیمام کرد، ئەوە قورئانخوێندنی ئیمام بۆ ئەو بەسە (پاداشتەکەی بۆ ئەویشە)، وە ئەگەر بەتەنها نوێژی کرد با بیخوێنێ، دەڵێ: جا بۆیە عەبدوڵڵای کوڕی عومەر ﷺ لەدوای ئیمام قورئانی نەدەخوێند.

٢٢٩- قَالَ يَحْيَى ﷺ: سَمِعْتُ مَالِكاً ﷺ يَقُولُ: الأَمْرُ عِنْدَنَا، أَنْ يَقْرَأَ الرَّجُلُ وَرَاءَ الإِمَامِ، فِيمَا لاَ يَجْهَرُ فِيهِ الإِمَامُ بِالْقِرَاءَةِ، وَيَتْرُكُ الْقِرَاءَةَ فِيمَا يَجْهَرُ فِيهِ الإِمَامُ بِالْقِرَاءَةِ.

واتە: یەحیا ﷺ گوتوویەتی: گوێم لە ئیمامی مالیك ﷺ بوو دەیگوت: لای ئێمە ئاوایە: نوێژخوێن (لە نوێژی بەکۆمەڵ) لەدوای ئیمام (بەبێدەنگ) قورئان دەخوێنێ لەو نوێژانەی ئیمام بەدەنگ قورئانیان تیادا ناخوێنێ، وە قورئان ناخوێنێ لەو نوێژانەی ئیمام بەدەنگ قورئان دەخوێنێ (بەڵکوو تەنها گوێ دەگرێ).

٢٣٠- عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ ﷺ، أَنَّ رَسُولَ اللهِ ﷺ انْصَرَفَ مِنْ صَلاَةٍ جَهَرَ فِيهَا بِالْقِرَاءَةِ، فَقَالَ: هَلْ قَرَأَ مَعِي مِنْكُمْ أَحَدٌ آنِفًا؟ فَقَالَ رَجُلٌ: نَعَمْ، أَنَا يَا رَسُولَ اللهِ، قَالَ: فَقَالَ رَسُولُ اللهِ ﷺ: إِنِّي أَقُولُ مَا لِي أُنَازَعُ الْقُرْآنَ؟ فَانْتَهَى النَّاسُ عَنِ الْقِرَاءَةِ مَعَ رَسُولِ اللهِ ﷺ، فِيمَا جَهَرَ فِيهِ رَسُولُ اللهِ ﷺ بِالْقِرَاءَةِ، حِينَ سَمِعُوا ذَلِكَ مِنْ رَسُولِ اللهِ ﷺ[3].

---

(١) ـ تَرْكُ الْقِرَاءَةِ خَلْفَ الإِمَامِ فِيماَ جَهَرَ فِيهِ.

(٢) ـ صحيح. أخرجه أبو مصعب الزهري: ٢٥١ في النداء والصلاة؛ والحدثاني: ٩٣ أ في الصلاة؛ والشيباني: ١١٢ في الصلاة، كلهم عن مالك به.

(٣) ـ صحيح. أخرجه أبو مصعب الزهري: ٢٥٠ في النداء والصلاة؛ والحدثاني: ٩٣ في الصلاة؛ والشيباني: ١١١

واتە: لە ئەبو هورەیرەوە ﷺ گێردراوەتەوە (گوتوویەتی): پێغەمبەری خوا ﷺ لە یەکێك لە نوێژە بەدەنگەکان سەلامی دایەوە، فەرمووی: ئایا کەس لە ئێوە تۆزێك بەر لە ئێستا لەگەڵ من قورئانی دەخوێند (لەناو نوێژدا)؟ پیاوێك گوتی: بەڵێ، من بووم ئەی پێغەمبەری خوا ﷺ، دەڵێ: جا پێغەمبەری خوا ﷺ فەرمووی: دەمگوت ئەوە کێیە بەربەرەکانێم لەگەڵ دەکات لە قورئاندا؟ جا خەڵکی وازیان هێنا لە قورئانخوێندن لەو نوێژ و ڕکاتانەی پێغەمبەری خوا ﷺ بەدەنگ تیایدا قورئانی دەخوێند، کاتێك ئەوەیان لە پێغەمبەری خواوە ﷺ بیست.

## ١١- ئەوەی هاتووە دەربارەی ئامین کردن لەپشت ئیمام[1]

**٢٣١**- عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ ﷺ، أَنَّ رَسُولَ اللهِ ﷺ قَالَ: إِذَا أَمَّنَ الإِمَامُ فَأَمِّنُوا، فَإِنَّهُ مَنْ وَافَقَ تَأْمِينُهُ تَأْمِينَ الْمَلاَئِكَةِ غُفِرَ لَهُ مَا تَقَدَّمَ مِنْ ذَنْبِهِ، قَالَ ابْنُ شِهَابٍ ﷺ: وَكَانَ رَسُولُ اللهِ ﷺ يَقُولُ: آمِينَ[2].

واتە: لە ئەبو هورەیرەوە ﷺ گێردراوەتەوە (گوتوویەتی): پێغەمبەری خوا ﷺ فەرموویەتی: کاتێ ئیمام (لە خوێندنی فاتیحەدا) ئامینی کرد ئێوەش ئامین بکەن، چونکە هەر کەسێك ئامینەکەی هاوکات بێت لەگەڵ ئامینی فریشتەکان (چونکە فریشتەکانیش ئامین دەکەن)، ئەوە لە گشت تاوانێکی بچووکی پێشووی دەبووردرێ، ئیبنو شیهاب ﷺ دەیگوت: پێغەمبەری خواش ﷺ دەیفەرموو: ئامین (واتە سوننەتە ئیمامیش ئامین بکات).

---

في الصلاة؛ وابن حنبل: ٧٩٩٤؛ والنسائي: ٩١٩ في الافتتاح؛ وأبو داود: ٨٢٦ في استفتاح الصلاة؛ والترمذي: ٣١٢ في الصلاة؛ وابن حبان: ١٨٤٩؛ والقابسي: ٨٠، كلهم عن مالك به.

(١) ـ مَا جَاءَ فِي التَّأْمِينِ خَلْفَ الإِمَامِ.

(٢) ـ صحيح. أخرجه أبو مصعب الزهري: ٢٥٢ في النداء والصلاة؛ والحدثاني: ٩٥ في الصلاة؛ والشيباني: ١٣٥ في الصلاة؛ والشافعي: ١٤٩؛ وفي: ١٠٢٩؛ وابن حنبل: ٩٩٢٣؛ والبخاري: ٧٨٠ في الأذان؛ ومسلم: الصلاة: ٧٢؛ والنسائي: ٩٢٨ في الافتتاح؛ وأبو داود: ٩٣٦ في الركوع والسجود؛ والترمذي: الفرائض: ١٦؛ والترمذي: ٢٥٠ في الصلاة؛ والقابسي: ١٨، كلهم عن مالك به.

**٢٣٢-** عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ ﷺ، أَنَّ رَسُولَ اللهِ ﷺ قَالَ: إِذَا قَالَ الإِمَامُ: ﴿ غَيْرِ ٱلْمَغْضُوبِ عَلَيْهِمْ وَلَا ٱلضَّآلِّينَ ۝٧ ﴾ الفاتحة، فَقُولُوا: آمِينَ، فَإِنَّهُ مَنْ وَافَقَ قَوْلُهُ قَوْلَ الْمَلاَئِكَةِ غُفِرَ لَهُ مَا تَقَدَّمَ مِنْ ذَنْبِهِ[١].

واتە: لە ئەبو هورەیرەوە ﷺ گێردراوەتەوە (گوتوویەتی): پێغەمبەری خوا ﷺ فەرموویەتی: کاتێ ئیمام گوتی: ﴿ غَيْرِ ٱلْمَغْضُوبِ عَلَيْهِمْ وَلَا ٱلضَّآلِّينَ ۝٧ ﴾ الفاتحة، ئێوە بڵێن: ئامین، چونکە هەر کەسێك وتەکەی (واتە ئامینەکەی) هاوکات بێت لەگەڵ وتەی فریشتەکان، ئەوە لە گشت تاوانێکی (بچووکی) پێشووی دەبووردرێ.

**٢٣٣-** عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ ﷺ، أَنَّ رَسُولَ اللهِ ﷺ قَالَ: إِذَا قَالَ أَحَدُكُمْ آمِينَ، وَقَالَتِ الْمَلاَئِكَةُ فِي السَّمَاءِ آمِينَ، فَوَافَقَتْ إِحْدَاهُمَا الأُخْرَى، غُفِرَ لَهُ مَا تَقَدَّمَ مِنْ ذَنْبِهِ[٢].

واتە: لە ئەبو هورەیرەوە ﷺ گێردراوەتەوە (گوتوویەتی): پێغەمبەری خوا ﷺ فەرموویەتی: کاتێ یەکێك لە ئێوە (لە کۆتایی فاتیحەی ناو نوێژدا) دەڵێ: ئامین، فریشتەکانیش لە ئاسماندا دەڵێن: ئامین، جا ئەگەر ئامینی نوێژخوێنەکە و فریشتەکان تێکی کردەوە، ئەوە لە گشت تاوانە بچووکەکانی پێشووی دەبووردرێ[٣].

**٢٣٤-** عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ ﷺ، أَنَّ رَسُولَ اللهِ ﷺ قَالَ: إِذَا قَالَ الإِمَامُ: سَمِعَ اللهُ لِمَنْ حَمِدَهُ، فَقُولُوا: اللهُمَّ رَبَّنَا لَكَ الْحَمْدُ، فَإِنَّهُ مَنْ وَافَقَ قَوْلُهُ قَوْلَ الْمَلاَئِكَةِ، غُفِرَ لَهُ مَا تَقَدَّمَ مِنْ ذَنْبِهِ[٤].

---

(١) ـ صحيح. أخرجه أبو مصعب الزهري: ٢٥٣ في النداء والصلاة؛ والشافعي: ١٥٠؛ وابن حنبل: ٩٩٢٤؛ والبخاري: ٧٨٢ في الأذان، وفي: ٤٤٧٥ في التفسير؛ والنسائي: ٩٢٩ في الافتتاح؛ وأبو داود: ٩٣٥ في الركوع والسجود؛ والقابسي: ٤٢٩، كلهم عن مالك به.

(٢) ـ صحيح. أخرجه أبو مصعب الزهري: ٢٥٤ في النداء والصلاة؛ والشافعي: ١٥١؛ وابن حنبل: ٩٩٢٦؛ والبخاري: ٧٨١ في الأذان؛ والنسائي: ٩٣٠ في الافتتاح؛ والقابسي: ٣٢٧، كلهم عن مالك به.

(٣) ـ تێبینی: زانایان جوملەی (غفر له ما تقدم من ذنبه)یان تایبەت کردووە بە گوناهە بچووکەکان، وەك لە فتح الباری هاتووە.

(٤) ـ صحيح. أخرجه أبو مصعب الزهري: ٢٥٥ في النداء والصلاة؛ والحدثاني: ٩٥ أ في الصلاة؛ وابن حنبل: ٩٩٢٥؛ والبخاري: ٧٩٦ في الأذان، وفي: ٣٢٢٨ في بدء الخلق؛ ومسلم: الصلاة: ٧١؛ والنسائي: ١٠٦٣ في التطبيق؛ وأبو داود: ٨٤٨ في استفتاح الصلاة؛ والترمذي: ٢٦٧ في الصلاة؛ وابن حبان: ١٩٠٧، وفي: ١٩١١؛ والقابسي: ٤٣٠، كلهم عن مالك به.

واتە: لە ئەبو هورەیرەوە ﷺ گێردراوەتەوە (گوتوویەتی): پێغەمبەری خوا ﷺ فەرموویەتی: کاتێ ئیمام گوتی: ((سَمِعَ اللهُ لِمَنْ حَمِدَهُ))، ئێوەش بڵێن: ((اللهُمَّ رَبَّنَا لَكَ الْحَمْدُ))، چونکە هەر کەسێك وتەکەی (واتە ئەم ڕستەیەی) هاوکات بێت لەگەڵ وتەی فریشتەکان، ئەوە لە گوناهە (بچووکەکانی) دەبووردرێ.

## ١٢- کرداری دانیشتن لە نوێژدا (بۆ تەحیات)[1]

**٢٣٥-** عَنْ عَلِيِّ بْنِ عَبْدِ الرَّحْمَنِ الْمُعَاوِيِّ ﷺ، أَنَّهُ قَالَ: رَآنِي عَبْدُ اللهِ بْنُ عُمَرَ ﷺ، وَأَنَا أَعْبَثُ بِالْحَصْبَاءِ فِي الصَّلَاةِ، فَلَمَّا انْصَرَفْتُ نَهَانِي، وَقَالَ: اصْنَعْ كَمَا كَانَ رَسُولُ اللهِ ﷺ يَصْنَعُ، فَقُلْتُ: وَكَيْفَ كَانَ رَسُولُ اللهِ ﷺ يَصْنَعُ؟ قَالَ: كَانَ إِذَا جَلَسَ فِي الصَّلَاةِ، وَضَعَ كَفَّهُ الْيُمْنَى عَلَى فَخِذِهِ الْيُمْنَى، وَقَبَضَ أَصَابِعَهُ كُلَّهَا، وَأَشَارَ بِأَصْبُعِهِ الَّتِي تَلِي الإِبْهَامَ، وَوَضَعَ كَفَّهُ الْيُسْرَى عَلَى فَخِذِهِ الْيُسْرَى، وَقَالَ: هَكَذَا كَانَ يَفْعَلُ[2].

واتە: لە عەلی کوڕی عەبدوڕڕەحمانی موعاوی ﷺ گێردراوەتەوە گوتوویەتی: عەبدوڵڵای کوڕی عومەر ﷺ منی بینی لە کاتێکدا لەناو نوێژدا دەستم وەردەدا لە وردە بەرد، جا کاتێ لە نوێژ تەواو بووم، نەهی لێ کردم و گوتی: ئەوە ئەنجام بدە کە پێغەمبەری خوا ﷺ ئەنجامی دەدا، منیش گوتم: پێغەمبەری خوا ﷺ چی دەکرد؟ گوتی: هەموو جار کاتێ دادەنیشت لە نوێژدا، دەستی ڕاستەی دەخستە سەر ڕانی ڕاستەی و گشت پەنجەکانی دەستی ڕاستەی دەنوقاند و ئاماژەی بەو پەنجەی دەکرد کە لەدوای پەنجەی گەورەیە (واتە پەنجەی شایەتمان)، وە دەستی چەپیشی لەسەر ڕانی چەپی دادەنا، گوتی: پێغەمبەری خوا ﷺ بەم شێوەیەی دەکرد.

---

(١) ـ الْعَمَلُ فِي الْجُلُوسِ فِي الصَّلَاةِ.

(٢) ـ صحيح. أخرجه أبو مصعب الزهري: ٤٩٤ في الجمعة؛ والحدثاني: ١٥٩ في الصلاة؛ والشيباني: ١٤٤ في الصلاة؛ والشافعي: ١٦٨؛ وابن حنبل: ٥٣٣١؛ ومسلم: المساجد: ١١٦؛ والنسائي: ١٢٦٧ في السهو؛ وأبو داود: ٩٨٧ في الركوع والسجود؛ وابن حبان: ١٩٤٢؛ والقابسي: ١٩٤، كلهم عن مالك به.

٢٣٦- عَنْ عَبْدِ اللهِ بْنِ دِينَارٍ ﵀، أَنَّهُ سَمِعَ عَبْدَ اللهِ بْنَ عُمَرَ ﵄، وَصَلَّى إِلَى جَنْبِهِ رَجُلٌ، فَلَمَّا جَلَسَ الرَّجُلُ فِي أَرْبَعٍ، تَرَبَّعَ وَثَنَى رِجْلَيْهِ، فَلَمَّا انْصَرَفَ عَبْدُ اللهِ ﵁ عَابَ ذَلِكَ عَلَيْهِ، فَقَالَ الرَّجُلُ: فَإِنَّكَ تَفْعَلُ ذَلِكَ، فَقَالَ عَبْدُ اللهِ بْنُ عُمَرَ ﵄: فَإِنِّي أَشْتَكِي[1].

واتە: لە عەبدوڵڵای کوڕی دینارەوە ﵀ گێڕدراوەتەوە گوێبیستی عەبدوڵڵای کوڕی عومەر ﵄ بووە لە کاتێکدا پیاوێك لە تەنیشتیەوە نوێژی دەکرد، جا کاتێ پیاوەکە گەیشت بە ڕکاتی چوارەم بەچوارچمکی دانیشت و هەردوو قاچەکانی نوشتاندەوە (واتە: هەردوو قاچەکانی لە تەنیشت یەکەوە داناوە و خستوونەتیە سەر یەکدی، وەك دانیشتنی ئافرەتان لە کاتی ئاساییدا)، جا کاتێ عەبدوڵڵا ﵁ لە نوێژ تەواو بوو ڕەخنەی لە پیاوەکە گرت لەسەر ئەو دانیشتنە، پیاوەکەش گوتی: تۆ ئاوا دەکەی (بۆیە منیش وا دەکەم)! عەبدوڵڵای کوڕی عومەریش ﵄ گوتی: من ئازارم هەیە (بۆیە قاچم ئاوا دادەنێم عوزرم هەیە، بۆ تۆ نابێ خۆ تۆ عوزرت نیە).

٢٣٧- عَنِ الْمُغِيرَةِ بْنِ حَكِيمٍ ﵀، أَنَّهُ رَأَى عَبْدَ اللهِ بْنَ عُمَرَ ﵄ يَرْجِعُ فِي سَجْدَتَيْنِ فِي الصَّلاَةِ، عَلَى صُدُورِ قَدَمَيْهِ، فَلَمَّا انْصَرَفَ، ذَكَرَ لَهُ ذَلِكَ، فَقَالَ: إِنَّهَا لَيْسَتْ سُنَّةَ الصَّلاَةِ، وَإِنَّمَا أَفْعَلُ هَذَا مِنْ أَجْلِ أَنِّي أَشْتَكِي[2].

واتە: لە موغیرەی کوڕی حەکیمەوە ﵀ گێڕدراوەتەوە بەوەی عەبدوڵڵای کوڕی عومەری ﵄ بینیوە لە دوو سوژدەکانی نوێژ لەسەر سەرەپەنجەکانی قاچەکانی گەڕاوەتەوە (بۆ سوژدەی دووەم و هەڵسانەوە)، جا کاتێ لە نوێژ تەواو بوو، موغیرە ﵀ پێی گوت (بۆچی ئاوا قاچەکانت دادەنا)، ئەویش گوتی: ئەوە بەشێك نییە لە شێوازی نوێژ، بەڵام کە من وا دەکەم لەبەر ئەوەیە من ئازارم هەیە (ناتوانم قاچم ڕابخەم).

٢٣٨- عَنْ عَبْدِ اللهِ بْنِ عَبْدِ اللهِ بْنِ عُمَرَ ﵄؛ أَنَّهُ أَخْبَرَهُ، أَنَّهُ كَانَ يَرَى عَبْدَ اللهِ بْنَ عُمَرَ ﵄ يَتَرَبَّعُ فِي الصَّلاَةِ إِذَا جَلَسَ، قَالَ: فَفَعَلْتُهُ وَأَنَا يَوْمَئِذٍ حَدِيثُ السِّنِّ، فَنَهَانِي عَبْدُ اللهِ بْنُ عُمَرَ

---

(١) ـ صحيح. أخرجه أبو مصعب الزهري: ٤٩٦ في الجمعة؛ والحدثاني: ١٦٠ في الصلاة؛ والشيباني: ١٥١ في الصلاة، كلهم عن مالك به.

(٢) ـ صحيح. أخرجه أبو مصعب الزهري: ٤٩٨ في الجمعة، عن مالك به.

ﷺ، وَقَالَ: إِنَّمَا سُنَّةُ الصَّلاَةِ، أَنْ تَنْصِبَ رِجْلَكَ الْيُمْنَى، وَتَثْنِيَ رِجْلَكَ الْيُسْرَى، فَقُلْتُ لَهُ: فَإِنَّكَ تَفْعَلُ ذَلِكَ، فَقَالَ: إِنَّ رِجْلَيَّ لاَ تَحْمِلاَنِي[1].

واتە: لە عەبدوڵڵای کوڕی عەبدوڵڵای کوڕی عومەرەوە ﷺ گێردراوەتەوە بەوەی هەواڵی (بە عەبدوڕڕەحمانی کوڕی قاسم) داوە کە عەبدوڵڵای کوڕی عومەری ﷺ بینیوە کاتێ دادەنیشت لە نوێژدا بە چوارچمکی دادەنیشت، دەڵێ: منیش وەکوو ئەوم کرد لە کاتێکدا بچووك بووم، جا عەبدوڵڵای کوڕی عومەر ﷺ نەهی لێکردم و گوتی: سوننەت و ڕێبازی نوێژ ئەوەیە قاچی ڕاستت بچەقێنیت و قاچی چەپەت بنوشتێنیتەوە، دەڵێ: منیش گوتم: خۆ تۆ ئاوا دەکەی (بەچوارچمکی دادەنیشی)، ئەویش گوتی: قاچەکانم توانای هەڵگرتنمیان نییە (واتە قاچەکانم ژان و ئازاریان هەیە ناتوانم لەسەریان دانیشم).

**٢٣٩**-عَنْ يَحْيَى بْنِ سَعِيدٍ ﷺ، أَنَّ الْقَاسِمَ بْنَ مُحَمَّدٍ ﷺ أَرَاهُمُ الْجُلُوسَ فِي التَّشَهُّدِ، فَنَصَبَ رِجْلَهُ الْيُمْنَى، وَثَنَى رِجْلَهُ الْيُسْرَى، وَجَلَسَ عَلَى وَرِكِهِ الأَيْسَرِ، وَلَمْ يَجْلِسْ عَلَى قَدَمِهِ.

ثُمَّ قَالَ: أَرَانِي هَذَا عَبْدُ اللهِ بْنُ عَبْدِ اللهِ بْنِ عُمَرَ ﷺ، وَحَدَّثَنِي أَنَّ أَبَاهُ كَانَ يَفْعَلُ ذَلِكَ[2].

واتە: لە یەحیای کوڕی سەعیدەوە ﷺ گێردراوەتەوە (گوتوویەتی): قاسمی کوڕی موحەممەد ﷺ دانیشتنی تەحیاتی پێ نیشان داین (بەم شێوەیە): قاچی ڕاستەی چەقاند و قاچی چەپەی نوشتاندەوە و لەسەر نێرکی چەپەی دانیشت و لەسەر قاچی دانەنیشت (واتە بەشێوازی تەوەڕوك دانیشت).

دواتر گوتی: عەبدوڵڵای کوڕی عەبدوڵڵای کوڕی عومەر ﷺ ئەوەی نیشان دام و بۆی گێڕامەوە کە باوکی ئاوای کردووە (واتە ئیبن عومەرﷺ).

---

(١) ـ صحيح. أخرجه أبو مصعب الزهري: ٤٩٧ في الجمعة؛ والحدثاني: ١٦٠ أ في الصلاة؛ والشيباني: ١٥٢ في الصلاة؛ والبخاري: ٨٢٧ في الأذان؛ وأبو داود: ٩٥٨ في الركوع والسجود، كلهم عن مالك به.

(٢) ـ صحيح. أخرجه أبو مصعب الزهري: ٤٩٥ في الجمعة؛ والحدثاني: ١٥٩ أ في الصلاة؛ وأبو داود: ٩٦١ في الركوع والسجود، كلهم عن مالك به.

## ١٣- تەحیاتخوێندن لە نوێژدا[1]

**٢٤٠-** عَنْ عَبْدِ الرَّحْمَنِ بْنِ عَبْدٍ الْقَارِيِّ ﵀، أَنَّهُ سَمِعَ عُمَرَ بْنَ الْخَطَّابِ ﵁ وَهُوَ عَلَى الْمِنْبَرِ يُعَلِّمُ النَّاسَ التَّشَهُّدَ، يَقُولُ: قُولُوا: التَّحِيَّاتُ لِلَّهِ، الزَّاكِيَاتُ لِلَّهِ، الطَّيِّبَاتُ الصَّلَوَاتُ لِلَّهِ، السَّلاَمُ عَلَيْكَ أَيُّهَا النَّبِيُّ وَرَحْمَةُ اللهِ وَبَرَكَاتُهُ، السَّلاَمُ عَلَيْنَا وَعَلَى عِبَادِ اللهِ الصَّالِحِينَ، أَشْهَدُ أَنْ لاَ إِلَهَ إِلاَّ اللهُ، وَأَشْهَدُ أَنَّ مُحَمَّدًا عَبْدُهُ وَرَسُولُهُ[2].

واتە: لە عەبدوڕڕەحمانی کوڕی عەبدولقاریئەوە ﵀ گێردراوەتەوە گوێی لە عومەری کوڕی خەتتاب ﵁ بووە لە کاتێکدا لەسەر مینبەر بووە، خەڵکی فێری تەحیات دەکرد، دەیگوت بڵێن: «التَّحِيَّاتُ لِلَّهِ، الزَّاكِيَاتُ لِلَّهِ، الطَّيِّبَاتُ الصَّلَوَاتُ لِلَّهِ، السَّلاَمُ عَلَيْكَ أَيُّهَا النَّبِيُّ وَرَحْمَةُ اللهِ وَبَرَكَاتُهُ، السَّلاَمُ عَلَيْنَا وَعَلَى عِبَادِ اللهِ الصَّالِحِينَ، أَشْهَدُ أَنْ لاَ إِلَهَ إِلاَّ اللهُ، وَأَشْهَدُ أَنَّ مُحَمَّدًا عَبْدُهُ وَرَسُولُهُ» واتە: گشت جۆرەکانی مەدح و مەزنی بۆ خوای پەروەردگار، گشت کردەوەیەك کە پاداشتی پێ زیاد دەبێت هەر بۆ ئەوە، گشت گوفتار و کردارێکی چاك و گشت نوێژ و پەرستشێك هەر بۆ «الله»یە، سەلام و ڕەحمەت و بەرەکەتی خوات لەسەر بێت ئەی پێغەمبەر ﷺ، سەلام لەسەر ئێمە و بەندە چاکەکانی خوای پەروەردگار بێ، شاهێدی دەدەم کە هیچ پەرستراوێکی بەحەق نییە جگە لە الله، وە شاهێدی دەدەم کە موحەممەد ﷺ بەندە و پەیامبەری ئەوە.

**٢٤١-** عَنْ نَافِعٍ ﵀، أَنَّ عَبْدَ اللهِ بْنَ عُمَرَ ﵄ كَانَ يَتَشَهَّدُ فَيَقُولُ: بِسْمِ اللهِ، التَّحِيَّاتُ لِلَّهِ، الصَّلَوَاتُ لِلَّهِ، الزَّاكِيَاتُ لِلَّهِ، السَّلاَمُ عَلَى النَّبِيِّ وَرَحْمَةُ اللهِ وَبَرَكَاتُهُ، السَّلاَمُ عَلَيْنَا وَعَلَى عِبَادِ اللهِ الصَّالِحِينَ، شَهِدْتُ أَنْ لاَ إِلَهَ إِلاَّ اللهُ، شَهِدْتُ أَنَّ مُحَمَّدًا رَسُولُ اللهِ، يَقُولُ هَذَا فِي الرَّكْعَتَيْنِ الأُولَيَيْنِ، وَيَدْعُو إِذَا قَضَى تَشَهُّدَهُ بِمَا بَدَا لَهُ، فَإِذَا جَلَسَ فِي آخِرِ صَلاَتِهِ تَشَهَّدَ كَذَلِكَ أَيْضًا، إِلاَّ أَنَّهُ يُقَدِّمُ التَّشَهُّدَ، ثُمَّ يَدْعُو بِمَا بَدَا لَهُ، فَإِذَا قَضَى تَشَهُّدَهُ، وَأَرَادَ أَنْ يُسَلِّمَ، قَالَ: السَّلاَمُ عَلَى النَّبِيِّ وَرَحْمَةُ اللهِ وَبَرَكَاتُهُ، السَّلاَمُ عَلَيْنَا وَعَلَى عِبَادِ اللهِ الصَّالِحِينَ، السَّلاَمُ عَلَيْكُمْ عَنْ يَمِينِهِ، ثُمَّ يَرُدُّ عَلَى الإِمَامِ، فَإِنْ سَلَّمَ عَلَيْهِ أَحَدٌ عَنْ يَسَارِهِ، رَدَّ عَلَيْهِ[3].

---

(١) ـ التَّشَهُّدُ فِي الصَّلَاةِ.

(٢) ـ صحيح. أخرجه أبو مصعب الزهري: ٤٩٩ في الجمعة؛ والحدثاني: ١٦١ في الصلاة؛ والشيباني: ١٤٦ في الصلاة؛ والشافعي: ١١٨٢، كلهم عن مالك به.

(٣) ـ صحيح. أخرجه أبو مصعب الزهري: ٥٠٠ في الجمعة؛ والحدثاني: ١٦١ أ في الصلاة؛ والشيباني: ١٤٧ في

واتە: لە نافیعەوە ﷺ گێڕدراوەتەوە (گوتوویەتی): عەبدوڵڵای کوڕی عومەر ﷺ هەموو جار تەحیاتی دەخوێند دەیگوت: «بِسْمِ اللهِ، التَّحِيَّاتُ لِلَّهِ، الصَّلَوَاتُ لِلَّهِ، الزَّاكِيَاتُ لِلَّهِ، السَّلاَمُ عَلَى النَّبِيِّ وَرَحْمَةُ اللهِ وَبَرَكَاتُهُ، السَّلاَمُ عَلَيْنَا وَعَلَى عِبَادِ اللهِ الصَّالِحِينَ، شَهِدْتُ أَنْ لاَ إِلَهَ إِلاَّ اللهُ، شَهِدْتُ أَنَّ مُحَمَّدًا رَسُولُ اللهِ» واتە: ((بە ناوی خوا، گشت جۆرەکانی مەدح و مەزنی بۆ خوای پەروەردگار، گشت نوێژ و پەرستشێك هەر بۆ «الله»یە، گشت کردەوەیەك کە پاداشتی پێ زیاد دەبێت هەر بۆ ئەوە، سەلام و ڕەحمەت و بەرەکەتی خوات لەسەر بێت ئەی پێغەمبەر ﷺ، سەلام لەسەر ئێمە و بەندە چاکەکانی خوای پەروەردگار بێ، شاهێدیم دا کە هیچ پەرستراوێکی بەحەق نییە جگە لە الله، وە شاهێدیم دا کە موحەممەد پەیامبەری ئەوە))، جا نافیع ﷺ دەڵێ: ئیبنو عومەر ﷺ ئەوەی لە دووەم ڕکاتی (نوێژی چوار ڕکاتی و سێ ڕکاتی) دەگوت، وە چ دوعایەکی بۆ بهاتایە دەیکرد، جا کاتێ لە کۆتا ڕکاتی نوێژەکەی دادەنیشت هەمان تەحیاتی دەخوێند و تەحیاتەکەی پێش دوعا دەخست، دواتر چ دوعایەکی بۆ بهاتایە دەیکرد، جا کاتێ تەحیاتەکەی تەواو دەکرد و دەیەویست سەلام بداتەوە، دەیگوت: ((السَّلاَمُ عَلَى النَّبِيِّ وَرَحْمَةُ اللهِ وَبَرَكَاتُهُ، السَّلاَمُ عَلَيْنَا وَعَلَى عِبَادِ اللهِ الصَّالِحِينَ)) واتە: ((سەلام و ڕەحمەت و بەرەکەتی خوا لەسەر پێغەمبەر ﷺ بێ، سەلام لەسەر ئێمە و بەندە چاکەکانیش بێت))، (ئینجا) بۆ لای ڕاستە دەیگوت: السلام علیکم (بۆ دەرچوون لەناو نوێژ)، دواتر وەڵامی سەلامی ئیمامی دەدایەوە (ئەگەر لەناو نوێژی جەماعەتدابا)، جا ئەگەر کەسێك سەلامی لێ کردبا لەلای چەپەی (واتە لەناو جەماعەت کەسێك لەلای چەپەی ئیبنو عومەر بووایە و سەلامی نوێژی بەلای ئیبنو عومەردا دابایەوە) ئەوە وەڵامی سەلامەکەی ئەویشی دەدایەوە[1].

---

الصلاة، کلهم عن مالك به.

(١) ـ تێبینی: لەلای ئیمامی مالیك ئەگەر نوێژخوێن مەئموم بوو سێ سەلامی بۆ سوننەتە، سەلامێك بۆ چوونەدەر لە نوێژ، یەکێکیش بۆ وەڵامدانەوەی ئیمام، یەکێکیش بۆ وەڵامدانەوەی ئەو مسوڵمانەی دەکەوێتە تەنیشتی، بەڵام لەلای سێ ئیمامەکەی دیکە تەنها دوو سەلام سوننەتە.

جا ئەوەی ئیمامی مالیك کاری پێ بوو لەو ئەسەرە تەنها سێ سەلامەکە بوو، ئەگەرنا لەلای ئیمامی مالیك

٢٤٢- عَنْ عَائِشَةَ ﵂، زَوْجِ النَّبِيِّ ﷺ، أَنَّهَا كَانَتْ تَقُولُ إِذَا تَشَهَّدَتِ: التَّحِيَّاتُ الطَّيِّبَاتُ، الصَّلَوَاتُ الزَّاكِيَاتُ لِلَّهِ، أَشْهَدُ أَنْ لاَ إِلَهَ إِلاَّ اللهُ، وَحْدَهُ لاَ شَرِيكَ لَهُ، وَأَنَّ مُحَمَّدًا عَبْدُهُ وَرَسُولُهُ، السَّلاَمُ عَلَيْكَ أَيُّهَا النَّبِيُّ وَرَحْمَةُ اللهِ وَبَرَكَاتُهُ، السَّلاَمُ عَلَيْنَا وَعَلَى عِبَادِ اللهِ الصَّالِحِينَ، السَّلاَمُ عَلَيْكُمْ[1].

واتە: لە عائیشەی ﵂ خێزانی پێغەمبەرەوە ﷺ گێردراوەتەوە كاتێ تەحیاتی دەخوێند دەیگوت: «التَّحِيَّاتُ الطَّيِّبَاتُ، الصَّلَوَاتُ الزَّاكِيَاتُ لِلَّهِ، أَشْهَدُ أَنْ لاَ إِلَهَ إِلاَّ اللهُ، وَحْدَهُ لاَ شَرِيكَ لَهُ، وَأَنَّ مُحَمَّدًا عَبْدُهُ وَرَسُولُهُ، السَّلاَمُ عَلَيْكَ أَيُّهَا النَّبِيُّ وَرَحْمَةُ اللهِ وَبَرَكَاتُهُ، السَّلاَمُ عَلَيْنَا وَعَلَى عِبَادِ اللهِ الصَّالِحِينَ، السَّلاَمُ عَلَيْكُمْ» واتە: ((هەرچی مەدح و بەگەورەدانان و، كردەوە و گوفتاری چاك و نوێژ و پەرستش و كردەوەی پاداشت زۆرە، گشتی بۆ خوایە ﷻ، شاهێدی دەدەم كە هیچ پەرستراوێكی بەحەق نییە جگە لە الله، تەنهایە هیچ هاوبەشێكی نییە، موحەممەدیش بەندە و پەیامبەری ئەوە، سەلام و ڕەحمەت و بەرەكەتی خوات لەسەر بێت ئەی پێغەمبەر ﷺ، سەلام لەسەر ئێمە و بەندە چاكەكانی خوای پەروەردگار بێت))، السلام علیكم (سەلامی دەدایەوە).

٢٤٣- أَنَّ عَائِشَةَ ﵂، زَوْجَ النَّبِيِّ ﷺ، كَانَتْ تَقُولُ إِذَا تَشَهَّدَتْ: التَّحِيَّاتُ الطَّيِّبَاتُ، الصَّلَوَاتُ الزَّاكِيَاتُ لِلَّهِ، أَشْهَدُ أَنْ لاَ إِلَهَ إِلاَّ اللهُ، وَحْدَهُ لاَ شَرِيكَ لَهُ، وَأَشْهَدُ أَنَّ مُحَمَّدًا عَبْدُ اللهِ وَرَسُولُهُ، السَّلاَمُ عَلَيْكَ أَيُّهَا النَّبِيُّ وَرَحْمَةُ اللهِ وَبَرَكَاتُهُ، السَّلاَمُ عَلَيْنَا وَعَلَى عِبَادِ اللهِ الصَّالِحِينَ، السَّلاَمُ عَلَيْكُمْ[2].

واتە: (بە سەنەدێكی دیكەشەوە هاتووە) عائیشەی ﵂ خێزانی پێغەمبەری خوا ﷺ هەموو جار كە تەحیاتی دەخوێند دەیگوت: «التَّحِيَّاتُ الطَّيِّبَاتُ، الصَّلَوَاتُ الزَّاكِيَاتُ

---

نابێ لە تەحیات بسم الله بكرێ و نابێ أشهد بگۆڕدرێت بۆ شهدت، وە نابێ لە تەحیاتی یەكەم دوعا بكرێ، وە نابێ سەلام بۆ سەر پێغەمبەری خوا ﷺ و صالحان لە كۆتایی دوعا دووبارە بكرێتەوە، وە نابێ السلام علیك أیها النبی بگۆڕدرێ بۆ السلام علی النبی.

(١) ـ صحيح. أخرجه أبو مصعب الزهري: ٥٠١ في الجمعة؛ والحدثاني: ١٦٢ في الصلاة؛ والشيباني: ١٤٥ في الصلاة، كلهم عن مالك به.

(٢) ـ صحيح. أخرجه أبو مصعب الزهري: ٥٠٢ في الجمعة، عن مالك به.

لِلَّهِ، أَشْهَدُ أَنْ لاَ إِلَهَ إِلاَّ اللهُ، وَحْدَهُ لاَ شَرِيكَ لَهُ، وَأَنَّ مُحَمَّدًا عَبْدُهُ وَرَسُولُهُ، السَّلاَمُ عَلَيْكَ أَيُّهَا النَّبِيُّ وَرَحْمَةُ اللهِ وَبَرَكَاتُهُ، السَّلاَمُ عَلَيْنَا وَعَلَى عِبَادِ اللهِ الصَّالِحِينَ، السَّلاَمُ عَلَيْكُمْ» واته: ((هەرچی مەدح و بەگەورەدانان و کردەوە و گوفتاری چاك و نوێژ و پەرستش و کردەوەی پاداشت زۆرە، گشتی بۆ خوایە، شاهێدی دەدەم کە هیچ پەرستراوێکی بەحەق نییە جگە لە الله، تەنهایە هیچ هاوبەشێکی نییە، وە موحەممەدیش ﷺ بەندە و پەیامبەری ئەوە، سەلام و ڕەحمەت و بەرەکەتی خوات لەسەر بێت ئەی پێغەمبەر ﷺ، سەلام لەسەر ئێمە و بەندە چاکەکانی خوای پەروەردگار بێت))، السلام علیکم (سەلامی دەدایەوە).

**٢٤٤- عَنْ مَالِكٍ ﷺ، أَنَّهُ سَأَلَ ابْنَ شِهَابٍ، وَنَافِعًا، مَوْلَى ابْنِ عُمَرَ ﷺ عَنْ رَجُلٍ دَخَلَ مَعَ الإِمَامِ فِي الصَّلاَةِ، وَقَدْ سَبَقَهُ الإِمَامُ بِرَكْعَةٍ، أَيَتَشَهَّدُ مَعَهُ فِي الرَّكْعَتَيْنِ وَالأَرْبَعِ، وَإِنْ كَانَ ذَلِكَ لَهُ وترا، فَقَالاَ: نَعَمْ لِيَتَشَهَّدْ مَعَهُ[1].**

**قَالَ مَالِكٌ ﷺ: وَهُوَ الأَمْرُ عِنْدَنَا.**

واتە: لە ئیمامی مالیکەوە ﷺ گێڕدراوەتەوە پرسیاری لە ئیبنو شیهاب و نافیعی خزمەتکاری ئیبنو عومەر ﷺ کردووە دەربارەی پیاوێك کە لەگەڵ ئیمام دەچێتە ناو نوێژ، لە کاتێکدا ئیمام ڕکاتێك پێش ئەو کەوتۆتەوە، ئایا لە ڕکعەتی دووەم و چوارەم لەگەڵ ئیمام تەحیات دەخوێنێ کە بە نسبەت ئەو ڕکاتی تاکن (چونکە ڕکاتی دووەمی ئیمام دەبێتە ڕکاتی یەکەمی ئەو و ڕکاتی چوارەمی ئیمامیش دەبێتە ڕکاتی سێیەمی ئەو)، ئەوانیش گوتیان: بەڵێ با تەحیاتی لەگەڵ بخوێنێ.

ئیمامی مالیك ﷺ گوتوویەتی: لەلای ئێمە کار بەوە دەکرێ.

---

(١) ـ مقطوع صحيح. أخرجه أبو مصعب الزهري: ٥٠٣ في الجمعة؛ والحدثاني: ١٦٢ أ في الصلاة؛ ومصنف ابن أبي شيبة: ٨٦٥٢ في الصلوات، كلهم عن مالك به.

## ١٤- ئەو کەسەی بەر لە ئیمام سەری بەرز دەکاتەوە چی دەکات (چۆن چارەی بابەتەکە دەکات؟)[١]

**٢٤٥-** عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ ﷺ، أَنَّهُ قَالَ: الَّذِي يَرْفَعُ رَأْسَهُ وَيَخْفِضُهُ قَبْلَ الإِمَامِ، فَإِنَّمَا نَاصِيَتُهُ بِيَدِ شَيْطَانٍ[٢].

واتە: لە ئەبو هورەیرەوە ﷺ گێردراوەتەوە گوتوویەتی: ئەو کەسەی سەری بەرز و نزم دەکاتەوە بەر لە ئیمام، ئەوە ناوچەوانی بەدەستی شەیتانەوەیە (واتە خۆی داوەتە دەستی شەیتان).

**٢٤٦-** قَالَ مَالِكٌ ﷺ فِيمَنْ سَهَا فَرَفَعَ رَأْسَهُ قَبْلَ الإِمَامِ فِي رُكُوعٍ أَوْ سُجُودٍ: إِنَّ السُّنَّةَ فِي ذَلِكَ، أَنْ يَرْجِعَ رَاكِعًا أَوْ سَاجِدًا، وَلاَ يَنْتَظِرُ الإِمَامَ، وَذَلِكَ خَطَأٌ مِمَّنْ فَعَلَهُ، لأَنَّ رَسُولَ اللهِ ﷺ قَالَ: إِنَّمَا جُعِلَ الإِمَامُ لِيُؤْتَمَّ بِهِ، فَلاَ تَخْتَلِفُوا عَلَيْهِ، وَقَالَ أَبُو هُرَيْرَةَ ﷺ: الَّذِي يَرْفَعُ رَأْسَهُ وَيَخْفِضُهُ قَبْلَ الإِمَامِ، إِنَّمَا نَاصِيَتُهُ بِيَدِ شَيْطَانٍ[٣].

واتە: ئیمامی مالیك ﷺ دەربارەی ئەو کەسەی پێشی ئیمام سەری بەرز دەکاتەوە لە ڕکوع یان لە سوژدە، گوتوویەتی: دەربارەی ئەو کەسە سوننەت وایە بگەڕێتەوە بۆ ڕکوع یان سوژدە وە چاوەڕێی ئیمام نەکات (تا هەڵسێتەوە)، ئەوە هەڵەیە لەلایەن ئەو کەسەی ئەنجامی دەدات (کەواتە نابێ لەسەر هەڵەکە بەردەوام بێت، بەڵکو دەبێ بگەڕێتەوە بۆ شوێنکەوتنی ئیمام)، چونکە پێغەمبەری خوا ﷺ فەرموویەتی: ئیمام بۆ ئەوە دانراوە تا شوێنی بکەون، جیاواز مەبن لە شوێنکەوتنی، وە ئەبو هورەیرە ﷺ دەیگوت: ئەو کەسەی سەری بەرز و نزم دەکاتەوە بەر لە ئیمام، ئەوە نەوچەوانی بەدەستی شەیتانەوەیە (واتە خۆی داوەتە دەستی شەیتان).

---

(١) ـ مَا يَفْعَلُ مَنْ رَفَعَ رَأْسَهُ قَبْلَ الإِمَامِ.

(٢) ـ صحيح. أخرجه أبو مصعب الزهري: ٤٩٢ في الجمعة؛ والحدثاني: ١٥٨ في الصلاة؛ وفي: ١٥٨ب في الصلاة، عن مالك به.

(٣) ـ أخرجه أبو مصعب الزهري: ٤٩٣ في الجمعة؛ والحدثاني: ١٥٨ أ في الصلاة؛ وفي: ١٥٨ب في الصلاة، عن مالك به.




## ١٥- ئەو کەسەی بە هەڵە لە دووەم ڕکات سەلام دەداتەوە چی دەکات (لە کاتێکدا نوێژەکە سێ یان چوار ڕکاتییە)[١]

٢٤٧- عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ ﷺ، أَنَّ رَسُولَ اللهِ ﷺ انْصَرَفَ مِنَ اثْنَتَيْنِ، فَقَالَ لَهُ ذُو الْيَدَيْنِ: أَقَصُرَتِ الصَّلاَةُ أَمْ نَسِيتَ يَا رَسُولَ اللهِ؟ فَقَالَ رَسُولُ اللهِ ﷺ: أَصَدَقَ ذُو الْيَدَيْنِ؟ فَقَالَ النَّاسُ: نَعَمْ، فَقَامَ رَسُولُ اللهِ ﷺ، فَصَلَّى رَكْعَتَيْنِ أُخْرَيَيْنِ، ثُمَّ سَلَّمَ، ثُمَّ كَبَّرَ، فَسَجَدَ مِثْلَ سُجُودِهِ أَوْ أَطْوَلَ، ثُمَّ رَفَعَ، ثُمَّ كَبَّرَ فَسَجَدَ مِثْلَ سُجُودِهِ أَوْ أَطْوَلَ، ثُمَّ رَفَعَ[٢].

واتە: لە ئەبو هوڕەیڕەوە ﷺ گێردراوەتەوە (گوتوویەتی): (جارێکیان) پێغەمبەری خوا ﷺ لە دووەم ڕکات سەلامی دایەوە (لە کاتێکدا نوێژەکە چوار ڕکاتی بوو)، جا ذول یەدەین ﷺ (یە کێك بوو لە هاوەڵان) گوتی: ئایا نوێژ کورتکراوەتەوە، یان لەیادت چوو (دوو ڕکاتەکەی دیکە بکەی) ئەی پێغەمبەری خوا؟ پێغەمبەری خواش ﷺ فەرمووی: ئایا ذول یەدەین ڕاست دەکات؟ خەڵکەکەش گوتیان: بەڵێ، جا پێغەمبەری خوا ﷺ هەڵسا و دوو ڕکاتی دیکەی کرد، دواتر سەلامی دایەوە، دواتر «الله أکبر»ی کردو سوژدەی برد وەك سوژدەی ئاسایی خۆی یان درێژتر، دواتر هەڵسایەوە لە سوژدە، دواتر «الله أکبر»ی کرد و سوژدەیەکی دیکەی برد وەك سوژدەی ئاسایی خۆی یان درێژتر، دواتر سەری بەرز کردەوە.

٢٤٨- عَنْ أَبِي سُفْيَانَ، مَوْلَى ابْنِ أَبِي أَحْمَدَ ﷺ أَنَّهُ قَالَ: سَمِعْتُ أَبَا هُرَيْرَةَ ﷺ يَقُولُ: صَلَّى رَسُولُ اللهِ ﷺ صَلاَةَ الْعَصْرِ، فَسَلَّمَ فِي رَكْعَتَيْنِ، فَقَامَ ذُو الْيَدَيْنِ فَقَالَ: أَقَصُرَتِ الصَّلاَةُ يَا رَسُولَ اللهِ أَمْ نَسِيتَ؟ فَقَالَ رَسُولُ اللهِ ﷺ: كُلُّ ذَلِكَ لَمْ يَكُنْ، فَقَالَ: قَدْ كَانَ بَعْضُ ذَلِكَ يَا رَسُولَ اللهِ، فَأَقْبَلَ رَسُولُ اللهِ ﷺ عَلَى النَّاسِ، فَقَالَ: أَصَدَقَ ذُو الْيَدَيْنِ؟ فَقَالُوا: نَعَمْ، فَقَامَ رَسُولُ اللهِ ﷺ فَأَتَمَّ مَا بَقِيَ مِنَ الصَّلاَةِ، ثُمَّ سَجَدَ سَجْدَتَيْنِ بَعْدَ التَّسْلِيمِ وَهُوَ جَالِسٌ[٣].

---

(١) ـ مَا يَفْعَلُ مَنْ سَلَّمَ مِنْ رَكْعَتَيْنِ سَاهِيًا.

(٢) ـ صحيح. أخرجه أبو مصعب الزهري: ٤٧٠ في الجمعة؛ والشافعي: ٨٩٦؛ والبخاري: ٧١٤ في الأذان، وفي: ١٢٢٨ في السهو، وفي: ٧٢٥٠ في خبر الواحد؛ والنسائي: ١٢٢٥ في السهو؛ وأبو داود: ١٠٠٩ في الركوع والسجود؛ والترمذي: ٣٩٩ في الصلاة؛ وابن حبان: ٢٦٨٦؛ والقابسي: ١٢٨، كلهم عن مالك به.

(٣) ـ صحيح. أخرجه أبو مصعب الزهري: ٤٧١ في الجمعة؛ والحدثاني: ١٤٩ أ في الصلاة؛ والشيباني: ١٣٧ في

واتە: لە ئەبو سوفیانی خزمەتکاری ئازادکراوی ئیبنو ئەبو ئەحمەدەوە ﷺ گێڕدراوەتەوە گوتوویەتی: گوێم لە ئەبو هورەیرە ﷺ بوو دەیگوت: (جارێکیان) پێغەمبەری خوا ﷺ نوێژی عەسری کرد، جا لە ڕکاتی دووەمدا سەلامی دایەوە، ذول یەدەینیش هەڵسا و گوتی: ئایا نوێژ کورت کراوەتەوە ئەی پێغەمبەری خوا ﷺ یان لەیادت چوو؟ پێغەمبەری خواش ﷺ فەرمووی: هیچیان نەبوو، ذول یەدەینیش گوتی: بەدڵنیایی یەکێك لەمانە بووە ئەی پێغەمبەری خوا، پێغەمبەری خواش ﷺ ڕووی کردە خەڵکەکە و فەرمووی: ئایا ذول یەدەین ڕاست دەکات؟ گوتیان: بەڵێ، جا پێغەمبەری خوا ﷺ هەڵسا و ئەوەی مابوو لە نوێژەکە تەواوی کرد، دواتر دوای سەلامدانەوە بەدانیشتنەوە دوو سوژدەی برد.

**٢٤٩-** عَنْ أَبِي بَكْرِ بْنِ سُلَيْمَانَ بْنِ أَبِي حَثْمَةَ ﷺ قَالَ: بَلَغَنِي أَنَّ رَسُولَ اللهِ ﷺ رَكَعَ رَكْعَتَيْنِ مِنْ إِحْدَى صَلاَتَيِ النَّهَارِ: الظُّهْرِ أَوِ الْعَصْرِ، فَسَلَّمَ مِنَ اثْنَتَيْنِ، فَقَالَ لَهُ ذُو الشِّمَالَيْنِ، رَجُلٌ مِنْ بَنِي زُهْرَةَ بْنِ كِلاَبٍ: أَقُصِرَتِ الصَّلاَةُ يَا رَسُولَ اللهِ أَمْ نَسِيتَ؟ فَقَالَ لَهُ رَسُولُ اللهِ ﷺ: مَا قَصُرَتِ الصَّلاَةُ وَمَا نَسِيتُ، فَقَالَ لَهُ ذُو الشِّمَالَيْنِ: قَدْ كَانَ بَعْضُ ذَلِكَ يَا رَسُولَ اللهِ، فَأَقْبَلَ رَسُولُ اللهِ ﷺ عَلَى النَّاسِ، فَقَالَ: أَصَدَقَ ذُو الْيَدَيْنِ؟ فَقَالُوا: نَعَمْ يَا رَسُولَ اللهِ، فَأَتَمَّ رَسُولُ اللهِ ﷺ مَا بَقِيَ مِنَ الصَّلاَةِ، ثُمَّ سَلَّمَ[1].

واتە: لە ئەبو بەکری کوڕی سولەیمانی کوڕی ئەبی حەثمەوە ﷺ گێڕدراوەتەوە گوتوویەتی: پێم گەیشتووە پێغەمبەری خوا ﷺ دوو ڕکاتی کرد لە یەکێك لە نوێژەکانی ڕۆژێك نیوەڕۆ یان عەسر بوو، جا لە دووەم ڕکاتدا سەلامی دایەوە، «ذول شیمالەین»یش کە پیاوێك بوو لە هۆزی زوهرەی کوڕی کیلاب (هاوەڵێکی قۆڵدرێژ بوو، لەبەر ئەوە پێیان دەوت ذول شیمالەین) پێی گوت: ئایا نوێژ کورت کراوەتەوە ئەی پێغەمبەری خوا ﷺ یان لەیادت چوو؟ پێغەمبەری خواش ﷺ فەرمووی: نە نوێژ کورت بۆتەوە و نە لەیادیشم چوو، «ذول شیمالەین»یش گوتی:

---

الصلاة؛ والشافعي: ٨٩٧؛ وابن حنبل: ٩٧٧٦، وفي: ٩٩٢٧، وفي: ٩٩٢٧؛ ومسلم: المساجد: ٩٩؛ والنسائي: ١٢٣٦ في السهو؛ وابن حبان: ٢٢٤٩، وفي: ٢٢٥١؛ والقابسي: ١٥٦، كلهم عن مالك به.

(١) ـ صحيح لغيره. أخرجه أبو مصعب الزهري: ٤٧٢ في الجمعة؛ والحدثاني: ١٥٠ في الصلاة، عن مالك به.

بەدڵنیایی یەکێك لەمانە ڕووی داوە، پێغەمبەری خواش ﷺ ڕووی کردە خەڵکەکە و فەرمووی: ئایا ذول یەدەین ڕاست دەکات؟ گوتیان: بەڵێ ئەی پێغەمبەری خوا ﷺ، جا پێغەمبەری خوا ﷺ ئەوەی تەواو کرد کە مابوو (واتە دوو ڕکاتی دیکەی کرد)، دواتر سەلامی دایەوە.

**٢٥٠- عَنْ سَعِيدِ بْنِ الْمُسَيَّبِ، وَعَنْ أَبِي سَلَمَةَ بْنِ عَبْدِ الرَّحْمَنِ ﷺ مِثْلَ ذَلِكَ[١].**

واتە: لە سەعیدی کوڕی موسەیەب و ئەبو سەلەمەی کوڕی عەبدورڕەحمانەوە ﷺ هەمان فەرموودە گێڕدراوەتەوە.

**٢٥١- [فتوى] قَالَ مَالِكٌ ﷺ: كُلُّ سَهْوٍ كَانَ نُقْصَانًا مِنَ الصَّلاَةِ، فَإِنَّ سُجُودَهُ قَبْلَ السَّلاَمِ، وَكُلُّ سَهْوٍ كَانَ زِيَادَةً فِي الصَّلاَةِ، فَإِنَّ سُجُودَهُ بَعْدَ السَّلاَمِ[٢].**

(فەتوا): ئیمامی مالیك ﷺ گوتوویەتی: گشت هەڵەیەك کە نوقسانی بێت لە نوێژدا (وەك ئەوەی لە نوێژی عەسر دوو ڕکات بکەیت و سەلام بدەیتەوە، دواتر زوو بزانیت و قەرەبووی بکەیتەوە)، ئەوە کڕنووشەکەی (کە بۆ قەرەبووکردنەوەی هەڵەکە دەیبات) بەر لە سەلامدانەوە دەبێ، وە گشت هەڵەیەك کە زیادە بێت لە نوێژدا، ئەوە کڕنووشەکەی دوای سەلامدانەوە دەبێت[٣].

---

(١) ـ صحيح لغيره. أخرجه الترمذي: الفرائض: ١٦، عن مالك به.

(٢) ـ أخرجه أبو مصعب الزهري: ٤٧٤ في الجمعة؛ والحدثاني: ١٥٠ب في الصلاة، عن مالك به.

(٣) ـ تێبینی: بەڵام لەلای ئیمامی شافیعی سوژدەی سەهوو تەنها لەدوای سەلامدانەوە دەبێ، بەپێی بەڵگەی خۆی.

## ١٦- تەواوکردنی ئەوەی نوێژخوێن بیری دەکەوێتەوە کاتێ گومانی بۆ پەیدا دەبێت لە نوێژەکەیدا[١]

**٢٥٢-** عَنْ عَطَاءِ بْنِ يَسَارٍ ﵀، أَنَّ رَسُولَ اللهِ ﷺ قَالَ: إِذَا شَكَّ أَحَدُكُمْ فِي صَلَاتِهِ، فَلَمْ يَدْرِ كَمْ صَلَّى، أَثَلَاثًا أَمْ أَرْبَعًا؟ فَلْيُصَلِّي رَكْعَةً، وَلْيَسْجُدْ سَجْدَتَيْنِ وَهُوَ جَالِسٌ، قَبْلَ التَّسْلِيمِ، فَإِنْ كَانَتِ الرَّكْعَةُ الَّتِي صَلَّى خَامِسَةً، شَفَعَهَا بِهَاتَيْنِ السَّجْدَتَيْنِ، وَإِنْ كَانَتْ رَابِعَةً، فَالسَّجْدَتَانِ تَرْغِيمٌ لِلشَّيْطَانِ[٢].

واتە: لە عەتائی کوڕی یەسارەوە ﵁ گێڕدراوەتەوە (گوتوویەتی): پێغەمبەری خوا ﷺ فەرموویەتی: ئەگەر یەکێك لە ئێوە گومانی بۆ پەیدابوو لە نوێژەکەیدا و نەیزانی چەند ڕکاتی کردووە، سێیە یان چوارە؟ ئەوە با ڕکاتێکی دیکە بکات و دوو سوژدەی سەهوو پێش سەلامدانەوە بە دانیشتنەوە ببات، جا ئەگەر (لە حەقیقەتدا) ئەو ڕکاتەی لە کۆتایی ئەنجامی دا پێنجەم ڕکات بوو، ئەوە بەو دوو سوژدەیە دەبنەوە جووت، وە ئەگەر ڕکاتەکەی کۆتایی کە زیادی کرد چوارەم ڕکات بوو، ئەوە دوو سوژدەکان دەبن بە ڕیسوایی بۆ شەیتان (چونکە شەیتان ویستی عیبادەتەکە بشێوێنێ بەڵام سەری نەگرت و بۆی نەلوا).

**٢٥٣-** عَنْ سَالِمِ بْنِ عَبْدِ اللهِ ﵀، أَنَّ عَبْدَ اللهِ بْنَ عُمَرَ ﵄ كَانَ يَقُولُ: إِذَا شَكَّ أَحَدُكُمْ فِي صَلَاتِهِ، فَلْيَتَوَخَّ الَّذِي يَظُنُّ أَنَّهُ نَسِيَ مِنْ صَلَاتِهِ، فَلْيُصَلِّهِ، ثُمَّ لْيَسْجُدْ سَجْدَتَيِ السَّهْوِ وَهُوَ جَالِسٌ[٣].

واتە: لە سالمی کوڕی عەبدوڵڵاوە ﵀ گێڕدراوەتەوە (گوتوویەتی): عەبدوڵڵای کوڕی عومەر ﵄ دەیگوت: ئەگەر یەکێك لە ئێوە گومانی لە نوێژەکەی هەبوو (نەیزانی چەند ڕکاتی کردووە یان لەکوێ هەڵەی کردووە)، ئەوە با (لە زیهن و مێشکی خۆی) لێکۆڵینەوە بکات لەوەی گومان دەبات لەیادی چووە و هەڵەی

---

(١) ـ إِتْمَامُ الْمُصَلِّيَ مَا ذَكَرَ إِذَا شَكَّ فِي صَلَاتِهِ.

(٢) ـ صحيح. أخرجه أبو مصعب الزهري: ٤٧٥ في الجمعة؛ والحدثاني: ١٥١ في الصلاة؛ والشيباني: ١٣٨ في الصلاة؛ وأبو داود: ١٠٢٦ في الركوع والسجود؛ وابن حبان: ٢٦٦٣، كلهم عن مالك به.

(٣) ـ صحيح. أخرجه أبو مصعب الزهري: ٤٧٦ في الجمعة؛ والحدثاني: ١٥١ أ في الصلاة، عن مالك به.

تیادا کردووە لە نوێژەکەیدا، ئینجا (ئەگەر بۆی دەرکەوت چی لەبیر چووە) با ئەنجامی بدات، دواتر (بەدانیشتنەوە) دوو سوژدەی سەهوو ببات لە کاتێکدا بە دانیشتنەوەیە.

**٢٥٤-** عَنْ عَطَاءِ بْنِ يَسَارٍ ﷺ، أَنَّهُ قَالَ: سَأَلْتُ عَبْدَ اللهِ بْنَ عَمْرِو بْنِ الْعَاصِ ﷺ، وَكَعْبَ الأَحْبَارِ عَنِ الَّذِي يَشُكُّ فِي صَلاَتِهِ فَلاَ يَدْرِي كَمْ صَلَّى أَثَلاَثًا أَمْ أَرْبَعًا؟ فَكِلاَهُمَا قَالَ: لِيُصَلِّ رَكْعَةً أُخْرَى، ثُمَّ لْيَسْجُدْ سَجْدَتَيْنِ وَهُوَ جَالِسٌ[1].

واتە: لە عەتائی کوڕی یەسارەوە ﷺ گێڕدراوەتەوە (گوتوویەتی): پرسیارم لە عەبدوڵڵای کوڕی عەمری کوڕی عاص و کەعبی ئەحبار ﷺ کرد، دەربارەی ئەو کەسەی گومانی بۆ دروست دەبێت لە نوێژەکەیدا، نازانێ چەند ڕکاتی کردووە، سێ یان چوار؟ هەردووکیان گوتیان: با ڕکاتێکی دیکە بکات (چونکە دەبێت یەقین هەڵبژێرێ کە بریتییە لە ژمارە کەمەکە)، دواتر بەدانیشتنەوە دوو سوژدە ببات.

**٢٥٥-** عَنْ نَافِعٍ ﷺ، أَنَّ عَبْدَ اللهِ بْنَ عُمَرَ ﷺ كَانَ إِذَا سُئِلَ عَنِ النِّسْيَانِ فِي الصَّلاَةِ، قَالَ: لِيَتَوَخَّ أَحَدُكُمِ الَّذِي يَظُنُّ أَنَّهُ نَسِيَ مِنْ صَلاَتِهِ، فَلْيُصَلِّهِ[2].

واتە: لە نافیعەوە ﷺ گێڕدراوەتەوە (گوتوویەتی): عەبدوڵڵای کوڕی عومەر ﷺ کاتێ پرسیاری لێکرابا دەربارەی سەهوو و لەبیرچوونەوە لە نوێژدا، دەیگوت: هەر یەکێك لە ئێوە کە گومانی هەیە لە نوێژەکەیدا بەوەی هەڵە و لەبیرچوونەوە ڕووی دابێت با لێبکۆڵێتەوە (تا بزانێت لە کوێ هەڵەی کردووە)، جا با نوێژەکە بکات (واتە ئەوە ئەنجام بدات کە بێگومانە لێی).

---

(١) ـ صحيح. أخرجه أبو مصعب الزهري: ٤٧٧ في الجمعة؛ والحدثاني: ١٥٢ في الصلاة؛ والشيباني: ١٤٠ في الصلاة؛ ومصنف ابن أبي شيبة: ٤٤١١ في الصلوات، كلهم عن مالك به.

(٢) ـ صحيح. أخرجه أبو مصعب الزهري: ٤٧٨ في الجمعة؛ والحدثاني: ١٥٢ أ في الصلاة؛ والشيباني: ١٤١ في الصلاة، كلهم عن مالك به.

## ١٧- ئەو کەسەی دوای تەواوبوونی نوێژ یان لە ڕکاتی دووەمدا هەڵدەستێتەوە[١]

**٢٥٦- عَنْ عَبْدِ اللهِ ابْنِ بُحَيْنَةَ ﷺ أَنَّهُ قَالَ: صَلَّى لَنَا رَسُولُ اللهِ ﷺ رَكْعَتَيْنِ، ثُمَّ قَامَ فَلَمْ يَجْلِسْ، فَقَامَ النَّاسُ مَعَهُ، فَلَمَّا قَضَى صَلاَتَهُ، وَنَظَرْنَا تَسْلِيمَهُ، كَبَّرَ، ثُمَّ سَجَدَ سَجْدَتَيْنِ وَهُوَ جَالِسٌ قَبْلَ التَّسْلِيمِ، ثُمَّ سَلَّمَ[٢].**

واتە: لە عەبدوڵڵای کوڕی بوحەینەوە ﷺ گێڕدراوەتەوە گوتوویەتی: پێغەمبەری خوا ﷺ (لە نوێژێکی چوار ڕکاتی) دوو ڕکات نوێژی بۆ کردین، دواتر (بۆ تەحیات) هەڵسا و دانەنیشت، خەڵکیش لەگەڵی هەڵسان (خۆشی زانی بیری چووە)، جا کاتێ گەیشتە کۆتایی نوێژەکەی لە کاتێکدا ئێمە چاوەڕێی سەلامدانەوەیان دەکرد، «الله أکبر»ی کرد، دواتر بەر لە سەلامدانەوە دوو سوژدەی برد لە کاتێکدا دانیشتبوو (دوای تەحیات)، دواتر سەلامی دایەوە.

**٢٥٧- عَنْ عَبْدِ اللهِ ابْنِ بُحَيْنَةَ ﷺ أَنَّهُ قَالَ: صَلَّى لَنَا رَسُولُ اللهِ ﷺ الظُّهْرَ، فَقَامَ فِي اثْنَتَيْنِ وَلَمْ يَجْلِسْ فِيهِمَا، فَلَمَّا قَضَى صَلاَتَهُ، سَجَدَ سَجْدَتَيْنِ ثُمَّ سَلَّمَ بَعْدَ ذَلِكَ[٣].**

واتە: لە عەبدوڵڵای کوڕی بوحەینەوە ﷺ گێڕدراوەتەوە گوتوویەتی: پێغەمبەری خوا ﷺ نوێژی نیوەڕۆی بۆ کردین، جا لە ڕکاتی دووەم هەڵسا و دانەنیشت، جا کاتێ گەیشتە کۆتایی نوێژەکەی، دوو سوژدەی برد، دواتر سەلامی دایەوە.

**٢٥٨- [فتوى] قَالَ مَالِكٌ ﷺ: فِيمَنْ سَهَا فِي صَلاَتِهِ، فَقَامَ بَعْدَ إِتْمَامِهِ الأَرْبَعَ، فَقَرَأَ ثُمَّ رَكَعَ، فَلَمَّا رَفَعَ رَأْسَهُ مِنْ رُكُوعِهِ، ذَكَرَ أَنَّهُ قَدْ كَانَ أَتَمَّ إِنَّهُ يَرْجِعُ، فَيَجْلِسُ وَلاَ يَسْجُدُ، وَلَوْ سَجَدَ**

---

(١) ـ مَنْ قَامَ بَعْدَ الإِتْمَامِ أَوْ فِي الرَّكْعَتَيْنِ.

(٢) ـ صحيح. أخرجه أبو مصعب الزهري: ٤٨٠ في الجمعة؛ والحدثاني: ١٥٣ في الصلاة؛ والشيباني: ١٣٩ في الصلاة؛ والشافعي: ١٧٤؛ وفي: ١٠٢٢؛ وابن حنبل: ٢٢٩٧٩؛ والبخاري: ١٢٢٤ في السهو؛ ومسلم: المساجد: ٨٥؛ والنسائي: ١٢٢٢ في السهو؛ وأبو داود: ١٠٣٤ في الركوع والسجود؛ والدارمي: ١٤٩٩ في الأذان؛ والقابسي: ٨١، كلهم عن مالك به.

(٣) ـ صحيح. أخرجه أبو مصعب الزهري: ٤٨١ في الجمعة؛ والحدثاني: ١٥٣ أ في الصلاة؛ والشافعي: ١٧٥؛ والبخاري: ١٢٢٥ في السهو؛ والقابسي: ٤٨٩، كلهم عن مالك به.





إِحْدَى السَّجْدَتَيْنِ لَمْ أَرَ أَنْ يَسْجُدَ الأُخْرَى، ثُمَّ إِذَا قَضَى صَلاَتَهُ فَلْيَسْجُدْ سَجْدَتَيْنِ وَهُوَ جَالِسٌ، بَعْدَ التَّسْلِيمِ[١].

(فەتوا): ئیمامی مالیك ﷺ دەربارەی ئەو كەسەی لە نوێژەكەیدا هەڵە دەكات، (لە نوێژێكی چوار ڕكاتی) هەڵدەستێتەوە پاش تەواوكردنی چوار ڕكاتەكە، جا قوڕئانی هەڵسانەوەی خوێند و دواتر ڕكوعی برد، جا كاتێ سەری بەرز كردەوە لە ڕكوع بیری كەوتەوە كە نوێژەكەی بەتەواوی كردووە (و ئەو ڕكاتە زیادە)، گوتوویەتی: (حوكمەكەی ئاوایە): دەگەڕێتەوە و دادەنیشێت و سوژدە نابات، ئەگەر سوژدەیەك لە دوو سوژدەكانی برد بۆچوونمان وا نییە سوژدەكەی دیكە ببات، دواتر كاتێ نوێژەكەی تەواو كرد با دوو سوژدە ببات بەدانیشتنەوە، دوای سەلامدانەوە (چونكە ئەگەر زیادە لە نوێژدا ڕووی دا بەپێی مەزهەبی ئیمامی مالیك سوژدەی سەهوو لەدوای سەلامدانەوە دەبات)[٢].

## ١٨- سەیركردنی شتێك لە نوێژدا كە سەرقاڵت دەكات و لاتدەدات لە نوێژ[٣]

**٢٥٩-** أَنَّ عَائِشَةَ ﵂ زَوْجَ النَّبِيِّ ﷺ قَالَتْ: أَهْدَى أَبُو جَهْمِ بْنُ حُذَيْفَةَ ﵁ لِرَسُولِ اللهِ ﷺ خَمِيصَةً شَامِيَّةً، لَهَا عَلَمٌ، فَشَهِدَ فِيهَا الصَّلاَةَ، فَلَمَّا انْصَرَفَ قَالَ: رُدِّي هَذِهِ الْخَمِيصَةَ إِلَى أَبِي جَهْمٍ، فَإِنِّي نَظَرْتُ إِلَى عَلَمِهَا فِي الصَّلاَةِ، فَكَادَ يَفْتِنُنِي[٤].

واتە: عائیشەی ﵂ خێزانی پێغەمبەر ﷺ گوتوویەتی: ئەبو جەهمی كوڕی حوذەیفە ﵁ پۆشاكێكی شامی كردە دیاری بۆ پێغەمبەری خوا ﷺ، كە وێنەی پێوە بوو، جا نوێژی پێوە كرد، كاتێ لێ بۆیەوە فەرمووی: ئەو پۆشاكە خەتخەت و بە

---

(١) ـ أخرجه أبو مصعب الزهري: ٤٨٢ في الجمعة؛ والحدثاني: ١٥٤ في الصلاة، عن مالك به.

(٢) ـ سەیری تێبینی فەتوای ژمارە (٢٥١) بكە.

(٣) ـ النَّظَرُ فِي الصَّلَاةِ إِلَىَ مَا يَشْغَلُكَ عَنْهَا.

(٤) ـ حسن. أخرجه أبو مصعب الزهري: ٤٨٤ في الجمعة؛ والحدثاني: ١٥٥ في الصلاة؛ وابن حنبل: ٢٥٤٨٤؛ وابن حبان: ٢٣٣٨؛ والقابسي: ٤٠٤، كلهم عن مالك به.

نەخشە بۆ ئەبو جەهم ببەوە، چونکە من سەیری نەخش و خەتخەتییەکەیم کرد لە نوێژدا، خەریك بوو سەرقاڵم بکات.

**٢٦٠-** عَنْ هِشَامِ بْنِ عُرْوَةَ ، عَنْ أَبِيهِ، أَنَّ رَسُولَ اللهِ ﷺ لَبِسَ خَمِيصَةً لَهَا عَلَمٌ، ثُمَّ أَعْطَاهَا أَبَا جَهْمٍ وَأَخَذَ مِنْ أَبِي جَهْمٍ أَنْبِجَانِيَّةً لَهُ، فَقَالَ: يَا رَسُولَ اللهِ، وَلِمَ؟ فَقَالَ: إِنِّي نَظَرْتُ إِلَى عَلَمِهَا فِي الصَّلاَةِ(١).

واتە: لە هیشامی کوڕی عورووەوە  گێڕدراوەتەوە، ئەویش لە باوکیەوە گێڕاویەتەوە (گوتوویەتی): پێغەمبەری خوا ﷺ پۆشاکێکی کردەبەری کە نەخشی پێوە بوو، دواتر دای بە ئەبو جەهم و پۆشاکێکی سادەی لە ئەبو جەهم وەرگرت، ئەویش گوتی: بۆچی؟ پێغەمبەری خواش ﷺ فەرمووی: من سەیری نەخشەکەیم کرد لە نوێژدا (خەریك بوو سەرقاڵم بکات).

**٢٦١-** عَنْ عَبْدِ اللهِ بْنِ أَبِي بَكْرٍ ، أَنَّ أَبَا طَلْحَةَ الأَنْصَارِيَّ  كَانَ يُصَلِّي فِي حَائِطِهِ، فَطَارَ دُبْسِيٌّ، فَطَفِقَ يَتَرَدَّدُ، يَلْتَمِسُ مَخْرَجًا، فَأَعْجَبَهُ ذَلِكَ، فَجَعَلَ يُتْبِعُهُ بَصَرَهُ سَاعَةً، ثُمَّ رَجَعَ إِلَى صَلاَتِهِ، فَإِذَا هُوَ لاَ يَدْرِي كَمْ صَلَّى؟ فَقَالَ: لَقَدْ أَصَابَتْنِي فِي مَالِي هَذَا فِتْنَةٌ، فَجَاءَ إِلَى رَسُولِ اللهِ ﷺ، فَذَكَرَ لَهُ الَّذِي أَصَابَهُ فِي حَائِطِهِ مِنَ الْفِتْنَةِ، وَقَالَ: يَا رَسُولَ اللهِ، هُوَ صَدَقَةٌ لِلَّهِ فَضَعْهُ حَيْثُ شِئْتَ(٢).

واتە: لە عەبدوڵڵای کوڕی ئەبو بەکرەوە  گێڕدراوەتەوە (گوتوویەتی): ئەبو تەڵحەی ئەنصاری  هەموو جار لەناو باخەکەی خۆی نوێژی دەکرد، جا کۆختییەك (کە باڵندەیەکی ڕەنگ خاکییە و لە کۆتر دەچێت) فڕی و هەر دەهات و دەچوو (تا دارخورماکان جێبهێڵێت و دەربچێ، لەبەر چڕی دارخورماکان بەئاسانی نەیدەتوانی دەربچێت) بەدوای دەرچەیەکدا دەگەڕا، ئەوە ئەبو تەڵحەی سەرسام کرد (بەوەی هەستی کرد دارخورماکانی چەندە چڕوپڕ و بەبەرن) ماوەیەك چاوی گێڕا (سەیری چڕوپڕی دارخورماکانی دەکرد)، دواتر فکر و چاوی گەڕایەوە بۆ

(١) ـ صحيح. أخرجه أبو مصعب الزهري: ٤٨٥ في الجمعة؛ والحدثاني: ١٥٥ أ في الصلاة، عن مالك به.

(٢) ـ ضعيف. أخرجه أبو مصعب الزهري: ٤٨٦ في الجمعة؛ والحدثاني: ١٥٦ في الصلاة، عن مالك به.

ناو نوێژەکەی، جا نەیزانی چەند ڕکات نوێژی کردووە، گوتی: بەدڵنیایی فیتنەیەکم تووش بوو بەهۆی ماڵەکەمەوە، جا هات بۆ لای پێغەمبەری خوا ﷺ و ئەو فیتنەیەی بۆ باس کرد کە تووشی ببوو لەناو باخەکەیدا و گوتی: باخەکەم صەدەقە بێت لە پێناوی خوا، لەوە بەکاری بێنە کە حەز دەکەیت.

**٢٦٢-** عَنْ عَبْدِ اللهِ بْنِ أَبِي بَكْرٍ ﷺ، أَنَّ رَجُلاً مِنَ الأَنْصَارِ كَانَ يُصَلِّي فِي حَائِطٍ لَهُ بِالْقُفِّ، وَادٍ مِنْ أَوْدِيَةِ الْمَدِينَةِ، فِي زَمَانِ الثَّمَرِ، وَالنَّخْلُ قَدْ ذُلِّلَتْ، فَهِيَ مُطَوَّقَةٌ بِثَمَرِهَا، فَنَظَرَ إِلَيْهَا، فَأَعْجَبَهُ مَا رَأَى مِنْ ثَمَرِهَا، ثُمَّ رَجَعَ إِلَى صَلاَتِهِ، فَإِذَا هُوَ لاَ يَدْرِي كَمْ صَلَّى؟ فَقَالَ: لَقَدْ أَصَابَتْنِي فِي مَالِي هَذَا فِتْنَةٌ، فَجَاءَ عُثْمَانَ بْنَ عَفَّانَ ﷺ، وَهُوَ يَوْمَئِذٍ خَلِيفَةٌ، فَذَكَرَ لَهُ ذَلِكَ، وَقَالَ: هُوَ صَدَقَةٌ، فَاجْعَلْهُ فِي سُبُلِ الْخَيْرِ، فَبَاعَهُ عُثْمَانُ بْنُ عَفَّانَ ﷺ بِخَمْسِينَ أَلْفًا، فَسُمِّيَ ذَلِكَ الْمَالُ الْخَمْسِينَ[1].

واتە: لە عەبدوڵڵای کوڕی ئەبو بەکرەوە ﷺ گێردراوەتەوە (گوتوویەتی): پیاوێك لە ئەنصارییەکان لەناو باخەکەی خۆی نوێژی دەکرد لە قوف کە دۆڵێکە لە دۆڵەکانی مەدینە، لە کاتی بەروبوومدا دارخورماکان لار ببوونەوە، دەورەدرابوون بە بەروبوومەکەی، ئەویش (لەناو نوێژەکە) سەیری کرد و بەروبوومەکە سەرسامی کرد، دواتر خەیاڵ و چاوی گەڕایەوە ناو نوێژەکە، جا سەیر دەکات نازانێ چەند ڕکات نوێژی کردووە؟ جا گوتی: بەدڵنیایی لەم ماڵ و سەروەتەمدا تووشی تاقیکردنەوە بووم، ئەوەبوو هات بۆ لای عوسمانی کوڕی عەففان ﷺ کە لەو ڕۆژگارەدا خەلیفە بوو، ئەویش ئەوەی بۆ باس کرد و گوتی: ئەوە باخەکەم کردە خێر، بۆ ڕێگەی خێر بەکاری بێنە، جا عوسمانی کوڕی عەففان ﷺ بە پەنجا هەزار فرۆشتی، ئەم باخە ناونرا باخی پەنجا هەزاری (چونکە بە پەنجا هەزار فرۆشرابوو).

---

(١) ـ ضعيف. أخرجه أبو مصعب الزهري: ٤٨٧ في الجمعة؛ والحدثاني: ١٥٦ أ في الصلاة، عن مالك به.

## کرداری (چارەکردنی) هەڵە لە نوێژدا[١]

**٢٦٣-** عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ ﷺ، أَنَّ رَسُولَ اللهِ ﷺ قَالَ: إِنَّ أَحَدَكُمْ إِذَا قَامَ يُصَلِّي، جَاءَهُ الشَّيْطَانُ، فَلَبَسَ عَلَيْهِ، حَتَّى لاَ يَدْرِيَ كَمْ صَلَّى؟ فَإِذَا وَجَدَ ذَلِكَ أَحَدُكُمْ، فَلْيَسْجُدْ سَجْدَتَيْنِ وَهُوَ جَالِسٌ[٢].

واتە: لە ئەبو هورەیرەوە ﷺ گێردراوەتەوە (گوتوویەتی): پێغەمبەری خوا ﷺ فەرموویەتی: هەر یەکێك لە ئێوە کاتێ هەڵدەستێت نوێژ دەکات، شەیتان دێت بۆ لای و لێی تێکدەدات، تا وای لێدێ نازانێ چەند ڕکاتی کردووە، جا کاتێ یەکێك لە ئێوە ئەوەی بەسەرهات، با دوو سوژدە ببات لە کاتێکدا بەدانیشتنەوەیە.

**٢٦٤-** عَنْ مَالِكٍ ﷺ؛ أَنَّهُ بَلَغَهُ، أَنَّ رَسُولَ اللهِ ﷺ قَالَ: إِنِّي لأَنْسَى أَوْ أُنَسَّى لأَسُنَّ[٣].

واتە: لە ئیمامی مالیکەوە ﷺ گێردراوەتەوە پێی گەیشتووە پێغەمبەری خوا ﷺ فەرموویەتی: من بیرم دەچێتەوە (هەڵە دەکەم) یان بیرم دەبردرێتەوە (واتە خوا تووشی هەڵە و لەبیرچوونەوەم دەکات لەناو نوێژ و لە شتی دیکە)، تا ڕێگەچارە و ڕێباز و سوننەت دابنێم (بۆ ئوممەتەکەم)[٤].

**٢٦٥-** عَنْ مَالِكٍ ﷺ؛ أَنَّهُ بَلَغَهُ، أَنَّ رَجُلاً سَأَلَ الْقَاسِمَ بْنَ مُحَمَّدٍ ﷺ فَقَالَ: إِنِّي أَهِمُ فِي صَلاَتِي، فَيَكْثُرُ ذَلِكَ عَلَيَّ، فَقَالَ الْقَاسِمُ بْنُ مُحَمَّدٍ ﷺ: امْضِ فِي صَلاَتِكَ، فَإِنَّهُ لَنْ يَذْهَبَ عَنْكَ، حَتَّى تَنْصَرِفَ وَأَنْتَ تَقُولُ: مَا أَتْمَمْتُ صَلاَتِي[٥].

---

(١) ـ الْعَمَلُ فِي السَّهْوِ.

(٢) ـ صحيح. أخرجه أبو مصعب الزهري: ٤٧٩ في الجمعة؛ وفي: ٤٨٨ في الجمعة؛ والحدثاني: ١٥٢ب في الصلاة؛ وفي: ١٥٧ في الصلاة؛ والشيباني: ١٣٦ في الصلاة؛ والبخاري: ١٢٣٢ في السهو؛ ومسلم: المساجد: ٨٢؛ والنسائي: ١٢٥٢ في السهو؛ وأبو داود: ١٠٣٠ في الركوع والسجود؛ والقابسي: ٢٤، كلهم عن مالك به.

(٣) ـ ضعيف. أخرجه أبو مصعب الزهري: ٤٨٩ في الجمعة، عن مالك به.

(٤) ـ تێبینی: کەواتە لەبیرچوونەوەکانی پێغەمبەری خوا ﷺ ڕەحمەتە بۆ ئوممەتەکەی، چونکە حوکمی شەرعییان لێ وەردەگیرێ و دەبنە ڕێگەچارە و دەرچە بۆ ئوممەتەکەی.

(٥) ـ مقطوع ضعيف. أخرجه أبو مصعب الزهري: ٤٩١ في الجمعة، عن مالك به.

واتە: لە ئیمامی مالیکەوە ﷺ گێڕدراوەتەوە (گوتوویەتی): پیاوێك پرسیاری لە قاسمی کوڕی موحەممەد ﷺ کرد و گوتی: من گومانێکی لاوازم بۆ دێت لە نوێژەکەم (هەر دەڵێم ڕەنگە ڕکاتێکم کەمتر کردبێت)، ئەوەم زۆر بەسەر دێ، قاسمی کوڕی موحەممەدیش ﷺ گوتی: لە نوێژەکەت بەردەوام بە (حیساب بۆ ئەو گومانە کەمە مەکە)، چونکە ئەوە وازت لێ ناهێنێ، تا تەواو دەبێت تۆ هەر دەڵێیت: نوێژەکەم تەواو نەکرد (واتە هەر دەڵێی ڕکاتێکم ماوە، بۆیە گوێی پێ مەدە مادەم گومانەکە بەهێز نییە و لێت بووە بە وەسوەسە)[1].

-----------------------------

(١) ـ تێبینی: ئەو گوێپێنەدانە لە کاتێکدایە کە تەنها وەسوەسە بێت و هیچ حەقیقەتێکی نەبێ، ئەگەرنا نابێت نوێژ بە ئیهمالی بکرێت و گوێ بە هیچ گومانێك نەدرێت.

## ١- كرداری خۆشۆردنی ڕۆژی هەینی[1]

**٢٦٦-** عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ ﷺ، أَنَّ رَسُولَ اللهِ ﷺ قَالَ: مَنِ اغْتَسَلَ يَوْمَ الْجُمُعَةِ غُسْلَ الْجَنَابَةِ، ثُمَّ رَاحَ فِي السَّاعَةِ الأولَى، فَكَأَنَّمَا قَرَّبَ بَدَنَةً، وَمَنْ رَاحَ فِي السَّاعَةِ الثَّانِيَةِ، فَكَأَنَّمَا قَرَّبَ بَقَرَةً، وَمَنْ رَاحَ فِي السَّاعَةِ الثَّالِثَةِ، فَكَأَنَّمَا قَرَّبَ كَبْشًا أَقْرَنَ، وَمَنْ رَاحَ فِي السَّاعَةِ الرَّابِعَةِ، فَكَأَنَّمَا قَرَّبَ دَجَاجَةً، وَمَنْ رَاحَ فِي السَّاعَةِ الْخَامِسَةِ، فَكَأَنَّمَا قَرَّبَ بَيْضَةً، فَإِذَا خَرَجَ الإِمَامُ، حَضَرَتِ الْمَلاَئِكَةُ يَسْتَمِعُونَ الذِّكْرَ[2].

واتە: لە ئەبو هورەیرەوە ﷺ گێردراوەتەوە (گوتوویەتی): پێغەمبەری خوا ﷺ فەرموویەتی: هەر كەسێك خۆی بشۆرێ وەك خۆشۆردنی جەنابەت، دواتر لە كاتی سەرەتا چوو بۆ مزگەوت (لە ڕۆژی هەینی)، ئەوە وەك ئەوە وایە وشترێكی كردبێتە خێر، وە هەر كەسێك لە كاتی دووەمدا بڕوات وەك ئەوە وایە مانگایەكی كردبێت بە خێر، وە هەر كەسێك لە كاتی سێیەمدا بڕوات وەك ئەوە وایە بەرانێكی كردبێت بە خێر، وە هەر كەسێك لە كاتی چوارەمدا بڕوات وەك ئەوە وایە مریشكێكی كردبێت بە خێر، وە هەر كەسێك لە كاتی پێنجەمدا بڕوات وەك ئەوە وایە هێلكەیەكی كردبێت بە خێر، جا كاتێ ئیمام دەرچوو (لە ماڵەوە یان لە حوجرە، بۆ ناو مزگەوت بۆ وتاردان) فریشتەكان ئامادە دەبن و گوێ بۆ زیكر و یادی خوا دەگرن (كە بریتییە لە وتارەكە، جا چیدی پاداشت نانووسن).

**٢٦٧-** عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ ﷺ، أَنَّهُ كَانَ يَقُولُ: غُسْلُ يَوْمِ الْجُمُعَةِ وَاجِبٌ عَلَى كُلِّ مُحْتَلِمٍ، كَغُسْلِ الْجَنَابَةِ[3].

واتە: لە ئەبو هورەیرەوە ﷺ گێردراوەتەوە دەیگوت: خۆشۆردنی ڕۆژی هەینی لەسەر گشت باڵغێك پێویستە، (شێوازەكەشی بۆ بەجێگەیاندنی سوننەتی ڕۆژی

---

(١) ـ الْعَمَلُ فِي غُسْلِ يَوْمِ الْجُمُعَةِ.

(٢) ـ صحيح. أخرجه أبو مصعب الزهري: ٤٣٢ في الجمعة؛ والحدثاني: ١٣٦ في الصلاة؛ والشافعي: ٢٦٧؛ وابن حنبل: ٩٩٢٨؛ والبخاري: ٨٨١ في الجمعة؛ ومسلم: الجمعة: ١٠؛ والنسائي: ١٣٨٨ في الجمعة؛ وأبو داود، ٣٥١ في الطهارة؛ والترمذي: ٤٩٩ في الجمعة؛ وابن حبان: ٢٧٧٥؛ والقابسي: ٤٢٨، كلهم عن مالك به.

(٣) ـ صحيح. أخرجه أبو مصعب الزهري: ٤٣٣ في الجمعة؛ والحدثاني: ١٣٦أفي الصلاة؛ والشيباني: ٦٠ في الصلاة؛ والقابسي: ٢٧١، كلهم عن مالك به.

هەینی دەبێ) وەك خۆشۆردنی جەنابەت بێت (دەبێ گشت لاشە بەلانی کەم جوان تەڕ ببێت)[١].

**٢٦٨-** عَنْ سَالِمِ بْنِ عَبْدِ اللهِ ﷺ، أَنَّهُ قَالَ: دَخَلَ رَجُلٌ مِنْ أَصْحَابِ رَسُولِ اللهِ ﷺ الْمَسْجِدَ يَوْمَ الْجُمُعَةِ، وَعُمَرُ بْنُ الْخَطَّابِ ﷺ يَخْطُبُ، فَقَالَ عُمَرُ ﷺ: أَيَّةُ سَاعَةٍ هَذِهِ؟ فَقَالَ: يَا أَمِيرَ الْمُؤْمِنِينَ، انْقَلَبْتُ مِنَ السُّوقِ، فَسَمِعْتُ النِّدَاءَ، فَمَا زِدْتُ عَلَى أَنْ تَوَضَّأْتُ، فَقَالَ عُمَرُ: وَالْوُضُوءَ أَيْضًا؟ وَقَدْ عَلِمْتَ أَنَّ رَسُولَ اللهِ ﷺ كَانَ يَأْمُرُ بِالْغُسْلِ[٢].

واتە: لە سالمی کوڕی عەبدوڵلاوە ﷺ گێردراوەتەوە گوتوویەتی: پیاوێك لە هاوەڵانی پێغەمبەری خوا ﷺ لە ڕۆژی هەینی هاتە ناو مزگەوت لە کاتێکدا ئیمامی عومەری کوڕی خەتتاب ﷺ وتاری دەدا، جا ئیمامی عومەر ﷺ گوتی: ئەوە چ کاتێکە (بۆ ئەوەندە دوا کەوتی)؟ ئەویش گوتی: ئەی گەورەی باوەڕداران، لە بازار گەڕامەوە ڕاستەوخۆ گوێم لە بانگ بوو، لە دەستنوێژشۆردنێك زیاتر هیچم نەکردووە (خۆم لەماڵەوە دوا نەخستووە)، ئیمامی عومەریش ﷺ گوتی: دەستنوێژیش؟! لە کاتێکدا دەزانی پێغەمبەری خوا ﷺ فەرمانی بە خۆشۆردن کردووە (واتە جگە لە تاخیربوون و دواکەوتن پاداشتی خۆشۆردنیشت لەدەست داوە و تەنها بە دەستنوێژشۆردن وازت هێناوە؟!).

**٢٦٩-** عَنْ أَبِي سَعِيدٍ الْخُدْرِيِّ ﷺ، أَنَّ رَسُولَ اللهِ ﷺ قَالَ: غُسْلُ يَوْمِ الْجُمُعَةِ وَاجِبٌ عَلَى كُلِّ مُحْتَلِمٍ[٣].

---

(١) ـ تێبینی: زۆربەی زانایان وشەی (واجب)یان لەو فەرموودەیە بۆ شێوازەکە گەڕاندۆتەوە، بەڵام خودی خۆشۆردنەکە لای ئەوان سوننەتە، بەڵام لەلای ئەبو هورەیرە و هەندێ لە زانایان وشەی (واجب) بۆ حەقیقەتی واجیبوونە وەك غوسلی جەنابەت.

(٢) ـ صحيح. أخرجه أبو مصعب الزهري: ٤٣١ في الجمعة؛ والحدثاني: ١٣٥ب في الصلاة؛ والشيباني: ٦٢ في الصلاة؛ والشافعي: ٦١؛ وفي: ١١٨٧؛ وابن حنبل: ١٩٩، وفي: ٣١٢، كلهم عن مالك به.

(٣) ـ صحيح. أخرجه أبو مصعب الزهري: ٤٣٠ في الجمعة؛ والحدثاني: ١٣٥أفي الصلاة؛ والشيباني: ٥٨ في الصلاة؛ وابن حنبل: ١١٥٩٥؛ والبخاري: ٨٧٩ في الجمعة، وفي: ٨٩٥ في الجمعة؛ ومسلم: الجمعة: ٥؛ والنسائي: ١٣٧٧ في الجمعة؛ وأبو داود: ٣٤١ في الطهارة؛ وابن حبان: ١٢٢٨؛ والدارمي: ١٥٣٧؛ والقابسي: ٢٧١، كلهم عن مالك به.

واتە: لە ئەبو سەعیدی خودرییەوە ﷜ گێردراوەتەوە (گوتوویەتی): پێغەمبەری خوا ﷺ فەرموویەتی: خۆشۆردنی ڕۆژی هەینی لەسەر گشت باڵغێك حەق و پێویستە (بۆ بەجێگەیاندنی سوننەتی ڕۆژی هەینی).

**٢٧٠-** عَنْ نَافِعٍ ؒ، عَنِ ابْنِ عُمَرَ ؆؛ أَنَّ رَسُولَ اللهِ ﷺ قَالَ: إِذَا جَاءَ أَحَدُكُمُ الْجُمُعَةَ، فَلْيَغْتَسِلْ[١].

واتە: لە نافیعەوە ؒ گێردراوەتەوە، ئەویش لە ئیبنو عومەرەوە ؆ گێڕاویەتەوە (گوتوویەتی): پێغەمبەری خوا ﷺ فەرموویەتی: کاتێ یەکێك لە ئێوە ویستی بێتە نوێژی هەینی، ئەوە با خۆی بشۆرێ.

**٢٧١- [فتوى]** قَالَ مَالِكٌ ؒ: مَنِ اغْتَسَلَ يَوْمَ الْجُمُعَةِ، أَوَّلَ نَهَارِهِ، وَهُوَ يُرِيدُ بِذَلِكَ غُسْلَ الْجُمُعَةِ، فَإِنَّ ذَلِكَ الْغُسْلَ لاَ يَجْزِي عَنْهُ، حَتَّى يَغْتَسِلَ لِرَوَاحِهِ، وَذَلِكَ أَنَّ رَسُولَ اللهِ ﷺ قَالَ فِي حَدِيثِ ابْنِ عُمَرَ ؆: إِذَا جَاءَ أَحَدُكُمُ الْجُمُعَةَ، فَلْيَغْتَسِلْ[٢].

(فەتوا): ئیمامی مالیك ؒ گوتوویەتی: هەر کەسێك خۆی بشۆرێ لە ڕۆژی هەینی لە سەرەتای ڕۆژەکە، لە کاتێکدا مەبەستی ئەوە بێت خۆشۆردنی هەینی بەربکەوێ، ئەوە ئەو خۆشۆردنەی بۆ بەرناکەوێ، تا خۆی نەشۆرێت لە کاتی ڕۆیشتنی (بۆ مزگەوت)، لەبەر ئەوەی پێغەمبەری خوا ﷺ لەو فەرموودەی ئیبنو عومەر ؆ گێڕاویەتەوە فەرموویەتی: کاتێ یەکێك لە ئێوە ویستی بێت بۆ هەینی با خۆی بشۆرێ (کەواتە لەو کاتەی دەیەوێ بێت بۆ هەینی دەبێ خۆی بشۆرێ)[٣].

---

(١) ـ صحيح. أخرجه أبو مصعب الزهري: ٤٢٩ في الجمعة؛ والحدثاني: ١٣٥ في الصلاة؛ والشيباني: ٥٧ في الصلاة؛ وابن حنبل: ٥٣١١؛ والبخاري: ٨٧٧ في الجمعة؛ والنسائي: ١٣٧٦ في الجمعة؛ والدارمي: ١٥٣٦ في الأذان؛ والقابسي: ٢٠٤، كلهم عن مالك به.

(٢) ـ أخرجه أبو مصعب الزهري: ٤٣٤ في الجمعة؛ والحدثاني: ١٣٦ب في الصلاة، عن مالك به.

(٣) ـ تێبینی: بەڵام زۆربەی زانایان پێیان وایە لە دوای هەڵاتنی بەیانی ڕۆژی هەینی خۆشۆردن بەردەکەوێ، بەڵام ئەگەر تاخیرتر بکرێت تا کاتی چوون بۆ مزگەوت چاکترە.




**٢٧٢- [فتوى]** قَالَ مَالِكٌ ﷺ: وَمَنِ اغْتَسَلَ يَوْمَ الْجُمُعَةِ مُعَجِّلاً أَوْ مُؤَخِّرًا وَهُوَ يَنْوِي بِذَلِكَ غُسْلَ الْجُمُعَةِ، فَأَصَابَهُ مَا يَنْقُضُ وُضُوءَهُ، فَلَيْسَ عَلَيْهِ إِلاَّ الْوُضُوءُ، وَغُسْلُهُ ذَلِكَ مُجْزِئٌ عَنْهُ[1].

(فەتوا): ئیمامی مالیك ﷺ گوتوویەتی: هەر کەسێك خۆی بشۆرێ لە ڕۆژی هەینیدا جا زوو یان درەنگ بڕوا (بۆ مزگەوت، بە مەرجێك لەو کاتەی ویستوویەتی بڕوات خۆی شۆردبێت)، مەبەستیشی پێی بەجێهێنانی خۆشۆردنی هەینی بێ، جا تووشی یەکێك لەو شتانە بوو کە دەستنوێژ دەشکێنن، ئەوە هیچی لەسەر نییە جگە لە دەستنوێژ، خۆشۆردنەکەشی بەرکەوتووە (واتە پێویست ناکا دووبارە خۆی بشۆرێتەوە، خۆشۆردنەکەی هەڵناوەشێتەوە).

## ٢- ئەوەی هاتووە دەربارەی بێدەنگبوون لە ڕۆژی هەینیدا لە کاتێکدا ئیمام وتار دەدات[2]

**٢٧٣-** عنْ أَبِي هُرَيْرَةَ ﷺ، أَنَّ رَسُولَ اللهِ ﷺ قَالَ: إِذَا قُلْتَ لِصَاحِبِكَ أَنْصِتْ وَالإِمَامُ يَخْطُبُ يَوْمَ الْجُمُعَةِ، فَقَدْ لَغَوْتَ[3].

واتە: لە ئەبو هورەیرەوە ﷺ گێردراوەتەوە (گوتوویەتی): پێغەمبەری خوا ﷺ فەرموویەتی: ئەگەر بە هاوەڵەکەت گوت: بێدەنگ بە، لە کاتێکدا ئیمام وتاری دەدا لە ڕۆژی هەینیدا، ئەوە قسەیەکی بێهودەت کردووە - یان پاداشتی هەینییەکەت بەتاڵ کردۆتەوە - (چونکە هی تۆش هەر قسەکردنە، بۆیە ئەگەر نەهیشت کرد دەبێ بەئیشارەت بیکەیت نەك بەقسە).

---

(١) ـ أخرجه أبو مصعب الزهري: ٤٣٦ في الجمعة؛ والحدثاني: ١٣٦ج في الصلاة، عن مالك به.

(٢) ـ مَا جَاءَ فِي الإِنْصَاتِ يَوْمَ الْجُمُعَةِ وَالإِمَامُ يَخْطُبُ.

(٣) ـ صحيح. أخرجه أبو مصعب الزهري: ٤٣٧ في الجمعة؛ وفي: ٤٣٨ في الجمعة؛ والحدثاني: ١٣٨ في الصلاة؛ وفي: ١٣٨أفي الصلاة؛ والشيباني: ٢٣٠ في الصلاة؛ والشافعي: ٢٩٢؛ وفي: ٢٩٣؛ وابن حنبل: ١٠١٣٢، وفي: ١٠٣٠٥، وفي: ١٠٣٠٥؛ والنسائي: ١٥٧٧ في العيدين؛ وأبو داود: ١١١٢ في الجمعة؛ والدارمي: ١٥٤٨ في الأذان، وفي: ١٥٤٩ في الأذان، كلهم عن مالك به.




**٢٧٤-** عَنِ ابْنِ شِهَابٍ ﷺ، عَنْ ثَعْلَبَةَ بْنِ أَبِي مَالِكٍ الْقُرَظِيِّ رر، أَنَّهُ أَخْبَرَهُ، أَنَّهُمْ كَانُوا فِي زَمَانِ عُمَرَ بْنِ الْخَطَّابِ ﷺ، يُصَلُّونَ يَوْمَ الْجُمُعَةِ، حَتَّى يَخْرُجَ عُمَرُ، فَإِذَا خَرَجَ عُمَرُ ﷺ، وَجَلَسَ عَلَى الْمِنْبَرِ، وَأَذَّنَ الْمُؤَذِّنُونَ، قَالَ ثَعْلَبَةُ: جَلَسْنَا نَتَحَدَّثُ، فَإِذَا سَكَتَ الْمُؤَذِّنُونَ وَقَامَ عُمَرُ ﷺ يَخْطُبُ، أَنْصَتْنَا، فَلَمْ يَتَكَلَّمْ مِنَّا أَحَدٌ(١).

قَالَ ابْنُ شِهَابٍ ﷺ: فَخُرُوجُ الإِمَامِ يَقْطَعُ الصَّلاَةَ، وَكَلاَمُهُ يَقْطَعُ الْكَلاَمَ(٢).

واتە: لە ئیبنو شیهابەوە ﷺ گێردراوەتەوە، ئەویش لە ثەعلەبەی کوڕی ئەبو مالیکی قوڕەظییەوە ﷺ گێڕاویەتەوە کە هەواڵی پێداوە بەوەی ئەوان لە سەردەمی ئیمامی عومەری کوڕی خەتتابدا ﷺ لە ڕۆژی هەینیدا هەر نوێژیان دەکرد (نوێژی سوننەتی موتڵەق) تا ئیمامی عومەر ﷺ دەردەچوو (بۆ ناو مزگەوت) و لەسەر مینبەر دادەنیشت و بانگبێژەکان بانگیان دەدا، ثەعلەبە دەڵێ: لەو کاتەدا دادەنیشتین قسەمان دەکرد، جا کاتێ بانگبێژەکان بێدەنگ دەبوون و ئیمامی عومەر ﷺ هەڵدەستا وتاری دەدا، بێدەنگ دەبووین و هیچ کەسێك لە ئێمە قسەی نەدەکرد.

ئیبنو شیهاب ﷺ گوتوویەتی: دەرچوونی ئیمام (بۆ وتاردان) کۆتایی بە نوێژ دێنێ، قسە و وتاردانەکەشی کۆتایی بە قسە دێنێ.

**٢٧٥-** عَنْ مَالِكِ بْنِ أَبِي عَامِرٍ ﷺ، أَنَّ عُثْمَانَ بْنَ عَفَّانَ ﷺ كَانَ يَقُولُ فِي خُطْبَتِهِ، قَلَّمَا يَدَعُ ذَلِكَ إِذَا خَطَبَ: إِذَا قَامَ الإِمَامُ يَخْطُبُ يَوْمَ الْجُمُعَةِ، فَاسْتَمِعُوا وَأَنْصِتُوا، فَإِنَّ لِلْمُنْصِتِ الَّذِي لاَ يَسْمَعُ مِنَ الْحَظِّ، مِثْلَ مَا لِلْمُنْصِتِ السَّامِعِ، فَإِذَا قَامَتِ الصَّلاَةُ فَاعْدِلُوا الصُّفُوفَ، وَحَاذُوا بِالْمَنَاكِبِ، فَإِنَّ اعْتِدَالَ الصُّفُوفِ مِنْ تَمَامِ الصَّلاَةِ، ثُمَّ لاَ يُكَبِّرُ، حَتَّى يَأْتِيَهُ رِجَالٌ قَدْ وَكَّلَهُمْ بِتَسْوِيَةِ الصُّفُوفِ، فَيُخْبِرُونَهُ أَنْ قَدِ اسْتَوَتْ، فَيُكَبِّرُ(٣).

---

(١) ـ صحيح. أخرجه أبو مصعب الزهري: ٤٣٩ في الجمعة؛ والحدثاني: ١٣٨ب في الصلاة؛ والشافعي: ٢٧٢، كلهم عن مالك به.

(٢) ـ أخرجه أبو مصعب الزهري: ٤٤٠ في الجمعة؛ والحدثاني: ١٣٨ج في الصلاة؛ والشيباني: ٢٢٨ في الصلاة، كلهم عن مالك به.

(٣) ـ صحيح. أخرجه أبو مصعب الزهري: ٤٤١ في الجمعة؛ والحدثاني: ١٣٩ في الصلاة؛ والشيباني: ٩٨ في الصلاة؛ والشافعي: ٢٩٥؛ ومصنف ابن أبي شيبة: ٣٥٣٢ في الصلوات، كلهم عن مالك به.

واتە: لە مالیکی کوڕی ئەبو عامیرەوە ﷺ گێڕدراوەتەوە (گوتوویەتی): عوسمانی کوڕی عەففان ﷺ لە وتارەکانی دەیگوت: کاتێ ئیمام هەڵسا وتاری دا لە ڕۆژی هەینیدا، ئەوە گوێبگرن و بێدەنگ بن، چونکە ئەو کەسەی خۆی بێدەنگ دەکات کە گوێشی لە وتارەکە نییە (لەبەر دووری لە وتاربێژ) هەمان پشکی بۆ هەیە لە پاداشت وەك ئەو کەسەی خۆی بێدەنگ کردووە و گوێشی لێیەتی، جا کە کاتی نوێژ هات ڕیزەکان ڕاست و ڕێك بکەن، شانەکانیش بلکێنن بەیەکدی، چونکە ڕاست و ڕێکی ڕیز بەشێکە لە کاملّی نوێژ، جا کەم جار هەبوو واز لەو وتانە بێنێت کاتێ وتاری دەدا، دواتر نوێژی دەست پێ نەدەکرد تا ئەو پیاوانە دەهاتن بۆ لای کە ڕایسپاردبوون بۆ ڕاستکردنی ڕیزەکان و هەواڵیان پێ دەدا کە ڕیزەکان ڕاست و ڕێکن، ئینجا نوێژی دەست پێ دەکرد و «الله أكبر»ی دەکرد.

**٢٧٦-** عَنْ نَافِعٍ ﷺ، أَنَّ عَبْدَ اللهِ بْنَ عُمَرَ ﷺ رَأَى رَجُلَيْنِ يَتَحَدَّثَانِ وَالإِمَامُ يَخْطُبُ يَوْمَ الْجُمُعَةِ، فَحَصَبَهُمَا أَنِ اصْمُتَا[1].

واتە: لە نافیعەوە ﷺ گێڕدراوەتەوە (گوتوویەتی): عەبدوڵڵای کوڕی عومەر ﷺ دوو پیاوی بینی قسەیان دەکرد لە کاتێکدا ئیمام وتاری دەدا لە ڕۆژی هەینی، جا وردە بەردی تێگرتن بۆ ئەوەی بێدەنگ بن.

**٢٧٧-** عَنْ مَالِكٍ ﷺ؛ أَنَّهُ بَلَغَهُ أَنَّ رَجُلاً عَطَسَ يَوْمَ الْجُمُعَةِ وَالإِمَامُ يَخْطُبُ، فَشَمَّتَهُ إِنْسَانٌ إِلَى جَنْبِهِ، فَسَأَلَ عَنْ ذَلِكَ سَعِيدَ بْنَ الْمُسَيَّبِ، فَنَهَاهُ عَنْ ذَلِكَ، وَقَالَ: لاَ تَعُدْ[2].

واتە: لە ئیمامی مالیکەوە ﷺ گێڕدراوەتەوە پێی گەیشتووە پیاوێك پژمیوە لە ڕۆژی هەینی لە کاتێکدا ئیمام وتاری دەدا، کەسێکیش لە تەنیشتیەوە گوتی: يرحمك الله، جا (کەسەکە) پرسیاری دەربارەی ئەوە لە سەعیدی کوڕی موسەیەب کرد (کە ئاخۆ دروستە وەڵامی پژمین بدرێتەوە بەوەی من وەڵامم داوەتەوە)، ئەویش نەهی لێ کرد و گوتی: دووبارەی نەکەیتەوە.

---

(١) ـ صحيح. أخرجه أبو مصعب الزهري: ٤٤٥ في الجمعة، عن مالك به.

(٢) ـ مقطوع صحيح.

**٢٧٨-** عَنْ مَالِكٍ ﵀، أَنَّهُ سَأَلَ ابْنَ شِهَابٍ ﵀ عَنِ الْكَلاَمِ يَوْمَ الْجُمُعَةِ، إِذَا نَزَلَ الإِمَامُ عَنِ الْمِنْبَرِ، قَبْلَ أَنْ يُكَبِّرَ، فَقَالَ ابْنُ شِهَابٍ ﵀: لاَ بَأْسَ بِذَلِكَ[1].

واتە: لە ئیمامی مالیكەوە ﵀ گێردراوەتەوە پرسیاری لە ئیبنو شیهاب ﵀ كردووە دەربارەی قسەكردن لە ڕۆژی هەینی كاتێ ئیمام (وتار تەواو دەكات و) لە مینبەر دێتە خوارەوە، پێش ئەوەی «الله أكبر» بكات بۆ نوێژ دەستپێكردن، ئیبنو شیهابیش ﵀ گوتی: ئەوە هیچ كێشەیەكی نییە.

## ٣- ئەوەی هاتووە دەربارەی ئەو كەسەی بە ڕكاتێك ڕادەگات لە ڕۆژی هەینی (لە نوێژی هەینی)[2]

**٢٧٩-** عَنِ ابْنَ شِهَابٍ ﵀ أَنَّهُ كَانَ يَقُولُ: مَنْ أَدْرَكَ مِنْ صَلاَةِ الْجُمُعَةِ رَكْعَةً فَلْيُصَلِّ إِلَيْهَا أُخْرَى، قَالَ ابْنُ شِهَابٍ ﵀: وَهِيَ السُّنَّةُ[3].

واتە: لە ئیبنو شیهابەوە ﵀ گێردراوەتەوە دەیگوت: هەر كەسێك بە ڕكاتێك ڕابگات لە نوێژی هەینی، (ئەوە بە نوێژەكە ڕاگەیشتووە) با ڕكاتێكی دیكە بكات، ئیبنو شیهاب ﵀ گوتوویەتی: ئەوە ڕێبازی پێغەمبەری خوایە ﷺ.

**٢٨٠-** قَالَ مَالِكٌ ﵀: وَعَلَى ذَلِكَ أَدْرَكْتُ أَهْلَ الْعِلْمِ بِبَلَدِنَا، وَذَلِكَ أَنَّ رَسُولَ اللهِ ﷺ قَالَ: مَنْ أَدْرَكَ مِنَ الصَّلاَةِ رَكْعَةً، فَقَدْ أَدْرَكَ الصَّلاَةَ[4].

واتە: ئیمامی مالیك ﵀ گوتوویەتی: لەسەر ئەوە گەیشتووم بە زانایانی شارەكەم (مەدینە)، جا ئەوە لەبەر ئەوەیە پێغەمبەری خوا ﷺ فەرموویەتی: هەر كەسێك لە نوێژدا بە ڕكاتێك ڕابگات، ئەوە بە نوێژەكە ڕاگەیشتووە.

---

(١) ـ مقطوع صحيح. أخرجه أبو مصعب الزهري: ٤٤٣ في الجمعة؛ والحدثاني: ١٣٩ب في الصلاة، عن مالك به.

(٢) ـ مَا جَاءَ فِيمَنْ أَدْرَكَ رَكْعَةً يَوْمَ الْجُمُعَةِ.

(٣) ـ مقطوع صحيح.

(٤) ـ أخرجه أبو مصعب الزهري: ٤٤٦ في الجمعة؛ والحدثاني: ١٤٠ في الصلاة، عن مالك به.

٢٨١- [فتوى] قَالَ مَالِكٌ ﷺ: فِي الَّذِي يُصِيبُهُ زِحَامٌ يَوْمَ الْجُمُعَةِ، فَيَرْكَعُ وَلاَ يَقْدِرُ عَلَى أَنْ يَسْجُدَ حَتَّى يَقُومَ الإِمَامُ، أَوْ يَفْرُغَ الإِمَامُ مِنْ صَلاَتِهِ، أَنَّهُ إِنْ قَدَرَ عَلَى أَنْ يَسْجُدَ إِنْ كَانَ قَدْ رَكَعَ، فَلْيَسْجُدْ إِذَا قَامَ النَّاسُ، وَإِنْ لَمْ يَقْدِرْ عَلَى أَنْ يَسْجُدَ حَتَّى يَفْرُغَ الإِمَامُ مِنْ صَلاَتِهِ، فَإِنَّهُ أَحَبُّ إِلَيَّ أَنْ يَبْتَدِئَ صَلاَتَهُ ظُهْرًا أَرْبَعًا[1].

(فەتوا): ئیمامی مالیك ﷺ دەربارەی ئەو کەسەی تووشی قەرەباڵغی دەبێت لە ڕۆژی هەینیدا، جا ڕکوع دەبات و (لەبەر قەرەباڵغییەکە) ناتوانێت سوژدە ببات تا ئیمام هەڵدەستێتەوە، گوتوویەتی: ئەگەر توانی سوژدە ببات لە کاتێکدا ڕکوعی بردبوو، ئەوە با سوژدە ببات کاتێ خەڵك هەڵسانەوە، وە ئەگەر نەیتوانی سوژدە ببات تا ئیمام لە نوێژەکەی تەواو بوو، ئەوە پێم چاکە نوێژەکەی لە سەرەتاوە دەست پێ بکاتەوە بە چوار ڕکاتی نیوەڕۆ (چونکە بە هیچ ڕکاتێك ڕانەگەیشتووە و هەینی بەرنەکەوتووە).

## ٤- ئەوەی هاتووە دەربارەی ئەو کەسەی لووتی تووشی خوێنبەربوون دەبێت لە ڕۆژی هەینیدا[2]

٢٨٢- [فتوى] قَالَ مَالِكٌ ﷺ: مَنْ رَعَفَ يَوْمَ الْجُمُعَةِ، وَالإِمَامُ يَخْطُبُ، فَخَرَجَ فَلَمْ يَرْجِعْ، حَتَّى فَرَغَ الإِمَامُ مِنْ صَلاَتِهِ، فَإِنَّهُ يُصَلِّي أَرْبَعًا.

(فەتوا): ئیمامی مالیك ﷺ گوتوویەتی: هەر کەسێك لووتی تووشی خوێنبەربوون بوو لە ڕۆژی هەینیدا لە کاتێکدا ئیمام وتاری دەدا، جا چوو بۆ دەرەوە و نەگەڕایەوە تا ئیمام لە نوێژەکەی بۆیەوە، ئەوە چوار ڕکات نوێژ دەکات (واتە نوێژی نیوەڕۆ دەکات نەك هەینی).

٢٨٣- [فتوى] قَالَ مَالِكٌ ﷺ: فِي الَّذِي يَرْكَعُ رَكْعَةً مَعَ الإِمَامِ يَوْمَ الْجُمُعَةِ ثُمَّ يَرْعُفُ، فَيَخْرُجُ فَيَأْتِي وَقَدْ صَلَّى الإِمَامُ الرَّكْعَتَيْنِ كِلْتَيْهِمَا، أَنَّهُ يَبْنِي بِرَكْعَةٍ أُخْرَى مَا لَمْ يَتَكَلَّمْ[3].

---

(١) ـ أخرجه أبو مصعب الزهري: ٤٤٨ في الجمعة؛ والحدثاني: ١٤٠ب في الصلاة، عن مالك به.

(٢) ـ مَا جَاءَ فِيمَنْ رَعَفَ يَوْمَ الْجُمُعَةِ.

(٣) ـ أخرجه أبو مصعب الزهري: ٤٥٠ في الجمعة؛ والحدثاني: ١٤١ في الصلاة، عن مالك به.

(فەتوا): ئیمامی مالیك ﷺ دەربارەی ئەو کەسەی ڕکاتێك نوێژی لەگەڵ ئیمام کردووە لە ڕۆژی هەینیدا، دواتر لووتی تووشی خوێنبەربوون دەبێت و دەچێتە دەرەوە، دواتر دێتەوە لە کاتێکدا ئیمام هەردوو ڕکاتەکەی تەواو کردووە، گوتوویەتی: (لەسەر ڕکعەتەکەی پێشوو) ڕکاتێکی دیکە دەکات مادەم قسەی نەکردبێ.

**٢٨٤- [فتوى]** قَالَ مَالِكٌ ﷺ: لَيْسَ عَلَى مَنْ رَعَفَ، أَوْ أَصَابَهُ أَمْرٌ لاَ بُدَّ لَهُ مِنَ الْخُرُوجِ أَنْ يَسْتَأْذِنَ الإِمَامَ يَوْمَ الْجُمُعَةِ، إِذَا أَرَادَ أَنْ يَخْرُجَ[١].

(فەتوا): ئیمامی مالیك ﷺ گوتوویەتی: ئەو کەسەی لووتی تووشی خوێنبەربوون دەبێت یان شتێکی تووش دەبێت کە حەتمەن دەبێ بچێتە دەرەوە، ئەوە لەسەری نییە مۆڵەت لە ئیمام بخوازێت لە ڕۆژی هەینیدا، کاتێ دەیەوێ بچێتە دەرەوە.

## ٥- ئەوەی دەربارەی سەعی هاتووە لە ڕۆژی هەینیدا (ئاخۆ بە مانای چییە)[٢]

**٢٨٥-** عَنْ مَالِكٍ ﷺ، أَنَّهُ سَأَلَ ابْنَ شِهَابٍ عَنْ قَوْلِ اللهِ تعالى: ﴿يَٰٓأَيُّهَا ٱلَّذِينَ ءَامَنُوٓاْ إِذَا نُودِيَ لِلصَّلَوٰةِ مِن يَوۡمِ ٱلۡجُمُعَةِ فَٱسۡعَوۡاْ إِلَىٰ ذِكۡرِ ٱللَّهِ ۝٩﴾ الجمعة، فَقَالَ ابْنُ شِهَابٍ ﷺ: كَانَ عُمَرُ بْنُ الْخَطَّابِ ﷺ يَقْرَؤُهَا: إِذَا نُودِيَ لِلصَّلاَةِ مِنْ يَوْمِ الْجُمُعَةِ فَامْضُوا إِلَى ذِكْرِ اللهِ[٣].

واتە: لە ئیمامی مالیکەوە ﷺ گێڕدراوەتەوە پرسیاری لە ئیبنو شیهاب کردووە دەربارەی وتەی خوای پەروەردگار ﷻ: ﴿يَٰٓأَيُّهَا ٱلَّذِينَ ءَامَنُوٓاْ إِذَا نُودِيَ لِلصَّلَوٰةِ مِن يَوۡمِ ٱلۡجُمُعَةِ فَٱسۡعَوۡاْ إِلَىٰ ذِكۡرِ ٱللَّهِ ۝٩﴾ الجمعة ، ئیبنو شیهاب ﷺ گوتوویەتی: عومەری کوڕی خەتتاب ﷺ بەم شێوەیە دەیخوێندەوە: ((إِذَا نُودِيَ لِلصَّلاَةِ مِنْ يَوْمِ الْجُمُعَةِ فَامْضُوا إِلَى ذِكْرِ اللهِ )).

---

(١) ـ أخرجه أبو مصعب الزهري: ٤٥١ في الجمعة؛ والحدثاني: ١٤١ أ في الصلاة، عن مالك به.

(٢) ـ مَا جَاءَ فِي السَّعْيِ يَوْمَ الْجُمُعَةِ.

(٣) ـ صحيح موقوف. أخرجه أبو مصعب الزهري: ٤٥٥ في الجمعة؛ وفي: ٤٥٧ في الجمعة؛ والحدثاني: ١٤٢ في الصلاة، عن مالك به.

٢٨٦- قَالَ مَالِكٌ ﷺ: وَإِنَّمَا السَّعْيُ فِي كِتَابِ اللهِ الْعَمَلُ وَالْفِعْلُ، يَقُولُ اللهُ ﷻ: ﴿ وَإِذَا تَوَلَّىٰ سَعَىٰ فِي ٱلْأَرْضِ ﴿٢٠٥﴾ ﴾ البقرة، وَقَالَ تَعَالَى: ﴿ وَأَمَّا مَن جَآءَكَ يَسْعَىٰ ﴿٨﴾ وَهُوَ يَخْشَىٰ ﴿٩﴾ ﴾ عبس، وَقَالَ: ﴿ ثُمَّ أَدْبَرَ يَسْعَىٰ ﴿٢٢﴾ ﴾ النازعات، وَقَالَ: ﴿ إِنَّ سَعْيَكُمْ لَشَتَّىٰ ﴿٤﴾ ﴾ الليل، قَالَ مَالِكٌ: فَلَيْسَ السَّعْيُ الَّذِي ذَكَرَ اللهُ فِي كِتَابِهِ بِالسَّعْيِ عَلَى الأَقْدَامِ، وَلاَ الاِشْتِدَادَ، وَإِنَّمَا عَنَى الْعَمَلَ وَالْفِعْلَ[1].

واتە: ئیمامی مالیك ﷺ گوتوویەتی: سەعی لە پەرتووكی خوای پەروەردگار بۆ مانای كردەوە هاتووە (نەك خێرا ڕۆیشتن)، خوای پەروەردگار ﷻ دەفەرموێ: ﴿ وَإِذَا تَوَلَّىٰ سَعَىٰ فِي ٱلْأَرْضِ ﴿٢٠٥﴾ ﴾ البقرة، وە دەفەرمووێ: ﴿ وَأَمَّا مَن جَآءَكَ يَسْعَىٰ ﴿٨﴾ وَهُوَ يَخْشَىٰ ﴿٩﴾ ﴾ عبس، وە دەفەرمووێ: ﴿ ثُمَّ أَدْبَرَ يَسْعَىٰ ﴿٢٢﴾ ﴾ النازعات، وە دەفەرمووێ: ﴿ إِنَّ سَعْيَكُمْ لَشَتَّىٰ ﴿٤﴾ ﴾ الليل، ئیمامی مالیك گوتوویەتی: ئەو سەعییەی خوای پەروەردگار لە پەرتووكەكەی باسی كردووە (دەربارەی ڕۆیشتن بۆ هەینی) ڕۆیشتن نییە بە پێیەكان و خێرا ڕۆیشتن نییە، بەڵكوو مەبەست پێی كردەوە و كردارە.

## ٦- ئەوەی هاتووە دەربارەی گەورەی مسوڵمانان كە لە سەفەر لە ڕۆژی هەینی لە گوندێك دادەبەزێت[2]

٢٨٧- [فتوى] قَالَ مَالِكٌ ﷺ: إِذَا نَزَلَ الإِمَامُ بِقَرْيَةٍ تَجِبُ فِيهَا الْجُمُعَةُ، وَالإِمَامُ مُسَافِرٌ، فَخَطَبَ وَجَمَّعَ بِهِمْ، فَإِنَّ أَهْلَ تِلْكَ الْقَرْيَةِ وَغَيْرَهُمْ يُجَمِّعُونَ مَعَهُ[3].

(فەتوا): ئیمامی مالیك ﷺ گوتوویەتی: ئەگەر گەورەی مسوڵمانان لە گوندێك دابەزی كە خەڵكەكە جومعەیان لەسەر واجبە، لە كاتێكدا گەورەی مسوڵمانان گەشتیارە، جا وتاری بۆدان و جومعەی پێ كردن، ئەوە دەبێ خەڵكی ئەو گوندە و غەیری لەوانیش (كە لەوێ ئامادەن) جومعەی لەگەڵ بكەن.

---

(١) ـ أخرجه أبو مصعب الزهري: ٤٥٥ في الجمعة؛ وفي: ٤٥٧ في الجمعة؛ والحدثاني: ١٤٢ في الصلاة، كلهم عن مالك به.

(٢) ـ مَا جَاءَ فِي الإِمَامِ يَنْزِلُ بِقَرْيَةٍ يَوْمَ الْجُمُعَةِ فِي السَّفَرِ.

(٣) ـ أخرجه أبو مصعب الزهري: ٤٦٠ في الجمعة؛ والحدثاني: ١٤٤ في الصلاة، عن مالك به.

٢٨٨- [فتوى] قَالَ مَالِكٌ ﷺ: وَإِنْ جَمَّعَ الإِمَامُ وَهُوَ مُسَافِرٌ بِقَرْيَةٍ لاَ تَجِبُ فِيهَا الْجُمُعَةُ، فَلاَ جُمُعَةَ لَهُ، وَلاَ لأَهْلِ تِلْكَ الْقَرْيَةِ، وَلاَ لِمَنْ جَمَّعَ مَعَهُمْ مِنْ غَيْرِهِمْ، وَلْيُتَمِّمْ أَهْلُ تِلْكَ الْقَرْيَةِ وَغَيْرُهُمْ، مِمَّنْ لَيْسَ بِمُسَافِرٍ، الصَّلاَةَ[1].

(فەتوا): ئیمامی مالیك ﷺ گوتوویەتی: ئەگەر گەورەی مسوڵمانان جومعەی بۆ کردن لە گوندێك کە جومعەی تێدا واجب نەبوو، ئەوە نە گەورەی مسوڵمانان و نە خەڵکی ئەو گوندە و نە ئەوانەشی کە جومعەیان لەگەڵ دەکەن لە خەڵکی دیکە، جومعەیان بەرنەکەوتووە، وە با خەڵکی گوندەکە و ئەوانەی دیکەش لەوانەی کە گەشتیار نین نوێژەکە تەواو بکەن (بە چوار ڕکاتی نیوەڕۆ).

٢٨٩- [فتوى] قَالَ مَالِكٌ ﷺ: وَلاَ جُمُعَةَ عَلَى مُسَافِرٍ.

(فەتوا): ئیمامی مالیك ﷺ گوتوویەتی: کەسی گەشتیار هەینی لەسەر واجب نییە.

## ٧- ئەوەی هاتووە دەربارەی ئەو کاتەی لە ڕۆژی هەینیدا هەیە (کە دوعای تێدا قبووڵە)[2]

٢٩٠-عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ ﷺ، أَنَّ رَسُولَ اللهِ ﷺ ذَكَرَ يَوْمَ الْجُمُعَةِ، فَقَالَ: فِيهِ سَاعَةٌ لاَ يُوَافِقُهَا عَبْدٌ مُسْلِمٌ وَهُوَ قَائِمٌ يُصَلِّي، يَسْأَلُ اللهَ شَيْئًا، إِلاَّ أَعْطَاهُ إِيَّاهُ، وَأَشَارَ رَسُولُ اللهِ ﷺ بِيَدِهِ، يُقَلِّلُهَا[3].

واتە: لە ئەبو هورەیرەوە ﷺ گێردراوەتەوە (گوتوویەتی): پێغەمبەری خوا ﷺ باسی ڕۆژی هەینی کرد و فەرمووی: کاتێکی تیایە هیچ بەندەیەکی مسوڵمان نییە تێیدا وەستابێت نوێژ بکات، یان داوای شتێك لە خوا بکات، حەتمەن پێی دەبەخشێ، جا پێغەمبەری خوا ﷺ بە دەستی ئاماژەی کرد بەوەی کاتەکە کورت و کەمۆکەیە (پاداشتیشی زۆرە).

---

(١) ـ أخرجه أبو مصعب الزهري: ٤٦١ في الجمعة؛ والحدثاني: ١٤٤ أ في الصلاة، عن مالك به.

(٢) ـ مَا جَاءَ فِي السَّاعَةِ الَّتِي فِي يَوْمِ الْجُمُعَةِ.

(٣) ـ صحيح. أخرجه أبو مصعب الزهري: ٤٦٢ في الجمعة؛ والحدثاني: ١٤٥ في الصلاة؛ والشافعي: ٣١٣؛ وابن حنبل: ١٠٣٠٧؛ والبخاري: ٩٣٥ في الجمعة؛ ومسلم: الجمعة: ١٣؛ والقابسي: ٢٣٢، كلهم عن مالك به.





**٢٩١**- عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ ﷺ، أَنَّهُ قَالَ: خَرَجْتُ إِلَى الطُّورِ، فَلَقِيتُ كَعْبَ الأَحْبَارِ ﷺ، فَجَلَسْتُ مَعَهُ، فَحَدَّثَنِي عَنِ التَّوْرَاةِ، وَحَدَّثْتُهُ عَنْ رَسُولِ اللهِ ﷺ، فَكَانَ فِيمَا حَدَّثْتُهُ، أَنْ قُلْتُ: قَالَ رَسُولُ اللهِ ﷺ: خَيْرُ يَوْمٍ طَلَعَتْ عَلَيْهِ الشَّمْسُ، يَوْمُ الْجُمُعَةِ، فِيهِ خُلِقَ آدَمُ، وَفِيهِ أُهْبِطَ مِنَ الْجَنَّةِ، وَفِيهِ تِيبَ عَلَيْهِ، وَفِيهِ مَاتَ، وَفِيهِ تَقُومُ السَّاعَةُ، وَمَا مِنْ دَابَّةٍ إِلاَّ وَهِيَ مُصِيخَةٌ يَوْمَ الْجُمُعَةِ، مِنْ حِينِ تُصْبِحُ حَتَّى تَطْلُعَ الشَّمْسُ شَفَقًا مِنَ السَّاعَةِ، إِلاَّ الْجِنَّ وَالإِنْسَ، وَفِيهِ سَاعَةٌ لاَ يُصَادِفُهَا عَبْدٌ مُسْلِمٌ وَهُوَ يُصَلِّي، يَسْأَلُ اللهَ شَيْئًا، إِلاَّ أَعْطَاهُ إِيَّاهُ، قَالَ كَعْبٌ: ذَلِكَ فِي كُلِّ سَنَةٍ يَوْمٌ، فَقُلْتُ: بَلْ فِي كُلِّ جُمُعَةٍ، فَقَرَأَ كَعْبٌ التَّوْرَاةَ، فَقَالَ: صَدَقَ رَسُولُ اللهِ ﷺ، قَالَ أَبُو هُرَيْرَةَ ﷺ: فَلَقِيتُ بَصْرَةَ بْنَ أَبِي بَصْرَةَ الْغِفَارِيَّ، فَقَالَ: مِنْ أَيْنَ أَقْبَلْتَ؟ فَقُلْتُ: مِنَ الطُّورِ، فَقَالَ: لَوْ أَدْرَكْتُكَ قَبْلَ أَنْ تَخْرُجَ إِلَيْهِ، مَا خَرَجْتَ، سَمِعْتُ رَسُولَ اللهِ ﷺ يَقُولُ: لاَ تُعْمَلُ الْمَطِيُّ إِلاَّ إِلَى ثَلاَثَةِ مَسَاجِدَ: إِلَى الْمَسْجِدِ الْحَرَامِ، وَإِلَى مَسْجِدِي هَذَا، وَإِلَى مَسْجِدِ إِيلِيَاءَ، أَوْ بَيْتِ الْمَقْدِسِ، يَشُكُّ.

قَالَ أَبُو هُرَيْرَةَ ﷺ: ثُمَّ لَقِيتُ عَبْدَ اللهِ بْنَ سَلاَمٍ ﷺ، فَحَدَّثْتُهُ بِمَجْلِسِي مَعَ كَعْبِ الأَحْبَارِ ﷺ، وَمَا حَدَّثْتُهُ بِهِ فِي يَوْمِ الْجُمُعَةِ، فَقُلْتُ: قَالَ كَعْبٌ: ذَلِكَ فِي كُلِّ سَنَةٍ يَوْمٌ، قَالَ: قَالَ عَبْدُ اللهِ بْنُ سَلاَمٍ ﷺ: كَذَبَ كَعْبٌ، فَقُلْتُ: ثُمَّ قَرَأَ كَعْبٌ التَّوْرَاةَ، فَقَالَ: بَلْ هِيَ فِي كُلِّ جُمُعَةٍ، فَقَالَ عَبْدُ اللهِ بْنُ سَلاَمٍ ﷺ: صَدَقَ كَعْبٌ، ثُمَّ قَالَ عَبْدُ اللهِ بْنُ سَلاَمٍ ﷺ: قَدْ عَلِمْتُ أَيَّةَ سَاعَةٍ هِيَ، قَالَ أَبُو هُرَيْرَةَ: فَقُلْتُ لَهُ: أَخْبِرْنِي بِهَا، وَلاَ تَضَنَّ عَلَيَّ، فَقَالَ عَبْدُ اللهِ بْنُ سَلاَمٍ ﷺ: هِيَ آخِرُ سَاعَةٍ فِي يَوْمِ الْجُمُعَةِ، قَالَ أَبُو هُرَيْرَةَ ﷺ: فَقُلْتُ: وَكَيْفَ تَكُونُ آخِرَ سَاعَةٍ فِي يَوْمِ الْجُمُعَةِ؟ وَقَدْ قَالَ رَسُولُ اللهِ ﷺ: لاَ يُصَادِفُهَا عَبْدٌ مُسْلِمٌ وَهُوَ يُصَلِّي، وَتِلْكَ سَاعَةٌ لاَ يُصَلَّى فِيهَا، فَقَالَ عَبْدُ اللهِ بْنُ سَلاَمٍ ﷺ: أَلَمْ يَقُلْ رَسُولُ اللهِ ﷺ: مَنْ جَلَسَ مَجْلِسًا يَنْتَظِرُ الصَّلاَةَ فَهُوَ فِي صَلاَةٍ حَتَّى يُصَلِّيَ؟ قَالَ أَبُو هُرَيْرَةَ ﷺ: فَقُلْتُ: بَلَى، قَالَ: فَهُوَ ذَلِكَ[1].

واتە: لە ئەبو هورەیرەوە ﷺ گێردراوەتەوە گوتوویەتی: دەرچووم بۆ کێوی طور و بە کەعبی ئەحبارِ ﷺ گەیشتم و لەگەڵی دانیشتم، جا ئەو دەربارەی تەورات قسەی

---

(١)ـ صحيح. أخرجه أبو مصعب الزهري: ٤٦٣ في الجمعة؛ والحدثاني: ١٤٥ أ في الصلاة؛ والشافعي: ٣١٤؛ وابن حنبل: ١٠٣٠٨، وفي: ٢٣٨٣٦، وفي: ٢٣٨٩٩؛ وأبو داود: ١٠٤٦؛ والترمذي: ٤٩١ في الجمعة؛ وابن حبان: ٢٧٧٢؛ والقابسي: ٥١٥، كلهم عن مالك به.

بۆ دەکردم و منیش لە پێغەمبەری خواوە ﷺ فەرموودەم بۆ دەگێڕایەوە، جا یەکێك لەوانەی بۆم گێڕایەوە ئەوەبوو گوتم: پێغەمبەری خوا ﷺ فەرموویەتی: چاکترین ڕۆژێك کە خۆری تێدا هەڵاتووە ڕۆژی هەینییە، تیایدا ئادەم ﷺ دروست کراوە، وە تیایدا لە بەهەشت خرایە خوارەوە، وە تیایدا تەوبە و گەڕانەوەی لێ قبووڵ کرا، وە تیایدا وەفاتی کرد، وە تیایدا دونیا تێکدەچێ، وە هیچ زیندەوەرێك نییە حەتمەن هەست ڕادەگرێت (گوێچکەکانی قوڵاغ دەکا) لە ڕۆژی هەینیدا لەو کاتەوەی بەیان دەکاتەوە تا خۆر هەڵدێت لە ترسی دونیا تێکچوون، تەنها جنۆکە و مرۆڤ نەبێت (غافڵن لەو ترسە)، وە تیایدا کاتێك هەیە هیچ بەندەیەکی مسوڵمان نییە هاوکات بێت لەگەڵی لە کاتێکدا لە نوێژدا بێت یان داوای شتێك لە خوای پەروەردگار بکات حەتمەن پێی دەبەخشێت.

کەعبی ئەحبار ﷺ گوتی: ئەوە یەك ڕۆژە لە گشت ساڵێکدا، منیش گوتم: (نەخێر) بەڵکوو لە گشت هەینییێکدایە، جا کەعب ﷺ تەوڕاتی خوێندەوە (تا دڵنیا بێت چ لە تەوڕاتدا هاتووە) و گوتی: پێغەمبەری خوا ﷺ ڕاست دەکات (لە تەوڕاتیش هەر وایە)، ئەبو هوڕەیڕە ﷺ دەڵێت: (ڕۆیشتم) و بە بەصرەی کوڕی ئەبو بەصرەی غیفاری ﷺ گەیشتم، گوتی: لە کوێ دێی؟ منیش گوتم: لە کێوی «طور»ـەوە، ئەویش گوتی: ئەگەر پێت بگەیشتمایە پێش ئەوەی دەربچی بۆ ئەوێ، ئەوە دەرنەدەچووی (چونکە ڕەنگە لەبەر پیرۆزی و دەستکەوتنی پاداشت چوبیت بۆ ئەوێ)، گوێم لە پێغەمبەری خوا ﷺ بوو دەیفەرموو: سەفەر و بارگە پێچانەوە بۆ هیچ شوێنێك ناکرێ (بۆ بەگەورەزانین و بە مەبەستی پاداشت)، تەنها بۆ سێ مزگەوت نەبێت: بۆ مزگەوتی حەڕام (واتە مزگەوتی کەعبە)و ئەو مزگەوتەی من و مزگەوتی ئیلیا یان بەیتول مەقدیس، گومانی لە یەك لەو دوو لەفزە هەبوو (کە هەردووکیان ناون بۆ مزگەوتی ئەقصا لە فەلەستین)، ئەبو هوڕەیڕە ﷺ دەڵێ: دواتر گەیشتم بە عەبدوڵلای کوڕی سەلام ﷺ و باسی مەجلیسەکەی خۆمم بۆ کرد لەگەڵ کەعبی ئەحباڕدا و ئەوەشم بۆ باس کرد دەربارەی ڕۆژی هەینی، جا گوتم: کەعب ﷺ گوتی: (ئەوەی تۆ باسی دەکەی) ڕۆژێکە لە گشت ساڵێکدا، دەڵێ: عەبدوڵلای کوڕی سەلام ﷺ گوتی: کەعب ﷺ ڕاست ناکات، منیش

گوتم: ئاخر دواتر تەوراتی خوێندەوە و گوتی: (من هەڵە بووم) بەڵكوو لە گشت هەینییێكدایە، جا عەبدوڵڵای كوڕی سەلام ﷺ گوتی: كەعب ﷺ ڕاست دەكات، دواتر عەبدوڵڵای كوڕی سەلام ﷺ گوتی: من دەزانم كاتەكە كام كاتەیە (كە لە ڕۆژی هەینیدا دوعای تێدا قبووڵە)، ئەبو هورەیرەش ﷺ دەڵێ: پێم گوت: هەواڵم پێ بدە و ڕەزیلی مەنوێنە لەگەڵم، عەبدوڵڵای كوڕی سەلامیش ﷺ گوتی: كاتەكە لە كۆتایی ڕۆژی هەینیدایە، ئەبو هورەیرەش ﷺ دەڵێ: منیش گوتم: چۆن دەبێت كۆتا كات بێت لە ڕۆژی هەینیدا، لە كاتێكدا پێغەمبەری خوا ﷺ (دەربارەی) فەرموویەتی: (كاتێك هەیە) هیچ بەندەیەكی مسوڵمان نییە هاوكات بێت لەگەڵی لە كاتێكدا لە نوێژكردن دا بێت یان دوعا و نزا بكات خوا قەبوڵی دەكات...، خۆ ئەو كاتەی تۆ باسی دەكەی نوێژی تێدا ناكرێ (حەڕامە نوێژی تیادا بكرێ، چونكە دەكەوێتە دوای عەسر و پێش خۆرئاوابوون)؟! عەبدوڵڵای كوڕی سەلامیش ﷺ گوتی: مەگەر پێغەمبەری خوا ﷺ نەیفەرمووە: هەر كەسێك لە شوێنێك دابنیشێت چاوەڕوانی نوێژ بكات، ئەوە لەناو نوێژدایە تا نوێژ دەكات، ئەبو هورەیرە ﷺ دەڵێ: منیش گوتم: وایە! ئەویش گوتی: ئەوە بەم جۆرەیە (واتە ئەو كەسەی لە كۆتایی ڕۆژی هەینی چاوەڕێی نوێژی مەغریب دەكات بەر لە خۆرئاوابوون، كاتەكە دەیگرێتەوە و وەك ئەوە وایە لەنوێژدا بێت).

## ٨- باسی شێوە و هەیئەت و پۆشاك و بەسەر شان و ملی خەڵكدا تێپەڕین، وە باسی ڕووكردنە ئیمام لە ڕۆژی هەینیدا[١]

**٢٩٢-** عَنْ مَالِكٍ ﷺ، عَنْ يَحْيَى بْنِ سَعِيدٍ أَنَّهُ بَلَغَهُ، أَنَّ رَسُولَ اللهِ ﷺ قَالَ: مَا عَلَى أَحَدِكُمْ لَوِ اتَّخَذَ ثَوْبَيْنِ لِجُمُعَتِهِ سِوَى ثَوْبَيْ مِهْنَتِهِ[٢].

واتە: لە ئیمامی مالیكەوە ﷺ گێردراوەتەوە، ئەویش لە یەحیای كوڕی سەعیدی گێڕاوەتەوە بەوەی پێی ڕاگەیاندووە (گوتوویەتی): پێغەمبەری خوا ﷺ (بەڕەخنەوە)

---

(١) ـ الْهَيْئَةُ وَتَخَطِّي الرِّقَابِ، وَاسْتِقْبَالُ الإِمَامِ يَوْمَ الْجُمُعَةِ.

(٢) ـ حسن لغيره. أخرجه أبو مصعب الزهري: ٤٦٥ في الجمعة؛ والحدثاني: ١٤٧ أ في الصلاة، عن مالك به.

فەرموویەتی: هەر یەکێك لە ئێوە چی لەسەر دەکەوێت ئەگەر دوو پارچە جل (واتە قاتێك، تاخمێك، سەر و بنێك، کورتەك و شەرواڵێك) تەرخان بکات بۆ هەینییەکەی، جگە لە دوو چارچە جلەکەی کار و پیشەکەی.

**٢٩٣-** عَنْ نَافِعٍ ﷺ، أَنَّ عَبْدَ اللهِ بْنَ عُمَرَ ﷺ كَانَ لاَ يَرُوحُ إِلَى الْجُمُعَةِ إِلاَّ ادَّهَنَ وَتَطَيَّبَ، إِلاَّ أَنْ يَكُونَ حَرَامًا[١].

واتە: لە نافیعەوە ﷺ گێڕدراوەتەوە (گوتوویەتی): عەبدوڵڵای کوڕی عومەر ﷺ نەدەچوو بۆ نوێژی هەینی حەتمەن قژی چەور دەکرد و خۆی بۆنخۆش دەکرد، تەنها لە کاتێکدا نەبێت کە لە ئیحرامدا بووایە.

**٢٩٤-** عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ ﷺ، أَنَّهُ كَانَ يَقُولُ: لأَنْ يُصَلِّيَ أَحَدُكُمْ بِظَهْرِ الْحَرَّةِ، خَيْرٌ لَهُ مِنْ أَنْ يَقْعُدَ، حَتَّى إِذَا قَامَ الإِمَامُ يَخْطُبُ، جَاءَ يَتَخَطَّى رِقَابَ النَّاسِ يَوْمَ الْجُمُعَةِ[٢].

واتە: لە ئەبو هوڕەیڕەوە ﷺ گێڕدراوەتەوە دەیگوت: ئەگەر یەکێك لە ئێوە لە «ظهر الحرة» نوێژ بکات (کە شوێنێکە لە مەدینە، واتە ئەگەر لە شوێنێکی دووری مزگەوت نوێژ بکات) چاکترە و پاداشتی زیاترە بۆی لەوەی دابنیشێت (و زوو نەیەت بۆ ڕیزەکانی پێشەوە تا مزگەوت پڕ دەبێت) و ئیمام هەڵدەستێت وتار دەدات، ئینجا بێت و بەسەر شانی خەڵکیدا تێپەڕێت لە ڕۆژی هەینیدا (بە حیسابی خۆی دەیەوێ پاداشتی ڕیزەکانی پێشەوەی بەر بکەوێت! نەخێر پاداشتی بۆ نییە و شوێنە دوورەکە پاداشتی زیاترە).

**٢٩٥-** قَالَ مَالِكٌ ﷺ: السُّنَّةُ عِنْدَنَا أَنْ يَسْتَقْبِلَ النَّاسُ الإِمَامَ يَوْمَ الْجُمُعَةِ، إِذَا أَرَادَ أَنْ يَخْطُبَ، مَنْ كَانَ مِنْهُمْ يَلِي الْقِبْلَةَ وَغَيْرَهَا[٣].

---

(١) ـ صحيح. أخرجه أبو مصعب الزهري: ٤٦٦ في الجمعة؛ والحدثاني: ١٤٧ب في الصلاة؛ والشيباني: ٦١ في الصلاة؛ وفي: ٢٢٤ في الصلاة، كلهم عن مالك به.

(٢) ـ صحيح. أخرجه أبو مصعب الزهري: ٤٦٧ في الجمعة؛ والحدثاني: ١٤٨ في الصلاة، عن مالك به.

(٣) ـ أخرجه أبو مصعب الزهري: ٤٦٩ في الجمعة، عن مالك به.

واتە: ئیمامی مالیك ﷺ گوتوویەتی: لەلای ئێمە سوننەت وایە خەڵك لە ڕۆژی هەینیدا ڕوو بکەنە ئیمام، کاتێ دەیەوێ وتار بدات، جا (جیاوازی نیە) کەسەکە لەلای قیبلە بێت یان جگە لە قیبلە.

## ٩- قوڕئانخوێندن لە نوێژی هەینی و دانیشتن (لە نێوان دوو وتارەکان)و ئەو کەسەی نوێژی هەینی واز لێ دەهێنێ بەبێ هیچ عوزرێك[١]

**٢٩٦**-عَنْ عُبَيْدِ اللهِ بْنِ عَبْدِ اللهِ بْنِ عُتْبَةَ بْنِ مَسْعُودٍ ﷺ، أَنَّ الضَّحَّاكَ بْنَ قَيْسٍ ﷺ، سَأَلَ النُّعْمَانَ بْنَ بَشِيرٍ ﷺ مَاذَا كَانَ يَقْرَأُ بِهِ رَسُولُ اللهِ ﷺ يَوْمَ الْجُمُعَةِ، عَلَى إِثْرِ سُورَةِ الْجُمُعَةِ؟ قَالَ: كَانَ يَقْرَأُ: ﴿ هَلْ أَتَىٰكَ حَدِيثُ ٱلْغَـٰشِيَةِ ۝١ ﴾ الغاشية[٢].

واتە: لە عوبەیدوڵڵای کوڕی عەبدوڵڵای کوڕی عوتبەی کوڕی مەسعودەوە ﷺ گێڕدراوەتەوە (گوتوویەتی): ضەححاکی کوڕی قەیس ﷺ پرسیاری لە نوعمانی کوڕی بەشیر ﷺ کرد (گوتی): پێغەمبەری خوا ﷺ چی دەخوێند لە ڕۆژی هەینیدا لە دوای سوڕەتی الجمعة؟ گوتی: ﴿ هَلْ أَتَىٰكَ حَدِيثُ ٱلْغَـٰشِيَةِ ۝١ ﴾ الغاشية ، ی دەخوێند[٣].

**٢٩٧**-عَنْ مَالِكٍ ﷺ، عَنْ صَفْوَانَ بْنِ سُلَيْمٍ، قَالَ مَالِكٌ: لاَ أَدْرِي أَعَنِ النَّبِيِّ ﷺ أَمْ لاَ؟ أَنَّهُ قَالَ: مَنْ تَرَكَ الْجُمُعَةَ ثَلاَثَ مَرَّاتٍ، مِنْ غَيْرِ عُذْرٍ وَلاَ عِلَّةٍ، طَبَعَ اللهُ عَلَى قَلْبِهِ[٤].

---

(١) ـ الْقِرَاءَةُ فِي صَلَاةِ الْجُمُعَةِ، وَالاحْتِبَاءِ، وَمَنْ تَرَكَهَا مِنْ غَيْرِ عُذْرٍ.

(٢) ـ صحيح. أخرجه أبو مصعب الزهري: ٤٦٤ في الجمعة؛ والحدثاني: ١٤٧ في الصلاة؛ والشيباني: ٢٢٦ في الصلاة؛ والشافعي: ١٠٤٠؛ وابن حنبل: ١٨٤٠٥، وفي: ١٨٤٦١؛ والنسائي: ١٤٢٣ في الجمعة؛ وأبو داود: ١١٢٣ في الجمعة؛ وابن حبان: ٢٨٠٧؛ والدارمي: ١٥٦٦ في الأذان؛ وشرح معاني الآثار: ٢٣٨٣؛ والقابسي: ٢٧٦، كلهم عن مالك به.

(٣) ـ تێبینی: بەڵام ئیمامی شافیعی بۆ بەجێگەیاندنی ئەو سوننەتە ئەو ڕیوایەتەی هەڵبژاردووە کە سوڕەتی «جومعە» و سوڕەتی «مونافیقون»ی بخوێندرێ، کە لە ڕیوایەتی ئەبو هوڕەیرە و ئیمامی عەلی هاتووە و فەرموودەکان صەحیحن.

(٤) ـ صحيح لغيره. أخرجه أبو مصعب الزهري: ٤٦٨ في الجمعة؛ والحدثاني: ١٤٨ أ في الصلاة، عن مالك به.

واتە: لە ئیمامی مالیکەوە ﷬ گێردراوەتەوە، ئەویش لە صەفوانی کوڕی سولەیمی گێڕاوەتەوە - جا ئیمامی مالیك ﷬ گوتوویەتی: نازانم صەفوان لە پێغەمبەری خواوەی ﷺ گێڕایەوە یان نا؟ - گوتی: هەر کەسێك سێ هەینی بچووێنێ، بەبێ هیچ بەهانە و نەخۆشییێك، ئەوا خوای پەروەردگار مۆر لەسەر دڵی دەدات.

**٢٩٨-** عَنْ جَعْفَرِ بْنِ مُحَمَّدٍ ﵀، عَنْ أَبِيهِ ﵁، أَنَّ رَسُولَ اللهِ ﷺ خَطَبَ خُطْبَتَيْنِ يَوْمَ الْجُمُعَةِ، وَجَلَسَ بَيْنَهُمَا[1].

واتە: لە جەعفەری کوڕی موحەممەدەوە ﷬ گێردراوەتەوە، ئەویش لە باوکیەوە ﵁ گێڕاویەتەوە (گوتوویەتی): پێغەمبەری خوا ﷺ لە ڕۆژی هەینیدا دوو وتاری دەدا و لە نێوانیان دادەنیشت.

---

(١) ـ صحيح لغيره. أخرجه أبو مصعب الزهري: ٤٤٤ في الجمعة؛ والحدثاني: ١٣٩ج في الصلاة، عن مالك به.




## ١- هاندان بۆ شەونوێژکردن (و تەراویحکردن) لە ڕەمەزاندا[1]

**٢٩٩-** عَنْ عَائِشَةَ ﵂، زَوْجِ النَّبِيِّ ﷺ، أَنَّ رَسُولَ اللهِ ﷺ صَلَّى فِي الْمَسْجِدِ ذَاتَ لَيْلَةٍ، فَصَلَّى بِصَلاَتِهِ نَاسٌ، ثُمَّ صَلَّى اللَّيْلَةَ الْقَابِلَةَ، فَكَثُرَ النَّاسُ، ثُمَّ اجْتَمَعُوا مِنَ اللَّيْلَةِ الثَّالِثَةِ أَوِ الرَّابِعَةِ، فَلَمْ يَخْرُجْ إِلَيْهِمْ رَسُولُ اللهِ ﷺ، فَلَمَّا أَصْبَحَ، قَالَ: قَدْ رَأَيْتُ الَّذِي صَنَعْتُمْ، وَلَمْ يَمْنَعْنِي مِنَ الْخُرُوجِ إِلَيْكُمْ، إِلاَّ أَنِّي خَشِيتُ أَنْ تُفْرَضَ عَلَيْكُمْ، وَذَلِكَ فِي رَمَضَانَ[2].

واتە: لە عائیشەی ﵂ ، خێزانی پێغەمبەرەوە ﷺ گێردراوەتەوە (گوتوویەتی): پێغەمبەری خوا ﷺ شەوێکیان لە مزگەوت بوو (شەونوێژی دەکرد)، خەڵکیش (لە دوای ئەو) نوێژیان لەگەڵ نوێژەکەی ئەو دابەست، دواتر (دووبارە) بۆ شەوی داهاتوو نوێژی کرد، خەڵکەکەش زیاد بوون، دواتر بۆ شەوی سێیەم، یان چوارەم خەڵك زیاتر کۆبوونەوە، (جا ئەم جارەیان) پێغەمبەری خوا ﷺ دەرنەچوو بۆ لایان، جا کاتێ بەیانی کردەوە فەرمووی: بینیم چیتان کرد (چۆن کۆبیوونەوە)، هیچ شتێك ڕێگر نەبوو کە بێم نوێژتان بۆ بکەم، تەنها ئەوە نەبێت ترسام لەسەرتان بکرێتە واجب، (عائیشە ﵂ دەڵێ:) ئەوە لە ڕەمەزاندا بوو.

**٣٠٠-** عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ ﵁، أَنَّ رَسُولَ اللهِ ﷺ كَانَ يُرَغِّبُ فِي قِيَامِ رَمَضَانَ، مِنْ غَيْرِ أَنْ يَأْمُرَ بِعَزِيمَةٍ، فَيَقُولُ: مَنْ قَامَ رَمَضَانَ إِيمَانًا وَاحْتِسَابًا، غُفِرَ لَهُ مَا تَقَدَّمَ مِنْ ذَنْبِهِ.

قَالَ ابْنُ شِهَابٍ ﵀: فَتُوُفِّيَ رَسُولُ اللهِ ﷺ وَالأَمْرُ عَلَى ذَلِكَ، ثُمَّ كَانَ الأَمْرُ عَلَى ذَلِكَ فِي خِلاَفَةِ أَبِي بَكْرٍ، وَصَدْرًا مِنْ خِلاَفَةِ عُمَرَ بْنِ الْخَطَّابِ ﵁ [3].

---

(١) ـ التَّرْغِيبُ فِي الصَّلَاةِ فِي رَمَضَانَ.

(٢) ـ صحيح. أخرجه أبو مصعب الزهري: ٢٧٤ في النداء والصلاة؛ والشيباني: ٢٣٨ في الصلاة؛ وابن حنبل: ٢٥٤٨٥؛ والبخاري: ١١٢٩ في التهجد، وفي: ٢٠١١ في التراويح؛ ومسلم: المسافرين: ١٧٧؛ والنسائي: ١٦٠٤ في قيام الليل؛ وأبو داود: ١٣٧٣ في رمضان؛ وابن حبان: ٢٥٤٢؛ والقابسي: ٣٦، كلهم عن مالك به.

(٣) ـ صحيح. أخرجه أبو مصعب الزهري: ٢٧٦ في النداء والصلاة؛ والشيباني: ٢٤٠ في الصلاة؛ وابن حنبل: ١٠٣٠٩، وفي: ١٠٨٥٥؛ والبخاري: ٣٧ في الإيمان، وفي: ٢٠٠٩ في التراويح؛ ومسلم: المسافرين: ١٧٣؛ والنسائي: ١٦٠٢ في قيام الليل، وفي: ١٦٠٣ في قيام الليل، وفي: ٢١٩٩ في الصيام، وفي: ٢٢٠٠ في الصيام، وفي: ٢٢٠١ في الصيام، وفي: ٥٠٢٥ في الإيمان، وفي: ٥٠٢٥ في الإيمان، وفي: ٥٠٢٦ في الإيمان، كلهم عن مالك به.

واتە: لە ئەبو هوڕەیرەوە ﷺ گێڕدراوەتەوە (گوتوویەتی): پێغەمبەری خوا ﷺ هەموو جار هاوەڵانی هان دەدا دەربارەی زیندووڕاگرتنی شەوانی ڕەمەزان، بەبێ ئەوەی بەواجب فەرمان بکات، دەیفەرموو: هەر کەسێك شەوانی ڕەمەزان زیندوو ڕابگرێ بەبڕواپێبوون و چاوەڕێکردنی پاداشت، لە گشت گوناهە (بچوکەکانی) پێشووی دەبووردرێ.

ئیبنو شیهاب ﷺ گوتوویەتی: جا پێغەمبەری خوا ﷺ وەفاتی کرد کارەکە بەم شێوەیە بوو (سوننەتێکی گەورە بوو، بەڵام لە مزگەوت ئەنجام نەدەدرا)، دواتر کارەکە هەر بەم شێوەیە بوو لە سەردەمی خەلافەتی ئیمامی ئەبو بەکر ﷺ، وە لە سەرەتای خەلافەتی ئیمامی عومەریش ﷺ (بەڵام دواتر ئیمامی عومەر ﷺ گواستیەوە بۆ مزگەوت).

## ٢- ئەوەی هاتووە دەربارەی شەونوێژی ڕەمەزان[1]

**٣٠١-** عَنْ عَبْدِ الرَّحْمَنِ بْنِ عَبْدٍ الْقَارِيِّ ﷺ، أَنَّهُ قَالَ: خَرَجْتُ مَعَ عُمَرَ بْنِ الْخَطَّابِ ﷺ فِي رَمَضَانَ إِلَى الْمَسْجِدِ، فَإِذَا النَّاسُ أَوْزَاعٌ مُتَفَرِّقُونَ، يُصَلِّي الرَّجُلُ لِنَفْسِهِ، وَيُصَلِّي الرَّجُلُ فَيُصَلِّي بِصَلاَتِهِ الرَّهْطُ، فَقَالَ عُمَرُ ﷺ: وَاللَّهِ إِنِّي لأَرَانِي لَوْ جَمَعْتُ هَؤُلاَءِ عَلَى قَارِئٍ وَاحِدٍ لَكَانَ أَمْثَلَ، فَجَمَعَهُمْ عَلَى أُبَيِّ بْنِ كَعْبٍ ﷺ، قَالَ: ثُمَّ خَرَجْتُ مَعَهُ لَيْلَةً أُخْرَى، وَالنَّاسُ يُصَلُّونَ بِصَلاَةِ قَارِئِهِمْ، فَقَالَ عُمَرُ ﷺ: نِعْمَتِ الْبِدْعَةُ هَذِهِ، وَالَّتِي تَنَامُونَ عَنْهَا أَفْضَلُ مِنِ الَّتِي تَقُومُونَ، يَعْنِي آخِرَ اللَّيْلِ، وَكَانَ النَّاسُ يَقُومُونَ أَوَّلَهُ[2].

واتە: لە عەبدوڕڕەحمانی کوڕی عەبدولقاریئەوە ﷺ گێڕدراوەتەوە گوتوویەتی: لە ڕەمەزاندا لەگەڵ عومەری کوڕی خەتتاب ﷺ دەرچووم بۆ مزگەوت، بینی خەڵکی کۆمەڵ کۆمەڵ و جیا جیان، (لەولاوە) کەسێك بۆ خۆی نوێژ دەکات بەتەنها، کەسی واش هەبوو نوێژی دەکرد و کۆمەڵێکیش لەدوایەوە نوێژیان لەگەڵ دەکرد، ئیمامی عومەریش ﷺ گوتی: بە خوا پێم وایە ئەگەر ئەمانە کۆبکەمەوە لەسەر یەك

---

(١) ـ مَا جَاءَ فِي قِيَامِ رَمَضَانَ.

(٢) ـ صحيح. أخرجه: أبو مصعب الزهري: ٢٧٩،٢٨٠، والشيباني: ٢٤١، والبخاري: ٢٠١٠، كلهم عن مالك.

قوڕئانخوێن (ئیمام) ئەوە زۆر چاکترە (لەو پەرتەوازەییە)، جا کۆی کردنەوە لەسەر ئیمامەتی ئوبەی کوڕی کەعب ، دەڵێ: جا شەوێکی دیکە لەگەڵی دەرچووم (بۆ مزگەوت)، لە کاتێکدا تێکڕا نوێژیان لەدوای ئیمامەکەیان دەکرد، ئیمامی عومەر  گوتی: ئەمە بیدعە و داهێنانێکی چاك بوو، وە ئەو نوێژەی لێی دەخەون (واتە نوێژی کۆتایی شەو و تەهەججود) چاکترە لەو نوێژەی کە ئێستا ئەنجامی دەدەن، جا خەڵکی لە سەرەتای شەوەوە تەڕاویح و شەونوێژیان دەکرد (دواتر ئیمامی عومەر ـ خوا لێی ڕازی بێ ـ خستیە کۆتایی شەو، بە نیازی پاداشتی زیاتر).

**٣٠٢- عَنِ السَّائِبِ بْنِ يَزِيدَ ، أَنَّهُ قَالَ: أَمَرَ عُمَرُ بْنُ الْخَطَّابِ  أُبَيَّ بْنَ كَعْبٍ طوتَميمًا الدَّارِيَّ  أَنْ يَقُومَا لِلنَّاسِ بِإِحْدَى عَشْرَةَ رَكْعَةً، قَالَ: وَقَدْ كَانَ الْقَارِئُ يَقْرَأُ بِالْمِئِينَ، حَتَّى كُنَّا نَعْتَمِدُ عَلَى الْعِصِيِّ مِنْ طُولِ الْقِيَامِ، وَمَا كُنَّا نَنْصَرِفُ إِلاَّ فِي فُرُوعِ الْفَجْرِ[١].**

واتە: لە سائیبی کوڕی یەزیدەوە  گێڕدراوەتەوە گوتوویەتی: عومەری کوڕی خەتتاب  فەرمانی بە ئوبەی کوڕی کەعب و تەمیمی داری  کرد یازدە ڕکات شەونوێژ (تەڕاویح) بۆ خەڵکی بکەن، (سائیب ) دەڵێ: جا قوڕئانخوێن (ئیمام) سوڕەتە میئونەکانی دەخوێند[٢]، تا ئەو ئەندازەیەی بە گۆچان خۆمان دەگرتەوە لەبەر زۆر وەستان، جا تا نزیك هەڵاتنی بەیان تەواو نەدەبووین و نەدەگەڕاینەوە.

**٣٠٣- عَنْ مَالِكٍ ، عَنْ يَزِيدَ بْنِ رُومَانَ  أَنَّهُ قَالَ: كَانَ النَّاسُ يَقُومُونَ فِي زَمَانِ عُمَرَ بْنِ الْخَطَّابِ  فِي رَمَضَانَ بِثَلاَثٍ وَعِشْرِينَ رَكْعَةً[٣].**

واتە: ئیمامی مالیك  لە یەزیدی کوڕی ڕومانەوە  گێڕاویەتەوە بەوەی گوتوویەتی: خەڵکی لە سەردەمی عومەری کوڕی خەتتاب  لە ڕەمەزاندا بیست و سێ ڕکات تەڕاویحیان دەکرد.

---

(١) ـ صحيح. أخرجه: أبو مصعب الزهري: ٢٨١، عن مالك.

(٢) ـ کە بریتین لەو سوڕەتانەی ژمارەی ئایەتەکانیان لە سەد ئایەت زیاترە یان لە سەد ئایەتەوە نزیکە و لەدوای حەوت سوڕەتە درێژەکانی سەرەتای قوڕئان دێن، کە لە سوڕەتی یونس یان هود دەست پێ دەکات.

(٣) ـ موقوف منكر. أخرجه أبو مصعب الزهري: ٢٨١، عن مالك به.




**٣٠٤- عَنْ دَاوُدَ بْنِ الْحُصَيْنِ** رَحِمَهُ اللهُ، أَنَّهُ سَمِعَ الأَعْرَجَ رَحِمَهُ اللهُ يَقُولُ: مَا أَدْرَكْتُ النَّاسَ إِلاَّ وَهُمْ يَلْعَنُونَ الْكَفَرَةَ فِي رَمَضَانَ، قَالَ: وَكَانَ الْقَارِئُ يَقْرَأُ سُورَةَ الْبَقَرَةِ فِي ثَمَانِ رَكَعَاتٍ، فَإِذَا قَامَ بِهَا فِي اثْنَتَيْ عَشْرَةَ رَكْعَةً رَأَى النَّاسُ أَنَّهُ قَدْ خَفَّفَ[1].

واتە: لە داودی کوڕی حوصەینەوە رَحِمَهُ اللهُ گێڕدراوەتەوە بەوەی گوێی لە ئەعرەج رَحِمَهُ اللهُ بووە دەیگوت: ئەوەندەی گەیشتبم بە هاوەڵان حەتمەن نزا و نەفرینیان لە کافران کردووە (لە قنوتدا) لە ڕەمەزاندا، دەیگوت: قورئانخوێن (ئیمام) سورەتی بەقەرەی بە هەشت ڕکات دەخوێند، جا ئەگەر بە دوازدە ڕکات بیخوێندایە خەڵکی پێیان وابوو خەفیفی کردووە (کورتی کردۆتەوە)!

**٣٠٥- عَنْ عَبْدِ اللهِ بْنِ أَبِي بَكْرٍ** رَحِمَهُ اللهُ، قَالَ: سَمِعْتُ أَبِي يَقُولُ: كُنَّا نَنْصَرِفُ فِي رَمَضَانَ، فَنَسْتَعْجِلُ الْخَدَمَ بِالطَّعَامِ مَخَافَةَ الْفَجْرِ[2].

واتە: لە عەبدوڵڵای کوڕی ئەبو بەکرەوە رَحِمَهُ اللهُ گێڕدراوەتەوە، گوتوویەتی: گوێم لە باوکم بوو دەیگوت: ئێمە لە ڕەمەزاندا (دوای تەراویح) دەگەڕاینەوەماڵەوە، جا پەلەمان لە خزمەتکارەکان دەکرد زوو خواردن ئامادە بکەن، لە ترسی هەڵاتنی بەیان (چونکە ئیمامی عومەر رَضِيَ اللهُ عَنْهُ تەراویحی خستبووە کۆتایی شەو و درێژیشیان دەکردەوە).

**٣٠٦- عَنْ هِشَامِ بْنِ عُرْوَةَ** رَحِمَهُ اللهُ، عَنْ أَبِيهِ رَحِمَهُ اللهُ، أَنَّ ذَكْوَانَ أَبَا عَمْرٍو، وَكَانَ عَبْدًا لِعَائِشَةَ رَضِيَ اللهُ عَنْهَا، زَوْجِ النَّبِيِّ ﷺ، فَأَعْتَقَتْهُ عَنْ دُبُرٍ مِنْهَا، كَانَ يَقُومُ يَقْرَأُ لَهَا فِي رَمَضَانَ[3].

واتە: لە هیشامی کوڕی عوروەوە رَحِمَهُ اللهُ گێڕدراوەتەوە، ئەویش لە باوکیەوە رَحِمَهُ اللهُ گێڕاویەتەوە (گوتوویەتی): ذەکوان (ئەبو عەمر رَحِمَهُ اللهُ) کە کۆیلەی عائیشەی رَضِيَ اللهُ عَنْهَا خێزانی پێغەمبەر ﷺ بوو، جا (عائیشە ـ رَضِيَ اللهُ عَنْهَا ـ) ئازادی کرد بە مودەببەر (واتە گوتی دوای مردنی من تۆ ئازادیت لە کۆیلایەتی)، جا هەموو جار (بە ئیمامەتی) شەونوێژی بۆ عائیشە رَضِيَ اللهُ عَنْهَا دەکرد لە ڕەمەزاندا.

---

(١) ـ صحيح. أخرجه أبو مصعب الزهري: ٢٨٢، عن مالك به.

(٢) ـ مقطوع صحيح. أخرجه أبو مصعب الزهري: ٢٨٣، عن مالك به.

(٣) ـ صحيح. أخرجه أبو مصعب الزهري: ٢٨٤، عن مالك به.




## ١- ئەوەی هاتووە دەربارەی شەونوێژ[١]

**٣٠٧- أَنَّ عَائِشَةَ ﵂، زَوْجَ النَّبِيِّ ﷺ قالت؛ أَنَّ رَسُولَ اللهِ ﷺ قَالَ: مَا مِنِ امْرِئٍ تَكُونُ لَهُ صَلاَةٌ بِلَيْلٍ، يَغْلِبُهُ عَلَيْهَا نَوْمٌ، إِلاَّ كَتَبَ اللهُ لَهُ أَجْرَ صَلاَتِهِ، وَكَانَ نَوْمُهُ عَلَيْهِ صَدَقَةً[٢].**

واتە: عائیشەی ﵂ خێزانی پێغەمبەر ﷺ گوتوویەتی: پێغەمبەری خوا ﷺ فەرموویەتی: هەر کەسێك بە شەو شەونوێژی هەبێت (بەردەوام ئەنجامی بدات)، جا (جاروبار، بەین بەینە) خەو بەسەریدا زاڵ بێت (بخەوێ و شەونوێژەکەی پێ نەکرێ)، حەتمەن خوای پەروەردگار پاداشتی شەونوێژەکەی بۆ دەنووسێ، خەوەکەش دەبێتە خێرپێکردن و بەخشش (لەلایەن خواوە).

**٣٠٨- عَنْ عَائِشَةَ ﵂، زَوْجِ النَّبِيِّ ﷺ، أَنَّهَا قَالَتْ: كُنْتُ أَنَامُ بَيْنَ يَدَيْ رَسُولِ اللهِ ﷺ، وَرِجْلاَيَ فِي قِبْلَتِهِ، فَإِذَا سَجَدَ غَمَزَنِي، فَقَبَضْتُ رِجْلَيَّ، فَإِذَا قَامَ بَسَطْتُهُمَا، قَالَتْ: وَالْبُيُوتُ يَوْمَئِذٍ لَيْسَ فِيهَا مَصَابِيحُ[٣].**

واتە: لە عائیشەی ﵂ خێزانی پێغەمبەرەوە ﷺ گێڕدراوەتەوە بەوەی گوتوویەتی: من بۆ خەوتن لەبەردەم پێغەمبەری خوا ﷺ ڕادەکشام، لە کاتێکدا قاچەکانم ڕووەو قیبلەی پێغەمبەری خوا ﷺ بوو، جا کاتێ سوژدەی دەبرد پەنجەی لێدەدام، منیش قاچم دەنوشتاندەوە، جا کاتێ هەڵدەستایەوە (بۆ ڕکاتی دیکە و تەحیات) قاچەکانم ڕادەکێشایەوە، دەڵێ: ماڵەکان لەو ڕۆژگارەدا چرایان تێدا نەبوو.

**٣٠٩- عَنْ عَائِشَةَ ﵂، زَوْجِ النَّبِيِّ ﷺ، أَنَّ رَسُولَ اللهِ ﷺ قَالَ: إِذَا نَعَسَ أَحَدُكُمْ فِي صَلاَتِهِ، فَلْيَرْقُدْ حَتَّى يَذْهَبَ عَنْهُ النَّوْمُ، فَإِنَّ أَحَدَكُمْ إِذَا صَلَّى وَهُوَ نَاعِسٌ، لاَ يَدْرِي لَعَلَّهُ يَذْهَبُ يَسْتَغْفِرُ فَيَسُبَّ نَفْسَهُ[٤].**

---

(١) ـ مَا جَاءَ فِي صَلَاةِ اللَّيْلِ.

(٢) ـ صحيح لغيره. أخرجه أبو مصعب الزهري: ٢٨٥؛ والشيباني: ١٦٧؛ وابن حنبل: ٢٥٥٠٣؛ والنسائي: ١٧٨٤؛ وأبو داود: ١٣١٤؛ والقابسي: ٨٦، كلهم عن مالك به.

(٣) ـ صحيح. أخرجه أبو مصعب الزهري: ٢٨٦؛ والشيباني: ٢٨٩ في الصلاة؛ وابن حنبل: ٢٥١٩١، وفي: ٢٥٩٢٦، وفي: ٢٥٩٢٦؛ والبخاري: ٣٨٢، وفي: ٥١٣، وفي: ١٢٠٩؛ ومسلم: ٢٧٢؛ والنسائي: ١٦٨؛ وابن حبان: ٢٣٤٢، وفي: ٢٣٤٨؛ وشرح معاني الآثار: ٢٦٥٧؛ والقابسي: ٤٢٣، كلهم عن مالك به.

(٤) ـ صحيح. أخرجه أبو مصعب الزهري: ٢٨٧؛ والبخاري: ٢١٢؛ ومسلم: ٢٢٢؛ وأبو داود: ١٣١٠؛ وابن حبان:




واتە: لە عائیشەی ﵂ خێزانی پێغەمبەری خواوە ﷺ گێردراوەتەوە (گوتوویەتی): پێغەمبەری خوا ﷺ فەرموویەتی: ئەگەر یەکێك لە ئێوە بۆرژا (خەوی هات) لە نوێژەکەیدا، ئەوە با پاڵکەوێ و بخەوێ تا خەوەکەی دەڕوا (و چالاك دەبێتەوە)، چونکە بە دڵنیایی کاتێ یەکێك لە ئێوە نوێژ دەکات لە کاتێکدا خەواڵووە، نازانێ (چی دەڵێ) ڕەنگە بیەوێت داوای لێخۆشبوون و نزا بکات جا جوێن بە خۆی بدات و نزا لە خۆی بکات (ڕەنگە شەیتان بەمجۆرە یاری پێ بکات).

**٣١٠**- عَنْ مَالِكٍ ﵀، عَنْ إِسْمَاعِيلَ بْنِ أَبِي حَكِيمٍ ﵀، أَنَّهُ بَلَغَهُ، أَنَّ رَسُولَ اللهِ ﷺ سَمِعَ امْرَأَةً مِنَ اللَّيْلِ تُصَلِّي، فَقَالَ: مَنْ هَذِهِ؟ فَقِيلَ لَهُ: هَذِهِ الْحَوْلَاءُ بِنْتُ تُوَيْتٍ ﵂ لاَ تَنَامُ اللَّيْلَ، فَكَرِهَ ذَلِكَ رَسُولُ اللهِ ﷺ، حَتَّى عُرِفَتِ الْكَرَاهِيَةُ فِي وَجْهِهِ، ثُمَّ قَالَ: إِنَّ اللهَ ﷻ لاَ يَمَلُّ حَتَّى تَمَلُّوا، اكْلَفُوا مِنَ الْعَمَلِ مَا لَكُمْ بِهِ طَاقَةٌ[1].

واتە: لە ئیمامی مالیکەوە ﵀ گێردراوەتەوە (گوتوویەتی): ئیسماعیلی کوڕی ئەبو حەکیم ﵀ پێی ڕاگەیاندووم (گوتوویەتی): پێغەمبەری خوا ﷺ گوێی لە مەدحی ئافرەتێك بوو بەوەی بە شەو ناخەوێ و شەونوێژ دەکات، فەرمووی: ئەو ئافرەتە کێیە؟ پێی گوترا: «حەولائی کچی تەوەیت»ـە ﵂، بەشەو ناخەوێ (هەر شەونوێژ دەکا) پێغەمبەری خواش ﷺ ئەوەی پێ باش نەبوو، تا ناڕەزایی لە ڕوخسارییەوە هەست پێ کرا، دواتر فەرمووی: خوای پەروەردگار ﷻ پاداشت ناپچڕێنێ هەتا خۆتان بێزار دەبن و وازدەهێنن، ئەوەندە کردارە بخەنە سەر خۆتان کە تواناتان بەسەریدا دەشکێ.

**٣١١**- عَنْ زَيْدِ بْنِ أَسْلَمَ ﵀، عَنْ أَبِيهِ ﵀، أَنَّ عُمَرَ بْنَ الْخَطَّابِ ﵁ كَانَ يُصَلِّي مِنَ اللَّيْلِ مَا شَاءَ اللهُ، حَتَّى إِذَا كَانَ مِنْ آخِرِ اللَّيْلِ، أَيْقَظَ أَهْلَهُ لِلصَّلاَةِ، يَقُولُ لَهُمْ: الصَّلاَةَ الصَّلاَةَ، ثُمَّ يَتْلُو هَذِهِ الآيَةَ: ﴿ وَأْمُرْ أَهْلَكَ بِٱلصَّلَوٰةِ وَٱصْطَبِرْ عَلَيْهَا ۖ لَا نَسْـَٔلُكَ رِزْقًا ۖ نَّحْنُ نَرْزُقُكَ ۗ وَٱلْعَـٰقِبَةُ لِلتَّقْوَىٰ ﴿١٣٢﴾ ﴾ طه[2].

---

٢٥٨٣؛ والقابسي: ٤٥٢، كلهم عن مالك به.

(١) ـ صحيح لغيره. أخرجه أبو مصعب الزهري: ٢٨٨، عن مالك به.

(٢) ـ صحيح. أخرجه أبو مصعب الزهري: ٢٨٩؛ والحدثاني: ٩٨؛ والشيباني: ١٦٩، كلهم عن مالك به.




واتە: لە زەیدی کوڕی ئەسلەمەوە ﷺ گێردراوەتەوە، ئەویش لە باوکیەوە ﷺ گێڕاویەتەوە (گوتوویەتی): عومەری کوڕی خەتتاب ﷺ چەندی خوا بە نسیبی بکردایە شەونوێژی دەکرد، تا ئەو کاتەی دەگەیشتە بەشی کۆتایی شەو، خانەوادەکەی هەڵدەستاند بۆ نوێژ، پێی دەگوتن: نوێژ بکەن نوێژ بکەن، دواتر ئەم ئایەتەی دەخوێندەوە: ﴿ وَأْمُرْ أَهْلَكَ بِالصَّلَوٰةِ وَاصْطَبِرْ عَلَيْهَا لَا نَسْـَٔلُكَ رِزْقًا نَّحْنُ نَرْزُقُكَ وَالْعَـٰقِبَةُ لِلتَّقْوَىٰ ﴿١٣٢﴾ ﴾ طه، واتە: (فەرمان بکە بە هەموو ئەندامەکانی خێزانەکەت تا نوێژ بکەن و بەردەوام و کۆڵنەدەر بە لەسەری، ئێمە بێگومان داوای ڕزق و ڕۆزی لە تۆ ناکەین، بەڵکوو ئێمە ڕزق و ڕۆزی بە ئێوە دەبەخشین، سەرەنجامی چاکیش هەر بۆ خواناسی و دیندارییە).

**٣١٢-** أَنَّ سَعِيدَ بْنَ الْمُسَيَّبِ ﷺ كَانَ يَقُولُ: يُكْرَهُ النَّوْمُ قَبْلَ الْعِشَاءِ، وَالْحَدِيثُ بَعْدَهَا[١].

واتە: سەعیدی کوڕی موسەییەب ﷺ دەیگوت: خەوتن پێشی نوێژی عیشا و قسەکردن و مەجلیسدانان دوای عیشا بە ناپەسەند داندراوە (تەنها بۆ زانست و کاری خێر نەبێت).

**٣١٣-** أَنَّ عَبْدَ اللهِ بْنَ عُمَرَ ﷺ كَانَ يَقُولُ: صَلاَةُ اللَّيْلِ وَالنَّهَارِ مَثْنَى مَثْنَى، يُسَلِّمُ مِنْ كُلِّ رَكْعَتَيْنِ[٢].

قَالَ مَالِكٌ ﷺ: وَهُوَ الأَمْرُ عِنْدَنَا.

واتە: عەبدوڵڵای کوڕی عومەر ﷺ دەیگوت: نوێژی سوننەت لە شەو و ڕۆژ دوو ڕکات دوو ڕکاتە (واتە ئەو سوننەتانەی لە دوو ڕکاتیش زیاترن هەر چاك وایە دوو دوو ئەنجام بدرێن)، (نوێژخوێن) لە گشت دوو ڕکاتێك سەلام بداتەوە.

ئیمامی مالیك ﷺ گوتوویەتی: فەتوا لای ئێمە لەسەر ئەوەیە.

---

(١) ـ مقطوع ضعيف. أخرجه أبو مصعب الزهري: ٢٩١، عن مالك به.

(٢) ـ صحيح. أخرجه أبو مصعب الزهري: ٢٩٠، عن مالك به.

## ٢- نوێژی ویتری پێغەمبەری خوا ﷺ (١)

**٣١٤- عَنْ عَائِشَةَ ، زَوْجِ النَّبِيِّ ﷺ، أَنَّ رَسُولَ اللهِ ﷺ كَانَ يُصَلِّي مِنَ اللَّيْلِ إِحْدَى عَشْرَةَ رَكْعَةً، يُوتِرُ مِنْهَا بِوَاحِدَةٍ، فَإِذَا فَرَغَ اضْطَجَعَ عَلَى شِقِّهِ الأَيْمَنِ**(٢).

واتە: لە عائیشەی خێزانی پێغەمبەرەوە ﷺ گێڕدراوەتەوە (گوتوویەتی): پێغەمبەری خوا ﷺ هەموو جار بە شەو یازدە ڕكات شەونوێژی دەكرد، (لە كۆتاییدا) ڕكاتێكیانی بەتەنها دەكرد (لە ویترەكان)، جا كاتێ تەواو دەبوو لەسەر لاتەنیشتی ڕاستەی پاڵدەكەوت (تا بانگی بەیانی دەدرا).

**٣١٥- عَنْ أَبِي سَلَمَةَ بْنِ عَبْدِ الرَّحْمَنِ بْنِ عَوْفٍ ، أَنَّهُ سَأَلَ عَائِشَةَ ، زَوْجَ النَّبِيِّ ﷺ، كَيْفَ كَانَتْ صَلاَةُ رَسُولِ اللهِ ﷺ فِي رَمَضَانَ؟ فَقَالَتْ: مَا كَانَ رَسُولُ اللهِ ﷺ يَزِيدُ فِي رَمَضَانَ، وَلاَ فِي غَيْرِهِ، عَلَى إِحْدَى عَشْرَةَ رَكْعَةً، يُصَلِّي أَرْبَعًا، فَلاَ تَسْأَلْ عَنْ حُسْنِهِنَّ وَطُولِهِنَّ، ثُمَّ يُصَلِّي أَرْبَعًا، فَلاَ تَسْأَلْ عَنْ حُسْنِهِنَّ وَطُولِهِنَّ، ثُمَّ يُصَلِّي ثَلاَثًا، فَقَالَتْ عَائِشَةُ : فَقُلْتُ: يَا رَسُولَ اللهِ، أَتَنَامُ قَبْلَ أَنْ تُوتِرَ؟ فَقَالَ: يَا عَائِشَةُ، إِنَّ عَيْنَيَّ تَنَامَانِ وَلاَ يَنَامُ قَلْبِي**(٣).

واتە: لە ئەبو سەلەمەی كوڕی عەبدوڕڕەحمانی كوڕی عەوفەوە گێڕدراوەتەوە بەوەی پرسیاری لە عائیشەی خێزانی پێغەمبەری خوا ﷺ كردووە، (گوتوویەتی): شەونوێژی پێغەمبەری خوا ﷺ چۆن بوو لە ڕەمەزاندا؟ ئەویش گوتی: پێغەمبەری خوا ﷺ نە لە ڕەمەزان و نە لە غەیری ڕەمەزان لە یازدە ڕكات زیاتری نەدەكرد، (سەرەتا) چوار ڕكاتی دەكرد، هەر مەپرسە لە جوانی و درێژییەكەیان، دواتر چواری دیكەشی دەكرد، هەر مەپرسە لە جوانی و درێژییەكەیان، دواتر سێ ڕكاتی دەكرد

---

(١) ـ صَلاَةُ النَّبِيِّ صَلى الله عَلَيهِ وَسَلمَ فِي الْوِتْرِ.

(٢) ـ صحيح. أخرجه أبو مصعب الزهري: ٢٩٢؛ والحدثاني: ٩٩؛ والشيباني: ١٦٥؛ والشافعي: ١٠٣٥؛ وابن حنبل: ٢٤١١٦، وفي: ٢٥٥٢٥؛ ومسلم: ١٢١؛ والنسائي: ١٦٩٦، وفي: ١٧٢٦؛ وأبو داود: ١٣٣٥؛ والترمذي: ٤٤٠؛ وابن حبان: ٢٤٢٧؛ والمنتقى لابن الجارود: ٢٧٩؛ والقابسي: ٣٥، كلهم عن مالك به.

(٣) صحيح. أخرجه أبو مصعب الزهري: ٢٩٣؛ والحدثاني: ٩٩؛ والشيباني: ٢٣٩؛ وابن حنبل: ٢٤١١٩، وفي: ٢٤٤٩٠، وفي: ٢٤٧٧٦؛ والبخاري: ١١٤٧، وفي: ٢٠١٣، وفي: ٣٥٦٩؛ ومسلم: ١٢٥؛ والنسائي: ١٦٩٧؛ وأبو داود: ١٣٤١؛ والترمذي: ٤٣٩؛ وابن حبان: ٢٤٣٠، وفي: ٢٦١٣؛ والقابسي: ٤١٧، كلهم عن مالك به.





(جا پێش کردنی ویترەکە پاڵدەکەوت)، عائیشە ﵂ دەڵێ گوتم: ئەی پێغەمبەری خوا ﷺ ئایا دەخەوی پێش ئەوەی ویتر بکەی!؟ (چونکە ئەبو بەکری باوکی ـ خوا لێی ڕازی بێ ـ نەدەخەوت تا لە سەرەتای شەوەوە ویترەکەشی دەکرد، ئەویش هەر ئەوەی بینی بوو)، پێغەمبەری خواش ﷺ فەرمووی: ئەی عائیشە چاوەکانم دەخەون بەڵام دڵم ناخەوێ[1].

**٣١٦- عَنْ عَائِشَةَ أُمِّ الْمُؤْمِنِينَ ﵂ قَالَتْ: كَانَ رَسُولُ اللهِ ﷺ يُصَلِّي بِاللَّيْلِ ثَلاَثَ عَشْرَةَ رَكْعَةً، ثُمَّ يُصَلِّي إِذَا سَمِعَ النِّدَاءَ بِالصُّبْحِ رَكْعَتَيْنِ خَفِيفَتَيْنِ[2].**

واتە: لە دایکی بڕوادارانەوە عائیشەی ﵂ خێزانی پێغەمبەری خواوە ﷺ گێڕدراوەتەوە گوتوویەتی: پێغەمبەری خوا ﷺ هەموو جار بە شەو سێزدە ڕکاتی دەکرد (واتە بە شەونوێژ و بە دوو ڕکات سوننەتی دوای عیشاشەوە)، دواتر دوو ڕکاتی خەفیفی (سووك) دەکرد کاتێ گوێبیستی بانگی بەیانی دەبوو (واتە سوننەتی پێشی بەیانی).

**٣١٧- عَنْ كُرَيْبٍ، مَوْلَى ابْنِ عَبَّاسٍ ﵄؛ أَنَّ عَبْدَ اللهِ بْنَ عَبَّاسٍ ﵄ أَخْبَرَهُ، أَنَّهُ بَاتَ لَيْلَةً عِنْدَ مَيْمُونَةَ ﵂، زَوْجِ النَّبِيِّ ﷺ، وَهِيَ خَالَتُهُ، قَالَ: فَاضْطَجَعْتُ فِي عَرْضِ الْوِسَادَةِ، وَاضْطَجَعَ رَسُولُ اللهِ ﷺ وَأَهْلُهُ فِي طُولِهَا، فَنَامَ رَسُولُ اللهِ ﷺ، حَتَّى إِذَا انْتَصَفَ اللَّيْلُ، أَوْ قَبْلَهُ بِقَلِيلٍ، أَوْ بَعْدَهُ بِقَلِيلٍ، اسْتَيْقَظَ رَسُولُ اللهِ ﷺ، فَجَلَسَ يَمْسَحُ النَّوْمَ عَنْ وَجْهِهِ بِيَدِهِ، ثُمَّ قَرَأَ الْعَشْرَ الآيَاتِ الْخَوَاتِمَ مِنْ سُورَةِ آلِ عِمْرَانَ، ثُمَّ قَامَ إِلَى شَنٍّ مُعَلَّقٍ، فَتَوَضَّأَ مِنْهُ، فَأَحْسَنَ وُضُوءَهُ، ثُمَّ قَامَ يُصَلِّي.**

---

(١) ـ تێبینی: زۆربەی زانایان دەفەرموون: چوار ڕکات چوار ڕکاتەکانی کە باس کران بە دوو ڕکات دوو ڕکات کردوویەتی، چونکە خۆی فەرموویەتی: شەونوێژ دوو ڕکات دوو ڕکاتە، وە عائیشەش (خوا لێی ڕازی بێ) لە فەرموودەی دیکە گوتوویەتی: لە گشت دوو ڕکاتێکدا سەلامی دەدایەوە، کەواتە کە دەڵێ: چوار ڕکاتی کردووە، مەبەستی ئەوەیە چوار ڕکاتی بەسەریەکەوە دەکرد بەبێ ئیسراحەت، دوو ڕکات دوو ڕکات، دواتر ئیسراحەتێکی دەکرد، دواتر چواری دیکەی بەم شێوەیە دەکرد، دواتر ئیسراحەتی دەکرد، دواتر سێ ڕکاتی دەکرد، دوویان بەیەکەوە و یەکێکیشیان بەتەنها. والله أعلم.

(٢) صحيح. أخرجه أبو مصعب الزهري: ٢٩٤؛ وابن حنبل: ٢٥٤٨٦؛ والبخاري: ١١٧٠؛ وأبو داود: ١٣٣٩؛ والقابسي: ٤٥٦، كلهم عن مالك به.

قَالَ ابْنُ عَبَّاسٍ ﵄: فَقُمْتُ، فَصَنَعْتُ مِثْلَ مَا صَنَعَ، ثُمَّ ذَهَبْتُ، فَقُمْتُ إِلَى جَنْبِهِ، فَوَضَعَ رَسُولُ اللهِ ﷺ يَدَهُ الْيُمْنَى عَلَى رَأْسِي، وَأَخَذَ بِأُذُنِي الْيُمْنَى يَفْتِلُهَا، فَصَلَّى رَكْعَتَيْنِ، ثُمَّ رَكْعَتَيْنِ، ثُمَّ رَكْعَتَيْنِ، ثُمَّ رَكْعَتَيْنِ، ثُمَّ رَكْعَتَيْنِ، ثُمَّ رَكْعَتَيْنِ، ثُمَّ أَوْتَرَ، ثُمَّ اضْطَجَعَ، حَتَّى أَتَاهُ الْمُؤَذِّنُ، فَصَلَّى رَكْعَتَيْنِ خَفِيفَتَيْنِ، ثُمَّ خَرَجَ فَصَلَّى الصُّبْحَ[1].

واتە: لە کوڕەیبی خزمەتکاری ئیبنو عەبباسەوە ﵀ گێردراوەتەوە (گوتوویەتی): عەبدوڵڵای کوڕی عەبباس ﵄ هەواڵی پێداوە بەوەی شەوێکیان ماوەتەوە لەلای مەیمونەی ﵂ خێزانی پێغەمبەری خوا ﷺ، کە پوریەتی (خوشکی دایکیەتی)، دەڵێ: جا بەلای پانی بالیف و سەرینەکەوە ڕاکشام، پێغەمبەری خوا ﷺ و خێزانەکەشی بەلای درێژی بالیفەکەوە ڕاکشان، جا پێغەمبەری خوا ﷺ خەوت تا بوو بە نیوەی شەو، یان تۆزێك پێش نیوەی شەو، یان تۆزێك دوای نیوەی شەو (کاتەکە لەو بەینە بوو)، پێغەمبەری خوا ﷺ لەخەو هەڵسا و بە دەستی موبارەکی شوێنەواری خەوی لە ڕوخساری لادەدا (دەستی بە ڕوخساری موبارەکی دادەهێنا)، دواتر دە ئایەتەکانی کۆتایی سوڕەتی «آل عمران»ی خوێند، دواتر هەڵسا بۆ لای مەتارەیەکی هەڵواسراو (کە ئاوی تیا بوو) دەستنوێژی لێ شۆرد زۆر بەڕێك و جوانی، دواتر هەڵسا نوێژی کرد.

ئیبنو عەبباس ﵄ دەڵێ: منیش هەڵسام و ئەوەم ئەنجام دا کە پێغەمبەری خوا ﷺ ئەنجامی دا (وەکوو ئەو شتەکانم کرد و دەستنوێژم شۆرد)، دواتر چووم لە تەنیشتی (چەپەی) وەستام، جا پێغەمبەری خوا ﷺ دەستی ڕاستەی خستە سەر سەرم و گوێچکەی ڕاستەمی گرت و بایدا (بۆ دەربڕینی خۆشەویستی و ژیکەڵەیی بۆ ئەو کە بەو تەمەنە بچووکە ئەو کارە مەزنە ئەنجام دەدات)، جا دوو ڕکات نوێژی کرد، دواتر دوو ڕکاتی دیکەی کرد، دواتر دوو ڕکاتی دیکەی کرد، دواتر دوو ڕکاتی دیکەی کرد، دواتر دوو ڕکاتی دیکەی کرد، دواتر دوو ڕکاتی دیکەی

(١) ـ صحيح. أخرجه أبو مصعب الزهري: ٢٩٦؛ والشيباني: ١٧٠؛ والشافعي: ٢٥٠؛ وابن حنبل: ٢١٦٤، وفي: ٣٣٧٢؛ والبخاري: ١٨٣، وفي: ٩٩٢، وفي: ١١٩٨، وفي: ٤٥٧٠، وفي: ٤٥٧١، وفي: ٤٥٧٢؛ ومسلم: ١٨٢؛ والنسائي: ١٦٢٠؛ وأبو داود: ١٣٦٧؛ وابن ماجه: ١٣٥٨؛ وابن حبان: ٢٤٢٤، وفي: ٢٤٢٨، وفي: ٢٥٧٩، وفي: ٢٥٩٢، وفي: ٢٦٢١؛ والقابسي: ١٩٣، كلهم عن مالك به.

کرد، دواتر یەك ڕکات ویتری کرد، دواتر پاڵکەوت تا (دوای تەواوبوون لە بانگ) بانگبێژ هات بۆ لای، ئینجا دوو ڕکاتی خەفیف و کورتی (سوننەتی پێش نوێژی بەیانی) کرد، دواتر لە ماڵەوە چووە دەرەوە بۆ مزگەوت) و نوێژی بەیانی کرد.

**٣١٨-** عَنْ زَيْدِ بْنِ خَالِدٍ الْجُهَنِيِّ ﷺ أَنَّهُ قَالَ: لأَرْمُقَنَّ اللَّيْلَةَ صَلاَةَ رَسُولِ اللهِ ﷺ، قَالَ: فَتَوَسَّدْتُ عَتَبَتَهُ، أَوْ فُسْطَاطَهُ، فَقَامَ رَسُولُ اللهِ ﷺ، فَصَلَّى رَكْعَتَيْنِ طَوِيلَتَيْنِ طَوِيلَتَيْنِ طَوِيلَتَيْنِ، ثُمَّ صَلَّى رَكْعَتَيْنِ، وَهُمَا دُونَ اللَّتَيْنِ قَبْلَهُمَا، ثُمَّ صَلَّى رَكْعَتَيْنِ، وَهُمَا دُونَ اللَّتَيْنِ قَبْلَهُمَا، ثُمَّ صَلَّى رَكْعَتَيْنِ، وَهُمَا دُونَ اللَّتَيْنِ قَبْلَهُمَا، ثُمَّ صَلَّى رَكْعَتَيْنِ، وَهُمَا دُونَ اللَّتَيْنِ قَبْلَهُمَا، ثُمَّ صَلَّى رَكْعَتَيْنِ، وَهُمَا دُونَ اللَّتَيْنِ قَبْلَهُمَا، ثُمَّ أَوْتَرَ، فَتِلْكَ ثَلاَثَ عَشْرَةَ رَكْعَةً[١].

واتە: لە زەیدی کوڕی خالیدی جوهەنییەوە ﷺ گێڕدراوەتەوە بەوەی (جارێکیان لە دڵی خۆی) گوتوویەتی: ئەم شەو هەر دەبێ سەیری شەونوێژی پێغەمبەری خوا ﷺ بکەم، دەڵێ: جا (کاتێ زانیم کاتی شەونوێژیەتی) سەرم لەسەر سەکۆی بەردەرگاکەی دانا (وەك سەرین و بالیف لەسەر لایەك ڕاکشام سەیرم دەکرد)، جا (بینیم) دوو ڕکاتی درێژ درێژی کرد، دواتر دوو ڕکاتی دیکەی کرد، لە درێژیدا کەمتر بوون لە دوو ڕکاتەکەی پێشوو، دواتر دوو ڕکاتی دیکەی کرد، کورتتر بوون لەوەی پێشوو، دواتر دوو ڕکاتی دیکەی کرد، کورتتر بوون لەوەی پێشوو، دواتر دوو ڕکاتی دیکەی کرد، کورتتر بوون لەوەی پێشوو، دواتر دوو ڕکاتی دیکەی کرد، کورتتر بوون لەوەی پێشوو، دواتر ڕکاتێکی بەتەنها کرد، ئەوە سێزدە ڕکات[٢].

---

(١) ـ صحيح. أخرجه أبو مصعب الزهري: ٢٩٧؛ والشيباني: ١٦٦؛ وابن حنبل: ٢١٧٢٤؛ ومسلم: ١٩٥؛ وأبو داود: ١٣٦٦؛ وابن ماجه: ١٣٥٧؛ وابن حبان: ٢٦٠٨؛ والقابسي: ٣١٢، كلهم عن مالك به.

(٢) ـ تێبینی: ئیبن عەبدولبەڕ (رحمه الله) دەڵێت: یەحیا (رحمه الله) کە ڕاوی ئەم پەڕتووکەیە لە گێڕانەوەی ئەم فەرموودەیەدا هەڵەی کردووە، بەوەی گوتوویەتی پێغەمبەری خوا ﷺ دوو ڕکاتەکانی سەرەتای زۆر زۆر درێژ کرد و ڕکاتەکانی دواتری کورتتر کرد، بەڵکوو ئەوەی لەلایەن ڕاوییەکانی دیکەی موەتتەْ و سوننەنەکانی دیکەدا هاتووە ئەوەیە: دوو ڕکاتی سەرەتای بەخەفیفی کردووە، ڕکاتەکانی دواتری درێژ کردووە. والله أعلم.

## ٣- فەرمانکردن بە نوێژی ویتر[١]

٣١٩- عَنْ عَبْدِ اللهِ بْنِ عُمَرَ ﵄؛ أَنَّ رَجُلاً سَأَلَ رَسُولَ اللهِ ﷺ عَنْ صَلاَةِ اللَّيْلِ؟ فَقَالَ رَسُولُ اللهِ ﷺ: صَلاَةُ اللَّيْلِ مَثْنَى مَثْنَى، فَإِذَا خَشِيَ أَحَدُكُمُ الصُّبْحَ، صَلَّى رَكْعَةً وَاحِدَةً، تُوتِرُ لَهُ مَا قَدْ صَلَّى[٢].

واتە: لە عەبدوڵڵای کوڕی عومەرەوە ﵄ گێڕدراوەتەوە (گوتوویەتی): پیاوێك پرسیاری لە پێغەمبەری خوا ﷺ کرد دەربارەی شەونوێژ؟ ئەویش فەرمووی: شەونوێژ دوو ڕکات دوو ڕکاتە، جا ئەگەر یەکێك لە ئێوە ترسا «بەیان»ی بەسەردا بێ، ئەوە با ڕکاتێك بکات، (بەمەش) ئەوەی کردوویەتی بۆی دەکات بە تاك (سوننەتی ویتریش دێتە جێ).

٣٢٠- عَنِ ابْنِ مُحَيْرِيزٍ ﵀، أَنَّ رَجُلاً مِنْ بَنِي كِنَانَةَ، يُدْعَى الْمُخْدَجِيَّ، سَمِعَ رَجُلاً بِالشَّامِ يُكَنَّى أَبَا مُحَمَّدٍ، يَقُولُ: إِنَّ الْوِتْرَ وَاجِبٌ، فَقَالَ: الْمُخْدَجِيُّ: فَرُحْتُ إِلَى عُبَادَةَ بْنِ الصَّامِتِ ﵁، فَاعْتَرَضْتُ لَهُ وَهُوَ رَائِحٌ إِلَى الْمَسْجِدِ، فَأَخْبَرْتُهُ بِالَّذِي قَالَ أَبُو مُحَمَّدٍ، فَقَالَ عُبَادَةُ ﵁: كَذَبَ أَبُو مُحَمَّدٍ، سَمِعْتُ رَسُولَ اللهِ ﷺ يَقُولُ: خَمْسُ صَلَوَاتٍ كَتَبَهُنَّ اللهُ ﷻ عَلَى الْعِبَادِ، فَمَنْ جَاءَ بِهِنَّ، لَمْ يُضَيِّعْ مِنْهُنَّ شَيْئًا، اسْتِخْفَافًا بِحَقِّهِنَّ، كَانَ لَهُ عِنْدَ اللهِ عَهْدٌ أَنْ يُدْخِلَهُ الْجَنَّةَ، وَمَنْ لَمْ يَأْتِ بِهِنَّ، فَلَيْسَ لَهُ عِنْدَ اللهِ عَهْدٌ، إِنْ شَاءَ عَذَّبَهُ، وَإِنْ شَاءَ أَدْخَلَهُ الْجَنَّةَ[٣].

واتە: لە ئیبنو موحەیریزەوە ﵀ گێڕدراوەتەوە (گوتوویەتی): پیاوێك لە بەنی کینانە کە پێی دەگوترا موخدەجی، لە شام گوێی لە پیاوێك بوو کونیەکەی ئەبو موحەممەد بوو دەیگوت: نوێژی ویتر واجبە، موخدەجیش دەڵێ: بەڕێ کەوتم بۆ لای عوبادەی کوڕی صامیت ﵁ و پێی گەیشتم لە کاتێکدا دەچوو بۆ مزگەوت،

---

(١) ـ الْأَمْرُ بِالْوِتْرِ.

(٢) ـ صحيح. أخرجه أبو مصعب الزهري: ٢٩٨؛ والحدثاني: ١٠٠؛ والشيباني: ١٦٤؛ والشافعي: ١٠٣٣؛ والشافعي: ١٧٨٤؛ والبخاري، ٩٩٠؛ ومسلم: ١٤٥؛ والنسائي: ١٦٩٤؛ وأبو داود: ١٣٢٦؛ والدارمي: ١٤٥٩، وفي: ١٥٨٤؛ والقابسي: ٢٠٢، كلهم عن مالك به.

(٣) ـ صحيح. أخرجه أبو مصعب الزهري: ٢٩٩؛ والحدثاني: ١٠٠؛ والنسائي: ٤٦١؛ وأبو داود: ١٤٢٠؛ والقابسي: ٥٠٣، كلهم عن مالك





جا ئەوەم پێ ڕاگەیاند کە ئەبو موحەممەد گوتبوی، عوبادەش ﷺ گوتی: ئەبو موحەممەد هەڵەی کردووە، من گوێم لە پێغەمبەری خوا ﷺ بوو دەیفەرموو: پێنج نوێژ هەن خوای پەروەردگار واجبی کردوون لەسەر بەندەکانی، جا هەر کەسێك جێبەجێیان بکات هیچیان لێ نەفەوتێنێ لە بەسادە سەیرکردنیان، ئەوە پەیمانێکی بۆ هەیە لەلایەن خوای پەروەردگارەوە بەوەی بیخاتە بەهەشتەوە، وە هەر کەسێك بە تەواوی جێبەجێیان نەکات (بیانفەوتێنێ یان نەیانکات)، ئەوە هیچ پەیمانێکی لەلایەن پەروەردگارەوە بۆ نییە، ئەگەر ویستی لەسەر بێ سزای دەدا، ئەگەر ویستیشی لەسەر بێ دەیخاتە بەهەشتەوە (بە پلەی کەمتر)[١].

**٣٢١- عَنْ سَعِيدِ بْنِ يَسَارٍ ﷺ قَالَ: كُنْتُ أَسِيرُ مَعَ عَبْدِ اللهِ بْنِ عُمَرَ ﷺ بِطَرِيقِ مَكَّةَ، قَالَ سَعِيدٌ: فَلَمَّا خَشِيتُ الصُّبْحَ، نَزَلْتُ، فَأَوْتَرْتُ، ثُمَّ أَدْرَكْتُهُ، فَقَالَ لِي عَبْدُ اللهِ بْنُ عُمَرَ ﷺ: أَيْنَ كُنْتَ؟ فَقُلْتُ لَهُ: خَشِيتُ الصُّبْحَ، فَنَزَلْتُ، فَأَوْتَرْتُ، فَقَالَ عَبْدُ اللهِ ﷺ: أَلَيْسَ لَكَ فِي رَسُولِ اللهِ ﷺ أُسْوَةٌ، فَقُلْتُ: بَلَى، وَاللَّهِ، فَقَالَ: إِنَّ رَسُولَ اللهِ ﷺ كَانَ يُوتِرُ عَلَى الْبَعِيرِ**[٢].

واتە: لە سەعیدی کوڕی یەسارەوە ﷺ گێڕدراوەتەوە گوتوویەتی: لەگەڵ عەبدوڵڵای کوڕی عومەرەو ﷺ بە ڕێگەی مەککەدا دەڕۆیشتم، سەعید ﷺ دەڵێ: کاتێ ترسام نوێژی بەیانی ببێ هاتمە خوارەوە (لە وڵاغەکەم) و نوێژی ویترم کرد، دواتر خۆم گەیاندەوە پێی، جا عەبدوڵڵای کوڕی عومەر ﷺ گوتی: لە کوێ بووی؟ منیش پێم گوت: ترسام نوێژی بەیانی ببێ، بۆیە دابەزیم و نوێژی ویترم کرد، عەبدوڵڵاش ﷺ گوتی: مەگەر لە پێغەمبەری خواوە ﷺ پێشەنگی و

---

(١) ـ تێبینی: ئەمە یەكێك لەم فەرمودانەیە كە بەڵگەیە بۆ بۆچوونی جمهور (زۆربەی زانایان) كە دەڵێن: ئەو كەسەی نوێژی دەچێ یان نوێژ ناكات و باوەڕی پێ هەیە، كافر نابێ، چونكە ئەگەر كافر ببووایە بە نەكردن و چوواندنی ئەوە پێغەمبەری خوا ﷺ لەم فەرموودەیە نەیدەفەرموو: ((هەر كەسێك جێبەجێیان نەكات، ئەوە هیچ پەیمانێكی لەلایەن پەروەردگارەوە بۆ نییە، ئەگەر ویستی لەسەر بێ سزای دەدا، ئەگەر ویستیشی لەسەر بێ ئەوە دەیخاتە بەهەشتەوە)) چونكە لێخۆشبوون و چوونە بەهەشت بۆ كافر نییە، وەك قورئان بڕاندوویەتەوە.

(٢) ـ صحيح. أخرجه أبو مصعب الزهري: ٣٠٠؛ والحدثاني: ١٠١؛ والشيباني: ٢٠٦؛ والبخاري: ٩٩٩؛ ومسلم، ٣٦؛ والترمذي: ٤٧٢؛ وابن ماجه: ١١٨٩؛ وابن حبان: ١٧٠٤، وفي: ٢٤١٣؛ والقابسي: ٥٢٢، كلهم عن مالك به.

چاولێکردنێکی چاك نییە بۆت؟ منیش گوتم: با سوێند بە خوا، ئەویش گوتی: پێغەمبەری خوا ﷺ (لەو کات و شوێنانە) لەسەر وشترەکەی نوێژی ویتری دەکرد (پێویستی نەدەکرد بێیتە خوارەوە).

**٣٢٢**- عَنْ سَعِيدِ بْنِ الْمُسَيَّبِ ﷺ أَنَّهُ قَالَ: كَانَ أَبُو بَكْرٍ الصِّدِّيقُ ﷺ إِذَا أَرَادَ أَنْ يَأْتِيَ فِرَاشَهُ أَوْتَرَ، وَكَانَ عُمَرُ بْنُ الْخَطَّابِ يُوتِرُ آخِرَ اللَّيْلِ، قَالَ سَعِيدُ بْنُ الْمُسَيَّبِ ﷺ: فَأَمَّا أَنَا، فَإِذَا جِئْتُ فِرَاشِي أَوْتَرْتُ[١].

واتە: لە سەعیدی کوڕی موسەیەبەوە ﷺ گێڕدراوەتەوە بەوەی گوتوویەتی: هەموو جار ئەبو بەکری صدیق ﷺ کاتێ بیویستایە بچێتە سەر جێگەی خەوتنی نوێژی ویتری دەکرد، عومەری کوڕی خەتتابیش ﷺ هەموو جار لە کۆتایی شەو ویتری دەکرد، سەعیدی کوڕی موسەییەب ﷺ گوتوویەتی: هەرچی منیشم، کاتێ دەمەوێ بچمە سەر جێگاکەم ویتر دەکەم (وەك ئیمامی ئەبو بەکر ـ ﷺ ـ).

**٣٢٣**- عَنْ مَالِكٍ ﷺ؛ أَنَّهُ بَلَغَهُ، أَنَّ رَجُلاً سَأَلَ عَبْدَ اللهِ بْنَ عُمَرَ عَنِ الْوِتْرِ أَوَاجِبٌ هُوَ؟ فَقَالَ عَبْدُ اللهِ بْنُ عُمَرَ ﷺ: قَدْ أَوْتَرَ رَسُولُ اللهِ ﷺ، وَأَوْتَرَ الْمُسْلِمُونَ، فَجَعَلَ الرَّجُلُ يُرَدِّدُ عَلَيْهِ، وَعَبْدُ اللهِ بْنُ عُمَرَ ﷺ يَقُولُ: أَوْتَرَ رَسُولُ اللهِ ﷺ، وَأَوْتَرَ الْمُسْلِمُونَ[٢].

واتە: لە ئیمامی مالیکەوە ﷺ گێڕدراوەتەوە بەوەی پێی گەیشتووە پیاوێك پرسیاری لە عەبدوڵڵای کوڕی عومەر ﷺ کرد دەربارەی نوێژی ویتر، کە ئاخۆ واجبە؟ عەبدوڵڵای کوڕی عومەریش ﷺ گوتی: پێغەمبەری خوا ﷺ ویتری کردووە و موسوڵمانانیش ویتریان کردووە، جا پیاوەکە هەر پرسیارەکەی دووبارە دەکردەوە (کە ئاخۆ واجبە؟)، عەبدوڵڵای کوڕی عومەریش ﷺ هەر دەیگوت: پێغەمبەری خوا ﷺ ویتری کردووە و موسوڵمانانیش ویتریان کردووە (واتە خۆ مەرج نییە واجب بێت ئنجا ئەنجامی بدەی، بۆ چاوەڕێ دەکەی بڵێم واجب نییە و لات ئاسان بێ ئەو کارە مەزنە لەدەست خۆت بدەی، تۆش وەك موسوڵمانان ئەنجامی بدە).

---

(١) ـ صحيح. أخرجه أبو مصعب الزهري: ٣٠٢، عن مالك به.

(٢) ـ صحيح. أخرجه أبو مصعب الزهري: ٣٠٣، عن مالك به.




**٣٢٤-** أَنَّ عَائِشَةَ ﵂، زَوْجَ النَّبِيِّ ﷺ كَانَتْ تَقُولُ: مَنْ خَشِيَ أَنْ يَنَامَ حَتَّى يُصْبِحَ، فَلْيُوتِرْ قَبْلَ أَنْ يَنَامَ، وَمَنْ رَجَا أَنْ يَسْتَيْقِظَ آخِرَ اللَّيْلِ، فَلْيُؤَخِّرْ وِتْرَهُ[1].

واتە: لە عائیشەی ﵂ خێزانی پێغەمبەری خواوە ﷺ گێڕدراوەتەوە بەوەی هەموو جار دەیگوت: هەر کەسێك ترسا لەوەی تا بەیانی بخەوێ (مەبەستیشی بوو شەونوێژ و ویتر ئەنجام بدات)، ئەوە با شەونوێژ و ویتر بکات پێش ئەوەی بخەوێ، وە هەر کەسێك ئومێدی هەبوو لە کۆتایی شەو خەبەری ببێتەوە (لە خۆی دڵنیا بوو)، ئەوە با نوێژە ویترەکەی دوا بخات (بۆ ئەو کات).

**٣٢٥-** عَنْ نَافِعٍ ﵀ أَنَّهُ قَالَ: كُنْتُ مَعَ عَبْدِ اللهِ بْنِ عُمَرَ ﵄ بِمَكَّةَ وَالسَّمَاءُ مُغِيمَةٌ، فَخَشِيَ عَبْدُ اللهِ ﵁ الصُّبْحَ، فَأَوْتَرَ بِوَاحِدَةٍ، ثُمَّ انْكَشَفَ الْغَيْمُ، فَرَأَى أَنَّ عَلَيْهِ لَيْلاً فَشَفَعَ بِوَاحِدَةٍ، ثُمَّ صَلَّى بَعْدَ ذَلِكَ رَكْعَتَيْنِ رَكْعَتَيْنِ، فَلَمَّا خَشِيَ الصُّبْحَ أَوْتَرَ بِوَاحِدَةٍ[2].

واتە: لە نافیعەوە ﵀ گێڕدراوەتەوە بەوەی گوتوویەتی: من لەگەڵ عەبدوڵڵای کوڕی عومەر ﵄ لە مەککە بووم، لە کاتێکدا ئاسمان هەوراوی بوو، جا عەبدوڵڵا ﵁ ترسا نوێژی بەیانی دابێت (واتە ترسا لەبەر هەورەکە لە دیاریکردنی کاتەکە نەپێکێ و بکەوێتە ناو بەیانەوە)، جا ڕکاتێك نوێژی ویتری کرد، دواتر هەورەکە لاچوو، جا بینی هێشتا شەو ماوە، جا بە یەك ڕکاتی دیکە ویترەکەی پێشووی کرد بە جووت، دواتر دوای ئەوە دوو ڕکات دوو ڕکات شەونوێژی کرد، جا کاتێ ترسا کاتی بەیانی بێ، یەك ڕکات نوێژی ویتری کرد[3].

**٣٢٦-** عَنْ نَافِعٍ ﵀، أَنَّ عَبْدَ اللهِ بْنَ عُمَرَ ﵄ كَانَ يُسَلِّمُ بَيْنَ الرَّكْعَتَيْنِ وَالرَّكْعَةِ فِي الْوِتْرِ، حَتَّى يَأْمُرَ بِبَعْضِ حَاجَتِهِ[4].

---

(١) ـ ضعيف. أخرجه أبو مصعب الزهري: ٣٠٤، عن مالك به.

(٢) ـ صحيح. أخرجه أبو مصعب الزهري: ٣٠٥؛ والحدثاني: ١٠١؛ والشيباني: ٢٥١؛ والشافعي: ١١٢١، كلهم عن مالك به.

(٣) ـ تێبینی: لەلای ئیمامی مالیك و ئیمامی شافیعی و ئیمامی ئەحمەد نابێ دوو ویتر لە شەوێکدا بکرێن، لەبەر فەرموودەی: (لا وتران في ليلة).

(٤) ـ صحيح. أخرجه أبو مصعب الزهري: ٣٠٦؛ والحدثاني: ١٠١؛ والشيباني: ٢٥٨؛ والشافعي: ١٠٣٩، كلهم عن مالك به.

واتە: لە نافیعەوە ﷺ گێڕدراوەتەوە (گوتوویەتی): (هەندێ جار) عەبدوڵڵای کوڕی عومەر ﷺ (لە سێ ڕکاتەکانی ویتردا) لە نێوان دوو ڕکاتەکە و ڕکاتەکەی کۆتایی سەلامی دەدایەوە تا فەرمانی بکردایە (بە خانەوادەکەی) بە پێویستییێکی خۆی (واتە بەیەکەوە کردنی هەرسێ ڕکاتەکە و بەجیا کردنیانی لەلا دروست بووە، ئەو کاتەی دەیپچڕاند بۆ ئەوەی بوو قسە لەگەڵ خانەوادەکەی بکات سەبارەت بە پێویستییێك).

٣٢٧- عَنِ ابْنِ شِهَابٍ ﷺ، أَنَّ سَعْدَ بْنَ أَبِي وَقَّاصٍ ﷺ كَانَ يُوتِرُ بَعْدَ الْعَتَمَةِ بِوَاحِدَةٍ[١].

قَالَ مَالِكٌ ﷺ: وَلَيْسَ عَلَى هَذَا الْعَمَلُ عِنْدَنَا، وَلَكِنْ أَدْنَى الْوِتْرِ ثَلَاثٌ.

واتە: لە ئیبنو شیهابەوە ﷺ گێڕدراوەتەوە (گوتوویەتی): هەموو جار سەعدی کوڕی ئەبو وەقاص ﷺ لە دوای نوێژی عیشاوە یەك ڕکات نوێژی ویتری دەکرد.

ئیمامی مالیك ﷺ گوتوویەتی: لەلای ئێمە کار و فەتوا لەسەر ئەوە نییە، بەڵکوو کەمترینی ویتر سێ ڕکاتە.

٣٢٨- أَنَّ عَبْدَ اللهِ بْنَ عُمَرَ ﷺ كَانَ يَقُولُ: صَلَاةُ الْمَغْرِبِ وِتْرُ صَلَاةِ النَّهَارِ[٢].

واتە: عەبدوڵڵای کوڕی عومەر ﷺ دەیگوت: نوێژی مەغریب ویتری نوێژەکانی ڕۆژییە (واتە: چۆن شەونوێژ کە نوێژی شەوە ویتری هەیە، بە هەمان شێوە نوێژەکانی ڕۆژیش ویتریان هەیە، ویترەکەشیان بریتییە لە نوێژی مەغریب).

٣٢٩- قَالَ مَالِكٌ ﷺ: مَنْ أَوْتَرَ أَوَّلَ اللَّيْلِ، ثُمَّ نَامَ، ثُمَّ قَامَ، فَبَدَا لَهُ أَنْ يُصَلِّيَ فَلْيُصَلِّ مَثْنَى مَثْنَى، فَهُوَ أَحَبُّ مَا سَمِعْتُ إِلَيَّ[٣].

واتە: ئیمامی مالیك ﷺ گوتوویەتی: هەر کەسێك لە سەرەتای شەوەوە نوێژی ویتری کرد، دواتر خەوت، دواتر هەڵسایەوە و بۆی ڕەخسا شەونوێژ بکات، ئەوە با دوو ڕکات

---

(١) ـ صحيح. أخرجه أبو مصعب الزهري: ٣٠٧؛ والحدثاني: ١٠١، كلهم عن مالك به.

(٢) ـ موقوف صحيح. أخرجه أبو مصعب الزهري: ٣٠٨؛ والشيباني: ٢٤٩، كلهم عن مالك به.

(٣) ـ أخرجه أبو مصعب الزهري: ٣٠٩، عن مالك به.

دوو ڕكات شەونوێژ بكات، ئەوەیان لەلای من چاكترینی ئەوەیە كە گوێبیستی بووبم (واتە: ئەوەیان چاكترە نەك ویترەكە دووبارە بكاتەوە و بیكاتە جووت).

## ٤- ئەنجامدانی نوێژی ویتر دوای كاتی بەیان[١]

**٣٣٠- عَنْ سَعِيدِ بْنِ جُبَيْرٍ ﷺ، أَنَّ عَبْدَ اللهِ بْنَ عَبَّاسٍ ﷺ رَقَدَ ثُمَّ اسْتَيْقَظَ، فَقَالَ لِخَادِمِهِ: انْظُرْ مَا صَنَعَ النَّاسُ، وَهُوَ يَوْمَئِذٍ قَدْ ذَهَبَ بَصَرُهُ، فَذَهَبَ الْخَادِمُ ثُمَّ رَجَعَ، فَقَالَ: قَدِ انْصَرَفَ النَّاسُ مِنَ الصُّبْحِ، فَقَامَ عَبْدُ اللهِ بْنُ عَبَّاسٍ ﷺ، فَأَوْتَرَ ثُمَّ صَلَّى الصُّبْحَ[٢].**

واتە: لە سەعیدی كوڕی جوبەیرەوە ﷺ گێڕدراوەتەوە (گوتوویەتی): عەبدوڵڵای كوڕی عەبباس ﷺ خەوت (بۆ كاتی جەماعەتی نوێژی بەیانی خەبەری نەبۆیەوە)، دواتر هەڵسا و بە خزمەتكارەكەی گوت: سەیركە بزانە خەڵكی چی دەكەن (ئایا نوێژی بەیانی ماوە)، لە كاتێكدا لەو ڕۆژگارەدا عەبدوڵڵای كوڕی عەبباس ﷺ چاوی كوێر ببوو، جا خزمەتكارەكە ڕۆیشت و دواتر گەڕایەوە و گوتی: خەڵك گەڕاونەتەوە لە نوێژی بەیانی، جا عەبدوڵڵای كوڕی عەبباس ﷺ هەڵسا و نوێژی ویتری كرد، دواتر نوێژی بەیانی كرد.

**٣٣١- عَنْ مَالِكٍ ﷺ؛ أَنَّهُ بَلَغَهُ أَنَّ عَبْدَ اللهِ بْنَ عَبَّاسٍ، وَعُبَادَةَ بْنَ الصَّامِتِ، وَالْقَاسِمَ بْنَ مُحَمَّدٍ، وَعَبْدَ اللهِ بْنَ عَامِرِ بْنِ رَبِيعَةَ، قَدْ أَوْتَرُوا بَعْدَ الْفَجْرِ[٣].**

واتە: لە ئیمامی مالیكەوە ﷺ گێڕدراوەتەوە بەوەی پێی گەیشتووە عەبدوڵڵای كوڕی عەبباس و عوبادەی كوڕی صامیت و قاسمی كوڕی موحەممەد و عەبدوڵڵای كوڕی عامری كوڕی ڕەبیعە (خوا لێیان ڕازی بێ) لە دوای كاتی نوێژی بەیانییەوە نوێژی ویتریان كردووە (ئەگەر لە شەودا بەهۆكارێك لە هۆكارەكان نەیانتوانیانە ئەنجامی بدەن).

---

(١) ـ الْوِتْرُ بَعْدَ الْفَجْرِ.

(٢) ـ ضعيف. أخرجه أبو مصعب الزهري: ٣١٠؛ والشيباني: ٢٥٦، كلهم عن مالك به.

(٣) ـ ضعيف. أخرجه الحدثاني: ١٠٢، عن مالك به.

**٣٣٢-** عَنْ هِشَامِ بْنِ عُرْوَةَ ﵀، عَنْ أَبِيهِ ﵀، أَنَّ عَبْدَ اللهِ بْنَ مَسْعُودٍ ﵁ قَالَ: مَا أُبَالِي لَوْ أُقِيمَتْ صَلاَةُ الصُّبْحِ وَأَنَا أُوتِرُ[1].

واتە: لە هیشامی کوڕی عوڕوەوە ﵀ گێڕدراوەتەوە، ئەویش لە باوکیەوە ﵀ گێڕاویەتیەوە (گوتوویەتی): عەبدوڵڵای کوڕی مەسعود ﵁ گوتوویەتی: گوێی پێ نادەم (لام ئاساییە) ئەگەر قامەت بۆ نوێژی بەیانی بکرێت لە کاتێکدا من نوێژی ویتر بکەم.

**٣٣٣-** عَنْ يَحْيَى بْنِ سَعِيدٍ ﵀ أَنَّهُ قَالَ: كَانَ عُبَادَةُ بْنُ الصَّامِتِ ﵁ يَؤُمُّ قَوْمًا، فَخَرَجَ يَوْمًا إِلَى الصُّبْحِ، فَأَقَامَ الْمُؤَذِّنُ صَلاَةَ الصُّبْحِ، فَأَسْكَتَهُ عُبَادَةُ ﵁ حَتَّى أَوْتَرَ، ثُمَّ صَلَّى بِهِمُ الصُّبْحَ[2].

واتە: لە یەحیای کوڕی سەعیدەوە ﵀ گێڕدراوەتەوە بەوەی گوتوویەتی: عوبادەی کوڕی صامیت ﵁ بۆ خەڵکانێك پێشنوێژی دەکرد، ڕۆژێکیان بۆ نوێژی بەیانی دەرچوو و بانگبێژەکەش دەستی کرد بە قامەتکردن، عوبادەش ﵁ بێدەنگی کرد تا نوێژی ویتری کرد، دواتر نوێژی بەیانی بۆ کردن.

**٣٣٤-** عَنْ عَبْدِ الرَّحْمَنِ بْنِ الْقَاسِمِ ﵀ أَنَّهُ قَالَ: سَمِعْتُ عَبْدَ اللهِ بْنَ عَامِرِ بْنِ رَبِيعَةَ ﵁ يَقُولُ: إِنِّي لأُوتِرُ وَأَنَا أَسْمَعُ الإِقَامَةَ أَوْ بَعْدَ الْفَجْرِ، يَشُكُّ عَبْدُ الرَّحْمَنِ أَيَّ ذَلِكَ قَالَ[3].

واتە: لە عەبدوڕڕەحمانی کوڕی قاسمەوە ﵀ گێڕدراوەتەوە بەوەی گوتوویەتی: گوێم لە عەبدوڵڵای کوڕی عامری کوڕی ڕەبیعە ﵁ بوو دەیگوت: (جاری وا هەیە) من ویتر دەکەم لە کاتێکدا گوێم لە قامەت دەبێت - یانیش گوتی: دوای هاتنی کاتی بەیان -، عەبدوڕڕەحمان گومانی هەیە کامیانی گوت.

**٣٣٥-** عَنْ عَبْدِ الرَّحْمَنِ بْنِ الْقَاسِمِ ﵀، أَنَّهُ سَمِعَ أَبَاهُ الْقَاسِمَ بْنَ مُحَمَّدٍ يَقُولُ: إِنِّي لأُوتِرُ بَعْدَ الْفَجْرِ[4].

---

(١) ـ ضعيف. أخرجه أبو مصعب الزهري: ٣١٢؛ والشيباني: ٢٥٥، كلهم عن مالك به.

(٢) ـ ضعيف. أخرجه أبو مصعب الزهري: ٣١٣؛ والشيباني: ٢٥٧، كلهم عن مالك به.

(٣) مقطوع صحيح. أخرجه أبو مصعب الزهري: ٣١٤؛ والشيباني: ٢٥٣، كلهم عن مالك به.

(٤) ـ مقطوع صحيح. أخرجه أبو مصعب الزهري: ٣١٥؛ والشيباني: ٢٥٤، كلهم عن مالك به.

قَالَ مَالِكٌ ﷺ: وَإِنَّمَا يُوتِرُ بَعْدَ الْفَجْرِ مَنْ نَامَ عَنِ الْوِتْرِ، وَلاَ يَنْبَغِي لأَحَدٍ أَنْ يَتَعَمَّدَ ذَلِكَ حَتَّى يَضَعَ وِتْرَهُ بَعْدَ الْفَجْرِ[1].

واتە: لە عەبدوڕڕەحمانی کوڕی قاسمەوە ﷺ گێڕدراوەتەوە بەوەی گوێی لە قاسمی کوڕی موحەممەدی باوکی بووە دەیگوت: من دوای هاتنی کاتی نوێژی بەیانی نوێژی ویتر دەکەم (واتە کاتێ بە هۆکارێك بۆی نارەخسێ لە کاتی خۆیدا ئەنجامی بدات).

ئیمامی مالیك ﷺ گوتوویەتی: تەنها ئەو کەسە نوێژی ویتر لەدوای کاتی بەیانییەوە دەکات کە بەسەر نوێژی ویترەوە خەوتووە (خەبەری نەبۆتەوە بۆ ئەنجامدانی نوێژی ویتر)، وە نابێ هیچ کەسێك بە ئەنقەست وا بکات بەوەی نوێژە ویترەکەی بخاتە دوای کاتی بەیانەوە.

## ٥- ئەوەی هاتووە دەربارەی دوو ڕکاتە سوننەتەکانی پێش نوێژی بەیانی[2]

**٣٣٦-** عَنْ عَبْدِ اللهِ بْنِ عُمَرَ ﷺ؛ أَنَّ حَفْصَةَ ﷺ، زَوْجَ النَّبِيِّ ﷺ أَخْبَرَتْهُ؛ أَنَّ رَسُولَ اللهِ ﷺ كَانَ إِذَا سَكَتَ الْمُؤَذِّنُ عَنِ الأَذَانِ لِصَلاَةِ الصُّبْحِ، صَلَّى رَكْعَتَيْنِ خَفِيفَتَيْنِ، قَبْلَ أَنْ تُقَامَ الصَّلاَةُ[3].

واتە: لە عەبدوڵڵای کوڕی عومەرەوە ﷺ گێڕدراوەتەوە (گوتوویەتی): حەفصەی ﷺ خێزانی پێغەمبەر ﷺ هەواڵی پێداوە بەوەی پێغەمبەری خوا ﷺ هەموو جار کاتێ بانگبێژەکە بێدەنگ دەبوو و لە بانگ دەبۆیەوە لە بانگی نوێژی بەیانیدا، دوو ڕکات نوێژی خەفیف و کورتی دەکرد، پێش ئەوەی قامەت بۆ نوێژ بکرێ.

---

(١) ـ أخرجه أبو مصعب الزهري: ٣١٦؛ والحدثاني: ١٠٢، كلهم عن مالك به.

(٢) ـ مَا جَاءَ فِي رَكْعَتَيِ الْفَجْرِ.

(٣) ـ صحيح. أخرجه أبو مصعب الزهري: ٣١٧؛ والحدثاني: ١٠٣؛ والشيباني: ٢٤٤؛ وابن حنبل: ٢٦٤٧٢؛ والبخاري: ٦١٨؛ ومسلم: ٨٧؛ والنسائي: ١٧٧٣؛ والدارمي: ١٤٤٤؛ والقابسي: ٢٠١، كلهم عن مالك به.

**٣٣٧- أَنَّ عَائِشَةَ ﷺ، زَوْجَ النَّبِيِّ ﷺ، قَالَتْ: إِنْ كَانَ رَسُولُ اللهِ ﷺ لَيُخَفِّفُ رَكْعَتَيِ الْفَجْرِ، حَتَّى إِنِّي لأَقُولُ أَقَرَأَ بِأُمِّ الْقُرْآنِ أَمْ لاَ**[١].

واتە: عائیشەی ﷺ خێزانی پێغەمبەری خوا ﷺ گوتوویەتی: پێغەمبەری خوا ﷺ ئەوەندە دوو ڕکاتەکانی پێش نوێژی بەیانی خەفیف و کورت دەکرد، تا من دەمگوت: ئەریٚ سوڕەتی فاتیحەی خوێند یان نا؟

**٣٣٨- عَنْ أَبِي سَلَمَةَ بْنِ عَبْدِ الرَّحْمَنِ ﷺ، أَنَّهُ قَالَ: سَمِعَ قَوْمٌ الإِقَامَةَ، فَقَامُوا يُصَلُّونَ، فَخَرَجَ عَلَيْهِمْ رَسُولُ اللهِ ﷺ فَقَالَ: أَصَلاَتَانِ مَعًا؟ أَصَلاَتَانِ مَعًا؟ وَذَلِكَ فِي صَلاَةِ الصُّبْحِ، فِي الرَّكْعَتَيْنِ اللَّتَيْنِ قَبْلَ الصُّبْحِ**[٢].

واتە: لە ئەبو سەلەمەی کوڕی عەبدوڕڕەحمانەوە ﷺ گێڕدراوەتەوە بەوەی گوتوویەتی: خەڵکانێك (لە هاوەڵان) گوێبیستی قامەت بوون، جا هەڵسان و دەستیان بە نوێژ کرد، پێغەمبەری خواش ﷺ فەرمووی: ئایا دوو نوێژ بەیەکەوە؟ ئایا دوو نوێژ بەیەکەوە؟ جا ئەوە لە کاتی نوێژی بەیانیدا بوو، دەربارەی دوو ڕکاتەکانی پێش نوێژی بەیانی بوو (واتە قامەت بۆ نوێژی بەیانی کرا، ئینجا ئەوان دەستیان کرد بە سوننەتی پێش نوێژی بەیانی، بەمەش دوو نوێژ هاتە ئاراوە، ئەوەش کارێکی باش نییە، چونکە کە قامەت کرا تەنها نوێژی فەڕز هەیە).

**٣٣٩- عَنْ مَالِكٍ ﷺ؛ أَنَّهُ بَلَغَهُ، أَنَّ عَبْدَ اللهِ بْنَ عُمَرَ ﷺ فَاتَتْهُ رَكْعَتَا الْفَجْرِ، فَقَضَاهُمَا بَعْدَ أَنْ طَلَعَتِ الشَّمْسُ**[٣].

واتە: لە ئیمامی مالیکەوە ﷺ گێڕدراوەتەوە بەوەی پێی گەیشتووە عەبدوڵڵای کوڕی عومەر ﷺ (جارێکیان) دوو ڕکاتەکانی پێش نوێژی بەیانی لەدەست چوو، جا قەزای کردنەوە دوای ئەوەی خۆر هەڵات.

---

(١) ـ صحيح. أخرجه أبو مصعب الزهري: ٣١٨، عن مالك به.

(٢) ـ صحيح. أخرجه أبو مصعب الزهري: ٣١٩؛ والشيباني: ٩٦، كلهم عن مالك به.

(٣) ـ صحيح. أخرجه أبو مصعب الزهري: ٣٢٠؛ والحدثاني: ١٠٣، كلهم عن مالك به.

**٣٤٠-** عَنْ عَبْدِ الرَّحْمَنِ بْنِ الْقَاسِمِ ﷺ، عَنِ الْقَاسِمِ بْنِ مُحَمَّدٍ ﷺ، أَنَّهُ صَنَعَ مِثْلَ الَّذِي صَنَعَ ابْنُ عُمَرَ ﷺ [(١)].

واتە: لە عەبدورڕەحمانی کوڕی قاسمەوە ﷺ گێڕدراوەتەوە، ئەویش لە قاسمی کوڕی موحەممەدەوە ﷺ گێڕاویەتیەوە کە هەمان ئەوەی ئەنجام داوە کە ئیبنو عومەر ﷺ ئەنجامی داوە (واتە سوننەتی پێش نوێژی بەیانی دوای هەڵاتنی خۆر ئەنجامداوە کاتێ لە دەستی چووە لە کاتی خۆیدا)[(٢)].

---

(١) ـ مقطوع صحيح.

(٢) ـ تێبینی: ئیمامی مالیك بەو بەڵگەیە نەهی کردووە لەوەی دوای نوێژی بەیانی سوننەتی بەیانی قەزا بکرێتەوە تا خۆر هەڵدێ، بەڵام ئیمامی شافیعی ڕێگەی داوە پێش هەڵاتنی خۆر ئەنجام بدرێ، بەڵگەشی فەرموودەیەکە کە پیاوێك لە خزمەتی پێغەمبەری خوا ﷺ ڕاستەوخۆ دوای نوێژی بەیانی قەزای کردۆتەوە و پێغەمبەری خوا ﷺ نارەزایی دەرنەبڕیوە، لە کاتێکدا هەواڵی بە پێغەمبەری خوا ﷺ داوە ئەوە قەزاکردنەوەی سوننەتی پێشی بەیانییە.



# پەرتووکی

# نوێژی بەکۆمەڵ[1]



---

(١) ـ كتابُ صَلاةِ الجَماعَةِ.

## ١- گەورەیی نوێژی بەكۆمەڵ بەسەر نوێژی بەتەنها[١]

**٣٤١-** عَنْ عَبْدِ اللهِ بْنِ عُمَرَ ﷺ؛ أَنَّ رَسُولَ اللهِ ﷺ قَالَ: صَلَاةُ الْجَمَاعَةِ تَفْضُلُ صَلَاةَ الْفَذِّ بِسَبْعٍ وَعِشْرِينَ دَرَجَةً[٢].

واتە: لە عەبدوڵڵای کوڕی عومەرەوە ﷺ گێڕدراوەتەوە (گوتوویەتی): پێغەمبەری خوا ﷺ فەرموویەتی: نوێژی بە کۆمەڵ چاکترە و پاداشتی زیاترە لە نوێژی بەتەنها بە بیست و حەوت پلە.

**٣٤٢-** عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ ﷺ، أَنَّ رَسُولَ اللهِ ﷺ قَالَ: صَلَاةُ الْجَمَاعَةِ أَفْضَلُ مِنْ صَلَاةِ أَحَدِكُمْ وَحْدَهُ بِخَمْسَةٍ وَعِشْرِينَ جُزْءًا[٣].

واتە: لە ئەبو هورەیرەوە ﷺ گێڕدراوەتەوە (گوتوویەتی): پێغەمبەری خوا ﷺ فەرموویەتی: نوێژی بە کۆمەڵ چاکترە و پاداشتی زیاترە لە نوێژی یەکێك لە ئێوە بەتەنها بە بیست و پێنج بەش[٤].

---

(١) ـ فَضْلُ صَلَاةِ الْجَمَاعَةِ عَلَى صَلَاةِ الْفَذِّ.

(٢) ـ صحيح. أخرجه أبو مصعب الزهري: ٣٢٢؛ والحدثاني: ١٠٤؛ والشيباني: ١٨٨؛ والشافعي: ٢١٧؛ وابن حنبل: ٥٣٣٢، وفي: ٥٩٢١، وفي: ٦٤٥٥؛ والبخاري: ٦٤٥؛ ومسلم: ٢٤٩؛ والنسائي: ٨٣٧؛ وابن حبان: ٢٠٥٢، وفي: ٢٠٥٤؛ والقابسي: ١٩٧، كلهم عن مالك به.

(٣) ـ صحيح. أخرجه أبو مصعب الزهري: ٣٢٣؛ والحدثاني: ١٠٤؛ والشافعي: ٢١٨؛ وابن حنبل: ١٠١٢٥، وفي: ١٠٣١٠؛ ومسلم: ٢٤٥؛ والنسائي: ٨٣٨؛ والترمذي: ٢١٦؛ وابن حبان: ٢٠٥٣؛ والمنتقى لإبن الجارود: ٣٠٣؛ والقابسي: ١١، كلهم عن مالك به.

(٤) ـ تێبینی: هەندێ لە زانایان دەفەرموون: ئەو فەرموودەی دەفەرموێ: نوێژی بە کۆمەڵ بیست و حەوت پلە پاداشتی زیاترە لە نوێژی بەتەنها، ئەوە لە کاتێکدایە کە نوێژە بەکۆمەڵەکە لە مزگەوت ئەنجام بدرێ، وە ئەو فەرموودەی دەفەرموێ: بە بیست و پێنج پلە گەورەترە، لە کاتێکدایە کە نوێژە بە کۆمەڵەکە لە شوێنێکی جگە لە مزگەوت ئەنجام بدرێ، کەواتە مزگەوت لە نوێژی بەکۆمەڵدا بەردەوام دوو پلە گەورەترە. وە هەندێکی دیکە گوتوویانە: نوێژە بەدەنگەکان پاداشتیان بیست و حەوت پلەیە، نوێژە بێدەنگەکانیش پاداشتیان بیست و پێنجە، چونکە نوێژە بەدەنگەکان گوێگرتن بۆ ئیمام و ئامینکردنی تیایە کە ئەگەر یەك بگرێتەوە لەگەڵ ئامینی فریشتەکان لێخۆشبوونی لە دوایە. وە چەندین بۆچوونی دیکەش هەیە.

**٣٤٣-** عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ ﷺ، أَنَّ رَسُولَ اللهِ ﷺ قَالَ: وَالَّذِي نَفْسِي بِيَدِهِ، لَقَدْ هَمَمْتُ أَنْ آمُرَ بِحَطَبٍ فَيُحْطَبَ، ثُمَّ آمُرَ بِالصَّلاَةِ فَيُؤَذَّنَ لَهَا، ثُمَّ آمُرَ رَجُلاً فَيَؤُمَّ النَّاسَ، ثُمَّ أُخَالِفَ إِلَى رِجَالٍ، فَأُحَرِّقَ عَلَيْهِمْ بُيُوتَهُمْ، وَالَّذِي نَفْسِي بِيَدِهِ، لَوْ يَعْلَمُ أَحَدُهُمْ أَنَّهُ يَجِدُ عَظْمًا سَمِينًا أَوْ مِرْمَاتَيْنِ حَسَنَتَيْنِ لَشَهِدَ الْعِشَاءَ[١].

واتە: لە ئەبو هورەیرەوە ﷺ گێردراوەتەوە (گوتوویەتی): پێغەمبەری خوا ﷺ فەرموویەتی: سوێند بەو زاتەی گیانی منی بەدەستە، هاتە سەرم فەرمان بکەم بەوەی دار کۆ بکرێتەوە، دواتر فەرمان بکەم بە نوێژکردن و بانگ بدرێ، دواتر فەرمان بە پیاوێك بکەم پێشنوێژی بۆ خەڵکی بکات (لە شوێنی من)، دواتر بچم و لەو کەسانە بسورێمەوە (کە ئامادەی نوێژی بەکۆمەڵ نابن) و ماڵەکانیان بەسەردا بسووتێنم، سوێند بەو کەسەی گیانی منی بەدەستە ئەگەر یەکێك لەوان بزانێ ئێسقانە گۆشتێکی گەورە یان دوو پارچە گۆشتی چاکی نێوان سمەکانی ئاژەڵی دەست دەکەوێت ئەوە ئامادەی نوێژی عیشا دەبێت (واتە بۆ دونیا ئامادەن بەڵام بۆ پاداشت ئامادە نابن!)[٢].

**٣٤٤-** أَنَّ زَيْدَ بْنَ ثَابِتٍ ﷺ قَالَ: أَفْضَلُ الصَّلاَةِ صَلاَتُكُمْ فِي بُيُوتِكُمْ، إِلاَّ صَلاَةَ الْمَكْتُوبَةِ[٣].

واتە: زەیدی کوڕی سابیت ﷺ دەیگوت: چاکترین و بەپاداشتترین نوێژ ئەو نوێژەتانە کە لە ماڵەوە ئەنجامی دەدەن، تەنها نوێژە فەرزەکان نەبێ (لە مزگەوت پاداشتیان زۆر زیاترە).

---

(١) ـ صحيح. أخرجه أبو مصعب الزهري: ٣٢٤؛ والحدثاني: ١٠٤؛ والشافعي: ٢١٥؛ والبخاري: ٦٤٤، وفي: ٧٢٢٤؛ والنسائي: ٨٤٨؛ وابن حبان: ٢٠٩٦؛ والقابسي: ٣٢٥، كلهم عن مالك به.

(٢) ـ تێبینی: نوێژی بە کۆمەڵ لەلای مالیکییەکان و ئیمامی شافیعی و زۆربەی زانایان فەرزی کیفایەیە، بە لێکدانەوەی کۆی بەڵگەکان.

(٣) ـ صحيح. أخرجه أبو مصعب الزهري: ٣٢٥؛ والحدثاني: ١٠٤؛ والشيباني: ١٨٧، كلهم عن مالك به.

## ٢- ئەوەی هاتووە دەربارەی نوێژی عیشا و بەیانی[١]

**٣٤٥-** عَنْ سَعِيدِ بْنِ الْمُسَيَّبِ ﷺ، أَنَّ رَسُولَ اللهِ ﷺ قَالَ: بَيْنَنَا وَبَيْنَ الْمُنَافِقِينَ شُهُودُ الْعِشَاءِ وَالصُّبْحِ، لاَ يَسْتَطِيعُونَهُمَا، أَوْ نَحْوَ هَذَا[٢].

واتە: لە سەعیدی کوڕی موسەیەبەوە ﷺ گێردراوەتەوە (گوتوویەتی): پێغەمبەری خوا ﷺ فەرموویەتی: لە نێوان ئێمە و لە نێوان دووڕووەکان (نیشانەیەك هەیە کە بریتییە لە) ئامادەبوونی نوێژی بەکۆمەڵی عیشا و بەیانی، (فەرمووی): توانایان بەسەر ئەو دوو نوێژەدا ناشکێ ـ یان شتێکی ئاوا ـ (واتە ناتوانن بێن بۆ مزگەوت بۆ ئەو دوو نوێژە، یان ئەگەر بشهێن بەردەوام دوا دەکەون، والله أعلم).

**٣٤٦-** عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ ﷺ، أَنَّ رَسُولَ اللهِ ﷺ قَالَ: بَيْنَمَا رَجُلٌ يَمْشِي بِطَرِيقٍ، إِذْ وَجَدَ غُصْنَ شَوْكٍ عَلَى الطَّرِيقِ، فَأَخَّرَهُ، فَشَكَرَ اللهُ لَهُ، فَغَفَرَ لَهُ.

وَقَالَ: الشُّهَدَاءُ خَمْسَةٌ: الْمَطْعُونُ، وَالْمَبْطُونُ، وَالْغَرِقُ، وَصَاحِبُ الْهَدْمِ، وَالشَّهِيدُ فِي سَبِيلِ اللهِ، وَقَالَ: لَوْ يَعْلَمُ النَّاسُ مَا فِي النِّدَاءِ وَالصَّفِّ الأَوَّلِ، ثُمَّ لَمْ يَجِدُوا إِلاَّ أَنْ يَسْتَهِمُوا عَلَيْهِ لاَسْتَهَمُوا، وَلَوْ يَعْلَمُونَ مَا فِي التَّهْجِيرِ لاَسْتَبَقُوا إِلَيْهِ، وَلَوْ يَعْلَمُونَ مَا فِي الْعَتَمَةِ وَالصُّبْحِ لأَتَوْهُمَا وَلَوْ حَبْوًا[٣].

واتە: لە ئەبو هوڕەیڕەوە ﷺ گێردراوەتەوە (گوتوویەتی): پێغەمبەری خوا ﷺ فەرموویەتی: لە کاتێکدا پیاوێك بە ڕێگایەکدا دەڕۆیشت، لەناکاو لقە دارێکی دڕکاوی بینی لەسەر ڕێگاکە، جا لایدا، خوای پەروەردگاریش ﷻ کارەکەی لێ قبووڵ کرد و لێی خۆش بوو (جا هەر شتێك پەیوەندی بە کۆمەڵی مسوڵمانانەوە هەبێت وەك لادانی ئەو دارە لەسەر ڕێی کۆمەڵی مسوڵمانان ئەوە پاداشتی زۆر گەورەترە، کەواتە چۆن مرۆڤ نوێژی بەکۆمەڵ بە نوێژی بەتەنها دەگۆڕێتەوە).

---

(١) ـ مَا جَاءَ فِي الْعَتَمَةِ وَالصُّبْحِ.

(٢) ـ صحيح لغيره. أخرجه أبو مصعب الزهري: ٣٢٦؛ والحدثاني: ١٠٥؛ والشافعي: ٢١٦، كلهم عن مالك به.

(٣) ـ صحيح. أخرجه أبو مصعب الزهري: ٣٢٧؛ والشيباني: ٣٠٣؛ وابن حنبل: ٨٢٨٨، وفي: ١٠٩٠٩؛ والبخاري: ٦٥٢، وفي: ٢٤٧٢، وفي: ٢٨٢٩، وفي: ٥٧٣٣؛ ومسلم: ١٦٤، وفي: ١٢٧؛ والترمذي: ١٠٦٣، وفي: ١٩٥٨؛ وابن حبان: ٥٣٧، وفي: ٣١٨٨؛ والقابسي: ٤٣٣، كلهم عن مالك به.





(جا کاتێ ئیمامی مالیك ﷺ ئەم فەرمووده دەگێڕێتەوە کە لە ڕوویێك لە ڕووەکان پەیوەندی بە بابەتەکەوە هەیە کە بریتییە لە گەورەیی کۆمەڵ و نوێژی بەکۆمەڵ، جا کە فەرموودەیەکی دیکەی لەلایە بە هەمان سەنەد، بۆیە گوتوویەتی با ئەو فەرموودەیەش باس بکەم هەرچەندە پەیوەندی بە بابەتەکەشەوە نەبێ، ئەویش بریتییە لەوەی پێغەمبەری خوا ﷺ فەرموویەتی: شەهیدەکان پێنج جۆرن: ئەوانەی بە نەخۆشی تاعون دەمرن، وە ئەوانەی بەهۆی نەخۆشییەکانی سك دەمرن (وەك سکچوون و نەخۆشی دیکە)، وە ئەوانەی بە خنکان دەمرن، وە ئەوانەی بە شت بەسەردابەربوونەوە دەمرن، وە ئەوانەی لە ڕێگەی خوای پەروەردگار لە جیهاد دەکوژرێن.

وە (بە هەمان سەنەد هاتووە) پێغەمبەری خوا ﷺ فەرموویەتی: ئەگەر خەڵك بیانزانیایە چ پاداشتێك هەیە لە بانگدان و ڕیزی یەکەم (ی جومعە و جەماعەتدا) دواتر دەستیان نەکەوتایە (لەبەر ئەوەی گشتیان ئامادەبوونایە و لە دەنگخۆشی و هەموو شت وەك یەکدی بووان، جا هیچ ڕێگەیەکیان نەدۆزیایەتەوە بۆ بەدەستهێنانی) تەنها ئەوە نەبێ تیروپشك بکەن، ئەوە تیروپشکیان دەکرد، وە ئەگەر بیانزانیایە چ پاداشتێك لە زوو ئامادەبوونی نوێژەکاندا هەیە، ئەوە پێشبڕکێیان دەکرد لە زوو دەرچوون بۆ مزگەوت، وە ئەگەر بیانزانیایە چ پاداشتێك لە ئامادەبوونی نوێژی بە کۆمەڵی عیشا و بەیانیدا هەیە، ئەوە بۆی دەهاتن ئەگەر بە گاگۆڵکێش بووایە (واتە نەخۆش و پیر و لاوازەکانیش خۆیان پێ ڕانەدەگیرا و بە هێنکەهێنك خۆیان دەگەیاندێ).

**٣٤٧- عَنْ أَبِي بَكْرِ بْنِ سُلَيْمَانَ بْنِ أَبِي حَثْمَةَ ﷺ، أَنَّ عُمَرَ بْنَ الْخَطَّابِ ﷺ فَقَدَ سُلَيْمَانَ بْنَ أَبِي حَثْمَةَ فِي صَلاَةِ الصُّبْحِ، وَأَنَّ عُمَرَ بْنَ الْخَطَّابِ ﷺ غَدَا إِلَى السُّوقِ، وَمَسْكَنُ سُلَيْمَانَ بَيْنَ السُّوقِ وَالْمَسْجِدِ النَّبَوِيِّ، فَمَرَّ عَلَى الشِّفَاءِ أُمِّ سُلَيْمَانَ، فَقَالَ لَهَا: لَمْ أَرَ سُلَيْمَانَ فِي الصُّبْحِ، فَقَالَتْ: إِنَّهُ بَاتَ يُصَلِّي، فَغَلَبَتْهُ عَيْنَاهُ، فَقَالَ عُمَرُ ﷺ: لأَنْ أَشْهَدَ صَلاَةَ الصُّبْحِ فِي الْجَمَاعَةِ، أَحَبُّ إِلَيَّ مِنْ أَنْ أَقُومَ لَيْلَةً**[1].

---

(١) ـ صحيح. أخرجه أبو مصعب الزهري: ٣٢٨؛ والحدثاني: ١٠٥؛ والشيباني: ٢٤٣، كلهم عن مالك به.




واتە: لە ئەبو بەکری کوڕی سولەیمانی کوڕی ئەبو حەثمەوە ﷺ گێڕدراوەتەوە (گوتوویەتی): عومەری کوڕی خەتتاب ﷺ سولەیمانی کوڕی ئەبو حەثمەی نەبینی لە نوێژی بەیانیدا، عومەری کوڕی خەتتابیش ﷺ بەیانییەکەی چوو بۆ بازاڕ، ماڵی سولەیمانی کوڕی ئەبو حەثمەش لە نێوان بازاڕ و مزگەوتی پێغەمبەری خوا ﷺ بوو، جا ئیمامی عومەر ﷺ بەلای شیفای دایکی سولەیماندا تێپەڕی و پێی گوت: سولەیمانم لە نوێژی بەیانیدا نەبینی، ئەویش گوتی: ئەو شەو هەر شەونوێژی کرد، جا خەو بەسەریدا زاڵ بوو (بۆ کاتی جەماعەت خەبەری نەبۆیەوە)، ئیمامی عومەریش ﷺ گوتی: ئەگەر ئامادەی نوێژی بەیانی بم لام چاکتر و خۆشەویستترە لەوەی شەوێك بەتەواوی شەونوێژ بکەم.

**٣٤٨**- عَنْ عَبْدِ الرَّحْمَنِ بْنِ أَبِي عَمْرَةَ الأَنْصَارِيِّ ﷺ، أَنَّهُ قَالَ: جَاءَ عُثْمَانُ بْنُ عَفَّانَ ﷺ إِلَى صَلاَةِ الْعِشَاءِ، فَرَأَى أَهْلَ الْمَسْجِدِ قَلِيلاً، فَاضْطَجَعَ فِي مُؤَخَّرِ الْمَسْجِدِ، يَنْتَظِرُ النَّاسَ أَنْ يَكْثُرُوا، فَأَتَاهُ ابْنُ أَبِي عَمْرَةَ ﷺ فَجَلَسَ إِلَيْهِ، فَسَأَلَهُ مَنْ هُوَ؟ فَأَخْبَرَهُ، فَقَالَ: مَا مَعَكَ مِنَ الْقُرْآنِ؟ فَأَخْبَرَهُ، فَقَالَ لَهُ عُثْمَانُ ﷺ: مَنْ شَهِدَ الْعِشَاءَ، فَكَأَنَّمَا قَامَ نِصْفَ لَيْلَةٍ، وَمَنْ شَهِدَ الصُّبْحَ، فَكَأَنَّمَا قَامَ لَيْلَةً[1].

واتە: لە عەبدوڕڕەحمانی کوڕی ئەبو عەمرەی ئەنصارییەوە ﷺ گێڕدراوەتەوە بەوەی گوتوویەتی: عوسمانی کوڕی عەففان ﷺ هات بۆ نوێژی عیشا، بینی خەڵکی مزگەوت ژمارەیان کەمە، جا لە کۆتایی مزگەوتەکە پاڵکەوت، چاوەڕێی خەڵکی کرد تا زۆر ببن، جا ئیبنو ئەبی عەمرە ﷺ هات بۆ لای و لەلای دانیشت، ئەویش پرسیاری لێکرد تۆ کێی؟ ئەویش پێی ڕاگەیاند و خۆی ناساند، ئیمامی عوسمانیش ﷺ گوتی: قورئانت چەند لەبەرە؟ ئەویش پێی ڕاگەیاند، ئیمامی عوسمان ﷺ پێی گوت: هەر کەسێك ئامادەی نوێژی عیشا بێت وەك ئەوە وایە نیو شەو شەونوێژی کردبێ، وە هەر کەسێك ئامادەی نوێژی بەیانی بێت وەك ئەوە وایە شەوێك تا سەر شەونوێژی کردبێت.

---

(١) ـ صحيح. أخرجه أبو مصعب الزهري: ٣٢٩؛ والحدثاني: ١٠٥، كلهم عن مالك به.





## ٣- دووبارەکردنەوەی نوێژ لەگەڵ ئیمام (لەگەڵ جەماعەت)[١]

**٣٤٩-** عَنْ زَيْدِ بْنِ أَسْلَمَ ﷺ، عَنْ رَجُلٍ مِنْ بَنِي الدِّيلِ، يُقَالُ لَهُ: بُسْرُ بْنُ مِحْجَنٍ، عَنْ أَبِيهِ مِحْجَنٍ ﷺ، أَنَّهُ كَانَ فِي مَجْلِسٍ مَعَ رَسُولِ اللهِ ﷺ، فَأُذِّنَ بِالصَّلَاةِ، فَقَامَ رَسُولُ اللهِ ﷺ فَصَلَّى، ثُمَّ رَجَعَ، وَمِحْجَنٌ ﷺ فِي مَجْلِسِهِ لَمْ يُصَلِّ مَعَهُ، فَقَالَ لَهُ رَسُولُ اللهِ ﷺ: مَا مَنَعَكَ أَنْ تُصَلِّيَ مَعَ النَّاسِ؟ أَلَسْتَ بِرَجُلٍ مُسْلِمٍ؟ فَقَالَ: بَلَى، يَا رَسُولَ اللهِ، وَلَكِنِّي قَدْ صَلَّيْتُ فِي أَهْلِي، فَقَالَ لَهُ رَسُولُ اللهِ ﷺ: إِذَا جِئْتَ، فَصَلِّ مَعَ النَّاسِ، وَإِنْ كُنْتَ قَدْ صَلَّيْتَ[٢].

واتە: لە زەیدی کوڕی ئەسلەمەوە ﷺ گێڕدراوەتەوە، ئەویش لە پیاوێکی بەنو دیلەوە گێڕاویەتەوە کە پێی دەگوترا: بوسری کوڕی میحجەن ﷺ، ئەویش لە میحجەنی باوکیەوە گێڕاویەتەوە بەوەی لە مەجلیسێکدا بووە لەگەڵ پێغەمبەری خوا ﷺ، جا بانگدرا بۆ نوێژ، پێغەمبەری خواش ﷺ هەڵسا و نوێژی کرد، دواتر گەڕایەوە، لە کاتێکدا میحجەن ﷺ هەر لە شوێنی خۆی مابۆیەوە نوێژی لەگەڵ نەکرد، پێغەمبەری خواش ﷺ پێی فەرموو: چی ڕێگری لێکردی لەگەڵ خەڵکیدا نوێژی بەکۆمەڵ بکەیت؟ مەگەر پیاوێکی مسوڵمان نیت؟ ئەویش گوتی: با، ئەی پێغەمبەری خوا ﷺ، بەڵام من لەماڵەوە نوێژم کردبوو، پێغەمبەری خواش ﷺ پێی فەرموو: ئەگەر هاتی بۆ لای مزگەوت ئەوە لەگەڵ خەڵکیدا نوێژ بکە، هەرچەندە نوێژیشت کردبێت.

**٣٥٠-** عَنْ نَافِعٍ ﷺ، أَنَّ رَجُلاً سَأَلَ عَبْدَ اللهِ بْنَ عُمَرَ ﷺ فَقَالَ: إِنِّي أُصَلِّي فِي بَيْتِي، ثُمَّ أُدْرِكُ الصَّلَاةَ مَعَ الإِمَامِ، أَفَأُصَلِّي مَعَهُ؟ فَقَالَ لَهُ عَبْدُ اللهِ بْنُ عُمَرَ ﷺ: نَعَمْ، فَقَالَ الرَّجُلُ: أَيَّتَهُمَا أَجْعَلُ صَلَاتِي؟ فَقَالَ لَهُ ابْنُ عُمَرَ ﷺ: أَوَ ذَلِكَ إِلَيْكَ، إِنَّمَا ذَلِكَ إِلَى اللهِ يَجْعَلُ أَيَّتَهُمَا شَاءَ[٣].

واتە: لە نافیعەوە ﷺ گێڕدراوەتەوە (گوتوویەتی): پیاوێك پرسیاری لە عەبدوڵڵای کوڕی عومەر ﷺ کرد و گوتی: من (جاری وا هەیە) لە ماڵەوە نوێژ دەکەم، دواتر

---

(١) ـ إِعَادَةُ الصَّلَاةِ مَعَ الإِمَامِ.

(٢) ـ حسن لغيره. أخرجه أبو مصعب الزهري: ٣٣٠؛ والحدثاني: ١٠٦؛ والشيباني: ٢١٧؛ والشافعي: ١٠٤٣؛ وابن حنبل: ١٦٤٤٢؛ والنسائي: ٨٥٧؛ وابن حبان: ٢٤٠٥؛ والقابسي: ١٨٤، كلهم عن مالك به.

(٣) ـ صحيح. أخرجه أبو مصعب الزهري: ٣٣١؛ والحدثاني: ١٠٦، كلهم عن مالك به.

لەگەڵ ئیمام بە نوێژی جەماعەت ڕادەگەم، جا ئایا نوێژی لەگەڵ بکەمەوە؟ عەبدوڵڵای کوڕی عومەریش ﷺ گوتی: بەڵێ، پیاوەکەش گوتی: کامیان بە نوێژە واجب و سەرەکییەکە ئەژمار بکەم؟ ئیبنو عومەریش ﷺ پێی گوت: مەگەر ئەوە لەلای تۆیە؟! ئەوە تەنها لەلای خوایە ﷻ کامیان حەز بکات ئەویان دەکات بە نوێژی واجب و سەرەکی.

**٣٥١- عَنْ يَحْيَى بْنِ سَعِيدٍ ﷺ، أَنَّ رَجُلاً سَأَلَ سَعِيدَ بْنَ الْمُسَيَّبِ ﷺ فَقَالَ: إِنِّي أُصَلِّي فِي بَيْتِي، ثُمَّ آتِي الْمَسْجِدَ فَأَجِدُ الإِمَامَ يُصَلِّي، أَفَأُصَلِّي مَعَهُ؟ فَقَالَ سَعِيدٌ ﷺ: نَعَمْ، فَقَالَ الرَّجُلُ: فَأَيُّهُمَا صَلاَتِي؟ فَقَالَ سَعِيدٌ ﷺ: أَوَ أَنْتَ تَجْعَلُهُمَا، إِنَّمَا ذَلِكَ إِلَى اللهِ[(١)].**

واتە: لە یەحیای کوڕی سەعیدەوە ﷺ گێڕدراوەتەوە (گوتوویەتی): پیاوێك پرسیاری لە سەعیدی کوڕی موسەیەب ﷺ کرد و گوتی: من (جاری وا هەیە) لە ماڵەوە نوێژ دەکەم، دواتر دێم بۆ مزگەوت دەبینم ئیمام پێشنوێژی بۆ خەڵکی دەکات، جا ئایا لەگەڵی نوێژ بکەمەوە؟ سەعیدیش ﷺ گوتی: بەڵێ، پیاوەکەش گوتی: کامیان نوێژەکەمە (کامیان بە فەرزەکە حیسابە)؟ سەعیدیش ﷺ گوتی: مەگەر تۆ بڕیاری لەسەر دەدەیت! ئەوە تەنها لەلای خوایە (ئەو دیاری دەکات و بڕیاری لەسەر دەدات).

**٣٥٢- عَنْ رَجُلٍ مِنْ بَنِي أَسَدٍ، أَنَّهُ سَأَلَ أَبَا أَيُّوبَ الأَنْصَارِيَّ ﷺ فَقَالَ: إِنِّي أُصَلِّي فِي بَيْتِي، ثُمَّ آتِي الْمَسْجِدَ فَأَجِدُ الإِمَامَ يُصَلِّي، أَفَأُصَلِّي مَعَهُ؟ فَقَالَ أَبُو أَيُّوبَ ﷺ: نَعَمْ، فَصَلِّ مَعَهُ فَإِنَّ مَنْ صَنَعَ ذَلِكَ فَإِنَّ لَهُ سَهْمَ جَمْعٍ، أَوْ مِثْلَ سَهْمِ جَمْعٍ[(٢)].**

واتە: لە پیاوێکی بەنو ئەسەدەوە گێڕدراوەتەوە بەوەی پرسیاری لە ئەبو ئەیوبی ئەنصاری ﷺ کردووە و گوتوویەتی: من (جاری وا هەیە) لە ماڵەوە نوێژ دەکەم، دواتر دێم بۆ مزگەوت دەبینم ئیمام بۆ کۆمەڵ نوێژ دەکات، جا ئایا لەگەڵی نوێژ بکەمەوە؟ ئەبو ئەیوبیش ﷺ گوتی: بەڵێ، نوێژی لەگەڵ بکەوە، چونکە هەر

---

(١) ـ مقطوع صحيح. أخرجه أبو مصعب الزهري: ٣٣٢، عن مالك به.

(٢) ـ ضعيف. أخرجه أبو مصعب الزهري: ٣٣٣؛ والشيباني: ٢١٩، كلهم عن مالك به.




کەسێك وا بکات، ئەوە دوو پشکی بۆ هەیە یان وەك دوو پشکی بۆ هەیە (واتە پاداشتەکەی دووبەرانبەرە).

**٣٥٣-** أَنَّ عَبْدَ اللهِ بْنَ عُمَرَ ﭭ كَانَ يَقُولُ: مَنْ صَلَّى الْمَغْرِبَ أَوِ الصُّبْحَ، ثُمَّ أَدْرَكَهُمَا مَعَ الإِمَامِ، فَلاَ يَعُدْ لَهُمَا[١].

واتە: عەبدوڵڵای کوڕی عومەر ﭭ هەموو جار دەیگوت: هەر کەسێك نوێژی مەغریب و بەیانی بکات (لە شوێنێکی جگە لە مزگەوت)، دواتر پێیان ڕابگات لەگەڵ ئیمامدا، ئەوە با دووبارەیان نەکاتەوە (چونکە دووبارەکردنەوەکەی مەغریب بۆی دەبێتە سوننەت، سوننەتی تاکیش «جگە لە ویتر»بونی نییە، وە دووبارەکردنەوەی نوێژی بەیانیش بۆی دەبێتە سوننەت، سوننەتیش دوای نوێژی بەیانی نییە - ئەوە بۆچوونی عەبدوڵڵایە ﭬ -).

**٣٥٤-** قَالَ مَالِكٌ ﭬ: وَلاَ أَرَى بَأْسًا أَنْ يُصَلِّيَ مَعَ الإِمَامِ مَنْ كَانَ قَدْ صَلَّى فِي بَيْتِهِ، إِلاَّ صَلاَةَ الْمَغْرِبِ، فَإِنَّهُ إِذَا أَعَادَهَا، كَانَتْ شَفْعًا[٢].

واتە: ئیمامی مالیك ﭬ گوتوویەتی: پێم وا نییە هیچ کێشەی تیا بێت ئەو کەسەی نوێژی لە ماڵەوە کردووە لەگەڵ ئیمام نوێژ دووبارە بکاتەوە، تەنها نوێژی مەغریب نەبێ، چونکە ئەگەر دووبارەی بکاتەوە دەبێتە جووت (واتە مەغریب خۆی سێ ڕکاتە، ئەگەر دووبارەی بکاتەوە دەبێتە شەش ڕکات و دەبێتە جووت، بۆیە نابێت - ئەمە بۆچونی ئیمامی مالیکە ﭬ -)[٣].

---

(١) ـ صحيح. أخرجه أبو مصعب الزهري: ٣٣٤؛ والشيباني: ٢١٨؛ والشافعي: ١٠٤٤، كلهم عن مالك به.

(٢) ـ أخرجه أبو مصعب الزهري: ٣٣٥، عن مالك به.

(٣) ـ تێبینی: بەڵام لەلای ئیمامی شافیعی هەموو نوێژەکان دروستە لەگەڵ جەماعەت دووبارە بکرێنەوە، لەبەر ئەوەی لە فەرموودەی میحجەندا بە ڕەهایی هاتووە.

## ٤- کردار و چۆنییەتی ئەنجامدانی نوێژی بەکۆمەڵ[١]

٣٥٥- عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ ﷺ، أَنَّ رَسُولَ اللهِ ﷺ قَالَ: إِذَا صَلَّى أَحَدُكُمْ بِالنَّاسِ فَلْيُخَفِّفْ، فَإِنَّ فِيهِمُ الضَّعِيفَ وَالسَّقِيمَ وَالْكَبِيرَ، وَإِذَا صَلَّى أَحَدُكُمْ لِنَفْسِهِ، فَلْيُطَوِّلْ مَا شَاءَ[٢].

واتە: لە ئەبو هورەیرەوە ﷺ گێڕدراوەتەوە (گوتوویەتی): پێغەمبەری خوا ﷺ فەرموویەتی: ئەگەر یەکێك لە ئێوە نوێژی بۆ خەڵکی کرد با خەفیف و کورتی بکاتەوە، چونکە بە دڵنیایی بێهێز و نەخۆش و بە تەمەنیان تێدایە، وە کاتێ یەکێك لە ئێوە تەنها بۆ خۆی نوێژی کرد، ئەوە با چەندی دەیەوێ درێژی بکاتەوە[٣].

٣٥٦- عَنْ نَافِعٍ ﷺ، أَنَّهُ قَالَ: قُمْتُ وَرَاءَ عَبْدِ اللهِ بْنِ عُمَرَ ﷺ فِي صَلَاةٍ مِنَ الصَّلَوَاتِ، وَلَيْسَ مَعَهُ أَحَدٌ غَيْرِي، فَخَالَفَ عَبْدُ اللهِ ﷺ بِيَدِهِ، فَجَعَلَنِي حِذَاءَهُ عَنْ يَمِينِهِ[٤].

واتە: لە نافیعەوە ﷺ گێڕدراوەتەوە گوتوویەتی: لەدوای عەبدوڵڵای کوڕی عومەرەوە ﷺ وەستام لە نوێژێك لە نوێژەکان، لە کاتێکدا کەسی جگە لە منی لەگەڵ نەبوو، جا عەبدوڵڵا ﷺ دەستی هێنایە پشتەوە و منی لە تەنیشتی خۆی دانا، لەلای ڕاستە.

---

(١) ـ الْعَمَلُ فِي صَلَاةِ الْجَمَاعَةِ.

(٢) ـ صحيح. أخرجه أبو مصعب الزهري: ٣٣٦؛ والحدثاني: ١٠٧؛ والشيباني: ٢٤٨؛ والشافعي: ٢١٢؛ وابن حنبل: ١٠٣١١؛ والبخاري: ٧٠٣؛ والنسائي: ٨٢٣؛ وأبو داود: ٧٩٤؛ وابن حبان: ١٧٦٠؛ والقابسي: ٣٢٦، كلهم عن مالك به.

(٣) ـ تێبینی: کاتێ پێغەمبەری خوا ﷺ دەفەرموێ: نوێژ بۆ خەڵکی کورت بکەنەوە، مانای ئەوە نییە ئەو کورتییە جێبەجێ بکرێت کە هەندێ خەڵك داوای دەکات بەوەی ئیمام و مەئموم بەدوای یەکەوە ڕابکەن و نەگەن بەیەکدی، نەخێر، بەدڵنیایی پێغەمبەری خوا ﷺ ئەو کورتییەی فەرمانی پێ کردووە بە کردار جێبەجێی کردووە، کەچی سوڕەتی قاف و هاوشێوەکانی خوێندوون و سوڕەتی کورتیشی خوێندووە، خوێندنی ئەویش هێواش بووە، کەواتە نابێ بە ناوی فەرمانی پێغەمبەری خوا ﷺ ئیمام و مەئموم لەدوای یەکدی ڕابکەن و نەگەنەوە یەکدی و نوێژەکە لەکۆڵ خۆیان بکەنەوە و قبووڵبوون لەدەست خۆیان بدەن!

(٤) ـ صحيح. أخرجه أبو مصعب الزهري: ٣٣٧؛ والحدثاني: ١٠٧؛ والشيباني: ١٧٧، كلهم عن مالك به.

**٣٥٧- عَنْ يَحْيَى بْنِ سَعِيدٍ ﷺ، أَنَّ رَجُلاً كَانَ يَؤُمُّ النَّاسَ بِالْعَقِيقِ، فَأَرْسَلَ إِلَيْهِ عُمَرُ بْنُ عَبْدِ الْعَزِيزِ ﷺ، فَنَهَاهُ[١].**

**قَالَ مَالِكٌ ﷺ: وَإِنَّمَا نَهَاهُ لأَنَّهُ كَانَ لاَ يُعْرَفُ أَبُوهُ.**

واتە: لە یەحیای کوڕی سەعیدەوە ﷺ گێڕدراوەتەوە (گوتوویەتی): پیاوێك هەموو جار لە عەقیق (کە شوێنێکی مەدینەیە) پێشنوێژی بۆ خەڵکی دەکرد، جا عومەری کوڕی عەبدولعەزیز ﷺ بەدوایدا نارد و نەهی لێکرد لەوەی چیدی پێشنوێژی بۆ خەڵکی بکات.

ئیمامی مالیك ﷺ گوتوویەتی: لەبەر ئەوە قەدەغەی لێکردووە، چونکە باوکی نەناسراو بووە (واتە وەچەی زینا بووە)[٢].

## ٥- نوێژکردنی ئیمام لە کاتێکدا بەدانیشتنەوەیە[٣]

**٣٥٨- عَنْ أَنَسِ بْنِ مَالِكٍ ﷺ، أَنَّ رَسُولَ اللهِ ﷺ رَكِبَ فَرَسًا فَصُرِعَ، فَجُحِشَ شِقُّهُ الأَيْمَنُ، فَصَلَّى صَلاَةً مِنَ الصَّلَوَاتِ وَهُوَ قَاعِدٌ، وَصَلَّيْنَا وَرَاءَهُ قُعُودًا، فَلَمَّا انْصَرَفَ قَالَ: إِنَّمَا جُعِلَ الإِمَامُ لِيُؤْتَمَّ بِهِ، فَإِذَا صَلَّى قَائِمًا فَصَلُّوا قِيَامًا، وَإِذَا رَكَعَ فَارْكَعُوا، وَإِذَا رَفَعَ فَارْفَعُوا وَإِذَا قَالَ: سَمِعَ اللهُ لِمَنْ حَمِدَهُ، فَقُولُوا: رَبَّنَا وَلَكَ الْحَمْدُ، وَإِذَا صَلَّى جَالِسًا، فَصَلُّوا جُلُوسًا أَجْمَعُونَ[٤].**

واتە: لە ئەنەسی کوڕی مالیکەوە ﷺ گێڕدراوەتەوە (گوتوویەتی): پێغەمبەری خوا ﷺ سواری ئەسپێك بوو و بەربۆوە (کەوت) و لای ڕاستەی جەستەی ڕوشا، جا نوێژێك لە نوێژەکانی بەدانیشتنەوە ئەنجام دا، ئێمەش لەدوای ئەو بەپێوە نوێژمان کرد، جا کاتێ تەواو بوو فەرمووی: ئیمام تەنها بۆ ئەوە دانراوە کە چاوی لێ بکرێ

---

(١) ـ مقطوع صحيح. أخرجه أبو مصعب الزهري: ٣٣٨، عن مالك به.

(٢) ـ تێبینی: هەندێکیش دەڵێن بۆیە لادراوە چونکە نەزان بووە، فیقهی شەریعەتی نەزانیوە. والله أعلم.

(٣) ـ صَلاَةُ الإِمَامِ وَهُوَ جَالِسٌ.

(٤) ـ صحيح. أخرجه أبو مصعب الزهري: ٣٣٩؛ والحدثاني: ١٠٨؛ والشيباني: ١٥٧؛ والشافعي: ٢٤٦؛ والبخاري: ٦٨٩؛ ومسلم: ٨٠؛ والنسائي: ٨٣٢؛ وأبو داود: ٦٠١؛ وابن حبان: ٢١٠٣، وفي: ٢١٠٧؛ والدارمي: ١٢٥٦، وفي: ١٣١٠؛ والقابسي: ١، كلهم عن مالك به.




و شوێنکەوتەی بن، جا کاتێ بەپێوە نوێژی کرد، ئێوەش بەپێوە نوێژ بکەن، وە کاتێ ڕکوعی برد ئێوەش ڕکوع ببەن، وە کاتی هەڵسایەوە ئێوەش هەڵسنەوە، وە کاتێ گوتی: «سَمِعَ اللهُ لِمَنْ حَمِدَهُ» ئێوەش بڵێن: «رَبَّنَا وَلَكَ الْحَمْدُ» وە کاتێ بەدانیشتنەوە نوێژی کرد، ئێوەش هەمووتان بەدانیشتنەوە نوێژ بکەن[١].

**٣٥٩-** عَنْ عَائِشَةَ ﵂، زَوْجِ النَّبِيِّ ﷺ، أَنَّهَا قَالَتْ: صَلَّى رَسُولُ اللهِ ﷺ وَهُوَ شَاكٍ فَصَلَّى جَالِسًا، وَصَلَّى وَرَاءَهُ قَوْمٌ قِيَامًا، فَأَشَارَ إِلَيْهِمْ أَنِ اجْلِسُوا، فَلَمَّا انْصَرَفَ قَالَ: إِنَّمَا جُعِلَ الإِمَامُ لِيُؤْتَمَّ بِهِ، فَإِذَا رَكَعَ فَارْكَعُوا، وَإِذَا رَفَعَ فَارْفَعُوا، وَإِذَا صَلَّى جَالِسًا، فَصَلُّوا جُلُوسًا[٢].

واتە: لە عائیشەی ﵂ خێزانی پێغەمبەری خواوە ﷺ گێڕدراوەتەوە بەوەی گوتوویەتی: پێغەمبەری خوا ﷺ نەساغ بوو بە دانیشتنەوە نوێژی کرد (لەسەر وڵاغ کەوتبووە خوارەوە و تەنیشتی جەستەی ڕوشا بوو)، خەڵکانێکیش لەدوایەوە بەپێوە نوێژیان لەگەڵی کرد، بۆیە ئاماژەی بۆ کردن بەوەی دابنیشن، جا کاتێ لە نوێژەکە تەواو بوو فەرمووی: ئیمام تەنها بۆ ئەوە دانراوە چاوی لێ بکرێ و شوێنکەوتەی بن، جا کاتێ ڕکوعی برد ئێوەش ڕکوع بەرن، وە کاتێ هەڵسایەوە ئێوەش هەڵسنەوە، وە کاتێ بەدانیشتنەوە نوێژی کرد ئێوەش بەدانیشتنەوە نوێژ بکەن.

**٣٦٠-** عَنْ هِشَامِ بْنِ عُرْوَةَ ﵀، عَنْ أَبِيهِ ﵀، أَنَّ رَسُولَ اللهِ ﷺ خَرَجَ فِي مَرَضِهِ، فَأَتَى فَوَجَدَ أَبَا بَكْرٍ ﵁ وَهُوَ قَائِمٌ يُصَلِّي بِالنَّاسِ، فَاسْتَأْخَرَ أَبُو بَكْرٍ ﵁، فَأَشَارَ إِلَيْهِ رَسُولُ اللهِ ﷺ، أَنْ كَمَا أَنْتَ، فَجَلَسَ رَسُولُ اللهِ ﷺ إِلَى جَنْبِ أَبِي بَكْرٍ ﵁، فَكَانَ أَبُو بَكْرٍ ﵁ يُصَلِّي بِصَلَاةِ رَسُولِ اللهِ ﷺ، وَكَانَ النَّاسُ يُصَلُّونَ بِصَلَاةِ أَبِي بَكْرٍ[٣].

واتە: لە هیشامی کوڕی عورووەوە ﵀ گێڕدراوەتەوە، ئەویش لە باوکیەوە ﵀ گێڕاویەتەوە (گوتوویەتی): پێغەمبەری خوا ﷺ لە نەخۆشییەکەیدا (نەخۆشی

---

(١) ـ تێبینی: لەلای ئیمامی شافیعی ئەو فەرموودەیە مەنسوخە، بۆیە پێی وایە ئەگەر مەئموم توانای ڕاوەستانی هەبێت نابێ لەدوای ئیمامی دانیشتوو بەدانیشتنەوە نوێژ بکات.

(٢) ـ صحيح. أخرجه أبو مصعب الزهري: ٣٤٠؛ والحدثاني: ١٠٨، والشافعي: ١٠٢٣؛ وابن حنبل: ٢٥١٩٢؛ والبخاري: ٦٨٨، وفي: ١١١٣، وفي: ١٢٣٦؛ وأبو داود: ٦٠٥؛ وابن حبان: ٢١٠٤؛ والقابسي: ٤٥٤، كلهم عن مالك به.

(٣) ـ صحيح. أخرجه أبو مصعب الزهري: ٣٤١؛ والشافعي: ١٠٢٤، كلهم عن مالك به.

وەفاتیدا) لەماڵەوە دەرچوو و هات بۆ مزگەوت و ئەبو بەکری بینی لە کاتێکدا وەستاوە و نوێژ بۆ خەڵکی دەکات، (جا کە ئەبو بەکر ـ ﷺ ـ پێغەمبەری خوای ﷺ بینی) ویستی بێتە دواوە، پێغەمبەری خواش ﷺ ئاماژەی بۆ کرد بەوەی لەسەر شێوەی خۆی بمێنێتەوە، جا پێغەمبەری خوا ﷺ لە تەنیشت ئەبو بەکر ﷺ دانیشت، جا ئیمامی ئەبو بەکر ﷺ بە نوێژی پێغەمبەری خواوە ﷺ نوێژی دەکرد، خەڵکیش بە نوێژی ئەبو بەکرەوە ﷺ نوێژیان دەکرد.

## ٦- گەورەیی نوێژی ئەو کەسەی نوێژ بەپێوە دەکات بەسەر نوێژی ئەو کەسەی بەدانیشتنەوە ئەنجامی دەدات[1]

**٣٦١-** عَنْ عَبْدِ اللهِ بْنِ عَمْرِو بْنِ الْعَاصِ ﷺ، أَنَّ رَسُولَ اللهِ ﷺ قَالَ: صَلَاةُ أَحَدِكُمْ وَهُوَ قَاعِدٌ مِثْلُ نِصْفِ صَلَاتِهِ وَهُوَ قَائِمٌ[2].

واتە: لە عەبدوڵڵای کوڕی عەمری کوڕی عاصەوە ﷺ گێڕدراوەتەوە (گوتوویەتی): پێغەمبەری خوا ﷺ فەرموویەتی: نوێژی هەر یەکێك لە ئێوە بەدانیشتنەوە نیوەی پاداشتی نوێژەکەیەتی بەپێوە.

**٣٦٢-** عَنْ عَبْدِ اللهِ بْنِ عَمْرِو بْنِ الْعَاصِ ﷺ أَنَّهُ قَالَ: لَمَّا قَدِمْنَا الْمَدِينَةَ، نَالَنَا وَبَاءٌ مِنْ وَعْكِهَا شَدِيدٌ، فَخَرَجَ رَسُولُ اللهِ ﷺ عَلَى النَّاسِ، وَهُمْ يُصَلُّونَ فِي سُبْحَتِهِمْ قُعُودًا، فَقَالَ رَسُولُ اللهِ ﷺ: صَلَاةُ الْقَاعِدِ مِثْلُ نِصْفِ صَلَاةِ الْقَائِمِ[3].

واتە: لە عەبدوڵڵای کوڕی عەمری کوڕی عاصەوە ﷺ گێڕدراوەتەوە بەوەی گوتوویەتی: کاتێ چووین بۆ مەدینە نەخۆشییەکی توند لە نەخۆشییەکانی مەدینەمان تووش بوو، جا پێغەمبەری خوا ﷺ هاتە دەرەوە بۆ ناو خەڵکی، لە کاتێکدا ئەوان لە نوێژی سوننەتدا بوون، بەدانیشتنەوە نوێژەکەیان دەکرد، پێغەمبەری خوا ﷺ

---

(١) ـ فَضْلُ صَلَاةِ الْقَائِمِ عَلَىَ صَلَاةِ الْقَاعِدِ.

(٢) ـ صحيح. أخرجه أبو مصعب الزهري: ٣٤٦؛ والحدثاني: ١١٢؛ والشيباني: ١٥٥؛ والقابسي: ١١٢، كلهم عن مالك به.

(٣) ـ ضعيف بهذا السياق. أخرجه أبو مصعب الزهري: ٣٤٧؛ والحدثاني: ١١٢؛ والشيباني: ١٥٦، كلهم عن مالك به.

فەرمووی: نوێژی كەسی دانیشتوو نیوەی پاداشتی نوێژی ئەو كەسەیە كە بە پێوە نوێژ دەكات.

### ٧- ئەوەی هاتووە دەربارەی نوێژی سوننەتی ئەو كەسەی بەدانیشتنەوە ئەنجامی دەدات[١]

**٣٦٣-** عَنْ حَفْصَةَ ﵂، زَوْجِ النَّبِيِّ ﷺ أَنَّهَا قَالَتْ: مَا رَأَيْتُ رَسُولَ اللهِ ﷺ صَلَّى فِي سُبْحَتِهِ قَاعِدًا قَطُّ، حَتَّى كَانَ قَبْلَ وَفَاتِهِ بِعَامٍ، فَكَانَ يُصَلِّي فِي سُبْحَتِهِ قَاعِدًا، وَيَقْرَأُ بِالسُّورَةِ فَيُرَتِّلُهَا، حَتَّى تَكُونَ أَطْوَلَ مِنْ أَطْوَلَ مِنْهَا[٢].

واتە: لە حەفصەی ﵂ خێزانی پێغەمبەری خواوە ﷺ گێڕدراوەتەوە گوتوویەتی: هەرگیز پێغەمبەری خوام ﷺ نەبینیبوو نوێژە سوننەتەكان بەدانیشتوویی نوێژ بكات، تا ساڵێك بەر لە وەفاتكردنی، ئەو كات نوێژە سوننەتەكانی بەدانیشتنەوە دەكرد و سوڕەتەكەی دەخوێند و درێژی دەكردەوە و زۆر بەهێواشی (و تەرتیل) دەیخوێند تا سوڕەتەكە زۆر درێژتر دەبوویەوە لە درێژی ئاسایی خۆی (واتە لەجیاتی دانیشتنەكە زیاتر درێژی دەكردەوە).

**٣٦٤-** عَنْ عَائِشَةَ ﵂، زَوْجِ النَّبِيِّ ﷺ، أَنَّهَا أَخْبَرَتْهُ، أَنَّهَا لَمْ ديكة رَسُولَ اللهِ ﷺ يُصَلِّي صَلَاةَ اللَّيْلِ قَاعِدًا قَطُّ، حَتَّى أَسَنَّ، فَكَانَ يَقْرَأُ قَاعِدًا، حَتَّى إِذَا أَرَادَ أَنْ يَرْكَعَ، قَامَ فَقَرَأَ نَحْوًا مِنْ ثَلَاثِينَ أَوْ أَرْبَعِينَ آيَةً، ثُمَّ رَكَعَ[٣].

واتە: لە عائیشەی ﵂ خێزانی پێغەمبەری خواوە ﷺ گێڕدراوەتەوە بەوەی هەواڵیداوە (گوتوویەتی): هەرگیز پێغەمبەری خوای ﷺ نەبینیبوو بەدانیشتنەوە

---

(١) ـ مَا جَاءَ فِي صَلَاةِ الْقَاعِدِ فِي النَّافِلَةِ.

(٢) ـ صحيح. أخرجه أبو مصعب الزهري: ٣٤٢؛ والحدثاني: ١١٠؛ والشيباني: ١٥٤؛ وابن حنبل: ٢٦٤٨٥؛ ومسلم: ١١٨؛ والنسائي: ١٦٥٨؛ والترمذي: ٣٧٣؛ وابن حبان: ٢٥٠٨، وفي: ٢٥٨٠؛ وأبي يعلى الموصلي: ٧٠٥٥؛ والقابسي: ٧، كلهم عن مالك به.

(٣) ـ صحيح. أخرجه أبو مصعب الزهري: ٣٤٣؛ وابن حنبل: ٢٥٤٨٧؛ والبخاري: ١١١٨؛ والقابسي: ٤٥٥، كلهم عن مالك به.

شەونوێژ بكات، تا بەساڵا چوو و تەمەنی گەورە بوو، جا ئەو كات لە كاتی قورئانخوێندنی ناو شەونوێژ دادەنیشت، تا ئەو كاتەی دەیویست ڕكوع ببات (واتە تا ئەو كاتەی ڕكوعبردنی نزیك دەبوو)، هەڵدەستایەوە بەڕاوەستان نزیكەی سی، یان چل ئایەتی دیكەی دەخوێند، دواتر ڕكوعی دەبرد.

**٣٦٥- عَنْ عَائِشَةَ ﵂، زَوْجِ النَّبِيِّ ﷺ، أَنَّ رَسُولَ اللهِ ﷺ كَانَ يُصَلِّي جَالِسًا، فَيَقْرَأُ وَهُوَ جَالِسٌ، فَإِذَا بَقِيَ مِنْ قِرَاءَتِهِ قَدْرُ مَا يَكُونُ ثَلَاثِينَ أَوْ أَرْبَعِينَ آيَةً، قَامَ فَقَرَأَ وَهُوَ قَائِمٌ، ثُمَّ رَكَعَ وَسَجَدَ، ثُمَّ صَنَعَ فِي الرَّكْعَةِ الثَّانِيَةِ مِثْلَ ذَلِكَ[1].**

واتە: لە عائیشەی ﵂ خێزانی پێغەمبەرەوە ﷺ گێڕدراوەتەوە (گوتوویەتی): پێغەمبەری خوا ﷺ (كاتێ تەمەنی گەورە بوو) نوێژە سوننەتەكانی بەدانیشتنەوە دەكرد، جا قورئانی ناو نوێژی دەخوێند لە كاتێكدا دانیشتوو بوو، جا كاتێ بە ئەندازەی سی، یان چل ئایەت دەما، هەڵدەستایەوە و بەپێوە تەواوی دەكرد، دواتر ڕكوع و سوژدەی دەبرد، دواتر لە ڕكاتی دووەمیش هەمان شتی دەكرد.

**٣٦٦- أَنَّ عُرْوَةَ بْنَ الزُّبَيْرِ، وَسَعِيدَ بْنَ الْمُسَيَّبِ ﵄ كَانَا يُصَلِّيَانِ النَّافِلَةَ وَهُمَا مُحْتَبِيَانِ[2].**

واتە: عوڕوەی كوڕی زوبەیر و سەعیدی كوڕی موسەیەب ﵄ نوێژی سوننەتیان بە ئیحتیبا دەكرد (واتە بەو جۆرە دانیشتنەی كە سمت و نێركەكان لە زەوی دادەنرێن و ڕان و قاچەكانیش بەرز دەكرێنەوە و بۆ لای سینگ دەهێنرێن و بە باسكەكان دەورە دەدرێن و دەستەكان لە پێشەوە دەگیرێن، واتە ئەو كاتەی بێتاقەت دەبوون لە جۆرەكانی دیكەی دانیشتن بەم جۆرە دادەنیشتن و نوێژە سوننەتەكانیان ئەنجام دەدا).

---

(١) ـ صحيح. أخرجه أبو مصعب الزهري: ٣٤٤؛ والحدثاني: ١١١؛ وابن حنبل: ٢٥٤٨٨؛ والبخاري: ١١١٩؛ ومسلم: ١١٢؛ والنسائي: ١٦٤٨؛ وأبو داود: ٩٥٤؛ والترمذي: ٣٧٤؛ والقابسي: ٣٧٨، كلهم عن مالك به.

(٢) ـ مقطوع صحيح. أخرجه أبو مصعب الزهري: ٣٤٥؛ والحدثاني: ١١١، كلهم عن مالك به.




## ٨- نوێژی «الوسطی»[١]

٣٦٧- عَنْ أَبِي يُونُسَ، مَوْلَى عَائِشَةَ أُمِّ الْمُؤْمِنِينَ أَنَّهُ قَالَ: أَمَرَتْنِي عَائِشَةُ ﷺ أَنْ أَكْتُبَ لَهَا مُصْحَفًا، ثُمَّ قَالَتْ: إِذَا بَلَغْتَ هَذِهِ الآيَةَ فَآذِنِّي: ﴿ حَٰفِظُواْ عَلَى ٱلصَّلَوَٰتِ وَٱلصَّلَوٰةِ ٱلْوُسْطَىٰ وَقُومُواْ لِلَّهِ قَٰنِتِينَ ﴿٢٣٨﴾ ﴾ البقرة، فَلَمَّا بَلَغْتُهَا آذَنْتُهَا، فَأَمْلَتْ عَلَيَّ حَافِظُوا عَلَى الصَّلَوَاتِ، وَالصَّلَاةِ الْوُسْطَى، وَصَلَاةِ الْعَصْرِ، وَقُومُوا لِلَّهِ قَانِتِينَ، ثُمَّ قَالَتْ: سَمِعْتُهَا مِنْ رَسُولِ اللهِ ﷺ[٢].

واتە: لە ئەبو یونسی خزمەتکاری ئازادکراوی عائیشەی دایکی بڕوادارانەوە ﷺ گێردراوەتەوە گوتوویەتی: عائیشە ﷺ فەرمانی پێکردم بەوەی موصحەفێکی بۆ بنووسمەوە، دواتر گوتی: بانگم بکە کاتێ گەیشتی بەم ئایەتە: ﴿ حَٰفِظُواْ عَلَى ٱلصَّلَوَٰتِ وَٱلصَّلَوٰةِ ٱلْوُسْطَىٰ وَقُومُواْ لِلَّهِ قَٰنِتِينَ ﴿٢٣٨﴾ ﴾ البقرة، جا کاتێ گەیشتم بە ئایەتەکە بانگم کرد، ئەویش ئاوا بەسەریدا خوێندمەوە: «حَافِظُوا عَلَى الصَّلَوَاتِ، وَالصَّلَاةِ الْوُسْطَى، وَصَلَاةِ الْعَصْرِ، وَقُومُوا لِلَّهِ قَانِتِينَ» واتە: ((پارێزگاری و بەردەوامی بدەن بە نوێژەکان، بەتایبەتی نوێژی وەستا، وە نوێژی عەسر، وە بەردەوامیش هەڵسن بە ئەنجامدانی فەرمانەکانی خوا بەگەردنکەچییەوە)) دواتر گوتی: ئەم ئایەتەم ئاوا لە پێغەمبەری خواوە ﷺ گوێ لێ بووە[٣].

٣٦٨- عَنْ عَمْرِو بْنِ رَافِعٍ ﷺ أَنَّهُ قَالَ: كُنْتُ أَكْتُبُ مُصْحَفًا لِحَفْصَةَ أُمِّ الْمُؤْمِنِينَ ﷺ، فَقَالَتْ: إِذَا بَلَغْتَ هَذِهِ الآيَةَ فَآذِنِّي: ﴿ حَٰفِظُواْ عَلَى ٱلصَّلَوَٰتِ وَٱلصَّلَوٰةِ ٱلْوُسْطَىٰ وَقُومُواْ لِلَّهِ قَٰنِتِينَ ﴿٢٣٨﴾ ﴾ البقرة، فَلَمَّا بَلَغْتُهَا آذَنْتُهَا، فَأَمْلَتْ عَلَيَّ: حَافِظُوا عَلَى الصَّلَوَاتِ، وَالصَّلَاةِ الْوُسْطَى، وَصَلَاةِ الْعَصْرِ، وَقُومُوا لِلَّهِ قَانِتِينَ[٤].

---

(١) ـ الصَّلَاةُ الْوُسْطَى.

(٢) ـ صحيح. أخرجه أبو مصعب الزهري: ٣٤٨؛ وأبو مصعب الزهري: ٣٤٩؛ والحدثاني: ١١٣؛ والشيباني: ٩٩٩؛ والشيباني: ١٠٠٠؛ وابن حنبل: ٢٤٤٩٢، وفي: ٢٥٤٨٩؛ ومسلم: ٢٠٧؛ والنسائي: ٤٧٢؛ وأبو داود: ٤١٠؛ والترمذي: ٢٩٨٢؛ والقابسي: ١٧٧، كلهم عن مالك به.

(٣) ـ تێبینی: ئەم فەرموودەیە و فەرموودەکەی دواتریش ئەوە دەگەیەنێ کە نوێژی (الوسطی) نوێژی عەسر نییە، چونکە نوێژی عەسریش لە ئایەتەکەدا بەجیا باس کراوە، بەڵام دواتر نەسخ بۆتەوە.

(٤) ـ موقوف حسن. أخرجه أبو مصعب الزهري: ٣٤٩؛ والشيباني: ٩٩٩، كلهم عن مالك به.




واتە: لە عەمری کوڕی ڕافیعەوە ﷺ گێڕدراوەتەوە بەوەی گوتوویەتی: من موصحەفێکم بۆ حەفصەی دایکی بڕواداران ﷺ دەنووسیەوە، جا گوتی: بانگم بکە ئەگەر گەیشتی بەو ئایەتە: ﴿ حَٰفِظُواْ عَلَى ٱلصَّلَوَٰتِ وَٱلصَّلَوٰةِ ٱلْوُسْطَىٰ وَقُومُواْ لِلَّهِ قَٰنِتِينَ ﴿٢٣٨﴾ ﴾ البقرة، جا کاتێ گەیشتم بە ئایەتەکە بانگم کرد، ئەویش ئاوا بەسەریدا خوێندمەوە: «حَافِظُوا عَلَى الصَّلَوَاتِ، وَالصَّلَاةِ الْوُسْطَى، وَصَلَاةِ الْعَصْرِ، وَقُومُوا لِلَّهِ قَانِتِينَ» واتە: ((پارێزگاری و بەردەوامی بدەن بە نوێژەکان، بەتایبەتی نوێژی وەستا، وە نوێژی عەسر، وە بەردەوامیش هەڵسن بە ئەنجامدانی فەرمانەکانی خوا بەگەردنکەچییەوە)).

**٣٦٩-** عَنِ ابْنِ يَرْبُوعٍ الْمَخْزُومِيِّ ﷺ أَنَّهُ قَالَ: سَمِعْتُ زَيْدَ بْنَ ثَابِتٍ يَقُولُ: الصَّلَاةُ الْوُسْطَى صَلَاةُ الظُّهْرِ[١].

واتە: لە ئیبنو یەربوعی مەخزومییەوە ﷺ گێڕدراوەتەوە گوتوویەتی: گوێم لە زەیدی کوڕی سابیت ﷺ بوو دەیگوت: «الصَّلَاةُ الْوُسْطَى»(کە لە قورئاندا هاتووە، مەبەست پێی) نوێژی نیوەڕۆیە.

**٣٧٠-** أَنَّ عَلِيَّ بْنَ أَبِي طَالِبٍ، وَعَبْدَ اللهِ بْنَ عَبَّاسٍ ﷺ كَانَا يَقُولَانِ: الصَّلَاةُ الْوُسْطَى صَلَاةُ الصُّبْحِ[٢].

قَالَ مَالِكٌ ﷺ: وَقَوْلُ عَلِيٍّ، وَابْنِ عَبَّاسٍ، أَحَبُّ مَا سَمِعْتُ إِلَيَّ فِي ذَلِكَ.

واتە: عەلی کوڕی ئەبو تالیب و عەبدوڵلای کوڕی عەبباس ﷺ دەیانگوت: «الصَّلَاةُ الْوُسْطَى»(کە لە قورئاندا هاتووە، مەبەست پێی) نوێژی بەیانییە.

ئیمامی مالیك ﷺ گوتوویەتی: قسە و بۆچوونی عەلی و ئیبنو عەبباس ﷺ لەلام خۆشەویستترینی ئەوەیە کە گوێبیستی بووم لەو بارەیەوە[٣].

---

(١) ـ صحيح. أخرجه أبو مصعب الزهري: ٣٥١؛ والحدثاني: ١١٣؛ والشيباني: ٩٩٨، كلهم عن مالك به.

(٢) ـ ضعيف. أخرجه أبو مصعب الزهري: ٣٥٠؛ والحدثاني: ١١٣، كلهم عن مالك به.

(٣) ـ تێبینی: ئیمامی شافیعیش هەمان بۆچونی هەیە.

## ٩- ڕوخسەتتدان لە نوێژکردن بە یەك پۆشاکەوە[١]

**٣٧١-** عَنْ عُمَرَ بْنِ أَبِي سَلَمَةَ ﷺ، أَنَّهُ رَأَى رَسُولَ اللهِ ﷺ يُصَلِّي فِي ثَوْبٍ وَاحِدٍ، مُشْتَمِلاً بِهِ فِي بَيْتِ أُمِّ سَلَمَةَ ﷺ، وَاضِعًا طَرَفَيْهِ عَلَى عَاتِقَيْهِ[٢].

واتە: لە عومەری کوڕی ئەبو سەلەمەوە ﷺ گێڕدراوەتەوە بەوەی پێغەمبەری خوای ﷺ بینیوە نوێژی کردووە بە تاقە (تاکە) پۆشاکێکەوە، بە درێژی باڵای لە خۆی پێچابوو لە ماڵی ئوممو سەلەمەی خێزانی ﷺ، بە شێوەیەك هەردوو لاکانی خستبۆیەوە سەر شانی (واتە لایێکی لەبن باڵی ڕاستەیەوە هێنابووە دەرەوە و دابووی بەسەر شانی چەپی، لایەکەی دیکەشی لەبن باڵی چەپیەوە هێنابۆیە دەرەوە و دابووی بەسەر شانی ڕاستی).

**٣٧٢-** عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ ﷺ، أَنَّ سَائِلاً سَأَلَ رَسُولَ اللهِ ﷺ عَنِ الصَّلاَةِ فِي ثَوْبٍ وَاحِدٍ؟ فَقَالَ رَسُولُ اللهِ ﷺ: أَوَلِكُلِّكُمْ ثَوْبَانِ؟[٣].

واتە: لە ئەبو هوڕەیرەوە ﷺ گێڕدراوەتەوە (گوتوویەتی): کەسێك پرسیاری لە پێغەمبەری خوا ﷺ کرد دەربارەی نوێژکردن بە یەك پۆشاکەوە؟ ئەویش ﷺ فەرمووی: مەگەر گشتتان دوو پۆشاکتان هەیە؟ (واتە بەڵێ دروستە، خۆ هەموو خەڵکی دوو پۆشاکیان نییە، هەیانە تەنها یەك پۆشاکی هەیە).

**٣٧٣-** عَنْ سَعِيدِ بْنِ الْمُسَيَّبِ ﷺ، أَنَّهُ قَالَ: سُئِلَ أَبُو هُرَيْرَةَ ﷺ: هَلْ يُصَلِّي الرَّجُلُ فِي ثَوْبٍ وَاحِدٍ؟ فَقَالَ: نَعَمْ، فَقِيلَ لَهُ: هَلْ تَفْعَلُ أَنْتَ ذَلِكَ؟ فَقَالَ: نَعَمْ، إِنِّي لأُصَلِّي فِي ثَوْبٍ وَاحِدٍ، وَإِنَّ ثِيَابِي لَعَلَى الْمِشْجَبِ[٤].

---

(١) ـ الرُّخْصَةُ فِي الصَّلَاةِ فِي الثَّوْبِ الْوَاحِدِ.

(٢) ـ صحيح. أخرجه أبو مصعب الزهري: ٣٥٢؛ والحدثاني: ١١٤؛ والنسائي: ٧٦٤؛ والقابسي: ٤٧٥، كلهم عن مالك به.

(٣) ـ صحيح. أخرجه أبو مصعب الزهري: ٣٥٤؛ والحدثاني: ١١٤؛ والشيباني: ١٦٠؛ والبخاري: ٣٥٨؛ ومسلم: ٢٧٥؛ والنسائي: ٧٦٣؛ وأبو داود: ٦٢٥؛ وابن حبان: ٢٢٩٥؛ والقابسي: ١٢، كلهم عن مالك به.

(٤) ـ صحيح. أخرجه أبو مصعب الزهري: ٣٥٥؛ والحدثاني: ١١٤، كلهم عن مالك به.

واتە: لە سەعیدی كوڕی موسەیەبەوە ﷺ گێڕدراوەتەوە گوتوویەتی: ئەبو هوڕەیرە ﷺ پرسیاری لێكرا: ئایا پیاو نوێژ بكا بە یەك پۆشاكەوە؟ ئەویش گوتی: بەڵێ، جا پێی گوترا: ئایا تۆ ئاوا دەكەیت؟ ئەویش گوتی: بەڵێ، من بە یەك پۆشاكەوە نوێژ دەكەم، لە كاتێكدا جلەكانم لەسەر ڕستەكەیە (واتە لەو كاتەی جلی وشكم نەماوە و شۆردوومن).

**٣٧٤- أَنَّ جَابِرَ بْنَ عَبْدِ اللهِ ﷺ كَانَ يُصَلِّي فِي الثَّوْبِ الْوَاحِدِ**[١].

واتە: جابری كوڕی عەبدوڵلا ﷺ بە یەك پۆشاك نوێژی دەكرد.

**٣٧٥- أَنَّ مُحَمَّدَ بْنَ عَمْرِو بْنِ حَزْمٍ ﷺ كَانَ يُصَلِّي فِي الْقَمِيصِ الْوَاحِدِ**[٢].

واتە: موحەممەدی كوڕی عەمری كوڕی حەزم ﷺ بە یەك پۆشاك نوێژی دەكرد.

**٣٧٦- عَنْ جَابِرِ بْنِ عَبْدِ اللهِ ﷺ، أَنَّ رَسُولَ اللهِ ﷺ قَالَ: مَنْ لَمْ يَجِدْ ثَوْبَيْنِ فَلْيُصَلِّ فِي ثَوْبٍ وَاحِدٍ، مُلْتَحِفًا بِهِ، فَإِنْ كَانَ الثَّوْبُ قَصِيرًا، فَلْيَتَّزِرْ بِهِ**[٣].

واتە: لە جابری كوڕی عەبدوڵلاوە ﷺ گێڕدراوەتەوە (گوتوویەتی): پێغەمبەری خوا ﷺ فەرموویەتی: هەر كەسێك دوو پارچە جلی دەست نەكەوت و نەیبوو، ئەوە با بە یەك پۆشاك نوێژ بكات، لە خۆی بپێچێ، جا ئەگەر جلەكە كورت بوو (بەشی هەموو جەستەی نەدەكرد)، با خوارەوەی جەستەی پێ داپۆشێت (ئینجا نوێژ بكات).

**٣٧٧- قَالَ مَالِكٌ ﷺ: أَحَبُّ إِلَيَّ أَنْ يَجْعَلَ الَّذِي يُصَلِّي فِي الْقَمِيصِ الْوَاحِدِ عَلَى عَاتِقَيْهِ ثَوْبًا أَوْ عِمَامَةً**[٤].

واتە: ئیمامی مالیك ﷺ گوتوویەتی: لام چاك و باشە ئەو كەسەی بە یەك پۆشاكەوە نوێژ دەكات پارچە جلیك یان عەمامە بخاتە سەر شانەكانی.

---

(١) ـ صحيح. أخرجه أبو مصعب الزهري: ٣٥٦، عن مالك به.

(٢) ـ مقطوع صحيح. أخرجه أبو مصعب الزهري: ٣٥٧، عن مالك به.

(٣) ـ صحيح لغيره. أخرجه أبو مصعب الزهري: ٣٥٣، عن مالك به.

(٤) ـ أخرجه أبو مصعب الزهري: ٣٥٨، عن مالك به.

## ١٠- مۆڵەتتدان بە ئافرەتان بە نوێژکردن تەنها بە مەکسی و لەچك[١]

**٣٧٨-** أَنَّ عَائِشَةَ ﵂، زَوْجَ النَّبِيِّ ﷺ كَانَتْ تُصَلِّي فِي الدِّرْعِ وَالْخِمَارِ[٢].

واتە: عائیشەی ﵂ خێزانی پێغەمبەر ﷺ هەموو جار بە مەکسییەك و لەچکێکەوە نوێژی دەکرد.

**٣٧٩-** عَنْ مُحَمَّدِ بْنِ زَيْدِ بْنِ قُنْفُذٍ ﵀، عَنْ أُمِّهِ ﵂، أَنَّهَا سَأَلَتْ أُمَّ سَلَمَةَ ﵂، زَوْجَ النَّبِيِّ ﷺ، مَاذَا تُصَلِّي فِيهِ الْمَرْأَةُ مِنَ الثِّيَابِ؟ فَقَالَتْ: تُصَلِّي فِي الْخِمَارِ وَالدِّرْعِ السَّابِغِ إِذَا غَيَّبَ ظُهُورَ قَدَمَيْهَا[٣].

واتە: لە موحەممەدی کوڕی زەیدی کوڕی قونفوز ﵀ گێردراوەتەوە، ئەویش لە دایکیەوە ﵂ گێڕاویەتەوە، بەوەی پرسیاری لە ئوممو سەلەمەی ﵂ خێزانی پێغەمبەری خوا ﷺ کردووە (گوتوویەتی): ئافرەت نوێژ بە چ جلوبەرگێکەوە دەکات؟ ئەویش گوتی: نوێژ بە لەچك و مەکسیێکی درێژی داپۆشەر دەکات ئەگەر پشتە پێیەکانی داپۆشێ.

**٣٨٠-** عَنْ عُبَيْدِ اللهِ بْنِ الأَسْوَدِ الْخَوْلاَنِيِّ ﵀، وَكَانَ فِي حَجْرِ مَيْمُونَةَ ﵂، زَوْجِ النَّبِيِّ ﷺ، أَنَّ مَيْمُونَةَ كَانَتْ تُصَلِّي فِي الدِّرْعِ وَالْخِمَارِ، لَيْسَ عَلَيْهَا إِزَارٌ[٤].

واتە: لە عوبەیدوڵڵای کوڕی ئەسوەدی خەولانییەوە ﵀ گێردراوەتەوە کە لە ژێر سەرپەرشتیاری مەیمونەی ﵂ خێزانی پێغەمبەری خوادا ﷺ بوو (گوتوویەتی): مەیمونە بە مەکسی و لەچکەوە نوێژی دەکرد، بێجامەی لەبەردا نەبوو (دیارە بۆ خاوێنی و دڵنیایی لەبەری کردۆتەوە).

---

(١) ـ الرُّخْصَةُ فِي صَلَاةِ الْمَرْأَةِ فِي الدِّرْعِ وَالْخِمَارِ.

(٢) ـ صحيح. أخرجه أبو مصعب الزهري: ٣٦٠؛ والحدثاني: ١١٥، كلهم عن مالك به.

(٣) ـ ضعيف. أخرجه أبو مصعب الزهري: ٣٦١؛ والحدثاني: ١١٥؛ والشيباني: ١٦٣؛ وأبو داود: ٦٣٩، كلهم عن مالك به.

(٤) ـ صحيح. أخرجه أبو مصعب الزهري: ٣٦٢؛ والشيباني: ١٥٩، كلهم عن مالك به.

٣٨١- عَنْ هِشَامِ بْنِ عُرْوَةَ ﷺ، عَنْ أَبِيهِ، أَنَّ امْرَأَةً اسْتَفْتَتْهُ فَقَالَتْ: إِنَّ الْمِنْطَقَ يَشُقُّ عَلَيَّ، أَفَأُصَلِّي فِي دِرْعٍ وَخِمَارٍ؟ فَقَالَ: نَعَمْ، إِذَا كَانَ الدِّرْعُ سَابِغًا[1].

واتە: لە هیشامی کوڕی عوڕوەوە ﷺ گێڕدراوەتەوە، ئەویش لە باوکیەوە گێڕاویەتەوە بەوەی ئافرەتێك پرسیاری لێکردوە و گوتوویەتی: پۆشاکی کەمەربەند (ئەو پۆشاکەی کەمەری هەیە وەك بێجامە) لەسەرم قورس و سەختە، جا ئایا تەنها بە مەکسی و چەفیە (لەچك) نوێژ بکەم؟ ئەویش گوتی: بەڵێ، ئەگەر مەکسییەکە سەرتاپا داپۆشەر بوو.

---

(١) ـ مقطوع صحيح. أخرجه أبو مصعب الزهري: ٣٦٣؛ والحدثاني: ١١٥، كلهم عن مالك به.



# پەرتووكی

## كورتكردنەوە (و كۆكردنەوە)ی نوێژ لە سەفەردا[1]



---

(١) ـ كتابُ قَصرِ الصَّلاةِ في السَّفَر.

## ١- کۆکردنەوەی دوو نوێژ لە شوێنی نیشتەجێ و سەفەردا[١]

**٣٨٢-** عَنِ الأَعْرَجِ ﷺ، أَنَّ رَسُولَ اللهِ ﷺ كَانَ يَجْمَعُ بَيْنَ الظُّهْرِ وَالْعَصْرِ فِي سَفَرِهِ إِلَى تَبُوكَ[٢].

واتە: لە ئەعرەجەوە ﷺ گێردراوەتەوە (گوتوویەتی): پێغەمبەری خوا ﷺ نوێژی نیوەڕۆ و عەسری کۆکردەوە لە سەفەرەکەی بۆ تەبوك.

**٣٨٣-** عَنْ أَبِي الطُّفَيْلِ عَامِرِ بْنِ وَاثِلَةَ ﷺ، أَنَّ مُعَاذَ بْنَ جَبَلٍ ﷺ أَخْبَرَهُ، أَنَّهُمْ خَرَجُوا مَعَ رَسُولِ اللهِ ﷺ عَامَ تَبُوكَ، فَكَانَ رَسُولُ اللهِ ﷺ يَجْمَعُ بَيْنَ الظُّهْرِ وَالْعَصْرِ، وَالْمَغْرِبِ وَالْعِشَاءِ، قَالَ: فَأَخَّرَ الصَّلاَةَ يَوْمًا، ثُمَّ خَرَجَ فَصَلَّى الظُّهْرَ وَالْعَصْرَ جَمِيعًا، ثُمَّ دَخَلَ، ثُمَّ خَرَجَ فَصَلَّى الْمَغْرِبَ وَالْعِشَاءَ جَمِيعًا، ثُمَّ قَالَ: إِنَّكُمْ سَتَأْتُونَ غَدًا إِنْ شَاءَ اللهُ عَيْنَ تَبُوكَ، وَإِنَّكُمْ لَنْ تَأْتُوهَا حَتَّى يَضْحَى النَّهَارُ، فَمَنْ جَاءَهَا فَلاَ يَمَسَّ مِنْ مَائِهَا شَيْئًا، حَتَّى آتِيَ، فَجِئْنَاهَا، وَقَدْ سَبَقَنَا إِلَيْهَا رَجُلاَنِ، وَالْعَيْنُ تَبِضُّ بِشَيْءٍ مِنْ مَاءٍ، فَسَأَلَهُمَا رَسُولُ اللهِ ﷺ: هَلْ مَسِسْتُمَا مِنْ مَائِهَا شَيْئًا؟ فَقَالاَ: نَعَمْ، فَسَبَّهُمَا رَسُولُ اللهِ ﷺ، وَقَالَ لَهُمَا مَا شَاءَ اللهُ أَنْ يَقُولَ، ثُمَّ غَرَفُوا بِأَيْدِيهِمْ مِنَ الْعَيْنِ، قَلِيلاً قَلِيلاً، حَتَّى اجْتَمَعَ فِي شَيْءٍ، ثُمَّ غَسَلَ رَسُولُ اللهِ ﷺ فِيهِ وَجْهَهُ وَيَدَيْهِ، ثُمَّ أَعَادَهُ فِيهَا، فَجَرَتِ الْعَيْنُ بِمَاءٍ كَثِيرٍ، فَاسْتَقَى النَّاسُ، ثُمَّ قَالَ رَسُولُ اللهِ ﷺ: يُوشِكُ يَا مُعَاذُ إِنْ طَالَتْ بِكَ حَيَاةٌ، أَنْ تَرَى مَا هَاهُنَا قَدْ مُلِئَ جِنَانًا[٣].

واتە: لە ئەبو توفەیلەوە ـ عامری کوڕی واثیلەوە ـ ﷺ گێردراوەتەوە، بەوەی موعازی کوڕی جەبەل ﷺ پێی ڕاگەیاندووە، بەوەی ئەوان ـ واتە خۆی و هاوەڵان ـ دەرچوون لەگەڵ پێغەمبەری خوا ﷺ لە ساڵی تەبوکدا، جا پێغەمبەری خوا ﷺ نوێژی نیوەڕۆ و عەسری بەیەکەوە و مەغریب و عیشای بەیەکەوە کۆکردەوە، دەڵێ: جا ڕۆژێکیان نوێژی (نیوەڕۆی) نەکرد تاخیری کرد تا کۆی بکاتەوە لەگەڵ عەسر، دواتر هاتە دەرەوە و نوێژی نیوەڕۆ و عەسری بەیەکەوە کۆ کردەوە، دواتر

---

(١) ـ الْجَمْعُ بَيْنَ الصَّلاَتَيْنِ فِي الْحَضَرِ وَالسَّفَرِ.

(٢) ـ صحيح. أخرجه أبو مصعب الزهري: ٣٦٤؛ والحدثاني: ١١٦؛ والشيباني: ٢٠٣، كلهم عن مالك به.

(٣) ـ صحيح. أخرجه أبو مصعب الزهري: ٣٦٥؛ والحدثاني: ١١٦؛ والشافعي: ١١٤؛ والشافعي: ١٧٨٣؛ وابن حنبل: ٢٢١٢٣، وفي: ٢٢١٢٤؛ والنسائي: ٥٨٧؛ وأبو داود: ١٢٠٦؛ وابن حبان: ١٥٩٥، وفي: ٦٥٣٧؛ والدارمي: ١٥١٥؛ والقابسي: ١٠٨، كلهم عن مالك به.

چووە ژوورەوە (بۆ ناو خێوەتەکەی)، دواتر دەرچوو و نوێژی مەغریب و عیشای بەیەکەوە ئەنجام دا، دواتر فەرمووی: إن شاء الله بەیانی دەچنە سەر کانییەکەی تەبوك، وە نابێ ئێوە بچنە سەری تا دەبێتە کاتی چێشتەنگاو و خۆر بەهێز دەبێ، جا هەر کەسێك گەیشتە لای کانییەکە (بەر لە من) ئەوە با دەست لە ئاوەکەی نەدات (نەیخواتەوە) تا من دەگەمە سەری، (موعازی کوڕی جەبەل ـ خوا لێی ڕازی بێ ـ) دەڵێ: جا گەیشتینە لای کانییەکە، دوو پیاو پێشمان کەوتبوون و پێشتر گەیشتبوونە سەری، لە کاتێکدا کانییەکە بە تۆزێك ئاو بریسکەی دەدا، جا پێغەمبەری خوا ﷺ پرسیاری لە دوو پیاوەکە کرد و فەرمووی: ئایا هیچ دەستتان لە ئاوەکەی داوە؟ ئەوانیش گوتیان: بەڵێ، جا پێغەمبەری خوا ﷺ قسەی پێ گوتن (سەرزەنشتی کردن) و ئەوەی خوا ئیزنی لەسەر بوو پێی گوتن، دواتر کەم کەمە بە دەستەکانیان گۆنمە ئاویان لە کانییەکە دەرهێنا تا هەندێك ئاو لە شتێکدا کۆ بۆیەوە، دواتر پێغەمبەری خوا ﷺ ڕوخسار و دەستەکانی تێدا شۆرد، دواتر ئاوەکەی گەڕاندەوە و ڕشتیەوە ناو کانییەکە، جا کانییەکە ئاوێکی یەجگار زۆری لەبەر ڕۆیشت و یەجگار زۆر بوو، خەڵکەکەش ئاوەکەیان خواردەوە و دایان بە ئاژەڵەکانیان (لە کاتێکدا سوپایێکی زۆر بوون)، دواتر پێغەمبەری خوا ﷺ فەرمووی: ئەی موعاز ئەگەر تەمەنت درێژ بێت زۆری نەماوە ببینی ئێرە چۆن پڕی باخچە و بێستان دەبێ (بەهۆی زۆری ئاوەوە).

**٣٨٤-** أَنَّ عَبْدَ اللهِ بْنَ عُمَرَ ﵄ قَالَ: كَانَ رَسُولُ اللهِ ﷺ إِذَا عَجِلَ بِهِ السَّيْرُ، يَجْمَعُ بَيْنَ الْمَغْرِبِ وَالْعِشَاءِ[١].

واتە: عەبدوڵڵای کوڕی عومەر ﵄ گوتوویەتی: پێغەمبەری خوا ﷺ کاتێ پەلەی ڕۆیشتنی بووایە (دەڕۆیشت و نوێژی دوادەخست، جەمع و تەئخیری دەکرد)، دواتر نوێژی مەغریب و عیشای بەیەکەوە کۆدەکردەوە.

---

(١) ـ صحيح. أخرجه أبو مصعب الزهري: ٣٦٦؛ والحدثاني: ١١٧؛ والشيباني: ٢٠١؛ والشافعي: ١٧٨٢؛ وابن حنبل: ٥٣٠٥؛ ومسلم: ٤٢؛ والنسائي: ٥٩٨؛ والقابسي: ١٩٩، كلهم عن مالك به.

**٣٨٥- عَنْ عَبْدِ اللهِ بْنِ عَبَّاسٍ ﷺ أَنَّهُ قَالَ: صَلَّى رَسُولُ اللهِ ﷺ الظُّهْرَ وَالْعَصْرَ جَمِيعًا، وَالْمَغْرِبَ وَالْعِشَاءَ جَمِيعًا، فِي غَيْرِ خَوْفٍ وَلاَ سَفَرٍ[1].**

**قَالَ مَالِكٌ ﷺ: أُرَى ذَلِكَ كَانَ فِي مَطَرٍ.**

واتە: لە عەبدوڵڵای کوڕی عەبباسەوە ﷺ گێڕدراوەتەوە گوتوویەتی: پێغەمبەری خوا ﷺ نوێژی نیوەڕۆ و عەسری بەیەکەوە کرد، وە مەغریب و عیشاش بەیەکەوە، بێ ئەوەی ترس یان سەفەر لە ئارادا بێت.

ئیمامی مالیك ﷺ دەڵێ: من پێم وایە بە هۆی باران بووە[2].

**٣٨٦- أَنَّ عَبْدَ اللهِ بْنَ عُمَرَ ﷺ كَانَ إِذَا جَمَعَ الْأُمَرَاءُ بَيْنَ الْمَغْرِبِ وَالْعِشَاءِ فِي الْمَطَرِ، جَمَعَ مَعَهُمْ[3].**

واتە: عەبدوڵڵای کوڕی عومەر ﷺ هەموو جار کاتێ کاربەدەستان نوێژی مەغریب و عیشایان کۆدەکردەوە بەهۆی باران، ئەویش لەگەڵیان ئەنجامی دەدا.

**٣٨٧- عَنِ ابْنِ شِهَابٍ ﷺ، أَنَّهُ سَأَلَ سَالِمَ بْنَ عَبْدِ اللهِ ﷺ، هَلْ يُجْمَعُ بَيْنَ الظُّهْرِ وَالْعَصْرِ فِي السَّفَرِ؟ فَقَالَ: نَعَمْ، لاَ بَأْسَ بِذَلِكَ، أَلَمْ ديكة إِلَى صَلاَةِ النَّاسِ بِعَرَفَةَ[4].**

واتە: لە ئیبنو شیهابەوە ﷺ گێڕدراوەتەوە کە پرسیاری لە سالمی کوڕی عەبدوڵڵا ﷺ کرد (گوتی): ئایا نوێژی نیوەڕۆ و عەسر لە سەفەردا کۆدەکرێنەوە؟ ئەویش گوتی: بەڵێ، ئەوە هیچ کێشەی تیا نییە، ئایا سەیری نوێژی خەڵکیت نەکردووە لە عەرەفە (کاتێ نوێژ کۆدەکەنەوە بەهۆی سەفەری حەج)؟

---

(١) ـ صحيح. أخرجه أبو مصعب الزهري: ٣٦٨؛ والحدثاني: ١١٧؛ والشافعي: ١٠٤٢؛ ومسلم: ٤٩؛ والنسائي: ٦٠١؛ وأبو داود: ١٢١٠؛ وابن حبان: ١٥٩٦؛ وشرح معاني الآثار: ٩٦٧؛ والقابسي: ١٠٩، كلهم عن مالك به.

(٢) ـ تێبینی: ئیمامی شافیعیش پێی وایە بەهۆی باران بووە، ئەو ڕیوایەتەش کە هاتووە دەڵێ بەهۆی باران نەبووە موخالەفەی ڕیوایەتی جمهورە کە ئەوەی تیا نییە و دواتر ڕیوایەتی ئیبنو عومەر و ئیبنو عەبباس هەیە لەسەر کۆکردنەوەی نوێژ بەهۆی باران، کە پاڵپشتی لێکدانەوەکە دەکات، وەك ئیمامی بەیهەقی ڕوونی کردۆتەوە.

(٣) ـ صحيح. أخرجه أبو مصعب الزهري: ٣٦٩؛ والحدثاني: ١١٧؛ والشيباني: ٢٠٤، كلهم عن مالك به.

(٤) ـ مقطوع صحيح. أخرجه أبو مصعب الزهري: ٣٧٠؛ والحدثاني: ١١٧، كلهم عن مالك به.

٣٨٨- عَنْ عَلِيِّ بْنِ حُسَيْنٍ رَحِمَهُ اللهُ أَنَّهُ كَانَ يَقُولُ: كَانَ رَسُولُ اللهِ ﷺ إِذَا أَرَادَ أَنْ يَسِيرَ يَوْمَهُ جَمَعَ بَيْنَ الظُّهْرِ وَالْعَصْرِ، وَإِذَا أَرَادَ أَنْ يَسِيرَ لَيْلَهُ جَمَعَ بَيْنَ الْمَغْرِبِ وَالْعِشَاءِ[١].

واتە: لە عەلی کوڕی حوسەینەوە رحمه الله گێڕدراوەتەوە دەیگوت: پێغەمبەری خوا ﷺ کاتێ بیویستایە لە ڕۆژەکەیدا هەر بەردەوام بێت لە ڕۆیشتن (لە سەفەردا)، ئەوە نوێژی نیوەڕۆ و عەسری کۆ دەکردەوە، وە کاتێ بیویستایە شەوەکەی هەر ڕێ بکات و بەردەوام بێت لە ڕۆیشتن، ئەوە نوێژی مەغریب و عیشای کۆدەکردەوە.

## ٢- کورتکردنەوەی نوێژ لە سەفەردا[٢]

٣٨٩- عَنْ رَجُلٍ مِنْ آلِ خَالِدِ بْنِ أَسِيدٍ رَحِمَهُ اللهُ، أَنَّهُ سَأَلَ عَبْدَ اللهِ بْنَ عُمَرَ رَضِيَ اللهُ عَنْهُمَا، فَقَالَ: يَا أَبَا عَبْدِ الرَّحْمَنِ، إِنَّا نَجِدُ صَلاَةَ الْخَوْفِ، وَصَلاَةَ الْحَضَرِ فِي الْقُرْآنِ، وَلاَ نَجِدُ صَلاَةَ السَّفَرِ؟ فَقَالَ ابْنُ عُمَرَ رَضِيَ اللهُ عَنْهُمَا: يَا ابْنَ أَخِي، إِنَّ اللهَ عَزَّ وَجَلَّ بَعَثَ إِلَيْنَا مُحَمَّدًا ﷺ، وَلاَ نَعْلَمُ شَيْئًا، فَإِنَّمَا نَفْعَلُ، كَمَا رَأَيْنَاهُ يَفْعَلُ[٣].

واتە: لە پیاوێکی ئالی خالیدی کوڕی ئوسەیدەوە رحمه الله گێڕدراوەتەوە بەوەی پرسیاری لە عەبدوڵڵای کوڕی عومەر رضي الله عنهما کردووە و گوتوویەتی: ئەی ئەبو عەبدوڕڕەحمان ئێمە نوێژی ترس و نوێژی نیشتەجێ (نوێژیماڵەوە)مان لە قورئاندا بینیوە، بەڵام نوێژی سەفەرمان نەبینیوە؟ ئیبنو عومەریش رضي الله عنه گوتی: ئەی برازام، خوای پەروەردگار موحەممەدی ﷺ بۆ لای ئێمە نارد لە کاتێکدا هیچ شتێکمان نەدەزانی (واتە بەهۆی پێغەمبەرەوە ﷺ نەبووایە قورئانیشمان نەدەزانی، جا ئێستا دەتەوێت کرداری پێغەمبەر ﷺ پشتگوێ بخەین بە حیساب لە قورئان نییە!!!)، دەی بێگومان تەنها ئەوە ئەنجام دەدەین کە بینیومانە پێغەمبەری خوا ﷺ ئەنجامی داوە.

---

(١) ـ صحيح لغيره. أخرجه أبو مصعب الزهري: ٣٦٧، عن مالك به.

(٢) ـ قَصْرُ الصَّلَاةِ فِي السَّفَرِ.

(٣) ـ صحيح لغيره. أخرجه أبو مصعب الزهري: ٣٧٥؛ والحدثاني: ١١٩؛ وابن حنبل: ٥٣٣٣؛ والقابسي: ٨٤، كلهم عن مالك به.

**٣٩٠- عَنْ عَائِشَةَ ﵂، زَوْجِ النَّبِيِّ ﷺ، أَنَّهَا قَالَتْ: فُرِضَتِ الصَّلاَةُ رَكْعَتَيْنِ رَكْعَتَيْنِ، فِي الْحَضَرِ وَالسَّفَرِ، فَأُقِرَّتْ صَلاَةُ السَّفَرِ، وَزِيدَ فِي صَلاَةِ الْحَضَرِ[١].**

واته: لە عائیشەی ﵂ خێزانی پێغەمبەری خواوە ﷺ گێردراوەتەوە گوتوویەتی: (سەرەتا) نوێژ دوو ڕكات دوو ڕكات واجب كرا، جا نوێژی سەفەر بەم شێوەیە مایەوە و نوێژی نیشتەجێش زیاد كرا (واتە مەغریب ڕكاتێك زیاد كرا و نیوەڕۆ و عەسر و عیشاش هەر یەكەیان دوو ڕكات زیاد كران).

**٣٩١- عَنْ يَحْيَى بْنِ سَعِيدٍ ﵀، أَنَّهُ قَالَ لِسَالِمِ بْنِ عَبْدِ اللهِ ﵀: مَا أَشَدَّ مَا رَأَيْتَ أَبَاكَ أَخَّرَ الْمَغْرِبَ فِي السَّفَرِ، فَقَالَ سَالِمٌ ﵀: غَرَبَتِ الشَّمْسُ وَنَحْنُ بِذَاتِ الْجَيْشِ، فَصَلَّى الْمَغْرِبَ بِالْعَقِيقِ[٢].**

واته: لە یەحیای كوڕی سەعیدەوە ﵀ گێردراوەتەوە بەوەی بە سالمی كوڕی عەبدوڵڵای ﵀ گوتووە: ئەوپەڕی ئەوەی بینیوتە باوكت نوێژی مەغریبی دواخستبێت لە سەفەردا چەند بووە؟ سالمیش ﵀ گوتی: خۆرئاوا بوو لە كاتێكدا ئێمە لە «ذات الجَيش» بووین، جا نوێژی مەغریبی لە عەقیق كرد (كە نێوانیان دوازدە میلە، كە دەكاتە نۆزدە كیلۆمەتر و سێسەد و هەشت مەتر).

## ٣- ئەو ئەندازەیەی پێویستە بۆ ئەوەی نوێژی تێدا كورت بكرێتەوە[٣]

**٣٩٢- أَنَّ عَبْدَ اللهِ بْنَ عُمَرَ ﵄ كَانَ إِذَا خَرَجَ حَاجًّا أَوْ مُعْتَمِرًا، قَصَرَ الصَّلاَةَ بِذِي الْحُلَيْفَةِ[٤].**

واته: عەبدوڵڵای كوڕی عومەر ﵄ كاتێ بە حاجی یان عومرەكار دەچوو بۆ حەج و عومرە، ئەوە لە زولحولەیفە نوێژی كورت دەكردەوە.

---

(١) ـ صحيح. أخرجه أبو مصعب الزهري: ٣٧٦؛ والحدثاني: ١١٩؛ والشيباني: ١٨٩؛ والبخاري: ٣٥٠؛ ومسلم: ١؛ والنسائي: ٤٥٥؛ وأبو داود: ١١٩٨؛ وابن حبان: ٢٧٣٦؛ والقابسي: ٢٧٣، كلهم عن مالك به.

(٢) ـ صحيح. أخرجه أبو مصعب الزهري: ٣٧٧؛ والحدثاني: ١١٩، كلهم عن مالك به.

(٣) ـ مَا يَجِبُ فِيهِ قَصْرُ الصَّلاَةِ.

(٤) ـ صحيح. أخرجه أبو مصعب الزهري: ٣٧٨؛ وفي: ١٣٢٩؛ والحدثاني: ١٢٠؛ والحدثاني: ٦١١؛ والشيباني: ١٩٠؛ والشيباني: ١٩١؛ والشيباني: ١٩٢، كلهم عن مالك به.

**٣٩٣- عَنْ سَالِمِ بْنِ عَبْدِ اللهِ ﷺ، عَنْ أَبِيهِ ﷺ، أَنَّهُ رَكِبَ إِلَى رِيمٍ، فَقَصَرَ الصَّلاَةَ فِي مَسِيرِهِ ذَلِكَ[1].**

**قَالَ مَالِكٌ ﷺ: وَذَلِكَ نَحْوٌ مِنْ أَرْبَعَةِ بُرُدٍ.**

واته: له سالمی کوڕی عەبدوڵڵاوه ﷺ گێڕدراوەتەوه، ئەویش له باوکیەوه ﷺ گێڕاویەتەوه بەوەی سواری وڵاغ بووه چووه بۆ ریم و لەو ئەندازەیەدا نوێژی کورت کردۆتەوه.

ئیمامی مالیك ﷺ گوتوویەتی: ئەو ئەندازەیه نزیکەی چوار بەریده (که لەلای مالیکییەکان به کیلۆمەتر دەکاته: ٨٩ کیلۆمەتر و ٤٠ مەتر).

**٣٩٤- عَنْ سَالِمِ بْنِ عَبْدِ اللهِ ﷺ، أَنَّ عَبْدَ اللهِ بْنَ عُمَرَ ﷺ رَكِبَ إِلَى ذَاتِ النُّصُبِ، فَقَصَرَ الصَّلاَةَ فِي مَسِيرِهِ ذَلِكَ[2].**

**قَالَ مَالِكٌ ﷺ: وَبَيْنَ ذَاتِ النُّصُبِ وَالْمَدِينَةِ أَرْبَعَةُ بُرُدٍ.**

واته: له سالمی کوڕی عەبدوڵڵاوه ﷺ گێڕدراوەتەوه (گوتوویەتی): عەبدوڵڵای کوڕی عومەر ﷺ بەسواری وڵاغ ڕۆیشت بۆ «ذات النُّصب» و لەو ئەندازەیه نوێژی کورتکردەوه.

ئیمامی مالیك ﷺ دەڵێت: نێوانی (ذات النُّصب) و مەدینه چوار بەریده (که لەلای مالیکییەکان به کیلۆمەتر دەکاته: ٨٩ کیلۆمەتر و ٤٠ مەتر).

**٣٩٥- عَنِ ابْنِ عُمَرَ ﷺ؛ أَنَّهُ كَانَ يُسَافِرُ إِلَى خَيْبَرَ، فَيَقْصُرُ الصَّلاَةَ[3].**

واته: له ئیبنو عومەرەوه ﷺ گێڕدراوەتەوه که هەموو جار ئەگەر سەفەری بکردایه بۆ خەیبەر، ئەوه نوێژەکانی کورت دەکردەوه (جا نێوانی مەدینه و خەیبەر ٩٦ میل بوو، که دەکاته ١٥٤ کیلۆمەتر و ٤٦٥ مەتر).

---

(١) ـ صحيح. أخرجه أبو مصعب الزهري: ٣٧٩؛ والحدثاني: ١٢٠؛ والشافعي: ٩٧، كلهم عن مالك به.

(٢) ـ صحيح. أخرجه أبو مصعب الزهري: ٣٨٠؛ والشافعي: ٩٦؛ والشافعي: ١٧٩١، كلهم عن مالك به.

(٣) ـ صحيح. أخرجه أبو مصعب الزهري: ٣٨١؛ والحدثاني: ١٢٠، كلهم عن مالك به.

**٣٩٦-** أَنَّ عَبْدَ اللهِ بْنَ عُمَرَ ﭭ كَانَ يَقْصُرُ الصَّلاَةَ فِي مَسِيرِهِ الْيَوْمَ التَّامَّ[١].

واتە: عەبدوڵڵای کوڕی عومەر ﭭ نوێژی کورت دەکردەوە لە ئەندازەی ڕۆژەڕێیەکی تەواو.

**٣٩٧-** عَنْ نَافِعٍ ﵀، أَنَّهُ كَانَ يُسَافِرُ مَعَ ابْنِ عُمَرَ ﭭ الْبَرِيدَ فَلاَ يَقْصُرُ الصَّلاَةَ[٢].

واتە: لە نافیعەوە ﵀ گێڕدراوەتەوە بەوەی سەفەری لەگەڵ ئیبنو عومەر ﭭ کردووە و بەریدێك ڕۆیشتووە و نوێژی کورت نەکردۆتەوە (کە لەلای مالیکییەکان دەکاتە ٢٢ کیلۆمەتر و ٢٦٠ مەتر)[٣].

**٣٩٨-** أَنَّ عَبْدَ اللهِ بْنَ عَبَّاسٍ ﭭ كَانَ يَقْصُرُ الصَّلاَةَ فِي مِثْلِ مَا بَيْنَ مَكَّةَ وَالطَّائِفِ، وَفِي مِثْلِ مَا بَيْنَ مَكَّةَ وَعُسْفَانَ، وَفِي مِثْلِ مَا بَيْنَ مَكَّةَ وَجُدَّةَ[٤].

قَالَ مَالِكٌ ﵀: وَذَلِكَ أَرْبَعَةُ بُرُدٍ، وَذَلِكَ أَحَبُّ مَا تُقْصَرُ إِلَيَّ فِيهِ الصَّلاَةُ.

واتە: عەبدوڵڵای کوڕی عەبباس ﭭ هەموو جار نوێژی کورت دەکردەوە لە ئەندازەی هاووێنەی نێوان مەککە و تائیف (کە بە کیلۆمەتر دەکاتە نزیکەی ١١١ کیلۆمەتر)، وە لە ئەندازەی هاووێنەی نێوان مەککە و عوسفانیش، وە لە ئەندازەی هاووێنەی نێوان مەککە و جوددەش (کە دەکاتە زیاتر لە هەشتا کیلۆمەتر).

ئیمامی مالیك ﵀ گوتوویەتی: جا ئەو ئەندازەیەی لە نێوان ئەو شوێنانە باس کراوە کەمتر نییە لە چوار بەرید (کە لەلای مالیکییەکان دەکاتە: هەشتا و نۆ کیلۆمەتر)، وە ئەوەش چاکترین ئەندازەیە لەلام کە نوێژی تیادا کۆدەکرێتەوە[٥].

---

(١) ـ صحيح. أخرجه أبو مصعب الزهري: ٣٨٢، عن مالك به.

(٢) ـ صحيح. أخرجه أبو مصعب الزهري: ٣٨٤، عن مالك به.

(٣) ـ تێبینی: ئەندازەی بەرید لەلای حەنەفییەکان و مالیکییەکان دەکاتە: (٢٢٢٦٠) مەتر، کە دەکاتە بیست و دوو کیلۆمەتر و دوو سەد و شەست مەتر، وە لەلای شافعییەکان و حەنبەلییەکان دەکاتە: (٤٤٢٥٠) مەتر، کە دەکاتە چل و چوار کیلۆمەتر و دوو سەد و پەنجا مەتر.

(٤) ـ صحيح. أخرجه أبو مصعب الزهري: ٣٨٣، عن مالك به.

(٥) ـ تێبینی: ئەوە بۆچوونی ئیمامی شافیعی و ئیمامی ئەحمەدیشە.

٣٩٩- قَالَ مَالِكٌ ﷺ: لاَ يَقْصُرُ الَّذِي يُرِيدُ السَّفَرَ الصَّلاَةَ، حَتَّى يَخْرُجَ مِنْ بُيُوتِ الْقَرْيَةِ، وَلاَ يُتِمُّ حَتَّى يَدْخُلَ أَوَّلَ بُيُوتِ الْقَرْيَةِ أَوْ يُقَارِبَ ذَلِكَ[1].

واتە: ئیمامی مالیك ﷺ دەڵێ: ئەو کەسەی دەیەوێ سەفەر بکات نابێ نوێژ کورت بکاتەوە، تاوەکوو دەردەچێت لە خانووەکانی گوندەکە (شارەکە، ناوچەکە)، وە نوێژیش تەواو ناکات (واتە هەر بە موسافیر حیسابە و واجب نییە بیکاتەوە چوار ڕکات) تاوەکوو دەگاتەوە خانووەکانی سەرەتای گوندەکە یان لەوە نزیك دەبێتەوە.

## ٤- نوێژی موسافیر کە نییەتی مانەوەی نەهێنابێ[2]

٤٠٠- أَنَّ عَبْدَ اللهِ بْنَ عُمَرَ ﷺ كَانَ يَقُولُ: أُصَلِّي صَلاَةَ الْمُسَافِرِ، مَا لَمْ أُجْمِعْ مُكْثًا وَإِنْ حَبَسَنِي ذَلِكَ اثْنَتَيْ عَشْرَةَ لَيْلَةً[3].

واتە: عەبدوڵڵای کوڕی عومەر ﷺ دەیگوت: نوێژ وەکوو نوێژی موسافیر و گەشتیار دەکەم (نوێژ کورت دەکەمەوە)، مادەم نییەتی مانەوەم نەبێ، هەر چەندە ئەو کارە دوازدە شەو بمهێڵێتەوە (جا ئەوە بۆ ئەو کەسەیە کە نەزانێ ئەمڕۆ، یان بەیانی، یان دووبەیانی، یان چ ڕۆژێك کارەکەی تەواو دەبێ).

٤٠١- عَنْ نَافِعٍ ﷺ أَنَّ ابْنَ عُمَرَ ﷺ أَقَامَ بِمَكَّةَ عَشْرَ لَيَالٍ يَقْصُرُ الصَّلاَةَ، إِلاَّ أَنْ يُصَلِّيَهَا مَعَ الإِمَامِ فَيُصَلِّيهَا بِصَلاَتِهِ[4].

واتە: لە نافیعەوە ﷺ گێڕدراوەتەوە (گوتوویەتی): ئیبنو عومەر ﷺ دە ڕۆژ لە مەککە مایەوە نوێژی کورت کردەوە (چونکە نییەتی مانەوەی نەبوو، نەیدەزانی دەگاتە چوار ڕۆژ و زیاتر)، تەنها لەو کاتەدا نەبێ کە لەگەڵ ئیمامی موقیم نوێژی دەکرد، ئەو کات وەك نوێژەکەی ئەو بە تەواوی دەیکرد (بەبێ کورتکردنەوە).

---

(١) ـ أخرجه أبو مصعب الزهري: ٣٨٥؛ وفي: ١٣٣٠، كلهم عن مالك به.

(٢) ـ صَلاَةُ الْمُسَافِرِ مَا لَمْ يُجْمِعْ مُكْثًا.

(٣) ـ صحيح. أخرجه أبو مصعب الزهري: ٣٨٧؛ والحدثاني: ١٢١؛ والشيباني: ١٩٤، كلهم عن مالك به.

(٤) ـ صحيح. أخرجه أبو مصعب الزهري: ٣٨٨؛ والحدثاني: ١٢١؛ والشافعي: ٥٨٦، كلهم عن مالك به.

## ٥- نوێژی موسافیر کاتێ نییەتی مانەوە دێنێ[١]

**٤٠٢-** عَنْ عَطَاءٍ الْخُرَاسَانِيِّ ﷺ، أَنَّهُ سَمِعَ سَعِيدَ بْنَ الْمُسَيَّبِ ﷺ قَالَ: مَنْ أَجْمَعَ إِقَامَةً أَرْبَعَ لَيَالٍ وَهُوَ مُسَافِرٌ، أَتَمَّ الصَّلَاةَ[٢].

قَالَ مَالِكٌ ﷺ: وَذَلِكَ أَحَبُّ مَا سَمِعْتُ إِلَيَّ.

واتە: لە عەتائی خۆراسانییەوە ﷺ گێردراوەتەوە گوێی لە سەعیدی کوڕی موسەیەب ﷺ بووە گوتوویەتی: هەر کەسێك نییەتی مانەوەی چوار شەو (لە شوێنێك) بێنێت لە کاتێکدا موسافیر بێ، ئەوە نوێژەکانی بەتەواوی دەکات (کورتیان ناکاتەوە، چونکە دەبێتە موقیم، نیشتەجێ).

ئیمامی مالیك ﷺ دەڵێ: ئەوە خۆشەویستترین و چاکترینی ئەوەیە لەلام کە گوێم لێ بووە (لەم بابەتەدا).

**٤٠٣-** وَسُئِلَ مَالِكٌ ﷺ عَنْ صَلَاةِ الْأَسِيرِ؟ فَقَالَ: مِثْلُ صَلَاةِ الْمُقِيمِ، إِلاَّ أَنْ يَكُونَ مُسَافِرًا[٣].

واتە: ئیمامی مالیك ﷺ پرسیاری لێکرا دەربارەی نوێژی ئەسیر (بەندکراو)؟ ئەویش گوتی: نوێژەکەی وەکوو کەسی نیشتەجێیە، تەنها لەو کاتەدا نەبێت کە موسافیرە (واتە لەو کاتەی دەیگوازنەوە و دەیبەن بۆ شوێنێکی دوور کە ئەندازەکەی بگاتە ئەندازەی نوێژ کورتکردنەوە ئەو کات زیندانییەکە بۆی هەیە نوێژ کورت بکاتەوە).

---

(١) ـ صَلَاةُ الْمُسَافِرِ إِذَا أَجْمَعَ مُكْثًا.

(٢) ـ مقطوع صحيح. أخرجه أبو مصعب الزهري: ٣٨٩؛ وفي: ١٣٣١؛ والشيباني: ١٩٨، كلهم عن مالك به.

(٣) ـ أخرجه أبو مصعب الزهري: ٣٩٠؛ والحدثاني: ١٢٢، كلهم عن مالك به.

## ٦- نوێژی موسافیر ئەگەر خۆی ئیمامەتی کرد، یان ئەگەر لە پشت ئیمامێك نوێژی کرد[١]

٤٠٤- عَنْ سَالِمِ بْنِ عَبْدِ اللهِ رَحِمَهُ اللهُ، عَنْ أَبِيهِ، أَنَّ عُمَرَ بْنَ الْخَطَّابِ رَضِيَ اللهُ عَنْهُ كَانَ إِذَا قَدِمَ مَكَّةَ صَلَّى بِهِمْ رَكْعَتَيْنِ، ثُمَّ يَقُولُ: يَا أَهْلَ مَكَّةَ أَتِمُّوا صَلَاتَكُمْ، فَإِنَّا قَوْمٌ سَفْرٌ[٢].

واتە: لە سالمی کوڕی عەبدوڵڵاوە رَحِمَهُ اللهُ گێڕدراوەتەوە، ئەویش لە باوکیەوە گێڕاویەتەوە (گوتوویەتی): ئیمامی عومەری کوڕی خەتتاب رَضِيَ اللهُ عَنْهُ کاتێ دەهات بۆ مەککە نوێژی بە دوو ڕکات بۆ دەکردن، دواتر دەیگوت: ئەی خەڵکی مەککە ئێوە نوێژەکەتان بەتەواوەتی بکەن (وەك ئێمە کورتی مەکەنەوە)، چونکە ئێمە موسافیرین.

٤٠٥- عَنْ زَيْدِ بْنِ أَسْلَمَ رَحِمَهُ اللهُ، عَنْ أَبِيهِ رَحِمَهُ اللهُ، عَنْ عُمَرَ بْنِ الْخَطَّابِ رَضِيَ اللهُ عَنْهُ، مِثْلَ ذَلِكَ[٣].

واتە: لە زەیدی کوڕی ئەسلەمەوە رَحِمَهُ اللهُ، ئەویش لە باوکیەوە رَحِمَهُ اللهُ، ئەویش لە عومەری کوڕی خەتتابەوە رَضِيَ اللهُ عَنْهُ هەمان شتی گێڕاوەتەوە.

٤٠٦- عَنْ نَافِعٍ رَحِمَهُ اللهُ، أَنَّ عَبْدَ اللهِ بْنَ عُمَرَ رَضِيَ اللهُ عَنْهُمَا كَانَ يُصَلِّي وَرَاءَ الإِمَامِ بِمِنًى أَرْبَعًا، فَإِذَا صَلَّى لِنَفْسِهِ صَلَّى رَكْعَتَيْنِ[٤].

واتە: لە نافیعەوە رَحِمَهُ اللهُ گێڕدراوەتەوە (گوتوویەتی): عەبدوڵڵای کوڕی عومەر رَضِيَ اللهُ عَنْهُمَا لە مینا لەدوای ئیمامی موقیم نوێژی بە چوار ڕکات دەکرد، جا ئەگەر بەتەنها نوێژی بکردایە ئەوە بە دوو ڕکات دەیکرد (واتە: کاتێك موسافیر لەدوای موقیم نوێژ دەکات، واجبە شوێنکەوتەی ئیمام بێت و نوێژەکەی تەواو بکات).

---

(١) ـ صَلَاةُ الْمُسَافِرِ إِذَا كَانَ إِمَامًا أَوْ كَانَ وَرَاءَ إِمَامٍ.

(٢) ـ صحيح. أخرجه أبو مصعب الزهري: ٣٩١؛ والحدثاني: ١٢٣؛ والشيباني: ١٩٥، كلهم عن مالك به.

(٣) ـ صحيح. أخرجه مصنف ابن أبي شيبة: ١٤٠٤، وفي: ١٤٢٣، عن مالك به.

(٤) ـ صحيح. أخرجه أبو مصعب الزهري: ٣٩٣؛ وفي: ١٣٥٩؛ والحدثاني: ١٢٣؛ والحدثاني: ٦٠٩؛ والشيباني: ١٩٩؛ والشافعي: ١١٢٢، كلهم عن مالك به.

٤٠٧- عَنْ صَفْوَانَ ﷺ، أَنَّهُ قَالَ: جَاءَ عَبْدُ اللهِ بْنُ عُمَرَ ﷺ يَعُودُ عَبْدَ اللهِ بْنَ صَفْوَانَ، فَصَلَّى لَنَا رَكْعَتَيْنِ، ثُمَّ انْصَرَفَ، فَقُمْنَا فَأَتْمَمْنَا[1].

واته: له صه‌فوانه‌وه ﷺ گێڕدراوه‌ته‌وه گوتوویه‌تی: عه‌بدوڵڵای كوڕی عومه‌ر ﷺ هات سه‌ردانی عه‌بدوڵڵای كوڕی صه‌فوانی كرد، جا به‌ ئیمامه‌تی دوو ڕكات نوێژی بۆ كردین، دواتر سه‌لامی دایه‌وه (چونكه موسافیر بوو)، ئێمه‌ش هه‌ڵسایه‌نه‌وه و نوێژه‌كه‌مان ته‌واو كرد (چونكه خه‌ڵكی ئه‌وێ بووین، موسافیر نه‌بووین).

## ٧- نوێژی سوننه‌ت له سه‌فه‌ردا به‌ڕۆژ و به‌شه‌و، وه نوێژكردن له‌سه‌ر سواری[2]

٤٠٨- عَنْ نَافِعٍ ﷺ، عَنْ عَبْدِ اللهِ بْنِ عُمَرَ ﷺ؛ أَنَّهُ لَمْ يَكُنْ يُصَلِّي مَعَ صَلَاةِ الْفَرِيضَةِ فِي السَّفَرِ شَيْئًا، قَبْلَهَا وَلاَ بَعْدَهَا، إِلاَّ مِنْ جَوْفِ اللَّيْلِ، فَإِنَّهُ كَانَ يُصَلِّي عَلَى الأَرْضِ وَعَلَى رَاحِلَتِهِ حَيْثُ تَوَجَّهَتْ[3].

واته: له نافیعه‌وه ﷺ گێڕدراوه‌ته‌وه، ئه‌ویش له عه‌بدوڵڵای كوڕی عومه‌ره‌وه ﷺ گێڕاویه‌ته‌وه به‌وه‌ی هیچ نوێژێكی (سوننه‌تی) له‌گه‌ڵ نوێژه فه‌رزه‌كان نه‌كردووه له سه‌فه‌ردا، چ له‌پێش نوێژه‌كان چ له دواوه‌یان، ته‌نها له شه‌و نه‌بێ، ئه‌و كات (شه‌ونوێژی ده‌كرد) له‌سه‌ر زه‌وی بووایه یان له‌سه‌ر پشتی وڵاغ جا وڵاغه‌كه ڕووی له هه‌ر لایێك بكردایه.

٤٠٩- أَنَّ الْقَاسِمَ بْنَ مُحَمَّدٍ، وَعُرْوَةَ بْنَ الزُّبَيْرِ، وَأَبَا بَكْرِ بْنَ عَبْدِ الرَّحْمَنِ ﷺ، كَانُوا يَتَنَفَّلُونَ فِي السَّفَرِ[4].

---

(١) ـ صحيح. أخرجه أبو مصعب الزهري: ٣٩٤؛ والحدثاني: ١٢٣، كلهم عن مالك به.

(٢) ـ صَلَاةُ النَّافِلَةِ فِي السَّفَرِ بِالنَّهَارِ وَاللَّيْلِ، وَالصَّلَاةِ عَلَى الدَّابَّةِ.

(٣) ـ صحيح. أخرجه أبو مصعب الزهري: ٤٠٠؛ والحدثاني: ١٢٥؛ والشيباني: ٢٠٩؛ والشافعي: ١١٢٣، كلهم عن مالك به.

(٤) ـ ضعيف. أخرجه أبو مصعب الزهري: ٣٩٦؛ والحدثاني: ١٢٤، كلهم عن مالك به.

واتە: قاسمی کوڕی موحەممەد و عورۆەی کوڕی زوبەیر و ئەبو بەکری کوڕی عەبدوڕڕەحمان ﷺ، گشتیان لە سەفەردا نوێژی سوننەتیان دەکرد.

٤١٠- وَسُئِلَ مالكٌ ﷺ عَنِ النَّافِلَةِ فِي السَّفَرِ، فَقَالَ: لاَ بَأْسَ بِذَلِكَ، بِاللَّيْلِ وَالنَّهَارِ، وَقَدْ بَلَغَنِي أَنَّ بَعْضَ أَهْلِ الْعِلْمِ كَانَ يَفْعَلُ ذَلِكَ[1].

واتە: ئیمامی مالیك ﷺ پرسیاری لێکرا دەربارەی سوننەتکردن لە سەفەردا؟ ئەویش گوتی: هیچ کێشەی تێدا نییە بەشەو و بەڕۆژ، وە پێم گەیشتووە هەندێك لە زانایان ئەوەیان ئەنجام داوە.

٤١١- أَنَّ عَبْدَ اللهِ بْنَ عُمَرَ ﷺ كَانَ يَرَى ابْنَهُ عُبَيْدَ اللهِ بْنَ عَبْدِ اللهِ يَتَنَفَّلُ فِي السَّفَرِ فَلاَ يُنْكِرُ عَلَيْهِ[2].

واتە: عەبدوڵڵای کوڕی عومەر ﷺ عوبەیدوڵڵای کوڕی خۆی دەبینی لەسەفەر نوێژی سوننەتی دەکرد و ڕێگریشی لێ نەدەکرد (هەرچەندە بەخۆی نەیدەکرد، چونکە کردن و نەکردنی دروستە و هەرکەس ئازادە کامیانی پێ چاکترە).

٤١٢- عَنْ عَبْدِ اللهِ بْنِ عُمَرَ ﷺ، أَنَّهُ قَالَ: رَأَيْتُ رَسُولَ اللهِ ﷺ يُصَلِّي وَهُوَ عَلَى حِمَارٍ وَهُوَ مُتَوَجِّهٌ إِلَى خَيْبَرَ[3].

واتە: لە عەبدوڵڵای کوڕی عومەرەوە ﷺ گێڕدراوەتەوە گوتوویەتی: پێغەمبەری خوام ﷺ بینی نوێژی سوننەتی دەکرد، لە کاتێکدا لەسەر گوێدرێژێك بوو دەچوو بۆ خەیبەر (ڕووی کردبووە خەیبەر).

٤١٣- عَنْ عَبْدِ اللهِ بْنِ عُمَرَ ﷺ؛ أَنَّ رَسُولَ اللهِ ﷺ كَانَ يُصَلِّي عَلَى رَاحِلَتِهِ فِي السَّفَرِ، حَيْثُ تَوَجَّهَتْ بِهِ.

---

(١) ـ أخرجه أبو مصعب الزهري: ٣٩٧؛ والحدثاني: ١٢٤، كلهم عن مالك به.

(٢) ـ ضعيف. أخرجه أبو مصعب الزهري: ٣٩٥؛ والحدثاني: ١٢٤، كلهم عن مالك به.

(٣) ـ صحيح. أخرجه أبو مصعب الزهري: ٣٩٨؛ والحدثاني: ١٢٥؛ والشيباني: ٢٠٧؛ والشافعي: ٨٤؛ وابن حنبل: ٤٥٢٠؛ ومسلم: ٣٥؛ والنسائي: ٧٤٠؛ وأبو داود: ١٢٢٦؛ وابن حبان: ٢٥١٥؛ وأبي يعلى الموصلي: ٥٦٦٦؛ والقابسي: ٤٠٠، كلهم عن مالك به.




قَالَ عَبْدُ اللهِ بْنُ دِينَارٍ ﷺ: وَكَانَ عَبْدُ اللهِ بْنُ عُمَرَ ﷺ يَفْعَلُ ذَلِكَ[١].

واتە: لە عەبدوڵڵای کوڕی عومەرەوە ﷺ گێڕدراوەتەوە (گوتوویەتی): پێغەمبەری خوا ﷺ هەموو جار لەسەر وڵاغەکەی نوێژی سوننەتی دەکرد، جا وڵاغەکە ڕووی لە هەر لایێك بکردایە.

عەبدوڵڵای کوڕی دینار ﷺ دەڵێ: عەبدوڵڵای کوڕی عومەریش ﷺ ئاوای دەکرد.

**٤١٤- عَنْ يَحْيَى بْنِ سَعِيدٍ ﷺ أَنَّهُ قَالَ: رَأَيْتُ أَنَسَ بْنَ مَالِكٍ ﷺ فِي السَّفَرِ وَهُوَ يُصَلِّي عَلَى حِمَارٍ، وَهُوَ مُتَوَجِّهٌ إِلَى غَيْرِ الْقِبْلَةِ، يَرْكَعُ وَيَسْجُدُ، إِيمَاءً مِنْ غَيْرِ أَنْ يَضَعَ وَجْهَهُ عَلَى شَيْءٍ[٢].**

واتە: لە یەحیای کوڕی سەعیدەوە ﷺ گێڕدراوەتەوە بەوەی گوتوویەتی: ئەنەسی کوڕی مالیکم ﷺ لە سەفەردا بینی، لەسەر گوێدرێژەکەی نوێژی دەکرد، لە کاتێکدا دەڕۆیشت بە ئاراستەی غەیری قیبلە، ڕکوع و سوژدەی دەبرد بە تۆزێك خۆ نەویکردن، بەبێ ئەوەی ناوچەوانی لەسەر هیچ شتێك دابنێت.

## ٨- نوێژی چێشتەنگاو[٣]

**٤١٥- عَنْ أَبِي مُرَّةَ، مَوْلَى عَقِيلِ بْنِ أَبِي طَالِبٍ ﷺ، أَنَّ أُمَّ هَانِئٍ بِنْتَ أَبِي طَالِبٍ ﷺ أَخْبَرَتْهُ، أَنَّ رَسُولَ اللهِ ﷺ صَلَّى عَامَ الْفَتْحِ ثَمَانِيَ رَكَعَاتٍ، مُلْتَحِفًا فِي ثَوْبٍ وَاحِدٍ[٤].**

واتە: لە ئەبو مورەی خزمەتکاری عەقیلی کوڕی ئەبو تالیبەوە ﷺ گێڕدراوەتەوە (گوتوویەتی): ئوممو هانیئی کچی ئەبو تالیب ﷺ هەواڵی پێدام (گوتی):

---

(١) ـ صحيح. أخرجه أبو مصعب الزهري: ٣٩٩؛ والحدثاني: ١٢٥؛ والشيباني: ٢٠٥؛ والشافعي: ٨٣؛ وابن حنبل: ٥٣٣٤؛ ومسلم: ٣٧؛ والنسائي: ٤٩٢، وفي: ٧٤٣؛ والقابسي: ٢٧٨، كلهم عن مالك به.

(٢) ـ صحيح. أخرجه أبو مصعب الزهري: ٤٠١؛ والحدثاني: ١٢٥؛ والشيباني: ٢٠٨، كلهم عن مالك به.

(٣) ـ صَلَاةُ الضُّحَى.

(٤) ـ صحيح. أخرجه أبو مصعب الزهري: ٤٠٢؛ والحدثاني: ١٢٦؛ والشيباني: ١٦١؛ وابن حنبل: ٢٧٤٣٢؛ والقابسي: ١٩١، كلهم عن مالك به.

پێغەمبەری خوا ﷺ لە ساڵی فەتحی مەککە هەشت ڕکات نوێژی چێشتەنگاوی کرد، تاقە جلێکی لە خۆی پێچا بوو.

٤١٦- عَنْ مَوْلَى عَقِيلِ بْنِ أَبِي طَالِبٍ ﷺ، أَنَّهُ سَمِعَ أُمَّ هَانِئٍ بِنْتَ أَبِي طَالِبٍ تَقُولُ: ذَهَبْتُ إِلَى رَسُولِ اللهِ ﷺ عَامَ الْفَتْحِ، فَوَجَدْتُهُ يَغْتَسِلُ، وَفَاطِمَةُ ابْنَتُهُ تَسْتُرُهُ بِثَوْبٍ، قَالَتْ: فَسَلَّمْتُ، فَقَالَ: مَنْ هَذِهِ؟ فَقُلْتُ: أُمُّ هَانِئٍ بِنْتُ أَبِي طَالِبٍ، فَقَالَ: مَرْحَبًا بِأُمِّ هَانِئٍ، فَلَمَّا فَرَغَ مِنْ غُسْلِهِ، قَامَ فَصَلَّى ثَمَانِيَ رَكَعَاتٍ، مُلْتَحِفًا فِي ثَوْبٍ وَاحِدٍ، ثُمَّ انْصَرَفَ، فَقُلْتُ: يَا رَسُولَ اللهِ، زَعَمَ ابْنُ أُمِّي عَلِيٌّ أَنَّهُ قَاتِلٌ رَجُلاً أَجَرْتُهُ، فُلاَنُ بْنُ هُبَيْرَةَ، فَقَالَ رَسُولُ اللهِ ﷺ: قَدْ أَجَرْنَا مَنْ أَجَرْتِ يَا أُمَّ هَانِئٍ، قَالَتْ أُمُّ هَانِئٍ: وَذَلِكَ ضُحًى[1].

واتە: لە خزمەتکاری عەقیلی کوڕی ئەبو تالیبەوە ﷺ گێردراوەتەوە بەوەی گوێی لە ئوممو هانیئی کچی ئەبو تالیب بووە دەیگوت: لە ساڵی فەتحی مەککە چووم بۆ لای پێغەمبەری خوا ﷺ، بینیم خۆی دەشۆرد، فاتیمەی کچیشی بە قوماشێك پەردەی لێ کردبوو (تاکو دیار نەبێت لە کاتی خۆشوشتندا)، دەڵێ: منیش سەلامم کرد، ئەویش فەرمووی: ئەوە کێیە؟ دەڵێ گوتم: ئوم هانیئی کچی ئەبو تالیبم، ئەویش فەرمووی: ئوممو هانیْ بەخێر بێ، جا کاتێ لە خۆشۆردنەکەی بۆیەوە هەڵسا و هەشت ڕکات نوێژی کرد، بە یەك پارچە جل خۆی پێچا بوو، دواتر سەلامی دایەوە، منیش گوتم: ئەی پێغەمبەری خوا ﷺ عەلی کوڕی دایکم (واتە عەلی برام) دەڵێ: ئەو پیاوە دەکوژم، لە کاتێکدا من پەنام داوە، فلانی کوڕی هوبەیرەیە، پێغەمبەری خواش ﷺ فەرمووی: ئەوەمان پەنا داوە کە تۆ پەنات داوە (واتە ناهێڵین عەلی دەستی لێ بدات)، ئوممو هانیْ دەڵێ: کاتەکە چێشتەنگا و بوو (واتە نوێژەکە سوننەتی چێشتەنگاو بووە).

---

(١) ـ صحيح. أخرجه أبو مصعب الزهري: ٤٠٣؛ والحدثاني: ١٢٦؛ والشيباني: ١٦٢؛ وابن حنبل: ٢٦٩٥٢، وفي: ٢٦٩٥٣، وفي: ٢٧٤٢٨؛ والبخاري: ٢٨٠، وفي: ٣٥٧، وفي: ٣١٧١، وفي: ٦١٥٨؛ ومسلم: ٧٠، وفي: ٨٢؛ والترمذي: ٢٧٣٤؛ وابن حبان: ١١٨٨؛ والدارمي: ١٤٥٣، وفي: ٢٥٠٢؛ والقابسي: ٤٢١، كلهم عن مالك به.

**٤١٧-** عَنْ عَائِشَةَ ﵂، زَوْجِ النَّبِيِّ ﷺ، أَنَّهَا قَالَتْ: مَا رَأَيْتُ رَسُولَ اللهِ ﷺ يُصَلِّي سُبْحَةَ الضُّحَى قَطُّ، وَإِنِّي لَأَسْتَحِبُّهَا، وَإِنْ كَانَ رَسُولُ اللهِ ﷺ لَيَدَعُ الْعَمَلَ، وَهُوَ يُحِبُّ أَنْ يَعْمَلَهُ، خَشْيَةَ أَنْ يَعْمَلَ بِهِ النَّاسُ، فَيُفْرَضَ عَلَيْهِمْ(١).

واته: له عائیشه‌ی ﵂ خێزانی پێغه‌مبه‌ره‌وه ﷺ گێڕدراوه‌ته‌وه به‌وه‌ی گوتوویه‌تی: هه‌رگیز پێغه‌مبه‌ری خوام ﷺ نه‌بینیوه نوێژی سوننه‌تی چێشته‌نگاو بكات (ته‌نها هه‌ندێ جار نه‌بێ، وه‌ك له‌ ڕیوایه‌تی دیكه‌ی عائیشه‌دا ﵂ هاتووه)، به‌ڵام من به سوننه‌تی ده‌زانم، هه‌رچه‌نده پێغه‌مبه‌ری خوا ﷺ وازی لێ هێناوه، له كاتێكدا حه‌زی لێ بووه ئه‌نجامی بدات، (به‌ڵام كه وازی لێ هێناوه) له ترسی ئه‌وه‌ی بووه خه‌ڵكی ئه‌نجامی بده‌ن و له‌سه‌ریان واجب بكرێت.

**٤١٨-** عَنْ عَائِشَةَ ﵂، أَنَّهَا كَانَتْ تُصَلِّي الضُّحَى ثَمَانِيَ رَكَعَاتٍ، ثُمَّ تَقُولُ: لَوْ نُشِرَ لِي أَبَوَايَ مَا تَرَكْتُهُنَّ(٢).

واته: له عائیشه‌وه ﵂ گێڕدراوه‌ته‌وه به‌وه‌ی هه‌موو جار هه‌شت ڕكات نوێژی چێشته‌نگاوی ده‌كرد، دواتر ده‌یگوت: ئه‌گه‌ر دایك و باوكم زیندوو بكرێنه‌وه بۆم (له به‌رامبه‌ر ئه‌وه‌ی واز له‌و هه‌شت ڕكاته بێنم) ئه‌وه وازیان لێ ناهێنم.

## ٩- بابه‌تی جۆراوجۆر ده‌رباره‌ی سوننه‌تی چێشته‌نگاو(٣)

**٤١٩-** عَنْ أَنَسِ بْنِ مَالِكٍ ﵁، أَنَّ جَدَّتَهُ مُلَيْكَةَ دَعَتْ رَسُولَ اللهِ ﷺ لِطَعَامٍ، فَأَكَلَ مِنْهُ، ثُمَّ قَالَ رَسُولُ اللهِ ﷺ: قُومُوا فَلأُصَلِّيَ لَكُمْ. قَالَ أَنَسٌ ﵁: فَقُمْتُ إِلَى حَصِيرٍ لَنَا قَدِ اسْوَدَّ مِنْ طُولِ مَا لُبِسَ، فَنَضَحْتُهُ بِمَاءٍ، فَقَامَ عَلَيْهِ رَسُولُ اللهِ ﷺ، وَصَفَفْتُ أَنَا وَالْيَتِيمُ وَرَاءَهُ، وَالْعَجُوزُ مِنْ وَرَائِنَا، فَصَلَّى لَنَا رَكْعَتَيْنِ ثُمَّ انْصَرَفَ(٤).

---

(١) ـ صحيح. أخرجه أبو مصعب الزهري: ٤٠٤؛ والشيباني: ٣٨٨؛ وابن حنبل: ٢٥٤٩٠؛ والبخاري: ١١٢٨؛ ومسلم، ٧٧؛ وأبو داود: ١٢٩٣؛ وابن حبان: ٣١٣؛ والقابسي: ٣٧، كلهم عن مالك به.

(٢) ـ ضعيف. أخرجه أبو مصعب الزهري: ٤٠٥؛ والحدثاني: ١٢٦، كلهم عن مالك به.

(٣) ـ جَامِعُ سُبْحَةِ الضُّحَى.

(٤) ـ صحيح. أخرجه أبو مصعب الزهري: ٤٠٦؛ والحدثاني: ١٢٧؛ والشيباني: ١٧٨؛ والشافعي: ٢٤٥؛ وابن حنبل:

واتە: لە ئەنەسی کوڕی مالیکەوە ﷺ گێردراوەتەوە بەوەی مولەیکەی داپیرەی ئەنەس پێغەمبەری خوای ﷺ بانگێشت کرد بۆ خواردن، ئەویش لێی خوارد، دواتر پێغەمبەری خوا ﷺ فەرمووی: هەڵسن تا نوێژتان بۆ بکەم، ئەنەس ﷺ دەڵێ: منیش هەڵسام چووم بۆ لای حەسیرێکمان کە ڕەش هەڵگەڕا بوو لەبەر زۆر ڕاخستن، جا بە ئاو ڕشاندم، پێغەمبەری خواش ﷺ هەڵسا و من و یەتیمێکیش لە دواوەی وەستاین، داپیرەش لەدوای ئێمە وەستا، جا دوو ڕکاتی بۆ کردین و دواتر سەلامی دایەوە (کەواتە نوێژی چێشتەنگاویان بە جەماعەت کردووە).

**٤٢٠-** عَنْ عُبَيْدِ اللهِ بْنِ عَبْدِ اللهِ بْنِ عُتْبَةَ بْنِ مَسْعُودٍ ﷺ، عَنْ أَبِيهِ، أَنَّهُ قَالَ: دَخَلْتُ عَلَى عُمَرَ بْنِ الْخَطَّابِ ﷺ بِالْهَاجِرَةِ، فَوَجَدْتُهُ يُسَبِّحُ، فَقُمْتُ وَرَاءَهُ، فَقَرَّبَنِي حَتَّى جَعَلَنِي حِذَاءَهُ عَنْ يَمِينِهِ، فَلَمَّا جَاءَ يَرْفَأُ، تَأَخَّرْتُ فَصَفَفْنَا وَرَاءَهُ[1].

واتە: لە عوبەیدوڵڵای کوڕی عەبدوڵڵای کوڕی عوتبەی کوڕی مەسعودەوە ﷺ گێردراوەتەوە، ئەویش لە باوکیەوە گێڕاویەتەوە بەوەی گوتوویەتی: لە کاتی چرقەی گەرما هاتمە ژوورەوە بۆ لای عومەری کوڕی خەتتاب ﷺ، جا بینیم نوێژی چێشتەنگاو دەکات، منیش لەدواوەی وەستام، ئەویش نزیکی کردمەوە لە خۆی تا لە تەنیشت خۆی دانام لەلای ڕاستی، جا کاتێ یەرفەْ هات (بووین بە دوو کەس و) چوومە دواوە و لەدواوەی ڕیز بووین (کەواتە نوێژی چێشتەنگاویان بە جەماعەتیش کردووە).

---

١٢٣٦٢، وفي: ١٢٥٢٩، وفي: ١٢٧٠٣؛ والبخاري: ٣٨٠، وفي: ٨٦٠، وفي: ١١٦٤؛ ومسلم: ٢٦٦؛ والنسائي: ٨٠١؛ وأبو داود: ٦١٢؛ والترمذي: ٢٣٤؛ وابن حبان: ٢٢٠٥؛ والدارمي: ١٢٨٧؛ والقابسي: ١١٥، كلهم عن مالك به.

(١) ـ صحيح. أخرجه أبو مصعب الزهري: ٤٠٧؛ والحدثاني: ١٢٧؛ والشيباني: ١٧٦، كلهم عن مالك به.




## ١٠- هەڕەشەی توند لەوەی کەسێك بەبەردەمی نوێژخوێنێکدا تێپەڕێت (بەئەنقەست)[(١)]

**٤٢١-** عَنْ عَبْدِ الرَّحْمَنِ بْنِ أَبِي سَعِيدٍ الْخُدْرِيِّ ﷺ، عَنْ أَبِيهِ ﷺ، أَنَّ رَسُولَ اللهِ ﷺ قَالَ: إِذَا كَانَ أَحَدُكُمْ يُصَلِّي، فَلاَ يَدَعْ أَحَدًا يَمُرُّ بَيْنَ يَدَيْهِ، وَلْيَدْرَأْهُ مَا اسْتَطَاعَ، فَإِنْ أَبَى فَلْيُقَاتِلْهُ فَإِنَّمَا هُوَ شَيْطَانٌ[(٢)].

واتە: لە عەبدوڕڕەحمانی کوڕی ئەبو سەعیدی خودرییەوە ﷺ گێڕدراوەتەوە، ئەویش لە باوکیەوە ﷺ گێڕاویەتەوە (گوتوویەتی): پێغەمبەری خوا ﷺ فەرموویەتی: ئەگەر یەکێك لە ئێوە نوێژی کرد، ئەوە با نەهێڵێ کەس بەبەردەمی (بە شوێنی سوژدەیدا) تێپەڕێ، وە با بیگەڕێنێتەوە (بەئاماژە و نەرمونیانی) ئەوەندەی دەتوانێ، جا ئەگەر کەسەکە ڕەتی کردەوە بگەڕێتەوە و ململانێی کرد، ئەوە با بە توندی مامەڵەی لەگەڵ بکات و دووری بخاتەوە، چونکە ئەوە شەیتانە (واتە کەسێکی کردەوە شەیتانییە و ڕێزی نوێژ ناگرێ).

**٤٢٢-** عَنْ بُسْرِ بْنِ سَعِيدٍ ﷺ، أَنَّ زَيْدَ بْنَ خَالِدٍ الْجُهَنِيَّ ﷺ أَرْسَلَهُ إِلَى أَبِي جُهَيْمٍ ﷺ يَسْأَلُهُ، مَاذَا سَمِعَ مِنْ رَسُولِ اللهِ ﷺ فِي الْمَارِّ بَيْنَ يَدَيِ الْمُصَلِّي؟ فَقَالَ أَبُو جُهَيْمٍ ﷺ: قَالَ رَسُولُ اللهِ ﷺ: لَوْ يَعْلَمُ الْمَارُّ بَيْنَ يَدَيِ الْمُصَلِّي، مَاذَا عَلَيْهِ، لَكَانَ أَنْ يَقِفَ أَرْبَعِينَ، خَيْرًا لَهُ مِنْ أَنْ يَمُرَّ بَيْنَ يَدَيْهِ، قَالَ أَبُو النَّضْرِ ﷺ: لاَ أَدْرِي أَقَالَ أَرْبَعِينَ يَوْمًا أَوْ شَهْرًا أَوْ سَنَةً[(٣)].

واتە: لە بوسری کوڕی سەعیدەوە ﷺ گێڕدراوەتەوە (گوتوویەتی): زەیدی کوڕی خالیدی جوهەنی ﷺ ناردمی بۆ لای ئەبو جوهەیم ﷺ تا پرسیاری لێ

---

(١) ـ التَّشْدِيدُ فِي أَنْ يَمُرَّ أَحَدٌ بَيْنَ يَدَيِ الْمُصَلِّي.

(٢) ـ صحيح. أخرجه أبو مصعب الزهري: ٤٠٨؛ وفي: ٥١٥؛ والحدثاني: ١٢٨؛ والشيباني: ٢٧٣؛ وابن حنبل: ١١٣١٧، وفي: ١١٤١٢؛ ومسلم: ٢٥٨؛ والنسائي: ٧٥٧؛ وأبو داود: ٦٩٧؛ وابن حبان: ٢٣٦٧، وفي: ٢٣٦٨؛ والمنتقى لابن الجارود: ١٦٧؛ والدارمي: ١٤١١؛ والقابسي: ١٧٥، كلهم عن مالك به.

(٣) ـ صحيح. أخرجه أبو مصعب الزهري: ٤٠٩؛ والحدثاني: ١٢٨؛ والشيباني: ٢٧٢؛ وابن حنبل: ١٧٥٧٥؛ والبخاري: ٥١٠؛ ومسلم: ٢٦١؛ والنسائي: ٧٥٦؛ وأبو داود: ٧٠١؛ والترمذي: ٣٣٦؛ وابن حبان: ٢٣٦٦؛ والدارمي: ١٤١٧؛ والقابسي: ٤٢٢، كلهم عن مالك به.



بکەم: کە ئاخۆ چی گوێ لێ بووە لە پێغەمبەری خواوە ﷺ دەربارەی ئەو کەسەی تێپەڕ دەبێ بە بەردەم نوێژخوێندا؟ ئەبو جوهەیمیش ﷺ گوتی: پێغەمبەری خوا ﷺ فەرموویەتی: ئەگەر ئەو کەسەی تێپەڕ دەبێ بە بەردەم نوێژخوێندا بزانێت چ تاوانێکی لە ئەستۆیە، ئەوە چل بوەستایە چاکتر بوو بۆی لەوەی تێپەڕ بێت بە بەردەم نوێژخوێندا، ئەبو نەضر ﷺ دەڵێ: نازانم ئایا (بوسر) گوتی: چل ڕۆژ، یان چل مانگ، یان چل ساڵ[١].

**٤٢٣**- أَنَّ كَعْبَ الأَحْبَارِ ﷺ قَالَ: لَوْ يَعْلَمُ الْمَارُّ بَيْنَ يَدَيِ الْمُصَلِّي، مَاذَا عَلَيْهِ، لَكَانَ أَنْ يُخْسَفَ بِهِ، خَيْرًا لَهُ مِنْ أَنْ يَمُرَّ بَيْنَ يَدَيْهِ[٢].

واتە: کەعبی ئەحبار ﷺ گوتوویەتی: ئەگەر ئەو کەسەی بە بەردەمی نوێژخوێندا تێپەڕ دەبێ بیزانیایە چ تاوانێکی لەسەرە، ئەوە ئەگەر لە زەوی خەسف بکرایە و ڕۆچوێنرابایە چاکتر بوو بۆی لەوەی بە بەردەمی نوێژخوێندا تێپەڕ ببێ.

**٤٢٤**- أَنَّ عَبْدَ اللهِ بْنَ عُمَرَ ﷺ كَانَ يَكْرَهُ أَنْ يَمُرَّ بَيْنَ أَيْدِي النِّسَاءِ، وَهُنَّ يُصَلِّينَ[٣].

واتە: عەبدوڵڵای کوڕی عومەر ﷺ بە ناپەسەندی دادەنا تەنانەت بە بەردەمی ئافرەتانیشدا ڕەت ببێ، لە کاتێکدا نوێژ دەکەن (هەرچەندە کەوتوونەتە کۆتایی ڕیزەکان و لای دەرگا بۆ هاتنە ژوورەوە و خۆ لێ پاراستنیان ئەستەمە، کەچی هەر پێی ناپەسەند بووە).

**٤٢٥**- أَنَّ عَبْدَ اللهِ بْنَ عُمَرَ ﷺ كَانَ لاَ يَمُرُّ بَيْنَ يَدَيْ أَحَدٍ، وَلاَ يَدَعُ أَحَدًا يَمُرُّ بَيْنَ يَدَيْهِ[٤].

واتە: عەبدوڵڵای کوڕی عومەر ﷺ بە بەردەمی هیچ کەسدا تێپەڕ نەدەبوو (لە نوێژدا)، وە نەشیدەهێشت کەسیش بە بەردەمیدا تێپەڕ ببێت.

---

(١) ـ تێبینی: ئەبو نەضر (رحمه الله) لە ڕیوایەتی دیکەدا بیری هاتۆتەوە، چل ساڵ بووە.

(٢) ـ مقطوع صحيح. أخرجه أبو مصعب الزهري: ٤١٠؛ والحدثاني: ١٢٨؛ والشيباني: ٢٧٤، كلهم عن مالك به.

(٣) ـ صحيح. أخرجه أبو مصعب الزهري: ٤١١؛ والحدثاني: ١٢٨، كلهم عن مالك به.

(٤) ـ صحيح. أخرجه أبو مصعب الزهري: ٤١٢، عن مالك به.

## ١١- مۆڵەتدان بە تێپەڕبوون بە بەردەم نوێژخوێندا (بۆ حاڵەتی تایبەت)[1]

**٤٢٦-** عَنْ عَبْدِ اللهِ بْنِ عَبَّاسٍ ﷺ، أَنَّهُ قَالَ: أَقْبَلْتُ رَاكِبًا عَلَى أَتَانٍ، وَأَنَا يَوْمَئِذٍ قَدْ نَاهَزْتُ الاِحْتِلاَمَ، وَرَسُولُ اللهِ ﷺ يُصَلِّي لِلنَّاسِ بِمِنًى، فَمَرَرْتُ بَيْنَ يَدَيْ بَعْضِ الصَّفِّ، فَنَزَلْتُ، فَأَرْسَلْتُ الأَتَانَ تَرْتَعُ، وَدَخَلْتُ فِي الصَّفِّ، فَلَمْ يُنْكِرْ ذَلِكَ عَلَيَّ أَحَدٌ[2].

واتە: لە عەبدوڵڵای کوڕی عەبباسەوە ﷺ گێردراوەتەوە گوتوویەتی: من بەسەر پشتی ماکەرێکەوە هاتم، لە کاتێکدا لەو ڕۆژگارەدا تازە خەریك بوو نزیك ببوومەوە لە باڵغبوون، پێغەمبەری خواش ﷺ نوێژی بۆ خەڵکی دەکرد لە مینا، جا بە بەردەم هەندێك لە ڕیزەکاندا تێپەڕ بووم، ئینجا دابەزیم و ماکەرەکەم بەڕەڵا کرد تا بلەوەڕێ، وە چوومە ناو ڕیزێکەوە و کەسیش لەسەر ئەوە قەدەغە و لۆمەی نەکردم.

**٤٢٧-** أَنَّ سَعْدَ بْنَ أَبِي وَقَّاصٍ ﷺ كَانَ يَمُرُّ بَيْنَ يَدَيْ بَعْضِ الصُّفُوفِ، وَالصَّلاَةُ قَائِمَةٌ[3].

قَالَ مَالِكٌ ﷺ: وَأَنَا أَرَى ذَلِكَ وَاسِعًا، إِذَا أُقِيمَتِ الصَّلاَةُ، وَبَعْدَ أَنْ يُحْرِمَ الإِمَامُ، وَلَمْ يَجِدِ الْمَرْءُ مَدْخَلاً إِلَى الْمَسْجِدِ إِلاَّ بَيْنَ الصُّفُوفِ.

واتە: سەعدی کوڕی ئەبو وەققاس ﷺ بە بەردەم هەندێك لە ڕیزەکانی نوێژدا تێپەڕ دەبوو، لە کاتێکدا نوێژ دابەسترا بوو.

ئیمامی مالیك ﷺ گوتوویەتی: من پێم وایە ئەوە مەجالی تێدا هەیە و دروستە، کاتێ قامەتی نوێژ دەکرێت و ئیمام نوێژ دادەبەستێ و نوێژخوێنەکە هیچ کەلێنێکی دەست ناکەوێت بۆ ناو مزگەوت تەنها بە تێپەڕبوون بە نێوانی ڕیزەکان نەبێت (ئەو کاتە ئاساییە و کێشە نییە).

---

(١) ـ الرُّخْصَةُ فِي الْمُرُورِ بَيْنَ يَدَيِ الْمُصَلِّي.

(٢) ـ صحيح. أخرجه أبو مصعب الزهري: ٤١٣؛ وفي: ١٣٥٧؛ والحدثاني: ١٢٩؛ وفي: ٦٠٧؛ والشافعي: ٨٢٣؛ وابن حنبل: ٣١٨٤ وفي: ٣١٨٥؛ والبخاري: ٧٦، وفي: ٤٩٣، وفي: ٨٦١، وفي: ٤٤١٢؛ ومسلم: ٢٥٤؛ وأبو داود: ٧١٥؛ وابن حبان: ٢١٥١، وفي: ٢٣٩٣؛ والقابسي: ٤٨، كلهم عن مالك به.

(٣) ـ ضعيف. أخرجه أبو مصعب الزهري: ٤١٥؛ والحدثاني: ١٢٩، كلهم عن مالك به.

٤٢٨- أَنَّ عَلِيَّ بْنَ أَبِي طَالِبٍ ﷺ قَالَ: لاَ يَقْطَعُ الصَّلاَةَ شَيْءٌ مِمَّا يَمُرُّ بَيْنَ يَدَيِ الْمُصَلِّي[١].

واتە: عەلی کوڕی ئەبو تالیب ﷺ گوتوویەتی: هیچ شتێك لەوانەی بە بەردەمی نوێژخوێندا تێپەڕ دەبن نوێژ نابڕن و بەتاڵی ناکەنەوە.

٤٢٩- أَنَّ عَبْدَ اللهِ بْنَ عُمَرَ ﷺ كَانَ يَقُولُ: لاَ يَقْطَعُ الصَّلاَةَ شَيْءٌ مِمَّا يَمُرُّ بَيْنَ يَدَيِ الْمُصَلِّي[٢].

واتە: عەبدوڵڵای کوڕی عومەر ﷺ هەموو جار دەیگوت: هیچ شتێك لەوانەی بە بەردەمی نوێژخوێندا تێپەڕ دەبن نوێژ نابڕن و بەتاڵی ناکەنەوە.

## ١٢- سوترە و بەربەستی نوێژخوێن لە سەفەردا[٣]

٤٣٠- عَنْ مَالِكٍ ﷺ؛ أَنَّهُ بَلَغَهُ، أَنَّ عَبْدَ اللهِ بْنَ عُمَرَ ﷺ كَانَ يَسْتَتِرُ بِرَاحِلَتِهِ إِذَا صَلَّى[٤].

واتە: لە مالیکەوە ﷺ گێڕدراوەتەوە، کە پێی گەیشتووە عەبدوڵڵای کوڕی عومەر ﷺ هەموو جار سوترە و بەربەستی بە وڵاغەکەی دروست دەکرد کاتێ (لە سەفەردا) نوێژی بکردایە.

٤٣١- عَنْ هِشَامِ بْنِ عُرْوَةَ ﷺ، أَنَّ أَبَاهُ كَانَ يُصَلِّي فِي الصَّحْرَاءِ إِلَى غَيْرِ سُتْرَةٍ[٥].

واتە: لە هیشامی کوڕی عورووەوە ﷺ گێڕدراوەتەوە (گوتوویەتی): باوکم (واتە عورووەی کوڕی زوبەیر خوا لێی ڕازی بێ) لە بیابان و چۆڵەوانی بەبێ سوترە و بەربەست نوێژی دەکرد.

---

(١) ـ صحيح. أخرجه أبو مصعب الزهري: ٤١٦؛ والحدثاني: ١٢٩، كلهم عن مالك به.

(٢) ـ صحيح. أخرجه أبو مصعب الزهري: ٤١٧؛ والحدثاني: ١٢٩؛ والشيباني: ٢٧٥، كلهم عن مالك به.

(٣) ـ سُتْرَةُ الْمُصَلِّي فِي السَّفَرِ.

(٤) ـ صحيح. أخرجه أبو مصعب الزهري: ٤١٨؛ والحدثاني: ١٣٠، كلهم عن مالك به.

(٥) ـ مقطوع صحيح. أخرجه الحدثاني: ١٣٠، عن مالك به.

## ١٣- دەستخشاندن لە وردەبەرد لە نوێژدا[١]

**٤٣٢-** عَنْ أَبِي جَعْفَرٍ الْقَارِئِ ﷺ أَنَّهُ قَالَ: رَأَيْتُ عَبْدَ اللهِ بْنَ عُمَرَ ﷺ إِذَا أَهْوَى لِيَسْجُدَ، مَسَحَ الْحَصْبَاءَ لِمَوْضِعِ جَبْهَتِهِ، مَسْحًا خَفِيفًا[٢].

واتە: لە ئەبو جەعفەری قاریئەوە ﷺ گێڕدراوەتەوە گوتوویەتی: عەبدوڵڵای کوڕی عومەرم ﷺ بینی کاتێ خۆی نەوی دەکرد تا سوژدە بەرێ، دەستی دەخشاند لە وردەبەردەکان بۆ شوێنی سوژدەبردنی، بەدەستلێخشاندنێکی کەم (تا بەردەکان ڕێك بخات و ئازاری ناوچەوانی نەدەن لە کاتی سوژدە).

**٤٣٣-** أَنَّ أَبَا ذَرٍّ ﷺ كَانَ يَقُولُ: مَسْحُ الْحَصْبَاءِ مَسْحَةً وَاحِدَةً، وَتَرْكُهَا خَيْرٌ مِنْ حُمْرِ النَّعَمِ[٣].

واتە: ئەبو زەڕ ﷺ هەموو جار دەیگوت: دەستخشاندن لە وردەبەرد یەك جارە، وازهێنانیش لێی لە وشتری سوور چاکترە (وشتری سوور لەناو عەرەبدا باشترین جۆری وشتر بووە).

## ١٤- ئەوەی هاتووە دەربارەی ڕاستکردنی ڕیزەکان (بۆ نوێژ)[٤]

**٤٣٤-** أَنَّ عُمَرَ بْنَ الْخَطَّابِ ﷺ كَانَ يَأْمُرُ بِتَسْوِيَةِ الصُّفُوفِ، فَإِذَا جَاؤُوهُ فَأَخْبَرُوهُ أَنْ قَدِ اسْتَوَتْ، كَبَّرَ[٥].

واتە: عومەری کوڕی خەتتاب ﷺ هەموو جار فەرمانی دەکرد بە ڕاست و ڕێککردنی ڕیزەکانی نوێژ، جا ئەگەر (ئەو کەسانەی بۆ ڕاستکردنی ڕیزەکان ڕایسپاردبوون) بهاتبان بۆ لای و هەواڵیان پێ بدابایە بەوەی ڕیزەکان ڕاست بوونە، ئەو کات «الله أكبر»ی دەکرد و نوێژی دەست پێ دەکرد.

---

(١) ـ مَسْحُ الْحَصْبَاءِ فِي الصَّلَاةِ.

(٢) ـ صحيح. أخرجه أبو مصعب الزهري: ٤٢٠؛ والحدثاني: ١٣١، كلهم عن مالك به.

(٣) ـ ضعيف. أخرجه أبو مصعب الزهري: ٤٢١؛ والحدثاني: ١٣١، كلهم عن مالك به.

(٤) ـ مَا جَاءَ فِي تَسْوِيَةِ الصُّفُوفِ.

(٥) ـ صحيح. أخرجه أبو مصعب الزهري: ٤٢٢؛ والحدثاني: ١٣٢؛ والشيباني: ٩٧، كلهم عن مالك به.

٤٣٥- عَنْ أَبِي سُهَيْلِ بْنِ مَالِكٍ ﷺ، عَنْ أَبِيهِ ﷺ أَنَّهُ قَالَ: كُنْتُ مَعَ عُثْمَانَ بْنِ عَفَّانَ ﷺ، فَقَامَتِ الصَّلاَةُ وَأَنَا أُكَلِّمُهُ فِي أَنْ يَفْرِضَ لِي، فَلَمْ أَزَلْ أُكَلِّمُهُ، وَهُوَ يُسَوِّي الْحَصْبَاءَ بِنَعْلَيْهِ، حَتَّى جَاءَهُ رِجَالٌ قَدْ كَانَ وَكَّلَهُمْ بِتَسْوِيَةِ الصُّفُوفِ، فَأَخْبَرُوهُ أَنَّ الصُّفُوفَ قَدِ اسْتَوَتْ، فَقَالَ لِي: اسْتَوِ فِي الصَّفِّ، ثُمَّ كَبَّرَ[1].

واته: له ئەبو سوهەیلی كوڕی مالیكەوە ﷺ گێردراوەتەوە، ئەویش له باوكیەوە ﷺ گێڕاویەتەوە بەوەی گوتوویەتی: من لەگەڵ عوسمانی كوڕی عەففان ﷺ بووم، جا كاتی نوێژ هات له كاتێكدا من قسەم لەگەڵ دەكرد دەربارەی ئەوەی بەشێكم پێ بدات له پارە و پوڵی خەزێنەی مسوڵمانان، ئەویش بە نەعلەكانی وردەبەردەكانی ڕاست و ڕێك دەكرد (بۆ كاتی سوژدە بردن)، تا پیاوانێك هاتن كە ئەو ڕایسپاردبوون بە ڕاستكردنی ڕیزەكان، جا هەواڵیان پێدا بەوەی ڕیزەكان ڕاستن، جا پێی گوتم: لەناو ڕیزەكە ڕاست بوەستە، دواتر «الله أكبر»ی كرد و دەستی بە نوێژ كرد.

## ١٥- دانانی دەستی ڕاستە لەسەر دەستی چەپە لە نوێژدا[2]

٤٣٦- عَنْ عَبْدِ الْكَرِيمِ بْنِ أَبِي الْمُخَارِقِ الْبَصْرِيِّ، أَنَّهُ قَالَ: مِنْ كَلاَمِ النُّبُوَّةِ ﷺ: إِذَا لَمْ تَسْتَحْيِ فَافْعَلْ مَا شِئْتَ، وَوَضْعُ الْيَدَيْنِ إِحْدَاهُمَا عَلَى الأُخْرَى فِي الصَّلاَةِ، يَضَعُ الْيُمْنَى عَلَى الْيُسْرَى، وَتَعْجِيلُ الْفِطْرِ، وَالاِسْتِينَاءُ بِالسُّحُورِ[3].

واته: له عەبدولكەریمی كوڕی ئەبو موخاریقی بەصریەوە گێردراوەتەوە بەوە گوتوویەتی: بەشێك له وتە و فەرمانی پێغەمبەران ﷺ ئەمانەن: ئەگەر شەرمت نەكرد هەموو شتێك بكە (واتە مادەم بتوانی خۆت له شەرم دابڕنێ خۆت له هەموو شتێك دادەڕنی و خۆت تووشی جۆرەها تاوان دەكەی)، وە (یەكێكی دیكە له وتە و فەرمانەكان) دانانی یەكێك له دەستەكانە لەسەر ئەوەی دیكە، (نوێژخوێن)

---

(١) ـ صحيح. أخرجه أبو مصعب الزهري: ٤٢٣؛ والحدثاني: ١٣٢، كلهم عن مالك به.

(٢) ـ وَضْعُ الْيَدَيْنِ إِحْدَاهُماَ عَلَىَ الأَخْرَى فِي الصَّلَاةِ.

(٣) ـ مقطوع صحيح. أخرجه أبو مصعب الزهري: ٤٢٤؛ وفي: ٧٧١؛ والحدثاني: ١٣٣؛ وفي: ٤٥٤، كلهم عن مالك به.

دەستی ڕاست لەسەر دەستی چەپ دادەنێ، وە (یەکێکی دیکە لە فەرمانەکان) زوو ڕۆژووشکاندن و درەنگ پارشێوخواردنە.

**٤٣٧- عَنْ سَهْلِ بْنِ سَعْدٍ السَّاعِدِيِّ ﷺ أَنَّهُ قَالَ: كَانَ النَّاسُ يُؤْمَرُونَ أَنْ يَضَعَ الرَّجُلُ الْيَدَ الْيُمْنَى عَلَى ذِرَاعِهِ الْيُسْرَى فِي الصَّلاَةِ[١]، قَالَ أَبُو حَازِمٍ ﷺ: لَا أَعْلَمُ إِلاَّ أَنَّهُ يَنْمِي ذَلِكَ.**

واتە: لە سەهلی کوڕی سەعدی ساعیدییەوە ﷺ گێڕدراوەتەوە بەوەی گوتوویەتی: خەڵکی (لە سەردەمی پێغەمبەر ﷺ) فەرمانیان پێ دەکرا بەوەی نوێژخوێنەکە دەستی ڕاست لەسەر باسکی چەپی دابنێت لە نوێژدا، ئەبو حازم ﷺ گوتوویەتی: نازانم، بەڵام (سەهلی کوڕی سەعد ـ خوا لێی ڕازی بێ ـ) فەرموودەکەی پاڵداوەتە لای پێغەمبەری خواوە ﷺ (دیارە ئەو لە پێغەمبەرەوە ﷺ زانیاری هەبووە لەو بارەیەوە چونکە ئەو هاوەڵە).

## ١٦- قونوتخوێندن لە نوێژی بەیانیدا[٢]

**٤٣٨- عَنْ نَافِعٍ ﷺ، أَنَّ عَبْدَ اللهِ بْنَ عُمَرَ ﷺ كَانَ لاَ يَقْنُتُ فِي شَيْءٍ مِنَ الصَّلاَةِ[٣].**

واتە: لە نافیعەوە ﷺ گێڕدراوەتەوە (گوتوویەتی): عەبدوڵڵای کوڕی عومەر ﷺ قونوتی لە هیچ نوێژێکدا نەدەخوێند[٤].

---

(١) ـ صحيح. أخرجه أبو مصعب الزهري: ٤٢٦؛ والحدثاني: ١٣٣؛ والشيباني: ٢٩١؛ وابن حنبل: ٢٢٩٠٠؛ والبخاري: ٧٤٠؛ والقابسي: ٤٠٩، كلهم عن مالك به.

(٢) ـ الْقُنُوتُ فِي الصُّبْحِ.

(٣) ـ صحيح. أخرجه أبو مصعب الزهري: ٤٢٧؛ وفي: ٥٣٨؛ والحدثاني: ١٣٤، كلهم عن مالك به.

(٤) ـ تێبینی: لە باسی قنوتدا لەم موەتتەئەی ئیمامی مالیکدا کە بە ڕیوایەتی یەحیایە تەنها ئەم فەرموودەی تیایە، بەڵام لە موەتتەئەکانی دیکەی ئیمامی مالیك کە بە ڕیوایەتی قوتابییەکانی دیکەی ڕیوایەت کراون فەرموودەیەکی دیکەشی تیایە بۆ ئەوانی داناوە، کە لە هیشامی کوڕی عورووەوە ﷺ گێڕدراوەتەوە باسی ئەوەی کردووە باوکی کە عورووەی کوڕی زوبەیرە کە هاوەڵی پێغەمبەری خوایە گوتوویەتی: عورووەی کوڕی زوبەیری باوکم قنوتی لە هیچ نوێژێکدا نەدەخوێند تەنها لە نوێژی بەیانیدا نەبێ، لە نوێژی بەیانیدا لە ڕکاتی دووەمدا دوای تەواوبوونی قورئانخوێندن قنوتی دەخوێند. وە ئیمامی مالیك خۆیشی لەو زانایانەیە کە بۆچوونیان وایە قنوت بەردەوام لە نوێژی بەیانی دەخوێنرێ.

## ١٧- نەهیكردن لە ئەنجامدانی نوێژ لە كاتێكدا نوێژخوێن پێویستی بە سەرئاو هەیە[(١)]

**٤٣٩-** عَنْ هِشَامِ بْنِ عُرْوَةَ ﷺ، عَنْ أَبِيهِ ﷺ، أَنَّ عَبْدَ اللهِ بْنَ الأَرْقَمِ ﷺ كَانَ يَؤُمُّ أَصْحَابَهُ، فَحَضَرَتِ الصَّلاَةُ يَوْمًا، فَذَهَبَ لِحَاجَتِهِ، ثُمَّ رَجَعَ، فَقَالَ: إِنِّي سَمِعْتُ رَسُولَ اللهِ ﷺ يَقُولُ: إِذَا أَرَادَ أَحَدُكُمُ الْغَائِطَ، فَلْيَبْدَأْ بِهِ قَبْلَ الصَّلاَةِ[(٢)].

---

جا دەربارەی شەرعییەت و سوننەتییەتی خوێندنی قونوت چەندین فەرموودەی ڕاست و دروست هەیە و زۆربەی زانایان لە هاوەڵانی پێغەمبەری خوا و زانایانی تابیعین و دواتریش تا ئەمڕۆ لەسەر ئەو بۆچوونەن كە بەردەوام بخوێندرێ، وەك لە «التحفه الأحوذي» شەرحی سونەنی تیرمیزیدا هاتووە كە لە كتێبی «الإعتبار»ی حافز ئەبو بەكری حازمی نەقلی دەكات و دەڵێت: زانایان ڕاجیاییان هەیە لە خوێندنی قنوتی نوێژی بەیانی، جا زۆربەی زانایان لە صەحابەكان و تابعینەكان و ئەوانەی دوای ئەوانیش لە زانایانی شار و دێهاتەكان لەسەر جێگیری قنوتن لە نوێژی بەیانیدا بە سوننەتیان زانیوە بەردەوام ئەنجام بدرێ، جا هەندێك لەوانەی بۆمان ڕیوایەت كراوە لێیانەوە لە هاوەڵان ئەمانەن: چوار خەلیفەكان: ئیمامی ئەبو بەكر و عومەر و عوسمان و عەلی، هەروەها: عەمماری كوڕی یاسر و ئوبەی كوڕی كەعب و ئەبو موسای ئەشعەری و عەبدوڕڕەحمانی كوڕی ئیمامی ئەبو بەكر و عەبدوڵڵای كوڕی عەبباس و ئەبو هورەیرە و بەڕائی كوڕی عازیب و ئەنەسی كوڕی مالیك و ئەبو حەلیمە موعازی كوڕی حاریسی ئەنصاری و سەهلی كوڕی سەعدی ساعیدی و عەرفەجەی كوڕی شوڕەیحی ئەشجەعی و موعاویەی كوڕی ئەبو سوفیان و عائیشە، وە لە تابیعییە گەورەكانیش: ئەبو ڕەجائی عوتاریدی و سوەیدی كوڕی غەفلە و ئەبو عوسمانی نەهدی و ئەبو ڕافیعی صائیغ، وە لە تابعینەكان: سەعیدی كوڕی موسەیەب و حەسەنی كوڕی حەسەن و ئیبنو سیرین و ئەبانی كوڕی عوسمان و قەتادە و تاوس و عوبەیدی كوڕی عومەیر و ڕەبیعی كوڕی خەیسەم و ئەیوبی سختیانی و عوبەیدەی سەلمانی و عوروەی كوڕی زوبەیر و زیادی كوڕی عوسمان و عەبدوڕڕەحمانی كوڕی ئەبو لەیلا و عومەری كوڕی عەبدولعەزیز و حومەیدی تەویل، وە لە ئیمام و فوقەهاكانی دوای ئەوان: ئەبو ئیسحاق و ئەبو بەكری كوڕی موحەممەد و حەكەمی كوڕی عوتەیبە و حەمماد و مالیكی كوڕی ئەنەس و هەموو ئەهلی حیجاز و ئەزاعی و زۆربەی زانایانی شام و شافیعی و زانایانی مەزهەبی شافیعی و جگە لەوانە زۆری دیكەش لە زانایان. وە چەند كەسێك لە زانایان پێچەوانەی ئەمانە فەتوایان داوە و ڕێگرییان لە قنوتی نوێژی بەیانی كردووە. تحفة الأحوذي بشرح جامع الترمذي، أبو العلا محمد عبد الرحمن بن عبد الرحيم المباركفوري، الناشر: دار الكتب العلمية – بيروت، ٣٥٩/٢.

(١) ـ النَّهْيُ عَنِ الصَّلَاةِ وَالإِنْسَانُ يُرِيدُ حَاجَتَهُ.

(٢) ـ صحيح. أخرجه أبو مصعب الزهري: ٥١٤؛ والحدثاني: ١٦٥؛ والشافعي: ٢٢١؛ والنسائي: ٨٥٢؛ وابن حبان: ٢٠٧١، كلهم عن مالك به.

واتە: لە هیشامی کوڕی عوروەوە ﷺ گێڕدراوەتەوە، ئەویش لە باوکیەوە ﷺ گێڕاویەتەوە (گوتوویەتی): عەبدوڵڵای کوڕی ئەرقەم ﷺ پێشنوێژی بۆ هاوەڵەکانی دەکرد، جا ڕۆژێکیان کاتی نوێژ هات و ڕۆیشت بۆ سەرئاوکردن، دواتر گەڕایەوە و گوتی: من گوێم لە پێغەمبەری خوا ﷺ بوو دەیفەرموو: ئەگەر یەکێك لە ئێوە ویستی بچێتە سەرئاو (کاتی نوێژیش بوو)، ئەوە با سەرەتا پێویستییەکەی جێبەجێ بکات (سەرئاو بکات) بەر لە نوێژ (بۆ ئەوەی تەنگاوییەکەی سەرقاڵی نەکات لە نوێژەکەیدا).

**٤٤٠-** أَنَّ عُمَرَ بْنَ الْخَطَّابِ ﷺ قَالَ: لاَ يُصَلِّيَنَّ أَحَدُكُمْ وَهُوَ ضَامٌّ بَيْنَ وَرِكَيْهِ[١].

واتە: عومەری کوڕی خەتتاب ﷺ گوتوویەتی: با یەکێك لە ئێوە نوێژ نەکات لە کاتێکدا سمت و ناوڕانەکانی بەیەکەوە لکاندووە لە تەنگاوییان (لەبەر میز یان پیسایی).

### ١٨- چاوەڕوانیکردنی نوێژ و بەپێ ڕۆیشتن بۆی[٢]

**٤٤١-** عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ ﷺ، أَنَّ رَسُولَ اللهِ ﷺ قَالَ: الْمَلاَئِكَةُ تُصَلِّي عَلَى أَحَدِكُمْ مَا دَامَ فِي مُصَلاَّهُ الَّذِي صَلَّى فِيهِ، مَا لَمْ يُحْدِثْ، اللهُمَّ اغْفِرْ لَهُ، اللهُمَّ ارْحَمْهُ[٣].

قَالَ مَالِكٌ ﷺ: لاَ أَرَى قَوْلَهُ: مَا لَمْ يُحْدِثْ، إِلاَّ الإِحْدَاثَ الَّذِي يَنْقُضُ الْوُضُوءَ.

واتە: لە ئەبو هورەیرەوە ﷺ گێڕدراوەتەوە (گوتوویەتی): پێغەمبەری خوا ﷺ فەرموویەتی: فریشتەکان نزا بۆ هەر یەکێك لە ئێوە دەکەن مادەم لە شوێنی نوێژکردنەکەی مابێتەوە، مادەم پیسی نەهاتبێتە سەر، (دەڵێن): پەروەردگارا لێی خۆش بە، پەروەردگارا ڕەحمی پێ بکە.

---

(١) ـ ضعيف. أخرجه أبو مصعب الزهري: ٥١٥؛ والحدثاني: ١٦٥، كلهم عن مالك به.

(٢) ـ انْتِظَارُ الصَّلاَةِ وَالْمَشْيُ إِلَيْهَا.

(٣) ـ صحيح. أخرجه أبو مصعب الزهري: ٥٢٧؛ والحدثاني: ١٧١؛ وابن حنبل: ١٠٣١٢؛ والبخاري: ٤٤٥، وفي: ٦٥٩؛ والنسائي: ٧٣٣؛ وأبو داود: ٤٦٩؛ وابن حبان: ١٧٥٣؛ والقابسي: ٣٣٠، كلهم عن مالك به.

ئیمامی مالیك ﷺ گوتوویەتی: پێم وا نییە کە دەڵێ: مادەم پیسی نەهاتبێتە سەر (مەبەستی هیچ شتێك بێت)، تەنها ئەو پیسی هاتنەسەرە نەبێت کە دەستنوێژ دەشکێنێ (واتە مەبەستی بێدەستنوێژییە).

٤٤٢- عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ ﷺ، أَنَّ رَسُولَ اللهِ ﷺ قَالَ: لاَ يَزَالُ أَحَدُكُمْ فِي صَلاَةٍ مَا كَانَتِ الصَّلاَةُ تَحْبِسُهُ، لاَ يَمْنَعُهُ أَنْ يَنْقَلِبَ إِلَى أَهْلِهِ إِلاَّ الصَّلاَةُ[1].

واتە: لە ئەبو هورەیرەوە ﷺ گێڕدراوەتەوە (گوتوویەتی): پێغەمبەری خوا ﷺ فەرموویەتی: هەر یەکێك لە ئێوە بەردەوام لە نوێژدایە مادەم نوێژ ڕایگرتبێت و هێڵابێتیەوە، هیچ شتێك ڕێگر نەبووبێت لەوەی بگەڕێتەوە ماڵەوە تەنها نوێژ نەبێت.

٤٤٣- أَنَّ أَبَا بَكْرِ بْنَ عَبْدِ الرَّحْمَنِ ﷺ كَانَ يَقُولُ: مَنْ غَدَا أَوْ رَاحَ إِلَى الْمَسْجِدِ، لاَ يُرِيدُ غَيْرَهُ، لِيَتَعَلَّمَ خَيْرًا أَوْ لِيُعَلِّمَهُ، ثُمَّ رَجَعَ إِلَى بَيْتِهِ، كَانَ كَالْمُجَاهِدِ فِي سَبِيلِ اللهِ، رَجَعَ غَانِمًا[2].

واتە: ئەبو بەکری کوڕی عەبدوڕڕەحمان ﷺ هەموو جار دەیگوت: هەر کەسێك لە دانی بەیانی یان دانی ئێوارە بڕوات بۆ مزگەوت، مەبەستی (لە دەرچوونەکە) جگە لە مزگەوت هیچ شتێك نەبێت (تەنها مەبەستی مزگەوت بێت)، بۆ ئەوەی فێری چاکەیەك بێت یان چاکەیەك فێری خەڵکی بکات، دواتر بگەڕێتەوە بۆ ماڵەوە، ئەوە وەك سوارچاکێکی تێکۆشەر وایە لە پێناوی خوا کە دەگەڕێتەوە بە دەستکەوتەوە.

٤٤٤- عَنْ نُعَيْمِ بْنِ عَبْدِ اللهِ الْمُجْمِرِ ﷺ، أَنَّهُ سَمِعَ أَبَا هُرَيْرَةَ ﷺ يَقُولُ: إِذَا صَلَّى أَحَدُكُمْ، ثُمَّ جَلَسَ فِي مُصَلاَّهُ، لَمْ تَزَلِ الْمَلاَئِكَةُ تُصَلِّي عَلَيْهِ: اللهُمَّ اغْفِرْ لَهُ، اللهُمَّ ارْحَمْهُ، فَإِنْ قَامَ مِنْ مُصَلاَّهُ، فَجَلَسَ فِي الْمَسْجِدِ يَنْتَظِرُ الصَّلاَةَ، لَمْ يَزَلْ فِي صَلاَةٍ حَتَّى يُصَلِّيَ[3].

واتە: لە نوعەیمی کوڕی عەبدوڵڵای موجمیر ﷺ گێڕدراوەتەوە بەوەی گوێی لە ئەبو هورەیرە ﷺ بووە دەیگوت: کاتێ یەکێك لە ئێوە نوێژ دەکات، دواتر لە

---

(١) ـ صحيح. أخرجه أبو مصعب الزهري: ٥٢٨؛ والحدثاني: ١٧١؛ وابن حنبل: ١٠٣١٣؛ ومسلم: ٢٧٥؛ وأبو داود: ٤٧٠؛ والقابسي: ٣٢٩، كلهم عن مالك به.

(٢) ـ مقطوع صحيح. أخرجه أبو مصعب الزهري: ٥٢٩؛ والحدثاني: ١٧١؛ والشيباني: ٩٥، كلهم عن مالك به.

(٣) ـ صحيح. أخرجه أبو مصعب الزهري: ٥٣٠؛ والحدثاني: ١٧١؛ والشيباني: ٢٩٥، كلهم عن مالك به.

شوێنی نوێژکردنەکەی دادەنیشێ، بەردەوام فریشتەکان نزای بۆ دەکەن (دەڵێن): پەروەردگارا لێی خۆش بە، پەروەردگارا بەزەیی لەگەڵ بنوێنە، جا ئەگەر هەڵسا لە شوێنی نوێژکردنەکەی و لە مزگەوت دانیشت چاوەڕێی نوێژی کرد، هەر بەردەوام لە نوێژکردندایە تا ئەو نوێژە دەکات کە چاوەڕێی دەکات (واتە چاوەڕوانی نوێژکردن پاداشتەکەی وەك پاداشتی ناو نوێژ وایە).

**٤٤٥- عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ ﷺ، أَنَّ رَسُولَ اللهِ ﷺ قَالَ: أَلاَ أُخْبِرُكُمْ بِمَا يَمْحُو اللهُ بِهِ الْخَطَايَا، وَيَرْفَعُ بِهِ الدَّرَجَاتِ؟ إِسْبَاغُ الْوُضُوءِ عِنْدَ الْمَكَارِهِ، وَكَثْرَةُ الْخُطَا إِلَى الْمَسَاجِدِ، وَانْتِظَارُ الصَّلاَةِ بَعْدَ الصَّلاَةِ، فَذَلِكُمُ الرِّبَاطُ، فَذَلِكُمُ الرِّبَاطُ، فَذَلِكُمُ الرِّبَاطُ[١].**

واتە: لە ئەبو هورەیرەوە ﷺ گێردراوەتەوە (گوتوویەتی): پێغەمبەری خوا ﷺ فەرموویەتی: ئایا ئەو شتەتان پێ ڕانەگەیەنم کە خوای پەروەردگار تاوانەکانی پێ دەسڕێتەوە و پلەکانی پێ بەرز دەکاتەوە؟ (ئەمانەن): جوان شۆردنی دەستنوێژ لە حاڵەتە ناخۆشەکاندا (سەرما، نەخۆشی و سەفەر و ... هتد)، وە زۆر هەنگاونان بۆ مزگەوت (واتە: زۆر هاموشۆکردنی مزگەوت)، وە چاوەڕوانیکردنی نوێژ لەدوای نوێژ، هەر ئەوانە ڕیبات و خۆپەیوەستکردن و بەردەوامین، هەر ئەوانە خۆپەیوەستکردن و بەردەوامین، هەر ئەوانە خۆپەیوەستکردن و بەردەوامین[٢].

**٤٤٦- أَنَّ سَعِيدَ بْنَ الْمُسَيَّبِ ﷺ قَالَ: يُقَالُ: لاَ يَخْرُجُ أَحَدٌ مِنَ الْمَسْجِدِ بَعْدَ النِّدَاءِ، إِلاَّ أَحَدٌ يُرِيدُ الرُّجُوعَ إِلَيْهِ، إِلاَّ مُنَافِقٌ[٣].**

واتە: سەعیدی کوڕی موسەیەب ﷺ گوتوویەتی: دەگوترێ: کەس دەرناچێت لە مزگەوت دوای بانگدان ـ تەنها کەسێك نەبێت (حاڵەتێکی زەروری بۆ ڕوو

---

(١) ـ صحيح. أخرجه أبو مصعب الزهري: ٧٧؛ وابن حنبل: ٧٧١٥، وفي: ٨٠٠٨؛ والنسائي: ١٤٣؛ وابن حبان: ١٠٣٨؛ والقابسي: ١٣٤، كلهم عن مالك به.

(٢) ـ تێبینی: وشەی «الرباط» بۆ ئەوە بەکاردێت کاتێك مرۆڤ خۆی بە شتێکەوە پابەند دەکات، بۆیە کەسی موجاهیدی تێکۆشەر لە پێناوی خوا ﷻ پێی دەگوترێ «مُرابِط» چونکە «رباط» و خۆپابەندکردن ئەنجام دەدات بۆ پاراستنی ئیسلام و مسوڵمانان، بەڵام لێرەدا بە مانای بەردەوامی دێت لەسەر پەرستش و نوێژ.

(٣) ـ مقطوع ضعيف.




بدات و بڕوات) و مەبەستی گەڕانەوەی هەبێت ـ تەنها مونافیق نەبێت (بێ هۆکار دەردەچێ).

**٤٤٧**ـ عَنْ أَبِي قَتَادَةَ الأَنْصَارِيِّ ﵁، أَنَّ رَسُولَ اللهِ ﷺ قَالَ: إِذَا دَخَلَ أَحَدُكُمُ الْمَسْجِدَ، فَلْيَرْكَعْ رَكْعَتَيْنِ، قَبْلَ أَنْ يَجْلِسَ[1].

واتە: لە ئەبو قەتادەی ئەنصارییەوە ﵁ گێردراوەتەوە (گوتوویەتی): پێغەمبەری خوا ﷺ فەرموویەتی: ئەگەر یەکێك لە ئێوە هاتە ژوورەوە بۆ مزگەوت، ئەوە با پێش ئەوەی دابنیشێت دوو ڕکات نوێژ بکات.

**٤٤٨**ـ عَنْ أَبِي النَّضْرِ، مَوْلَى عُمَرَ بْنِ عُبَيْدِ اللهِ ﵀، عَنْ أَبِي سَلَمَةَ بْنِ عَبْدِ الرَّحْمَنِ ﵀، أَنَّهُ قَالَ لَهُ: أَلَمْ أَرَ صَاحِبَكَ إِذَا دَخَلَ الْمَسْجِدَ يَجْلِسُ قَبْلَ أَنْ يَرْكَعَ؟ قَالَ أَبُو النَّضْرِ: يَعْنِي بِذَلِكَ عُمَرَ بْنَ عُبَيْدِ اللهِ، وَيَعِيبُ ذَلِكَ عَلَيْهِ، أَنْ يَجْلِسَ إِذَا دَخَلَ الْمَسْجِدَ قَبْلَ أَنْ يَرْكَعَ[2].

قَالَ يَحْيَى ﵀: قَالَ مَالِكٌ ﵀: وَذَلِكَ حَسَنٌ، وَلَيْسَ بِوَاجِبٍ.

واتە: لە ئەبو نەزری خزمەتکاری عومەری کوڕی عوبەیدوڵڵاوە ﵀ گێردراوەتەوە، ئەویش لە ئەبو سەلەمەی کوڕی عەبدوڕڕەحمانەوە ﵀ گێڕاویەتەوە بەوەی پێی گوتووە: مەگەر نابینم هاوەڵەکەت کاتێ دێتە ناو مزگەوت دادەنیشێت پێش ئەوەی نوێژ بکات؟ ئەبو نەزر دەڵێ: مەبەستی پێ عومەری کوڕی عوبەیدوڵایە ڕەخنەی لێ دەگرێ لەوەی دابنیشێ بەر لەوەی نوێژ بکات کاتێ دێتە ناو مزگەوت.

یەحیا ﵀ گوتوویەتی: ئیمامی مالیك ﵀ گوتوویەتی: ئەو کارە (واتە نوێژکردن لە کاتی هاتنە ناو مزگەوت) شتێکی چاکە، بەڵام واجب نییە.

---

(١) ـ صحيح. أخرجه أبو مصعب الزهري: ٥٣٣؛ والشيباني: ٢٧٦؛ وابن حنبل: ٢٢٦٣١؛ والبخاري: ٤٤٤؛ ومسلم: ٦٩؛ والنسائي: ٧٣٠؛ وأبو داود: ٤٦٧؛ والترمذي: ٣١٦؛ وابن ماجه: ٩٩٩؛ وابن حبان: ٢٤٩٧؛ والدارمي: ١٣٩٣؛ والقابسي: ٣٩٩، كلهم عن مالك به.

(٢) ـ مقطوع صحيح. أخرجه أبو مصعب الزهري: ٥٣٤؛ والحدثاني: ١٧٣، كلهم عن مالك به.





## ١٩- دانانی دەستەکان لەسەر ئەو بەشەی ڕوخساری لەسەر دادەندرێت لە سوژدەدا[١]

٤٤٩- عَنْ نَافِعٍ ﷺ، أَنَّ عَبْدَ اللهِ بْنَ عُمَرَ ﷺ كَانَ إِذَا سَجَدَ، وَضَعَ كَفَّيْهِ عَلَى الَّذِي يَضَعُ عَلَيْهِ وَجْهَهُ[٢].

قَالَ نَافِعٌ ﷺ، وَلَقَدْ رَأَيْتُهُ فِي يَوْمٍ شَدِيدِ الْبَرْدِ، وَإِنَّهُ لَيُخْرِجُ كَفَّيْهِ مِنْ تَحْتِ بُرْنُسٍ لَهُ حَتَّى يَضَعَهُمَا عَلَى الْحَصْبَاءِ.

واتە: لە نافیعەوە ﷺ گێڕدراوەتەوە (گوتوویەتی): عەبدوڵڵای کوڕی عومەر ﷺ هەموو جار کاتێ سوژدەی ببردایە، دەستەکانی لەسەر ئەو بەشە دادەنا کە ڕوخساری لەسەر داناوە.

نافیع ﷺ گوتوویەتی: بەدڵنیاییی من بینیومە لە ڕۆژی زۆر سارد دەستەکانی لەژێر ڕۆبەکەی خۆی دەردەهێنا تاوەکوو دایانبنێت لەسەر وردەبەردەکان (کە نوێژی لەسەر دەکردن و ناوچەوانی لەسەر دادەنا).

٤٥٠- أَنَّ عَبْدَ اللهِ بْنَ عُمَرَ ﷺ كَانَ يَقُولُ: مَنْ وَضَعَ جَبْهَتَهُ بِالأَرْضِ، فَلْيَضَعْ كَفَّيْهِ عَلَى الَّذِي يَضَعُ عَلَيْهِ جَبْهَتَهُ، ثُمَّ إِذَا رَفَعَ، فَلْيَرْفَعْهُمَا، فَإِنَّ الْيَدَيْنِ تَسْجُدَانِ كَمَا يَسْجُدُ الْوَجْهُ[٣].

واتە: عەبدوڵڵای کوڕی عومەر ﷺ دەیگوت: هەر کەسێك (لە نوێژدا) ناوچەوانی لەسەر زەوی دانا، ئەوە با دوو دەستەکانیشی لەسەر ئەو بەشە دابنێ کە ناوچەوانی لەسەر داناوە، دواتر کاتێ (لە نێوان سوژدەکان) هەڵسایەوە، با هەردوو دەستەکانیشی بەرز بکاتەوە، چونکە دوو دەستەکانیش سوژدە دەبەن وەك چۆن ڕوخسار سوژدە دەبات (کەواتە ئەگەر دەستەکانیشی هەڵنەگرێتەوە ئەوە دەکا لە سوژدە هەڵنەستاوەتەوە).

---

(١) ـ وَضْعُ الْيَدَيْنِ عَلىَ مَا يُوضَعُ عَلَيْهِ الْوَجْهُ فِي السُّجُودِ.

(٢) ـ صحيح. أخرجه أبو مصعب الزهري: ٥٣٥؛ والحدثاني: ١٧٤؛ والشيباني: ١٤٩، كلهم عن مالك به.

(٣) ـ صحيح. أخرجه أبو مصعب الزهري: ٥٣٦؛ والحدثاني: ١٧٤؛ والشيباني: ١٥٠، كلهم عن مالك به.

## ٢٠- ئاوڕدانەوە و چەپڵەلێدان لەناو نوێژدا لە کاتی پێویستی[١]

**٤٥١**- عَنْ سَهْلِ بْنِ سَعْدٍ السَّاعِدِيِّ ﷺ، أَنَّ رَسُولَ اللهِ ﷺ ذَهَبَ إِلَى بَنِي عَمْرِو بْنِ عَوْفٍ لِيُصْلِحَ بَيْنَهُمْ، وَحَانَتِ الصَّلاَةُ، فَجَاءَ الْمُؤَذِّنُ إِلَى أَبِي بَكْرٍ الصِّدِّيقِ ﷺ، فَقَالَ: أَتُصَلِّي لِلنَّاسِ فَأُقِيمَ؟ قَالَ: نَعَمْ، فَصَلَّى أَبُو بَكْرٍ، فَجَاءَ رَسُولُ اللهِ ﷺ، وَالنَّاسُ فِي الصَّلاَةِ، فَتَخَلَّصَ حَتَّى وَقَفَ فِي الصَّفِّ، فَصَفَّقَ النَّاسُ، وَكَانَ أَبُو بَكْرٍ لاَ يَلْتَفِتُ فِي صَلاَتِهِ، فَلَمَّا أَكْثَرَ النَّاسُ مِنَ التَّصْفِيقِ، الْتَفَتَ أَبُو بَكْرٍ، فَرَأَى رَسُولَ اللهِ ﷺ، فَأَشَارَ إِلَيْهِ رَسُولُ اللهِ ﷺ أَنِ امْكُثْ مَكَانَكَ، فَرَفَعَ أَبُو بَكْرٍ ﷺ يَدَيْهِ، فَحَمِدَ اللهَ عَلَى مَا أَمَرَهُ بِهِ رَسُولُ اللهِ ﷺ مِنْ ذَلِكَ، ثُمَّ اسْتَأْخَرَ حَتَّى اسْتَوَى فِي الصَّفِّ، وَتَقَدَّمَ رَسُولُ اللهِ ﷺ فَصَلَّى، ثُمَّ انْصَرَفَ، فَقَالَ: يَا أَبَا بَكْرٍ، مَا مَنَعَكَ أَنْ تَثْبُتَ إِذْ أَمَرْتُكَ، فَقَالَ أَبُو بَكْرٍ: مَا كَانَ لاِبْنِ أَبِي قُحَافَةَ، أَنْ يُصَلِّيَ بَيْنَ يَدَيْ رَسُولِ اللهِ ﷺ، فَقَالَ رَسُولُ اللهِ ﷺ: مَا لِي رَأَيْتُكُمْ أَكْثَرْتُمْ مِنَ التَّصْفِيحِ؟ مَنْ نَابَهُ شَيْءٌ فِي صَلاَتِهِ فَلْيُسَبِّحْ، فَإِنَّهُ إِذَا سَبَّحَ الْتُفِتَ إِلَيْهِ، وَإِنَّمَا التَّصْفِيحُ لِلنِّسَاءِ[٢].

واتە: لە سەهلی کوڕی سەعدی ساعیدییەوە ﷺ گێڕدراوەتەوە (گوتوویەتی): پێغەمبەری خوا ﷺ ڕۆیشت بۆ لای بەنو عەمری کوڕی عەوف تاوەکوو صوڵح و ئاشتەواییەکیان لە نێواندا بکات، جا کاتی نوێژیش هات و بانگبێژ هات بۆ لای ئەبو بەکری صدیق ﷺ و گوتی: ئایا نوێژ بۆ خەڵکی دەکەی (لە شوێنی پێغەمبەر ﷺ) تا قامەت بکەم؟ گوتی: بەڵێ، جا ئەبو بەکر ﷺ دەستی بە نوێژ کرد، پێغەمبەری خواش ﷺ هاتەوە لە کاتێکدا خەڵك لەناو نوێژدا بوون، ڕیزەکانی بڕی هەتا لە ڕیزی یەکەم وەستا، جا خەڵکی چەپڵەیان لێ دا (بۆ ئاگادارکردنەوەی ئیمامی ئەبو بەکر ـ ﷺ ـ)، ئەبو بەکریش ﷺ عادەتی وابوو لە نوێژدا ئاوڕی نەدەدایەوە، جا کە خەڵکی زیاد چەپڵەیان لێ دا ئەبو بەکر ﷺ ئاوڕی دایەوە و پێغەمبەری خوای ﷺ بینی، پێغەمبەری خواش ﷺ ئاماژەی بۆ کرد لە شوێنی خۆی بمێنێتەوە، جا ئەبو بەکر ـ ﷺ ـ (لەناو نوێژدا) دەستەکانی بەرز کردەوە و ستاییشی خوای کرد

---

(١) ـ الِالْتِفَاتُ وَالتَّصْفِيقُ عِنْدَ الْحَاجَةِ فِي الصَّلَاةِ.

(٢) ـ صحيح. أخرجه أبو مصعب الزهري: ٥٣٧؛ والحدثاني: ١٧٥؛ والشافعي: ٢٠٢؛ وفي: ٢٢٨؛ وابن حنبل: ٢٢٩٠٣؛ والبخاري: ٦٨٤؛ ومسلم: ١٠٢؛ وأبو داود: ٩٤٠؛ وابن حبان: ٢٢٦٠؛ والقابسي: ٤٠٨، كلهم عن مالك به.

لەسەر ئەو فەرمانەی کە پێغەمبەری خوا ﷺ پێی کرد (بەوەی پێی ڕازییە بە ئیمام بمێنێتەوە)، دواتر هاتە دواوە تا خۆی ڕاست کرد لەگەڵ ڕیزەکە، پێغەمبەری خواش ﷺ چووە پێشەوە و نوێژی بۆ خەڵکی کرد، دواتر سەلامی دایەوە و فەرمووی: ئەی ئەبو بەکر چی قەدەغەی کردی لەوەی لە شوێنی خۆت بمێنیتەوە لە کاتێکدا فەرمانم کرد بمێنیتەوە؟ ئەبو بەکریش ﷺ گوتی: بۆ کوڕی ئەبو قوحافە نییە لەپێش پێغەمبەری خوا ﷺ نوێژ بکات، پێغەمبەری خواش ﷺ (بە خەڵکی) فەرموو: بۆچی بینیم زۆر چەپڵەتان لێ دا؟ هەر کەسێك لە نوێژەکەیدا ئاگادارییەکی دا با «سبحان الله» بکات، چونکە ئەگەر «سبحان الله»ی کرد ئاوڕی بۆ دەدرێتەوە، چەپڵەلێدان تەنها بۆ ئافرەتانە (واتە لەو حاڵەتانە تایبەتە بە ئافرەتان، وەك لە فەرموودەی دیکەدا هاتووە کە ئافرەتان لە نوێژدا دەبێ بەچەپڵە ئاگاداری بدەن، بۆ پیاوانیش «سبحان الله»).

**٤٥٢- عَنْ نَافِعٍ ﷺ، أَنَّ ابْنَ عُمَرَ ﷺ لَمْ يَكُنْ يَلْتَفِتُ فِي صَلاَتِهِ[١].**

واتە: لە نافیعەوە ﷺ گێڕدراوەتەوە (گوتوویەتی): ئیبنو عومەر ﷺ لە نوێژدا ئاوڕی نەدەدایەوە.

**٤٥٣- عَنْ أَبِي جَعْفَرٍ الْقَارِئِ ﷺ، أَنَّهُ قَالَ: كُنْتُ أُصَلِّي وَعَبْدُ اللهِ بْنُ عُمَرَ ﷺ وَرَائِي، وَلاَ أَشْعُرُ، فَالْتَفَتُّ فَغَمَزَنِي[٢].**

واتە: لە ئەبو جەعفەری قاریئەوە ﷺ گێڕدراوەتەوە گوتوویەتی: من نوێژم دەکرد لە کاتێکدا عەبدوڵڵای کوڕی عومەر ﷺ لەدواوەم بوو و ئاگام لێ نەبوو، جا ئاوڕم دایەوە و (پشتەملی) گوشیم (واتە لەبەر ئاوڕدانەوەکە بەم شێوەیە نەهی لێ کردم).

---

(١) ـ صحيح. أخرجه الحدثاني: ١٧٥، عن مالك به.

(٢) ـ صحيح. أخرجه أبو مصعب الزهري: ٥٣٩؛ والحدثاني: ١٧٥، كلهم عن مالك به.

## ٢١- ئەو کەسەی کە دێت لە کاتێکدا ئیمام ڕکوعی بردووە، چی دەکات؟[١]

**٤٥٤-** عَنْ أَبِي أُمَامَةَ بْنِ سَهْلِ بْنِ حُنَيْفٍ ﵀ أَنَّهُ قَالَ: دَخَلَ زَيْدُ بْنُ ثَابِتٍ ﵁ الْمَسْجِدَ، فَوَجَدَ النَّاسَ رُكُوعًا فَرَكَعَ، ثُمَّ دَبَّ حَتَّى وَصَلَ الصَّفَّ[٢].

واتە: لە ئەبو ئومامەی کوڕی سەهلی کوڕی حونەیفەوە ﵀ گێڕدراوەتەوە گوتوویەتی: زەیدی کوڕی سابیت ﵁ هات بۆ ناو مزگەوت، جا بینی خەڵك ڕکوعیان بردووە، ئەویش (بەر لەوەی بچێتە ناو ڕیزەکە بۆ ئەوەی ڕکاتەکەی لەکیس نەچێت) ڕکوعی برد، دواتر (هەر بەڕکوعەوە) ڕۆیشت تا گەیشتە ناو ڕیزەکە.

**٤٥٥-** أَنَّ عَبْدَ اللهِ بْنَ مَسْعُودٍ ﵁ كَانَ يَدِبُّ رَاكِعًا[٣].

واتە: عەبدوڵلای کوڕی مەسعود ﵁ (کاتێ بیزانیایە ئەگەر تا دەگاتە ناو ڕیزی نوێژ ڕکاتەکەی لەدەست دەچێ، ئەوە لە پێشتر ڕکوعی دەبرد) و بەڕکوعەوە دەڕۆیشت (تا خۆی دەگەیاندە ناو ڕیزەکەوە).

## ٢٢- ئەوەی هاتووە دەربارەی صەڵاوەتدان لەسەر پێغەمبەر ﷺ (لە تەحیاتدا)[٤]

**٤٥٦-** عَنْ عَمْرِو بْنِ سُلَيْمٍ الزُّرَقِيِّ ﵀، أَنَّهُ قَالَ: أَخْبَرَنِي أَبُو حُمَيْدٍ السَّاعِدِيُّ ﵁ أَنَّهُمْ قَالُوا: يَا رَسُولَ اللهِ، كَيْفَ نُصَلِّي عَلَيْكَ؟ فَقَالَ: قُولُوا: اللهُمَّ صَلِّ عَلَى مُحَمَّدٍ، وَأَزْوَاجِهِ، وَذُرِّيَّتِهِ، كَمَا صَلَّيْتَ عَلَى آلِ إِبْرَاهِيمَ، وَبَارِكْ عَلَى مُحَمَّدٍ، وَأَزْوَاجِهِ، وَذُرِّيَّتِهِ، كَمَا بَارَكْتَ عَلَى آلِ إِبْرَاهِيمَ، إِنَّكَ حَمِيدٌ مَجِيدٌ[٥].

---

(١) ـ مَا يَفْعَلُ مَنْ جَاءَ وَالإِمَامُ رَاكِعٌ.

(٢) ـ صحيح. أخرجه أبو مصعب الزهري: ٥٤٩؛ والحدثاني: ١٧٩؛ والشيباني: ٢٨٥، كلهم عن مالك به.

(٣) ـ صحيح. أخرجه أبو مصعب الزهري: ٥٥٠؛ والحدثاني: ١٧٩، كلهم عن مالك به.

(٤) ـ مَا جَاءَ فِي الصَّلَاةِ عَلَىَ النَّبِيِّ صَلى الله عَلَيهِ وَسَلمَ.

(٥) ـ صحيح. أخرجه أبو مصعب الزهري: ٥٠٤؛ والشيباني: ٢٩٢؛ وابن حنبل: ٢٣٦٤٨؛ والبخاري: ٣٣٦٩، وفي:




واتە: لە عەمری کوڕی سولەیمی زوڕقییەوە ﷺ گێڕدراوەتەوە گوتوویەتی: ئەبو حومەیدی ساعیدی ﷺ هەواڵی پێداوم بەوەی ئەوان (پرسیاریان لە پێغەمبەری خوا ﷺ کردووە و) گوتوویانە: ئەی پێغەمبەری خوا ﷺ چۆن صەڵاوەتت لەسەر لێ بدەین (واتە چۆن نزای ڕەحمەتت بۆ بکەین)؟ ئەویش فەرمووی: بڵێن: ((اللهُمَّ صَلِّ عَلَى مُحَمَّدٍ، وَأَزْوَاجِهِ، وَذُرِّيَّتِهِ، كَمَا صَلَّيْتَ عَلَى آلِ إِبْرَاهِيمَ، وَبَارِكْ عَلَى مُحَمَّدٍ، وَأَزْوَاجِهِ، وَذُرِّيَّتِهِ، كَمَا بَارَكْتَ عَلَى آلِ إِبْرَاهِيمَ، إِنَّكَ حَمِيدٌ مَجِيدٌ)) واتە: ((پەروەردگارا ڕەحمەت بڕژێنە سەر موحەممەد ﷺ و خێزانەکانی و وەچەکانی، هەروەك ڕەحمەتت ڕژاند بەسەر خانەوادەی ئیبراهیم ﷺ، وە فەڕ و بەرەکەت بڕژێنە بەسەر موحەممەد ﷺ و خێزانەکانی و وەچەکانی، هەروەك فەڕ و بەرەکەتت ڕژاند بەسەر خانەوادەی ئیبراهیم ﷺ، بەڕاستی تۆ ستایشکراو و بەرز و خاوەنشکۆی)).

**٤٥٧-** عَنْ أَبِي مَسْعُودٍ الأَنْصَارِيِّ ﷺ، أَنَّهُ قَالَ: أَتَانَا رَسُولُ اللهِ ﷺ فِي مَجْلِسِ سَعْدِ بْنِ عُبَادَةَ ﷺ، فَقَالَ لَهُ بَشِيرُ بْنُ سَعْدٍ ﷺ: أَمَرَنَا اللهُ أَنْ نُصَلِّيَ عَلَيْكَ يَا رَسُولَ اللهِ، فَكَيْفَ نُصَلِّي عَلَيْكَ؟ قَالَ: فَسَكَتَ رَسُولُ اللهِ ﷺ، حَتَّى تَمَنَّيْنَا أَنَّهُ لَمْ يَسْأَلْهُ، ثُمَّ قَالَ: قُولُوا: اللهُمَّ صَلِّ عَلَى مُحَمَّدٍ وَعَلَى آلِ مُحَمَّدٍ، كَمَا صَلَّيْتَ عَلَى إِبْرَاهِيمَ، وَبَارِكْ عَلَى مُحَمَّدٍ وَعَلَى آلِ مُحَمَّدٍ، كَمَا بَارَكْتَ عَلَى آلِ إِبْرَاهِيمَ، فِي الْعَالَمِينَ، إِنَّكَ حَمِيدٌ مَجِيدٌ، وَالسَّلَامُ كَمَا قَدْ عَلِمْتُمْ[1].

واتە: لە ئەبو مەسعودی ئەنصارییەوە ﷺ گێڕدراوەتەوە گوتوویەتی: پێغەمبەری خوا ﷺ هات بۆ لامان لە (دیوەخان و) دانیشتگای سەعدی کوڕی عوبادە ﷺ، جا بەشیری کوڕی سەعد ﷺ گوتی: ئەی پێغەمبەری خوا ﷺ خوا فەرمانی پێ کردووین نزای ڕەحمەتت بۆ بکەین و صەڵاوەتت لەسەر لێ بدەین، جا چۆن صەڵاوەتت لەسەر لێ بدەین؟ دەڵێ: جا پێغەمبەری خوا ﷺ بێدەنگ بوو، تا ئاواتمان خواست خۆزگە پرسیاری لێ نەکردبا، دواتر فەرمووی: بڵێن: ((اللهُمَّ صَلِّ

---

٦٣٦٠؛ ومسلم: ٦٩؛ وأبو داود: ٩٧٩؛ وابن ماجه: ٨٩٢؛ والقابسي: ٣١٣، كلهم عن مالك به.

(١) ـ صحيح. أخرجه أبو مصعب الزهري: ٥٠٥؛ والحدثاني: ١٦٣؛ والشيباني: ٢٩٣؛ وابن حنبل: ١٧١٠٨، وفي: ٢٢٤٠٦، وفي: ٢٢٤٠٦؛ ومسلم: ٦٥؛ والنسائي: ١٢٨٥؛ وأبو داود: ٩٨٠؛ والترمذي: ٣٢٢٠؛ وابن حبان: ١٩٥٨، وفي: ١٩٦٥؛ والدارمي: ١٣٤٣؛ والقابسي: ٢٦٨، كلهم عن مالك به.




عَلَى مُحَمَّدٍ وَعَلَى آلِ مُحَمَّدٍ، كَمَا صَلَّيْتَ عَلَى إِبْرَاهِيمَ، وَبَارِكْ عَلَى مُحَمَّدٍ وَعَلَى آلِ مُحَمَّدٍ، كَمَا بَارَكْتَ عَلَى آلِ إِبْرَاهِيمَ، فِي الْعَالَمِينَ، إِنَّكَ حَمِيدٌ مَجِيدٌ)) واتە: ((پەروەردگارا ڕەحمەت بڕژێنە سەر موحەممەد ﷺ و سەر خانەوادەی موحەممەد ﷺ، هەروەك ڕەحمەتت ڕژاندە سەر ئیبراهیم ﷺ، وە فەڕ و بەرەکەت بڕژێنە سەر موحەممەد ﷺ و سەر خانەوادەی موحەممەد ﷺ، هەروەك فەڕ و بەرەکەتت ڕژاندە سەر خانەوادەی ئیبراهیم ﷺ، لەناو دروستکراوەکان ستایشکراو و بەرزی))، جا سەلام بدەنەوە وەك چۆن فێربوون و دەیزانن.

٤٥٨- عَنْ عَبْدِ اللهِ بْنِ دِينَارٍ ﷺ، أَنَّهُ قَالَ: رَأَيْتُ عَبْدَ اللهِ بْنَ عُمَرَ ﷺ يَقِفُ عَلَى قَبْرِ النَّبِيِّ ﷺ، فَيُصَلِّي عَلَى النَّبِيِّ ﷺ، وَعَلَى أَبِي بَكْرٍ، وَعُمَرَ[١].

واتە: لە عەبدوڵڵای کوڕی دینارەوە ﷺ گێڕدراوەتەوە گوتوویەتی: عەبدوڵڵای کوڕی عومەرم ﷺ بینی لەلای گۆڕی پێغەمبەری خوا ﷺ وەستابوو، نزای ڕەحمەتی کرد و صەڵاوەتی دا لەسەر پێغەمبەری خوا ﷺ و ئەبو بەکر و عومەر ﷺ.

## ٢٣- بابەتی جۆراوجۆری پەیوەست بە کرداری نوێژ[٢]

٤٥٩- عَنِ ابْنِ عُمَرَ ﷺ: أَنَّ رَسُولَ اللهِ ﷺ كَانَ يُصَلِّي قَبْلَ الظُّهْرِ رَكْعَتَيْنِ، وَبَعْدَهَا رَكْعَتَيْنِ، وَبَعْدَ الْمَغْرِبِ رَكْعَتَيْنِ فِي بَيْتِهِ، وَبَعْدَ صَلاَةِ الْعِشَاءِ رَكْعَتَيْنِ، وَكَانَ لاَ يُصَلِّي بَعْدَ الْجُمُعَةِ حَتَّى يَنْصَرِفَ، فَيَرْكَعَ رَكْعَتَيْنِ[٣].

واتە: لە ئیبنو عومەرەوە ﷺ گێڕدراوەتەوە (گوتوویەتی): پێغەمبەری خوا ﷺ هەموو جار دوو ڕکات سوننەتی لە پێش نوێژی نیوەڕۆ دەکرد، دوو ڕکاتیشی لەدواوەی دەکرد، وە دوو ڕکاتیشی لەدوای مەغریب دەکرد لە ماڵەوەی، وە دوو

---

(١) ـ صحيح. أخرجه أبو مصعب الزهري: ٥٠٦؛ والحدثاني: ١٦٣، كلهم عن مالك به.

(٢) ـ الْعَمَلُ فِي جَامِعِ الصَّلاَةِ.

(٣) ـ صحيح. أخرجه أبو مصعب الزهري: ٥٥١؛ والحدثاني: ١٧٩؛ والشيباني: ٢٩٦؛ وابن حنبل: ٥٢٩٦، وفي: ٥٦٠٣؛ والبخاري: ٩٣٧؛ ومسلم: ٧١؛ والنسائي: ٨٧٣، وفي: ١٤٢٧؛ وأبو داود: ١٢٥٢؛ والدارمي: ١٤٣٧، وفي: ١٥٧٣؛ والقابسي: ٢٠٠، كلهم عن مالك به.

ڕکاتیشی لەدوای عیشا دەکرد، وە دوای نوێژی هەینی سوننەتی نەدەکرد تا لە مزگەوت دەگەڕایەوە بۆماڵەوە، ئینجا (لە ماڵەوە) دوو ڕکاتی دەکرد.

**٤٦٠- عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ ﷺ، أَنَّ رَسُولَ اللهِ ﷺ قَالَ: أَتَرَوْنَ قِبْلَتِي هَاهُنَا؟ فَوَاللَّهِ مَا يَخْفَى عَلَيَّ خُشُوعُكُمْ وَلاَ رُكُوعُكُمْ، إِنِّي لأَرَاكُمْ مِنْ وَرَاءِ ظَهْرِي[1].**

واتە: لە ئەبو هورەیرەوە ﷺ گێردراوەتەوە (گوتوویەتی): پێغەمبەری خوا ﷺ فەرموویەتی: ئایا گومان دەبەن تەنها ڕووم لەو لایە بێ (واتە وا دەزانن لەناو نوێژدا تەنها لای قیبلە دەبینم)؟ دە سوێند بە خوا هیچ لە سوژدە و ڕکوعی ئێوەم لەلا ون نابێ، من لەدواوەش دەتانبینم.

**٤٦١- عَنْ عَبْدِ اللهِ بْنِ عُمَرَ ﷺ؛ أَنَّ رَسُولَ اللهِ ﷺ كَانَ يَأْتِي قُبَاءَ رَاكِبًا وَمَاشِيًا[2].**

واتە: لە عەبدوڵڵای کوڕی عومەرەوە ﷺ گێردراوەتەوە (گوتوویەتی): پێغەمبەری خوا ﷺ هەموو جار دەهات بۆ (مزگەوتی) قوباء بەسواری و بەپیادە.

**٤٦٢- عَنِ النُّعْمَانِ بْنِ مُرَّةَ ﷺ، أَنَّ رَسُولَ اللهِ ﷺ قَالَ: مَا تَرَوْنَ فِي الشَّارِبِ، وَالسَّارِقِ، وَالزَّانِي؟ وَذَلِكَ قَبْلَ أَنْ يُنْزَلَ فِيهِمْ، قَالُوا: اللهُ وَرَسُولُهُ أَعْلَمُ، قَالَ: هُنَّ فَوَاحِشُ، وَفِيهِنَّ عُقُوبَةٌ، وَأَسْوَأُ السَّرِقَةِ الَّذِي يَسْرِقُ صَلاَتَهُ، قَالُوا: وَكَيْفَ يَسْرِقُ صَلاَتَهُ يَا رَسُولَ اللهِ؟ قَالَ: لاَ يُتِمُّ رُكُوعَهَا وَلاَ سُجُودَهَا[3].**

واتە: لە نوعمانی کوڕی موڕەوە ﷺ گێردراوەتەوە (گوتوویەتی): پێغەمبەری خوا ﷺ فەرموویەتی: بۆچوونتان چییە و چی دەڵێن دەربارەی ئارەقخۆر و دز و داوێنپیس؟ جا ئەمە پێش دابەزینی سزا و حوکم بوو دەربارەیان، گوتیان: خوا ﷻ و پێغەمبەرەکەی ﷺ زاناترن، فەرمووی: ئەو کارانە کاری بەدن، وە سزایان تیایە، وە خراپترین دزی بریتییە لە دزی ئەو کەسەی کە دزی لە نوێژەکەی خۆی دەکات،

---

(١) ـ صحيح. أخرجه أبو مصعب الزهري: ٥٥٢؛ والحدثاني: ١٧٩؛ وابن حنبل: ٨٠١١، وفي: ٨٨٦٤؛ والبخاري: ٤١٨، وفي: ٧٤١؛ ومسلم: ١٠٩؛ وابن حبان: ٦٣٣٧؛ والقابسي: ٣٢٨، كلهم عن مالك به.

(٢) ـ صحيح. أخرجه الحدثاني: ١٧٩؛ وابن حنبل: ٥٣٣٠؛ والقابسي: ٢٧٩، كلهم عن مالك به.

(٣) ـ صحيح لغيره. أخرجه أبو مصعب الزهري: ٥٥٤؛ والحدثاني: ١٨٠؛ والشافعي: ٧٩٥، كلهم عن مالك به.

گوتیان: چۆن دزی لە نوێژەکەی دەکات ئەی پێغەمبەری خوا ﷺ؟ فەرمووی: نە ڕکوع و نە سوژدەی نوێژەکە بەتەواوەتی نابات.

**٤٦٣-** عَنْ هِشَامِ بْنِ عُرْوَةَ رحمه الله، عَنْ أَبِيهِ رحمه الله، أَنَّ رَسُولَ اللهِ ﷺ قَالَ: اجْعَلُوا مِنْ صَلاَتِكُمْ فِي بُيُوتِكُمْ[1].

واتە: لە هیشامی کوڕی عوڕوەوە رحمه الله گێڕدراوەتەوە، ئەویش لە باوکیەوە رحمه الله گێڕاویەتەوە (گوتوویەتی): پێغەمبەری خوا ﷺ فەرموویەتی: هەندێك لە نوێژە (سوننەتەکانتان) بۆ ماڵەوە دانێن (لە ماڵەوە ئەنجامیان بدەن).

**٤٦٤-** أَنَّ عَبْدَ اللهِ بْنَ عُمَرَ رضي الله عنهما كَانَ يَقُولُ: إِذَا لَمْ يَسْتَطِعِ الْمَرِيضُ السُّجُودَ، أَوْمَأَ بِرَأْسِهِ إِيمَاءً، وَلَمْ يَرْفَعْ إِلَى جَبْهَتِهِ شَيْئًا[2].

واتە: عەبدوڵڵای کوڕی عومەر رضي الله عنهما هەموو جار دەیگوت: ئەگەر کەسی نەخۆش نەیتوانی سوژدە ببات، ئەوە بە سەری ئاماژە دەکات، هیچ شتێکیش بۆ ناوچەوانی بەرز ناکاتەوە (واتە مەرج نییە سەری بەر بەردێك یان شتێك بکەوێ، پێویست بەوە ناکات).

**٤٦٥-** عَنْ رَبِيعَةَ بْنِ أَبِي عَبْدِ الرَّحْمَنِ رحمه الله، أَنَّ عَبْدَ اللهِ بْنَ عُمَرَ رضي الله عنهما كَانَ إِذَا جَاءَ الْمَسْجِدَ، وَقَدْ صَلَّى النَّاسُ، بَدَأَ بِالصَّلاَةِ الْمَكْتُوبَةِ، وَلَمْ يُصَلِّ قَبْلَهَا شَيْئًا[3].

واتە: لە ڕەبیعەی کوڕی ئەبو عەبدوڕڕەحمانەوە رحمه الله گێڕدراوەتەوە (گوتوویەتی): عەبدوڵڵای کوڕی عومەر رضي الله عنهما هەموو جار کاتێ بهاتبا بۆ مزگەوت، لە کاتێکدا خەڵك دەستیان بەنوێژ بکردبا، ئەوە دەستی بە نوێژی واجب دەکرد و هیچ سوننەتێکی لە پێشدا نەدەکرد.

---

(١) ـ صحيح لغيره. أخرجه أبو مصعب الزهري: ٥٥٥؛ والحدثاني: ١٨٠، كلهم عن مالك به.

(٢) ـ صحيح. أخرجه أبو مصعب الزهري: ٥٥٦؛ والحدثاني: ١٨٠؛ والشيباني: ٢٨٠، كلهم عن مالك به.

(٣) ـ صحيح لغيره. أخرجه أبو مصعب الزهري: ٥٥٨؛ والحدثاني: ١٨١، كلهم عن مالك به.




**٤٦٦- أَنَّ عَبْدَ اللهِ بْنَ عُمَرَ ﭬ مَرَّ عَلَى رَجُلٍ وَهُوَ يُصَلِّي، فَسَلَّمَ عَلَيْهِ، فَرَدَّ الرَّجُلُ كَلاَمًا، فَرَجَعَ إِلَيْهِ عَبْدُ اللهِ بْنُ عُمَرَ ﭬ فَقَالَ لَهُ: إِذَا سُلِّمَ عَلَى أَحَدِكُمْ وَهُوَ يُصَلِّي فَلاَ يَتَكَلَّمْ، وَلْيُشِرْ بِيَدِهِ**(١).

واتە: عەبدوڵڵای کوڕی عومەر ﭬ بەلای پیاوێکدا تێپەڕی، لە کاتێکدا نوێژی دەکرد، جا سەلامی لە پیاوەکە کرد، پیاوەکەش بەدەنگ وەڵامی سەلامەکەی دایەوە، جا عەبدوڵڵای کوڕی عومەر ﭬ گەڕایەوە بۆ لای و پێی گوت: ئەگەر یەکێك لە ئێوە سەلامی لێکرا لە کاتێکدا نوێژی دەکرد، ئەوە با بەقسە وەڵام نەداتەوە، بەڵکوو با بەدەستی ئاماژە بکات.

**٤٦٧- أَنَّ عَبْدَ اللهِ بْنَ عُمَرَ ﭬ كَانَ يَقُولُ: مَنْ نَسِيَ صَلاَةً فَلَمْ يَذْكُرْهَا إِلاَّ وَهُوَ مَعَ الإِمَامِ، فَإِذَا سَلَّمَ الإِمَامُ، فَلْيُصَلِّ الصَّلاَةَ الَّتِي نَسِيَ، ثُمَّ لِيُصَلِّ بَعْدَهَا الأُخْرَى**(٢).

واتە: عەبدوڵڵای کوڕی عومەر ﭬ دەیگوت: هەر کەسێك نوێژێکی لەیاد چوو و بیری نەکەوتەوە تەنها لەو کاتە نەبێت کە لەگەڵ ئیمامدایە (لەناو نوێژێکی دیکە، ئەو کات هاتەوە یادی)، ئەوە با کاتێ ئیمام سەلامی دایەوە ئەو نوێژە بکات کە لە یادی چووە، دواتر با نوێژەکەی دیکە بکات (کە لەگەڵ ئیمام ئەنجامی دابوو، واتە دەبێ ئەو نوێژە دووبارە بکاتەوە کە لەگەڵ ئیمام کردوویەتی و بۆی حیساب نەکراوە، چونکە بۆچونی وایە نابێ نوێژەکان ڕیزبەندیان تێکبچێ)(٣).

**٤٦٨- عَنْ وَاسِعِ بْنِ حَبَّانَ ﭬ أَنَّهُ قَالَ: كُنْتُ أُصَلِّي وَعَبْدُ اللهِ بْنُ عُمَرَ ﭬ مُسْنِدٌ ظَهْرَهُ إِلَى جِدَارِ الْقِبْلَةِ، فَلَمَّا قَضَيْتُ صَلاَتِي انْصَرَفْتُ إِلَيْهِ مِنْ قِبَلِ شِقِّي الأَيْسَرِ، فَقَالَ عَبْدُ اللهِ بْنُ عُمَرَ ﭬ: مَا مَنَعَكَ أَنْ تَنْصَرِفَ عَنْ يَمِينِكَ؟ قَالَ: فَقُلْتُ: رَأَيْتُكَ، فَانْصَرَفْتُ إِلَيْكَ، قَالَ عَبْدُ اللهِ ﭬ:**

---

(١) ـ صحيح. أخرجه أبو مصعب الزهري: ٥٥٩؛ والحدثاني: ١٨١؛ والشيباني: ١٧٥، كلهم عن مالك به.

(٢) ـ صحيح. أخرجه أبو مصعب الزهري: ٥٦٠؛ والحدثاني: ١٨١؛ والشيباني: ٢١٦؛ وشرح معاني الآثار: ٢٦٨٣، كلهم عن مالك به.

(٣) ـ تێبینی: بەڵام لەلای ئیمامی شافیعی ئەو نوێژەی دواتر کە کە لەگەڵ ئیمام ئەنجامی داوە صەحیحە و کێشەی نییە، ئەو نوێژەش قەزا دەکاتەوە کە لەبیری چووە و ئێستا دوای ئەنجامدانی نوێژێکی دیکە بیری کەوتۆتەوە، واتە هەردووکیان قەزا ناکاتەوە.




فَإِنَّكَ قَدْ أَصَبْتَ، إِنَّ قَائِلاً يَقُولُ: انْصَرِفْ عَلَى يَمِينِكَ، فَإِذَا كُنْتَ تُصَلِّي، فَانْصَرِفْ حَيْثُ شِئْتَ، إِنْ شِئْتَ عَلَى يَمِينِكَ، وَإِنْ شِئْتَ عَلَى يَسَارِكَ[١].

واتە: لە واسیعی کوڕی حەببانەوە ﷺ گێردراوەتەوە گوتوویەتی: (جارێکیان) من نوێژم دەکرد لە کاتێکدا عەبدوڵڵای کوڕی عومەر ﷺ پشتی دابوو بە دیواری قیبلە، جا کاتێ نوێژەکەمم تەواو کرد بەلای چەپەمەوە هەڵسام چووم بۆ لای، عەبدوڵڵای کوڕی عومەر ﷺ گوتی: چ شتێك ڕێگرت بوو بەوەی بەلای ڕاستەتەوە بڕۆیت؟ دەڵێ: منیش گوتم: تۆم بینی و هاتم بەلای تۆوە (واتە تۆ لەلای چەپە بوویت و خۆم بەو لایەدا سوڕاند)، عەبدوڵڵا ﷺ گوتی: تۆ تەواوت کرد و پێکات، هەیە دەڵێ: بە لای ڕاستەتدا هەڵسە و بڕۆ ئەگەر نوێژت کرد، (نەخێر): بە چ لایێك حەز دەکەیت بڕۆ، ئەگەر ویستت بەلای ڕاستەت، ئەگەر ویستیشت بەلای چەپەت (هەردووکیان دروستن).

٤٦٩- عَنْ هِشَامِ بْنِ عُرْوَةَ ﷺ، عَنْ أَبِيهِ ﷺ، عَنْ رَجُلٍ مِنَ الْمُهَاجِرِينَ لَمْ يَرَ بِهِ بَأْسًا، أَنَّهُ سَأَلَ عَبْدَ اللهِ بْنَ عَمْرِو بْنِ الْعَاصِ ﷺ: أَأُصَلِّي فِي عَطَنِ الإِبِلِ؟ فَقَالَ عَبْدُ اللهِ: لاَ، وَلَكِنْ صَلِّ فِي مُرَاحِ الْغَنَمِ[٢].

واتە: لە هیشامی کوڕی عوڕوەوە ﷺ گێردراوەتەوە، ئەویش لە باوکیەوە ﷺ گێراویەتەوە، ئەویش لە پیاوێکی موهاجیری گێراوەتەوە کە جێگەی متمانەیە بەوەی پرسیاری لە عەبدوڵڵای کوڕی عەمری کوڕی عاص - ﷺ - کردووە و (گوتوویەتی): ئایا نوێژ بکەم لە مۆڵگەی وشتر؟ عەبدوڵڵاش ﷺ گوتی: نەخێر، بەڵام لە مۆڵگەی مەڕ و بزن نوێژ بکە (لەویان دروستە).

٤٧٠- عَنْ سَعِيدِ بْنِ الْمُسَيَّبِ ﷺ، أَنَّهُ قَالَ: مَا صَلاَةٌ يُجْلَسُ فِي كُلِّ رَكْعَةٍ مِنْهَا؟ ثُمَّ قَالَ سَعِيدٌ ﷺ: هِيَ الْمَغْرِبُ إِذَا فَاتَتْكَ مِنْهَا رَكْعَةٌ، وَكَذَلِكَ سُنَّةُ الصَّلاَةِ كُلُّهَا[٣].

---

(١) ـ صحيح. أخرجه أبو مصعب الزهري: ٥٦٢؛ والحدثاني: ١٨٢؛ والشيباني: ٢٧٧، كلهم عن مالك به.

(٢) ـ ضعيف. أخرجه أبو مصعب الزهري: ٥٦٣؛ والحدثاني: ١٨٢، كلهم عن مالك به.

(٣) ـ مقطوع صحيح. أخرجه أبو مصعب الزهري: ٥٦٤؛ والحدثاني: ١٨٢، كلهم عن مالك به.




واتە: لە سەعیدی کوڕی موسەیەبەوە ﷺ گێڕدراوەتەوە بەوەی گوتوویەتی: ئەو نوێژە کامەیە کە لە گشت ڕکاتەکان دانیشتن هەیە؟ دواتر سەعید ﷺ هەر خۆی وەڵامی دایەوە و گوتی: نوێژی مەغریبە کاتێ (لە نوێژی بەکۆمەڵ) ڕکاتێکت لەکیس دەچێ، هەروەها شێوازی گشت نوێژەکان هەر وایە (ڕکاتێك دوا بکەوی دەبێ دواتر بۆی دابنیشی).

## ٢٤- بابەتی جۆراوجۆر دەربارەی نوێژ[1]

**٤٧١-** عَنْ أَبِي قَتَادَةَ الأَنْصَارِي ﷺ، أَنَّ رَسُولَ اللهِ ﷺ كَانَ يُصَلِّي وَهُوَ حَامِلٌ أُمَامَةَ بِنْتَ زَيْنَبَ بِنْتِ رَسُولِ اللهِ ﷺ، وَلأَبِي الْعَاصِ بْنِ رَبِيعَةَ بْنِ عَبْدِ شَمْسٍ، فَإِذَا سَجَدَ وَضَعَهَا، وَإِذَا قَامَ حَمَلَهَا[2].

واتە: لە ئەبو قەتادەی ئەنصارییەوە ﷺ گێڕدراوەتەوە (گوتوویەتی): پێغەمبەری خوا ﷺ نوێژی دەکرد لە کاتێکدا ئومامەی کچی زەینەبی ـ نەوەی خۆی ـ هەڵگرتبوو، کە هی ئەبو عاصی کوڕی ڕەبیعەی کوڕی عەبدی شەمس بوو (کە زاوای پێغەمبەری خوا ﷺ بوو)، جا کاتێ سوژدەی دەبرد دایدەنا، وە کاتێ هەڵدەستایەوە هەڵیدەگرتەوە.

**٤٧٢-** عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ ﷺ، أَنَّ رَسُولَ اللهِ ﷺ قَالَ: يَتَعَاقَبُونَ فِيكُمْ مَلاَئِكَةٌ بِاللَّيْلِ وَمَلاَئِكَةٌ بِالنَّهَارِ، وَيَجْتَمِعُونَ فِي صَلاَةِ الْعَصْرِ، وَصَلاَةِ الْفَجْرِ، ثُمَّ يَعْرُجُ الَّذِينَ بَاتُوا فِيكُمْ، فَيَسْأَلُهُمْ وَهُوَ أَعْلَمُ بِهِمْ: كَيْفَ تَرَكْتُمْ عِبَادِي؟ فَيَقُولُونَ: تَرَكْنَاهُمْ يُصَلُّونَ، وَأَتَيْنَاهُمْ وَهُمْ يُصَلُّونَ[3].

واتە: لە ئەبو هورەیرەوە ﷺ گێڕدراوەتەوە (گوتوویەتی): پێغەمبەری خوا ﷺ فەرموویەتی: کۆمەڵە فریشتەیەك بەشەو و کۆمەڵە فریشتەیەك بەڕۆژ بەدوای یەکەوە

---

(١) ـ جَامِعُ الصَّلَاةِ.

(٢) ـ صحيح. أخرجه أبو مصعب الزهري: ٥٦٦؛ والحدثاني: ١٨٣؛ والشيباني: ٢٨٨؛ والشافعي: ٢٠٩؛ وابن حنبل: ٢٢٥٧٧؛ والبخاري: ٥١٦؛ ومسلم: ٤١؛ والنسائي: ١٢٠٤؛ وأبو داود: ٩١٧؛ وابن حبان: ١١٠٩؛ والقابسي: ٣٩٨، كلهم عن مالك به.

(٣) ـ صحيح. أخرجه أبو مصعب الزهري: ٥٦٧؛ والحدثاني: ١٨٣؛ وابن حنبل: ١٠٣١٤؛ والبخاري: ٥٥٥، وفي: ٧٤٢٩، وفي: ٧٤٨٦؛ ومسلم: ٢١٠؛ والنسائي: ٤٨٥؛ وابن حبان: ١٧٣٧؛ والقابسي: ٣٣١، كلهم عن مالك به.

نۆبەت دەگۆڕنەوە لەناوتاندا، جا (هەردوو کۆمەڵەکە) کۆدەبنەوە لە نوێژی عەسر و نوێژی بەیانیدا (کە کاتی گۆڕینی نۆبەتەکانیانە)، دواتر ئەوانە بەرز دەبنەوە ئاسمان کە شەو لەلاتان مابوونەوە، جا خوای پەروەردگار ﷻ پرسیاریان لێ دەکات لە کاتێکدا حاڵی هەمووان دەزانێت (پێیان دەفەرموێ): چۆن بەندەکانی منتان جێهێشت (لە چ حاڵەتێکدا بوون)؟ ئەوانیش دەڵێن: جێمان هێشتن لە کاتێکدا نوێژیان دەکرد (نوێژی بەیانی)، وە کاتێ چووین بۆ لایان هەر نوێژیان دەکرد (واتە دوێنێ عەسریش کاتێ چووین بۆ لایان و نۆبەتمان بوو هەر لە نوێژدا بوون).

**٤٧٣-** عَنْ عَائِشَةَ ﵂، زَوْجِ النَّبِيِّ ﷺ، أَنَّ رَسُولَ اللهِ ﷺ قَالَ: مُرُوا أَبَا بَكْرٍ ﵁ فَلْيُصَلِّ لِلنَّاسِ، فَقَالَتْ عَائِشَةُ ﵂: إِنَّ أَبَا بَكْرٍ ﵁ يَا رَسُولَ اللهِ، إِذَا قَامَ فِي مَقَامِكَ لَمْ يُسْمِعِ النَّاسَ مِنَ الْبُكَاءِ، فَمُرْ عُمَرَ ﵁ فَلِيُصَلِّيَ لِلنَّاسِ، قَالَ: مُرُوا أَبَا بَكْرٍ ﵁ فَلْيُصَلِّ لِلنَّاسِ، قَالَتْ عَائِشَةُ ﵂: فَقُلْتُ لِحَفْصَةَ ﵂: قُولِي لَهُ: إِنَّ أَبَا بَكْرٍ ﵁ إِذَا قَامَ فِي مَقَامِكَ لَمْ يُسْمِعِ النَّاسَ مِنَ الْبُكَاءِ، فَمُرْ عُمَرَ ﵁ فَلْيُصَلِّ لِلنَّاسِ، فَفَعَلَتْ حَفْصَةُ ﵂، فَقَالَ رَسُولُ اللهِ ﷺ: إِنَّكُنَّ لَأَنْتُنَّ صَوَاحِبُ يُوسُفَ، مُرُوا أَبَا بَكْرٍ ﵁ فَلْيُصَلِّ لِلنَّاسِ، فَقَالَتْ حَفْصَةُ ﵂ لِعَائِشَةَ ﵂: مَا كُنْتُ لأُصِيبَ مِنْكِ خَيْرًا[1].

واتە: لە عائیشەی ﵂ خێزانی پێغەمبەری خواوە ﷺ گێردراوەتەوە (گوتوویەتی): پێغەمبەری خوا ﷺ (لە کاتی نەخۆشی سەرەمەرگدا) فەرمووی: فەرمان بە ئەبو بەکر ﵁ بکەن با نوێژ بۆ خەڵکی بکات، عائیشەش ﵂ گوتی: ئەی پێغەمبەری خوا ﷺ ئەبو بەکر ﵁ ئەگەر لە شوێنی تۆ بوەستێت خەڵکی گوێبیست ناکات (واتە خەڵك گوێیان لە دەنگی نابێت) لەبەر گریان، جا فەرمان بە عومەر ﵁ بکە با نوێژ بۆ خەڵکی بکات، پێغەمبەری خوا ﷺ (دووبارە) فەرمووی: فەرمان بە ئەبو بەکر ﵁ بکەن با نوێژ بۆ خەڵکی بکات، عائیشە ﵂ دەڵێت: منیش بە حەفصەم ﵂ وت: پێی بڵێ: ئەبو بەکر ﵁ ئەگەر لە شوێنی تۆ بوەستێت خەڵکی گوێبیست ناکات لەبەر گریان، جا فەرمان بە عومەر ﵁ بکە با نوێژ بۆ خەڵکی بکات، حەفصەش ﵂ ئەنجامی دا (پێی گوت)، پێغەمبەری خواش ﷺ (بە حەفصە و

---

(١) ـ صحيح. أخرجه أبو مصعب الزهري: ٥٦٨؛ والبخاري: ٦٧٩، وفي: ٧١٦، وفي: ٧٣٠٣؛ والترمذي: ٣٦٧٢؛ والقابسي: ٤٥٣، كلهم عن مالك به.

عائیشەی) فەرمووو: ئێوە وەك ئافرەتانی هاوەڵی یوسف وان (واتە هەر خەریکی سەین و بەینی خۆتانن و لە حەق لادەدەن وەك ئەو ئافرەتانەی بوونە فیتنە بۆ پێغەمبەر یوسف ﷺ)، دەی فەرمان بە ئەبو بەکر ﷺ بکەن با نوێژ بۆ خەڵکی بکات، جا حەفصە ﷺ ـ بە عائیشەی ـ وت: من خێرم لە تۆوە پێ نەبڕاوە (بۆیە وای گوت، چونکە جارێکی دیکەش بە پلانی عائیشە ـ ﷺ ـ بەیەکەوە ڕێك کەوتن کاتێ بە پێغەمبەری خوایان ﷺ وت: ئەوە چیت خواردووە، بۆنی مەغافیرت لێ دێ، دواتر ئایەت دابەزی، حەفصە ـ ﷺ ـ مەبەستی ئەوەیە).

**٤٧٤- عَنْ عُبَيْدِ اللهِ بْنِ عَدِيِّ بْنِ الْخِيَارِ ﷺ، أَنَّهُ قَالَ: بَيْنَمَا رَسُولُ اللهِ ﷺ جَالِسٌ بَيْنَ ظَهْرَانَيِ النَّاسِ، إِذْ جَاءَهُ رَجُلٌ فَسَارَّهُ، فَلَمْ يُدْرَ مَا سَارَّهُ بِهِ، حَتَّى جَهَرَ رَسُولُ اللهِ ﷺ، فَإِذَا هُوَ يَسْتَأْذِنُهُ فِي قَتْلِ رَجُلٍ مِنَ الْمُنَافِقِينَ، فَقَالَ رَسُولُ اللهِ ﷺ حِينَ جَهَرَ: أَلَيْسَ يَشْهَدُ أَنْ لاَ إِلَهَ إِلاَّ اللهُ، وَأَنَّ مُحَمَّدًا رَسُولُ اللهِ؟ فَقَالَ الرَّجُلُ: بَلَى، وَلاَ شَهَادَةَ لَهُ، فَقَالَ: أَلَيْسَ يُصَلِّي؟ قَالَ: بَلَى، وَلاَ صَلاَةَ لَهُ، فَقَالَ ﷺ: أُولَئِكَ الَّذِينَ نَهَانِي اللهُ عَنْهُمْ**[1].

واتە: لە عوبەیدوڵڵای کوڕی عەدی کوڕی خیارەوە ﷺ گێڕدراوەتەوە گوتوویەتی: لە کاتێکدا پێغەمبەری خوا ﷺ دانیشتبوو لەناو خەڵکیدا، لەناکاو پیاوێك هات و بەنهێنی قسەیەکی لەگەڵ کرد، جا نەزانرا چی بەنهێنی پێ گوت، تا پێغەمبەری خوا ﷺ ئاشکرای کرد، بەوەی داوای لێ کردبوو مۆڵەتی بدات بە کوشتنی پیاوێکی دووڕوو (مونافیق)، جا پێغەمبەری خوا ﷺ کاتێ ئاشکرای کرد فەرمووی: مەگەر ئەو شاهێدی نادات بەوەی هیچ پەروەردگارێکی بەحەق نییە جگە لە الله، وە موحەممەدیش نێردراوی ئەوە؟ پیاوەکەش گوتی: با، بەڵام شایەتمانی بۆ نییە (واتە شایەتمانەکەی درۆیە)، پێغەمبەری خوا ﷺ فەرمووی: ئایا نوێژ ناکات؟ گوتی: با، بەڵام نوێژی بۆ نییە (بۆ دووڕوویی دەیکات)، جا پێغەمبەری خوا ﷺ فەرمووی: ئەمانەن خوا نەهی لێ کردووم دەربارەیان (واتە نەهی لێ کردووم بیانکوژم لەسەر ناوەڕۆکی ناخیان، چونکە ئەوەی مامەڵەی دونیا لەسەر ڕووکەشە، مامەڵەی دواڕۆژ لەسەر ناوەڕۆك و ناخ و دڵە).

---

(١) ـ صحيح. أخرجه أبو مصعب الزهري: ٥٦٩؛ والحدثاني: ١٨٣؛ والشافعي: ١٤٩٩، كلهم عن مالك به.

**٤٧٥-** عَنْ عَطَاءِ بْنِ يَسَارٍ ﷺ، أَنَّ رَسُولَ اللهِ ﷺ قَالَ: اللهمَّ لاَ تَجْعَلْ قَبْرِي وَثَنًا يُعْبَدُ، اشْتَدَّ غَضَبُ الله عَلَى قَوْمٍ اتَّخَذُوا قُبُورَ أَنْبِيَائِهِمْ مَسَاجِدَ[1].

واتە: لە عەتائی کوڕی یەسارەوە ﷺ گێڕدراوەتەوە (گوتوویەتی): پێغەمبەری خوا ﷺ فەرموویەتی: پەروەردگارا گۆڕەکەم نەبێتە بتێك و بپەرسترێ، توڕەیی خوا ﷻ (واتە سزای سەختی خوا) لەسەر قەومێکە گۆڕی پێغەمبەرانی خۆیانیان کردووە بە پەرستگا.

**٤٧٦-** عَنْ مَحْمُودِ بْنِ لَبِيدٍ الأَنْصَارِيِّ ﷺ، أَنَّ عِتْبَانَ بْنَ مَالِكٍ ﷺ كَانَ يَؤُمُّ قَوْمَهُ وَهُوَ أَعْمَى، وَأَنَّهُ قَالَ لِرَسُولِ اللهِ ﷺ: إِنَّهَا تَكُونُ الظُّلْمَةُ وَالْمَطَرُ وَالسَّيْلُ، وَأَنَا رَجُلٌ ضَرِيرُ الْبَصَرِ، فَصَلِّ يَا رَسُولَ اللهِ فِي بَيْتِي مَكَانًا أَتَّخِذْهُ مُصَلًّى، فَجَاءَهُ رَسُولُ اللهِ ﷺ فَقَالَ: أَيْنَ تُحِبُّ أَنْ أُصَلِّيَ؟ فَأَشَارَ لَهُ إِلَى مَكَانٍ مِنَ الْبَيْتِ، فَصَلَّى فِيهِ رَسُولُ اللهِ ﷺ[2].

واتە: لە مەحمودی کوڕی لەبیدی ئەنصارییەوە ﷺ گێڕدراوەتەوە (گوتوویەتی): عیتبانی کوڕی مالیك ﷺ پێشنوێژی بۆ قەومەکەی دەکرد لە کاتێکدا نابینا بوو، جا بە پێغەمبەری خوای ﷺ وت: جاری وا هەیە شەو و باران و لافاوە، منیش پیاوێکی نابینام، جا ئەی پێغەمبەری خوا ﷺ لە شوێنێکی ماڵەکەم نوێژ بکە تا بیکەم بە شوێنی نوێژ (لەو کاتانەی ناتوانم بچم بۆ مزگەوت نوێژەکە لەوێ دەکەم)، پێغەمبەری خواش ﷺ هات بۆ لای و فەرمووی: حەز دەکەیت لە کوێ نوێژ بکەم؟ ئەویش ئاماژەی بۆ شوێنێکی ماڵەکە کرد، پێغەمبەری خوا ﷺ نوێژی تێدا کرد.

**٤٧٧-** عَنْ عَبَّادِ بْنِ تَمِيمٍ ﷺ، عَنْ عَمِّهِ ﷺ، أَنَّهُ رَأَى رَسُولَ اللهِ ﷺ مُسْتَلْقِيًا فِي الْمَسْجِدِ، وَاضِعًا إِحْدَى رِجْلَيْهِ عَلَى الأُخْرَى[3].

---

(١) ـ صحيح لغيره. أخرجه أبو مصعب الزهري: ٥٧٠؛ والحدثاني: ١٨٤، كلهم عن مالك به.

(٢) ـ صحيح. أخرجه أبو مصعب الزهري: ٥٧٢؛ والحدثاني: ١٨٤؛ والشافعي: ٢٢٣؛ والبخاري: ٦٦٧؛ والنسائي: ٧٨٨؛ وابن حبان: ١٦١٢؛ ومصنف ابن أبي شيبة: ٦٠٧٠؛ والقابسي: ٨، كلهم عن مالك به.

(٣) ـ صحيح. أخرجه أبو مصعب الزهري: ٥٧٣؛ والحدثاني: ١٨٥؛ والشيباني: ٩٧١؛ وابن حنبل: ١٦٤٧٧؛ والبخاري: ٤٧٥؛ ومسلم: ٧٥؛ والنسائي: ٧٢١؛ وأبو داود: ٤٨٦٦؛ وابن حبان: ٥٥٥٢؛ والقابسي: ٧١، كلهم عن مالك به.

واتە: لە عەببادی کوڕی تەمیمەوە ﷺ گێردراوەتەوە، ئەویش لە مامیەوە ﷺ گێڕاویەتەوە بەوەی پێغەمبەری خوای ﷺ بینیوە لەسەر پشت ڕاکشاوە لە مزگەوت و قاچێکیشیانی لەسەر قاچەکەی دیکە دانابوو (واتە: قاچەکانی نەنوقاندبوو، نەیقوچاندبۆیەوە، تەنها بەڕاکشاوی لەسەر یەکدی دانابوو).

**٤٧٨-** عَنْ سَعِيدِ بْنِ الْمُسَيَّبِ ﷺ، أَنَّ عُمَرَ بْنَ الْخَطَّابِ، وَعُثْمَانَ بْنَ عَفَّانَ، ﷺ، كَانَا يَفْعَلَانِ ذَلِكَ[1].

واتە: لە سەعیدی کوڕی موسەیەبەوە ﷺ گێردراوەتەوە (گوتوویەتی): عومەری کوڕی خەتتاب و عوسمانی کوڕی عەففان ﷺ ئەوەیان ئەنجام داوە (واتە لە مزگەوت لەسەر پشت ڕاکشاون).

**٤٧٩-** أَنَّ عَبْدَ اللهِ بْنَ مَسْعُودٍ ﷺ قَالَ لإِنْسَانٍ: إِنَّكَ فِي زَمَانٍ كَثِيرٌ فُقَهَاؤُهُ، قَلِيلٌ قُرَّاؤُهُ، تُحْفَظُ فِيهِ حُدُودُ الْقُرْآنِ، وَتُضَيَّعُ حُرُوفُهُ، قَلِيلٌ مَنْ يَسْأَلُ، كَثِيرٌ مَنْ يُعْطِي، يُطِيلُونَ فِيهِ الصَّلَاةَ، وَيَقْصُرُونَ الْخُطْبَةَ، يُبَدُّونَ أَعْمَالَهُمْ قَبْلَ أَهْوَائِهِمْ، وَسَيَأْتِي عَلَى النَّاسِ زَمَانٌ، قَلِيلٌ فُقَهَاؤُهُ، كَثِيرٌ قُرَّاؤُهُ، يُحْفَظُ فِيهِ حُرُوفُ الْقُرْآنِ، وَتُضَيَّعُ حُدُودُهُ، كَثِيرٌ مَنْ يَسْأَلُ، قَلِيلٌ مَنْ يُعْطِي، يُطِيلُونَ فِيهِ الْخُطْبَةَ، وَيَقْصُرُونَ الصَّلَاةَ، يُبَدُّونَ فِيهِ أَهْوَاءَهُمْ قَبْلَ أَعْمَالِهِمْ[2].

واتە: عەبدوڵڵای کوڕی مەسعود ﷺ بە کەسێکی گوت: تۆ لە سەردەمێکیت فوقەها و شەرعزانی زۆرە، قوڕئانخوێن و قاریئی کەمە، سنوورەکانی قوڕئانی تێدا دەپارێزرێ (واتە خەڵك کار بە ناوەڕۆکی قوڕئان دەکات)، وە زۆر حیساب لەسەر حەرفەکانی ناکرێت (واتە بۆ ڕووکەش قوڕئان ناخوێننەوە، بەڵکوو حیساب بۆ پاداشت و جێبەجێکردنی دەکەن نەك تەنها خوێندنەوە و ڕووکەشەکە)، هەروەها کەمن ئەو کەسانەی داوای ماڵ و سامان دەکەن (هەر چەندە پێویستیشیان بێ، چونکە سەربەرز و بەعیزەتن)، زۆرن ئەوانەی دەبەخشن (چونکە زۆربەی لە خێر و صەدەقە تێ دەگەن)، هەروەها نوێژ درێژ دەکەن و وتار کورت دەکەنەوە،

---

(١) ـ صحيح. أخرجه أبو مصعب الزهري: ٥٧٤؛ والحدثاني: ١٨٩؛ والشيباني: ٩٧٢؛ وأبو داود: ٤٨٦٧؛ وشرح معاني الآثار: ٦٨٨٩، كلهم عن مالك به.

(٢) ـ صحيح. أخرجه أبو مصعب الزهري: ٥٧٥، عن مالك به.

وە کردەوەی چاك پێشی هەوا و ئارەزوویان دەخەن، جا سەردەمێك بەسەر خەڵکیدا دێ، فوقەها و شەرعزانیان کەمە، قورئانخوێن و قاریئیان زۆرە، پیتەکانی قورئان لەبەر دەکرێ (واتە تەنها لە ڕووی خوێندنەوە لە قورئان دەزانن، لە ڕووی کارپێکردنەوە خەسارەتمەندن)، وە سنوورەکانی قورئان زایە دەکرێ (کار بە قورئان ناکرێ)، زۆرن ئەوانەی داوای ماڵ و سەروەت دەکەن، کەمن ئەوانەی دەبەخشن، وتار درێژ دەکەنەوە (واتە قسەیان زۆرە)، نوێژ کورت دەکەنەوە (تاقەتی کرداری چاکیان نییە)، هەوا و ئارەزوویان پێشی کردەوەی چاك دەخەن.

**٤٨٠-** عَنْ يَحْيَى بْنِ سَعِيدٍ ﷺ، أَنَّهُ قَالَ: بَلَغَنِي أَنَّ أَوَّلَ مَا يُنْظَرُ فِيهِ مِنْ عَمَلِ الْعَبْدِ الصَّلَاةُ، فَإِنْ قُبِلَتْ مِنْهُ، نُظِرَ فِيمَا بَقِيَ مِنْ عَمَلِهِ، وَإِنْ لَمْ تُقْبَلْ مِنْهُ، لَمْ يُنْظَرْ فِي شَيْءٍ مِنْ عَمَلِهِ[١].

واتە: لە یەحیای کوڕی سەعیدەوە ﷺ گێڕدراوەتەوە گوتوویەتی: پێم گەیشتووە کە یەکەم شتێك لە کردەوەکانی بەندە سەیر دەکرێ و لێپێچینەوەی لەسەر دەکرێت نوێژە، جا ئەگەر لێی قبووڵ بکرێ، ئەوە سەیری کردەوەکانی دیکەی دەکەن (کردەوەکانی تریش بایەخدار دەبن)، وە ئەگەر لێی قبووڵ نەکرێ ئەوە سەیری هیچ لە کردەوەکانی دیکەی ناکرێ (چونکە ئەوەندە سەنگیان نیە بەبێ نوێژ).

**٤٨١-** عَنْ عَائِشَةَ ﷺ، زَوْجِ النَّبِيِّ ﷺ، أَنَّهَا قَالَتْ: كَانَ أَحَبُّ الْعَمَلِ إِلَى رَسُولِ اللهِ ﷺ الَّذِي يَدُومُ عَلَيْهِ صَاحِبُهُ[٢].

واتە: لە عائیشەی ﷺ خێزانی پێغەمبەری خواوە ﷺ گێڕدراوەتەوە گوتوویەتی: خۆشەویستترین کردەوە لای پێغەمبەری خوا ﷺ ئەو کردەوە بوو کە خاوەنەکەی لەسەری بەردەوام بێت.

**٤٨٢-** عَنْ عَامِرِ بْنِ سَعْدِ بْنِ أَبِي وَقَّاصٍ ﷺ، عَنْ أَبِيهِ ﷺ، أَنَّهُ قَالَ: كَانَ رَجُلَانِ أَخَوَانِ، فَهَلَكَ أَحَدُهُمَا قَبْلَ صَاحِبِهِ بِأَرْبَعِينَ لَيْلَةً، فَذُكِرَتْ فَضِيلَةُ الْأَوَّلِ عِنْدَ رَسُولِ اللهِ ﷺ، فَقَالَ: أَلَمْ يَكُنِ

---

(١) ـ مقطوع ضعيف. أخرجه أبو مصعب الزهري: ٥٧٦، عن مالك به.

(٢) ـ صحيح. أخرجه أبو مصعب الزهري: ٥٧٧؛ والحدثاني: ١٨٥؛ وابن حنبل: ٢٥٤٧٨؛ والبخاري: ٦٤٦٢؛ وابن حبان: ٣٢٣؛ والقابسي: ٤٥٧، كلهم عن مالك به.




الآخَرُ مُسْلِمًا؟ قَالُوا: بَلَى، يَا رَسُولَ اللهِ، وَكَانَ لاَ بَأْسَ بِهِ، فَقَالَ رَسُولُ اللهِ ﷺ: وَمَا يُدْرِيكُمْ مَا بَلَغَتْ بِهِ صَلاَتُهُ؟ إِنَّمَا مَثَلُ الصَّلاَةِ كَمَثَلِ نَهْرٍ غَمْرٍ عَذْبٍ بِبَابِ أَحَدِكُمْ، يَقْتَحِمُ فِيهِ كُلَّ يَوْمٍ خَمْسَ مَرَّاتٍ، فَمَا تَرَوْنَ ذَلِكَ يُبْقِي مِنْ دَرَنِهِ؟ فَإِنَّكُمْ لاَ تَدْرُونَ مَا بَلَغَتْ بِهِ صَلاَتُهُ؟[١].

واتە: لە عامری کوڕی سەعدی کوڕی ئەبی وەقاصەوە ﷀ گێڕدراوەتەوە، ئەویش لە باوکیەوە ﷛ گێڕاویەتەوە گوتوویەتی: دوو برا هەبوون، یەکێکیان بە چل شەو پێشی ئەوەی دیکەیان وەفاتی کرد، جا باسی چاکەی برای یەکەم کرا لە خزمەت پێغەمبەری خوادا ﷺ، پێغەمبەری خواش ﷺ فەرمووی: مەگەر ئەوەی دیکەشیان مسوڵمان نییە؟ گوتیان: با (ئەویش مسوڵمانە) ئەی پێغەمبەری خوا ﷺ، وە هیچ کێشەی نەبوو (مسوڵمانێکی چاك بوو)، پێغەمبەری خواش ﷺ فەرمووی: ئێوە چووزانن نوێژەکانی بەکوێی گەیاندووە (پلەی چەندە بەرز کردۆتەوە بەم ماوەیەی نێوانیان)، چونکە نموونەی نوێژ وەك ڕوبارێکی بەخوڕی سازگار وایە لەبەر دەرگای هەر یەکێك لە ئێوە، هەموو ڕۆژێك پێنج جار خۆی بخاتە ناوی، پێتان وایە ئەو کەسە هیچ پیسیێکی پێوە دەمێنێ؟ ئێوە نازانن نوێژەکانی بە چ پلەیەکی گەیاندووە.

٤٨٣- أَنَّ عَطَاءَ بْنَ يَسَارٍ ﷛ كَانَ إِذَا مَرَّ عَلَيْهِ بَعْضُ مَنْ يَبِيعُ فِي الْمَسْجِدِ، دَعَاهُ فَسَأَلَهُ مَا مَعَكَ؟ وَمَا تُرِيدُ؟ فَإِنْ أَخْبَرَهُ أَنَّهُ يُرِيدُ أَنْ يَبِيعَهُ، قَالَ: عَلَيْكَ بِسُوقِ الدُّنْيَا، فَإِنَّمَا هَذَا سُوقُ الآخِرَةِ[٢].

واتە: عەتائی کوڕی یەسار ﷀ هەموو جار ئەگەر یەکێکی ببینیایە لەوانەی لە مزگەوت شتیان دەفرۆشت، بانگی دەکرد و پرسیاری لێدەکرد چیت لەلایە؟ چیت دەوێ مەبەستت چییە؟ ئەگەر هەواڵی پێ بدابایە کە مەبەستی ئەوەیە بیفرۆشێ، دەیگوت: بڕۆ بۆ بازاڕی دونیا، ئێرە تەنها بازاڕی دواڕۆژە (واتە مزگەوت جێی عیبادەتە لە مزگەوت کڕین و فرۆشتن مەکە، بڕۆ بۆ بازاڕ).

---

(١) ـ صحيح. أخرجه أبو مصعب الزهري: ٥٧٨؛ والحدثاني: ١٨٥، كلهم عن مالك به.

(٢) ـ مقطوع ضعيف. أخرجه أبو مصعب الزهري: ٥٨٠؛ والحدثاني: ١٨٦، كلهم عن مالك به.




٤٨٤- أَنَّ عُمَرَ بْنَ الْخَطَّابِ ﷺ بَنَى رَحْبَةً فِي نَاحِيَةِ الْمَسْجِدِ، تُسَمَّى الْبُطَيْحَاءَ، وَقَالَ: مَنْ كَانَ يُرِيدُ أَنْ يَلْغَطَ، أَوْ يُنْشِدَ شِعْرًا، أَوْ يَرْفَعَ صَوْتَهُ، فَلْيَخْرُجْ إِلَى هَذِهِ الرَّحْبَةِ[١].

واتە: عومەری کوڕی خەتتاب ﷺ ساحە و گۆڕەپانێکی لە لایێکی مزگەوت دروست کرد، پێی دەگوترا بوتەیحاء و گوتی: هەر کەسێك دەیەوێ ژاوەژاو بکات، یان شیعر بڵێ، یان دەنگی بەرز بکاتەوە، ئەوە با دەربچێت بۆ ئەو گۆڕەپانە (با لەناو مزگەوت ئەو شتانە ئەنجام نەدات، مزگەوت شوێنی ئەو شتانە نیە، تەنها شوێنی پەرستشە).

## ٢٥- هاندان دەربارەی نوێژ[٢]

٤٨٥- عَنْ أَبِي سُهَيْلِ بْنِ مَالِكٍ ﷺ، عَنْ أَبِيهِ ﷺ، أَنَّهُ سَمِعَ طَلْحَةَ بْنَ عُبَيْدِ اللهِ ﷺ يَقُولُ: جَاءَ رَجُلٌ إِلَى رَسُولِ اللَّهِ ﷺ، مِنْ أَهْلِ نَجْدٍ، ثَائِرُ الرَّأْسِ، يُسْمَعُ دَوِيُّ صَوْتِهِ، وَلاَ نَفْقَهُ مَا يَقُولُ، حَتَّى دَنَا، فَإِذَا هُوَ يَسْأَلُ عَنِ الإِسْلاَمِ، فَقَالَ لَهُ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ: خَمْسُ صَلَوَاتٍ فِي الْيَوْمِ وَاللَّيْلَةِ، قَالَ: هَلْ عَلَيَّ غَيْرُهُنَّ؟ قَالَ: لاَ، إِلاَّ أَنْ تَطَّوَّعَ، قَالَ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ: وَصِيَامُ شَهْرِ رَمَضَانَ، قَالَ: هَلْ عَلَيَّ غَيْرُهُ؟ قَالَ: لاَ، إِلاَّ أَنْ تَطَّوَّعَ، قَالَ: وَذَكَرَ لَهُ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ الزَّكَاةَ، فَقَالَ: هَلْ عَلَيَّ غَيْرُهَا؟ فَقَالَ: لاَ، إِلاَّ أَنْ تَطَّوَّعَ، قَالَ: فَأَدْبَرَ الرَّجُلُ وَهُوَ يَقُولُ: وَاللَّهِ لاَ أَزِيدُ عَلَى هَذَا، وَلاَ أَنْقُصُ مِنْهُ، فَقَالَ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ: أَفْلَحَ إِنْ صَدَقَ[٣].

واتە: لە ئەبو سوهەیلی کوڕی مالیکەوە ﷺ گێردراوەتەوە، ئەویش لە باوکیەوە ﷺ گێراویەتەوە بەوەی گوێی لە تەڵحەی کوڕی عوبەیدوڵڵا ﷺ بووە دەیگوت: پیاوێك هات بۆ لای پێغەمبەری خوا ﷺ کە خەڵکی نەجد بوو، قژ ئاڵۆز بوو، دەنگی لە دوورەوە دەهات، تێ نەدەگەیشتین چی دەڵێ، تاوەکوو نزیك بۆیەوە،

---

(١) ـ ضعيف. أخرجه أبو مصعب الزهري: ٥٨١؛ والحدثاني: ١٨٦، كلهم عن مالك به.

(٢) ـ جَامِعُ التَّرْغِيبِ فِي الصَّلَاةِ.

(٣) ـ صحيح. أخرجه أبو مصعب الزهري: ٥٣١؛ والحدثاني: ١٧٢؛ والشافعي: ٨٧؛ وفي: ١١٦٢؛ وابن حنبل: ١٣٩٠؛ والبخاري: ٤٦، وفي: ٢٦٧٨؛ ومسلم: ٨؛ والنسائي: ٤٥٨، وفي: ٥٠٢٨؛ وأبو داود: ٣٩١؛ وابن حبان: ١٧٢٤، وفي: ٣٢٦٢؛ والمنتقى لابن جارود: ١٤٤؛ والقابسي: ٢٦٧، كلهم عن مالك به.

جا زانیمان پرسیار دەربارەی ئیسلام دەکات، پێغەمبەری خواش ﷺ پێی فەرموو: پێنج نوێژ واجبن لە شەو و ڕۆژێکدا، کابراش گوتی: ئایا (لە نوێژ) جگە لەوانەم لەسەر واجبە؟ فەرمووی: نەخێر، تەنها ئەگەر خۆت نوێژی سوننەت بکەی، پێغەمبەری خوا ﷺ فەرمووی: هەروەها ڕۆژووی مانگی ڕەمەزان، کابرا گوتی: ئایا (لە ڕۆژوودا) جگە لەوەم لەسەر واجبە؟ فەرمووی: نەخێر، تەنها ئەگەر خۆت ڕۆژووی سوننەت بگری، دەڵێ: جا پێغەمبەری خوا ﷺ باسی زەکاتیشی بۆ کرد، کابراش گوتی: ئایا (لە بەخشیندا) جگە لەوەم لەسەر واجبە؟ پێغەمبەری خواش ﷺ فەرمووی: نەخێر، تەنها ئەگەر خۆت صەدەقەی سوننەت بکەی، دەڵێ: جا پیاوەکە پشتی هەڵکرد و ڕۆیشت لەوکاتەدا دەیگوت: سوێند بە خوا لەوە زیاتر ناکەم و لەوەش کەمتر ناکەم، پێغەمبەری خواش ﷺ فەرمووی: سەرفراز دەبێت ئەگەر ڕاست بکات.

**٤٨٦- عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ ﷺ، أَنَّ رَسُولَ اللهِ ﷺ قَالَ: يَعْقِدُ الشَّيْطَانُ عَلَى قَافِيَةِ رَأْسِ أَحَدِكُمْ، إِذَا هُوَ نَامَ، ثَلاَثَ عُقَدٍ، يَضْرِبُ مَكَانَ كُلِّ عُقْدَةٍ، عَلَيْكَ لَيْلٌ طَوِيلٌ، فَارْقُدْ، فَإِنِ اسْتَيْقَظَ، فَذَكَرَ اللهَ، انْحَلَّتْ عُقْدَةٌ، فَإِنْ تَوَضَّأَ، انْحَلَّتْ عُقْدَةٌ، فَإِنْ صَلَّى، انْحَلَّتْ عُقَدُهُ، فَأَصْبَحَ نَشِيطًا، طَيِّبَ النَّفْسِ، وَإِلاَّ أَصْبَحَ خَبِيثَ النَّفْسِ كَسْلاَنَ**[1].

واتە: لە ئەبو هوڕەیڕەوە ﷺ گێڕدراوەتەوە (گوتوویەتی): پێغەمبەری خوا ﷺ فەرموویەتی: شەیتان سێ گرێ لە پشتەسەری هەر یەك لە ئێوە دەدات کاتێك دەخەوێ، دەست لە شوێنی گشت گرێکان دەدات (تا دڵنیا بێ گرێکان باش قایم بوون، جا دەڵێت): شەوێکی درێژ و کاتێکی زۆرت لەپێشە، بخەوە (واتە ئەگەر بەتەمای شەونوێژ و عیبادەتیش بیت کاتی زۆرت لەپێشە جارێ بخەوە)، جا ئەگەر کەسەکە خەبەری بۆیەوە و زیکر و یادی خوای کرد، ئەوە گرێیەکیان دەبێتەوە، وە ئەگەر دەستنوێژیشی شۆرد، ئەوە گرێیەکی دیکەش دەبێتەوە، وە ئەگەر نوێژیشی کرد، ئەوە گشت گرێیەکانی دەبنەوە، جا بەیانی دەکاتەوە بەگورجوگۆڵی،

---

(١) ـ صحيح. أخرجه أبو مصعب الزهري: ٥٣٢؛ والبخاري: ١١٤٢؛ وأبو داود: ١٣٠٦؛ وابن حبان: 2553؛ والقابسي: ٣٣٤، كلهم عن مالك به.

بەدەروونێکی ئارامەوە، وە ئەگەر وا نەبوو (واتە تا بەیانی خەوت)، ئەوە بەیانی دەکاتەوە بەدەروونپیسی و ناڕێکی و تەمبەڵی.

## ١- کرداری خۆشۆردنی دوو جەژنەکان و بانگدان و قامەتکردن تیایاندا[١]

٤٨٧- عَنْ مَالِكٍ ﷺ، أَنَّهُ سَمِعَ غَيْرَ وَاحِدٍ مِنْ عُلَمَائِهِمْ يَقُولُ: لَمْ يَكُنْ فِي الْفِطْرِ وَالأَضْحَى نِدَاءٌ، وَلاَ إِقَامَةٌ، مُنْذُ زَمَانِ رَسُولِ اللهِ ﷺ إِلَى الْيَوْمِ[٢].

قَالَ مَالِكٌ ﷺ: وَتِلْكَ السُّنَّةُ الَّتِي لاَ اخْتِلاَفَ فِيهَا عِنْدَنَا.

واتە: لە ئیمامی مالیکەوە ﷺ گێردراوەتەوە گوێی لە چەندین زانا بووە دەیانگوت: لە نوێژی جەژنی ڕەمەزان و جەژنی قورباندا لە سەردەمی پێغەمبەری خواوە ﷺ تا ئەمڕۆشی لەگەڵدا بێت بانگ و قامەت نەبووە.

ئیمامی مالیك ﷺ گوتوویەتی: ئەو شێواز و ڕێبازە لەلای ئێمە ڕاجیایی تیا نییە[٣].

٤٨٨- أَنَّ عَبْدَ اللهِ بْنَ عُمَرَ ﷺ كَانَ يَغْتَسِلُ يَوْمَ الْفِطْرِ قَبْلَ أَنْ يَغْدُوَ إِلَى الْمُصَلَّى[٤].

واتە: عەبدوڵڵای کوڕی عومەر ﷺ لە ڕۆژی جەژنی قوربان پێش ئەوەی بچێتە شوێنی نوێژکردن خۆی دەشۆرد.

## ٢- فەرمانکردن بە نوێژکردن بەر لە وتاردان لە دوو جەژنەکاندا[٥]

٤٨٩- عَنِ ابْنِ شِهَابٍ ﷺ، أَنَّ رَسُولَ اللهِ ﷺ كَانَ يُصَلِّي يَوْمَ الْفِطْرِ وَيَوْمَ الأَضْحَى قَبْلَ الْخُطْبَةِ[٦].

---

(١) ـ الْعَمَلُ فِي غُسْلِ الْعِيدَيْنِ، وَالنِّدَاءُ فِيهِمَا وَالإِقَامَةُ.

(٢) ـ صحيح.

(٣) ـ تێبینی: لەلای ئیمامی شافیعی سوننەتە بگوترێ: (الصلاة جامعة)، بە بەڵگەی فەرموودەیەك كە ئیمامی زوهری بە مورسەلی لە پێغەمبەری خواوە ﷺ دەیگێڕێتەوە و قیاسیش لەسەر نوێژی خۆرگیران پاڵپشتی دەكات.

(٤) ـ صحيح. أخرجه أبو مصعب الزهري: ٥٨٣؛ والحدثاني: ١٨٧؛ والشيباني: ٦٩؛ وفي: ٧٠؛ والشافعي: ٣٢٠، كلهم عن مالك به.

(٥) ـ الأَمْرُ بِالصَّلاَةِ قَبْلَ الْخُطْبَةِ فِي الْعِيدَيْنِ.

(٦) ـ صحيح لغيره. أخرجه الشيباني: ٢٣٣، عن مالك به.

واتە: لە ئیبنو شیهابەوە ﷺ گێڕدراوەتەوە (گوتوویەتی): پێغەمبەری خوا ﷺ لە ڕۆژی جەژنی ڕەمەزان و جەژنی قورباندا پێش وتاردان نوێژی دەکرد.

**٤٩٠-** عَنْ مَالِكٍ ﷺ؛ أَنَّهُ بَلَغَهُ، أَنَّ أَبَا بَكْرٍ، وَعُمَرَ ﷺ كَانَا يَفْعَلَانِ ذَلِكَ[١].

واتە: لە مالیکەوە ﷺ گێڕدراوەتەوە کە پێی گەیشتووە ئیمامی ئەبو بەکر و عومەر ﷺ هەر بەو شێوەیان دەکرد (واتە: لە دوو جەژنەکاندا نوێژیان پێش وتار دەخست).

**٤٩١-** عَنْ أَبِي عُبَيْدٍ، مَوْلَى ابْنِ أَزْهَرَ ﷺ، أَنَّهُ قَالَ: شَهِدْتُ الْعِيدَ مَعَ عُمَرَ بْنِ الْخَطَّابِ ﷺ فَصَلَّى، ثُمَّ انْصَرَفَ، فَخَطَبَ النَّاسَ، فَقَالَ: إِنَّ هَذَيْنِ يَوْمَانِ نَهَى رَسُولُ اللهِ ﷺ عَنْ صِيَامِهِمَا: يَوْمُ فِطْرِكُمْ مِنْ صِيَامِكُمْ، وَالآخَرُ يَوْمٌ تَأْكُلُونَ فِيهِ مِنْ نُسُكِكُمْ[٢].

قَالَ أَبُو عُبَيْدٍ ﷺ: ثُمَّ شَهِدْتُ الْعِيدَ مَعَ عُثْمَانَ بْنِ عَفَّانَ ﷺ، فَجَاءَ فَصَلَّى، ثُمَّ انْصَرَفَ فَخَطَبَ، وَقَالَ: إِنَّهُ قَدِ اجْتَمَعَ لَكُمْ فِي يَوْمِكُمْ هَذَا عِيدَانِ، فَمَنْ أَحَبَّ مِنْ أَهْلِ الْعَالِيَةِ أَنْ يَنْتَظِرَ الْجُمُعَةَ، فَلْيَنْتَظِرْهَا، وَمَنْ أَحَبَّ أَنْ يَرْجِعَ، فَقَدْ أَذِنْتُ لَهُ[٣].

قَالَ أَبُو عُبَيْدٍ ﷺ: ثُمَّ شَهِدْتُ الْعِيدَ مَعَ عَلِيِّ بْنِ أَبِي طَالِبٍ ﷺ، وَعُثْمَانُ مَحْصُورٌ، فَجَاءَ، فَصَلَّى، ثُمَّ انْصَرَفَ، فَخَطَبَ[٤].

واتە: لە ئەبو عوبەیدی خزمەتکاری ئیبنو ئەزهەرەوە ﷺ گێڕدراوەتەوە گوتوویەتی: لەگەڵ عومەری کوڕی خەتتاب ﷺ ئامادەی نوێژی جەژن بووم (لە سەردەمی خەلافەتی ئەودا)، جا دەستی بە نوێژ کرد و سەلامی دایەوە و وتاری بۆ خەڵکی دا و، گوتی: ئەمانە دوو ڕۆژن پێغەمبەری خوا ﷺ نەهی کردووە لە بەڕۆژووبوون تیایاندا: ڕۆژی جەژنی ڕەمەزان ڕۆژێکە ڕۆژوو دەشکێنن (بەڕۆژوبوونی ڕەمەزان کۆتایی پێدێنن)، وە ڕۆژەکەی دیکە (ڕۆژی جەژنی قوربانە) لە قوربانییەکەتان دەخۆن.

---

(١) ـ صحيح. أخرجه أبو مصعب الزهري: ٥٨٧؛ والحدثاني: ١٨٩، كلهم عن مالك به.

(٢) ـ صحيح. أخرجه أبو مصعب الزهري: ٥٨٨؛ والحدثاني: ١٨٩؛ والشيباني: ٢٣٢؛ والشافعي: ٢٦٢؛ وفي: ٣٤٥؛ وابن حنبل: ٢٨٢؛ والبخاري: ١٩٩٠؛ ومسلم: ١٣٨؛ وابن حبان: ٣٦٠٠، كلهم عن مالك به.

(٣) ـ صحيح.

(٤) ـ صحيح.

ئەبو عوبەید ﷺ گوتوویەتی: دواتر ئامادەی جەژن بووم لەگەڵ عوسمانی کوڕی عەففان ـ ﷺ ـ (واتە لە سەردەمی خەلافەتی ئەودا)، جا هات و نوێژی کرد، دواتر سەلامی دایەوە و وتاری دا و گوتی: لەم ڕۆژەتاندا دوو جەژنتان بۆ کۆ بۆتەوە (واتە هەم جەژنە هەم هەینییە)، جا هەر کەسێك لە خەڵکی گوندەکانی دەوروبەری مەدینە هاتووە و حەز دەکات چاوەڕێی نوێژی هەینیش بکات، ئەوە با چاوەڕێ بکات، وە هەر کەسێك حەز دەکات بگەڕێتەوە، ئەوە مۆڵەتم پێ دا.

ئەبو عوبەید ﷺ گوتوویەتی: دواتر ئامادەی جەژن بووم لەگەڵ عەلی کوڕی ئەبو تالیب ﷺ، لە کاتێکدا ئیمامی عوسمان ـ ﷺ ـ گەمارۆ درابوو (لەلایەن نەیارەکانی، بۆیە نەیتوانی نوێژی جەژن بۆ مسوڵمانان بکات، بۆیە ئیمامی عەلی ـ ﷺ ـ بەم ئەرکە هەڵسا)، جا هات نوێژی کرد و سەلامی دایەوە و وتاری دا (واتە هەموویان نوێژی جەژنیان پێشی وتارەکە خستووە).

## ٣- فەرمانکردن بە خواردن پێش دەرچوون بۆ نوێژی جەژن[١]

**٤٩٢-** عَنْ هِشَامِ بْنِ عُرْوَةَ ﷺ، عَنْ أَبِيهِ ﷺ، أَنَّهُ كَانَ يَأْكُلُ يَوْمَ عِيدِ الْفِطْرِ قَبْلَ أَنْ يَغْدُوَ[٢].

واتە: لە هیشامی کوڕی عورەوە ﷺ گێردراوەتەوە، ئەویش لە باوکیەوە ﷺ گێراویەتەوە بەوەی هەموو جار لە ڕۆژی جەژنی ڕەمەزان پێش ئەوەی بچێت بۆ مزگەوت شتێکی دەخوارد.

**٤٩٣-** عَنِ ابْنِ شِهَابٍ ﷺ، عَنْ سَعِيدِ بْنِ الْمُسَيَّبِ ﷺ أَنَّهُ أَخْبَرَهُ، أَنَّ النَّاسَ كَانُوا يُؤْمَرُونَ بِالأَكْلِ يَوْمَ الْفِطْرِ قَبْلَ الْغُدُوِّ[٣].

قَالَ مَالِكٌ ﷺ: وَلاَ أَرَى ذَلِكَ عَلَى النَّاسِ فِي الأَضْحَى.

---

(١) ـ الأَمْرُ بِالأَكْلِ قَبْلَ الْغُدُوِّ فِي الْعِيدِ.

(٢) ـ مقطوع صحيح. أخرجه أبو مصعب الزهري: ٥٨٤؛ والحدثاني: ١٨٨، كلهم عن مالك به.

(٣) ـ مقطوع صحيح. أخرجه أبو مصعب الزهري: ٥٨٥؛ والحدثاني: ١٨٨؛ وفي: ١٨٨؛ ومصنف ابن أبي شيبة: ٥٦٠٠، كلهم عن مالك به.

واتە: لە ئیبنو شیهابەوە ﷺ گێردراوەتەوە، ئەویش لە سەعیدی کوڕی موسەیەبەوە ﷺ گێڕاویەتەوە بەوەی هەواڵی پێداوە (گوتوویەتی): خەڵك فەرمانیان پێدەکرا بە خواردنی خۆراك لە ڕۆژی جەژنی ڕەمەزاندا پێش چوون بۆ نوێژی جەژن.

ئیمامی مالیك ﷺ گوتوویەتی: پێم وانییە خەڵك ئەوەیان لەسەر بێ لە جەژنی قورباندا (واتە تەنها لە ڕەمەزاندا ئەوە سوننەتە، چونکە تا ڕۆژەکە جیاوازی پێوە دیاربێ لەگەڵ ڕۆژەکانی پێشوو کە ڕۆژانی ڕەمەزان بووە و خواردن نەخوراوە، بەڵام ئەوە لە جەژنی قورباندا نایەتەجێ).

## ٤- ئەوەی هاتووە دەربارەی تەکبیرکردن و قورئانخوێندن لە نوێژی دوو جەژنەکاندا[١]

٤٩٤- عَنْ عُبَيْدِ اللهِ بْنِ عَبْدِ اللهِ بْنِ عُتْبَةَ بْنِ مَسْعُودٍ ﷺ، أَنَّ عُمَرَ بْنَ الْخَطَّابِ ﷺ سَأَلَ أَبَا وَاقِدٍ اللَّيْثِيَّ ﷺ، مَا كَانَ يَقْرَأُ بِهِ رَسُولُ اللهِ ﷺ فِي الأَضْحَى وَالْفِطْرِ؟ فَقَالَ: كَانَ يَقْرَأُ بِـ ﴿قٓ ۚ وَٱلْقُرْءَانِ ٱلْمَجِيدِ ١﴾ ق، وَ ﴿ٱقْتَرَبَتِ ٱلسَّاعَةُ وَٱنشَقَّ ٱلْقَمَرُ ١﴾ القمر[٢].

واتە: لە عوبەیدوڵڵای کوڕی عەبدوڵڵای کوڕی عوتبەی کوڕی مەسعودەوە ﷺ گێردراوەتەوە (گوتوویەتی): عومەری کوڕی خەتتاب ﷺ پرسیاری لە ئەبو واقیدی لەیسی ﷺ کرد (گوتی): پێغەمبەری خوا ﷺ چی دەخوێند لە نوێژی جەژنی قوربان و ڕەمەزاندا؟ ئەویش گوتی: سوڕەتی: ﴿قٓ ۚ وَٱلْقُرْءَانِ ٱلْمَجِيدِ ١﴾ق، و سوڕەتی: ﴿ٱقْتَرَبَتِ ٱلسَّاعَةُ وَٱنشَقَّ ٱلْقَمَرُ ١﴾القمر، ی دەخوێند.

٤٩٥- عَنْ نَافِعٍ ﷺ، مَوْلَى عَبْدِ اللهِ بْنِ عُمَرَ ﷺ، أَنَّهُ قَالَ: شَهِدْتُ الأَضْحَى وَالْفِطْرَ مَعَ أَبِي هُرَيْرَةَ ﷺ، فَكَبَّرَ فِي الرَّكْعَةِ الأُولَى سَبْعَ تَكْبِيرَاتٍ قَبْلَ الْقِرَاءَةِ، وَفِي الآخِرَةِ خَمْسَ تَكْبِيرَاتٍ قَبْلَ الْقِرَاءَةِ.

قَالَ مَالِكٌ ﷺ: وَهُوَ الأَمْرُ عِنْدَنَا[٣].

---

(١) ـ مَا جَاءَ فِي التَّكْبِيرِ وَالْقِرَاءَةِ فِي صَلَاةِ الْعِيدَيْنِ.

(٢) ـ صحيح. أخرجه أبو مصعب الزهري: ٥٨٩؛ والحدثاني: ١٩٠؛ والشيباني: ٢٣٦؛ والشافعي: ٣٤١؛ وفي: ١٠٤١؛ وابن حنبل: ٢١٩٤٦؛ ومسلم: ١٤؛ وأبو داود: ١١٥٤؛ والترمذي: ٥٣٤؛ وابن حبان: ٢٨٢٠، كلهم عن مالك به.

(٣) ـ صحيح. أخرجه أبو مصعب الزهري: ٥٩٠؛ والحدثاني: ١٩٠؛ والشيباني: ٢٣٧؛ والشافعي: ٣٤٠، كلهم عن مالك به.

واتە: لە نافیعی ﷺ خزمەتکاری عەبدوڵڵای کوڕی عومەرەوە ﷺ گێردراوەتەوە گوتوویەتی: ئامادەی نوێژی جەژنی قوربان و ڕەمەزان بووم لەگەڵ ئەبو هوڕەیرە ﷺ، جا لە ڕکاتی یەکەم پێش خوێندنی فاتیحە حەوت جار «الله أكبر»ی کرد، وە لە ڕکاتەکەی دیکە پێش خوێندنی فاتیحە پێنج جار «الله أكبر»ی کرد.

ئیمامی مالیك ﷺ گوتوویەتی: بابەتەکە لای ئێمەش هەر وایە.

**٤٩٦- [فتوى] قَالَ مَالِكٌ ﷺ فِي رَجُلٍ وَجَدَ النَّاسَ قَدِ انْصَرَفُوا مِنَ الصَّلاَةِ يَوْمَ الْعِيدِ: إِنَّهُ لاَ يَرَى عَلَيْهِ صَلاَةً فِي الْمُصَلَّى، وَلاَ فِي بَيْتِهِ، وَإِنَّهُ إِنْ صَلَّى فِي الْمُصَلَّى، أَوْ فِي بَيْتِهِ، لَمْ أَرَ بِذَلِكَ بَأْسًا، وَيُكَبِّرُ سَبْعًا فِي الأُولَى قَبْلَ الْقِرَاءَةِ، وَخَمْسًا فِي الثَّانِيَةِ قَبْلَ الْقِرَاءَةِ[١].**

(فەتوا): ئیمامی مالیك ﷺ دەربارەی پیاوێك کە ببینێ خەڵك تەواو بوون لە نوێژی جەژن لە ڕۆژی جەژندا، گوتوویەتی: پێم وا نییە نوێژی لەسەر بێت نە لە موصەڵا و شوێنی نوێژکردنی جەژن و نە لە ماڵەوەش، وە ئەگەر هاتوو (لەگەڵ ئەوەشدا) نوێژەکەی کرد لە شوێنی نوێژکردنی جەژن یان لە ماڵەوە، ئەوە پێم وا نییە هیچ کێشەی تیا بێت (دروستە)، وە (دەربارەی چۆنێتییەکەش) لە ڕکاتی یەکەم پێش قوڕئانخوێندن حەوت جار «الله أكبر» دەکات، وە لە ڕکاتی دووەمدا پێش قوڕئانخوێندن پێنج جار «الله أكبر» دەکات[٢].

## ٥- نەکردنی نوێژی سوننەت لە پێش و پاشی نوێژی دوو جەژنەکان[٣]

**٤٩٧- أَنَّ عَبْدَ اللهِ بْنَ عُمَرَ ﷺ لَمْ يَكُنْ يُصَلِّي يَوْمَ الْفِطْرِ قَبْلَ الصَّلاَةِ وَلاَ بَعْدَهَا[٤].**

---

(١) ـ أخرجه أبو مصعب الزهري: ٥٩١؛ وفي: ٥٩٢؛ والحدثاني: ١٩٠؛ وفي: ١٩٠، كلهم عن مالك به.

(٢) ـ تێبینی: لەلای ئیمامی مالیك لە ڕکاتی یەکەم تەکبیری دەستپێکردن لەگەڵ حەفتەکە حیسابە، بەڵام لە ڕکاتی دووەم تەکبیری هەستانەوە لەگەڵ پێنجەکە حیساب نییە، بەڵام لەلای ئیمامی شافیعی تەکبیری دەستپێکردن لە ڕکاتی یەکەم و تەکبیری هەڵسانەوە لە ڕکاتی دووەم لەو ژمارەیە حیساب نییە، دەبێ حەوت و پێنجەکە بێجگە لەو دوو تەکبیرە بن.

(٣) ـ تَرْكُ الصَّلاَةِ قَبْلَ الْعِيدَيْنِ وَبَعْدَهُمَا.

(٤) ـ صحيح. أخرجه أبو مصعب الزهري: ٥٩٣؛ والحدثاني: ١٩١؛ والشيباني: ٢٣٤، كلهم عن مالك به.



واتە: عەبدوڵڵای کوڕی عومەر ﷻ نوێژی (سوننەتی) نەدەکرد لە ڕۆژی جەژنی ڕەمەزاندا، نە لەپێش نوێژی جەژن و نە لە دواوەی.

٤٩٨- أَنَّ سَعِيدَ بْنَ الْمُسَيَّبِ ﷺ كَانَ يَغْدُو إِلَى الْمُصَلَّى، بَعْدَ أَنْ يُصَلِّيَ الصُّبْحَ، قَبْلَ طُلُوعِ الشَّمْسِ[١].

واتە: سەعیدی کوڕی موسەیەب ﷺ (هەموو جار لە جەژنەکاندا) زوو دەچوو بۆ شوێنی نوێژی جەژن دوای ئەوەی نوێژی بەیانی دەکرد، پێش هەڵاتنی خۆر.

## ٦- مۆڵەتدان بە کردنی نوێژ (ی سوننەت) پێش و پاشی ئەنجامدانی نوێژی دوو جەژنەکان[٢]

٤٩٩- عَنْ عَبْدِ الرَّحْمَنِ بْنِ الْقَاسِمِ ﷺ، أَنَّ أَبَاهُ الْقَاسِمَ كَانَ يُصَلِّي قَبْلَ أَنْ يَغْدُوَ إِلَى الْمُصَلَّى أَرْبَعَ رَكَعَاتٍ[٣].

واتە: لە عەبدوڕڕەحمانی کوڕی قاسمەوە ﷺ گێڕدراوەتەوە هەواڵیداوە بەوەی قاسمی باوکی پێش ئەوەی بچێت بۆ شوێنی نوێژی جەژن، چوار ڕکات نوێژی سوننەتی دەکرد (دوای هەڵاتنی خۆر).

٥٠٠- عَنْ هِشَامِ بْنِ عُرْوَةَ ﷺ، عَنْ أَبِيهِ ﷺ أَنَّهُ كَانَ يُصَلِّي يَوْمَ الْفِطْرِ قَبْلَ الصَّلَاةِ فِي الْمَسْجِدِ[٤].

واتە: لە هیشامی کوڕی عوڕوەوە ﷺ گێڕدراوەتەوە، ئەویش لە باوکیەوە ﷺ گێڕاویەتەوە بەوەی نوێژی (سوننەتی) دەکرد پێش کردنی نوێژی جەژن لە مزگەوت (دوای خۆرهەڵاتن)[٥].

---

(١) ـ مقطوع ضعيف. أخرجه أبو مصعب الزهري: ٥٩٦؛ والحدثاني: ١٩١، عن مالك به.

(٢) ـ الرُّخْصَةُ فِي الصَّلَاةِ قَبْلَ الْعِيدَيْنِ وَبَعْدَهُماَ.

(٣) ـ مقطوع صحيح. أخرجه أبو مصعب الزهري: ٥٩٤؛ والحدثاني: ١٩١؛ والشيباني: ٢٣٥، كلهم عن مالك به.

(٤) ـ مقطوع صحيح. أخرجه أبو مصعب الزهري: ٥٩٥، عن مالك به.

(٥) ـ تێبینی: ئەو نوێژکردنە سوننەتی موتڵەق بووە، نەك سوننەتی جەژن، چونکە جەژن سوننەتی نییە.





## ٧- ڕۆیشتنی ئیمام بۆ نوێژی جەژن و چاوەڕێکردنی خەڵکی بۆ وتار[١]

**٥٠١- [فتوى]** قَالَ مَالِكٌ ﵀: مَضَتِ السُّنَّةُ الَّتِي لاَ اخْتِلاَفَ فِيهَا عِنْدَنَا، فِي وَقْتِ الْفِطْرِ وَالأَضْحَى، أَنَّ الإِمَامَ يَخْرُجُ مِنْ مَنْزِلِهِ قَدْرَ مَا يَبْلُغُ مُصَلاَّهُ، وَقَدْ حَلَّتِ الصَّلاَةُ[٢].

(فەتوا): ئیمامی مالیك ﵀ گوتوویەتی: ئەو سوننەت و شێوازەی ڕاجیایی تیا نییە لای ئێمە هەر ئاوا ڕۆیشتووە و بەردەوام بووە دەربارەی کاتی نوێژی جەژنی ڕەمەزان و جەژنی قوربان بەوەی: ئیمام دەردەچێت لە ماڵەکەی بە ئەندازەی ئەوەندەی بگاتە شوێنی نوێژکردن (ڕاستەوخۆ دەست بە نوێژی جەژن بکات و وەك هەینی دانەنیشێت و چاوەڕێ نەکات)، ئەوەش لە کاتێکدایە کە نوێژی جەژن دروست بێت بکرێ (واتە: خۆرهەڵاتبێ).

**٥٠٢- [فتوى]** قَالَ يَحْيَى ﵀: سُئِلَ مَالِكٌ ﵀ عَنْ رَجُلٍ صَلَّى مَعَ الإِمَامِ يَوْمَ الْفِطْرِ، هَلْ لَهُ أَنْ يَنْصَرِفَ قَبْلَ أَنْ يَسْمَعَ الْخُطْبَةَ؟ فَقَالَ: لاَ يَنْصَرِفُ حَتَّى يَنْصَرِفَ الإِمَامُ[٣].

(فەتوا): یەحیا ﵀ گوتوویەتی: پرسیار لە ئیمامی مالیك ﵀ کرا دەربارەی کەسێك لەگەڵ ئیمام نوێژ بکات لە ڕۆژی جەژنی ڕەمەزان، ئایا بۆی هەیە بڕوات پێش ئەوەی گوێ بۆ وتار بگرێت؟ ئەویش گوتی: ناڕوات تاوەکوو ئیمام تەواو دەبێت (لە وتار).

---

(١) ـ غُدُوُّ الإِمَامِ يَوْمَ الْعِيدِ، وَانْتِظَارُ الْخُطْبَةِ.

(٢) ـ أخرجه أبو مصعب الزهري: ٥٩٧؛ والحدثاني: ١٩١، كلهم عن مالك به.

(٣) ـ أخرجه أبو مصعب الزهري: ٥٩٨؛ والحدثاني: ١٩١، كلهم عن مالك به.

## نوێژی ترس[١]

٥٠٣- عَنْ صَالِحِ بْنِ خَوَّاتٍ ﷺ، عَمَّنْ صَلَّى مَعَ رَسُولِ اللهِ ﷺ يَوْمَ ذَاتِ الرِّقَاعِ صَلاَةَ الْخَوْفِ، أَنَّ طَائِفَةً صَفَّتْ مَعَهُ، وَصَفَّتْ طَائِفَةٌ وُجَاهَ الْعَدُوِّ، فَصَلَّى بِالَّتِي مَعَهُ رَكْعَةً، ثُمَّ ثَبَتَ قَائِمًا، وَأَتَمُّوا لأَنْفُسِهِمْ، ثُمَّ انْصَرَفُوا، فَصَفُّوا وُجَاهَ الْعَدُوِّ، وَجَاءَتِ الطَّائِفَةُ الأُخْرَى، فَصَلَّى بِهِمُ الرَّكْعَةَ الَّتِي بَقِيَتْ مِنْ صَلاَتِهِ، ثُمَّ ثَبَتَ جَالِسًا، وَأَتَمُّوا لأَنْفُسِهِمْ، ثُمَّ سَلَّمَ بِهِمْ[٢].

واتە: لە صالحی کوڕی خەواتەوە ﷺ گێردراوەتەوە، ئەویش لە یەکێك لە هاوەڵانی گێڕاوەتەوە بەوەی نوێژی ترسی لەگەڵ پێغەمبەری خوا ﷺ کردووە لە «ذات الرِّقاع» (گوتوویەتی): کۆمەڵێك لەگەڵی ڕیز بوون، کۆمەڵێکی دیکەش لەبەرانبەر دوژمن وەستان، جا ڕکاتێك نوێژی بەوانە کرد کە لەگەڵی وەستابوون، دواتر (بۆ ڕەکەتی دووەم) بە پێوە وەستا، کۆمەڵەکەش نوێژەکەی خۆیان تەواو کرد، دواتر سەلامیان دایەوە و ڕیزیان بەست بەرانبەر دوژمن، جا کۆمەڵەکەی دیکە هاتن و ڕکاتەکەی دیکەی پێکردن کە مابۆیەوە لە نوێژەکەی، دواتر لە دانیشتنی تەحیات مایەوە (درێژی کردەوە)، کۆمەڵەکەش هەڵسانەوە و ڕکاتەکەی دیکەیان تەواو کرد بۆ خۆیان و (خۆیان گەیاندەوە تەحیاتی پێغەمبەری خوا ﷺ)، دواتر سەلامی لەگەڵ دانەوە.

٥٠٤- عَنْ صَالِحِ بْنِ خَوَّاتٍ الأَنْصَارِيِّ ﷺ، أَنَّ سَهْلَ بْنَ أَبِي حَثْمَةَ الأَنْصَارِيَّ ﷺ حَدَّثَهُ، أَنَّ صَلاَةَ الْخَوْفِ أَنْ يَقُومَ الإِمَامُ، وَمَعَهُ طَائِفَةٌ مِنْ أَصْحَابِهِ، وَطَائِفَةٌ مُوَاجِهَةٌ الْعَدُوَّ، فَيَرْكَعُ الإِمَامُ رَكْعَةً، وَيَسْجُدُ بِالَّذِينَ مَعَهُ، ثُمَّ يَقُومُ، فَإِذَا اسْتَوَى قَائِمًا، ثَبَتَ، وَأَتَمُّوا لأَنْفُسِهِمُ الرَّكْعَةَ الْبَاقِيَةَ، ثُمَّ يُسَلِّمُونَ، وَيَنْصَرِفُونَ، وَالإِمَامُ قَائِمٌ، فَيَكُونُونَ وُجَاهَ الْعَدُوِّ، ثُمَّ يُقْبِلُ الآخَرُونَ الَّذِينَ لَمْ يُصَلُّوا، فَيُكَبِّرُونَ وَرَاءَ الإِمَامِ، فَيَرْكَعُ بِهِمْ وَيَسْجُدُ، ثُمَّ يُسَلِّمُ، فَيَقُومُونَ، فَيَرْكَعُونَ لأَنْفُسِهِمُ الرَّكْعَةَ الثَّانِيَةِ، ثُمَّ يُسَلِّمُونَ[٣].

---

(١) ـ صَلاَةُ الْخَوْفِ.

(٢) ـ صحيح. أخرجه أبو مصعب الزهري: ٥٩٩؛ وفي: ٦٠٣؛ والحدثاني: ١٩٥؛ والشافعي: ٨٦٢؛ وابن حنبل: ٢٣١٨٥؛ والبخاري: ٤١٢٩؛ ومسلم: ٣١٠؛ والنسائي: ١٥٣٧؛ وأبو داود: ١٢٣٨؛ والترمذي: ٥٦٧؛ والقابسي: ٥١٤، كلهم عن مالك به.

(٣) ـ صحيح. أخرجه أبو مصعب الزهري: ٦٠٠؛ والحدثاني: ١٩٥؛ وأبو داود: ١٢٣٩، كلهم عن مالك به.

واتە: لە صالحی کوڕی خەواتی ئەنصارییەوە ﷺ گێڕدراوەتەوە، ئەویش لە سەهلی کوڕی ئەبو حەثمەی ئەنصارییەوە ﷺ گێڕاویەتەوە بۆی باسکردووە (گوتوویەتی): نوێژی ترس ئاوایە: ئیمام دەوەستێ و کۆمەڵێك لە هاوەڵانیشی لەگەڵی دەوەستن، کۆمەڵێکیش ڕوو لە دوژمن دەکەن، جا ئیمام ڕکوع و سوژدەکانی ڕکاتی یەکەم بەو کەسانە دەبات کە لەگەڵین، دواتر هەڵدەستێتەوە، جا کاتێ بەتەواوی ڕاست بۆیەوە هەر ڕادەوەستێت و دەمێنێتەوە، (ئەوانەی لەگەڵی بوون) ئەو ڕکاتەی ماوە بۆخۆیان تەواوی دەکەن، دواتر سەلام دەدەنەوە و دەڕۆن، لە کاتێکدا ئیمام هێشتا وەستاوە (لەناو ڕکاتی دووەم)، جا کۆمەڵەکە دەچن بەرەو ڕووی دوژمن ڕادەوەستن، دواتر ئەوانە دێن کە نوێژیان نەکردووە، جا نوێژ دادەبەستن لە دوای ئیمام، ئەویش ڕکوع و سوژدەکانیان پێ دەبات، دواتر سەلام دەداتەوە، کۆمەڵەکەش هەڵدەستنەوە و ڕکاتی دووەم بۆخۆیان دەکەن، دواتر سەلام دەدەنەوە.

٥٠٥- عَنْ نَافِعٍ ﷺ، أَنَّ عَبْدَ اللهِ بْنَ عُمَرَ ﷺ كَانَ إِذَا سُئِلَ عَنْ صَلاَةِ الْخَوْفِ، قَالَ: يَتَقَدَّمُ الإِمَامُ، وَطَائِفَةٌ مِنَ النَّاسِ، فَيُصَلِّي بِهِمُ الإِمَامُ رَكْعَةً، وَتَكُونُ طَائِفَةٌ مِنْهُمْ بَيْنَهُ وَبَيْنَ الْعَدُوِّ، لَمْ يُصَلُّوا، فَإِذَا صَلَّى الَّذِينَ مَعَهُ رَكْعَةً، اسْتَأْخَرُوا مَكَانَ الَّذِينَ لَمْ يُصَلُّوا، وَلاَ يُسَلِّمُونَ، وَيَتَقَدَّمُ الَّذِينَ لَمْ يُصَلُّوا، فَيُصَلُّونَ مَعَهُ رَكْعَةً، ثُمَّ يَنْصَرِفُ الإِمَامُ، وَقَدْ صَلَّى رَكْعَتَيْنِ، فَتَقُومُ كُلُّ وَاحِدٍ مِنَ الطَّائِفَتَيْنِ، فَيُصَلُّونَ لأَنْفُسِهِمْ رَكْعَةً رَكْعَةً، بَعْدَ أَنْ يَنْصَرِفَ الإِمَامُ، فَيَكُونُ كُلُّ وَاحِدٍ مِنَ الطَّائِفَتَيْنِ قَدْ صَلَّوْا رَكْعَتَيْنِ، فَإِنْ كَانَ خَوْفًا هُوَ أَشَدَّ مِنْ ذَلِكَ، صَلَّوْا رِجَالاً قِيَامًا عَلَى أَقْدَامِهِمْ، أَوْ رُكْبَانًا مُسْتَقْبِلِي الْقِبْلَةِ، أَوْ غَيْرَ مُسْتَقْبِلِيهَا[1].

قَالَ مَالِكٌ ﷺ: قَالَ نَافِعٌ ﷺ: لاَ أَرَى عَبْدَ اللهِ بْنَ عُمَرَ ﷺ حَدَّثَهُ إِلاَّ عَنْ رَسُولِ اللهِ ﷺ.

واتە: لە نافیعەوە ﷺ گێڕدراوەتەوە (گوتوویەتی): عەبدوڵڵای کوڕی عومەر ﷺ هەموو جار کاتێ پرسیاری لێ کرابایە دەربارەی نوێژی ترس، دەیگوت: ئیمام پێش دەکەوێت و کۆمەڵێکیش لە خەڵکی (لەگەڵی دەست بە نوێژ دەکەن)، جا ئیمام ڕکاتێکیان پێ دەکات، وە کۆمەڵێکی دیکەش لەنێوان ئەوان و دوژمن دەوەستن نوێژ

---

(١) ـ صحيح. أخرجه أبو مصعب الزهري: ٦٠١؛ والحدثاني: ١٩٦؛ والشيباني: ٢٩٠؛ والشافعي: ٨٢؛ وفي: ١١٧٢؛ والبخاري: ٤٥٣٥؛ والمنتقى لابن الجارود: ٢٣٤، كلهم عن مالك به.

ناكەن (چاودێری دوژمن دەكەن نەوەك دوژمن سەرقاڵییەكەی ئەوان بقۆزێتەوە)، جا كاتێ ئەوانەی لەگەڵ ئیمامن ڕكاتێكیان كرد، دەچنە دواوە بۆ شوێنی ئەوانەی نوێژیان نەكردووە، سەلامیش نادەنەوە (هەر لەناو نوێژ حیسابن)، وە ئەوانە دێنە پێشەوە كە نوێژیان نەكردووە، جا ڕكاتێك لەگەڵ ئیمام دەكەن، دواتر ئیمام سەلامی خۆی دەداتەوە لە كاتێكدا دوو ڕكاتی تەواوی خۆی ئەنجام داوە، جا هەردوو كۆمەڵەكە دەوەستن و هەر یەكەو ڕكاتێك بۆخۆی دەكات دوای سەلامدانەوەی ئیمام، جا بەمەش هەر كۆمەڵەیەك لە دوو كۆمەڵەكە دوو ڕكاتیان ئەنجام داوە، جا ئەگەر ترسەكە لەوە زیاتر بوو، ئەوە بەدەم ڕۆیشتنەوە بەپیادە نوێژ دەكەن، یان بەسواری، جا ڕوویان لە قیبلە بێت یان ڕوویان لە قیبلە نەبێت.

ئیمامی مالیك ﷬ گوتوویەتی: نافیع ﷬ گوتوویەتی: پێم وا نییە عەبدوڵڵای كوڕی عومەر ﭭ ئەو فەرموودەی لە كەسەوە گێڕابێتەوە جگە لە پێغەمبەری خوا ﷺ.

**٥٠٦- عَنْ سَعِيدِ بْنِ الْمُسَيَّبِ ﷬، أَنَّهُ قَالَ: مَا صَلَّى رَسُولُ اللهِ ﷺ الظُّهْرَ وَالْعَصْرَ يَوْمَ الْخَنْدَقِ حَتَّى غَابَتِ الشَّمْسُ[١].**

**قَالَ مَالِكٌ ﷬: وَحَدِيثُ الْقَاسِمِ بْنِ مُحَمَّدٍ ﷬، عَنْ صَالِحِ بْنِ خَوَّاتٍ ﷬، أَحَبُّ مَا سَمِعْتُ إِلَيَّ فِي صَلَاةِ الْخَوْفِ[٢].**

واتە: لە سەعیدی كوڕی موسەیەبەوە ﷬ گێڕدراوەتەوە گوتوویەتی: پێغەمبەری خوا ﷺ لە ڕۆژی خەندەقدا نوێژی نیوەڕۆ و عەسری نەكرد تا خۆر ئاوا بوو، (چونكە كاتەكە زۆر مەترسیدار بوو و مەجال نەبوو).

ئیمامی مالیك ﷬ گوتوویەتی: فەرموودەی قاسمی كوڕی موحەممەد ﷬ كە لە صالحی كوڕی خەواتەوە ﷬ گێڕاویەتەوە، خۆشەویستترین و چاكترین فەرموودەیە لەلام كە گوێم لێ بووە دەربارەی نوێژی ترس (كە دەكاتە فەرموودەی ژمارە ٥٠٤).

---

(١) ـ صحيح لغيره. أخرجه أبو مصعب الزهري: ٦٠٢؛ والحدثاني: ١٩٦، كلهم عن مالك به.

(٢) ـ أخرجه الحدثاني: ١٩٦، عن مالك به.



# پەرتووكی

# نوێژی خۆرگیران و مانگگیران[1]



---

١) ـ كِتابُ صَلاةِ الكُسوفِ.

## ١- چۆنیەتی نوێژی مانگ و خۆرگیران[1]

**٥٠٧- عَنْ عَائِشَةَ ﵂، زَوْجِ النَّبِيِّ ﷺ، أَنَّهَا قَالَتْ: خَسَفَتِ الشَّمْسُ فِي عَهْدِ النَّبِيِّ ﷺ، فَصَلَّى رَسُولُ اللهِ ﷺ بِالنَّاسِ، فَقَامَ فَأَطَالَ الْقِيَامَ، ثُمَّ رَكَعَ فَأَطَالَ الرُّكُوعَ، ثُمَّ قَامَ فَأَطَالَ الْقِيَامَ، وَهُوَ دُونَ الْقِيَامِ الأَوَّلِ، ثُمَّ رَكَعَ فَأَطَالَ الرُّكُوعَ، وَهُوَ دُونَ الرُّكُوعِ الأَوَّلِ، ثُمَّ رَفَعَ فَسَجَدَ، ثُمَّ فَعَلَ فِي الرَّكْعَةِ الآخِرَةِ مِثْلَ ذَلِكَ، ثُمَّ انْصَرَفَ وَقَدْ تَجَلَّتِ الشَّمْسُ، فَخَطَبَ النَّاسَ، فَحَمِدَ اللهَ وَأَثْنَى عَلَيْهِ، ثُمَّ قَالَ: إِنَّ الشَّمْسَ وَالْقَمَرَ آيَتَانِ مِنْ آيَاتِ اللهِ، لاَ يَخْسِفَانِ لِمَوْتِ أَحَدٍ، وَلاَ لِحَيَاتِهِ، فَإِذَا رَأَيْتُمْ ذَلِكَ فَادْعُوا اللهَ، وَكَبِّرُوا، وَتَصَدَّقُوا، ثُمَّ قَالَ: يَا أُمَّةَ مُحَمَّدٍ، وَاللَّهِ مَا مِنْ أَحَدٍ أَغْيَرَ مِنَ اللهِ ﷻ، أَنْ يَزْنِيَ عَبْدُهُ أَوْ تَزْنِيَ أَمَتُهُ، يَا أُمَّةَ مُحَمَّدٍ، وَاللَّهِ لَوْ تَعْلَمُونَ مَا أَعْلَمُ، لَضَحِكْتُمْ قَلِيلاً، وَلَبَكَيْتُمْ كَثِيراً[2].**

واتە: لە عائیشەی ﵂ خێزانی پێغەمبەری خواوە ﷺ گێڕدراوەتەوە گوتوویەتی: لە سەردەمی پێغەمبەری خوادا ﷺ خۆرگیرا، جا پێغەمبەری خوا ﷺ نوێژی (خۆرگیرانی) بۆ خەڵکی کرد (بەم شێوەیە): وەستانی بۆ خوێندنی قورئان درێژکردەوە، دواتر ڕکوعی برد و ڕکوعەکەی درێژ کردەوە، دواتر (دووبارە) هەڵسایەوە و وەستانەکەی درێژ کردەوە کەمتر لە وەستانەکەی یەکەم، دواتر (دووبارە) ڕکوعی برد و ڕکوعەکەی درێژ کردەوە کەمتر لە ڕکوعی یەکەم، دواتر هەڵسایەوە، دواتر سوژدەی برد، دواتر لە ڕکاتەکەی دیکەش بە هەمان شێوەی کرد، دواتر سەلامی دایەوە لە کاتێکدا خۆر دەرکەوتبۆیەوە، جا وتاری بۆ خەڵکی دا، (لە وتارەکەدا): ستاییشی خوای پەروەردگاری کرد و بەجوانی وەسفی کرد، دواتر فەرمووی: خۆر و مانگ دوو نیشانەن لە نیشانەکانی گەورەیی خوای پەروەردگار، ناگیرێن و تاریك نابن لەبەر مردن یان ژیانی کەسێك، جا ئەگەر خۆرگیران یان مانگگیرانتان بینی، ئەوە نزا لەلای خوای پەروەردگار بکەن و الله أکبر بکەن و خێر و صەدەقە بکەن، دواتر فەرمووی: ئەی ئوممەتی موحەممەد ﷺ، سوێند بە

---

(١) ـ الْعَمَلُ فِي صَلاَةِ الْكُسُوفِ.

(٢) ـ صحيح. أخرجه أبو مصعب الزهري: ٦٠٥؛ والحدثاني: ١٩٤؛ والشافعي: ٨٦٦؛ والبخاري: ١٠٤٤، وفي: ٥٢٢١؛ ومسلم: ١؛ والنسائي: ١٤٧٤؛ وأبو داود: ١١٩١؛ وابن حبان: ٢٨٤٥؛ والدارمي: ١٥٣٠، كلهم عن مالك به.




خوا هیچ کەسێك بە ئەندازەی خوا ﷻ بە سەرپێچی و تاوان تووڕە نابێت و هیچ کەس ئەوەندەی خوا پێی ناخۆش نییە بەوەی پیاوێك یان ئافرەتێك زینا دەكات، ئەی ئوممەتی موحەممەد ﷺ، ئەگەر ئەو شتانە بزانن کە من دەیزانم، ئەوە کەم پێدەکەنین و زۆر دەگریان[١].

٥٠٨- عَنْ عَبْدِ اللهِ بْنِ عَبَّاسٍ رضي الله عنهما، أَنَّهُ قَالَ: خَسَفَتِ الشَّمْسُ، فَصَلَّى رَسُولُ اللهِ ﷺ، وَالنَّاسُ مَعَهُ، فَقَامَ قِيَامًا طَوِيلاً، قَالَ: نَحْوًا مِنْ سُورَةِ الْبَقَرَةِ، قَالَ: ثُمَّ رَكَعَ رُكُوعًا طَوِيلاً، ثُمَّ رَفَعَ فَقَامَ قِيَامًا طَوِيلاً وَهُوَ دُونَ الْقِيَامِ الأَوَّلِ، ثُمَّ رَكَعَ رُكُوعًا طَوِيلاً وَهُوَ دُونَ الرُّكُوعِ الأَوَّلِ، ثُمَّ سَجَدَ، ثُمَّ قَامَ قِيَامًا طَوِيلاً وَهُوَ دُونَ الْقِيَامِ الأَوَّلِ، ثُمَّ رَكَعَ رُكُوعًا طَوِيلاً وَهُوَ دُونَ الرُّكُوعِ الأَوَّلِ، ثُمَّ رَفَعَ فَقَامَ قِيَامًا طَوِيلاً وَهُوَ دُونَ الْقِيَامِ الأَوَّلِ، ثُمَّ رَكَعَ رُكُوعًا طَوِيلاً وَهُوَ دُونَ الرُّكُوعِ الأَوَّلِ، ثُمَّ سَجَدَ، ثُمَّ انْصَرَفَ وَقَدْ تَجَلَّتِ الشَّمْسُ، فَقَالَ: إِنَّ الشَّمْسَ وَالْقَمَرَ آيَتَانِ مِنْ آيَاتِ اللهِ، لاَ يَخْسِفَانِ لِمَوْتِ أَحَدٍ وَلاَ لِحَيَاتِهِ، فَإِذَا رَأَيْتُمْ ذَلِكَ، فَاذْكُرُوا اللهَ، قَالُوا: يَا رَسُولَ اللهِ، رَأَيْنَاكَ تَنَاوَلْتَ شَيْئًا فِي مَقَامِكَ هَذَا، ثُمَّ رَأَيْنَاكَ تَكَعْكَعْتَ، فَقَالَ: إِنِّي رَأَيْتُ الْجَنَّةَ، فَتَنَاوَلْتُ مِنْهَا عُنْقُودًا، وَلَوْ أَخَذْتُهُ لأَكَلْتُمْ مِنْهُ مَا بَقِيَتِ الدُّنْيَا، وَرَأَيْتُ النَّارَ، فَلَمْ أَرَ كَالْيَوْمِ مَنْظَرًا قَطُّ، وَرَأَيْتُ أَكْثَرَ أَهْلِهَا النِّسَاءَ، قَالُوا: لِمَ يَا رَسُولَ اللهِ؟ قَالَ: لِكُفْرِهِنَّ، قِيلَ: أَيَكْفُرْنَ بِاللَّهِ؟ قَالَ: وَيَكْفُرْنَ الْعَشِيرَ، وَيَكْفُرْنَ الإِحْسَانَ، لَوْ أَحْسَنْتَ إِلَى إِحْدَاهُنَّ الدَّهْرَ كُلَّهُ، ثُمَّ رَأَتْ مِنْكَ شَيْئًا، قَالَتْ: مَا رَأَيْتُ مِنْكَ خَيْرًا قَطُّ[٢].

واتە: لە عەبدوڵڵای کوڕی عەبباسەوە رضي الله عنهما گێردراوەتەوە گوتوویەتی: خۆر گیرا، جا پێغەمبەری خوا ﷺ نوێژی (خۆرگیرانی) کرد، خەڵکیش لەگەڵی بوون، جا (لە نوێژەکەدا) وەستا بە وەستانێکی درێژ، دەڵێ: بەئەندازەی سوڕەتی بەقەڕە، دەڵێ:

---

(١) ـ تێبینی: لەلای ئیمامی مالیك خوتبە لەدوای نوێژی خۆرگیران سوننەت نییە، بەڵام ئامۆژگاری کردنی خەڵك دروستە، بۆیە ئەو فەرموودەیە بەو شێوەیە لێکدەداتەوە، نەك وەکوو جومعە وتاری هەبێ، بەڵام لەلای ئیمامی شافیعی نوێژی خۆرگیران خوتبەی لە دوا سوننەتە و هەیەتی بە بەڵگەی ئەو فەرموودەیە.

(٢) ـ صحيح. أخرجه أبو مصعب الزهري: ٦٠٦؛ والحدثاني: ١٩٢؛ والشافعي: ٣٤٦؛ والشافعي: ٨٦٤؛ وابن حنبل: ٢٧١١، وفي: ٣٣٧٤، وفي: ٣٣٧٤؛ والبخاري، ٢٩، وفي: ٤٣١، وفي: ٧٤٨، وفي: ١٠٥٢، وفي: ٣٢٠٢، وفي: ٥١٩٧؛ والنسائي: ١٤٩٣؛ وأبو داود: ١١٨٩؛ وابن حبان: ٢٨٣٢، وفي: ٢٨٥٣؛ والمنتقى لابن الجارود: ٢٤٨؛ والقابسي: ١٧١، كلهم عن مالك به.

دواتر ڕکوعی برد بە ڕکوعێکی درێژ، دواتر (بۆ جاری دووەم لە هەمان ڕکات) هەڵسایەوە و وەستا بەوەستانێکی درێژ کە کورتتر بوو لە وەستانی یەکەم، دواتر (بۆ جاری دووەم) ڕکوعی برد بە ڕکوعێکی درێژ کە کورتتر بوو لە ڕکوعی یەکەم، پاشان سوجدەی برد، دواتر هەڵسایەوە و وەستا بە وەستانێکی درێژ کە کورتتر بوو لە وەستانی یەکەم، دواتر ڕکوعی برد بە ڕکوعێکی درێژ کە کورتتر بوو لە ڕکوعی یەکەم، دواتر هەڵسایەوە و وەستا بە وەستانێکی درێژ کە کورتتر بوو لە وەستانی پێشوو، دواتر ڕکوعی برد بە ڕکوعێکی درێژ کە کورتتر بوو لە ڕکوعی پێشوو، دواتر سوژدەی برد، دواتر سەلامی دایەوە لە کاتێکدا خۆر دەرکەوتبۆیەوە، جا فەرمووی: خۆر و مانگ دوو نیشانەن لە نیشانەکانی گەورەیی خوای پەروەردگار، ناگیرێن و تاریك نابن لەبەر مردن یان ژیانی کەسێك، جا ئەگەر خۆرگیران یان مانگگیرانتان بینی، ئەوە یادی خوا ﷻ بکەن، گوتیان: ئەی پێغەمبەری خوا ﷺ تۆمان بینی لە شوێنی خۆت دەستت بۆ شتێك برد، دواتر بینیمانی کشایتە دواوە و گەڕایتەوە؟ ئەویش فەرمووی: من بەهەشتم بینی، جا دەستم خستە سەر وشیە میوەیەك ـ هێشووی میوەیەك ـ (بەڵام ڕێگەم پێ نەدرا لێی بکەمەوە)، ئەگەر بمهێنابا ئەوە لێتان دەخوارد تا دونیا بمابا، وە دۆزەخیشم بینی، جا هەرگیز وەك ئەمڕۆ دیمەنی وا سامناکم نەبینیوە، بینیم زۆربەی خەڵکەکەی ناوی ئافرەت بوون، گوتیان: بۆچی ئەی پێغەمبەری خوا ﷺ؟ فەرمووی: بەهۆی کوفریانەوە، گوترا: ئایا کوفر بە خوا دەکەن؟ فەرمووی: کوفرانەی مێردەکانیان دەکەن، کوفرانەی چاکە دەکەن، ئەگەر چاکە لەگەڵ یەکێکیان بکەیت (واتە لەگەڵ ئەو ئافرەتانەی وا سەرەنجامیان دۆزەخە) بەدرێژایی ساڵ، دواتر شتێکت لێ ببینێ (کە بەدڵی نەبێ) دەڵێ: هەرگیز چاکەم لە تۆ نەبینیوە.

**٥٠٩**- عَنْ عَائِشَةَ ﵂، زَوْجِ النَّبِيِّ ﷺ، أَنَّ يَهُودِيَّةً جَاءَتْ تَسْأَلُهَا، فَقَالَتْ: أَعَاذَكِ اللهُ مِنْ عَذَابِ الْقَبْرِ، فَسَأَلَتْ عَائِشَةُ ﵂ رَسُولَ اللهِ ﷺ: أَيُعَذَّبُ النَّاسُ فِي قُبُورِهِمْ؟ فَقَالَ رَسُولُ اللهِ ﷺ، عَائِذًا بِاللَّهِ مِنْ ذَلِكَ، ثُمَّ رَكِبَ رَسُولُ اللهِ ﷺ ذَاتَ غَدَاةٍ مَرْكَبًا، فَخَسَفَتِ الشَّمْسُ، فَرَجَعَ ضُحًى، فَمَرَّ بَيْنَ ظَهْرَانَيِ الْحُجَرِ، ثُمَّ قَامَ يُصَلِّي، وَقَامَ النَّاسُ وَرَاءَهُ، فَقَامَ قِيَامًا طَوِيلاً، ثُمَّ رَكَعَ رُكُوعًا طَوِيلاً، ثُمَّ رَفَعَ فَقَامَ قِيَامًا طَوِيلاً وَهُوَ دُونَ الْقِيَامِ الأَوَّلِ، ثُمَّ رَكَعَ رُكُوعًا طَوِيلاً

وَهُوَ دُونَ الرُّكُوعِ الأَوَّلِ، ثُمَّ رَفَعَ فَسَجَدَ، ثُمَّ قَامَ قِيَامًا طَوِيلاً وَهُوَ دُونَ الْقِيَامِ الأَوَّلِ، ثُمَّ رَكَعَ رُكُوعًا طَوِيلاً وَهُوَ دُونَ الرُّكُوعِ الأَوَّلِ، ثُمَّ رَفَعَ فَقَامَ قِيَامًا طَوِيلاً وَهُوَ دُونَ الْقِيَامِ الأَوَّلِ، ثُمَّ رَكَعَ رُكُوعًا طَوِيلاً وَهُوَ دُونَ الرُّكُوعِ الأَوَّلِ، ثُمَّ رَفَعَ، ثُمَّ سَجَدَ، ثُمَّ انْصَرَفَ، فَقَالَ مَا شَاءَ اللهُ أَنْ يَقُولَ، ثُمَّ أَمَرَهُمْ أَنْ يَتَعَوَّذُوا مِنْ عَذَابِ الْقَبْرِ[1].

واتە: لە عائیشەی ﵂ خێزانی پێغەمبەری خواوە ﷺ گێردراوەتەوە (گوتوویەتی): ئافرەتێکی جوولەکە هات بۆ لای و پرسیاری لێ کرد، جا ئافرەتەکە (لەناو قسەکانی) گوتی: خوا بتپارێزێ لە سزای گۆڕ، عائیشە ﵂ پرسیاری لە پێغەمبەری خوا ﷺ کرد (گوتی): ئایا خەڵك سزا دەدرێن لە گۆڕەکانیان؟ پێغەمبەری خواش ﷺ فەرمووی: بەڵێ بەدڵنیایی، پەنا دەگرم بە خوا لەوە، دواتر پێغەمبەری خوا ﷺ بەیانییەکیان سواری وڵاغ بوو (بۆ بەخاکسپاردنی ئیبراهیمی کوڕی ڕۆیشت)، جا خۆر گیرا و کاتی چێشتەنگاو گەڕایەوە و بەنێو ژوورەکانی خێزانەکانیدا تێ پەڕی، دواتر وەستا و نوێژی (خۆرگیرانی) کرد، خەڵکیش لە دواوەی وەستان، جا وەستا بەوەستانێکی درێژ، دواتر ڕکوعی برد بەڕکوعبردنێکی درێژ، دواتر (بۆ جاری دووەم) هەڵسایەوە و وەستا بەوەستانێکی درێژ کە کورتتر بوو لە وەستانی یەکەم، دواتر (بۆ جاری دووەم) ڕکوعی برد بەڕکوعبردنێکی درێژ کە کورتتر بوو لە ڕکوعی یەکەم، دواتر هەڵسایەوە، سوژدەی برد، دواتر (بۆ ڕکاتی دووەم) هەڵسایەوە و وەستا بەوەستانێکی درێژ کە کورتتر بوو لە وەستانی پێشوو، دواتر ڕکوعی برد بەڕکوعبردنێکی درێژ کە کورتتر بوو لە ڕکوعی پێشوو، دواتر هەڵسایەوە و وەستا بەوەستانێکی درێژ کە کورتتر بوو لە وەستانی پێشوو، دواتر ڕکوعی برد بەڕکوعبردنێکی درێژ کە کورتتر بوو لە ڕکوعی پێشوو، دواتر هەڵسایەوە، سوژدەی برد، دواتر سەلامی دایەوە، دواتر هێندەی فەرموو کە خوا مۆڵەتی لەسەر بوو، دواتر فەرمانی پێ کردن پەنا بە خوا بگرن لە سزای گۆڕ.

---

(١) ـ صحيح. أخرجه أبو مصعب الزهري: ٦٠٧؛ والبخاري: ١٠٤٩، وفي: ١٠٥٥؛ والقابسي: ٤٥٩؛ وفي: ٤٩٥، كلهم عن مالك به.

## ٢- ئەوەی هاتووە دەربارەی خۆرگیران[١]

٥١٠- عَنْ أَسْمَاءَ بِنْتِ أَبِي بَكْرٍ الصِّدِّيقِ ﷺ أَنَّهَا قَالَتْ: أَتَيْتُ عَائِشَةَ ﷺ، زَوْجَ النَّبِيِّ ﷺ حِينَ خَسَفَتِ الشَّمْسُ، فَإِذَا النَّاسُ قِيَامٌ يُصَلُّونَ، وَإِذَا هِيَ قَائِمَةٌ تُصَلِّي، فَقُلْتُ: مَا لِلنَّاسِ؟ فَأَشَارَتْ بِيَدِهَا نَحْوَ السَّمَاءِ، وَقَالَتْ: سُبْحَانَ اللهِ، فَقُلْتُ: آيَةٌ؟ فَأَشَارَتْ بِرَأْسِهَا أَنْ نَعَمْ، قَالَتْ: فَقُمْتُ حَتَّى تَجَلَّانِي الْغَشْيُ، وَجَعَلْتُ أَصُبُّ فَوْقَ رَأْسِي الْمَاءَ، فَحَمِدَ اللهَ رَسُولُ اللهِ ﷺ وَأَثْنَى عَلَيْهِ، ثُمَّ قَالَ: مَا مِنْ شَيْءٍ كُنْتُ لَمْ أَرَهُ إِلاَّ وَقَدْ رَأَيْتُهُ فِي مَقَامِي هَذَا، حَتَّى الْجَنَّةُ وَالنَّارُ، وَلَقَدْ أُوحِيَ إِلَيَّ أَنَّكُمْ تُفْتَنُونَ فِي الْقُبُورِ مِثْلَ أَوْ قَرِيبًا مِنْ فِتْنَةِ الدَّجَّالِ، لاَ أَدْرِي أَيَّتَهُمَا قَالَتْ أَسْمَاءُ، يُؤْتَى أَحَدُكُمْ فَيُقَالُ لَهُ: مَا عِلْمُكَ بِهَذَا الرَّجُلِ؟ فَأَمَّا الْمُؤْمِنُ أَوِ الْمُوقِنُ، لاَ أَدْرِي أَيَّ ذَلِكَ قَالَتْ أَسْمَاءُ، فَيَقُولُ: هُوَ مُحَمَّدٌ رَسُولُ اللهِ، جَاءَنَا بِالْبَيِّنَاتِ وَالْهُدَى، فَأَجَبْنَا، وَآمَنَّا، وَاتَّبَعْنَا، فَيُقَالُ لَهُ: نَمْ صَالِحًا، قَدْ عَلِمْنَا إِنْ كُنْتَ لَمُؤْمِنًا، وَأَمَّا الْمُنَافِقُ أَوِ الْمُرْتَابُ، لاَ أَدْرِي أَيَّتَهُمَا قَالَتْ أَسْمَاءُ، فَيَقُولُ: لاَ أَدْرِي، سَمِعْتُ النَّاسَ يَقُولُونَ شَيْئًا فَقُلْتُهُ[٢].

واتە: لە ئەسمائی کچی ئەبو بەکرەوە ﷺ گێردراوەتەوە گوتوویەتی: هاتم بۆ لای عائیشەی خێزانی پێغەمبەری خوا ﷺ کاتێ خۆر گیرا، جا بینیم خەڵکی وەستاون و نوێژ دەکەن، وە ئەویش وەستاوە و نوێژ دەکات، جا گوتم: خەڵك چییان لێ قەوماوە؟ ئەویش بە دەستی ئاماژەی بۆ ئاسمان کرد و گوتی: سبحان الله، منیش گوتم: ئایەت و نیشانەی خوا ڕووی داوە؟ جا بە سەری ئاماژەی بۆ کردم بەڵێ، دەڵێ: جا (لەگەڵیان لەناو نوێژەکەدا) وەستام تا شل بووم و خەریك بوو ببوورێمەوە، جا هەر ئاوم دەکرد بەسەر سەرمدا، (جا دوای نوێژەکە) پێغەمبەری خوا ﷺ ستاییشی خوای پەروەردگاری کرد و بەجوانی وەسفی کرد، دواتر فەرمووی: لە ڕاستیدا هەر شتێك کە پێشتر نەمدیتبوو لەو شوێنەی خۆم بینیم، هەتا بەهەشت و دۆزەخیش، وە وەحیم بۆ کراوە بەوەی ئێوە تاقی دەکرێنەوە و سزا دەدرێن لە گۆڕەکاندا وەك فیتنەی دەججال ـ یان نزیك لە فیتنەی دەجحال ـ ڕاوی دەڵێ: نازانم ئەسماء

---

(١) ـ مَا جَاءَ فِي صَلَاةِ الْكُسُوفِ.

(٢) ـ صحيح. أخرجه أبو مصعب الزهري: ٦٠٤؛ والحدثاني: ١٩٣؛ والبخاري: ١٨٤، وفي: ١٠٥٣، وفي: ٧٢٨٧؛ وابن حبان: ٣١١٤؛ والقابسي: ٤٨١، كلهم عن مالك به.

کامیانی گوت (گوتی: وەك فیتنەی دەججال یان نزیك لە فیتنەی دەججال)، (لە گۆڕدا دوو فریشتە) دێن بۆ لای هەر یەکێکتان و پێی دەگوترێت: چ زانیاریت هەیە بەو پیاوە (واتە بە پێغەمبەری خوا ﷺ)؟ جا هەرچی بڕوادارە یان خاوەن یەقینە ـ نازانم ئەسما کامەیانی گوت، بڕوادار یان خاوەن یەقین ـ (وەڵام دەداتەوە) و دەڵێت: ئەو موحەممەدە ﷺ پێغەمبەری خوایە، بە بەڵگەی ڕوون و ڕێنموونییەوە هاتووە بۆ ئێمە، ئێمەش وەڵامان دایەوە و بڕوامان هێنا و شوێنی کەوتین، جا پێی دەگوترێت: بخەوە بە ئاسودەیی بەهۆی چاکەکانتەوە، زانیمان تۆ بڕواداری، وە هەرچی کەسی دووڕوو یان کەسی بە گومان ـ نازانم ئەسماء کامیانی وت ـ دەڵێ: نازانم (ئەو پیاوە کێیە)، گوێم لە خەڵکی بوو هەر شتێکیان دەوت منیش دەموت.

## ١- چۆنیەتی نوێژەبارانە (نوێژ و نزای داواکردنی باران)[١]

**٥١١-** عَنْ عَبْدِ اللهِ بْنِ أَبِي بَكْرِ بْنِ عَمْرِو بْنِ حَزْمٍ ﵀، أَنَّهُ سَمِعَ عَبَّادَ بْنَ تَمِيمٍ ﵀ يَقُولُ: سَمِعْتُ عَبْدَ اللهِ بْنَ زَيْدٍ الْمَازِنِيَّ ﵁ يَقُولُ: خَرَجَ رَسُولُ اللهِ ﷺ إِلَى الْمُصَلَّى، فَاسْتَسْقَى، وَحَوَّلَ رِدَاءَهُ حِينَ اسْتَقْبَلَ الْقِبْلَةَ[٢].

واتە: لە عەبدوڵڵای کوڕی ئەبو بەکری کوڕی عەمری کوڕی حەزمەوە ﵀ گێردراوەتەوە بەوەی گوێی لە عەببادی کوڕی تەمیم ﵀ بووە دەیگوت: گوێم لە عەبدوڵڵای کوڕی زەیدی مازینی بوو ﵁ دەیگوت: پێغەمبەری خوا ﷺ دەرچوو بۆ شوێنی نوێژکردن و نوێژ و دوعای بارانبارینی کرد، جا کاتێ ڕووی کردە قیبلە کەوێکەی (جوببەکەی) هەڵگێڕایەوە.

**٥١٢- [فتوى]** قَالَ يَحْيَى ﵀: وَسُئِلَ مَالِكٌ ﵀ عَنْ صَلاَةِ الاِسْتِسْقَاءِ كَمْ هِيَ؟ فَقَالَ: رَكْعَتَانِ، وَلَكِنْ يَبْدَأُ الإِمَامُ بِالصَّلاَةِ قَبْلَ الْخُطْبَةِ، فَيُصَلِّي رَكْعَتَيْنِ، ثُمَّ يَخْطُبُ قَائِمًا وَيَدْعُو، وَيَسْتَقْبِلُ الْقِبْلَةَ، وَيُحَوِّلُ رِدَاءَهُ حِينَ يَسْتَقْبِلُ الْقِبْلَةَ، وَيَجْهَرُ فِي الرَّكْعَتَيْنِ بِالْقِرَاءَةِ، وَإِذَا حَوَّلَ رِدَاءَهُ جَعَلَ الَّذِي عَلَى يَمِينِهِ عَلَى شِمَالِهِ، وَالَّذِي عَلَى شِمَالِهِ عَلَى يَمِينِهِ، وَيُحَوِّلُ النَّاسُ أَرْدِيَتَهُمْ، إِذَا حَوَّلَ الإِمَامُ رِدَاءَهُ، وَيَسْتَقْبِلُونَ الْقِبْلَةَ، وَهُمْ قُعُودٌ[٣].

(فەتوا): یەحیا ﵀ گوتوویەتی: ئیمامی مالیك ﵀ پرسیاری لێکرا دەربارەی نوێژەبارانە کە ئاخۆ چەند ڕکاتە؟ ئەویش گوتی: دوو ڕکاتە، بەڵام ئیمام سەرەتا دەست بە نوێژ دەکات بەر لە وتار، جا دوو ڕکات نوێژ دەکات، دواتر بەپێوە وتار دەدات و نزا و دوعا دەکات و ڕوو دەکاتە قیبلە و جوببەکەی هەڵدەگێڕێتەوە کاتێ ڕوو دەکاتە قیبلە، وە لە هەردوو ڕکاتەکە قورئان بەدەنگ دەخوێنێ، وە کاتێ جوببەکەی هەڵدەگێڕێتەوە لای ڕاستەی دەباتە لای چەپەی و لای چەپەشی

---

(١) ـ الْعَمَلُ فِي الاِسْتِسْقَاءِ.

(٢) ـ صحيح. أخرجه أبو مصعب الزهري: ٦٠٨؛ والحدثاني: ١٩٨؛ والشيباني: ٢٩٤؛ والشافعي: ٣٥٤؛ وابن حنبل: ١٦٤٨٢، وفي: ١٦٥١٣، وفي: ١٦٥١٣؛ ومسلم: ١؛ والنسائي: ١٥١١؛ وأبو داود: ١١٦٧؛ والقابسي: ٣٠٥، كلهم عن مالك به.

(٣) ـ أخرجه أبو مصعب الزهري: ٦٠٩؛ والحدثاني: ١٩٨، كلهم عن مالك به.




دەباتە لای ڕاستەی، وە خەڵکیش جوببە یان کراسەکانیان هەڵدەگێڕنەوە کاتێ ئیمام جوببەکەی خۆی هەڵگێڕایەوە، وە ڕوو دەکەنە قیبلە لە کاتێکدا دانیشتوون.

## ٢- ئەوەی هاتووە دەربارەی نوێژەبارانە[١]

**٥١٣-** عَنْ عَمْرِو بْنِ شُعَيْبٍ ﷺ، أَنَّ رَسُولَ اللهِ ﷺ كَانَ إِذَا اسْتَسْقَى قَالَ: اللهُمَّ اسْقِ عِبَادَكَ وَبَهِيمَتَكَ، وَانْشُرْ رَحْمَتَكَ، وَأَحْيِ بَلَدَكَ الْمَيِّتَ[٢].

واتە: لە عەمری کوڕی شوعەیبەوە ﷺ گێڕدراوەتەوە (گوتوویەتی): پێغەمبەری خوا ﷺ کاتێ نوێژ و نزای داواکردنی بارانی دەکرد دەیفەرموو: پەروەردگارا ئاو بدە بە بەندەکانت و گیانلەبەرەکانت، وە ڕەحمەتەکەت بڵاوبکەوە، وە مەملەکەتە مردووەکەت (واتە مەملەکەتە وشکەکەت) زیندوو بکەوە.

**٥١٤-** عَنْ أَنَسِ بْنِ مَالِكٍ ﷺ، أَنَّهُ قَالَ: جَاءَ رَجُلٌ إِلَى رَسُولِ اللهِ ﷺ، فَقَالَ: يَا رَسُولَ اللهِ، هَلَكَتِ الْمَوَاشِي، وَتَقَطَّعَتِ السُّبُلُ، فَادْعُ اللهَ، فَدَعَا رَسُولُ اللهِ ﷺ، فَمُطِرْنَا مِنَ الْجُمُعَةِ إِلَى الْجُمُعَةِ، قَالَ: فَجَاءَ رَجُلٌ إِلَى رَسُولِ اللهِ ﷺ، فَقَالَ: يَا رَسُولَ اللهِ، تَهَدَّمَتِ الْبُيُوتُ، وَانْقَطَعَتِ السُّبُلُ، وَهَلَكَتِ الْمَوَاشِي، فَقَالَ رَسُولُ اللهِ ﷺ: اللهُمَّ ظُهُورَ الْجِبَالِ، وَالآكَامِ، وَبُطُونَ الأَوْدِيَةِ، وَمَنَابِتَ الشَّجَرِ، قَالَ: فَانْجَابَتْ عَنِ الْمَدِينَةِ انْجِيَابَ الثَّوْبِ[٣].

واتە: لە ئەنەسی کوڕی مالیکەوە ﷺ گێڕدراوەتەوە گوتوویەتی: پیاوێك هات بۆ لای پێغەمبەری خوا ﷺ و، گوتی: ئەی پێغەمبەری خوا ﷺ ئاژەڵەکان بەهیلاك چوون و ڕێگەکان پچڕان (واتە گژوگیا و بەروبووم و بازرگانی و سەفەر زۆر کەم بووە خەریکە بەتەواوی لەناو بچێت)، جا داوا لە خوا ﷻ بکە باران بباریێ، پێغەمبەری خواش ﷺ نزای کرد و بارانمان بۆ بارێنرا لە هەینییەوە بۆ هەینی (یەك

---

(١) ـ مَا جَاءَ فِي الِاسْتِسْقَاءِ.

(٢) ـ حسن. أخرجه أبو مصعب الزهري: ٦١٠؛ والحدثاني: ١٩٧؛ وأبو داود: ١١٧٦، كلهم عن مالك به.

(٣) ـ صحيح. أخرجه أبو مصعب الزهري: ٦١١؛ والحدثاني: ١٩٧؛ والشافعي: ٣٥٢؛ والبخاري: ١٠١٦، وفي: ١٠١٧، وفي: ١٠١٩؛ والنسائي: ١٥٠٤؛ وابن حبان: ٢٨٥٧؛ والقابسي: ٤٤٨، كلهم عن مالك به.




حەفتەی تەواو)، دەڵێ: جا پیاوێك هات بۆ لای پێغەمبەری خوا ﷺ و گوتی: ئەی پێغەمبەری خوا ﷺ خەریکە ماڵەکان بڕوخێن (ئاو بیانبات) و ڕێگەکان پچڕاون (لەبەر بەرزبوونەوەی ئاو) و خەریکە ئاژەڵەکانیش لەناو بچن، پێغەمبەری خواش ﷺ فەرمووی: پەروەردگارا بارانەکە بەسەر شاخەکان و تەپۆڵکەکان و ناو دۆڵەکان و شوێنی سەوزبوونی دارودرەخت و گژوگیا ببارێنە، جا بارانەکە لە ئاسمانی مەدینە دەرچوو وەك داکەندنی پۆشاك.

**٥١٥- [فتوى]** قَالَ يَحْيَى ﷺ: قَالَ مَالِكٌ ﷺ: فِي رَجُلٍ فَاتَتْهُ صَلاَةُ الاِسْتِسْقَاءِ وَأَدْرَكَ الْخُطْبَةَ، فَأَرَادَ أَنْ يُصَلِّيَهَا فِي الْمَسْجِدِ أَوْ فِي بَيْتِهِ إِذَا رَجَعَ؟ قَالَ مَالِكٌ: هُوَ مِنْ ذَلِكَ فِي سَعَةٍ، إِنْ شَاءَ فَعَلَ أَوْ تَرَكَ.

(فەتوا): یەحیا ﷺ گوتوویەتی: ئیمامی مالیك ﷺ دەربارەی کەسێك کە نوێژەبارانەی لە دەست دەچێت (لەگەڵ ئیمامدا) و دەگات بە وتار، جا حەزی کرد و ویستی نوێژەکە ئەنجام بدات لە مزگەوت یان لە ماڵەوە کاتێ گەڕایەوە (ئایا بۆی هەیە)؟ گوتی: بابەتەکە مەجالی تێدا هەیە، ئەگەر ویستی دەیکات یان وازی لێ دەهێنێ (هەردووکی دەگونجێ).

## ٣- داواکردنی باران لە ئەستێرەکان (لە شتە سروشتییەکان)[١]

**٥١٦-** عَنْ زَيْدِ بْنِ خَالِدٍ الْجُهَنِيِّ ﷺ، أَنَّهُ قَالَ: صَلَّى لَنَا رَسُولُ اللهِ ﷺ صَلاَةَ الصُّبْحِ بِالْحُدَيْبِيَةِ، عَلَى إِثْرِ سَمَاءٍ كَانَتْ مِنَ اللَّيْلِ، فَلَمَّا انْصَرَفَ، أَقْبَلَ عَلَى النَّاسِ، فَقَالَ: أَتَدْرُونَ مَاذَا قَالَ رَبُّكُمْ؟ قَالُوا: اللهُ وَرَسُولُهُ أَعْلَمُ، قَالَ: قَالَ: أَصْبَحَ مِنْ عِبَادِي مُؤْمِنٌ بِي، وَكَافِرٌ بِي، فَأَمَّا مَنْ قَالَ: مُطِرْنَا بِفَضْلِ اللهِ وَرَحْمَتِهِ، فَذَلِكَ مُؤْمِنٌ بِي كَافِرٌ بِالْكَوْكَبِ، وَأَمَّا مَنْ قَالَ: مُطِرْنَا بِنَوْءِ كَذَا وَكَذَا، فَذَلِكَ كَافِرٌ بِي، مُؤْمِنٌ بِالْكَوْكَبِ[٢].

---

(١) ـ الاِسْتِمْطَارُ بِالنُّجُومِ.

(٢) ـ صحيح. أخرجه أبو مصعب الزهري: ٦١٢؛ والحدثاني: ١٩٩؛ والشافعي: ٣٥٩؛ وابن حنبل: ١٧١٠٢؛ والبخاري: ٨٤٦، وفي: ١٠٣٨؛ ومسلم: ١٢٥؛ وأبو داود: ٣٩٠٦؛ وابن حبان: ١٨٨، وفي: ٦١٣٢؛ والقابسي: ٢٧٤، كلهم عن مالك به.




واتە: لە زەیدی كوڕی خالیدی جوهەنییەوە ﷺ گێڕدراوەتەوە گوتوویەتی: پێغەمبەری خوا ﷺ لە حودەیبییە لە حودەیبییە نوێژی بەیانی بۆ كردین، دوای باران بارین، كە لە شەو باری بوو، جا كاتێ سەلامی دایەوە، ڕووی كردە خەڵكەكە و فەرمووی: ئایا دەزانن پەروەردگارتان چی فەرمووە؟ گوتیان: خوا و پێغەمبەرەكەی زاناترن، فەرمووی: فەرموویەتی: هەندێك لە بەندەكانم بەباوەڕداری و هەندێكیش بە بێبڕوایی بەیانییان كردەوە، جا ئەوەی گوتوویەتی: بارانمان بۆ بارێنرا بەفەزڵ و ڕەحمەتی خوا ﷻ، ئەوە بڕوادارە بە من و كافرە بە ئەستێرەكان، وە هەرچی ئەوەشە كە گوتوویەتی: بارانمان بۆ بارێنرا بەهۆی دەركەوتنی فڵانە ئەستێرە و و فڵانە ئەستێرە، ئەوە بێبڕوایە بە من و بڕوادارە بە ئەستێرەكان.

٥١٧- عَنْ مَالِكٍ ﵀؛ أَنَّهُ بَلَغَهُ، أَنَّ رَسُولَ اللهِ ﷺ كَانَ يَقُولُ: إِذَا أَنْشَأَتْ بَحْرِيَّةً ثُمَّ تَشَاءَمَتْ، فَتِلْكَ عَيْنٌ غُدَيْقَةٌ[1].

واتە: لە ئیمامی مالیكەوە ﵀ گێڕدراوەتەوە بەوەی پێی گەیشتووە پێغەمبەری خوا ﷺ دەیگوت: ئەگەر هەورێك لەلای دەریاوە بەرز بۆیەوە، دواتر بەرەو ئاراستەی شام چوو (واتە لە خۆرئاواوە بەرەو باشوور ڕۆیشت)، ئەوە بارانی زۆری چەند ڕۆژەیە (واتە چەندین ڕۆژ بەردەوام دەبێ)[2].

٥١٨- أَنَّ أَبَا هُرَيْرَةَ ﷺ كَانَ يَقُولُ، إِذَا أَصْبَحَ وَقَدْ مُطِرَ النَّاسُ: مُطِرْنَا بِنَوْءِ الْفَتْحِ، ثُمَّ يَتْلُو هَذِهِ الآيَةَ: ﴿ مَا يَفْتَحِ ٱللَّهُ لِلنَّاسِ مِن رَّحْمَةٍ فَلَا مُمْسِكَ لَهَا ﴿٢﴾ ﴾ فاطر[3].

واتە: ئەبو هوڕەیرە ﷺ هەموو جار (پێچەوانەی بێبڕوایان) كاتێ بەیانی كردبایەوە لە كاتێكدا خەڵكی بارانیان بۆ باریبووایە دەیگوت: بارانمان بۆ بارێنرا بە دەروازەی بەخششی خوا ﷻ، دواتر ئەم ئایەتەی دەخوێندەوە: ﴿ مَا يَفْتَحِ ٱللَّهُ لِلنَّاسِ

---

(١) ـ موضوع. أخرجه أبو مصعب الزهري: ٦١٣؛ والحدثاني: ١٩٩، كلهم عن مالك به.

(٢) ـ تێبینی: ئەگەر مرۆڤ بڕوای وا نەبێ هۆكارەكان خودی خۆیان وا دەكەن شتەكان ڕوو بدەن، بەڵكوو گشتی فەرمان و كاری خوایە، ئەوە لەو كاتەدا بۆی دروستە بەهۆی هۆكارە سروشتییەكان و قاعیدە كەونییەكان پێشبینی بكات.

(٣) ـ ضعيف. أخرجه أبو مصعب الزهري: ٦١٤؛ والحدثاني: ١٩٩، كلهم عن مالك به.




مِن رَّحْمَةٍ فَلَا مُمْسِكَ لَهَا ﴿٢﴾ ﴾فاطر ، واتە: ((هەر کاتێك خوا دەروازە و ڕەحمەت و بەخششی خۆی لە خەڵکی بکاتەوە، ئەوە هیچ کەس و هیچ شتێك ناتوانێت ڕێگری لێ بکات)).




## ١- نەهیکردن لە ڕووکردنە قیبلە لە کاتێکدا مرۆڤ لەسەر بەجێگەیاندنی پێویستی خۆیەتی (لە سەرئاوکردنە)[١]

٥١٩- أَنَّ أَبَا أَيُّوبَ الأَنْصَارِيَّ ﷺ، صَاحِبَ النَّبِيِّ ﷺ، وَهُوَ بِمِصْرَ يَقُولُ: وَاللَّهِ مَا أَدْرِي كَيْفَ أَصْنَعُ بِهَذِهِ الْكَرَابِيسِ؟ وَقَدْ قَالَ رَسُولُ اللهِ ﷺ: إِذَا ذَهَبَ أَحَدُكُمُ الْغَائِطَ أَوِ الْبَوْلَ، فَلاَ يَسْتَقْبِلِ الْقِبْلَةَ، وَلاَ يَسْتَدْبِرْهَا بِفَرْجِهِ[٢].

واتە: ئەبو ئەیوبی ئەنصاری ﷺ هاوەڵی پێغەمبەری خوا ﷺ لە کاتێکدا لە میصر بوو دەیگوت: سوێند بە خوا نازانم چی بکەم لەم ئاودەستانە (لەم سەرئاوانە)؟ ـ چونکە ڕوویان لە قیبلەیە ـ لە کاتێکدا پێغەمبەری خوا ﷺ فەرموویەتی: ئەگەر یەکێك لە ئێوە چوو بۆ سەرئاوکردن، ئەوە با بە دامێنی ڕوو نەکاتە قیبلە و پشتیشی تێ نەکات.

٥٢٠- عَنْ نَافِعٍ ﷺ، عَنْ رَجُلٍ مِنَ الأَنْصَارِ، أَنَّهُ سَمِعَ رَسُولَ اللهِ ﷺ يَنْهَى أَنْ تُسْتَقْبَلَ الْقِبْلَةُ لِغَائِطٍ أَوْ بَوْلٍ[٣].

واتە: لە نافیعەوە ﷺ گێڕدراوەتەوە، ئەویش لە پیاوێکی ئەنصاری گێڕاوەتەوە بەوەی گوێی لە پێغەمبەری خوا ﷺ بووە نەهی کردووە لەوەی ڕوو بکرێتە قیبلە بۆ سەرئاوکردن.

## ٢- مۆڵەتدان بە ڕووکردنە قیبلە لە کاتی سەرئاوکردندا[٤]

٥٢١- عَنْ عَبْدِ اللهِ بْنِ عُمَرَ ﷺ، أَنَّهُ كَانَ يَقُولُ: إِنَّ نَاسًا يَقُولُونَ: إِذَا قَعَدْتَ عَلَى حَاجَتِكَ، فَلاَ تَسْتَقْبِلِ الْقِبْلَةَ، وَلاَ بَيْتَ الْمَقْدِسِ[٥].

---

(١) ـ النَّهْيُ عَنِ اسْتِقْبَالِ الْقِبْلَةِ وَالإِنْسَانُ عَلَى حَاجَتِهِ.

(٢) ـ صحيح. أخرجه أبو مصعب الزهري: ٥٠٧؛ وابن حنبل: ٢٣٥٦١؛ والنسائي: ٢٠؛ والقابسي: ١٢٤، كلهم عن مالك به.

(٣) ـ صحيح لغيره. أخرجه أبو مصعب الزهري: ٥٠٨؛ والحدثاني: ١٦٤؛ والقابسي: ٢٦٤، كلهم عن مالك به.

(٤) ـ الرُّخْصَةُ فِي اسْتِقْبَالِ الْقِبْلَةِ لِبَوْلٍ أَوْ غَائِطٍ.

(٥) ـ صحيح. أخرجه أبو مصعب الزهري: ٥١٦؛ والحدثاني: ١٦٤؛ والشافعي: ٨٩٢؛ والبخاري: ١٤٥؛ والنسائي:




قَالَ عَبْدُ اللهِ ﷺ: لَقَدِ ارْتَقَيْتُ عَلَى ظَهْرِ بَيْتٍ لَنَا، فَرَأَيْتُ رَسُولَ اللهِ ﷺ عَلَى لَبِنَتَيْنِ، مُسْتَقْبِلاً بَيْتِ الْمَقْدِسِ لِحَاجَتِهِ، ثُمَّ قَالَ: لَعَلَّكَ مِنِ الَّذِينَ يُصَلُّونَ عَلَى أَوْرَاكِهِمْ؟ قَالَ: فَقُلْتُ: لاَ أَدْرِي وَاللَّهِ.

قَالَ مَالِكٌ ﷺ: يَعْنِي الَّذِي يَسْجُدُ وَلاَ يَرْتَفِعُ عَنِ الأَرْضِ، يَسْجُدُ وَهُوَ لاَصِقٌ بِالأَرْضِ.

واته: له عەبدوڵڵای کوڕی عومەرەوە ﷺ گێردراوەتەوە گوتوویەتی: خەڵکانێك هەیە دەڵێن: کاتێ لەسەرئاو دانیشتی، ئەوە نە ڕوو بکەرە قیبلە و نە بەیتولمەقدیس.

عەبدوڵڵا ﷺ دەڵێ: بەدڵنیایی من چوومە سەربانی ماڵەکەمان (کە مەبەستی سەربانی ماڵی حەفصەی خوشکیەتی)، جا پێغەمبەری خوام ﷺ بینی لەسەر دوو خشت دانیشتبوو (بۆ سەرئاوکردن) ڕووەو بەیتولمەقدیس، (جا ئەو بابەتەی لەگەڵ واسع باس دەکرد) دواتر گوتی: (ئەی واسع) ڕەنگە تۆ لەو کەسانە بی کە نوێژ لەسەر سمتەکانیان دەکەن (واتە لە کاتی سوژدە ڕانەکانیان دوور ناخەنەوە لە سك و سینگیان)؟ ئەویش گوتی: والله نازانم.

ئیمامی مالیك ﷺ گوتوویەتی: واتە مەبەستی ئەو کەسەیە کە سوژدە دەبات و خۆی لە زەوی ناکاتەوە، سوژدە دەبات لە کاتێکدا خۆی بە زەوییەوە نوساندووە (سمت و سك و سینگی لە زەوی بەرز ناکاتەوە).

### ٣- نەهیکردن لە تف هاویشتن بەرەو ڕووی قیبلە (لە نوێژدا)[١]

**٥٢٢**- عَنْ نَافِعٍ ﷺ، عَنْ عَبْدِ اللهِ بْنِ عُمَرَ ﷺ: أَنَّ رَسُولَ اللهِ ﷺ رَأَى بُصَاقًا فِي جِدَارِ الْقِبْلَةِ، فَحَكَّهُ، ثُمَّ أَقْبَلَ عَلَى النَّاسِ، فَقَالَ: إِذَا كَانَ أَحَدُكُمْ يُصَلِّي فَلاَ يَبْصُقْ قِبَلَ وَجْهِهِ، فَإِنَّ اللهَ ﷻ قِبَلَ وَجْهِهِ إِذَا صَلَّى[٢].

---

٢٣؛ وأبو داود: ١٢؛ وابن حبان: ١٤٢١؛ والقابسي: ٥٠٢، كلهم عن مالك به.

(١) ـ النَّهْيُ عَنِ الْبُصَاقِ فِي الْقِبْلَةِ.

(٢) ـ صحيح. أخرجه أبو مصعب الزهري: ٥٤٤؛ والحدثاني: ١٧٧؛ والشيباني: ٢٨١؛ وابن حنبل: ٥٣٣٥؛ والبخاري: ٤٠٧؛ ومسلم: ٥٠؛ والنسائي: ٧٢٤؛ والقابسي: ٢٠٥، كلهم عن مالك به.

واتە: لە نافیعەوە ﷺ گێردراوەتەوە، ئەویش لە عەبدوڵڵای کوڕی عومەرەوە ﷺ گێڕاویەتەوە بەوەی (گوتوویەتی): پێغەمبەری خوا ﷺ تفێکی بە دیواری قیبلەی مزگەوتەوە بینی، جا ڕنی و لێی کردەوە، دواتر ڕووی کردە خەڵکی و فەرمووی: ئەگەر یەکێك لەناو نوێژ بوو، ئەوە با تف لە بەرانبەری خۆی ڕۆ نەکات، چونکە لەبەرانبەر خوای پەروەردگار نوێژ دەکات (واتە لەسەر ئەو بنەمایەی ڕووی کردبێتە پەروەردگار نوێژ دەکات، بۆیە نابێ ئەو قودسییەتە بشکێنێت و ئەو کارە ناڕەوایە بکات).

**٥٢٣**- عَنْ عَائِشَةَ ﷺ، زَوْجِ النَّبِيِّ ﷺ، أَنَّ رَسُولَ اللهِ ﷺ رَأَى فِي جِدَارِ الْقِبْلَةِ بُصَاقًا أَوْ مُخَاطًا أَوْ نُخَامَةً، فَحَكَّهُ[1].

واتە: لە عائیشەی ﷺ خێزانی پێغەمبەرەوە ﷺ گێردراوەتەوە (گوتوویەتی): پێغەمبەری خوا ﷺ لە دیواری قیبلەی مزگەوت تف، یان چڵم، یان بەڵغەمێکی بینی، جا ڕنی و لێی کردەوە.

## ٤- ئەوەی هاتووە دەربارەی قیبلە[2]

**٥٢٤**- عَنْ عَبْدِ اللهِ بْنِ عُمَرَ ﷺ، أَنَّهُ قَالَ: بَيْنَمَا النَّاسُ بِقُبَاءٍ، فِي صَلَاةِ الصُّبْحِ، إِذْ جَاءَهُمْ آتٍ، فَقَالَ: إِنَّ رَسُولَ اللهِ ﷺ قَدْ أُنْزِلَ عَلَيْهِ اللَّيْلَةَ قُرْآنٌ، وَقَدْ أُمِرَ أَنْ يَسْتَقْبِلَ الْكَعْبَةَ، فَاسْتَقْبِلُوهَا، وَكَانَتْ وُجُوهُهُمْ إِلَى الشَّامِ، فَاسْتَدَارُوا إِلَى الْكَعْبَةِ[3].

واتە: لە عەبدوڵڵای کوڕی عومەرەوە ﷺ گێڕدراوەتەوە گوتوویەتی: لە کاتێکدا خەڵك لە قوباء لە نوێژی بەیانیدا بوون، لە ناکاو کەسێك هات و گوتی: ئەمشەو

---

(١) ـ صحيح. أخرجه أبو مصعب الزهري: ٥٤٥؛ والحدثاني: ١٧٧؛ وابن حنبل: ٢٥١٩٧؛ والبخاري: ٤٠٨؛ ومسلم: ٥٢، كلهم عن مالك به.

(٢) ـ مَا جَاءَ فِي الْقِبْلَةِ.

(٣) ـ صحيح. أخرجه أبو مصعب الزهري: ٥٤٦؛ والحدثاني: ١٧٨؛ والشيباني: ٢٨٣؛ والشافعي: ٨١؛ وفي: ١١٦٤؛ وابن حنبل: ٥٩٣٤؛ والبخاري: ٤٠٤، وفي: ٤٤٩١، وفي: ٤٤٩٤، وفي: ٧٢٥١؛ ومسلم: ١٣؛ والنسائي: ٤٩٣، وفي: ٧٤٥؛ وابن حبان: ١٧١٥؛ والقابسي: ٢٧٧، كلهم عن مالك به.

چەند ئایەتێکی قورئان بەسەر پێغەمبەری خوا ﷺ دابەزیوە، فەرمانی پێکراوە ڕوو بکاتە کەعبە، کەواتە ڕوو بکەنە ئەوێ، لە کاتێکدا ڕوویان لە شام بوو (واتە ڕوویان کردبووە بەیتولمەقدیس)، جا خۆیان سوڕاند بۆ ئاراستەی کەعبە.

**٥٢٥-** عَنْ سَعِيدِ بْنِ الْمُسَيَّبِ ﷺ، أَنَّهُ قَالَ: صَلَّى رَسُولُ اللهِ ﷺ بَعْدَ أَنْ قَدِمَ الْمَدِينَةَ، سِتَّةَ عَشَرَ شَهْرًا، نَحْوَ بَيْتِ الْمَقْدِسِ، ثُمَّ حُوِّلَتِ الْقِبْلَةُ قَبْلَ بَدْرٍ بِشَهْرَيْنِ[١].

واتە: لە سەعیدی کوڕی موسەیەبەوە ﷺ گێردراوەتەوە گوتوویەتی: پێغەمبەری خوا ﷺ دوای ئەوەی هات بۆ مەدینە شازدە مانگ ڕووە و بەیتولمەقدیس نوێژی کرد، دواتر دوو مانگ پێش جەنگی بەدر قیبلە گۆڕدرا (بوو بە کەعبە).

**٥٢٦-** أَنَّ عُمَرَ بْنَ الْخَطَّابِ ﷺ قَالَ: مَا بَيْنَ الْمَشْرِقِ وَالْمَغْرِبِ قِبْلَةٌ، إِذَا تُوُجِّهَ قِبَلَ الْبَيْتِ[٢].

واتە: عومەری کوڕی خەتتاب ﷺ گوتوویەتی: قیبلە لە نێوانی ڕۆژهەڵات و ڕۆژئاوادایە، کاتێ ڕوو کرابێتە کەعبە (چونکە دەکرێ پشتت لە کەعبە بێت و لەنێوانی خۆرهەڵات و خۆرئاواشدا بیت، بۆیە گوتوویەتی: بە مەرجێك بەرەو ڕووی کەعبە بیت، چونکە ئەو کاتیش ئاراستەکە زۆر فراوانە، بەڵام بەو شێوەیە دیاری دەکرێ و دەزانرێ).

## ٥- ئەوەی هاتووە دەربارەی مزگەوتی پێغەمبەری خوا ﷺ[٣]

**٥٢٧-** عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ ﷺ، أَنَّ رَسُولَ اللهِ ﷺ قَالَ: صَلاَةٌ فِي مَسْجِدِي هَذَا، خَيْرٌ مِنْ أَلْفِ صَلاَةٍ فِيمَا سِوَاهُ، إِلاَّ الْمَسْجِدَ الْحَرَامَ[٤].

---

(١) ـ صحيح لغيره. أخرجه أبو مصعب الزهري: ٥٤٧؛ والحدثاني: ١٧٨؛ والشافعي: ١١٦٥، كلهم عن مالكبه.

(٢) ـ صحيح. أخرجه أبو مصعب الزهري: ٥٤٨؛ والحدثاني: ١٧٨، كلهم عن مالك به.

(٣) ـ مَا جَاءَ فِي مَسْجِدِ النَّبِيِّ صَلى الله عَلَيهِ وَسَلمَ.

(٤) ـ صحيح. أخرجه أبو مصعب الزهري: ٥١٧؛ والحدثاني: ١٦٨؛ والبخاري: ١١٩٠؛ والترمذي: ٣٢٥؛ وابن ماجه: ١٤٠١؛ والقابسي: ١٨٦، كلهم عن مالك به.





واتە: لە ئەبو هورەیرەوە ﷺ گێڕدراوەتەوە (گوتوویەتی): پێغەمبەری خوا ﷺ فەرموویەتی: نوێژێك لەو مزگەوتەی من چاكترە لە هەزار نوێژ لە مزگەوتی دیكە، جگە لە مزگەوتی كەعبە (لەوێ پاداشتەكە لە مزگەوتی مەدینەش زیاترە).

**٥٢٨-** عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ، أَوْ عَنْ أَبِي سَعِيدٍ الْخُدْرِيِّ ﷺ، أَنَّ رَسُولَ اللهِ ﷺ قَالَ: مَا بَيْنَ بَيْتِي وَمِنْبَرِي رَوْضَةٌ مِنْ رِيَاضِ الْجَنَّةِ، وَمِنْبَرِي عَلَى حَوْضِي[١].

واتە: لە ئەبو هورەیرەوە یان لە ئەبو سەعیدی خودرییەوە ﷺ گێڕدراوەتەوە (گوتوویەتی): پێغەمبەری خوا ﷺ فەرموویەتی: نێوانی ماڵەكەم و مینبەرەكەم مێرگێكە لە مێرگەكانی بەهەشت، مینبەرەكەم لەسەر حەوزەكەم دەبێت (لەوێ دادەندرێ لە ڕۆژی دواییدا).

**٥٢٩-** عَنْ عَبْدِ اللهِ بْنِ زَيْدٍ الْمَازِنِيِّ ﷺ، أَنَّ رَسُولَ اللهِ ﷺ قَالَ: مَا بَيْنَ بَيْتِي وَمِنْبَرِي رَوْضَةٌ مِنْ رِيَاضِ الْجَنَّةِ[٢].

واتە: لە عەبدوڵڵای كوڕی زەیدی مازینییەوە ﷺ گێڕدراوەتەوە (گوتوویەتی): پێغەمبەری خوا ﷺ فەرموویەتی: نێوانی ماڵەكەم و مینبەرەكەم مێرگ و باخێكە لە مێرگ و باخەكانی بەهەشت.

## ٦- ئەوەی هاتووە دەربارەی چوونی ئافرەتان بۆ مزگەوت[٣]

**٥٣٠-** عَنْ عَبْدِ اللهِ بْنِ عُمَرَ ﷺ؛ أَنَّهُ قَالَ: قَالَ رَسُولُ اللهِ ﷺ: لاَ تَمْنَعُوا إِمَاءَ اللهِ مَسَاجِدَ اللهِ[٤].

---

(١) ـ صحيح. أخرجه أبو مصعب الزهري: ٥١٨؛ والحدثاني: ١٦٨؛ وابن حنبل: ٧٢٢٢، وفي: ١٠٠٠٩، وفي: ١٠٠٠٩، وفي: ١٠٩١٢، وفي: ١١٠١٦؛ والبخاري: ٧٣٣٥؛ والقابسي: ١٥٤، كلهم عن مالك به.

(٢) ـ صحيح. أخرجه أبو مصعب الزهري: ٥١٩؛ والحدثاني: ١٦٨ب؛ وابن حنبل: ١٦٥٠٠؛ والبخاري: ١١٩٥؛ ومسلم: ٥٠٠؛ والنسائي: ٦٩٥؛ والقابسي: ٣٠٦، كلهم عن مالك به.

(٣) ـ مَا جَاءَ فِي خُرُوجِ النِّسَاءِ إِلىَ الْمَسَاجِدِ.

(٤) ـ صحيح. أخرجه أبو مصعب الزهري: ٥٤٠؛ والحدثاني: ١٧٦، كلهم عن مالك به.




واتە: لە عەبدوڵڵای کوڕی عومەرەوە ﷺ گێردراوەتەوە گوتوویەتی: پێغەمبەری خوا ﷺ فەرموویەتی: ئافرەتانی بەندەی خوا ﷻ قەدەغە مەکەن لە مزگەوتەکانی خوا ﷻ.

**٥٣١**- عَنْ بُسْرِ بْنِ سَعِيدٍ ﷺ، أَنَّ رَسُولَ اللهِ ﷺ قَالَ: إِذَا شَهِدَتْ إِحْدَاكُنَّ صَلاَةَ الْعِشَاءِ، فَلاَ تَمَسَّنَّ طِيبًا[١].

واتە: لە بوسری کوڕی سەعیدەوە ﷺ گێردراوەتەوە (گوتوویەتی) پێغەمبەری خوا ﷺ فەرموویەتی: ئەگەر یەکێك لە ئێوەی ئافرەتان ئامادەی نوێژی عیشا بوو، با بۆن و گوڵاو لە خۆی نەدات[٢].

**٥٣٢**- عَنْ عَاتِكَةَ بِنْتِ زَيْدِ بْنِ عَمْرِو بْنِ نُفَيْلٍ امْرَأَةِ عُمَرَ بْنِ الْخَطَّابِ ﷺ، أَنَّهَا كَانَتْ تَسْتَأْذِنُ عُمَرَ بْنَ الْخَطَّابِ ﷺ إِلَى الْمَسْجِدِ فَيَسْكُتُ، فَتَقُولُ: وَاللَّهِ لأَخْرُجَنَّ إِلاَّ أَنْ تَمْنَعَنِي، فَلاَ يَمْنَعُهَا[٣].

واتە: لە عاتیکەی کچی زەیدی کوڕی عەمڕی کوڕی نوفەیل کە خێزانی عومەری کوڕی خەتتابە ﷺ گێردراوەتەوە بەوەی داوای مۆڵەتی لە عومەری کوڕی خەتتاب ﷺ کرد بچێت بۆ مزگەوت، ئەویش بێدەنگ بوو (چونکە پێی خۆش نەبوو و نەشیدەتوانی سەرپێچی فەرمانی پێغەمبەری خوا ﷺ بکات)، جا عاتیکە ﷺ گوتی: سوێند بە خوا دەچم بۆ مزگەوت تەنها لەو کاتەدا نەبێت کە ڕێگریم لێ بکەیت، ئەویش ڕێگری لێ نەکرد.

**٥٣٣**- عَنْ عَائِشَةَ ﷺ، زَوْجِ النَّبِيِّ ﷺ، أَنَّهَا قَالَتْ: لَوْ أَدْرَكَ رَسُولُ اللهِ ﷺ مَا أَحْدَثَ النِّسَاءُ لَمَنَعَهُنَّ الْمَسَاجِدَ، كَمَا مُنِعَهُ نِسَاءُ بَنِي إِسْرَائِيلَ.

---

(١) ـ صحيح. أخرجه أبو مصعب الزهري: ٥٤١؛ والحدثاني: ١٧٦أ، عن مالك به.

(٢) ـ تێبینی: ئەم بابەتە تایبەت نییە بە نوێژی عیشا، بەڵام لەبەر ئەوەی وا عادەت بوو ئافرەتان زیاتر لە سەرەتای شەو خۆیان بۆنخۆش دەکرد، بۆیە بەتایبەت باسی عیشا کراوە.

(٣) ـ ضعيف. أخرجه أبو مصعب الزهري: ٥٤٢؛ والحدثاني: ١٧٦ب، عن مالك به.




قَالَ يَحْيَى بْنُ سَعِيدٍ ﵀: فَقُلْتُ لِعَمْرَةَ: أَوَ مُنِعَ نِسَاءُ بَنِي إِسْرَائِيلَ الْمَسَاجِدَ، قَالَتْ: نَعَمْ[١].

واتە: لە عائیشەی ﵄ خێزانی پێغەمبەری خواوە ﷺ گێڕدراوەتەوە (ماوەیەك دوای وەفاتی پێغەمبەری خوا ﷺ) گوتوویەتی: ئەگەر پێغەمبەری خوا ﷺ بگەیشتبایە بەوەی ئافرەتان دایانهێناوە و ئێستا ئەنجامی دەدەن (لە بەزاندنی سنوورەکان)، ئەوە ڕێگری لێ دەکردن لە هاتن بۆ مزگەوتەکان وەك چۆن ئافرەتانی بەنو ئیسرائیل ڕێگرییان لێ کرا.

یەحیای کوڕی سەعید ﵀ گوتوویەتی: جا (ئەو ڕاوییەی فەرموودەکەی لە عائیشەوە ـ ﵄ ـ گێڕاوەتەوە ناوی عەمرە بوو) پێم گوت: بۆ مەگەر ئافرەتانی بەنو ئیسرائیل ڕێگرییان لێ کرا لە مزگەوت؟ گوتی: بەڵێ.

---

(١) ـ صحيح. أخرجه أبو مصعب الزهري: ٥٤٣؛ والحدثاني: ١٧٦ج؛ والبخاري: ٨٦٩؛ وأبو داود: ٥٦٩؛ والقابسي: ٤٩٦، كلهم عن مالك به.

## ١- فەرمانكردن بە دەستنوێژشۆردن دەربارەی ئەو كەسەی دەیەوێت دەست لە قورئان بدات[١]

**٥٣٤-** عَنْ عَبْدِ اللهِ بْنِ أَبِي بَكْرِ بْنِ مُحَمَّدِ بْنِ عَمْرُو بْنِ حَزْمٍ ﷺ، أَنَّ فِي الْكِتَابِ الَّذِي كَتَبَهُ رَسُولُ اللهِ ﷺ لِعَمْرِو بْنِ حَزْمٍ: أَنْ لاَ يَمَسَّ الْقُرْآنَ إِلاَّ طَاهِرٌ[٢].

واتە: لە عەبدوڵڵای كوڕی ئەبو بەكری كوڕی موحەممەدی كوڕی عومەری كوڕی حەزمەوە ﷺ گێڕدراوەتەوە (گوتوویەتی): لەو نووسراوەی پێغەمبەری خوا ﷺ نووسیبووی (واتە فەرمانی كردبوو بنووسرێت) بۆ عەمری كوڕی حەزم، ئەوەی تیابوو: با دەست لە قورئان نەدات تەنها كەسی پاك نەبێت (جا ئیمامی مالیك دەفەرمووێ: مەبەستی دەستنوێژە).

**٥٣٥-** قَالَ مَالِكٌ ﷺ: وَلاَ يَحْمِلُ أَحَدٌ الْمُصْحَفَ بِعِلاَقَتِهِ، وَلاَ عَلَى وِسَادَةٍ، إِلاَّ وَهُوَ طَاهِرٌ، وَلَوْ جَازَ ذَلِكَ لَحُمِلَ فِي خَبِيئَتِهِ، وَلَمْ يُكْرَهْ ذَلِكَ، لأَنْ يَكُونَ فِي يَدَيِ الَّذِي يَحْمِلُهُ شَيْءٌ يُدَنِّسُ بِهِ الْمُصْحَفَ، وَلَكِنْ إِنَّمَا كُرِهَ ذَلِكَ لِمَنْ يَحْمِلُهُ وَهُوَ غَيْرُ طَاهِرٍ، إِكْرَامًا لِلْقُرْآنِ وَتَعْظِيمًا لَهُ[٣].

واتە: ئیمامی مالیك ﷺ فەرموویەتی: هیچ كەسێك نابێ قورئان هەڵبگرێت بە پەت و زنجیری بەرگەكەیەوە، وە نابێ هەڵیشی بگرێت بەسەر سەرین و بالیفەوە (چونكە دروست نییە)، ئەگەر دروست بووایە بەو شتانە هەڵبگیرێ ئەوە دروست دەبوو بەو بەرگەشەوە هەڵبگیرێ كە قورئانەكەی تێدا هەڵگیراوە (كەچی ئەوە دروست نییە، كەواتە ئەم شتانەش هەمان حوكمیان هەیە)، جا دەستلێدانی قورئان حەڕام نەكراوە لەبەر ئەوەی شتێكی پیس هەبێت بە دەستی ئەو كەسەی قورئان هەڵدەگرێت و پیسی بكات (نەخێر)، بەڵكوو حەڕام كراوە لەسەر كەسەی هەڵیدەگرێت لە كاتێكدا دەستنوێژی نییە، تەنها لەبەر ڕێزە بۆ قورئان و بە گەورەگرتنیەتی.

---

(١) ـ الأَمْرُ بِالْوُضُوءِ لِمَنْ مَسَّ الْقُرْآنَ.

(٢) ـ صحيح لغيره. أخرجه أبو مصعب الزهري: ٢٣٤؛ والشيباني: ٢٩٧، كلهم عن مالك به.

(٣) ـ صحيح. أخرجه أبو مصعب الزهري: ٢٣٦، عن مالك به.

٥٣٦- قَالَ مَالِكٌ ﷺ: أَحْسَنُ مَا سَمِعْتُ فِي هَذِهِ الآيَةِ:﴿ لَّا يَمَسُّهُۥٓ إِلَّا ٱلْمُطَهَّرُونَ ﴿٧٩﴾ ﴾ الواقعة، إِنَّمَا هِيَ بِمَنْزِلَةِ هَذِهِ الآيَةِ، الَّتِي فِي:﴿ عَبَسَ وَتَوَلَّىٰٓ ﴿١﴾ ﴾ عبس، قَوْلُ اللهِ ﷻ:﴿ كَلَّآ إِنَّهَا تَذْكِرَةٌ ﴿١١﴾ فَمَن شَآءَ ذَكَرَهُۥ ﴿١٢﴾ فِى صُحُفٍ مُّكَرَّمَةٍ ﴿١٣﴾ مَّرْفُوعَةٍ مُّطَهَّرَةٍۭ ﴿١٤﴾ بِأَيْدِى سَفَرَةٍ ﴿١٥﴾ كِرَامٍۭ بَرَرَةٍ ﴿١٦﴾ ﴾ عبس.[١]

واتە: ئیمامی مالیك ﷺ گوتوویەتی: چاكترینی ئەوەی بیستوومە دەربارەی ئەو ئایەتە: ﴿ لَّا يَمَسُّهُۥٓ إِلَّا ٱلْمُطَهَّرُونَ ﴿٧٩﴾ ﴾ الواقعة، ئەوەیە كە وەك هەمان ئەو ئایەتەیە كە لە سوڕەتی: ﴿ عَبَسَ وَتَوَلَّىٰٓ ﴿١﴾ ﴾ عبس.دایە، كە بریتییە لەوەی خوای پەروەردگار دەفەرموێ: ﴿ كَلَّآ إِنَّهَا تَذْكِرَةٌ ﴿١١﴾ فَمَن شَآءَ ذَكَرَهُۥ ﴿١٢﴾ فِى صُحُفٍ مُّكَرَّمَةٍ ﴿١٣﴾ مَّرْفُوعَةٍ مُّطَهَّرَةٍۭ ﴿١٤﴾ بِأَيْدِى سَفَرَةٍ ﴿١٥﴾ كِرَامٍۭ بَرَرَةٍ ﴿١٦﴾ ﴾ عبس، واتە: ((نەخێر وا مەكە، چونكە بەڕاستی ئەم ئایەتانە یادخستنەوە و ئامۆژگارییە . جا كەسێك بیەوێ ڕێنموویی وەرگرێ ئەوە یادی دەكات . ئەم قوڕئانە لە چەندین لاپەڕەی بەڕێز و پیرۆزدا هەڵگیراوە . كە بەرز و بڵند و پاك ڕاگیراون . بە دەستی فریشتە نووسەرەكان . كە بەڕێز و خواناس و ملكەچ و فەرمانبەردارن))[٢].

## ٢- مۆڵەتدانی خوێندنی قوڕئان (بەلەبەر) بەبێ دەستنوێژ[٣]

٥٣٧- عَنْ مُحَمَّدِ بْنِ سِيرِينَ ﷺ، أَنَّ عُمَرَ بْنَ الْخَطَّابِ ﷺ كَانَ فِي قَوْمٍ وَهُمْ يَقْرَؤُونَ الْقُرْآنَ، فَذَهَبَ لِحَاجَتِهِ، ثُمَّ رَجَعَ وَهُوَ يَقْرَأُ الْقُرْآنَ، فَقَالَ لَهُ رَجُلٌ: يَا أَمِيرَ الْمُؤْمِنِينَ، أَتَقْرَأُ الْقُرْآنَ وَلَسْتَ عَلَى وُضُوءٍ؟ فَقَالَ لَهُ عُمَرُ: مَنْ أَفْتَاكَ بِهَذَا؟ أَمُسَيْلِمَةُ؟[٤].

---

(١) ـ أخرجه أبو مصعب الزهري: ٢٣٧، عن مالك به.

(٢) ـ تێبینی: ئیمامی مالیك لە تەفسیری ئەو ئایەتەدا گوتوویەتی: مەبەستی ئەوەیە ئایەتەكە باسی قوڕئانی لەوحی مەحفوزە كە تەنها پاكەكان دەبێ دەستی لێ بدەن، جا ئەو قوڕئانەی بەردەستی ئێمە هەمان ئەو قوڕئانەیە، كەواتە پێویستی بە هەمان بەگەورەگرتن و پاكی هەیە، بۆیە بەبێ دەستنوێژ دەستلێدانی دروست نییە.

(٣) ـ الرُّخْصَةُ فِي قِرَاءَةِ الْقُرْآنِ عَلَى غَيْرِ وُضُوءٍ.

(٤) صحيح لغيره. أخرجه أبو مصعب الزهري: ٢٣٥، عن مالك به.

واتە: لە موحەممەدی کوڕی سیرینەوە ﷺ گێردراوەتەوە (گوتوویەتی): عومەری کوڕی خەتتاب ﷺ لەناو کۆمەڵێك بوو قورئانیان دەخوێند، جا ڕۆیشت بۆ سەرئاوکردن، دواتر گەڕایەوە لە کاتێکدا (بەلەبەر، بەبێ دەستدان لە قورئان) قورئانی دەخوێند، جا پیاوێك (لە هۆزەکەی موسەیلەمە) پێی گوت: ئەی گەورەی بڕواداران، ئایا قورئان دەخوێنیت و دەستنوێژیشت نییە؟ عومەریش ـ خوا لێی ڕازی بێ ـ (بەئینکارییەوە) پێی گوت: کێ ئەم فەتوایەی بۆ داوی (بەوەی قورئانخوێندن بەلەبەر دروست نەبێت بەبێ دەستنوێژ)؟ ئایا موسەیلەمە فەتوای بۆ داوی؟

## ٣- ئەوەی هاتووە دەربارەی بەشبەشکردنی قورئان (ڕۆژانە خوێندنەوەی بەشێکی) و کردنە ویردی بەردەوام[١]

**٥٣٨-** أَنَّ عُمَرَ بْنَ الْخَطَّابِ ﷺ قَالَ: مَنْ فَاتَهُ حِزْبُهُ مِنَ اللَّيْلِ، فَقَرَأَهُ حِينَ تَزُولُ الشَّمْسُ، إِلَى صَلاَةِ الظُّهْرِ، فَإِنَّهُ لَمْ يَفُتْهُ، أَوْ كَأَنَّهُ أَدْرَكَهُ[٢].

واتە: عومەری کوڕی خەتتاب ﷺ گوتوویەتی: هەر کەسێك بەشە (قورئانخوێندنی ڕۆژانەی) خۆی لێ فەوتا لە شەودا، جا خوێندی لەو کاتەی خۆر لە ناوەڕاستی ئاسمان لادەدا تا نوێژی نیوەڕۆ (واتە لەو نێوانەدا خوێندی)، ئەوە لێی نەفەوتاوە، یان وەك ئەوە وایە لە کاتی خۆیدا جێبەجێی کردبێ.

**٥٣٩-** عَنْ يَحْيَى بْنِ سَعِيدٍ ﷺ، أَنَّهُ قَالَ: كُنْتُ أَنَا وَمُحَمَّدُ بْنُ يَحْيَى بْنِ حَبَّانَ ﷺ جَالِسَيْنِ، فَدَعَا مُحَمَّدٌ ﷺ رَجُلاً، فَقَالَ: أَخْبِرْنِي بِالَّذِي سَمِعْتَ مِنْ أَبِيكَ، فَقَالَ الرَّجُلُ: أَخْبَرَنِي أَبِي، أَنَّهُ أَتَى زَيْدَ بْنَ ثَابِتٍ ﷺ، فَقَالَ لَهُ: كَيْفَ تَرَى فِي قِرَاءَةِ الْقُرْآنِ فِي سَبْعٍ؟ فَقَالَ زَيْدٌ رر: حَسَنٌ، وَلأَنْ أَقْرَأَهُ فِي نِصْفِ شَهْرٍ، أَوْ عَشْرٍ، أَحَبُّ إِلَيَّ، وَسَلْنِي لِمَ ذَاكَ؟ قَالَ: فَإِنِّي أَسْأَلُكَ، قَالَ زَيْدٌ ﷺ: لِكَيْ أَتَدَبَّرَهُ، وَأَقِفَ عَلَيْهِ[٣].

---

(١) ـ مَا جَاءَ فِي تَحْزِيبِ الْقُرْآنِ.

(٢) ـ صحيح. أخرجه أبو مصعب الزهري: ٢٤٠؛ والحدثاني: ٩١؛ والشيباني: ١٦٨؛ والنسائي: ١٧٩٢، كلهم عن مالك به.

(٣) ـ ضعيف. أخرجه أبو مصعب الزهري: ٢٤١؛ والحدثاني: ٩١أ، كلهم عن مالك به.

واتە: لە یەحیای کوڕی سەعیدەوە ﷺ گێڕدراوەتەوە گوتوویەتی: من و موحەممەدی کوڕی یەحیای کوڕی حەببان ﷺ دانیشتبووین، جا موحەممەد ﷺ پیاوێکی بانگ کرد و گوتی: هەواڵم پێ بدە بەوەی لە باوکتەوە بیستووتە، پیاوەکەش گوتی: باوکم هەواڵی پێ داوم بەوەی چۆتە لای زەیدی کوڕی سابیت ﷺ و پێی گوتووە: قورئانخوێندنت پێ چۆنە لە حەوت ڕۆژدا؟ زەیدیش ﷺ گوتی: چاکە، وە ئەگەر لە پازدە یان دە ڕۆژدا بیخوێنم ئەوە چاکتر و خۆشەویستترە لەلام، وە پرسیارم لێ بکە بۆچی؟ ئەویش گوتی: دەی من پرسیارت لێ دەکەم (بۆچی؟) زەید ﷺ گوتی: بۆ ئەوەی تێی بفکرم و بیری لێ بکەمەوە و لەسەری بوەستم.

## ٤- ئەوەی هاتووە دەربارەی قورئان[١]

**٥٤٠**- عَنْ عَبْدِ الرَّحْمَنِ بْنِ عَبْدٍ الْقَارِيِّ ﷺ، أَنَّهُ قَالَ: سَمِعْتُ عُمَرَ بْنَ الْخَطَّابِ ﷺ، يَقُولُ: سَمِعْتُ هِشَامَ بْنَ حَكِيمِ بْنِ حِزَامٍ ﷺ يَقْرَأُ سُورَةَ الْفُرْقَانِ عَلَى غَيْرِ مَا أَقْرَؤُهَا، وَكَانَ رَسُولُ اللهِ ﷺ أَقْرَأَنِيهَا، فَكِدْتُ أَنْ أَعْجَلَ عَلَيْهِ، ثُمَّ أَمْهَلْتُهُ حَتَّى انْصَرَفَ، ثُمَّ لَبَّبْتُهُ بِرِدَائِهِ، فَجِئْتُ بِهِ رَسُولَ اللهِ ﷺ، فَقُلْتُ: يَا رَسُولَ اللهِ، إِنِّي سَمِعْتُ هَذَا يَقْرَأُ سُورَةَ الْفُرْقَانِ عَلَى غَيْرِ مَا أَقْرَأْتَنِيهَا، فَقَالَ رَسُولُ اللهِ ﷺ: أَرْسِلْهُ، ثُمَّ قَالَ: اقْرَأْ يَا هِشَامُ، فَقَرَأَ الْقِرَاءَةَ الَّتِي سَمِعْتُهُ يَقْرَأُ، فَقَالَ رَسُولُ اللهِ ﷺ: هَكَذَا أُنْزِلَتْ، ثُمَّ قَالَ لِي: اقْرَأْ، فَقَرَأْتُهَا، فَقَالَ: هَكَذَا أُنْزِلَتْ، إِنَّ هَذَا الْقُرْآنَ أُنْزِلَ عَلَى سَبْعَةِ أَحْرُفٍ، فَاقْرَؤُوا مَا تَيَسَّرَ مِنْهُ[٢].

واتە: لە عەبدوڕڕەحمانی کوڕی عەبدی قارییەوە ﷺ گێڕدراوەتەوە گوتوویەتی: گوێم لە عومەری کوڕی خەتتاب ﷺ بوو دەیگوت: گوێم لە هیشامی کوڕی حەکیمی کوڕی حیزام ﷺ بوو سوڕەتی فورقانی دەخوێند بەشێوازێکی جیاواز لەو شێوازەی من دەمزانی و دەمخوێندەوە، کە پێغەمبەری خوا ﷺ بۆی خوێندبوومەوە و فێری کردبووم، جا خەریك بوو پەلەی لێ بکەم (هەر لەناو قورئانەکە یەخەی

---

(١) ـ مَا جَاءَ فِي الْقُرْآنِ.

(٢) ـ صحيح. أخرجه أبو مصعب الزهري: ٢٤٢؛ والحدثاني: ٩٢؛ والشافعي: ١١٨٣؛ وابن حنبل: ٢٧٧؛ والبخاري: ٢٤١٩؛ والنسائي: ٩٣٧؛ وأبو داود: ١٤٧٥؛ وابن حبان: ٧٤١؛ والقابسي: ٤٧، كلهم عن مالك به.

بگرم)، دواتر وازم لێی هێنا تا تەواو بوو، پاشان یەخەم گرت و هێنام بۆ خزمەتی پێغەمبەری خوا ﷺ و گوتم: ئەی پێغەمبەری خوا ﷺ من گوێم لەوە بوو سوڕەتی فورقانی دەخوێند جیاواز لەو شێوازەی کە تۆ فێرت کردم، پێغەمبەری خواش ﷺ فەرمووی: بەریدە وازی لێ بێنە، دواتر فەرمووی: ئەی هیشام بخوێنە، ئەویش بەو جۆرە خوێندی کە من گوێم لێی بوو، پێغەمبەری خوا ﷺ فەرمووی: بەم شێوەیە دابەزیوە، دواتر بە منی فەرموو: بخوێنە، منیش خوێندم، جا فەرمووی: بەم شێوەیەش دابەزیوە، (فەرمووی): بێگومان بەدڵنیاییی قورئان لەسەر حەوت شێواز دابەزیوە، بۆیە کامە شێوازتان بەلاوە ئاسان بوو بەوشێوازە بخوێنن.

**٥٤١-** عَنْ عَبْدِ اللهِ بْنِ عُمَرَ ﷺ؛ أَنَّ رَسُولَ اللهِ ﷺ قَالَ: إِنَّمَا مَثَلُ صَاحِبِ الْقُرْآنِ، كَمَثَلِ صَاحِبِ الإِبِلِ الْمُعَقَّلَةِ، إِنْ عَاهَدَ عَلَيْهَا أَمْسَكَهَا، وَإِنْ أَطْلَقَهَا ذَهَبَتْ[١].

واتە: لە عەبدوڵڵای کوڕی عومەرەوە ﷺ گێڕدراوەتەوە (گوتوویەتی): پێغەمبەری خوا ﷺ فەرموویەتی: نموونەی خاوەن و حافز و خوێنەری قورئان وەك خاوەنی وشتری بەستراوە وایە، ئەگەر بەردەوام ئاگاداری بوو (بەردەوام بوو لە بەستانەوە و چاودێریکردنی)، ئەوە هەر لە دەستی دەمێنێ، وە ئەگەر کردیەوە و ئیهماڵی کرد و کەمتەرخەمی کرد، ئەوە دەڕوات (واتە قورئان ئەگەر زوو زوو موڕاجەعە نەکرێتەوە دەڕوات و نامێنێت و بیر دەچێتەوە).

**٥٤٢-** عَنْ عَائِشَةَ ﷺ، زَوْجِ النَّبِيِّ ﷺ، أَنَّ الْحَارِثَ بْنَ هِشَامٍ، سَأَلَ رَسُولَ اللهِ ﷺ كَيْفَ يَأْتِيكَ الْوَحْيُ؟ فَقَالَ رَسُولُ اللهِ ﷺ: أَحْيَانًا يَأْتِينِي مِثْلَ صَلْصَلَةِ الْجَرَسِ، وَهُوَ أَشَدُّهُ عَلَيَّ، فَيُفْصَمُ عَنِّي، وَقَدْ وَعَيْتُ مَا قَالَ، وَأَحْيَانًا يَتَمَثَّلُ لِيَ الْمَلَكُ رَجُلاً، فَيُكَلِّمُنِي، فَأَعِي مَا يَقُولُ، قَالَتْ عَائِشَةُ: وَلَقَدْ رَأَيْتُهُ يَنْزِلُ عَلَيْهِ فِي الْيَوْمِ الشَّدِيدِ الْبَرْدِ، فَيُفْصَمُ عَنْهُ، وَإِنَّ جَبِينَهُ لَيَتَفَصَّدُ عَرَقًا[٢].

---

(١) ـ صحيح. أخرجه أبو مصعب الزهري: ٢٤٣؛ والحدثاني: ٩٢أ؛ والشيباني: ١٧٤؛ وابن حنبل: ٥٣١٥، وفي: ٥٩٢٣؛ والبخاري: ٥٠٣١؛ ومسلم: ٢٢٦؛ والنسائي: ٩٤٢؛ وابن حبان: ٧٦٤، وفي: ٧٦٥؛ والقابسي: ٢٠٣، كلهم عن مالك به.

(٢) ـ صحيح. أخرجه أبو مصعب الزهري: ٢٧٠؛ وابن حنبل: ٢٦٢٤١؛ والبخاري: ٢؛ والنسائي: ٩٣٤؛ والترمذي: ٣٦٣٤؛ وابن حبان: ٣٨؛ والقابسي: ٤٥٨، كلهم عن مالك به.

واتە: لە عائیشەی ﵂ خێزانی پێغەمبەری خواوە ﷺ گێڕدراوەتەوە (گوتوویەتی): حاریسی کوڕی هیشام پرسیاری لە پێغەمبەری خوا ﷺ کرد (گوتی): چۆن سروش و وەحیت بۆ دێت؟ پێغەمبەری خواش ﷺ فەرمووی: هەندێ جار وەك دەنگی زەنگوڵە بۆم دێ، ئەوەیان قورسترینە لەسەرم، جا لێم جیادەبێتەوە لە کاتێکدا هەموو ئەوەم لەبەر کردووە و تێی گەیشتووم کە جیبریل گوتوویەتی، وە هەندێ جار جیبریل خۆیم بۆ دەکات بە پیاوێك و قسەم لەگەڵ دەکات (بەقسە وەحییەکەم پێ دەگەیەنێ)، جا ئەوەی دەیڵێ تێی دەگەم و لەبەری دەکەم، عائیشە ﵂ دەڵێ: بەدڵنیایی لە ڕۆژی زۆر سارددا وەحی بۆ هاتووە، جا کە وەحییەکە لێی جیابۆتەوە ناوچەوانی ئارەقەی زۆری دەرداوە (ئەوەندە لەسەری قورس بووە).

**٥٤٣-** عَنْ هِشَامِ بْنِ عُرْوَةَ ﵀، عَنْ أَبِيهِ ﵀، أَنَّهُ قَالَ: أُنْزِلَتْ: ﴿عَبَسَ وَتَوَلَّىٰٓ ۝١﴾ عبس، فِي عَبْدِ اللهِ بْنِ أُمِّ مَكْتُومٍ، جَاءَ إِلَى رَسُولِ اللهِ ﷺ، فَجَعَلَ يَقُولُ: يَا مُحَمَّدُ اسْتَدْنِينِي، وَعِنْدَ النَّبِيِّ ﷺ رَجُلٌ مِنْ عُظَمَاءِ الْمُشْرِكِينَ، فَجَعَلَ النَّبِيُّ ﷺ يُعْرِضُ عَنْهُ، وَيُقْبِلُ عَلَى الآخَرِ، وَيَقُولُ: يَا أَبَا فُلَانٍ هَلْ تَرَى بِمَا أَقُولُ بَأْسًا؟ فَيَقُولُ: لاَ وَالدِّمَاءِ، مَا أَرَى بِمَا تَقُولُ بَأْسًا، فَأُنْزِلَتْ: ﴿عَبَسَ وَتَوَلَّىٰٓ ۝١ أَن جَآءَهُ ٱلْأَعْمَىٰ ۝٢﴾ عبس[1].

واتە: لە هیشامی کوڕی عورووەوە ﵀ گێڕدراوەتەوە، ئەویش لە باوکیەوە ﵀ گێڕاویەتەوە گوتوویەتی: ﴿عَبَسَ وَتَوَلَّىٰٓ ۝١﴾ عبس، دەربارەی عەبدوڵڵای کوڕی ئوموو مەکتوم دابەزی، (کاتێ) هات بۆ لای پێغەمبەری خوا ﷺ، هەر دەیگوت: جێگایەکی نزیك لە خۆتم بۆ دیاری بکە (تا پرسیارت لێ بکەم و لە ئایین زیاتر شارەزا بم و گوێم لە زانیارییەکانت بێت)، لەم کاتەشدا پیاوێك لە گەورەکانی موشریکان لەوێ بوو، جا پێغەمبەری خوا ﷺ هەر ڕووی لە عەبدوڵڵا وەردەگێڕا و ڕوی دەکردە کەسەکەی دیکە و (باسی ئیسلامەتی بۆ دەکرد) دەیفەرموو: ئەی فڵان مەگەر ئەوەی باسی دەکەم نارێکی و کێشەی هەیە؟ ئەویش دەیگوت: نەخێر، سوێند بەو خوێنەی (لە کاتی قوربانیدا) دەیرێژین لە پێناوی خواکاندا، هیچ نارێکییەك نابینم لەوەی دەیڵێی، ئیتر ئەمە دابەزێنرا: ﴿عَبَسَ وَتَوَلَّىٰٓ ۝١ أَن جَآءَهُ ٱلْأَعْمَىٰ ۝٢﴾ عبس.

---

(١) ـ صحيح. أخرجه أبو مصعب الزهري: ٢٧١، عن مالك به.

٥٤٤- عَنْ زَيْدِ بْنِ أَسْلَمَ ﷺ، عَنْ أَبِيهِ ﷺ، أَنَّ رَسُولَ اللهِ ﷺ كَانَ يَسِيرُ فِي بَعْضِ أَسْفَارِهِ، وَعُمَرُ بْنُ الْخَطَّابِ ﷺ يَسِيرُ مَعَهُ لَيْلاً، فَسَأَلَهُ عُمَرُ ﷺ عَنْ شَيْءٍ، فَلَمْ يُجِبْهُ، ثُمَّ سَأَلَهُ، فَلَمْ يُجِبْهُ، ثُمَّ سَأَلَهُ، فَلَمْ يُجِبْهُ، فَقَالَ عُمَرُ ﷺ: ثَكِلَتْكَ أُمُّكَ، عُمَرُ ﷺ، نَزَرْتَ رَسُولَ اللهِ ﷺ ثَلاَثَ مَرَّاتٍ، كُلُّ ذَلِكَ لاَ يُجِيبُكَ، قَالَ عُمَرُ ﷺ: فَحَرَّكْتُ بَعِيرِي، حَتَّى إِذَا كُنْتُ أَمَامَ النَّاسِ، وَخَشِيتُ أَنْ يَنْزِلَ فِيَّ قُرْآنٌ، فَمَا نَشِبْتُ أَنْ سَمِعْتُ صَارِخًا يَصْرُخُ بِي، قَالَ، فَقُلْتُ: لَقَدْ خَشِيتُ أَنْ يَكُونَ نَزَلَ فِيَّ قُرْآنٌ، قَالَ: فَجِئْتُ رَسُولَ اللهِ ﷺ، فَسَلَّمْتُ عَلَيْهِ، فَقَالَ: لَقَدْ أُنْزِلَتْ عَلَيَّ هَذِهِ اللَّيْلَةَ، سُورَةٌ، لَهِيَ أَحَبُّ إِلَيَّ مِمَّا طَلَعَتْ عَلَيْهِ الشَّمْسُ، ثُمَّ قَرَأَ:﴿ إِنَّا فَتَحْنَا لَكَ فَتْحًا مُّبِينًا ﴿١﴾ ﴾ الفتح[1].

واتە: لە زەیدی کوڕی ئەسلەمەوە ﷺ گێردراوەتەوە، ئەویش لە باوکیەوە ﷺ گێڕاویەتەوە (گوتوویەتی): پێغەمبەری خوا ﷺ بەشەو بۆ یەکێ لە سەفەرەکانی دەڕۆیشت، عومەری کوڕی خەتتابیشی لە خزمەتدا بوو ﷺ، جا عومەر ﷺ پرسیاری شتێکی لێکرد، ئەویش وەڵامی نەدایەوە، دواتر پرسیاری لێکردەوە، وەڵامی نەدایەوە، دواتر پرسیاری لێکردەوە، وەڵامی نەدایەوە، جا عومەر ﷺ گوتی: دایکت تۆی لێ بفەوتێ ئەی عومەر، سێ جار پێداگریت لە پێغەمبەری خوا ﷺ کرد و بێزارت کرد، هەموو جارەکان وەڵامی نەدایتەوە (دیارە پرسیارەکەت نابەجێ بووە)، عومەر ﷺ دەڵێ: جا تەکانێکم بە وشترەکەم دا، تا گەیشتمە پێشەوەی خەڵکەکە و ترسام قورئان دەربارەم دابەزێ، جا زۆری نەبرد گوێم لێ بوو کەسێك بانگی دەکردم، دەڵێ: گوتم: دەترسم قورئان دەربارەم دابەزیبێ، دەڵێ: بۆیە هاتم بۆ لای پێغەمبەری خوا ﷺ و سەلامم لێ کرد، ئەویش فەرمووی: ئەمشەو سوڕەتێکم بەسەردا دابەزیوە کە لەلام خۆشەویسترە لە تەواوی ئەوەی خۆر بەسەریدا هەڵاتووە (واتە لە گشت دونیا لام خۆشەویسترە)، دواتر سوڕەتی: ﴿ إِنَّا فَتَحْنَا لَكَ فَتْحًا مُّبِينًا ﴿١﴾ ﴾ الفتح، ی خوێندەوە (دابەزی بوو).

---

(١) ـ صحيح. أخرجه أبو مصعب الزهري: ٢٧٢؛ وابن حنبل: ٢٠٩؛ والبخاري: ٤١٧٧، وفي: ٤٨٣٣، وفي: ٥٠١٢؛ والترمذي: ٣٢٦٢؛ وابن حبان: ٦٤٠٩؛ وأبو يعلى الموصلي: ١٤٨، وفي: ٥٠٣٠؛ والقابسي: ١٦٧، كلهم عن مالك به.

**٥٤٥-** عَنْ أَبِي سَعِيدٍ ﷺ قَالَ: سَمِعْتُ رَسُولَ اللهِ ﷺ، يَقُولُ: يَخْرُجُ فِيكُمْ قَوْمٌ تَحْقِرُونَ صَلاَتَكُمْ مَعَ صَلاَتِهِمْ، وَصِيَامَكُمْ مَعَ صِيَامِهِمْ، وَأَعْمَالَكُمْ مَعَ أَعْمَالِهِمْ، يَقْرَؤُونَ الْقُرْآنَ، وَلاَ يُجَاوِزُ حَنَاجِرَهُمْ، يَمْرُقُونَ مِنَ الدِّينِ مُرُوقَ السَّهْمِ مِنَ الرَّمِيَّةِ، تَنْظُرُ فِي النَّصْلِ، فَلاَ تَرَى شَيْئًا، وَتَنْظُرُ فِي الْقِدْحِ، فَلاَ تَرَى شَيْئًا، وَتَنْظُرُ فِي الرِّيشِ، فَلاَ تَرَى شَيْئًا، وَتَتَمَارَى فِي الْفُوقِ[1].

واتە: لە ئەبو سەعیدەوە ﷺ گێڕدراوەتەوە گوتوویەتی: گوێم لە پێغەمبەری خوا ﷺ بوو دەیفەرموو: خەڵكانێك لەناوتاندا پەیدادەبن نوێژی خۆتان بەكەم دەزانن بە بەراورد بە نوێژەكانی ئەوان، وە ڕۆژوەكانیشتان (بەكەم دەزانن) بە بەراورد بە ڕۆژوەكانی ئەوان، وە كردەوەكانتان بەگشتی (بەكەم و نارێك دەزانن) بە بەراورد بە كردەوەكانی ئەوان، (بەڵام ئەوان كردەوەكانیان گشتی ڕووكەشە): قورئان دەخوێنن كەچی لە گەروویان تێپەڕ ناكات (ناگاتە دڵیان)، لە دین دەردەچن وەك دەرچوونی تیر لە جەستەی نێچیر (بەوپەڕی بەهێزی و تیژڕەوی هاویشتنی، بەشێوەیەك): سەیری سەری تیرەكە دەكەی هیچ (شوێنەواری خوێن) نابینی، وە سەیری داری تیرەكە دەكەی هیچ شوێنەوارێك نابینیی، وە سەیری پەڕاموچەكەش دەكەی هیچ شوێنەوارێك نابینی، وە گومانت بۆ دروست دەبێت لەو شوێنەی پەتەكە دەیگرێت لە كاتی هاویشتن، بەڵام هەر هیچ نابینی (واتە ئەم جۆرە كەسانە وەك هاویشتن و دەرچوونی تیر لەلایەن ڕاوچییەكی بازوو بەهێز دەردەچن لە دین و هیچ شوێنەواری لە دیندەرچوونیشیان پێوە دیار نییە).

**٥٤٦-** أَنَّ عَبْدَ اللهِ بْنَ عُمَرَ ﷺ مَكَثَ عَلَى سُورَةِ الْبَقَرَةِ، ثَمَانِيَ سِنِينَ يَتَعَلَّمُهَا[2].

واتە: عەبدوڵڵای كوڕی عومەر ﷺ هەشت ساڵ لەسەر سوڕەتی بەقەڕە مایەوە خۆی فێر دەكرد (واتە بە كردار و تێڕامانەوە لە خزمەتیدا بوو).

---

(١) ـ صحيح. أخرجه أبو مصعب الزهري: ٢٧٣؛ والشيباني: ٨٦٥؛ وابن حنبل: ١١٥٩٦؛ والبخاري: ٥٠٥٨؛ وابن حبان: ٦٧٣٧؛ والقابسي: ٤٩١، كلهم عن مالك به.

(٢) ـ ضعيف. أخرجه أبو مصعب الزهري: ٢٣٨؛ والحدثاني: ٩٠أ، عن مالك به.

## ٥- ئەوەی هاتووە دەربارەی سوژدەی قورئان (سوژدەی تیلاوە)[١]

٥٤٧- عَنْ أَبِي سَلَمَةَ بْنِ عَبْدِ الرَّحْمَنِ رَحِمَهُ اللهُ، أَنَّ أَبَا هُرَيْرَةَ رَضِيَ اللهُ عَنْهُ قَرَأَ لَهُمْ: ﴿إِذَا ٱلسَّمَآءُ ٱنشَقَّتْ ۝١﴾ الانشقاق، فَسَجَدَ فِيهَا، فَلَمَّا انْصَرَفَ، أَخْبَرَهُمْ أَنَّ رَسُولَ اللهِ ﷺ سَجَدَ فِيهَا[٢].

واتە: لە ئەبو سەلەمەی کوڕی عەبدوڕڕەحمانەوە رَحِمَهُ اللهُ گێڕدراوەتەوە (گوتوویەتی): ئەبو هوڕەیرە رَضِيَ اللهُ عَنْهُ سوڕەتی: ﴿إِذَا ٱلسَّمَآءُ ٱنشَقَّتْ ۝١﴾ الانشقاق،ی بۆ خوێندن و سوژدەی تێدا برد، جا کاتێ سەلامی دایەوە هەواڵی پێ دان بەوەی پێغەمبەری خوا ﷺ سوژدەی تێدا بردووە.

٥٤٨- عَنْ نَافِعٍ رَحِمَهُ اللهُ، مَوْلَى ابْنِ عُمَرَ رَضِيَ اللهُ عَنْهُمَا؛ أَنَّ رَجُلاً مِنْ أَهْلِ مِصْرَ أَخْبَرَهُ، أَنَّ عُمَرَ بْنَ الْخَطَّابِ رَضِيَ اللهُ عَنْهُ قَرَأَ سُورَةَ الْحَجِّ، فَسَجَدَ فِيهَا سَجْدَتَيْنِ، ثُمَّ قَالَ: إِنَّ هَذِهِ السُّورَةَ فُضِّلَتْ بِسَجْدَتَيْنِ[٣].

واتە: لە نافیعی رَحِمَهُ اللهُ خزمەتکاری ئیبنو عومەرەوە رَضِيَ اللهُ عَنْهُمَا گێڕدراوەتەوە (گوتوویەتی): پیاوێکی خەڵکی میصر هەواڵی پێداوە (گوتوویەتی): عومەری کوڕی خەتتاب رَضِيَ اللهُ عَنْهُ سوڕەتی حەجی خوێند و دوو سوژدەی (تیلاوەی) تێدا برد (واتە کاتێ گەیشت بە شوێنەکانیان لە ئایەتی: ١٨ و ٧٧)، دواتر گوتی: ئەو سوڕەتە پلە و گەورەیی تایبەتی پێ دراوە بەهۆی ئەو دوو سوژدەیەوە.

٥٤٩- عَنْ عَبْدِ اللهِ بْنِ دِينَارٍ رَحِمَهُ اللهُ، أَنَّهُ قَالَ: رَأَيْتُ عَبْدَ اللهِ بْنَ عُمَرَ رَضِيَ اللهُ عَنْهُمَا يَسْجُدُ فِي سُورَةِ الْحَجِّ سَجْدَتَيْنِ[٤].

واتە: لە عەبدوڵڵای کوڕی دینارەوە رَحِمَهُ اللهُ گێڕدراوەتەوە گوتوویەتی: عەبدوڵڵای کوڕی عومەرم رَضِيَ اللهُ عَنْهُمَا بینی لە سوڕەتی حەجدا دوو سوژدەی (تیلاوەی) برد.

---

(١) ـ مَا جَاءَ فِي سُجُودِ الْقُرْآنِ.

(٢) ـ صحيح. أخرجه أبو مصعب الزهري: ٢٥٩؛ والشيباني: ٢٦٧؛ والشافعي: ١٠٣١؛ وابن حنبل: ١٠٣١٩، وفي: ١٠٨٥٧؛ ومسلم، ١٠٧؛ والنسائي: ٩٦١؛ والقابسي: ٣٧٧، كلهم عن مالك به.

(٣) ـ ضعيف. أخرجه أبو مصعب الزهري: ٢٦٠؛ والشيباني: ٢٦٩؛ والشافعي: ١٠٣٤؛ وفي: ١١١٧، كلهم عن مالك به.

(٤) ـ صحيح. أخرجه أبو مصعب الزهري: ٢٦٣؛ والشيباني: ٢٧١، عن مالك به.

٥٥٠- أَنَّ عُمَرَ بْنَ الْخَطَّابِ ﷺ قَرَأَ بِـ﴿ وَٱلنَّجْمِ إِذَا هَوَىٰ ﴿١﴾ ﴾ النجم، فَسَجَدَ فِيهَا، ثُمَّ قَامَ، فَقَرَأَ بِسُورَةٍ أُخْرَى[١].

واتە: عومەری کوڕی خەتتاب ﷺ سورەتی: ﴿ وَٱلنَّجْمِ إِذَا هَوَىٰ ﴿١﴾ ﴾ النجم،ی خوێند و سوژدەی تیلاوەی تیادا برد، دواتر هەڵسایەوە و سورەتێکی دیکەی خوێند.

٥٥١- عَنْ هِشَامِ بْنِ عُرْوَةَ ﷺ، عَنْ أَبِيهِ ﷺ، أَنَّ عُمَرَ بْنَ الْخَطَّابِ ﷺ قَرَأَ سَجْدَةً وَهُوَ عَلَى الْمِنْبَرِ يَوْمَ الْجُمُعَةِ، فَنَزَلَ فَسَجَدَ، وَسَجَدَ النَّاسُ مَعَهُ، ثُمَّ قَرَأَهَا يَوْمَ الْجُمُعَةِ الأُخْرَى، فَتَهَيَّأَ النَّاسُ لِلسُّجُودِ، فَقَالَ عُمَرُ ﷺ: عَلَى رِسْلِكُمْ، إِنَّ اللهَ لَمْ يَكْتُبْهَا عَلَيْنَا، إِلاَّ أَنْ نَشَاءَ، فَلَمْ يَسْجُدْ، وَمَنَعَهُمْ أَنْ يَسْجُدُوا[٢].

واتە: لە هیشامی کوڕی عوڕوەوە ﷺ گێڕدراوەتەوە، ئەویش لە باوکیەوە ﷺ گێڕاویەتەوە (گوتوویەتی): عومەری کوڕی خەتتاب ﷺ ئایەتێکی سوژدەی خوێندەوە لە کاتێکدا لەسەر مینبەر بوو لە ڕۆژی هەینی، جا هاتە خوارەوە و سوژدەی برد، خەڵکیش لەگەڵیدا سوژدەیان برد، دواتر بۆ هەینی داهاتوو دووبارە ئایەتەکەی خوێندەوە، جا خەڵکی خۆیان ئامادە کرد بۆ سوژدە، ئیمامی عومەر ﷺ گوتی: وەکوو خۆتان بن (مەجوڵێن)، خوای پەروەردگار ئەم سوژدەیەی لەسەر واجب نەکردووین (واتە بە واجبی تێ نەگەن) تەنها ئەگەر خۆمان بمانەوێ (ئەو کات دەیبەین)، جا سوژدەی نەبرد و ئەوانیشی قەدەغە کرد لەوەی سوژدە ببەن (تا بزانن سوننەتە نەك واجب).

٥٥٢- قَالَ مَالِكٌ ﷺ: لَيْسَ الْعَمَلُ عَلَى أَنْ يَنْزِلَ الإِمَامُ إِذَا قَرَأَ السَّجْدَةَ عَلَى الْمِنْبَرِ، فَيَسْجُدَ[٣].

واتە: ئیمامی مالیك ﷺ گوتوویەتی: کار بەوە ناکرێ (واتە پێویست نییە) بەوەی ئیمام کاتێ ئایەتی سوژدەی خوێندەوە لەسەر مینبەر بێتە خوارەوە و سوژدە بەرێت.

---

(١) ـ صحيح. أخرجه أبو مصعب الزهري: ٢٦١؛ والحدثاني: ٩٧؛ والشيباني: ٢٦٨؛ والشافعي: ١٠٣٢، كلهم عن مالك به.

(٢) ـ صحيح. أخرجه أبو مصعب الزهري: ٢٦٢، عن مالك به.

(٣) ـ أخرجه أبو مصعب الزهري: ٢٦٤، عن مالك به.

**٥٥٣- [فتوى]** قَالَ يَحْيَى ﵀: قَالَ مَالِكٌ ﵀: الأَمْرُ عِنْدَنَا أَنَّ عَزَائِمَ سُجُودِ الْقُرْآنِ إِحْدَى عَشْرَةَ سَجْدَةً، لَيْسَ فِي الْمُفَصَّلِ مِنْهَا شَيْءٌ[1].

(فتوا) واتە: یەحیا ﵀ گوتوویەتی: ئیمامی مالیك ﵀ گوتوویەتی: لەلای ئێمە شوێنە گەورە و سوننەتەکان کە چاك بێت سوژدەیان تیادا ببردرێت یازدە ئایەتی سوژدەن، ئەو یازدە شوێنانە هیچیان لە سورەتە موفەصەڵەکان نین[2].

**٥٥٤- [فتوى]** قَالَ مَالِكٌ ﵀: لاَ يَنْبَغِي لأَحَدٍ يَقْرَأُ مِنْ سُجُودِ الْقُرْآنِ شَيْئًا بَعْدَ صَلاَةِ الصُّبْحِ، وَلاَ بَعْدَ صَلاَةِ الْعَصْرِ، وَذَلِكَ أَنَّ رَسُولَ اللهِ ﷺ نَهَى عَنِ الصَّلاَةِ بَعْدَ الصُّبْحِ، حَتَّى تَطْلُعَ الشَّمْسُ، وَعَنِ الصَّلاَةِ بَعْدَ الْعَصْرِ، حَتَّى تَغْرُبَ الشَّمْسُ، وَالسَّجْدَةُ مِنَ الصَّلاَةِ، فَلاَ يَنْبَغِي لأَحَدٍ أَنْ يَقْرَأَ سَجْدَةً فِي تَيْنِكَ السَّاعَتَيْنِ[3].

(فتوا) واتە: ئیمامی مالیك ﵀ گوتوویەتی: نابێ هیچ کەسێك کە یەکێك لە ئایەتەکانی سوژدە دەخوێنێت (لەم دوو کاتەدا) سوژدە بەرێت: دوای نوێژی بەیانی و دوای نوێژی عەسر، ئەمەش لەبەر ئەوەیە پێغەمبەری خوا ﷺ نەهی کردووە لە نوێژ دوای نوێژی بەیانی تاوەکوو خۆر هەڵدێ، وە لە نوێژ دوای عەسر تاوەکوو خۆر ئاوا دەبێ، سوژدەش لە نوێژە، کەواتە کەس بۆی نییە سوژدە بەرێت لەم دوو کاتەدا.

**٥٥٥- [فتوى]** قَالَ يَحْيَى ﵀: سُئِلَ مَالِكٌ ﵀: عَمَّنْ قَرَأَ سَجْدَةً وَامْرَأَةٌ حَائِضٌ تَسْمَعُ، هَلْ لَهَا أَنْ تَسْجُدَ؟ قَالَ مَالِكٌ ﵀: لاَ يَسْجُدُ الرَّجُلُ، وَلاَ الْمَرْأَةُ، إِلاَّ وَهُمَا طَاهِرَانِ[4].

(فتوا) واتە: یەحیا ﵀ گوتوویەتی: ئیمامی مالیك ﵀ پرسیاری لێکرا دەربارەی ئەو کەسەی ئایەتی سوژدە دەخوێنێت لە کاتێکدا ئافرەتێکی حەیزدار گوێی لێیەتی، ئایا (ئافرەتەکە) بۆی هەیە سوژدە بەرێت؟ ئیمامی مالیك ﵀ گوتوویەتی: نە پیاو و نە ئافرەت بۆیان نیە سوژدە بەن مەگەر پاك و بەدەستنوێژ بن (ئینجا بۆیان هەیە، چونکە سوژدەش لە نوێژە).

---

(١) ـ أخرجه أبو مصعب الزهري: ٢٦٥، عن مالك به.

(٢) ـ تێبینی: سورەتە موفەصەلەکان لە سورەتی «الحجرات»ـەوە دەست پێ دەکەن تا سورەتی «عبس».

(٣) ـ أخرجه أبو مصعب الزهري: ٢٦٦؛ والحدثاني: ٩٧ب، عن مالك به.

(٤) ـ أخرجه أبو مصعب الزهري: ٢٦٧؛ والحدثاني: ٩٧ج، عن مالك به.

٥٥٦- **[فتوى]** قَالَ يَحْيَى ﷺ: وسُئِلَ مَالِكٌ ﷺ عَنِ امْرَأَةٍ قَرَأَتْ سَجْدَةً، وَرَجُلٌ مَعَهَا يَسْمَعُ، أَعَلَيْهِ أَنْ يَسْجُدَ مَعَهَا؟ قَالَ مَالِكٌ: لَيْسَ عَلَيْهِ أَنْ يَسْجُدَ مَعَهَا، إِنَّمَا تَجِبُ السَّجْدَةُ عَلَى الْقَوْمِ يَكُونُونَ مَعَ الرَّجُلِ يَأْتَمُّونَ بِهِ، فَيَقْرَأُ سَجْدَةً، فَيَسْجُدُونَ مَعَهُ، وَلَيْسَ عَلَى مَنْ سَمِعَ سَجْدَةً مِنْ إِنْسَانٍ يَقْرَؤُهَا، لَيْسَ لَهُ بِإِمَامٍ أَنْ يَسْجُدَ تِلْكَ السَّجْدَةَ[1].

(فتوا) واتە: یەحیا ﷺ گوتوویەتی: ئیمامی مالیك ﷺ پرسیاری لێکرا دەربارەی ئافرەتێك کە ئایەتێکی سوژدە دەخوێنێت لە کاتێکدا پیاوێکی لەگەڵە گوێی لێیە، ئایا پیاوەکە لەسەری واجبە لەگەڵ ئافرەتەکە سوژدە ببات؟ ئیمامی مالیك ﷺ گوتی: پیاوەکە لەسەری واجب نییە سوژدە لەگەڵ ئافرەتەکە ببات، سوژدە تەنها لەسەر خەڵکانێك واجبە لەگەڵ پیاوێك بن و لەگەڵی لەناو نوێژدا بن، پیاوە (ئیمامەکە) ئایەتی سوژدە بخوێنێت و سوژدە ببات، ئەو کات لەسەریان واجبە لەگەڵ ئەو سوژدە ببەن، کەواتە سوژدە واجب نییە لەسەر کەسێك گوێی لە ئایەتی سوژدە دەبێت لە کەسێکەوە و کەسەکە سوژدە دەبات کە ئیمامی ئەو نییە (واتە مادام ئیمامی ئەو نییە و لەناو نوێژ نییە لەسەری واجب نییە وەك ئەو سوژدە ببات)[2].

## ٦- ئەوەی هاتووە دەربارەی خوێندنی سورەتی: ﴿قُلْ هُوَ اللَّهُ أَحَدٌ ۝١﴾ الإخلاص و ﴿تَبَارَكَ الَّذِي بِيَدِهِ الْمُلْكُ ۝١﴾ الملك[3]

**٥٥٧**- عَنْ أَبِي سَعِيدٍ الْخُدْرِيِّ ﷺ، أَنَّهُ سَمِعَ رَجُلاً يَقْرَأُ: ﴿قُلْ هُوَ اللَّهُ أَحَدٌ ۝١﴾ الإخلاص، يُرَدِّدُهَا، فَلَمَّا أَصْبَحَ غَدَا إِلَى رَسُولِ اللهِ ﷺ، فَذَكَرَ ذَلِكَ لَهُ، وَكَأَنَّ الرَّجُلَ يَتَقَالُّهَا، فَقَالَ رَسُولُ اللهِ ﷺ: وَالَّذِي نَفْسِي بِيَدِهِ، إِنَّهَا لَتَعْدِلُ ثُلُثَ الْقُرْآنِ[4].

---

(١) ـ أخرجه أبو مصعب الزهري: ٢٦٨؛ والحدثاني: ٩٧ج، عن مالك به.

(٢) ـ تێبینی: کاتێ ئیمام سوژدەی تیلاوە دەبات بۆ ئەو سوننەتە، بەڵام لەسەر مەئمومەکان واجبە شوێنی ئیمامەکە بکەون و بۆ ئەوان دەبێتە واجب لەبەر شوێنکەوتن.

(٣) ـ مَا جَاءَ فِي قِرَاءَةِ: {قُلْ هُوَ اللهُ أَحَدٌ} وَ {تَبَارَكَ الَّذِي بِيَدِهِ الْمُلْكُ}.

(٤) ـ صحيح. أخرجه أبو مصعب الزهري: ٢٥٦؛ والحدثاني: ٩٦؛ والشيباني: ١٧٢؛ وابن حنبل: ١١١٩٧، وفي: ١١٣٢٤، وفي: ١١٤١٠؛ والبخاري: ٥٠١٣، وفي: ٦٦٤٣، وفي: ٧٣٧٤؛ والنسائي: ٩٩٥؛ وأبو داود: ١٤٦١؛ وابن حبان:

واتە: لە ئەبو سەعیدی خودرییەوە ﷺ گێڕدراوەتەوە گوێی لە پیاوێك بووە هەر: ﴿ قُلْ هُوَ ٱللَّهُ أَحَدٌ ۝١ ﴾ الإخلاص، ی دووبارە دەكردەوە (واتە هەر سوڕەتی ئیخلاصی دەخوێند)، جا كاتێ بەیانی كردەوە چوو بۆ لای پێغەمبەری خوا ﷺ و ئەوەی بۆ باس كرد وەك ئەوەی ئەبو سەعید ﷺ ئەم كارەی پێ كەمپاداشت بێ، جا پێغەمبەری خوا ﷺ فەرمووی: سوێند بەو كەسەی گیانی منی بەدەستە، ئەو سوڕەتە (پاداشتەكەی) بە ئەندازەی سێیەكی قوڕئانە.

٥٥٨- عَنْ عُبَيْدِ بْنِ حُنَيْنٍ، مَوْلَى آلِ زَيْدِ بْنِ الْخَطَّابِ ﷺ، أَنَّهُ قَالَ: سَمِعْتُ أَبَا هُرَيْرَةَ ﷺ يَقُولُ: أَقْبَلْتُ مَعَ رَسُولِ اللهِ ﷺ، فَسَمِعَ رَجُلاً يَقْرَأُ:﴿ قُلْ هُوَ ٱللَّهُ أَحَدٌ ۝١ ﴾ الإخلاص، فَقَالَ رَسُولُ اللهِ ﷺ: وَجَبَتْ، فَسَأَلْتُهُ: مَاذَا يَا رَسُولَ اللهِ؟ فَقَالَ: الْجَنَّةُ، فَقَالَ أَبُو هُرَيْرَةَ ﷺ: فَأَرَدْتُ أَنْ أَذْهَبَ إِلَيْهِ، فَأُبَشِّرَهُ، ثُمَّ فَرِقْتُ أَنْ يَفُوتني الْغَدَاءُ مَعَ رَسُولِ اللهِ ﷺ، فَآثَرْتُ الْغَدَاءَ مَعَ رَسُولِ اللهِ ﷺ، ثُمَّ ذَهَبْتُ إِلَى الرَّجُلِ، فَوَجَدْتُهُ قَدْ ذَهَبَ[1].

واتە: لە عوبەیدی كوڕی حونەینی خزمەتكاری ئالی زەیدی كوڕی خەتتابەوە ﷺ گێڕدراوەتەوە گوتوویەتی: گوێم لە ئەبو هوڕەیرە ﷺ بوو دەیگوت: لەگەڵ پێغەمبەری خوا ﷺ هاتم، جا پێغەمبەری خوا ﷺ گوێی لە پیاوێك بوو: ﴿ قُلْ هُوَ ٱللَّهُ أَحَدٌ ۝١ ﴾الإخلاص،ی دەخوێند، جا پێغەمبەری خوا ﷺ فەرمووی: واجب بوو، منیش پرسیارم لێكرد: چی (واجب بوو) ئەی پێغەمبەری خوا ﷺ؟ فەرمووی: بەهەشت، ئەبو هوڕەیرە ﷺ دەڵێ: جا ویستم بچم بۆ لای و موژدەی بدەمێ، دواتر ترسام نانی بەیانیم لەگەڵ پێغەمبەری خوادا ﷺ لە كیس بچێ، بۆیە بەشداریكردنم لە نانی بەیانیدا لەگەڵ پێغەمبەری خوادا ﷺ هەڵبژارد (بە ئومێدی ئەوەی دواتر دەیبینم)، دواتر ڕۆیشتم بۆ لای پیاوەكە، جا بینیم ڕۆیشتووە.

---

٧٩١؛ وأبو يعلى الموصلي: ١٥٤٨؛ والقابسي: ٣٩١، كلهم عن مالك به.

(١) ـ صحيح. أخرجه أبو مصعب الزهري: ٢٥٧؛ والحدثاني: ٩٦أ؛ وابن حنبل: ٧٩٩٨، وفي: ١٠٩٣٢؛ والنسائي: ٩٩٤؛ والترمذي: ٢٨٩٧؛ وأبو يعلى الموصلي: ٧٦٧؛ والقابسي: ٣٨٢، كلهم عن مالك به.

٥٥٩- عَنِ ابْنِ شِهَابٍ ﷺ، عَنْ حُمَيْدِ بْنِ عَبْدِ الرَّحْمَنِ بْنِ عَوْفٍ ﷺ، أَنَّهُ أَخْبَرَهُ أَنَّ: ﴿ قُلْ هُوَ ٱللَّهُ أَحَدٌ ۝١ ﴾ الإخلاص، تَعْدِلُ ثُلُثَ الْقُرْآنِ، وَأَنَّ: ﴿ تَبَٰرَكَ ٱلَّذِى بِيَدِهِ ٱلْمُلْكُ ۝١ ﴾ الملك، تُجَادِلُ عَنْ صَاحِبِهَا[1].

واتە: لە ئیبنو شیهابەوە ﷺ گێڕدراوەتەوە، ئەویش لە حومەیدی کوڕی عەبدوڕڕەحمانی کوڕی عەوفەوە ﷺ گێراویەتەوە هەواڵی پێداوە بەوەی: ﴿ قُلْ هُوَ ٱللَّهُ أَحَدٌ ۝١ ﴾ الإخلاص، (پاداشتەکەی) بە ئەندازەی سێیەکی قورئانە، وە (خوێندنی بەردەوامی): ﴿ تَبَٰرَكَ ٱلَّذِى بِيَدِهِ ٱلْمُلْكُ ۝١ ﴾ الملك، پارێزگاری لە خاوەنەکەی دەکات (لە سزای گۆڕو لە ڕۆژی دوایی، تا دەیخاتە بەهەشتەوە).

## ٧- ئەوەی هاتووە دەربارەی زیکر و یادی خوا ﷻ [2]

٥٦٠- عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ ﷺ، أَنَّ رَسُولَ اللهِ ﷺ قَالَ: مَنْ قَالَ: لاَ إِلَهَ إِلاَّ اللهُ، وَحْدَهُ لاَ شَرِيكَ لَهُ، لَهُ الْمُلْكُ وَلَهُ الْحَمْدُ، وَهُوَ عَلَى كُلِّ شَيْءٍ قَدِيرٌ، فِي يَوْمٍ مِئَةَ مَرَّةٍ، كَانَتْ لَهُ عَدْلَ عَشْرِ رِقَابٍ، وَكُتِبَتْ لَهُ مِئَةُ حَسَنَةٍ، وَمُحِيَتْ عَنْهُ مِئَةُ سَيِّئَةٍ، وَكَانَتْ لَهُ حِرْزًا مِنَ الشَّيْطَانِ، يَوْمَهُ ذَلِكَ حَتَّى يُمْسِيَ، وَلَمْ يَأْتِ أَحَدٌ بِأَفْضَلَ مِمَّا جَاءَ بِهِ، إِلاَّ أَحَدٌ عَمِلَ أَكْثَرَ مِنْ ذَلِكَ[3].

واتە: لە ئەبو هورەیرەوە ﷺ گێڕدراوەتەوە (گوتوویەتی): پێغەمبەری خوا ﷺ فەرموویەتی: هەر کەسێك لە ڕۆژێکدا سەد جار بڵێ: ((لاَ إِلَهَ إِلاَّ اللهُ، وَحْدَهُ لاَ شَرِيكَ لَهُ، لَهُ الْمُلْكُ وَلَهُ الْحَمْدُ، وَهُوَ عَلَى كُلِّ شَيْءٍ قَدِيرٌ))، ئەوە بۆی وەك پاداشتی ئازادکردنی دە کۆیلە وایە، وە سەد چاکەشی بۆ دەنووسرێ، وە سەد خراپەشی لەسەر دەسڕێتەوە، وە بۆی دەبێتە پارێزەر و پەنا لە شەیتان لە ڕۆژەکەدا تا شەو دەکاتەوە، وە کەس بە چاکتر هەڵنەستاوە و لە دوارۆژ بە چاکتر نایێت لەوەی ئەو

---

(١) ـ مقطوع صحيح. أخرجه أبو مصعب الزهري: ٢٥٨؛ والحدثاني: ٩٦ب، كلهم عن مالك به.

(٢) ـ مَا جَاءَ فِي ذِكْرِ اللهِ تَبَارَكَ وَتَعَالَى.

(٣) ـ صحيح. أخرجه أبو مصعب الزهري: ٥٢٠؛ والحدثاني: ١٦٩؛ وابن حنبل: ٧٩٩٥، وفي: ٨٨٦٠؛ والبخاري: ٣٢٩٣، وفي: ٦٤٠٣؛ ومسلم: ٢٨؛ والترمذي: ٣٤٦٨؛ وابن ماجه: ٣٨٤٣؛ وابن حبان: ٨٤٩؛ ومصنف ابن أبي شيبة: ٢٩٤٦٧، كلهم عن مالك به.

پێی هەڵساوە و لەگەڵ خۆی بەتوێشوو بۆ دوارۆژ هێناویەتی، تەنها کەسێك نەبێت لەوە زیاتری ئەنجام دابێت.

**٥٦١- عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ ﷺ، أَنَّ رَسُولَ اللهِ ﷺ قَالَ: مَنْ قَالَ: سُبْحَانَ اللهِ وَبِحَمْدِهِ فِي يَوْمٍ مِئَةَ مَرَّةٍ، حُطَّتْ عَنْهُ خَطَايَاهُ، وَإِنْ كَانَتْ مِثْلَ زَبَدِ الْبَحْرِ[١].**

واتە: لە ئەبو هورەیرەوە ﷺ گێردراوەتەوە (گوتوویەتی): پێغەمبەری خوا ﷺ فەرموویەتی: هەر کەسێك لە ڕۆژێکدا سەد جار بڵێ: «سبحان الله وبحمده» ئەوە گوناهەکانی دەسڕێنەوە، ئەگەر بە ئەندازەی کەفی دەریاش بن.

**٥٦٢- عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ ﷺ، أَنَّهُ قَالَ: مَنْ سَبَّحَ اللهَ دُبُرَ كُلِّ صَلاَةٍ ثَلاَثًا وَثَلاَثِينَ، وَكَبَّرَ ثَلاَثًا وَثَلاَثِينَ، وَحَمِدَ ثَلاَثًا وَثَلاَثِينَ، وَخَتَمَ الْمِئَةَ بِلاَ إِلَهَ إِلاَّ اللهُ، وَحْدَهُ لاَ شَرِيكَ لَهُ، لَهُ الْمُلْكُ وَلَهُ الْحَمْدُ، وَهُوَ عَلَى كُلِّ شَيْءٍ قَدِيرٌ، غُفِرَتْ ذُنُوبُهُ، وَلَوْ كَانَتْ مِثْلَ زَبَدِ الْبَحْرِ[٢].**

واتە: لە ئەبو هورەیرەوە ﷺ گێردراوەتەوە گوتوویەتی: هەر کەسێك لەدوای گشت نوێژەکان سی و سێ جار «سبحان الله» و سی و سێ جار «الله أكبر» و سی و سێ جار «الحمد لله» بکات (کە دەکاتە نەوەد و نۆ)، جا ژمارە سەد کۆتایی پێ بهێنێت بە «لاَ إِلَهَ إِلاَّ اللهُ، وَحْدَهُ لاَ شَرِيكَ لَهُ، لَهُ الْمُلْكُ وَلَهُ الْحَمْدُ، وَهُوَ عَلَى كُلِّ شَيْءٍ قَدِيرٌ» ئەوە لە گوناهەکانی دەبووردرێ، ئەگەر بە ئەندازەی کەفی دەریاش بن.

**٥٦٣- عَنْ عُمَارَةَ بْنِ صَيَّادٍ ﷺ، عَنْ سَعِيدِ بْنِ الْمُسَيَّبِ ﷺ أَنَّهُ سَمِعَهُ يَقُولُ فِي الْبَاقِيَاتِ الصَّالِحَاتِ: إِنَّهَا قَوْلُ الْعَبْدِ: اللهُ أَكْبَرُ، وَسُبْحَانَ اللهِ، وَالْحَمْدُ لِلَّهِ، وَلاَ إِلَهَ إِلاَّ اللهُ، وَلاَ حَوْلَ وَلاَ قُوَّةَ إِلاَّ بِاللَّهِ[٣].**

واتە: لە عومارەی کوڕی صەیادەوە ﷺ گێردراوەتەوە، ئەویش لە سەعیدی کوڕی موسەیەبەوە ﷺ گێراویەتەوە بەوەی گوێی لێی بووە دەربارەی «الْبَاقِيَاتِ الصَّالِحَاتِ»

---

(١) ـ صحيح. أخرجه أبو مصعب الزهري: ٥٢١؛ وابن حنبل: ٧٩٩٦، وفي: ١٠٦٩٤؛ والبخاري: ٦٤٠٥؛ وابن ماجه: ٣٨٥٧؛ وابن حبان: ٨٢٩؛ ومصنف ابن أبي شيبة: ٢٩٤٠٨؛ والقابسي: ٤٣١، كلهم عن مالك به.

(٢) ـ صحيح. أخرجه أبو مصعب الزهري: ٥٢٢؛ وابن حبان: ٢٠١٣، عن مالك به.

(٣) ـ مقطوع صحيح. أخرجه أبو مصعب الزهري: ٥٢٣؛ والحدثاني: ١٧٠؛ والشيباني: ١٠٠١، كلهم عن مالك به.

(واتە ئەو كردەوە چاكانەی پاداشتیان زۆرە و دەمێننەوە كە لە ئایەتی ٤٦ی سورەتی كەهفدا هاتوە) دەیگوت: ئەوانە بریتین لە ویردی بەندەی مسوڵمان كاتێ دەڵێ: «اللهُ أَكْبَرُ، وَسُبْحَانَ اللهِ، وَالْحَمْدُ لِلَّهِ، وَلاَ إِلَهَ إِلاَّ اللهُ، وَلاَ حَوْلَ وَلاَ قُوَّةَ إِلاَّ بِاللَّهِ».

**٥٦٤-** قَالَ أَبُو الدَّرْدَاءِ ﷺ: أَلاَ أُخْبِرُكُمْ بِخَيْرِ أَعمَالِكُمْ، وَأَرْفَعِهَا فِي دَرَجَاتِكُمْ، وَأَزْكَاهَا عِنْدَ مَلِيكِكُمْ، وَخَيْرٍ لَكُمْ مِنْ إِعْطَاءِ الذَّهَبِ وَالْوَرِقِ، وَخَيْرٍ لَكُمْ مِنْ أَنْ تَلْقَوْا عَدُوَّكُمْ، فَتَضْرِبُوا أَعْنَاقَهُمْ، وَيَضْرِبُوا أَعْنَاقَكُمْ؟ قَالُوا: بَلَى، قَالَ: ذِكْرُ اللهِ[١].

قَالَ مُعَاذُ بْنُ جَبَلٍ ﷺ: مَا عَمِلَ ابْنُ آدَمَ مِنْ عَمَلٍ أَنْجَى لَهُ مِنْ عَذَابِ اللهِ، مِنْ ذِكْرِ اللهِ[٢].

واتە: ئەبو دەرداء ﷺ گوتوویەتی: ئایا هەواڵتان پێ نەدەم بە چاكترین كردەوەكانتان و بەرزترینیشیان لە بەرزكردنەوەی پلەكانتان و پاكترین و گەشەكردووترینیان لەلای پەروەردگارتانەوە، وە چاكتر بێت بۆتان لە بەخشینی زێڕ و زیو، وە چاكتر بێت بۆتان لەوەی بگەن بە دوژمنەكانی ئایینتان و لە گەردەنیان بدەن و ئەوانیش لە گەردەنتان بدەن و شەهید ببن (جا پێتان نەڵێم ئەوە چ كردەوەیەكە لە گشت لەمانە گەورەتر بێ)؟ گوتیان: با، فەرمووی: زیكر و یادی خوای گەورەیە.

موعازی كوڕی جەبەل ﷺ گوتوویەتی: نەوەی ئادەم هیچ كردەوەیەكی نەكردووە ڕزگاركەرتر بێت بۆی لە سزای خوا، وەك زیكر و یادی خوا ﷻ.

**٥٦٥-** عَنْ رِفَاعَةَ بْنِ رَافِعٍ الزُّرَقِيِّ ﷺ، أَنَّهُ قَالَ: كُنَّا يَوْمًا نُصَلِّي وَرَاءَ رَسُولِ اللهِ ﷺ، فَلَمَّا رَفَعَ رَسُولُ اللهِ ﷺ رَأْسَهُ مِنَ الرَّكْعَةِ، وَقَالَ: سَمِعَ اللهُ لِمَنْ حَمِدَهُ، قَالَ رَجُلٌ وَرَاءَهُ: رَبَّنَا وَلَكَ الْحَمْدُ، حَمْدًا كَثِيرًا طَيِّبًا مُبَارَكًا فِيهِ، فَلَمَّا انْصَرَفَ رَسُولُ اللهِ ﷺ، قَالَ: مَنِ الْمُتَكَلِّمُ آنِفًا؟ فَقَالَ: قَالَ الرَّجُلُ: أَنَا يَا رَسُولَ اللهِ، فَقَالَ رَسُولُ اللهِ ﷺ: لَقَدْ رَأَيْتُ بِضْعَةً وَثَلاَثِينَ مَلَكًا يَبْتَدِرُونَهَا، أَيُّهُمْ يَكْتُبُهُنَّ أَوَّلاً[٣].

---

(١) ـ ضعيف. أخرجه أبو مصعب الزهري: ٥٢٤؛ والحدثاني: ١٧٠أ، عن مالك به.

(٢) ـ أخرجه الحدثاني: ١٧٠ب، عن مالك به.

(٣) ـ صحيح. أخرجه أبو مصعب الزهري: ٥٢٦؛ والحدثاني: ١٧٠ج؛ وابن حنبل: ١٩٠١٨؛ والبخاري: ٧٩٩؛ والنسائي: ١٠٦٢؛ وأبو داود: ٧٧٠؛ وابن حبان: ١٩١٠؛ والقابسي: ٢٦٩، كلهم عن مالك به.




واتە: لە ریفاعەی کوڕی ڕافیعی زورقییەوە ﷺ گێڕدراوەتەوە گوتوویەتی: ڕۆژێك نوێژمان لەدوای پێغەمبەری خوا ﷺ دەکرد، جا کاتێ سەری موبارەکی بەرز کردەوە لە ڕکوع و فەرمووی: «سَمِعَ اللهُ لِمَنْ حَمِدَهُ» پیاوێك لە دواوەی گوتی: «رَبَّنَا وَلَكَ الْحَمْدُ، حَمْدًا كَثِيرًا طَيِّبًا مُبَارَكًا فِيهِ» ، جا کاتێ پێغەمبەری خوا ﷺ سەلامی دایەوە فەرمووی: بەر لە ئێستا کێ بوو قسەی کرد؟ جا دەڵێ: پیاوەکە گوتی: من بووم ئەی پێغەمبەری خوا ﷺ، پێغەمبەری خواش ﷺ فەرمووی: سی و ئەوەندە فریشتەم بینین دەستپێشخەرییان دەکرد کامیان پێشتر پاداشتەکەی بنووسن[١].

### ٨- ئەوەی هاتووە دەربارەی دوعا و نزا[٢]

**٥٦٦- عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ ﷺ، أَنَّ رَسُولَ اللهِ ﷺ قَالَ: لِكُلِّ نَبِيٍّ دَعْوَةٌ يَدْعُو بِهَا، فَأُرِيدُ أَنْ أَخْتَبِئَ دَعْوَتِي، شَفَاعَةً لأُمَّتِي فِي الآخِرَةِ[٣].**

واتە: لە ئەبو هورەیرەوە ﷺ گێڕدراوەتەوە (گوتوویەتی): پێغەمبەری خوا ﷺ فەرموویەتی: بۆ گشت پێغەمبەرێك نزایێك هەیە داوای دەکات (کە حەتمەن دێتە جێ، وەك نزاکانی پێغەمبەران بە لەناوبردنی گەلە کافرەکانیان)، جا من دەمەوێ نزاکەم هەڵبگرم بۆ کردنە شەفاعەت بۆ ئوممەتەکەم لە ڕۆژی دواییدا.

---

(١) ـ تێبینی: ئەوە یەکێك لەو فەرموودانەیە کە دەبێتە بەڵگە بۆ ڕای زۆربەی زانایانی وەك ئیمامی شافیعی کە دەفەرموون: بیدعەی چاك و بیدعەی خراپ هەیە، ئەوە یەکێکە لە بیدعە چاکەکان، چونکە بەدڵنیایی کارەکەی بیدعە بوو، چونکە پێغەمبەری خوا ﷺ ئەو زیکرەی فێر نەکردبوو، کەچی خۆی ئەنجامی دا و خوای پەروەردگار لێی قبووڵ کرد و پاداشتی دایەوە پێش ئەوەی پێغەمبەری خوا ﷺ ئیقراری لەسەر بکات، پێغەمبەری خوا ﷺ تەنها هەواڵیدا بەوەی ئەو زیکرە پاداشتەکەی زۆر بووە فریشتەکان پێشبڕکێیان لەسەر نووسینی پاداشتەکەی کردووە، دوای ئیقراری پێغەمبەری خوا ﷺ بۆ ئێمە بوو بە سوننەت، بەڵام بۆ هاوەڵەکە بەر لە ئیقراری پێغەمبەری خوا ﷺ بیدعەیەکی چاك و قبووڵکراو بوو، دواتر دوای ئیقرار بۆ ئەویش بوو بە سوننەت.

(٢) ـ مَا جَاءَ فِي الدُّعَاءِ.

(٣) ـ صحيح. أخرجه أبو مصعب الزهري: ٦١٥؛ والحدثاني: ٢٠٠؛ وابن حنبل: ١٠٣١٦؛ والبخاري: ٦٣٠٤؛ وابن حبان: ٦٤٦١؛ والقابسي: ٣٣٥، كلهم عن مالك به.

٥٦٧- عَنْ يَحْيَى بْنِ سَعِيدٍ ﷺ، أَنَّهُ بَلَغَهُ، أَنَّ رَسُولَ اللهِ ﷺ كَانَ يَدْعُو فَيَقُولُ: اللهُمَّ فَالِقَ الإِصْبَاحِ، وَجَاعِلَ اللَّيْلِ سَكَنًا، وَالشَّمْسِ وَالْقَمَرِ حُسْبَانًا، اقْضِ عَنِّي الدَّيْنَ، وَأَغْنِنِي مِنَ الْفَقْرِ، وَأَمْتِعْنِي بِسَمْعِي، وَبَصَرِي، وَقُوَّتِي فِي سَبِيلِكَ[١].

واتە: لە یەحیای کوڕی سەعیدەوە ﷺ گێڕدراوەتەوە بەوەی پێی گەیشتووە: پێغەمبەری خوا ﷺ هەموو جار دوعای دەکرد و دەیفەرموو: (اللهُمَّ فَالِقَ الإِصْبَاحِ، وَجَاعِلَ اللَّيْلِ سَكَنًا، وَالشَّمْسِ وَالْقَمَرِ حُسْبَانًا، اقْضِ عَنِّي الدَّيْنَ، وَأَغْنِنِي مِنَ الْفَقْرِ، وَأَمْتِعْنِي بِسَمْعِي، وَبَصَرِي، وَقُوَّتِي فِي سَبِيلِكَ) واتە: پەروەردگارا، ئەی دروستکار و دەرخەری بەیان و ڕووناکی، ئەی دانەر و دروستکاری شەو بۆ وەستاندنی جموجۆڵ (بۆ پشوو)، ئەی دانەری ڕۆژ و مانگ و گێڕانی بە ئالەتی حیساب بۆ ڕۆژ و مانگ وساڵ ... هتد، دەسا قەرزم بۆ بدەرەوە و دەوڵەمەندم بکە لە هەژاری و بەهرەوەرم بکە بە بیستنم و بینینم و هێزم لە پێناوی خۆتدا.

٥٦٨- عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ ﷺ، أَنَّ رَسُولَ اللهِ ﷺ قَالَ: لاَ يَقُلْ أَحَدُكُمْ إِذَا دَعَا: اللهُمَّ اغْفِرْ لِي إِنْ شِئْتَ، اللهُمَّ ارْحَمْنِي إِنْ شِئْتَ، لِيَعْزِمِ الْمَسْأَلَةَ، فَإِنَّهُ لاَ مُكْرِهَ لَهُ[٢].

واتە: لە ئەبو هورەیرەوە ﷺ گێڕدراوەتەوە (گوتوویەتی): پێغەمبەری خوا ﷺ فەرموویەتی: یەکێك لە ئێوە کاتێ نزا و دوعا دەکات با نەڵێت: پەروەردگارا لێم خۆش بە ئەگەر دەتەوێت، پەروەردگارا ڕەحمم پێ بکە ئەگەر دەتەوێت (واتە با نەڵێت إن شاء الله)، بەڵکوو با جەخت و پێداگری بکات لە داواکردن، چونکە خوای پەروەردگار هیچ زۆرلێکەرێکی نییە (هەرچی بیکات بە ویستی خۆیەتی، بەڵام ئەم جۆرە داواکردنە بە إن شاء الله ساردوسڕی پێوە دیارە و خوای پەروەردگار پێی خۆش نییە)[٣].

---

(١) ـ ضعيف. أخرجه أبو مصعب الزهري: ٦١٦؛ والحدثاني: ٢٠٠أ، كلهم عن مالك به.

(٢) ـ صحيح. أخرجه أبو مصعب الزهري: ٦١٧؛ والحدثاني: ٢٠٠ب؛ وابن حنبل: ١٠٣١٥؛ والبخاري: ٦٣٣٩؛ وأبو داود: ١٤٨٣؛ والترمذي: ٣٤٩٧؛ والقابسي: ٣٣٦، كلهم عن مالك به.

(٣) ـ تێبینی: ئەوە لەو کاتە نەهی لێکراوە ئەگەر مەبەستی بە گوتنی (إن شاْ الله) مەشیئەتی خوا بێ، واتە قبووڵکردن و ڕەتکردنەوەی دوعاکەی بداتە دەست خوا، خوا ئەوەی پێ خۆش نییە، حەز دەکات




**٥٦٩- عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ ﷺ، أَنَّ رَسُولَ اللهِ ﷺ قَالَ: يُسْتَجَابُ لأَحَدِكُمْ مَا لَمْ يَعْجَلْ، فَيَقُولُ: قَدْ دَعَوْتُ فَلَمْ يُسْتَجَبْ لِي[١].**

واتە: لە ئەبو هورەیرەوە ﷺ گێردراوەتەوە (گوتوویەتی): پێغەمبەری خوا ﷺ فەرموویەتی: هەر یەکێك لە ئێوە وەڵام دەدرێتەوە و نزاکەی قبوول دەبێت مادەم پەلە نەکات بەوەی بڵێ: نزام کرد، وەڵام نەدرامەوە (ئەو قسەیە پەلەکردنە).

**٥٧٠- عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ ﷺ، أَنَّ رَسُولَ اللهِ ﷺ قَالَ: يَنْزِلُ رَبُّنَا ﷻ كُلَّ لَيْلَةٍ إِلَى السَّمَاءِ الدُّنْيَا، حِينَ يَبْقَى ثُلُثُ اللَّيْلِ الآخِرُ، فَيَقُولُ: مَنْ يَدْعُونِي فَأَسْتَجِيبَ لَهُ؟ مَنْ يَسْأَلُنِي فَأُعْطِيَهُ؟ مَنْ يَسْتَغْفِرُنِي فَأَغْفِرَ لَهُ؟[٢].**

واتە: لە ئەبو هورەیرەوە ﷺ گێردراوەتەوە (گوتوویەتی): پێغەمبەری خوا ﷺ فەرموویەتی: پەروەردگارمان ﷻ ڕەحمەتی دادەبەزێ بۆ ئاسمانی دونیا لە هەموو شەوێکدا، کاتێ سێیەکی کۆتایی شەو دادێ، جا دەفەرموێ: کێ لێم دەپاڕێتەوە و نزا دەکات تا بۆی گیرا بکەم؟ کێ داوام لێ دەکات تا پێی ببەخشم؟ کێ داوای لێخۆشبوونم لێ دەکات تا لێی خۆش بم؟

**٥٧١- أَنَّ عَائِشَةَ أُمَّ الْمُؤْمِنِينَ ﷺ قَالَتْ: كُنْتُ نَائِمَةً إِلَى جَنْبِ رَسُولِ اللهِ ﷺ، فَفَقَدْتُهُ مِنَ اللَّيْلِ، فَلَمَسْتُهُ بِيَدِي، فَوَضَعْتُ يَدِي عَلَى قَدَمَيْهِ، وَهُوَ سَاجِدٌ، يَقُولُ: أَعُوذُ بِرِضَاكَ مِنْ سَخَطِكَ، وَبِمُعَافَاتِكَ مِنْ عُقُوبَتِكَ، وَبِكَ مِنْكَ، لاَ أُحْصِي ثَنَاءً عَلَيْكَ، أَنْتَ كَمَا أَثْنَيْتَ عَلَى نَفْسِكَ[٣].**

---

پێداگری بکات، بەڵام ئەگەر مەبەستی بە إن شا‌ء الله موڕادیفی یا ڕەبی بێ، واتە مەبەستی گیرابوون بێ، وەك لە کوردەواری دەگوترێ: خوا شیفات دەدا إن شاء الله، مەبەستی ئەوەیە: یا ڕەبی خوا شیفات بدات، بە مەجاز إن شاء الله بەکاردێنێ.

(١) ـ صحيح. أخرجه أبو مصعب الزهري: ٦١٨؛ والحدثاني: ٢٠١؛ وابن حنبل: ١٠٣١٧؛ والبخاري: ٦٣٤٠؛ ومسلمك ٩٠؛ وأبو داود: ١٤٨٤؛ والترمذي: ٣٣٨٧؛ وابن ماجه: ٣٨٩٨؛ وابن حبان: ٩٧٥؛ والقابسي: ٧٤، كلهم عن مالك به.

(٢) ـ صحيح. أخرجه أبو مصعب الزهري: ٦١٩؛ والحدثاني: ٢٠١أ؛ وابن حنبل: ١٠٣١٨؛ والبخاري: ١١٤٥، وفي: ٦٣٢١، وفي: ٧٤٩٤؛ ومسلم: ١٦٨؛ وأبو داود: ١٣١٥، وفي: ٤٧٣٣؛ والترمذي: ٣٤٩٨؛ وابن حبان: ٩٢٠؛ والقابسي: ٢٦، كلهم عن مالك به.

(٣) ـ صحيح لغيره. أخرجه أبو مصعب الزهري: ٦٢٠؛ والحدثاني: ٢٠٢؛ والترمذي: ٣٤٩٣، كلهم عن مالك به.

واتە: عائیشەی دایکی باوەڕداران ﷺ گوتوویەتی: من خەوتبووم لە تەنیشت پێغەمبەری خوا ﷺ، جا لە کاتێکی شەودا بزرم کرد (لەسەر جێگا نەمدۆزیەوە)، جا بەدەستم بەدوایدا دەگەڕام و دەستم لێ دەکوتا، لەناکاو دەستم لەسەر قاچەکانی دانا، لە کاتێکدا لە سوژدە بوو و دەیفەرموو: (أَعُوذُ بِرِضَاكَ مِنْ سَخَطِكَ، وَبِمُعَافَاتِكَ مِنْ عُقُوبَتِكَ، وَبِكَ مِنْكَ، لاَ أُحْصِي ثَنَاءً عَلَيْكَ، أَنْتَ كَمَا أَثْنَيْتَ عَلَى نَفْسِكَ) واتە: ((پەروەردگارا پەنا بە ڕەزامەندیت دەگرم لە توڕەییت، وە پەنا بە سەلامەتکردنت دەگرم لە سزادانت، وە پەنا بە تۆ دەگرم لە تۆ، مەدح و سەنای تۆم پێ جێبەجێ ناکرێت کە شایستەی خۆت بێت لەبەر بێشوماری صیفات و نیعمەتەکانت، (بەڵکوو با) مەدح و سەنا و شوکرم بۆت بەو شێوەیە بێت کە تەنها خۆت تواناداری بەسەری و دەزانی چۆن ئەنجام دەدرێت و خۆت تواناداری بەسەر جێبەجێکردنی)).

**٥٧٢-** عَنْ طَلْحَةَ بْنِ عُبَيْدِ اللهِ بْنِ كَرِيزٍ ﷺ، أَنَّ رَسُولَ اللهِ ﷺ قَالَ: أَفْضَلُ الدُّعَاءِ دُعَاءُ يَوْمِ عَرَفَةَ، وَأَفْضَلُ مَا قُلْتُ أَنَا وَالنَّبِيُّونَ مِنْ قَبْلِي: لاَ إِلَهَ إِلاَّ اللهُ وَحْدَهُ لاَ شَرِيكَ لَهُ[١].

واتە: لە تەڵحەی کوڕی عوبەیدوڵای کوڕی کەریزەوە ﷺ گێڕدراوەتەوە (گوتوویەتی): پێغەمبەری خوا ﷺ فەرموویەتی: چاکترین دوعا و نزا دوعا و نزای ڕۆژی عەرەفەیە، وە چاکترینی ئەوەی من و پێغەمبەرانی پێشوو (عليهم الصلاة والسلام) گوتوومانە (و خێرێکی گەورەی هەیە لەم ڕۆژەدا بگوترێ، بریتییە لەم زیکرە): ((لاَ إِلَهَ إِلاَّ اللهُ وَحْدَهُ لاَ شَرِيكَ لَهُ)) واتە: ((هیچ پەرستراوێکی بەحەق نییە تەنها الله نەبێ، کە تاکە و هیچ هاوبەشێکی نییە)).

**٥٧٣-** عَنْ عَبْدِ اللهِ بْنِ عَبَّاسٍ ﷺ، أَنَّ رَسُولَ اللهِ ﷺ كَانَ يُعَلِّمُهُمْ هَذَا الدُّعَاءَ، كَمَا يُعَلِّمُهُمُ السُّورَةَ مِنَ الْقُرْآنِ، يَقُولُ: اللهُمَّ إِنِّي أَعُوذُ بِكَ مِنْ عَذَابِ جَهَنَّمَ، وَأَعُوذُ بِكَ مِنْ عَذَابِ الْقَبْرِ، وَأَعُوذُ بِكَ مِنْ فِتْنَةِ الْمَسِيحِ الدَّجَّالِ، وَأَعُوذُ بِكَ مِنْ فِتْنَةِ الْمَحْيَا وَالْمَمَاتِ[٢].

---

(١) ـ صحيح لغيره. أخرجه أبو مصعب الزهري: ٦٢١؛ وفي: ١٤٦٢؛ والحدثاني: ٢٠٢أ؛ والحدثاني: ٦٢٤أ، كلهم عن مالك به.

(٢) ـ صحيح. أخرجه أبو مصعب الزهري: ٦٢٢؛ والحدثاني: ٢٠٢ب؛ وابن حنبل: ٢١٦٨، وفي: ٢٧٠٩، وفي: ٢٨٣٩؛ ومسلم: ١٣٤؛ والنسائي: ٢٠٦٣، وفي: ٥٥١٢؛ وأبو داود: ١٥٤٢؛ والترمذي: ٣٤٩٤؛ وابن حبان: ٩٩٩؛

واتە: لە عەبدوڵڵای کوڕی عەبباسەوە ﷺ گێڕدراوەتەوە (گوتوویەتی): پێغەمبەری خوا ﷺ ئەم دوعایەی فێر دەکردن هەروەك چۆن سورەتێکی قورئانی فێر دەکردن، دەیفەرموو: (اللهُمَّ إِنِّي أَعُوذُ بِكَ مِنْ عَذَابِ جَهَنَّمَ، وَأَعُوذُ بِكَ مِنْ عَذَابِ الْقَبْرِ، وَأَعُوذُ بِكَ مِنْ فِتْنَةِ الْمَسِيحِ الدَّجَّالِ، وَأَعُوذُ بِكَ مِنْ فِتْنَةِ الْمَحْيَا وَالْمَمَاتِ) واتە: ((پەروەردگارا من پەنات پێ دەگرم لە سزای دۆزەخ، وە پەنات پێ دەگرم لە سزای گۆڕ، وە پەنات پێ دەگرم لە فیتنە و تاقیکردنەوەی دەججال، وە پەنات پێ دەگرم لە فیتنە و تاقیکردنەوەی ژیان و مردن)).

**٥٧٤-** عَنْ عَبْدِ اللهِ بْنِ عَبَّاسٍ ﷺ: أَنَّ رَسُولَ اللهِ ﷺ كَانَ إِذَا قَامَ إِلَى الصَّلاَةِ مِنْ جَوْفِ اللَّيْلِ، يَقُولُ: اللهُمَّ لَكَ الْحَمْدُ، أَنْتَ نُورُ السَّمَاوَاتِ وَالأَرْضِ، وَلَكَ الْحَمْدُ، أَنْتَ قَيَّامُ السَّمَاوَاتِ وَالأَرْضِ، وَلَكَ الْحَمْدُ، أَنْتَ رَبُّ السَّمَاوَاتِ وَالأَرْضِ وَمَنْ فِيهِنَّ، أَنْتَ الْحَقُّ، وَقَوْلُكَ الْحَقُّ، وَوَعْدُكَ الْحَقُّ، وَلِقَاؤُكَ حَقٌّ، وَالْجَنَّةُ حَقٌّ، وَالنَّارُ حَقٌّ، وَالسَّاعَةُ حَقٌّ، اللهُمَّ لَكَ أَسْلَمْتُ، وَبِكَ آمَنْتُ، وَعَلَيْكَ تَوَكَّلْتُ، وَإِلَيْكَ أَنَبْتُ، وَبِكَ خَاصَمْتُ، وَإِلَيْكَ حَاكَمْتُ، فَاغْفِرْ لِي مَا قَدَّمْتُ وَأَخَّرْتُ، وَأَسْرَرْتُ وَأَعْلَنْتُ، أَنْتَ إِلَهِي، لاَ إِلَهَ إِلاَّ أَنْتَ[1].

واتە: لە عەبدوڵڵای کوڕی عەبباسەوە ﷺ گێڕدراوەتەوە (گوتوویەتی): پێغەمبەری خوا ﷺ هەموو جار کاتێ شەو هەڵدەستا بۆ شەونوێژ دەیفەرموو: (اللهُمَّ لَكَ الْحَمْدُ، أَنْتَ نُورُ السَّمَاوَاتِ وَالأَرْضِ، وَلَكَ الْحَمْدُ، أَنْتَ قَيَّامُ السَّمَاوَاتِ وَالأَرْضِ، وَلَكَ الْحَمْدُ، أَنْتَ رَبُّ السَّمَاوَاتِ وَالأَرْضِ وَمَنْ فِيهِنَّ، أَنْتَ الْحَقُّ، وَقَوْلُكَ الْحَقُّ، وَوَعْدُكَ الْحَقُّ، وَلِقَاؤُكَ حَقٌّ، وَالْجَنَّةُ حَقٌّ، وَالنَّارُ حَقٌّ، وَالسَّاعَةُ حَقٌّ، اللهُمَّ لَكَ أَسْلَمْتُ، وَبِكَ آمَنْتُ، وَعَلَيْكَ تَوَكَّلْتُ، وَإِلَيْكَ أَنَبْتُ، وَبِكَ خَاصَمْتُ، وَإِلَيْكَ حَاكَمْتُ، فَاغْفِرْ لِي مَا قَدَّمْتُ وَأَخَّرْتُ، وَأَسْرَرْتُ وَأَعْلَنْتُ، أَنْتَ إِلَهِي، لاَ إِلَهَ إِلاَّ أَنْتَ) واتە: ((پەروەردگارا گشت حەمد و ستاییشێك هەر تەنها بۆ تۆیە، تۆ ڕووناکی ئاسمانەکان و زەوی، وە گشت ستاییشێك هەر تەنها بۆ تۆیە، تۆ

---

والقابسي: ١١٠، كلهم عن مالك به.

(١) ـ صحيح. أخرجه أبو مصعب الزهري: ٦٢٣؛ والحدثاني: ٢٠٣؛ وابن حنبل: ٢٧١٠، وفي: ٢٨١٣؛ ومسلم: ١٩٩؛ وأبو داود: ٧٧١؛ والترمذي: ٣٤١٨؛ وابن حبان: ٢٥٩٨؛ ومصنف ابن أبي شيبة: ٢٩٣٢٦؛ والقابسي: ١١١، كلهم عن مالك به.

پارێزەر و بەڕێوەبەری ئاسمانەکان و زەوی بەوپەڕی تۆکمەیی، وە گشت ستاییشێك هەر تەنها بۆ تۆیە، تۆ پەروەردگاری ئاسمانەکان و زەوی و ئەوەی تیاشیاندایە، تۆ حەقیت و وتەت حەقە و بەڵێنت حەقە و لیقا و پێگەیشتنت حەقە و بەهەشت حەقە و دۆزەخ حەقە و ڕۆژی دوایی حەقە، پەروەردگارا خۆم تەنها تەسلیمی تۆ کرد، وە تەنها بڕوام بە تۆ هێنا، وە تەنها پشتم بە تۆ بەست، وە (بەتەوبەکردن) تەنها بۆ لای تۆ گەڕامەوە، وە تەنها بە (بەڵگەی شەریعەتی) تۆ ململانێم کردووە (لەگەڵ بێبڕوایان)، وە تەنها حوکمم بۆ لای تۆ گێڕاوەتەوە، دەسا (لەبەر خاتری ئەو هەموو شتە مەزنانە) لێم خۆش بە، لەوەی پێشتر کردوومە و لەوەی دواتر دەیکەم، وە لەوەی بەپەنهان کردوومە و لەوەی بە ئاشکرا کردوومە، هەر تەنها تۆ پەروەردگاری منی، هیچ پەرستراوێکی بەحەق نییە جگە لە تۆ)).

**٥٧٥-** عَنْ عَبْدِ اللهِ بْنِ عَبْدِ اللهِ بْنِ جَابِرِ بْنِ عَتِيكٍ ﷺ، أَنَّهُ قَالَ: جَاءَنَا عَبْدُ اللهِ بْنُ عُمَرَ ﷺ فِي بَنِي مُعَاوِيَةَ، وَهِيَ قَرْيَةٌ مِنْ قُرَى الأَنْصَارِ، فَقَالَ لِي: هَلْ تَدْرُونَ أَيْنَ صَلَّى رَسُولُ اللهِ ﷺ مِنْ مَسْجِدِكُمْ هَذَا؟ فَقُلْتُ لَهُ: نَعَمْ، وَأَشَرْتُ لَهُ إِلَى نَاحِيَةٍ مِنْهُ، فَقَالَ لِي: هَلْ تَدْرِي مَا الثَّلاَثُ الَّتِي دَعَا بِهِنَّ فِيهِ؟ فَقُلْتُ: نَعَمْ، قَالَ: فَأَخْبِرْنِي بِهِنَّ، قَالَ: فَقُلْتُ: دَعَا بِأَنْ لاَ يُظْهِرَ عَلَيْهِمْ عَدُوًّا مِنْ غَيْرِهِمْ، وَلاَ يُهْلِكَهُمْ بِالسِّنِينَ، فَأُعْطِيَهُمَا، وَدَعَا بِأَنْ لاَ يَجْعَلَ بَأْسَهُمْ بَيْنَهُمْ، فَمُنِعَهَا، قَالَ: صَدَقْتَ.

قَالَ ابْنُ عُمَرَ ﷺ: فَلَنْ يَزَالَ الْهَرْجُ إِلَى يَوْمِ الْقِيَامَةِ[1].

واتە: لە عەبدوڵڵای کوڕی عەبدوڵڵای کوڕی جابری کوڕی عەتیکەوە ﷺ گێڕدراوەتەوە گوتوویەتی: عەبدوڵڵای کوڕی عومەر ﷺ هات بۆ لامان لە بەنو موعاویە، کە گوندێکە لە گوندەکانی ئەنصارەکان، جا پێی گوتم: ئایا دەزانن پێغەمبەری خوا ﷺ لە کوێی ئەم مزگەوتەتان نوێژی کرد؟ منیش پێم گوت: بەڵێ، وە ئاماژەم کرد بۆ لایێکی مزگەوتەکە، جا پێی گوتم: سێ دوعایەکە دەزانی کە تیایدا کردی؟ منیش گوتم: بەڵێ، گوتی: باسیان بکە بۆم، منیش گوتم: دوعای کرد بەوەی

---

(١) ـ صحيح. أخرجه أبو مصعب الزهري: ٦٢٤؛ والحدثاني: ٢٠٤؛ وابن حنبل: ٢٣٨٠٠؛ والقابسي: ٣٠٠، **كلهم** عن مالك به.



دوژمنیان بەسەردا زاڵ نەكات بەشێوەك بەتێكڕا قەڵاچۆیان بكەن، وە بەوەی لەناویان نەبات بەقاتوقڕی و وشكەساڵی، جا هەردووكی پێ درا (ئەم دووەی بۆ گیرا كرا)، وە دوعای كرد بەوەی جیاوازی و كێشە و جەنگیان نەخاتە نێوان، جا ڕێگری لەم دوعایە كرا و گیرا نەكرا، (ئیبنو عومەر ـ خوا لێی ڕازی بێ ـ) گوتی: ڕاست دەكەیت.

ئیبنو عومەر ﷺ گوتوویەتی: جا بەردەوام تا دواڕۆژ شەڕ و كوشتار دەمێنێ (مرۆڤەكانی پێ تاقی دەكرێتەوە).

٥٧٦- عَنْ زَيْدِ بْنِ أَسْلَمَ ﷺ، أَنَّهُ كَانَ يَقُولُ: مَا مِنْ دَاعٍ يَدْعُو، إِلاَّ كَانَ بَيْنَ إِحْدَى ثَلاَثٍ: إِمَّا أَنْ يُسْتَجَابَ لَهُ، وَإِمَّا أَنْ يُدَّخَرَ لَهُ، وَإِمَّا أَنْ يُكَفَّرَ عَنْهُ[1].

واتە: لە زەیدی كوڕی ئەسلەمەوە ﷺ گێڕدراوەتەوە گوتوویەتی: هەر نزاكارێك نزا بكات حەتمەن خۆی لەنێو یەكێك لەم سێ شتە دەبینێتەوە: یان بۆی گیرا دەبێت (چی داوا كردووە ڕێك ئەوە دێتە جێ)، یانیش بۆی دەكرێتە توێشووی دواڕۆژ، یانیش بەهۆیەوە تاوانی دەسڕێتەوە.

## ٩- كردار و شێوازی دوعا[2]

٥٧٧- عَنْ عَبْدِ اللهِ بْنِ دِينَارٍ ﷺ، أَنَّهُ قَالَ: رَآنِي عَبْدُ اللهِ بْنُ عُمَرَ ﷺ وَأَنَا أَدْعُو وَأُشِيرُ بِأُصْبُعَيْنِ، أُصْبُعٍ مِنْ كُلِّ يَدٍ، فَنَهَانِي[3].

واتە: لە عەبدوڵڵای كوڕی دینارەوە ﷺ گێڕدراوەتەوە گوتوویەتی: عەبدوڵڵای كوڕی عومەر ﷺ منی بینی لە كاتێكدا دوعام دەكرد و بە دوو پەنجە ئاماژەم دەكرد، هەر پەنجەی لە دەستێك، جا نەهی لێكردم (چونكە دوعا بە دوو پەنجە ناكرێ، یان دەبێ هەردوو دەست بەرز بكرێتەوە بەگشت پەنجەكانەوە، یان تەنها پەنجەی شایەتمان لە دەستی ڕاستە، كە تایبەتە بە دوعای وتاردان).

---

(١) ـ مقطوع صحيح. أخرجه أبو مصعب الزهري: ٦٢٥؛ والحدثاني: ٢٠٤أ، عن مالك به.

(٢) ـ الْعَمَلُ فِي الدُّعَاءِ.

(٣) ـ صحيح. أخرجه أبو مصعب الزهري: ٦٢٦؛ والحدثاني: ٢٠٥؛ والشيباني: ٩١٥، كلهم عن مالك به.

٥٧٨- أَنَّ سَعِيدَ بْنَ الْمُسَيَّبِ ﷺ كَانَ يَقُولُ: إِنَّ الرَّجُلَ لَيُرْفَعُ بِدُعَاءِ وَلَدِهِ مِنْ بَعْدِهِ؛ وَقَالَ بِيَدَيْهِ نَحْوَ السَّمَاءِ، فَرَفَعَهُمَا[١].

واتە: سەعیدی کوڕی موسەیەب ﷺ دەیگوت: بەدڵنیایی مرۆڤی مسوڵمان لەدوای مردنی بەهۆی دوعا و نزای مناڵەکەیەوە پلەی بەرز دەبێتەوە، جا بە دەستەکانی ئاماژەی بۆ ئاسمان دەکرد و بەرزی دەکردنەوە.

٥٧٩- عَنْ هِشَامِ بْنِ عُرْوَةَ ﷺ، عَنْ أَبِيهِ ﷺ، أَنَّهُ قَالَ: إِنَّمَا أُنْزِلَتْ هَذِهِ الآيَةُ: ﴿وَلَا تَجْهَرْ بِصَلَاتِكَ وَلَا تُخَافِتْ بِهَا وَابْتَغِ بَيْنَ ذَٰلِكَ سَبِيلًا ﴿١١٠﴾﴾ الإسراء، فِي الدُّعَاءِ[٢].

قَالَ يَحْيَى ﷺ: وَسُئِلَ مَالِكٌ ﷺ عَنِ الدُّعَاءِ فِي الصَّلَاةِ الْمَكْتُوبَةِ؟ فَقَالَ: لَا بَأْسَ بِالدُّعَاءِ فِيهَا[٣].

واتە: لە هیشامی کوڕی عورووەوە ﷺ گێردراوەتەوە، ئەویش لە باوکیەوە ﷺ گێراویەتەوە بەوەی گوتوویەتی: ئەم ئایەتە: ﴿وَلَا تَجْهَرْ بِصَلَاتِكَ وَلَا تُخَافِتْ بِهَا وَابْتَغِ بَيْنَ ذَٰلِكَ سَبِيلًا ﴿١١٠﴾﴾ الإسراء،لەسەر دوعا دابەزی (بەمەش مانای ئایەتەکە ئەو تەفسیرە وەردەگرێت: دوعاکانت بەدەنگ ئەنجام مەدە و مەشیشارەوە، بەڵکوو ڕێگەی نێوانیان بگرە بەر، با مامناوەندی بێت).

یەحیا ﷺ گوتوویەتی: ئیمامی مالیك ﷺ پرسیاری لێکرا دەربارەی دوعا لە نوێژی واجب (لەدوای ڕکوع و لە سوژدە و دوای تەحیات)؟ ئەویش گوتی: هیچ کێشەی تیا نییە دوعای تێدا بکرێت.

٥٨٠- عَنْ مَالِكٍ ﷺ؛ أَنَّهُ بَلَغَهُ، أَنَّ رَسُولَ اللهِ ﷺ كَانَ يَدْعُو فَيَقُولُ: اللهُمَّ إِنِّي أَسْأَلُكَ فِعْلَ الْخَيْرَاتِ، وَتَرْكَ الْمُنْكَرَاتِ، وَحُبَّ الْمَسَاكِينِ، وَإِذَا أَرَدْتَ فِي النَّاسِ فِتْنَةً، فَاقْبِضْنِي إِلَيْكَ غَيْرَ مَفْتُونٍ[٤].

---

(١) ـ مقطوع صحيح. أخرجه أبو مصعب الزهري: ٦٢٧؛ والحدثاني: ٢٠٥أ؛ والشيباني: ٩١٦، كلهم عن مالك به.

(٢) ـ صحيح. أخرجه أبو مصعب الزهري: ٦٢٨؛ والحدثاني: ٢٠٥ب، عن مالك به.

(٣) ـ أخرجه أبو مصعب الزهري: ٦٢٩؛ والحدثاني: ٢٠٥ج، عن مالك به.

(٤) ـ صحيح لغيره. أخرجه أبو مصعب الزهري: ٦٣٠؛ والحدثاني: ٢٠٥، عن مالك به.

واتە: لە ئیمامی مالیکەوە ﷺ گێڕدراوەتەوە بەوەی پێی گەیشتووە پێغەمبەری خوا ﷺ هەموو جار دوعای دەکرد و دەیفەرموو: (اللهُمَّ إِنِّي أَسْأَلُكَ فِعْلَ الْخَيْرَاتِ، وَتَرْكَ الْمُنْكَرَاتِ، وَحُبَّ الْمَسَاكِينِ، وَإِذَا أَرَدْتَ فِي النَّاسِ فِتْنَةً، فَاقْبِضْنِي إِلَيْكَ غَيْرَ مَفْتُونٍ) واتە: ((پەروەردگارا داوات لێ دەکەم ـ تەوفیقم بدەیت ـ بۆ ئەنجامدانی کردەوەی چاك و دوورکەوتنەوە لە کردەوەی خراپ و خۆشویستنی هەژاران، وە ئەگەر ویستت تاقیکردنەوەیەکی سەخت بخەیتە ناو خەڵکی ئەوە من بگەڕێنەوە بۆ لای خۆت بەبێ تاقیکردنەوە و تێوەگلان لە تاقیکردنەوەکە)).

**٥٨١-** عَنْ مَالِكٍ ﷺ؛ أَنَّهُ بَلَغَهُ، أَنَّ رَسُولَ اللهِ ﷺ قَالَ: مَا مِنْ دَاعٍ يَدْعُو إِلَى هُدًى، إِلاَّ كَانَ لَهُ مِثْلُ أَجْرِ مَنِ اتَّبَعَهُ، لاَ يَنْقُصُ ذَلِكَ مِنْ أُجُورِهِمْ شَيْئًا، وَمَا مِنْ دَاعٍ يَدْعُو إِلَى ضَلاَلَةٍ، إِلاَّ كَانَ عَلَيْهِ مِثْلُ أَوْزَارِهِمْ، لاَ يَنْقُصُ ذَلِكَ مِنْ أَوْزَارِهِمْ شَيْئًا[١].

واتە: لە ئیمامی مالیکەوە ﷺ گێڕدراوەتەوە پێی گەیشتووە پێغەمبەری خوا ﷺ فەرموویەتی: هیچ بانگخوازێك نییە بانگەواز بکات بۆ ڕێنموویی حەتمەن هەمان پاداشتی ئەو کەسانەی بۆ هەیە کە شوێنی دەکەون، ئەوەش هیچ لە پاداشتی ئەوان کەم ناکاتەوە، وە هیچ بانگخوازێك نییە بانگەواز بکات بۆ گومڕایی حەتمەن هەمان تاوانی ئەوانەی لەسەر شانە کە شوێنی دەکەون، ئەوەش هیچ لە تاوانی ئەوان کەم ناکاتەوە.

**٥٨٢-** أَنَّ عَبْدَ اللهِ بْنَ عُمَرَ ﷺ قَالَ: اللهُمَّ اجْعَلْنِي مِنْ أَئِمَّةِ الْمُتَّقِينَ[٢].

واتە: عەبدوڵلای کوڕی عومەر ﷺ گوتوویەتی: پەروەردگارا بمکەیت بە ڕێبەرێك و زانایێك بۆ کەسانی لەخواترس.

**٥٨٣-** أَنَّ أَبَا الدَّرْدَاءِ ﷺ كَانَ يَقُومُ مِنْ جَوْفِ اللَّيْلِ، فَيَقُولُ: نَامَتِ الْعُيُونُ، وَغَارَتِ النُّجُومُ، وَأَنْتَ الْحَيُّ الْقَيُّومُ[٣].

---

(١) ـ صحيح لغيره. أخرجه أبو مصعب الزهري: ٦٣١؛ والحدثاني: ٢٠٦، عن مالك به.

(٢) ـ ضعيف. أخرجه أبو مصعب الزهري: ٦٣٢؛ والحدثاني: ٢٠٦أ، عن مالك به.

(٣) ـ ضعيف. أخرجه أبو مصعب الزهري: ٦٣٣؛ والحدثاني: ٢٠٦ب، عن مالك به.




واتە: ئەبو دەرداء ﷺ هەموو جار لە قوڵایی شەو هەڵدەستا و دەیگوت: (نَامَتِ الْعُيُونُ، وَغَارَتِ النُّجُومُ، وَأَنْتَ الْحَيُّ الْقَيُّومُ) واتە: ((چاوەکان خەوتوون و ئەستێرەکان ون بوون، تۆش (پەروەردگارا) بەبەردەوامی زیندوو و ڕاگر و پارێزەری بوونەوەری)). (واتە هەموو شتێك گۆڕانی بەسەردا دێت تەنها زاتی پاکی تۆ نەبێت).

## ١٠- نەهیکردن لە نوێژ دوای نوێژی بەیانی و دوای نوێژی عەسر[١]

٥٨٤- عَنْ عَبْدِ اللهِ الصُّنَابِحِيِّ ﷺ، أَنَّ رَسُولَ اللهِ ﷺ قَالَ: إِنَّ الشَّمْسَ تَطْلُعُ وَمَعَهَا قَرْنُ الشَّيْطَانِ، فَإِذَا ارْتَفَعَتْ فَارَقَهَا، ثُمَّ إِذَا اسْتَوَتْ قَارَنَهَا، فَإِذَا زَالَتْ فَارَقَهَا، فَإِذَا دَنَتْ لِلْغُرُوبِ قَارَنَهَا، فَإِذَا غَرَبَتْ فَارَقَهَا، وَنَهَى رَسُولُ اللهِ ﷺ عَنِ الصَّلَاةِ فِي تِلْكَ السَّاعَاتِ[٢].

واتە: لە عەبدوڵڵای صونابیحییەوە ﷺ گێڕدراوەتەوە (گوتوویەتی): پێغەمبەری خوا ﷺ فەرموویەتی: خۆرهەڵدێ لە کاتێکدا قۆچی شەیتانی لەگەڵە، جا کاتێ خۆر بەرزدەبێتەوە لە قۆچەکانی شەیتان جیادەبێتەوە، دواتر کاتێ خۆر ڕێك کەوتە ناوەڕاستی ئاسمان یەك دەگرێتەوە لەگەڵ قۆچەکانی شەیتان، جا کاتێ لادەدات لێی جیادەبێتەوە، وە کاتێ نزیك دەبێتەوە لە ئاوابوون یەك دەگرێتەوە لەگەڵی، جا کاتێ بەتەواوی ئاوا دەبێت لێی جیادەبێتەوە، جا پێغەمبەری خوا ﷺ حەڕامی کردووە لەو کاتانەدا نوێژ بکرێ[٣].

٥٨٥- عَنْ هِشَامِ بْنِ عُرْوَةَ ﷺ، عَنْ أَبِيهِ ﷺ، أَنَّهُ قَالَ: كَانَ رَسُولُ اللهِ ﷺ يَقُولُ: إِذَا بَدَا حَاجِبُ الشَّمْسِ، فَأَخِّرُوا الصَّلَاةَ حَتَّى تَبْرُزَ، وَإِذَا غَابَ حَاجِبُ الشَّمْسِ، فَأَخِّرُوا الصَّلَاةَ حَتَّى تَغِيبَ[٤].

---

(١) ـ النَّهْيُ عَنِ الصَّلَاةِ بَعْدَ الصُّبْحِ وَبَعْدَ الْعَصْرِ.

(٢) ـ ضعيف. أخرجه أبو مصعب الزهري: ٣١؛ والحدثاني: ١٨؛ والشيباني: ١٨١؛ والشافعي: ٨٠٧؛ والنسائي: ٥٥٩؛ وأبي يعلى الموصلي: ١٤٥١، كلهم عن مالك به.

(٣) ـ تێبینی: لەلای ئیمامی مالیك نابێ لەو کاتانە هیچ سوننەتێك بکرێ جگە لە نوێژی فەرز، بەڵام لەلای ئیمامی شافیعی نوێژی فەرزو ئەو سوننەتانەش دروستن کە هۆکاریان هەیە وەك چوونە ناو مزگەوت و سوننەتی دەستنوێژ و ... هتد، لەوانەی هۆکاریان هەیە، بەڵام سوننەتی موتڵەق دروست نییە.

(٤) ـ صحيح. أخرجه أبو مصعب الزهري: ٣٢؛ والحدثاني: ١٨أ، كلهم عن مالك به.





واتە: لە هیشامی کوڕی عورووەوە ﷀ گێردراوەتەوە، ئەویش لە باوکیەوە ﷀ گێڕاویەتەوە گوتوویەتی: پێغەمبەری خوا ﷺ دەیفەرموو: ئەگەر بازنەی خۆر دەرکەوت، ئەوە نوێژ دوا بخەن تا بەتەواوی دەردەکەوێ، وە کاتێ ژێرەوەی بازنەی خۆر ئاوا بوو، ئەوە نوێژ دوا بخەن تا بەتەواوی ئاوا دەبێت.

**٥٨٦- عَنِ الْعَلاَءِ بْنِ عَبْدِ الرَّحْمَنِ ﷀ، قَالَ: دَخَلْنَا عَلَى أَنَسِ بْنِ مَالِكٍ ﷺ بَعْدَ الظُّهْرِ، فَقَامَ يُصَلِّي الْعَصْرَ، فَلَمَّا فَرَغَ مِنْ صَلاَتِهِ، ذَكَرْنَا تَعْجِيلَ الصَّلاَةِ، أَوْ ذَكَرَهَا، ثُمَّ قَالَ: سَمِعْتُ رَسُولَ اللهِ ﷺ يَقُولُ: تِلْكَ صَلاَةُ الْمُنَافِقِينَ، تِلْكَ صَلاَةُ الْمُنَافِقِينَ، تِلْكَ صَلاَةُ الْمُنَافِقِينَ، يَجْلِسُ أَحَدُهُمْ، حَتَّى إِذَا اصْفَرَّتِ الشَّمْسُ، وَكَانَتْ بَيْنَ قَرْنَيِ الشَّيْطَانِ، أَوْ عَلَى قَرْنِ الشَّيْطَانِ، قَامَ فَنَقَرَ أَرْبَعًا، لاَ يَذْكُرُ اللهَ فِيهَا إِلاَّ قَلِيلاً**[1].

واتە: لە عەلائی کوڕی عەبدوڕڕەحمانەوە ﷀ گێردراوەتەوە گوتوویەتی: چووینە ژوورەوە بۆ لای ئەنەسی کوڕی مالیك ﷺ دوای کردنی نوێژی نیوەڕۆ، جا (کە کاتی عەسر هات زوو) هەڵسا نوێژی عەسری کرد، جا کاتێ لە نوێژەکەی تەواو بوو باسی پەلەکردنمان کرد لە ئەنجامدانی نوێژەکە لە کاتی خۆی ـ یان ئەو خۆی باسی کرد ـ دواتر گوتی: گوێم لە پێغەمبەری خوا ﷺ بوو (باسی دواخستنی نوێژی عەسری کرد) فەرمووی: ئەوە نوێژی دووڕووەکانە، ئەوە نوێژی دووڕووەکانە، ئەوە نوێژی دووڕووەکانە، یەکێك لە ئێوە دادەنیشێت تاوەکوو خۆر زەرد و لێڵ دەبێت و دەکەوێتە نێوان دوو قۆچەکانی شەیتان ـ یان سەر قۆچی شەیتان ـ، ئینجا هەڵدەستێت و چوار ڕکات بەپەلە دەکات وەك دەنوکدانی پەلەوەر لە زەوی، زیکر و یادی خوای تێدا ناکات تەنها کەمێك نەبێت.

**٥٨٧- عَنْ عَبْدِ اللهِ بْنِ عُمَرَ ﷺ؛ أَنَّ رَسُولَ اللهِ ﷺ قَالَ: لاَ يَتَحَرَّ أَحَدُكُمْ فَيُصَلِّيَ عِنْدَ طُلُوعِ الشَّمْسِ، وَلاَ عِنْدَ غُرُوبِهَا**[2].

---

(١) ـ صحيح. أخرجه أبو مصعب الزهري: ٣٣؛ والحدثاني: ١٩؛ وابن حنبل: ١٢٥٣١، وفي: ١٢٩٥٢؛ وأبو داود: ٤١٣؛ وابن حبان: ٢٦١؛ والقابسي: ١٣٢، كلهم عن مالك به.

(٢) ـ صحيح. أخرجه أبو مصعب الزهري: ٣٤؛ والحدثاني: ١٩أ؛ والشيباني: ١٨٠؛ والشافعي: ٨٠٦؛ وابن حنبل: ٤٨٨٥، وفي: ٥٣٠١؛ والبخاري: ٥٨٥؛ ومسلم: ٢٨٩؛ والنسائي: ٥٦٣؛ وابن حبان: ١٥٤٨، وفي: ١٥٦٦؛ والقابسي: ١٩٦، كلهم عن مالك به.

واتە: لە عەبدوڵڵای کوڕی عومەرەوە ﷺ گێڕدراوەتەوە (گوتوویەتی): پێغەمبەری خوا ﷺ فەرموویەتی: با هیچ کەسێك لە ئێوە بەئەنقەست لە کاتی خۆرهەڵات و لە کاتی خۆرئاوابووندا نوێژ نەکات.

٥٨٨- عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ ﷺ، أَنَّ رَسُولَ اللهِ ﷺ نَهَى عَنِ الصَّلاَةِ بَعْدَ الْعَصْرِ حَتَّى تَغْرُبَ الشَّمْسُ، وَعَنِ الصَّلاَةِ بَعْدَ الصُّبْحِ حَتَّى تَطْلُعَ الشَّمْسُ[١].

واتە: لە ئەبو هوڕەیڕەوە ﷺ گێڕدراوەتەوە (گوتوویەتی): پێغەمبەری خوا ﷺ نەهی کردووە لە نوێژ دوای نوێژی عەسر تاوەکوو خۆر بەتەواوی ئاوا دەبێ، وە نەهی کردووە لە نوێژ دوای نوێژی بەیانی تاوەکوو خۆر بەتەواوی هەڵدێ.

٥٨٩- عَنْ عَبْدِ اللهِ بْنِ عُمَرَ ﷺ أَنَّ عُمَرَ بْنَ الْخَطَّابِ ﷺ كَانَ يَقُولُ: لاَ تَحَرَّوْا بِصَلاَتِكُمْ طُلُوعَ الشَّمْسِ، وَلاَ غُرُوبَهَا، فَإِنَّ الشَّيْطَانَ يَطْلُعُ قَرْنَاهُ مَعَ طُلُوعِ الشَّمْسِ، وَيَغْرُبَانِ مَعَ غُرُوبِهَا، وَكَانَ يَضْرِبُ النَّاسَ عَلَى تِلْكَ الصَّلاَةِ[٢].

واتە: لە عەبدوڵڵای کوڕی عومەرەوە ﷺ گێڕدراوەتەوە (گوتوویەتی): عومەری کوڕی خەتتاب ﷺ هەموو جار دەیگوت: بەئەنقەست نوێژتان مەخەنە کاتی خۆرهەڵاتن، وە مەیخەنە کاتی خۆرئاوابوون، چونکە شەیتان دوو قۆچەکانی دەردەخات لە کاتی خۆرهەڵات و ون دەبن لەگەڵ ئاوابوونی خۆر، جا (ئیمامی عومەر ـ خوا لێی ڕازی بێ ـ) لە خەڵکی دەدا لەسەر نوێژ لەم دوو کاتەدا.

٥٩٠- عَنِ السَّائِبِ بْنِ يَزِيدَ ﷺ، أَنَّهُ رَأَى عُمَرَ بْنَ الْخَطَّابِ يَضْرِبُ الْمُنْكَدِرَ فِي الصَّلاَةِ بَعْدَ الْعَصْرِ[٣].

واتە: لە سائیبی کوڕی یەزیدەوە ﷺ گێڕدراوەتەوە بەوەی عومەری کوڕی خەتتابی ﷺ بینیوە لە مونکەدیری دەدا لەسەر نوێژی دوای عەسر.

---

(١) ـ صحيح. أخرجه أبو مصعب الزهري: ٣٥؛ والحدثاني: ٢٠؛ والشافعي: ٨٠٥؛ وابن حنبل: ٩٩٥٤؛ ومسلم: ٢٨٥؛ والنسائي: ٥٦١؛ وابن حبان: ١٥٤٣، وفي: ١٥٤٤؛ والقابسي: ٩٦، كلهم عن مالك به.

(٢) ـ صحيح. أخرجه أبو مصعب الزهري: ٣٦؛ والحدثاني: ٢٠أ؛ والشيباني: ١٨٢، كلهم عن مالك به.

(٣) ـ صحيح. أخرجه أبو مصعب الزهري: ٣٧؛ والحدثاني: ٢٠ب؛ والشيباني: ٢٢١، كلهم عن مالك به.

## ١- ئەوەی هاتووە دەربارەی شۆردنی مردوو[١]

**٥٩١-** عَنْ جَعْفَرِ بْنِ مُحَمَّدٍ ﷺ، عَنْ أَبِيهِ ﷺ، أَنَّ رَسُولَ اللهِ ﷺ غُسِّلَ فِي قَمِيصٍ[٢].

واتە: لە جەعفەری کوڕی موحەممەدەوە ﷺ گێڕدراوەتەوە، ئەویش لە باوکیەوە ﷺ گێڕاویەتەوە (گوتوویەتی): پێغەمبەری خوا ﷺ بە پۆشاکەوە شۆر درا.

**٥٩٢-** عَنْ أُمِّ عَطِيَّةَ الأَنْصَارِيَّةِ ﷺ أَنَّهَا قَالَتْ: دَخَلَ عَلَيْنَا رَسُولُ اللهِ ﷺ حِينَ تُوُفِّيَتِ ابْنَتُهُ، فَقَالَ: اغْسِلْنَهَا ثَلاَثًا، أَوْ خَمْسًا، أَوْ أَكْثَرَ مِنْ ذَلِكَ، بِمَاءٍ وَسِدْرٍ، وَاجْعَلْنَ فِي الآخِرَةِ كَافُورًا، أَوْ شَيْئًا مِنْ كَافُورٍ، فَإِذَا فَرَغْتُنَّ، فَآذِنَّنِي، قَالَتْ: فَلَمَّا فَرَغْنَا، آذَنَّاهُ، فَأَعْطَانَا حِقْوَهُ، فَقَالَ: أَشْعِرْنَهَا إِيَّاهُ، تَعْنِي بِحِقْوِهِ، إِزَارَهُ[٣].

واتە: لە ئوممو عەتییەی ئەنصارییەوە ﷺ گێڕدراوەتەوە گوتوویەتی: پێغەمبەری خوا ﷺ هاتە ژوورەوە بۆ لامان کاتێ (زەینەبی) کچی وەفاتی کردبوو، جا فەرمووی: سێ جار یان پێنج جار یان زیاتر بیشۆرن، بە ئاو و سیدر (کە گیایێك بوو لە جێگای سابون بەکار دەهات)، وە لە جاری کۆتاییدا کافوری تێ بکەن یان شتێك لە کافور (کە جۆرە ماددەیەکی بۆنخۆشە لەناو قەدی جۆرە دارێکی صینی هەیە)، جا کاتێ تەواوبوون بانگم بکەن، دەڵێ: جا کاتێ لێ بووینەوە بانگمان کرد، ئەویش بێجامەکەی خۆی پێ داین و فەرمووی: لەبنەوە لەبەری بکەن.

**٥٩٣-** عَنْ عَبْدِ اللهِ بْنِ أَبِي بَكْرٍ ﷺ، أَنَّ أَسْمَاءَ بِنْتَ عُمَيْسٍ امْرَأَةَ أَبِي بَكْرٍ الصِّدِّيقِ ﷺ، غَسَّلَتْ أَبَا بَكْرٍ الصِّدِّيقَ حِينَ تُوُفِّيَ، ثُمَّ خَرَجَتْ، فَسَأَلَتْ مَنْ حَضَرَهَا مِنَ الْمُهَاجِرِينَ، فَقَالَتْ: إِنِّي صَائِمَةٌ، وَإِنَّ هَذَا يَوْمٌ شَدِيدُ الْبَرْدِ، فَهَلْ عَلَيَّ مِنْ غُسْلٍ؟ فَقَالُوا: لاَ[٤].

---

(١) ـ مَا جَاءَ فِي غُسْلِ الْمَيِّتِ.

(٢) ـ صحيح لغيره.

(٣) ـ صحيح. أخرجه أبو مصعب الزهري: ١٠٠٥؛ والحدثاني: ٣٩٣؛ والشافعي: ١٦٢٥؛ والبخاري: ١٢٥٣؛ والنسائي: ١٨٨١؛ وأبو داود: ٣١٤٢؛ والقابسي: ١٢٩، كلهم عن مالك به.

(٤) ـ ضعيف. أخرجه أبو مصعب الزهري: ١٠٠٦؛ والحدثاني: ٣٩٣أ؛ والشيباني: ٣٠٤، كلهم عن مالك به.

واتە: لە عەبدوڵڵای کوڕی ئەبو بەکرەوە ﷺ گێڕدراوەتەوە (گوتوویەتی): ئەسمائی کچی عومەیسی خێزانی ئەبو بەکری صدیق ﷺ ئەبو بەکری شۆرد کاتێ وەفاتی کرد، دواتر دەرچوو و ئافرەتێکی ئەنصاری لەوێ لەگەڵی ئامادە بوو و پرسیاری لێکرد (ئایا خۆت ناشۆری، چونکە مردووت شۆردووە)؟ ئەویش گوتی: من بەڕۆژووم، ئەمڕۆش زۆر ساردە، جا ئایا خۆشۆردنم لەسەرە؟ ئەوانیش گوتیان: نەخێر.

٥٩٤- **[فتوى]** عَنْ مَالِكٍ ﷺ: أَنَّهُ سَمِعَ أَهْلَ الْعِلْمِ يَقُولُونَ: إِذَا مَاتَتِ الْمَرْأَةُ، وَلَيْسَ مَعَهَا نِسَاءٌ يُغَسِّلْنَهَا، وَلاَ مِنْ ذَوِي الْمَحْرَمِ أَحَدٌ يَلِي ذَلِكَ مِنْهَا، وَلاَ زَوْجٌ يَلِي ذَلِكَ مِنْهَا، يُمِّمَتْ، فَيُمْسَحُ بِوَجْهِهَا وَكَفَّيْهَا مِنَ الصَّعِيدِ[1].

قَالَ مَالِكٌ ﷺ: وَإِذَا هَلَكَ الرَّجُلُ، وَلَيْسَ مَعَهُ أَحَدٌ، إِلاَّ نِسَاءٌ، يَمَّمْنَهُ أَيْضًا[2].

(فتوا) واتە: لە ئیمامی مالیکەوە ﷺ گێڕدراوەتەوە بەوەی گوێی لە زانایان بووە دەیانگوت: ئەگەر ئافرەت مرد و هیچ ئافرەتێك نەبوو بیشۆرێ، وە هیچ لە پیاوە مەحرەمەکانی نەبوون تا شۆردنەکەی لە ئەستۆ بگرن، وە مێردیشی نەبوو شۆردنەکە لە ئەستۆ بگرێ، ئەوە تەیمومی بۆ دەکرێت (بەم شێوەیە): ڕوخسار و دوو دەستەکانی بە خۆڵ مەسح دەکرێ.

ئیمامی مالیك ﷺ گوتوویەتی: ئەگەر پیاویش مرد و کەسی لەگەڵ نەبوو جگە لە ئافرەتی نامەحرەم، ئەوە بۆ ئەویش تەیموم دەکەن (بەڵام تا ئانیشکەکانی بە خۆڵ مەسح دەکەن، وەك ئافرەتەکە تەنها دەستەکانی مەسح ناکەن).

٥٩٥- **[فتوى]** قَالَ مَالِكٌ ﷺ: وَلَيْسَ لِغُسْلِ الْمَيِّتِ عِنْدَنَا شَيْءٌ مَوْصُوفٌ، وَلَيْسَ لِذَلِكَ صِفَةٌ مَعْلُومَةٌ، وَلَكِنْ يُغَسَّلُ فَيُطَهَّرُ[3].

(فتوا) واتە: ئیمامی مالیك ﷺ گوتوویەتی: لەلای ئێمە هیچ شتێکی باسکراو نییە بۆ شۆردنی مردوو، وە هیچ شێوازێکی دیاریکراو نییە، بەڵکوو دەشۆردرێ و پاك دەکرێتەوە (هەر ئەوەندە).

---

(١) ـ أخرجه أبو مصعب الزهري: ١٠٠٧؛ والحدثاني: ٣٩٣ج، عن مالك به.

(٢) ـ أخرجه أبو مصعب الزهري: ١٠٠٨، عن مالك به.

(٣) ـ أخرجه أبو مصعب الزهري: ١٠٠٩، عن مالك به.

## ٢- ئەوەی هاتووە دەربارەی كفنكردنی مردوو[١]

**٥٩٦-** عَنْ عَائِشَةَ ﵂، زَوْجِ النَّبِيِّ ﷺ، أَنَّ رَسُولَ اللهِ ﷺ كُفِّنَ فِي ثَلاَثَةِ أَثْوَابٍ بِيضٍ سُحُولِيَّةٍ، لَيْسَ فِيهَا قَمِيصٌ وَلاَ عِمَامَةٌ[٢].

واتە: لە عائیشەی ﵂ خێزانی پێغەمبەرەوە ﷺ گێردراوەتەوە (گوتوویەتی): پێغەمبەری خوا ﷺ لە سێ پارچە قوماشی سپی سوحولیدا كفن كرا (كە قوماشێكی یەمەنییە)، نە قەمیس و نە مێزەری تیا نەبوو.

**٥٩٧-** عَنْ يَحْيَى بْنِ سَعِيدٍ ﵀، أَنَّ رَسُولَ اللهِ ﷺ كُفِّنَ فِي ثَلاَثَةِ أَثْوَابٍ بِيضٍ سُحُولِيَّةٍ[٣].

واتە: لە یەحیای كوڕی سەعیدەوە ﵀ گێردراوەتەوە (گوتوویەتی): پێغەمبەری خوا ﷺ لە سێ پارچە جلی سپی سوحولیدا كفن كرا.

**٥٩٨-** عَنْ يَحْيَى بْنِ سَعِيدٍ ﵀، أَنَّهُ قَالَ: بَلَغَنِي أَنَّ أَبَا بَكْرٍ الصِّدِّيقَ ﵁ قَالَ لِعَائِشَةَ ﵂ وَهُوَ مَرِيضٌ: فِي كَمْ كُفِّنَ رَسُولُ اللهِ ﷺ؟ فَقَالَتْ: فِي ثَلاَثَةِ أَثْوَابٍ بِيضٍ سُحُولِيَّةٍ، فَقَالَ أَبُو بَكْرٍ ﵁: خُذُوا هَذَا الثَّوْبَ، لِثَوْبٍ عَلَيْهِ، قَدْ أَصَابَهُ مِشْقٌ أَوْ زَعْفَرَانٌ، فَاغْسِلُوهُ، ثُمَّ كَفِّنُونِي فِيهِ، مَعَ ثَوْبَيْنِ آخَرَيْنِ، فَقَالَتْ عَائِشَةُ: وَمَا هَذَا؟ فَقَالَ أَبُو بَكْرٍ: الْحَيُّ أَحْوَجُ إِلَى الْجَدِيدِ مِنَ الْمَيِّتِ، وَإِنَّمَا هَذَا لِلْمُهْلَةِ[٤].

واتە: لە یەحیای كوڕی سەعیدەوە ﵀ گێردراوەتەوە گوتوویەتی: پێم گەیشتووە ئەبو بەكر ﵁ لە كاتێكدا نەخۆش بووە بە عائیشەی ﵂ گوتووە: پێغەمبەری خوا ﷺ لە چەند پارچە قوماش كفن كرا؟ ئەویش گوتی: لە سێ پارچە جلی سپی سحولی، ئەبو بەكریش ﵁ گوتی: ها ئەم جلە بگرن، جلێك كە لەبەریدا بوو، كە (ڕەنگی) میشق یان زەعفەڕانی پێوە بوو، (گوتی): بیشۆرن، دواتر بەو جلە لەگەڵ

---

(١) ـ مَا جَاءَ فِي كَفَنِ الْمَيِّتِ.

(٢) ـ صحيح. أخرجه أبو مصعب الزهري: ١٠١١؛ والشافعي: ١٦٢٩؛ والبخاري: ١٢٧٣؛ والنسائي: ١٨٩٨؛ وابن حبان: ٣٠٣٧، كلهم عن مالك به.

(٣) ـ أخرجه أبو مصعب الزهري: ١٠١٠؛ والقابسي: ٤٦٣، عن مالك به.

(٤) ـ صحيح لغيره. أخرجه أبو مصعب الزهري: ١٠١٠؛ وفي: ١٠١٢؛ والحدثاني: ٣٩٤أ، كلهم عن مالك به.

دوو پارچە جلی دیکە کفنم بکەن، جا عائیشە ﷺ گوتی: ئەوجە ئەوە چییە (زۆر کۆنە، چۆن دەبێ)؟ ئەبو بەکریش ﷺ گوتی: زیندوو لە مردوو پێویستترە بۆ جلی نوێ، ئەوە تەنها بۆ کێم و زوخاوە (واتە هەر بۆ کفنە کە مرۆڤ تیایدا دەڕزێت و دەتلێتەوە، نوێی بۆ چییە؟).

٥٩٩- عَنْ عَبْدِ اللهِ بْنِ عَمْرِو بْنِ الْعَاصِ ﷺ، أَنَّهُ قَالَ: الْمَيِّتُ يُقَمَّصُ، وَيُؤَزَّرُ، وَيُلَفُّ فِي الثَّوْبِ الثَّالِثِ، فَإِنْ لَمْ يَكُنْ إِلاَّ ثَوْبٌ وَاحِدٌ، كُفِّنَ فِيهِ[١].

واتە: لە عەبدوڵڵای کوڕی عەمری کوڕی عاصەوە ﷺ گێڕدراوەتەوە گوتوویەتی: مردوو (لە کفندا) پارچەیەکی وەکوو قەمیسی لەبەر دەکرێت و پارچەیەکی لەبەر خوارەوە دەکرێت و لە قوماشی سێیەمیشدا دەپێچرێ، جا ئەگەر لە یەك پارچە زیاتر نەبوو، ئەوە هەر بەو پارچە کفن دەکرێت (لێی دەئاڵێنرێ).

## ٣- ڕۆیشتن لە پێشەوەی تەرم[٢]

٦٠٠- عَنِ ابْنِ شِهَابٍ ﷺ، أَنَّ رَسُولَ اللهِ ﷺ، وَأَبَا بَكْرٍ، وَعُمَرَ كَانُوا يَمْشُونَ أَمَامَ الْجَنَازَةِ، وَالْخُلَفَاءُ هَلُمَّ جَرًّا، وَعَبْدُ اللهِ بْنُ عُمَرَ[٣].

واتە: لە ئیبنو شیهابەوە ﷺ گێڕدراوەتەوە (گوتوویەتی): پێغەمبەری خوا ﷺ و ئەبو بەکر و عومەر (خوا لێیان ڕازی بێ) لە پێشەوەی تەرمەوە ڕۆیشتوون، هەروەها خەلیفەکانی دیکەش و عەبدوڵڵای کوڕی عومەریش (خوا لێیان ڕازی بێ) هەر بەم شێوەیەیان کردووە (تا ئێستا).

٦٠١- عَنْ رَبِيعَةَ بْنِ عَبْدِ اللهِ بْنِ الْهُدَيْرِ ﷺ، أَنَّهُ رَأَى عُمَرَ بْنَ الْخَطَّابِ ﷺ يَقْدُمُ النَّاسَ أَمَامَ الْجَنَازَةِ، فِي جَنَازَةِ زَيْنَبَ بِنْتِ جَحْشٍ ﷺ[٤].

---

(١) ـ صحيح. أخرجه أبو مصعب الزهري: ١٠١٣؛ والحدثاني: ٣٩٤ب؛ والشيباني: ٣٠٥، كلهم عن مالك به.

(٢) ـ الْمَشْيُ أَمَامَ الْجَنَازَةِ.

(٣) ـ صحيح. أخرجه أبو مصعب الزهري: ١٠٢٤؛ والحدثاني: ٣٩٨أ؛ والشيباني: ٣٠٧، كلهم عن مالك به.

(٤) ـ صحيح. أخرجه أبو مصعب الزهري: ١٠٢٥؛ والحدثاني: ٣٩٨ب؛ والشيباني: ٣٠٨؛ والشافعي: ١٦٥٢، كلهم عن مالك به.




واتە: لە ڕەبیعەی کوڕی عەبدوڵڵای کوڕی هودەیرەوە ﷺ گێڕدراوەتەوە بەوەی عومەری کوڕی خەتتابی ﷺ بینیوە پێش خەڵکی کەوتبوو لە پێشەوەی جەنازە، لە (بە خاکسپاردنی) تەرمی زەینەبی کچی جەحش ﷺ.

٦٠٢- عَنْ هِشَامِ بْنِ عُرْوَةَ ﷺ أَنَّهُ قَالَ: مَا رَأَيْتُ أَبِي قَطُّ فِي جَنَازَةٍ إِلاَّ أَمَامَهَا، قَالَ: ثُمَّ يَأْتِي الْبَقِيعَ فَيَجْلِسُ حَتَّى يَمُرُّوا عَلَيْهِ[1].

واتە: لە هیشامی کوڕی عوڕوەوە ﷺ گێڕدراوەتەوە گوتوویەتی: باوکمم نەبینیوە لە جەنازەیەك بووبێت حەتمەن پێشی خەڵکی دەکەوت لە پێش جەنازە، گوتی: دواتر دەچوو بۆ بەقیع و دادەنیشت تاوەکوو خەڵکەکە بەلایدا دەڕۆیشتن.

٦٠٣- عَنِ ابْنِ شِهَابٍ ﷺ، أَنَّهُ قَالَ: الْمَشْيُ خَلْفَ الْجَنَازَةِ مِنْ خَطَإِ السُّنَّةِ[2].

واتە: لە ئیبنو شیهابەوە ﷺ گێڕدراوەتەوە گوتوویەتی: ڕۆیشتن لەدوای جەنازە لە نەپێکانی سوننەتە (چونکە سوننەت وایە لە پێشەوە بڕۆن نەك لە دواوە).

## ٤- نەهیکردن لە شوێنکەوتنی تەرم بەئاگرەوە[3]

٦٠٤- عَنْ أَسْمَاءَ بِنْتِ أَبِي بَكْرٍ ﷺ، أَنَّهَا قَالَتْ لأَهْلِهَا: أَجْمِرُوا ثِيَابِي إِذَا مِتُّ، ثُمَّ حَنِّطُونِي، وَلاَ تَذُرُّوا عَلَى كَفَنِي حِنَاطًا، وَلاَ تَتْبَعُونِي بِنَارٍ[4].

واتە: لە ئەسمائی کچی ئەبو بەکرەوە ﷺ گێڕدراوەتەوە بە خانەوادەکەی گوتووە: جلەکانم بە بۆنی خۆش دووکەڵمژ بکەن کە مردم، دواتر بۆنی خۆشیشم لێ بدەن، وە هیچ شوێنەوار و ڕەنگی گوڵاو مەهێڵنەوە بەسەر کفنەکەم، وە بە هەڵگرتنی ئاگرەوە شوێنی جەنازەکەم مەکەون (بۆ ئەوەی هیچ فەخامەت و گەورەیی پێوە دیار نەبێ، بەڵکوو با غەریبی پێوە دیار بێ).

---

(١) ـ صحيح. أخرجه أبو مصعب الزهري: ١٠٢٣؛ والحدثاني: ٣٩٨؛ والحدثاني: ٣٩٩، كلهم عن مالك به.

(٢) ـ مقطوع صحيح.

(٣) ـ النَّهْيُ أَنْ تُتْبَعَ الْجَنَازَةُ بِنَارٍ.

(٤) ـ صحيح. أخرجه أبو مصعب الزهري: ١٠١٤؛ والحدثاني: ٣٩٤ج، عن مالك به.




**٦٠٥**- عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ ﷺ، أَنَّهُ نَهَى أَنْ يُتْبَعَ بَعْدَ مَوْتِهِ بِنَارٍ.

قَالَ يَحْيَى ﷺ: سَمِعْتُ مَالِكًا ﷺ يَكْرَهُ ذَلِكَ(١).

واتە: لە ئەبو هورەیرەوە ﷺ گێردراوەتەوە نەهی کردووە لەوەی بە ئاگرەوە شوێن جەنازەکەی بکەون.

یەحیا ﷺ گوتوویەتی: گوێم لە ئیمامی مالیك ﷺ بوو ئەو کارەی پێ ناپەسەند بوو.

## ٥- «الله أکبر» کردن لە نوێژی مردوودا(٢)

**٦٠٦**- عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ ﷺ، أَنَّ رَسُولَ اللهِ ﷺ نَعَى النَّجَاشِيَّ لِلنَّاسِ فِي الْيَوْمِ الَّذِي مَاتَ فِيهِ، وَخَرَجَ بِهِمْ إِلَى الْمُصَلَّى، فَصَفَّ بِهِمْ وَكَبَّرَ أَرْبَعَ تَكْبِيرَاتٍ(٣).

واتە: لە ئەبو هورەیرەوە ﷺ گێردراوەتەوە (گوتوویەتی): پێغەمبەری خوا ﷺ (بە وەحی هەواڵی مردنی پێگەیشت و دواتر) هەواڵی مردنی نەجاشی بە خەڵکی ڕاگەیاند لەو ڕۆژەی تیایدا وەفاتی کرد، وە بردنیە دەرەوە بۆ شوێنی نوێژ و ڕیزی کردن و (لە نوێژەکەدا) چوار «الله أکبر»ی کرد.

**٦٠٧**- عَنْ أَبِي أُمَامَةَ بْنِ سَهْلِ بْنِ حُنَيْفٍ ﷺ، أَنَّ مِسْكِينَةً مَرِضَتْ، فَأُخْبِرَ رَسُولُ اللهِ ﷺ بِمَرَضِهَا، قَالَ: وَكَانَ رَسُولُ اللهِ ﷺ يَعُودُ الْمَسَاكِينَ، وَيَسْأَلُ عَنْهُمْ، فَقَالَ رَسُولُ اللهِ ﷺ: إِذَا مَاتَتْ فَآذِنُونِي بِهَا، فَخُرِجَ بِجَنَازَتِهَا لَيْلاً، فَكَرِهُوا أَنْ يُوقِظُوا رَسُولَ اللهِ ﷺ، فَلَمَّا أَصْبَحَ رَسُولُ اللهِ ﷺ، أُخْبِرَ بِالَّذِي كَانَ مِنْ شَأْنِهَا، فَقَالَ: أَلَمْ آمُرْكُمْ أَنْ تُؤْذِنُونِي بِهَا؟ فَقَالُوا: يَا رَسُولَ اللهِ،

---

(١) ـ صحيح. أخرجه أبو مصعب الزهري: ١٠١٥؛ والشيباني: ٣٠٩، عن مالك به.

(٢) ـ التَّكْبِيرُ عَلَى الْجَنَائِزِ.

(٣) ـ صحيح. أخرجه أبو مصعب الزهري: ٩٧٨؛ والحدثاني: ٤٠٢؛ والشيباني: ٣١٧؛ والشافعي: ١٠٥٣؛ وفي: ١٦٤٠، وفي: ١٧٩٥؛ وابن حنبل: ٩٦٤٤، وفي: ٩٦٦١؛ والبخاري: ١٢٤٥، وفي: ١٣٣٣؛ ومسلم: ٦٢؛ والنسائي: ١٩٧١، وفي: ١٩٨٠؛ وأبو داود: ٣٢٠٤؛ وابن حبان: ٣٠٦٨، وفي: ٣٠٩٨؛ والمنتقى لابن الجارود: ٥٤٢؛ وشرح معاني الآثار: ٢٨٤١؛ والقابسي: ١٤، كلهم عن مالك به.




كَرِهْنَا أَنْ نُخْرِجَكَ لَيْلاً، وَنُوقِظَكَ، فَخَرَجَ رَسُولُ اللهِ ﷺ، حَتَّى صَفَّ بِالنَّاسِ عَلَى قَبْرِهَا، وَكَبَّرَ أَرْبَعَ تَكْبِيرَاتٍ[1].

واتە: لە ئەبو ئومامەی کوڕی سەهلی کوڕی حونەیفەوە ﷺ گێڕدراوەتەوە (گوتوویەتی): ئافرەتێکی هەژار نەخۆش کەوت، ئەو هەواڵە درا بە پێغەمبەری خوا ﷺ، دەڵێ: جا پێغەمبەری خوا ﷺ (عادەتی وا بوو) سەردانی هەژارانی دەکرد و لە حاڵی دەپرسین، پێغەمبەری خوا ﷺ فەرمووی: ئەگەر وەفاتی کرد هەواڵم پێ بدەن، جا بەشەو (وەفاتی کرد و) تەرمەکەیان بردە دەرەوەو بەخاکیان سپارد و پێیان ناخۆش بوو پێغەمبەری خوا ﷺ لە خەو خەبەر بکەنەوە، جا کاتێ پێغەمبەری خوا ﷺ بەیانی کردەوە هەواڵی پێ درا بە حاڵی ئافرەتەکە، ئەویش فەرمووی: مەگەر فەرمانم پێ نەکردن هەواڵی مردنیم پێ ڕابگەیەنن (لە ساتی مردنیدا)؟ ئەوانیش گوتیان: ئەی پێغەمبەری خوا ﷺ پێمان ناخۆش بوو بەشەو بتهێنینە دەرەوە و لە خەو خەبەرت بکەینەوە، جا پێغەمبەری خوا ﷺ دەرچوو و خەڵکی ڕیز کرد لەسەر گۆڕی ئافرەتەکە و چوار جار «الله أکبر»ی کرد لە نوێژەکەدا.

**٦٠٨-** عَنْ مَالِكٍ ﷺ، أَنَّهُ سَأَلَ ابْنَ شِهَابٍ ﷺ عَنِ الرَّجُلِ يُدْرِكُ بَعْضَ التَّكْبِيرِ عَلَى الْجَنَازَةِ، وَيَفُوتُهُ بَعْضُهُ، فَقَالَ: يَقْضِي مَا فَاتَهُ مِنْ ذَلِكَ[2].

واتە: لە ئیمامی مالیکەوە ﷺ گێڕدراوەتەوە بەوەی پرسیاری لە ئیبنو شیهاب ﷺ کردووە دەربارەی کەسێك کە بە هەندێك لە «الله أکبر»ـەکان ڕادەگات لە نوێژی جەنازە و هەندێکی لێ دەفەوتێن (لەبەر ئەوەی تۆزێك درەنگ گەیشتووە)؟ ئەویش گوتی: ئەوەی لەدەستی چووە دەیگێڕێتەوە (واتە لەگەڵ ئیمام سەلام ناداتەوە تا چوار «الله أکبر»ـەکانی خۆی تەواو دەکات).

---

(١) ـ صحيح. أخرجه أبو مصعب الزهري: ٩٧٩؛ والحدثاني: ٤٠٢أ؛ والشيباني: ٣١٨؛ والشافعي: ١٦٤١؛ والنسائي: ١٩٠٧، كلهم عن مالك به.

(٢) ـ مقطوع صحيح. أخرجه أبو مصعب الزهري: ٩٨٠؛ والحدثاني: ٤٠٢ب، عن مالك به.

## ٦- کەسی نوێژخوێن لەسەر تەرم چی دەڵێت[١]

٦٠٩- عَنْ سَعِيدِ بْنِ أَبِي سَعِيدٍ الْمَقْبُرِيِّ ﷺ، عَنْ أَبِيهِ ﷺ، أَنَّهُ سَأَلَ أَبَا هُرَيْرَةَ ﷺ: كَيْفَ تُصَلِّي عَلَى الْجَنَازَةِ؟ فَقَالَ أَبُو هُرَيْرَةَ ﷺ: أَنَا، لَعَمْرُ اللهِ أُخْبِرُكَ، أَتَّبِعُهَا مِنْ أَهْلِهَا، فَإِذَا وُضِعَتْ كَبَّرْتُ، وَحَمِدْتُ اللهَ، وَصَلَّيْتُ عَلَى نَبِيِّهِ، ثُمَّ أَقُولُ: اللهُمَّ عَبْدُكَ، وَابْنُ عَبْدِكَ، وَابْنُ أَمَتِكَ، كَانَ يَشْهَدُ أَنْ لاَ إِلَهَ إِلاَّ أَنْتَ، وَأَنَّ مُحَمَّدًا عَبْدُكَ وَرَسُولُكَ، وَأَنْتَ أَعْلَمُ بِهِ، اللهُمَّ إِنْ كَانَ مُحْسِنًا، فَزِدْ فِي إِحْسَانِهِ، وَإِنْ كَانَ مُسِيئًا، فَتَجَاوَزْ عَنْ سَيِّئَاتِهِ، اللهُمَّ لاَ تَحْرِمْنَا أَجْرَهُ، وَلاَ تَفْتِنَّا بَعْدَهُ[٢].

واتە: لە سەعیدی کوڕی ئەبو سەعیدی مەقبورییەوە ﷺ گێڕدراوەتەوە، ئەویش لە باوکیەوە ﷺ گێڕاویەتەوە بەوەی پرسیاری لە ئەبو هورەیرە ﷺ کردووە: چۆن نوێژ لەسەر جەنازە دەکەیت؟ ئەبو هورەیرەش ﷺ گوتی: سوێند بە خوای پەروەردگار پێت دەڵێم (بەو شێوەیە دەکەم): لەناو خزم و کەسەکانی شوێنی جەنازەکە دەکەوم، جا کاتێ دایاننا «الله أكبر» دەکەم (نوێژەکە دەست پێ دەکەم)، وە ستاییشی خوای پەروەردگار دەکەم (لە نوێژەکەدا)، وە صەڵاوەت لەسەر پێغەمبەری خوا ﷺ لێدەدەم، دواتر دەڵێم: ((اللهُمَّ عَبْدُكَ، وَابْنُ عَبْدِكَ، وَابْنُ أَمَتِكَ، كَانَ يَشْهَدُ أَنْ لاَ إِلَهَ إِلاَّ أَنْتَ، وَأَنَّ مُحَمَّدًا عَبْدُكَ وَرَسُولُكَ، وَأَنْتَ أَعْلَمُ بِهِ، اللهُمَّ إِنْ كَانَ مُحْسِنًا، فَزِدْ فِي إِحْسَانِهِ، وَإِنْ كَانَ مُسِيئًا، فَتَجَاوَزْ عَنْ سَيِّئَاتِهِ، اللهُمَّ لاَ تَحْرِمْنَا أَجْرَهُ، وَلاَ تَفْتِنَّا بَعْدَهُ)) واتە: ((پەروەدگارا ئەوە بەندەی تۆیە، کوڕی پیاوێکی بەندەی تۆیە، وە کوڕی ئافرەتێکی بەندەی تۆیە، ئەو بەردەوام شاهێدی دەدا بەوەی هیچ پەرستراوێکی بەحەق نییە جگە لە تۆ، وە شاهێدی دەدا بەوەی موحەممەدیش ﷺ بەندە و پەیامبەری تۆیە، وە خۆت زاناتری بە حاڵی ئەو، پەروەردگارا ئەگەر چاکەکارە ئەوە لە چاکەکانی زیاد بکە و پاداشتی زیاتری بدەرەوە، وە ئەگەر خراپەکارە ئەوە لە خراپەکانی خۆش بە، پەروەردگارا لە پاداشتەکەی بێبەشمان مەکە و لەدوای ئەویش تووشی فیتنەمان مەکە بەوەی ئاگامان لە تۆ نەمێنێ)).

---

(١) ـ مَا يَقُولُ الْمُصَلِّيَ عَلَىَ الْجَنَازَةِ.

(٢) ـ صحيح. أخرجه أبو مصعب الزهري: ١٠١٦؛ والحدثاني: ٣٩٥؛ والشيباني: ٣١١، كلهم عن مالك به.

**٦١٠-** عَنْ يَحْيَى بْنِ سَعِيدٍ ﷺ، أَنَّهُ قَالَ: سَمِعْتُ سَعِيدَ بْنَ الْمُسَيَّبِ ﷺ يَقُولُ: صَلَّيْتُ وَرَاءَ أَبِي هُرَيْرَةَ ﷺ عَلَى صَبِيٍّ لَمْ يَعْمَلْ خَطِيئَةً قَطُّ، فَسَمِعْتُهُ يَقُولُ: اللهُمَّ أَعِذْهُ مِنْ عَذَابِ الْقَبْرِ(١).

واتە: لە یەحیای کوڕی سەعیدەوە ﷺ گێڕدراوەتەوە گوتوویەتی: گوێم لە سەعیدی کوڕی موسەییەب ﷺ بوو دەیگوت: لەدوای ئەبو هورەیرە ﷺ نوێژم لەسەر تەرمی منداڵێك کرد کە هەرگیز یەك تاوانی نەکردبوو (زۆر بچوك بوو، تەکلیفی لەسەر نەبوو)، جا گوێم لە ئەبو هورەیرە ﷺ بوو دەیگوت: پەروەردگارا بیپارێزە لە سزای گۆڕ (واتە لە خەم و ترس و بێزاری و تەنیایی بیپارێزە کە بۆ ئەو بچکۆڵەیە دەبێتە جۆرێك لە سزای گۆڕ).

**٦١١-** أَنَّ عَبْدَ اللهِ بْنَ عُمَرَ ﷺ كَانَ لاَ يَقْرَأُ فِي الصَّلاَةِ عَلَى الْجَنَازَةِ(٢).

واتە: عەبدوڵڵای کوڕی عومەر ﷺ قورئانی نەدەخوێند لەناو نوێژی جەنازەدا (واتە جگە لە فاتیحە سورەتی تری نەدەخوێند).

## ٧- نوێژکردن لەسەر مردوو دوای نوێژی عەسر و بەیانی(٣)

**٦١٢-** عَنْ مُحَمَّدِ بْنِ أَبِي حَرْمَلَةَ، مَوْلَى عَبْدِ الرَّحْمَنِ بْنِ أَبِي سُفْيَانَ بْنِ حُوَيْطِبٍ ﷺ، أَنَّ زَيْنَبَ بِنْتَ أَبِي سَلَمَةَ ﷺ تُوُفِّيَ، وَطَارِقٌ ﷺ أَمِيرُ الْمَدِينَةِ، فَأُتِيَ بِجَنَازَتِهَا بَعْدَ صَلاَةِ الصُّبْحِ، فَوُضِعَتْ بِالْبَقِيعِ، قَالَ: وَكَانَ طَارِقٌ يُغَلِّسُ بِالصُّبْحِ، قَالَ ابْنُ أَبِي حَرْمَلَةَ ﷺ: فَسَمِعْتُ عَبْدَ اللهِ بْنَ عُمَرَ ﷺ يَقُولُ لأَهْلِهَا: إِمَّا أَنْ تُصَلُّوا عَلَى جَنَازَتِكُمُ الآنَ، وَإِمَّا أَنْ تَتْرُكُوهَا حتَّى تَرْتَفِعَ الشَّمْسُ(٤).

واتە: لە موحەممەدی کوڕی ئەبو حەرمەلەی خزمەتکاری عەبدوڕڕەحمانی کوڕی ئەبو سوفیانی کوڕی حوەیتیبەوە ﷺ گێڕدراوەتەوە (گوتوویەتی): زەینەبی کچی ئەبو سەلەمە ﷺ وەفاتی کرد، «تاریق»یش ﷺ ئەمیر و گەورەی مەدینە بوو،

---

(١) ـ صحيح. أخرجه أبو مصعب الزهري: ١٠١٧؛ والحدثاني: ٣٩٥أ، عن مالك به.

(٢) ـ صحيح. أخرجه أبو مصعب الزهري: ٩٧٠؛ والحدثاني: ٣٩٧أ، عن مالك به.

(٣) ـ الصَّلاَةُ عَلَى الْجَنَائِزِ بَعْدَ الْعَصِرْ وَبَعْدَ الصُّبْحِ.

(٤) ـ صحيح. أخرجه أبو مصعب الزهري: ١٠٢١؛ والحدثاني: ٣٩٦ب، عن مالك به.




جا جەنازەکەی دوای نوێژی بەیانی هێنرا و لە گۆڕستانی بەقیع دانرا، دەڵێ: تاریق عادەتی وا بوو نوێژی بەیانی بەتاریکی دەکرد (واتە لە کاتی یەکەمدا ئەنجامی دەدا)، ئیبنو ئەبو حەرمەلە ﷺ دەڵێ: جا گوێم لە عەبدوڵڵای کوڕی عومەر بوو ﷺ بە خانەوادەی مردووەکەی دەگوت: یان ئێستا نوێژ لەسەر مردووەکەتان بکەن، یانیش وازی لێ بێنن تا خۆر بەرز دەبێتەوە.

**٦١٣**- أَنَّ عَبْدَ اللهِ بْنَ عُمَرَ ﷺ قَالَ: يُصَلَّى عَلَى الْجَنَازَةِ بَعْدَ الْعَصْرِ، وَبَعْدَ الصُّبْحِ إِذَا صُلِّيَتَا لِوَقْتِهِمَا[1].

واتە: عەبدوڵڵای کوڕی عومەر ﷺ گوتوویەتی: (دروستە و) نوێژ لەسەر مردوو دەکرێت دوای نوێژی عەسر، وە دوای نوێژی بەیانیش، ئەگەر ئەم دوو نوێژە لە کاتی خۆیان ئەنجام دران (بەڵام ئەگەر نوێژەکە تاخیر کرا تا کاتی خۆر هەڵات یان خۆر ئاوابوون، ئەوە لەلای ئەو ناپەسەندە)[2].

## ٨- نوێژکردن لەسەر مردوو لە مزگەوت[3]

**٦١٤**- عَنْ عَائِشَةَ ﷺ، زَوْجِ النَّبِيِّ ﷺ، أَنَّهَا أَمَرَتْ أَنْ يُمَرَّ عَلَيْهَا بِسَعْدِ بْنِ أَبِي وَقَّاصٍ ﷺ فِي الْمَسْجِدِ حِينَ مَاتَ، لِتَدْعُوَ لَهُ، فَأَنْكَرَ ذَلِكَ النَّاسُ عَلَيْهَا، فَقَالَتْ عَائِشَةُ ﷺ: مَا أَسْرَعَ النَّاسَ، مَا صَلَّى رَسُولُ اللهِ ﷺ عَلَى سُهَيْلِ بْنِ بَيْضَاءَ ﷺ إِلاَّ فِي الْمَسْجِدِ[4].

واتە: لە عائیشەی ﷺ خێزانی پێغەمبەری خواوە ﷺ گێردراوەتەوە بەوەی عائیشە ﷺ فەرمانی کرد تەرمی سەعدی کوڕی ئەبو وەقاص ﷺ بەلایاندا بهێنرێت بۆ مزگەوت کاتێ وەفاتی کرد، بۆ ئەوەی دوعای بۆ بکات و نوێژی لەسەر

---

(١) ـ صحيح. أخرجه أبو مصعب الزهري: ١٠٢٠؛ والحدثاني: ٣٩٦أ؛ والشيباني: ٣١٣، كلهم عن مالك به.

(٢) ـ تێبینی: لەلای ئیمامی مالیك و ئیمامی شافیعی ﷺ نوێژکردن لەسەر مردوو لە هیچ کاتێك ناپەسەند نییە، بەڵام وا باشترە لەو کاتانە نەبێت.

(٣) ـ الصَّلاَةُ عَلَى الْجَنَائِزِ فِي الْمَسْجِدِ.

(٤) ـ صحيح. أخرجه أبو مصعب الزهري: ١٠١٨؛ والحدثاني: ٣٩٦، عن مالك به.




بكات، جا هەندێك لە خەڵكی لەسەر ئەوە ڕەخنەیان لێ گرت (واتە گوتیان: چۆن دەبێت لە مزگەوت نوێژی لەسەر بكرێت)، عائیشەش ﷺ گوتی: خەڵك چەندە زوو (سوننەتیان بیر چۆیەوە و پەلە دەكەن بۆ ڕەخنەگرتن)، پێغەمبەری خوا ﷺ نوێژی لەسەر تەرمی سوهەیلی كوڕی بەیضا ﷺ نەكرد تەنها لە مزگەوت نەبێت.

٦١٥- عَنْ عَبْدِ اللهِ بْنِ عُمَرَ ﷺ؛ أَنَّهُ قَالَ: صُلِّيَ عَلَى عُمَرَ بْنِ الْخَطَّابِ ﷺ فِي الْمَسْجِدِ[1].

واتە: لە عەبدوڵڵای كوڕی عومەرەوە ﷺ گێڕدراوەتەوە بەوەی گوتوویەتی: لە مزگەوت نوێژ كرا لەسەر عومەری كوڕی خەتتاب ﷺ.

## ٩- بابەتی جۆراوجۆر پەیوەست بە نوێژكردن لەسەر مردوو[2]

٦١٦- عَنْ مَالِكٍ ﷺ، أَنَّهُ بلَغَهُ، أَنَّ عُثْمَانَ بْنَ عَفَّانَ، وَعَبْدَ اللهِ بْنَ عُمَرَ، وَأَبَا هُرَيْرَةَ ﷺ كَانُوا يُصَلُّونَ عَلَى الْجَنَائِزِ بِالْمَدِينَةِ، الرِّجَالِ وَالنِّسَاءِ، فَيَجْعَلُونَ الرِّجَالَ مِمَّا يَلِي الإِمَامَ، وَالنِّسَاءَ مِمَّا يَلِي الْقِبْلَةَ[3].

واتە: لە ئیمامی مالیكەوە ﷺ گێڕدراوەتەوە پێی گەیشتووە عوسمانی كوڕی عەففان و عەبدوڵڵای كوڕی عومەر و ئەبو هوڕەیرە ﷺ نوێژیان لەسەر پیاو و ئافرەتی مردوو دەكرد لە مەدینە، جا پیاویان دەخستنە تەنیشت ئیمام، ئافرەتیشیان دەخستە لای قیبلە (واتە لە بەرامبەر ئیمامیان دادەنا، ئیمام لە ناوەڕاستی دەوەستا).

٦١٧- أَنَّ عَبْدَ اللهِ بْنَ عُمَرَ ﷺ كَانَ إِذَا صَلَّى عَلَى الْجَنَائِزِ يُسَلِّمُ، حَتَّى يُسْمِعَ مَنْ يَلِيهِ[4].

واتە: عەبدوڵڵای كوڕی عومەر ﷺ هەموو جار كاتێ نوێژی لەسەر تەرمێك بكردبایە سەلامی دەدایەوە، (بەشێوەیەكی وا بەهێز سەلامی دەدایەوە) هەموو ئەو كەسانەی گوێبیست دەكرد كە ئامادەبوون.

---

(١) ـ صحيح. أخرجه أبو مصعب الزهري: ١٠١٩؛ والشيباني: ٣١٤؛ ومصنف ابن أبي شيبة: ١١٩٦٨، كلهم عن مالك به.

(٢) ـ جَامِعُ الصَّلَاةِ عَلَى الْجَنَائِزِ.

(٣) ـ صحيح. أخرجه أبو مصعب الزهري: ٩٦٨؛ والحدثاني: ٣٩٧، عن مالك به.

(٤) ـ صحيح. أخرجه أبو مصعب الزهري: ١٠٠٢؛ والشيباني: ٣١٢، عن مالك به.

٦١٨- أَنَّ عَبْدَ اللهِ بْنَ عُمَرَ ﷺ كَانَ يَقُولُ: لاَ يُصَلِّي الرَّجُلُ عَلَى الْجَنَازَةِ إِلاَّ وَهُوَ طَاهِرٌ[١].

واته: عەبدوڵڵای کوڕی عومەر ﷺ هەموو جار دەیگوت: با هیچ کەسێك نوێژ لەسەر مردوو نەکات تەنها بەدەستنوێژەوە نەبێت.

٦١٩- قَالَ يَحْيَى ﷺ: سَمِعْتُ مَالِكًا ﷺ يَقُولُ: لَمْ أَرَ أَحَدًا مِنْ أَهْلِ الْعِلْمِ يَكْرَهُ أَنْ يُصَلَّى عَلَى وَلَدِ الزِّنَا وَأُمِّهِ[٢].

واته: یەحیا ﷺ گوتوویەتی: گوێم لە ئیمامی مالیك ﷺ بوو دەیگوت: هیچ کەسێك لە زانایانم نەبینیوە پێیان چاك نەبێت و پێیان ناپەسەند بێت نوێژ لەسەر منالی زینا و دایکەکەی بکەن.

## ١٠- ئەوەی هاتووە دەربارەی بەخاکسپاردنی مردوو[٣]

٦٢٠- عَنْ مَالِكٍ ﷺ؛ أَنَّهُ بَلَغَهُ، أَنَّ رَسُولَ اللهِ ﷺ تُوُفِّيَ يَوْمَ الاِثْنَيْنِ، وَدُفِنَ يَوْمَ الثُّلاَثَاءِ، وَصَلَّى النَّاسُ عَلَيْهِ أَفْذَاذًا لاَ يَؤُمُّهُمْ أَحَدٌ، فَقَالَ نَاسٌ: يُدْفَنُ عِنْدَ الْمِنْبَرِ، وَقَالَ آخَرُونَ: يُدْفَنُ بِالْبَقِيعِ، فَجَاءَ أَبُو بَكْرٍ الصِّدِّيقُ ﷺ، فَقَالَ: سَمِعْتُ رَسُولَ اللهِ ﷺ يَقُولُ: مَا دُفِنَ نَبِيٌّ قَطُّ إِلاَّ فِي مَكَانِهِ الَّذِي تُوُفِّيَ فِيهِ، فَحُفِرَ لَهُ فِيهِ، فَلَمَّا كَانَ عِنْدَ غُسْلِهِ، أَرَادُوا نَزْعَ قَمِيصِهِ، فَسَمِعُوا صَوْتًا يَقُولُ: لاَ تَنْزِعُوا الْقَمِيصَ، فَلَمْ يُنْزَعِ الْقَمِيصُ، وَغُسِّلَ وَهُوَ عَلَيْهِ ﷺ[٤].

واته: لە ئیمامی مالیکەوە ﷺ گێردراوەتەوە بەوەی پێی گەیشتووە پێغەمبەری خوا ﷺ ڕۆژی دووشەم وەفاتی کرد و ڕۆژی سێشەم نێژرا، (جا پێشی ئەوەی بنێژرێ) خەڵك تاك تاك نوێژیان لەسەر کرد، هیچ کەسێك نەبووە ئیمام و پێشنوێژیان، جا خەڵکانێك گوتیان: لەلای مینبەر دەنێژرێ، هەندێکی دیکە گوتیان: لە بەقیع دەنێژرێ، جا ئەبو بەکری صدیق ﷺ هات و گوتی: گوێم لە پێغەمبەری خوا ﷺ

---

(١) ـ صحيح. أخرجه أبو مصعب الزهري: ٩٦٩؛ والحدثاني: ٣٩٧ب؛ والشيباني: ٣١٦، كلهم عن مالك به.

(٢) ـ أخرجه أبو مصعب الزهري: ١٠٠٣، عن مالك به.

(٣) ـ مَا جَاءَ فِي دَفْنِ الْمَيِّتِ.

(٤) ـ صحيح. أخرجه أبو مصعب الزهري: ٩٧١؛ والحدثاني: ٤٠٠، عن مالك به.

بوو دەیفەرموو: (هەرگیز هیچ پێغەمبەرێك ﷺ نەنێژراوە تەنها لەو شوێنە نەبێ کە تیایدا مردووە)، جا لە شوێنەکەی خۆی چاڵی بۆ لێدرا، جا کە کاتی شۆردنی هات، ویستیان جلەکەی لەبەر داکەنن، جا گوێیان لە دەنگێك بوو دەیگوت: جلی لەبەر دامەکەنن، بۆیە جلەکە دانەکەنرا و شۆردرا لە کاتێکدا جلەکەی هەر لەبەردا بوو (بە دایك و باوکەوە بە قوربانی بین).

**٦٢١-** عَنْ هِشَامِ بْنِ عُرْوَةَ ﷺ، عَنْ أَبِيهِ ﷺ، أَنَّهُ قَالَ: كَانَ بِالْمَدِينَةِ رَجُلَانِ أَحَدُهُمَا يَلْحَدُ، وَالآخَرُ لاَ يَلْحَدُ، فَقَالُوا: أَيُّهُمَا جَاءَ أَوَّلُ، عَمِلَ عَمَلَهُ، فَجَاءَ الَّذِي يَلْحَدُ، فَلَحَدَ لِرَسُولِ اللهِ ﷺ(١).

واتە: لە هیشامی کوڕی عورِوەوە ﷺ گێڕدراوەتەوە، ئەویش لە باوکیەوە ﷺ گێڕاویەتەوە گوتوویەتی: دوو پیاو لە مەدینە هەبوون (گۆڕیان لێ دەدا)، یەکیان گۆڕی لادرِی لێ دەدا (واتە دوای ئەوەی گۆڕەکەی تەواو هەڵدەکەند بەرەو تەنیشتێك قوڵی دەکرد کە بە عەرەبی پێی دەگوترێ لەحد)، ئەوەی دیکەشیان لادرِی لێ نەدەدا (بەڵکوو ناودرِی لێ دەدا کە تەنها بۆ خوارەوە قوڵ دەکرێ)، جا (ناردیان بەدوای هەردووکیاندا) و گوتیان: کامیان سەرەتا گەیشت با کارەکەی ئەنجام بدات (بە شێوازی خۆی)، جا ئەوەیان پێشتر گەیشت کە لادرِی دەکرد (کە ئەوەشیان چاکترە)، جا گۆڕی لادرِی بۆ پێغەمبەری خوا ﷺ لێ دا.

**٦٢٢-** أَنَّ أُمَّ سَلَمَةَ ﷺ، زَوْجَ النَّبِيِّ ﷺ كَانَتْ تَقُولُ: مَا صَدَّقْتُ بِمَوْتِ رَسُولِ اللهِ ﷺ، حَتَّى سَمِعْتُ وَقْعَ الْكَرَازِينِ(٢).

واتە: ئوممو سەلەمەی ﷺ خێزانی پێغەمبەری خوا ﷺ دەیگوت: باوەڕم بە مردنی پێغەمبەری خوا ﷺ نەکرد تاوەکوو گوێم لە دەنگی بێڵ و پاچ و خاکەناس بوو.

---

(١) ـ صحيح. أخرجه أبو مصعب الزهري: ٩٧٢؛ والحدثاني: ٤٠٠أ، عن مالك به.

(٢) ـ ضعيف. أخرجه أبو مصعب الزهري: ٩٧٣؛ والحدثاني: ٤٠٠ب، عن مالك به.

**٦٢٣**- أَنَّ عَائِشَةَ ﵂، زَوْجَ النَّبِيِّ ﷺ قَالَتْ: رَأَيْتُ ثَلاَثَةَ أَقْمَارٍ سَقَطْنَ فِي حُجْرَتِي، فَقَصَصْتُ رُؤْيَايَ عَلَى أَبِي بَكْرٍ الصِّدِّيقِ ﵁، قَالَتْ: فَلَمَّا تُوُفِّيَ رَسُولُ اللهِ ﷺ، وَدُفِنَ فِي بَيْتِي، قَالَ لَهَا أَبُو بَكْرٍ ﵁: هَذَا أَحَدُ أَقْمَارِكِ، وَهُوَ خَيْرُهَا[١].

واتە: عائیشەی ﵂ خێزانی پێغەمبەری خوا ﷺ گوتوویەتی: لە خەودا بینیم سێ مانگ کەوتنە ناو ژوورەکەمەوە، جا خەونەکەمم بۆ ئەبو بەکری صدیق ﵁ گێڕایەوە (چونکە زانایێکی گەورە بوو لە لێکدانەوەی خەون)، عائیشە ﵂ دەڵێ: جا کاتێ پێغەمبەری خوا ﷺ وەفاتی کرد و لە ژوورەکەم نێژرا ئەبو بەکر ﵁ پێی گوتم: ئەوە یەکێکە لە مانگەکانت، کە چاکترینیانە (دواتریش ئیمامی ئەبو بەکر و عومەریش ـ خوا لێیان ڕازی بێ ـ لەوێ نێژران و بوون بە سێ مانگ).

**٦٢٤**- أَنَّ سَعْدَ بْنَ أَبِي وَقَّاصٍ، وَسَعِيدَ بْنَ زَيْدِ بْنِ عَمْرِو بْنِ نُفَيْلٍ ﵄ تُوُفِّيَا بِالْعَقِيقِ، وَحُمِلاَ إِلَى الْمَدِينَةِ، وَدُفِنَا بِهَا[٢].

واتە: سەعدی کوڕی ئەبو وەقاص و سەعیدی کوڕی عەمری کوڕی نوفەیل ﵄ لە عەقیق وەفاتیان کرد (کە شوێنێکی نزیك مەدینەیە)، جا هەڵگیران و گواسترانەوە بۆ مەدینە و لەوێ نێژران.

**٦٢٥**- عَنْ هِشَامِ بْنِ عُرْوَةَ ﵀، عَنْ أَبِيهِ ﵀، أَنَّهُ قَالَ: مَا أُحِبُّ أَنْ أُدْفَنَ بِالْبَقِيعِ، لأَنْ أُدْفَنَ بِغَيْرِهِ، أَحَبُّ إِلَيَّ مِنْ أَنْ أُدْفَنَ فِيهِ، إِنَّمَا هُوَ أَحَدُ رَجُلَيْنِ: إِمَّا ظَالِمٌ، فَلاَ أُحِبُّ أَنْ أُدْفَنَ مَعَهُ، وَإِمَّا صَالِحٌ، فَلاَ أُحِبُّ أَنْ تُنْبَشَ لِي عِظَامُهُ[٣].

واتە: لە هیشامی کوڕی عوڕوەوە ﵀ گێڕدراوەتەوە، ئەویش لە باوکیەوە ﵁ گێڕاویەتەوە بەوەی گوتوویەتی: پێم خۆش نییە لە گۆڕستانی بەقیع بنێژرێم، ئەگەر لە گۆڕستانێك و شوێنێکی جگە لەو بنێژرێم پێم خۆشترە لەوەی لەوێ بنێژرێم (لەبەر ئەوەی دوای لەناوچوونی ئێسك و پروسکەکان گۆڕەکە هەڵدەدرایەوە و

---

(١) ـ صحيح. أخرجه أبو مصعب الزهري: ٩٧٤؛ والحدثاني: ٤٠١، عن مالك به.

(٢) ـ ضعيف. أخرجه أبو مصعب الزهري: ٩٧٧؛ والحدثاني: ٤٠١ج، عن مالك به.

(٣) ـ مقطوع صحيح. أخرجه أبو مصعب الزهري: ١٠٠١، عن مالك به.

خەڵکی دیکە دەنێژرا)، چونکە تەنها دوو کەس هەن (واتە لە دوو کەس دەرناچێت ئەوانەی کاتی خۆی لەوێ نێژراون و بوونەتەوە خۆڵ): یان کەسێکی ستەمکار و تاوانبارە، پێم خۆش نییە لەگەڵی بنێژرێم (چونکە لە شوێنەکەی من سزا دەدرێ)، یانیش کەسێکی چاکە، پێم خۆش نییە بۆ من ئێسکەکانی دەربهێنرێن (واتە ڕەنگە مسوڵمانێکی چاك زەمانێکی زۆر بێت مردبێت و ئێسکەکانی تێکەڵی خۆڵ بووبن و بۆ من شوێنەکەی هەڵبکەنرێ).

## ١١- وەستان بۆ تەرم و دانیشتن لەسەر گۆڕ[١]

**٦٢٦-** عَنْ عَلِيِّ بْنِ أَبِي طَالِبٍ ﷺ، أَنَّ رَسُولَ اللهِ ﷺ كَانَ يَقُومُ فِي الْجَنَائِزِ، ثُمَّ جَلَسَ بَعْدُ[٢].

واتە: لە عەلی کوڕی ئەبو تاڵیبەوە ﷺ گێڕدراوەتەوە (گوتوویەتی): پێغەمبەری خوا ﷺ سەرەتا لەبەر تەرمی مردوو هەڵدەستایەوە، دواتر دادەنیشت[٣].

**٦٢٧-** أَنَّ عَلِيَّ بْنَ أَبِي طَالِبٍ ﷺ كَانَ يَتَوَسَّدُ الْقُبُورَ، وَيَضْطَجِعُ عَلَيْهَا[٤].

قَالَ مَالِكٌ ﷺ: وَإِنَّمَا نُهِيَ عَنِ الْقُعُودِ عَلَى الْقُبُورِ، فِيمَا نُرَى، لِلْمَذَاهِبِ[٥].

واتە: عەلی کوڕی ئەبو تاڵیب ﷺ شانی دەدایە سەر گۆڕ و لەسەری پاڵدەکەوت.

---

(١) ـ الْوُقُوفُ لِلْجَنَائِزِ وَالْجُلُوسُ عَلَى الْمَقَابِرِ.

(٢) ـ صحيح. أخرجه أبو مصعب الزهري: ١٠٢٢؛ والشيباني: ٣١٠؛ والشافعي: ٧٩٢؛ وفي: ١٦٦٥؛ وابن حبان: ٣٠٥٤؛ والقابسي: ٥٠٩، كلهم عن مالك به.

(٣) ـ تێبینی: لێرەدا ئەم فەرموودە یەكێك لەو دوو مانایانە لەخۆ دەگرێ:
مانای یەكەم: یان مەبەستی ئەوەیە ماوەیەك لەبەر جەنازە هەڵدەستا، بەڵام دواتر وازی لێهێنا و هەڵنەدەستا. جا ئیمامی مالیك لەسەر ئەو بۆچوونەیە و دانیشتنی پێ چاكترە نەك هەڵسان، هەروەها ئیمامی شافیعیش.
مانای دووەم: یانیش مەبەستی ئەوەیە لەبەر جەنازە هەڵدەستا تا ئەوەندەی جەنازەكە لێی ڕەت دەبوو و دووردەكەوتەوە ئینجا دادەنیشت.

(٤) ـ ضعيف. أخرجه الشيباني: ٣٢٢، عن مالك به.

(٥) ـ أخرجه أبو مصعب الزهري: ٩٧٦، عن مالك به.

ئیمامی مالیك ﷺ گوتوویەتی: کە نەهی کراوە لە دانیشتن لەسەر گۆڕەکان، ئێمە پێمان وایە تەنها بۆ سەرئاوکردنە، (واتە نەهی لەوە کراوە بۆ میز و پیسایی و شتی پیس لەسەر قەبر دابنیشن، بۆیە دەبینین هەندێك لە هاوەڵان لەسەر گۆڕ پاڵکەوتوون و دانیشتوون و پێیان ئاسایی بووە)[١].

**٦٢٨**- أَنَّ أَبَا أُمَامَةَ بْنَ سَهْلِ بْنِ حُنَيْفٍ ﷺ يَقُولُ: كُنَّا نَشْهَدُ الْجَنَائِزَ، فَمَا يَجْلِسُ آخِرُ النَّاسِ حَتَّى يُؤْذَنُوا[٢].

واتە: ئەبو ئومامەی کوڕی سەهلی کوڕی حونەیف ﷺ دەیگوت: ئێمە ئامادەی نوێژی مردوو دەبووین، جا هیچ لە خەڵکی دانەدەنیشتن تاوەکوو مۆڵەتیان پێ دەدرا (لەلایەن خاوەنی مردووەکە، بەوەی نوێژی لەسەر بکەن، یان بەوەی بڕۆن دوای نوێژ لەسەرکردنی).

## ١٢- نەهیکردن لە گریانی بەدەنگ لەسەر مردوو[٣]

**٦٢٩**- أَنَّ جَابِرَ بْنَ عَتِيكٍ ﷺ قال: أَنَّ رَسُولَ اللهِ ﷺ جَاءَ يَعُودُ عَبْدَ اللهِ بْنَ ثَابِتٍ، فَوَجَدَهُ قَدْ غُلِبَ، فَصَاحَ بِهِ، فَلَمْ يُجِبْهُ، فَاسْتَرْجَعَ رَسُولُ اللهِ ﷺ، وَقَالَ: غُلِبْنَا عَلَيْكَ يَا أَبَا الرَّبِيعِ، فَصَاحَ النِّسْوَةُ وَبَكَيْنَ، فَجَعَلَ جَابِرٌ يُسَكِّتُهُنَّ، فَقَالَ رَسُولُ اللهِ ﷺ: دَعْهُنَّ، فَإِذَا وَجَبَ، فَلاَ تَبْكِيَنَّ بَاكِيَةٌ، قَالُوا: يَا رَسُولَ اللهِ، وَمَا الْوُجُوبُ؟ قَالَ: إِذَا مَاتَ، فَقَالَتِ ابْنَتُهُ: وَاللَّهِ إِنْ كُنْتُ لأَرْجُو أَنْ تَكُونَ شَهِيدًا، فَإِنَّكَ كُنْتَ قَدْ قَضَيْتَ جِهَازَكَ، فَقَالَ رَسُولُ اللهِ ﷺ: إِنَّ اللهَ قَدْ أَوْقَعَ أَجْرَهُ عَلَى قَدْرِ نِيَّتِهِ، وَمَا تَعُدُّونَ الشَّهَادَةَ؟ قَالُوا: الْقَتْلُ فِي سَبِيلِ اللهِ، فَقَالَ رَسُولُ اللهِ ﷺ: الشُّهَدَاءُ سَبْعَةٌ، سِوَى الْقَتْلِ فِي سَبِيلِ اللهِ: الْمَطْعُونُ شَهِيدٌ، وَالْغَرِقُ شَهِيدٌ، وَصَاحِبُ ذَاتِ الْجَنْبِ شَهِيدٌ، وَالْمَبْطُونُ شَهِيدٌ، وَالْحَرِقُ شَهِيدٌ، وَالَّذِي يَمُوتُ تَحْتَ الْهَدْمِ شَهِيدٌ، وَالْمَرْأَةُ تَمُوتُ بِجُمْعٍ شَهِيدٌ[٤].

---

(١) ـ تێبینی: ئەو بۆچونەی ئیمامی مالیك فەرموودەی مەرفوعی لەسەرە، بەڵام لەلای جمهوری زانایان دانیشتنیش لەسەر گۆڕ دروست نییە، بە بەڵگەی عمومی فەرموودەکان.

(٢) ـ صحيح. أخرجه أبو مصعب الزهري: ١٠٢٩؛ والحدثاني: ٣٩٩ج، عن مالك به.

(٣) ـ النَّهْيُ عَنِ الْبُكَاءِ عَلَى الْمَيِّتِ.

(٤) ـ صحيح لغيره. أخرجه أبو مصعب الزهري: ٩٣٥، وفي: ٩٩٦؛ والشيباني، ٣٠٢؛ والشافعي: ١٦٦٧؛ وابن

واتە: جابری کوڕی عەتیك ﷺ گوتوویەتی: پێغەمبەری خوا ﷺ هات سەردانی عەبدوڵڵای کوڕی سابیتی کرد، بینی ئازار باڵی بەسەردا کێشاوە، جا بانگی کرد وەڵامی نەدایەوە، بۆیە پێغەمبەری خوا ﷺ «إنا لله وإنا إليه راجعون»ی کرد و فەرمووی: کاری ئێمە ژێر کەوت دەربارەی تۆ ئەی ئەبو ڕەبیع (واتە هیچمان پێ ناکرێ کاری خوا زاڵە و تەواو بووە)، جا ئافرەتەکانی قیژاندیان و گریان، جابریش ﷺ هەر بێدەنگی دەکردن، پێغەمبەری خواش ﷺ فەرمووی: وازیان لێ بێنە (با بگرین)، بەڵام کاتێ واجب بوو یەك ئافرەت بەدەنگ و هاوار نەگرییێ، گوتیان: ئەی پێغەمبەری خوا واجب چییە؟ فەرمووی: کاتێ دەمرێ، جا کچەکەی گوتی: سوێند بە خوا ئومێدم وایە شەهیدیت، چونکە تۆ بەتەواوی خۆت بۆ مردن ئامادە کردبوو (و زاد و زەخیرەت تەواوە)، پێغەمبەری خواش ﷺ فەرمووی: خوای پەروەردگار پاداشتەکەی بەپێی نییەتی ئەو داناوە (نەك بەپێی کردەوەکانی، ئێوە چووزانن نییەتەکەی بای چەندە)، وە ئێوە چی بە شەهیدی ئەژمار دەکەن؟ گوتیان: کوژران لە پێناوی خوا، پێغەمبەری خواش ﷺ فەرمووی: شەهیدەکان جگە لە کوژراو لە پێناوی خوا حەوتن: ئەوەی بە نەخۆشی تاعون دەمرێت شەهیدە، وە ئەوەی دەخنکێت شەهیدە، وە ئەوەی نەخۆشی لە تەرۆك و سکی دەدات و دەمرێت شەهیدە، وە ئەوەی بە سك ئێشە دەمرێت شەهیدە، وە سوتاو شەهیدە، وە ئەوەی لە ژێر داڕماندا دەمرێت شەهیدە، وە ئەو ئافرەتەی بەهۆی منداڵبوونەوە دەمرێت شەهیدە.

**٦٣٠- عَنْ عَمْرَةَ بِنْتِ عَبْدِ الرَّحْمَنِ ﷺ، أَنَّهَا أَخْبَرَتْهُ: أَنَّهَا سَمِعَتْ عَائِشَةَ أُمَّ الْمُؤْمِنِينَ ﷺ تَقُولُ: وَذُكِرَ لَهَا أَنَّ عَبْدَ اللهِ بْنَ عُمَرَ يَقُولُ: إِنَّ الْمَيِّتَ لَيُعَذَّبُ بِبُكَاءِ الْحَيِّ، فَقَالَتْ عَائِشَةُ: يَغْفِرُ اللهُ لأَبِي عَبْدِ الرَّحْمَنِ، أَمَا إِنَّهُ لَمْ يَكْذِبْ، وَلَكِنَّهُ نَسِيَ أَوْ أَخْطَأَ، إِنَّمَا مَرَّ رَسُولُ اللهِ ﷺ بِيَهُودِيَّةٍ يَبْكِي عَلَيْهَا أَهْلُهَا، فَقَالَ: إِنَّكُمْ لَتَبْكُونَ عَلَيْهَا، وَإِنَّهَا لَتُعَذَّبُ فِي قَبْرِهَا[1].**

---

حنبل: ٢٣٨٠٤؛ والنسائي: ١٨٤٦؛ وأبو داود: ٣١١١؛ وابن حبان: ٣١٨٩، وفي: ٣١٩٠؛ وشرح معاني الآثار: ٦٩٦٨؛ والقابسي: ٣٠١، كلهم عن مالك به.

(١) ـ صحيح. أخرجه أبو مصعب الزهري: ٩٩٧؛ والحدثاني: ٤٠٧أ؛ والشيباني: ٣١٩، وفي: ٣٢٠؛ والشافعي: ٨٨٩؛ وابن حنبل: ٢٤٨٠٢، وفي: ٢٦٢٢٣؛ والبخاري: ١٢٨٩؛ ومسلم: ٢٧؛ والنسائي: ١٨٥٦؛ والترمذي: ١٠٠٦؛ وابن حبان: ٣١٢٣؛ والقابسي: ٣١٦، كلهم عن مالك به.

واتە: لە عەمرەی كچی عەبدوڕڕەحمانەوە ﷺ گێردراوەتەوە هەواڵی داوە بەوەی گوێی لە عائیشەی دایكی بڕواداران ﷺ بووە لە كاتێكدا باسی عەبدوڵڵای كوڕی عومەری ﷺ بۆ كرا بەوەی دەیگوت: مردوو سزا دەدرێت بە گریانی زیندووەكان، جا عائیشە ﷺ گوتی: خوا لە ئەبو عەبدوڕڕەحمان خۆش بێ، ناڕاستی نەگوتووە، بەڵام لەیادی چووە یان هەڵەی كردووە، (كە پێغەمبەری خوا ﷺ ئاوای فەرموو بابەتەكە) تەنها ئەوە بوو پێغەمبەری خوا ﷺ بەلای گۆڕی ئافرەتێكی جوولەكەدا تێپەڕ بوو لە كاتێكدا خانەوادەكەی لەسەری دەگریان، جا فەرمووی: ئێوە لەسەری دەگرین لە كاتێكدا ئەویش سزا دەدرێت لە گۆڕەكەیدا[١].

## ١٣- ئارامگرتن و تەسلیمبوون بۆ پەروەردگار لە بەڵا و موصیبەتدا[٢]

**٦٣١- عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ ﷺ، أَنَّ رَسُولَ اللهِ ﷺ قَالَ: لاَ يَمُوتُ لأَحَدٍ مِنَ الْمُسْلِمِينَ ثَلاَثَةٌ مِنَ الْوَلَدِ، فَتَمَسَّهُ النَّارُ، إِلاَّ تَحِلَّةَ الْقَسَمِ[٣].**

واتە: لە ئەبو هوڕەیرەوە ﷺ گێردراوەتەوە (گوتوویەتی): پێغەمبەری خوا ﷺ فەرموویەتی: هیچ مسوڵمانێك نییە سێ منداڵی لێ بمرێت و ئاگری بەربكەوێت و بچێتە ناو ئاگر، تەنها بای بەجێهێنانی سوێندەكە نەبێت (واتە تەنها ئەوەندە بەناو ئاگردا یان بەسەر ئاگردا ڕەت دەبێت كە خوای پەروەردگار سوێندی خواردووە دەبێ هەموو كەسێك بەناویدا ڕەت بێت ـ وەك لە سورەتی مەریەمدا هاتووە ـ، جا مسوڵمانیش بەناویدا ڕەت دەبێت بەڵام بەبێ زیان، جا ئەو كەسەی سێ منداڵی لێ بمرێت تەنها ئەوەندە ئاگر دەبینێت).

---

(١) ـ تێبینی: پێغەمبەری خوا ﷺ بۆ ئەوە ئەم هەواڵەی پێ داون تا خەمێك لە خۆیان بخۆن نەك لەو، تازە ئەو ڕۆیشتووە، تاوەكوو وەك ئەو بەكافری نەمرن و سەرەنجامیان وەكوو ئەو نەبێ، ئەوەش گرنگترە لە ڕاگرتنی دڵی ئەوان و ڕانەگەیاندنی ئەو هەواڵە ناخۆشە پێیان، والله أعلم.

(٢) ـ الْحِسْبَةُ فِي الْمُصِيبَةِ.

(٣) ـ صحيح. أخرجه أبو مصعب الزهري: ٩٨٢؛ والحدثاني: ٤٠٣أ؛ وابن حنبل: ١٠١٢٤؛ والبخاري: ٦٦٥٦؛ ومسلم: ١٥٠؛ والنسائي: ١٨٧٥؛ والترمذي: ١٠٦٠؛ وابن حبان: ٢٩٤٢؛ والقابسي: ١٥، كلهم عن مالك به.

**٦٣٢-** عَنْ أَبِي النَّضْرِ السَّلَمِيِّ ﷺ، أَنَّ رَسُولَ اللهِ ﷺ قَالَ: لاَ يَمُوتُ لأَحَدٍ مِنَ الْمُسْلِمِينَ ثَلاَثَةٌ مِنَ الْوَلَدِ، فَيَحْتَسِبُهُمْ، إِلاَّ كَانُوا لَهُ جُنَّةً مِنَ النَّارِ، فَقَالَتِ امْرَأَةٌ عِنْدَ رَسُولِ اللهِ ﷺ: يَا رَسُولَ اللهِ، أَوِ اثْنَانِ؟ قَالَ: أَوِ اثْنَانِ[١].

واتە: لە ئەبو نەزری سەلەمییەوە ﷺ گێردراوەتەوە (گوتوویەتی): هیچ مسوڵمانێك نییە سێ منداڵی لێ بمرێت و سەبر و ئارامیان لەسەر بگرێ، حەتمەن دەبن بە قەڵغان و بەربەست بۆی لە ئاگر، جا ئافرەتێك لەلای پێغەمبەری خوا ﷺ گوتی: ئەی پێغەمبەری خوا ﷺ ئەی دووان؟ فەرمووی: دووانیش.

**٦٣٣-** عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ ﷺ، أَنَّ رَسُولَ اللهِ ﷺ قَالَ: مَا يَزَالُ الْمُؤْمِنُ يُصَابُ فِي وَلَدِهِ وَحَامَّتِهِ، حَتَّى يَلْقَى اللهَ وَلَيْسَتْ لَهُ خَطِيئَةٌ[٢].

واتە: لە ئەبو هورەیرەوە ﷺ گێردراوەتەوە (گوتوویەتی): پێغەمبەری خوا ﷺ فەرموویەتی: مرۆڤی بڕوادار بەردەوام بەڵا و ناڕەحەتی و مردن تووشی منداڵەکانی و خۆشەویستانی دەبێ، تاوەکوو دەگاتە لیقای خوای پەروەردگار لە کاتێکدا (بەهۆی پاداشتی ئارامگرتن) یەك دانە تاوانیشی نەماوە (گشتی سڕاونەتەوە).

## ١٤- بابەتی جۆراوجۆری پەیوەست بە صەبر و ئارامی و دانبەخۆداگرتن[٣]

**٦٣٤-** عَنْ عَبْدِ الرَّحْمَنِ بْنِ الْقَاسِمِ بْنِ مُحَمَّدِ بْنِ أَبِي بَكْرٍ الصِّدِّيقِ ﷺ، أَنَّ رَسُولَ اللهِ ﷺ قَالَ: لِيُعَزِّ الْمُسْلِمِينَ فِي مَصَائِبِهِمُ، الْمُصِيبَةُ بِي[٤].

واتە: لە عەبدوڕڕەحمانی کوڕی قاسمی کوڕی موحەممەدی کوڕی ئەبو بەکری صدیقەوە ﷺ گێردراوەتەوە (گوتوویەتی): پێغەمبەری خوا ﷺ فەرموویەتی: با

---

(١) ـ صحيح لغيره. أخرجه أبو مصعب الزهري: ٩٨١؛ والحدثاني: ٤٠٣؛ والقابسي: ٩٤، كلهم عن مالك به.

(٢) ـ صحيح. أخرجه أبو مصعب الزهري: ٩٨٤؛ والحدثاني: ٤٠٤أ، كلهم عن مالك به.

(٣) ـ جَامِعُ الْحِسْبَةِ فِي الْمُصِيبَةِ.

(٤) ـ صحيح لغيره. أخرجه أبو مصعب الزهري: ٩٨٣؛ والحدثاني: ٤٠٣ب، عن مالك به.



موصیبەتی مردنی من صەبر و ئارامی ببەخشێتە مسوڵمانان لە بەڵاو موصیبەتەکانیاندا (واتە: مردنی من لە گشت موصیبەتەکان گەورەترە بۆیان، بۆیە با موصیبەتەکانی دیکە بە بچووك بزانن).

**٦٣٥**- عَنْ أُمِّ سَلَمَةَ ﵂، زَوْجِ النَّبِيِّ ﷺ، أَنَّ رَسُولَ اللهِ ﷺ قَالَ: مَنْ أَصَابَتْهُ مُصِيبَةٌ فَقَالَ كَمَا أَمَرَهُ اللهُ: [إِنَّا لِلَّهِ وَإِنَّا إِلَيْهِ رَاجِعُونَ] اللهُمَّ أْجُرْنِي فِي مُصِيبَتِي، وَأَعْقِبْنِي خَيْرًا مِنْهَا، إِلاَّ فَعَلَ اللهُ ذَلِكَ بِهِ، قَالَتْ أُمُّ سَلَمَةَ: فَلَمَّا تُوُفِّيَ أَبُو سَلَمَةَ، قُلْتُ ذَلِكَ، ثُمَّ قُلْتُ: وَمَنْ خَيْرٌ مِنْ أَبِي سَلَمَةَ؟ فَأَعْقَبَهَا اللهُ رَسُولَهُ ﷺ، فَتَزَوَّجَهَا[1].

واتە: لە ئوممو سەلەمەی ﵂ خێزانی پێغەمبەری خواوە ﷺ گێڕدراوەتەوە (گوتوویەتی): پێغەمبەری خوا ﷺ فەرموویەتی: هەر کەسێك بەڵا و موصیبەتێکی تووش ببێت وەك ئەوەی خوای پەروەردگار فەرمانی کردووە بڵێ: ئێمە موڵکی خواین و هەر بۆ لای ئەویش دەگەڕێینەوە. ((پەروەردگارا پاداشتم بۆ بنووسە لە موصیبەتەکەمدا، وە چاکتر لەوەی گەڕاندتەوە لەمەودوا پێم ببەخشە))، حەتمەن خوای پەروەردگار ئاوای بۆ دەکات (واتە: شوێنگرەوەی چاکتری پێ دەبەخشێ)، ئوممو سەلەمە ﵂ گوتوویەتی: جا کاتێ ئەبو سەلەمە ﵁ وەفاتی کرد (کە مێردی کۆنی بوو)، ئەو دوعایەم گوت، دواتر (لە دڵی خۆم) گوتم: جا کێ لە ئەبو سەلەمە چاکترە (کەچی ئەو دوعایە دەڵێت چاکترم بۆ بێتە شوێنی)؟ جا خوای پەروەردگار لەدوای ئەو پێغەمبەری خوای ﷺ بۆ لە شوێنی ئەبو سەلەمە دانا و پێغەمبەری خوا ﷺ ئوم سەلەمەی کرد بە هاوسەری خۆی (جا دوعاکە هاتە جێ، هاوسەرەکەی لە مسوڵمانێکی چاکەوە بوو بە گەورەی پێغەمبەران).

**٦٣٦**- عَنِ الْقَاسِمِ بْنِ مُحَمَّدٍ ﵀، أَنَّهُ قَالَ: هَلَكَتِ امْرَأَةٌ لِي، فَأَتَانِي مُحَمَّدُ بْنُ كَعْبٍ الْقُرَظِيُّ ﵁ يُعَزِّينِي بِهَا، فَقَالَ: إِنَّهُ كَانَ فِي بَنِي إِسْرَائِيلَ رَجُلٌ فَقِيهٌ عَالِمٌ عَابِدٌ مُجْتَهِدٌ، وَكَانَتْ لَهُ امْرَأَةٌ، وَكَانَ بِهَا مُعْجَبًا، وَلَهَا مُحِبًّا، فَمَاتَتْ، فَوَجَدَ عَلَيْهَا وَجْدًا شَدِيدًا، وَلَقِيَ عَلَيْهَا أَسَفًا، حَتَّى خَلاَ فِي بَيْتٍ، وَغَلَّقَ عَلَى نَفْسِهِ، وَاحْتَجَبَ مِنَ النَّاسِ، فَلَمْ يَكُنْ يَدْخُلُ عَلَيْهِ أَحَدٌ، وَإِنَّ امْرَأَةً سَمِعَتْ بِهِ، فَجَاءَتْهُ، فَقَالَتْ: إِنَّ لِي إِلَيْهِ حَاجَةً أَسْتَفْتِيهِ فِيهَا، لَيْسَ يُجْزِينِي فِيهَا إِلاَّ

---

(١) ـ صحيح. أخرجه أبو مصعب الزهري: ٩٨٥؛ والحدثاني: ٤٠٤، عن مالك به.

مُشَافَهَتُهُ، فَذَهَبَ النَّاسُ، وَلَزِمَتْ بَابَهُ، وَقَالَتْ: مَا لِي مِنْهُ بُدٌّ، فَقَالَ لَهُ قَائِلٌ: إِنَّ هَاهُنَا امْرَأَةً أَرَادَتْ أَنْ تَسْتَفْتِيَكَ، وَقَالَتْ: إِنْ أَرَدْتُ إِلاَّ مُشَافَهَتَهُ، وَقَدْ ذَهَبَ النَّاسُ، وَهِيَ لاَ تُفَارِقُ الْبَابَ، فَقَالَ: ائْذَنُوا لَهَا، فَدَخَلَتْ عَلَيْهِ، فَقَالَتْ: إِنِّي جِئْتُكَ أَسْتَفْتِيكَ فِي أَمْرٍ، قَالَ: وَمَا هُوَ؟ قَالَتْ: إِنِّي اسْتَعَرْتُ مِنْ جَارَةٍ لِي حَلْيًا، فَكُنْتُ أَلْبَسُهُ وَأُعِيرُهُ زَمَانًا، ثُمَّ إِنَّهُمْ أَرْسَلُوا إِلَيَّ فِيهِ، أَفَأُؤَدِّيهِ إِلَيْهِمْ؟ فَقَالَ: نَعَمْ، وَاللَّهِ، فَقَالَتْ: إِنَّهُ قَدْ مَكَثَ عِنْدِي زَمَانًا، فَقَالَ: ذَلِكَ أَحَقُّ لِرَدِّكِ إِيَّاهُ إِلَيْهِمْ، حِينَ أَعَارُوكِيهِ زَمَانًا، فَقَالَتْ: أَيْ يَرْحَمُكَ اللهُ، أَفَتَأْسَفُ عَلَى مَا أَعَارَكَ اللهُ، ثُمَّ أَخَذَهُ مِنْكَ وَهُوَ أَحَقُّ بِهِ مِنْكَ؟ فَأَبْصَرَ مَا كَانَ فِيهِ، وَنَفَعَهُ اللهُ بِقَوْلِهَا[1].

واتە: لە قاسمی کوڕی موحەممەدەوە ﷺ گێڕدراوەتەوە گوتوویەتی: خێزانێکم مرد، جا موحەممەدی کوڕی کەعبی قوڕەزی ﷺ هات بۆ لام و سەرەخۆشی ئافرەتەکەی لێ کردم و گوتی: لە نەوەی ئیسڕائیل پیاوێکی شەرعزانی زانای خواپەرستی موجتەهید هەبوو، جا خێزانێکی هەبوو و زۆر بەو خێزانەی سەرسام بوو و زۆر خۆشی دەویست، وەفاتی کرد، جا زۆر خەفەتبار بوو و داخێکی زۆری بۆ هەڵکێشا، تاوەکوو بەتەنها خۆی قەتیس کرد لەماڵەوە و دەرگای لەسەر خۆی داخست و بەربەستی خستە نێوان خۆی و خەڵکی (تێکەڵیان نەدەبوو)، هیچ کەسێك نەدەچوو بۆ لای، جا ئافرەتێك گوێبیستی ئەم بابەتە بوو، چوو بۆ لای و گوتی: من کارێکم هەیە پرسیاری دەربارە لێ دەکەم، کارەکەم نایەتە جێ تەنها بە قسەلەگەڵکردنی نەبێت بەڕاستەخۆ، خەڵکیش چوون، جا ئافرەتەکە لەپێش دەرگاکە نەجوڵا (هەر مایەوە تا قسەی لەگەڵ بکات و وەڵامی بداتەوە)، وە گوتی: هیچ شتێك لەم دەرگایە لامنادا، جا یەکێك گوتی: (هۆ زانا) لێرەدا ئافرەتێك هەیە دەیەوێ پرسیارت لێ بکات و دەڵێت: بە قسەلەگەڵکردن نەبێ نامەوێ، جا لە کاتێکدا خەڵك هەمووی ئامادەیە و ئافرەتەکەش لە دەرگاکە جیا نابێتەوە، پیاوە زاناکە (ناچار) گوتی: مۆڵەتی بدەن با بێتە ژوورەوە، جا چووە ژوورەوە بۆ لای و گوتی: من هاتووم بۆ لات پرسیارت لێ دەکەم دەربارەی شتێك، پیاوە زاناکەش گوتی: شتەکە چییە؟ ئافرەتەکە گوتی: من خشڵم بە خواستن وەرگرتووە لە

---

(١) ـ مقطوع صحيح. أخرجه أبو مصعب الزهري: ٩٩٨؛ والحدثاني: ٤٠٨، عن مالك به.

مُشَافَهَتُهُ، فَذَهَبَ النَّاسُ، وَلَزِمَتْ بَابَهُ، وَقَالَتْ: مَا لِي مِنْهُ بُدٌّ، فَقَالَ لَهُ قَائِلٌ: إِنَّ هَاهُنَا امْرَأَةً أَرَادَتْ أَنْ تَسْتَفْتِيَكَ، وَقَالَتْ: إِنْ أَرَدْتُ إِلاَّ مُشَافَهَتَهُ، وَقَدْ ذَهَبَ النَّاسُ، وَهِيَ لاَ تُفَارِقُ الْبَابَ، فَقَالَ: ائْذَنُوا لَهَا، فَدَخَلَتْ عَلَيْهِ، فَقَالَتْ: إِنِّي جِئْتُكَ أَسْتَفْتِيكَ فِي أَمْرٍ، قَالَ: وَمَا هُوَ؟ قَالَتْ: إِنِّي اسْتَعَرْتُ مِنْ جَارَةٍ لِي حَلْيًا، فَكُنْتُ أَلْبَسُهُ وَأُعِيرُهُ زَمَانًا، ثُمَّ إِنَّهُمْ أَرْسَلُوا إِلَيَّ فِيهِ، أَفَأُؤَدِّيهِ إِلَيْهِمْ؟ فَقَالَ: نَعَمْ، وَاللَّهِ، فَقَالَتْ: إِنَّهُ قَدْ مَكَثَ عِنْدِي زَمَانًا، فَقَالَ: ذَلِكَ أَحَقُّ لِرَدِّكِ إِيَّاهُ إِلَيْهِمْ، حِينَ أَعَارُوكِيهِ زَمَانًا، فَقَالَتْ: أَيْ يَرْحَمُكَ اللهُ، أَفَتَأْسَفُ عَلَى مَا أَعَارَكَ اللهُ، ثُمَّ أَخَذَهُ مِنْكَ وَهُوَ أَحَقُّ بِهِ مِنْكَ؟ فَأَبْصَرَ مَا كَانَ فِيهِ، وَنَفَعَهُ اللهُ بِقَوْلِهَا[1].

واتە: لە قاسمی کوڕی موحەممەدەوە ﷺ گێڕدراوەتەوە گوتوویەتی: خێزانێکم مرد، جا موحەممەدی کوڕی کەعبی قوڕەزی ﷺ هات بۆ لام و سەرەخۆشی ئافرەتەکەی لێ کردم و گوتی: لە نەوەی ئیسڕائیل پیاوێکی شەرعزانی زانای خواپەرستی موجتەهید هەبوو، جا خێزانێکی هەبوو و زۆر بەو خێزانەی سەرسام بوو و زۆر خۆشی دەویست، وەفاتی کرد، جا زۆر خەفەتبار بوو و داخێکی زۆری بۆ هەڵکێشا، تاوەکوو بەتەنها خۆی قەتیس کرد لەماڵەوە و دەرگای لەسەر خۆی داخست و بەربەستی خستە نێوان خۆی و خەڵکی (تێکەڵیان نەدەبوو)، هیچ کەسێك نەدەچوو بۆ لای، جا ئافرەتێك گوێبیستی ئەم بابەتە بوو، چوو بۆ لای و گوتی: من کارێکم هەیە پرسیاری دەربارە لێ دەکەم، کارەکەم نایەتە جێ تەنها بە قسەلەگەڵکردنی نەبێت بەڕاستەخۆ، خەڵکیش چوون، جا ئافرەتەکە لەپێش دەرگاکە نەجوڵا (هەر مایەوە تا قسەی لەگەڵ بکات و وەڵامی بداتەوە)، وە گوتی: هیچ شتێك لەم دەرگایە لامنادا، جا یەکێك گوتی: (هۆ زانا) لێرەدا ئافرەتێك هەیە دەیەوێ پرسیارت لێ بکات و دەڵێت: بە قسەلەگەڵکردن نەبێ نامەوێ، جا لە کاتێکدا خەڵك هەمووی ئامادەیە و ئافرەتەکەش لە دەرگاکە جیا نابێتەوە، پیاوە زاناکە (ناچار) گوتی: مۆڵەتی بدەن با بێتە ژوورەوە، جا چووە ژوورەوە بۆ لای و گوتی: من هاتووم بۆ لات پرسیارت لێ دەکەم دەربارەی شتێك، پیاوە زاناکەش گوتی: شتەکە چییە؟ ئافرەتەکە گوتی: من خشڵم بە خواستن وەرگرتووە لە

---

(١) ـ مقطوع صحيح. أخرجه أبو مصعب الزهري: ٩٩٨؛ والحدثاني: ٤٠٨، عن مالك به.

دراوسێیەکیان، جا من ماوەیەکی زۆرە بەخۆمی وەدەکەم و بە خواستن دەیدەم بە خەڵکی (وەکوو هی خۆمی لێ هاتووە)، جا ئێستا ئەوان کەسێکیان ناردووە بۆ لام بۆ وەرگرتنەوەی خشڵەکە، جا ئایا دەبێت هەر بیاندەمەوە؟ زاناکە گوتی: بەڵێ سوێند بەخوا، ئافرەتەکە گوتی: ئاخر ماوەیەکی زۆرە لەلای منە! زاناکەش گوتی: ئەوە وا دەکات شایستەتر بێت بیاندەیتەوە کاتێ پێیان داویت ماوەیەکی زۆرە (واتە ئەصڵەن نەدەبوو ئەو هەموو ماوەیە لەلات بێت)، ئافرەتەکەش گوتی: هەی ڕەحمەتی خوات لێ بێ، ئایا داخ و خەم و پەژارەی وا زۆر دەخۆی لەسەر ئەوەی خوای پەروەردگار بە خواستن پێی دابووی (کە خێزانەکەت بوو)؟! دواتر لێی وەرگرتیەوە لە کاتێکدا ئەو شایستەترە لە تۆ لەوەی وەریبگرێتەوە، ئیتر زاناکە دڵی ڕۆشن بۆیەوە و تاریکی ونبوونەکەی لاچوو، وە خوای پەروەردگار سوودی پێ گەیاند بە قسەی ئافرەتەکە (دەستی بە ژیانی ئاسایی و خزمەتکردنی شەرعی خوا کردەوە).

## ١٥- ئەوەی هاتووە دەربارەی موختەفی، کە بریتییە لەو کەسەی گۆڕ هەڵدەکەنێ بۆ بردنی شتومەکی مردووەکە[١]

**٦٣٧-** عَنْ مُحَمَّدِ بْنِ عَبْدِ الرَّحْمَنِ ﷺ، عَنْ أُمِّهِ عَمْرَةَ بِنْتِ عَبْدِ الرَّحْمَنِ ﷺ، أَنَّهُ سَمِعَهَا تَقُولُ: لَعَنَ رَسُولُ اللهِ ﷺ الْمُخْتَفِيَ وَالْمُخْتَفِيَةَ، يَعْنِي نَبَّاشِي الْقُبُورِ[٢].

واتە: لە موحەممەدی کوڕی عەبدوڕڕەحمانەوە ﷺ گێڕدراوەتەوە، ئەویش لە عەمرەی کچی عەبدوڕڕەحمانی دایکیەوە ﷺ گێڕاویەتەوە بەوەی گوێی لێی بووە گوتوویەتی: پێغەمبەری خوا ﷺ نەفرینی کردووە لە موختەفی و موختەفییە، واتە پیاو و ژنی گۆڕ هەڵکەن (کە گۆڕ هەڵدەکەنن بۆ بردنی شتەکانی مردووەکە وەك: کفن و ددانی زێڕ و پارە و پلاتین و ... هتد).

---

(١) ـ مَا جَاءَ فِي الْمُخْتَفِي وَهُوَ النَّبَّاشُ.

(٢) ـ ضعيف. أخرجه أبو مصعب الزهري: ٩٩٩؛ والحدثاني: ٤٠٩أ، عن مالك به.

**٦٣٨-** أَنَّ عَائِشَةَ ﵂، زَوْجَ النَّبِيِّ ﷺ كَانَتْ تَقُولُ: كَسْرُ عَظْمِ الْمُسْلِمِ مَيْتًا، كَكَسْرِهِ وَهُوَ حَيٌّ، تَعْنِي فِي الإِثْمِ[١].

واته: عائیشەی ﵂ خێزانی پێغەمبەر ﷺ دەیگوت: شکاندنی ئێسقانی مرۆڤی مسوڵمان بە مردوویی وەك شکاندنیەتی بەزیندوویی، واتە لە ڕووی تاوانەوە.

## ١٦- بابەتی جۆراوجۆر دەربارەی مردوو[٢]

**٦٣٩-** أَنَّ عَائِشَةَ ﵂، زَوْجَ النَّبِيِّ ﷺ سَمِعَتْ رَسُولَ اللهِ ﷺ قَبْلَ أَنْ يَمُوتَ، وَهُوَ مُسْتَنِدٌ إِلَى صَدْرِهَا، وَأَصْغَتْ إِلَيْهِ يَقُولُ: اللهُمَّ اغْفِرْ لِي، وَارْحَمْنِي، وَأَلْحِقْنِي بِالرَّفِيقِ الأَعْلَى[٣].

واته: عائیشەی ﵂ خێزانی پێغەمبەر ﷺ گوێی لە پێغەمبەری خوا ﷺ بوو بەر لەوەی وەفات بکات لە کاتێکدا سەری دابوو بە سینگی عائیشەوە ﵂، ئەویش سەری بۆ نزم کردبۆیەوە گوێی لە نوسکەی پێغەمبەری خوا ﷺ ڕاگرتبوو ـ دەیفەرموو: (اللهُمَّ اغْفِرْ لِي، وَارْحَمْنِي، وَأَلْحِقْنِي بِالرَّفِيقِ الأَعْلَى) واتە: پەروەردگارا لێم خۆش بە و ڕەحمم پێ بکە و بمگەیەنە بە ڕەفیقی ئەعلا (واتە ڕەفیقە هەرە بەرزەکان لە پێغەمبەران و فریشتەکان و شەهیدان و پیاوچاکان و ڕاستگۆیان).

**٦٤٠-** أَنَّ عَائِشَةَ ﵂ زَوْجَ النَّبِيِّ ﷺ، قَالَتْ: قَالَ رَسُولُ اللهِ ﷺ: مَا مِنْ نَبِيٍّ يَمُوتُ حَتَّى يُخَيَّرَ، قَالَتْ: فَسَمِعْتُهُ يَقُولُ: اللهُمَّ الرَّفِيقَ الأَعْلَى، فَعَرَفْتُ أَنَّهُ ذَاهِبٌ[٤].

واته: عائیشەی ﵂ خێزانی پێغەمبەر ﷺ گوتوویەتی: پێغەمبەری خوا ﷺ فەرموویەتی: هیچ پێغەمبەرێك نامرێت تاوەکوو سەرپشك نەکرێت (لە نێوان مانەوەی لە دونیا و گەڕانەوەی بۆ لای پەروەردگار)، عائیشە ﵂ دەڵێ: جا گوێم لێی بوو دەیفەرموو: پەروەردگارا دۆستە هەرە بەرزەکان ـ هەڵدەبژێرم ـ (واتە

---

(١) ـ ضعيف موقوفا صحيح مرفوعا. أخرجه أبو مصعب الزهري: ١٠٠٠؛ والحدثاني: ٤٠٩، كلهم عن مالك به.

(٢) ـ جَامِعُ الْجَنَائِزِ.

(٣) ـ صحيح. أخرجه أبو مصعب الزهري: ٩٨٦؛ والحدثاني: ٤٠٥؛ ومسلم: ٨٥؛ والقابسي: ٤٨٣، كلهم عن مالك به.

(٤) ـ صحيح. أخرجه أبو مصعب الزهري: ٩٨٧؛ والحدثاني: ٤٠٥أ، عن مالك به.

گەیشتن بە پێغەمبەران و فریشتەکان و خەڵکە پلە بەرزەکانی بەهەشت)، (عائیشە ـ ﷺـ دەڵێ): جا زانیم دەڕوا و وەفات دەکات.

**٦٤١-** أَنَّ عَبْدَ اللهِ بْنَ عُمَرَ ﷺ قَالَ: إِنَّ رَسُولَ اللهِ ﷺ قَالَ: إِنَّ أَحَدَكُمْ إِذَا مَاتَ، عُرِضَ عَلَيْهِ مَقْعَدُهُ بِالْغَدَاةِ وَالْعَشِيِّ، إِنْ كَانَ مِنْ أَهْلِ الْجَنَّةِ، فَمِنْ أَهْلِ الْجَنَّةِ، وَإِنْ كَانَ مِنْ أَهْلِ النَّارِ، فَمِنْ أَهْلِ النَّارِ، يُقَالُ لَهُ: هَذَا مَقْعَدُكَ، حَتَّى يَبْعَثَكَ اللهُ إِلَى يَوْمِ الْقِيَامَةِ[1].

واتە: عەبدوڵڵای کوڕی عومەر ﷺ گوتوویەتی: پێغەمبەری خوا ﷺ فەرموویەتی: یەکێك لە ئێوە کاتێ دەمرێت بەیانییان و ئێواران شوێنەکەی پیشان دەدرێ، ئەگەر خەڵکی بەهەشت بێ، ئەوە (هەر لەناو گۆڕەوە) خەڵکی بەهەشتە (جێگەکەی خۆی دەبینێت و خۆشی و شادی پێ دەگات)، وە ئەگەر لە خەڵکی دۆزەخ بێ، ئەوە (هەر لە ناو گۆڕەوە) خەڵکی ئاگرە (سزا دەدرێت و شوێنەکەی دەبینێ لە دۆزەخ)، بە هەر یەکەیان دەگوترێت: ئەوە جێگەتە تاوەکوو خوای پەروەردگار زیندووت دەکاتەوە لە ڕۆژی دواییدا.

**٦٤٢-** عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ ﷺ، أَنَّ رَسُولَ اللهِ ﷺ قَالَ: كُلُّ ابْنِ آدَمَ تَأْكُلُهُ الأَرْضُ، إِلاَّ عَجْبَ الذَّنَبِ، مِنْهُ خُلِقَ، وَفِيهِ يُرَكَّبُ[2].

واتە: لە ئەبو هوڕەیرەوە ﷺ گێردراوەتەوە (گوتوویەتی): پێغەمبەری خوا ﷺ فەرموویەتی: گشت لاشەی نەوەی ئادەم زەوی دەیخوات، جگە لە کلێنجە (کە بەشێکی بچووکە بەئەندازەی دەنکە نیسکێکە دەکەوێتە خوارەوەی بڕبڕەی پشت)، سەرەتا لەوەوە دروست بووە و لەویشەوە دروست دەکرێتەوە (لە ڕۆژی دواییدا).

**٦٤٣-** أَنَّ كَعْبَ بْنَ مَالِكٍ ﷺ كَانَ يُحَدِّثُ، أَنَّ رَسُولَ اللهِ ﷺ قَالَ: إِنَّمَا نَسَمَةُ الْمُؤْمِنِ طَيْرٌ يَعْلَقُ فِي شَجَرِ الْجَنَّةِ، حَتَّى يَرْجِعَهُ اللهُ إِلَى جَسَدِهِ يَوْمَ يَبْعَثُهُ[3].

---

(١) ـ صحيح. أخرجه أبو مصعب الزهري: ٩٩٠؛ والحدثاني: ٤١٠؛ وابن حنبل: ٥٩٢٦؛ والبخاري: **١٣٧٩**؛ ومسلم: ٦٥؛ والنسائي: ٢٠٧٢؛ وابن حبان: ٣١٣٠؛ والقابسي: ٢٠٧، كلهم عن مالك به.

(٢) ـ صحيح. أخرجه أبو مصعب الزهري: ٩٩١؛ والحدثاني: ٤١٠أ؛ والبخاري: ٥٣٥٢؛ وأبو داود: ٤٧٤٣؛ **وابن** حبان: ٣١٣٨؛ والقابسي: ٣٤١، كلهم عن مالك به.

(٣) ـ صحيح. أخرجه أبو مصعب الزهري: ٩٩٢؛ والحدثاني: ٤٠٦أ؛ وابن حنبل: ١٥٨١٦؛ والنسائي: ٢٠٧٣؛ **وابن** ماجه: ٤٣٢٥؛ والقابسي: ٧٢، كلهم عن مالك به.




واتە: كەعبی كوڕی مالیك ﷺ دەیگوت: پێغەمبەری خوا ﷺ فەرموویەتی: ڕوحی مرۆڤی مسوڵمان باڵندەیە لانەی خۆی هەڵدەواسێ بە درەختی بەهەشتەوە، تاوەكوو خوای پەروەردگار دەیگەڕێنێتەوە بۆ جەستەكەی لەو ڕۆژەی زیندووی دەكاتەوە.

**٦٤٤-** عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ ﷺ، أَنَّ رَسُولَ اللهِ ﷺ قَالَ: قَالَ اللهُ تعالى: إِذَا أَحَبَّ عَبْدِي لِقَائِي أَحْبَبْتُ لِقَاءَهُ، وَإِذَا كَرِهَ لِقَائِي كَرِهْتُ لِقَاءَهُ[1].

واتە: لە ئەبو هوڕەیڕەوە ﷺ گێڕدراوەتەوە (گوتوویەتی): پێغەمبەری خوا ﷺ فەرموویەتی: خوای بەرز و بڵند فەرموویەتی: ئەگەر بەندەكەم حەزی بە دیداری من كرد، منیش حەز بە دیداری ئەو دەكەم، وە ئەگەر حەزی بە دیداری من نەكرد، منیش حەز بە دیداری ئەو ناكەم.

**٦٤٥-** عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ ﷺ، أَنَّ رَسُولَ اللهِ ﷺ قَالَ: قَالَ رَجُلٌ لَمْ يَعْمَلْ حَسَنَةً قَطُّ لأَهْلِهِ، إِذَا مَاتَ فَحَرِّقُوهُ، ثُمَّ أَذْرُوا نِصْفَهُ فِي الْبَرِّ، وَنِصْفَهُ فِي الْبَحْرِ، فَوَاللَّهِ لَئِنْ قَدَرَ اللهُ عَلَيْهِ، لَيُعَذِّبَنَّهُ عَذَابًا لاَ يُعَذِّبُهُ أَحَدًا مِنَ الْعَالَمِينَ، فَلَمَّا مَاتَ الرَّجُلُ، فَعَلُوا مَا أَمَرَهُمْ بِهِ، فَأَمَرَ اللهُ الْبَرَّ فَجَمَعَ مَا فِيهِ، وَأَمَرَ الْبَحْرَ فَجَمَعَ مَا فِيهِ، ثُمَّ قَالَ: لِمَ فَعَلْتَ هَذَا؟ قَالَ: مِنْ خَشْيَتِكَ يَا رَبِّ، وَأَنْتَ أَعْلَمُ، قَالَ: فَغَفَرَ لَهُ[2].

واتە: لە ئەبو هوڕەیڕەوە ﷺ گێڕدراوەتەوە (گوتوویەتی): پێغەمبەری خوا ﷺ فەرموویەتی: پیاوێك كە هەرگیز یەك چاكەشی نەكردبوو (تەنها ئەوەندە نەبێ بڕوادار بوو) بە خانەوادەكەی گوت: ئەگەر مرد بیسوتێنن، دواتر نیوەی (خۆڵەمێشەكە) پەرش و بڵاو بكەنەوە لە وشكانیدا، وە نیوەشی بخەنە ناو دەریاوە، چونكە سوێند بە خوا ئەگەر خوا بتوانێ زیندووم بكاتەوە ئەوە سزایێكم دەدات هەرچی مرۆڤی تاوانبارە ئاوا سزا نادرێ، جا كە پیاوەكە مرد، ئەوەیان ئەنجام دا كە فەرمانی پێ كردبوون، جا خوای پەروەردگار ﷻ فەرمانی بە وشكانی كرد و

---

(١) ـ صحيح. أخرجه أبو مصعب الزهري: ٩٩٤؛ والحدثاني: ٤٠٩ب؛ والبخاري: ٧٥٠٤؛ والنسائي: ١٨٣٥؛ وابن حبان: ٣٦٣؛ والقابسي: ٣٤٠، كلهم عن مالك به.

(٢) ـ صحيح. أخرجه أبو مصعب الزهري: ٩٩٣؛ والحدثاني: ٤٠٧؛ والبخاري: ٧٥٠٦؛ ومسلم: ٢٤؛ والقابسي: ٣٣٧، كلهم عن مالك به.

وشکانی هەموو ئەوەی کۆ کردەوە کە تیایدا پەرش و بڵاو کرابوو، وە فەرمانی بە دەریا کرد دەریاش هەموو ئەوەی کۆ کردەوە کە لەناویدا پەرش و بڵاو کرابویەوە، دواتر بە پیاوەکەی فەرموو: بۆچی ئەو وەسیەتەت کرد؟ گوتی: لەبەر ترس لە تۆ ئەی پەروەردگارا تۆش زاناتری، دەڵێ: جا لێی خۆش بوو[١].

**٦٤٦- عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ ﷺ، أَنَّ رَسُولَ اللهِ ﷺ قَالَ: كُلُّ مَوْلُودٍ يُولَدُ عَلَى الْفِطْرَةِ، فَأَبَوَاهُ يُهَوِّدَانِهِ أَوْ يُنَصِّرَانِهِ، كَمَا تُنَاتَجُ الإِبِلُ مِنْ بَهِيمَةٍ جَمْعَاءَ، هَلْ تُحِسُّ فِيهَا مِنْ جَدْعَاءَ؟ قَالُوا: يَا رَسُولَ اللهِ، أَرَأَيْتَ الَّذِي يَمُوتُ وَهُوَ صَغِيرٌ؟ قَالَ: اللهُ أَعْلَمُ بِمَا كَانُوا عَامِلِينَ[٢].**

واتە: لە ئەبو هورەیرەوە ﷺ گێردراوەتەوە (گوتوویەتی): پێغەمبەری خوا ﷺ فەرموویەتی: گشت منداڵێك لەسەر فیترەت و سروشت و دینی خوا لەدایك دەبێت (واتە ڕۆحەکەی پەیمانی بەندایەتی خوای داوە)، جا دایك و باوکی دەیکەن بە جوولەکە یان دەیکەن بە گاور، هەر وەك چۆن وشتر بێچووی بێعەیبی دەبێ، ئایا هیچ کلکبڕاو و گوێبڕاو و عەیبدارێکی تیادا دەبینن (ئەوە خەڵکە کلك و گوێی دەبڕن)؟! گوتیان: ئەی پێغەمبەری خوا ﷺ چی دەفەرمووی دەربارەی ئەو منداڵەی دەمرێت لە کاتێکدا بچووکە (سەرەنجامی چییە)؟ فەرمووی: خوای پەروەردگار زاناترە بەوەی لەمەودوا ئەنجامیان دەدا (ئەگەر بمابان، بەڵام لە ئێستادا هیچ حوکمێکیان لەسەر نییە لە ڕووی کردارەوە، نە بەهەشت نە دۆزەخ، بەڵام بە هۆی لوتفی خودا دەخرێنە بەهەشتەوە).

**٦٤٧- عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ ﷺ، أَنَّ رَسُولَ اللهِ ﷺ قَالَ: لاَ تَقُومُ السَّاعَةُ حَتَّى يَمُرَّ الرَّجُلُ بِقَبْرِ الرَّجُلِ، فَيَقُولُ: يَا لَيْتَنِي مَكَانَهُ[٣].**

---

(١) ـ تێبینی: ئەم پیاوە بڕوادار بووە، لەگەڵ ئەوەش زۆر لە خوا ترساوە پێش مردنی، بەڵام جوان شارەزای سیفاتەکانی خوا نەبووە، بۆیە گوتوویەتی ئاوام لێ بکەن بەشکوو خوا زیندووم نەکاتەوە، بەڵام نەزانینیەکە بۆی بۆتە عوزر بۆیە خوای پەروەردگار ئەوەی بۆ بە کوفر ئەژمار نەکردووە، تەوحید و ترسەکەش بوونەتە شەفاعەتکار و هۆکاری لێخۆشبوون، لە کاتێکدا، تەنها باوەڕی هەبووە، هیچ کردەوەی چاکی نەبووە!

(٢) ـ صحيح. أخرجه أبو مصعب الزهري: ٩٩٥؛ وأبو داود: ٤٧١٤؛ وابن حبان: ١٣٣؛ والقابسي: ٣٣٨، كلهم عن مالك به.

(٣) ـ صحيح. أخرجه أبو مصعب الزهري: ٩٧٥؛ والحدثاني: ٤٠١أ؛ وابن حنبل: ٧٢٢٦؛ والبخاري: ٧١١٥؛ ومسلم: ٥٣؛ وابن حبان: ٦٧٠٧؛ والقابسي: ٣٣٩، كلهم عن مالك به.




واتە: لە ئەبو هورەیرەوە ﷺ گێردراوەتەوە (گوتوویەتی): قیامەت هەڵناستێت تاوەکوو مرۆڤ بەلای گۆڕی کەسێکدا تێپەڕ دەبێت و دەڵێت: بریا لە جێگەی ئەو بوومایە (ئەوەندە زەمانەکە ناخۆش و خراپ دەبێت).

**٦٤٨-** عَنْ أَبِي قَتَادَةَ بْنِ رِبْعِيٍّ ﷺ، أَنَّهُ كَانَ يُحَدِّثُ؛ أَنَّ رَسُولَ اللهِ ﷺ مُرَّ عَلَيْهِ بِجَنَازَةٍ، فَقَالَ: مُسْتَرِيحٌ وَمُسْتَرَاحٌ مِنْهُ، فَقَالُوا: يَا رَسُولَ اللهِ، مَا الْمُسْتَرِيحُ وَمَا الْمُسْتَرَاحُ مِنْهُ؟ قَالَ: الْعَبْدُ الْمُؤْمِنُ يَسْتَرِيحُ مِنْ نَصَبِ الدُّنْيَا وَأَذَاهَا، إِلَى رَحْمَةِ اللهِ، وَالْعَبْدُ الْفَاجِرُ يَسْتَرِيحُ مِنْهُ الْعِبَادُ وَالْبِلاَدُ، وَالشَّجَرُ وَالدَّوَابُّ[١].

واتە: لە ئەبو قەتادەی کوڕی ڕیبعییەوە ﷺ گێردراوەتەوە باسی دەکرد دەیگوت: پێغەمبەری خوا ﷺ جەنازەیەکی بەلادا تێپەڕێنرا و فەرمووی: یان ئەرخەیان بوو یان لەدەستی ئەرخەیان بوون، هاوەڵانیش گوتیان: ئەی پێغەمبەری خوا ﷺ یان ئەرخەیان و یان لەدەستی ئەرخەیان بوون چییە؟ فەرمووی: مرۆڤی باوەڕدار ئەرخەیان دەبێت بە ڕزگاربوون لە ناخۆشی و ئازاری دونیا، دەچێت بۆ ڕەحمەتی خوا، بەندەی خراپەکاریش بەندەکان و مەملەکەت و درەخت و ئاژەڵ ئەرخەیان و ڕزگار دەبن لەدەستی بە هۆی مردنی.

**٦٤٩-** عَنْ أَبِي النَّضْرِ، مَوْلَى عُمَرَ بْنِ عُبَيْدِ اللهِ ﷺ، أَنَّهُ قَالَ: قَالَ رَسُولُ اللهِ ﷺ، لَمَّا مَاتَ عُثْمَانُ بْنُ مَظْعُونٍ ﷺ، وَمُرَّ بِجَنَازَتِهِ: ذَهَبْتَ وَلَمْ تَلَبَّسْ مِنْهَا بِشَيْءٍ[٢].

واتە: لە ئەبو نەزڕی خزمەتکاری عومەری کوڕی عوبەیدوڵلاوە ﷺ گێردراوەتەوە گوتوویەتی: کاتێ عوسمانی کوڕی مەزعون ﷺ مرد و خەڵك بەلای جەنازەکەیدا دەڕۆیشت، پێغەمبەری خوا ﷺ فەرمووی: ڕۆیشتیت و هیچی وات لە دونیا بەکارنەهێنا (واتە زۆر زاهید و کەمویست ژیای لە دونیا).

---

(١) ـ صحيح. أخرجه أبو مصعب الزهري: ١٠٢٧؛ والحدثاني: ٣٩٩أ؛ والبخاري: ٦٥١٢؛ ومسلم: ٦١؛ والنسائي: ١٩٣٠؛ وابن حبان: ٣٠١٢؛ والقابسي: ١٠١، كلهم عن مالك به.

(٢) ـ ضعيف. أخرجه أبو مصعب الزهري: ٩٨٩؛ والحدثاني: ٤٠٦ب، عن مالك به.

**٦٥٠-** عَنْ عَلْقَمَةَ بْنِ أَبِي عَلْقَمَةَ ﵀، عَنْ أُمِّهِ ﵂، أَنَّهَا قَالَتْ: سَمِعْتُ عَائِشَةَ، زَوْجَ النَّبِيِّ ﷺ تَقُولُ: قَامَ رَسُولُ اللهِ ﷺ ذَاتَ لَيْلَةٍ، فَلَبِسَ ثِيَابَهُ، ثُمَّ خَرَجَ، قَالَتْ: فَأَمَرْتُ جَارِيَتِي بَرِيرَةَ تَتْبَعُهُ، فَتَبِعَتْهُ، حَتَّى جَاءَ الْبَقِيعَ، فَوَقَفَ فِي أَدْنَاهُ مَا شَاءَ اللهُ أَنْ يَقِفَ، ثُمَّ انْصَرَفَ، فَسَبَقَتْهُ بَرِيرَةُ، فَأَخْبَرَتْنِي، فَلَمْ أَذْكُرْ لَهُ شَيْئًا حَتَّى أَصْبَحَ، ثُمَّ ذَكَرْتُ ذَلِكَ لَهُ، فَقَالَ: إِنِّي بُعِثْتُ إِلَى أَهْلِ الْبَقِيعِ لأُصَلِّيَ عَلَيْهِمْ[١].

واتە: لە عەلقەمەی کوڕی ئەبو عەلقەمەوە ﵀ گێڕدراوەتەوە، ئەویش لە دایکیەوە ﵂ گێڕاویەتەوە بەوەی گوتوویەتی: گوێم لە عائیشەی ﵂ خێزانی پێغەمبەر ﷺ بوو دەیگوت: پێغەمبەری خوا ﷺ شەوێکیان هەڵسا و جلەکانی لەبەر کرد، دواتر چووە دەرەوە، عائیشە ﵂ دەڵێ: منیش فەرمانم بە بەریرەی خزمەتکارم کرد بەدوایدا بڕوات (تا هەڵسوکەوت و سوننەتی زیاتری پێغەمبەری خوام ﷺ دەستکەوێ)، ئەویش بەدوایدا ڕۆیشت، تاوەکوو چووە گۆڕستانی بەقیع و لە سەرەتاکەی وەستا ئەوەندەی خوا مۆڵەتی لەسەر بوو بوەستێ، دواتر ڕۆیشت، جا بەریرە پێشی کەوت و بەر لە پێغەمبەری خوا ﷺ گەڕایەوە و هەواڵی پێدام، منیش هیچم بۆ باس نەکرد تا بەیانی کردەوە، دواتر ئەوەم بۆ باس کرد (کە بۆچی چوویت بۆ بەقیع)، ئەویش فەرمووی: من نێردرام و فەرمانم پێ کرا بچم بۆ لای ئەهلی بەقیع تاوەکوو دوعایان بۆ بکەم.

**٦٥١-** أَنَّ أَبَا هُرَيْرَةَ ﵁ قَالَ: أَسْرِعُوا بِجَنَائِزِكُمْ، فَإِنَّمَا هُوَ خَيْرٌ تُقَدِّمُونَهُمْ إِلَيْهِ، أَوْ شَرٌّ تَضَعُونَهُ عَنْ رِقَابِكُمْ[٢].

واتە: ئەبو هوڕەیرە ﵁ گوتوویەتی: پەلە لە بەجێگەیاندنی مردووەکانتان بکەن، چونکە یان جێگە و مەنزڵی چاك و بەختەوەری هەیە دەیبەن بۆ ئەوێ (ئەگەر کەسێکی چاك بووبێت)، یان جێگە و مەنزڵی خراپ و بەدبەختی هەیە لە کۆڵی خۆتانی دەکەنەوە (ئەگەر کەسێکی خراپ بووبێت).

---

(١) ـ حسن. أخرجه أبو مصعب الزهري: ٩٨٨؛ والحدثاني: ٤٠٦؛ والنسائي: ٢٠٣٨؛ وابن حبان: ٣٧٤٨؛ والقابسي: ٤٠٥، كلهم عن مالك به.

(٢) ـ صحيح. أخرجه أبو مصعب الزهري: ١٠٢٨؛ والحدثاني: ٣٩٩ب؛ والشيباني: ٣٠٦، كلهم عن مالك به.

## ١- ئەو شتانەی زەكاتیان تێدا واجبە[١]

**٦٥٢-** عَنْ عَمْرِو بْنِ يَحْيَى الْمَازِنِيِّ ﵀، عَنْ أَبِيهِ ﵀، أَنَّهُ قَالَ: سَمِعْتُ أَبَا سَعِيدٍ الْخُدْرِيَّ ﵁ يَقُولُ: قَالَ رَسُولُ اللهِ ﷺ: لَيْسَ فِيمَا دُونَ خَمْسِ ذَوْدٍ صَدَقَةٌ، وَلَيْسَ فِيمَا دُونَ خَمْسِ أَوَاقٍ صَدَقَةٌ، وَلَيْسَ فِيمَا دُونَ خَمْسَةِ أَوْسُقٍ صَدَقَةٌ[٢].

واتە: لە عەمری كوڕی یەحیای مازینییەوە ﵀ گێڕدراوەتەوە، ئەویش لە باوكیەوە ﵀ گێڕاویەتەوە گوتوویەتی: گوێم لە ئەبو سەعیدی خودریی بوو ﵁ دەیگوت: پێغەمبەری خوا ﷺ فەرموویەتی: لە پێنج وشتر كەمتر زەكاتی تێدا نییە، وە كەمتر لە پێنج ئۆقیە زیو (كە دەكاتە دوو سەد درهەم، واتە دوو سەد مسقاڵ زیو) زەكاتی تێدا نییە، وە (لە دانەوێڵەدا) كەمتر لە پێنج وەسق (واتە پێنج بار، كە دەكاتە چل تەنەكە) زەكات نییە.

**٦٥٣-** عَنْ أَبِي سَعِيدٍ الْخُدْرِيِّ ﵁، أَنَّ رَسُولَ اللهِ ﷺ قَالَ: لَيْسَ فِيمَا دُونَ خَمْسَةِ أَوْسُقٍ مِنَ التَّمْرِ صَدَقَةٌ، وَلَيْسَ فِيمَا دُونَ خَمْسِ أَوَاقٍ مِنَ الْوَرِقِ صَدَقَةٌ، وَلَيْسَ فِيمَا دُونَ خَمْسِ ذَوْدٍ مِنَ الإِبِلِ صَدَقَةٌ[٣].

واتە: لە ئەبو سەعیدی خودرییەوە ﵁ گێڕدراوەتەوە (گوتوویەتی): پێغەمبەری خوا ﷺ فەرموویەتی: لە خورمادا كەمتر لە پێنج وەسق (واتە پێنج بار، كە دەكاتە چل تەنەكە) زەكات نییە، وە لە كەمتر لە پێنج ئۆقیە زیو زەكات نییە، وە لە كەمتر لە پێنج وشتر زەكات نییە.

**٦٥٤-** عَنْ مَالِكٍ ﵀؛ أَنَّهُ بَلَغَهُ، أَنَّ عُمَرَ بْنَ عَبْدِ الْعَزِيزِ ﵀ كَتَبَ إِلَى عَامِلِهِ عَلَى دِمَشْقَ فِي الصَّدَقَةِ: إِنَّمَا الصَّدَقَةُ فِي الْحَرْثِ، وَالْعَيْنِ، وَالْمَاشِيَةِ.

---

(١) ـ مَا تَجِبُ فِيهِ الزَّكَاةُ.

(٢) ـ صحيح. أخرجه أبو مصعب الزهري: ٦٣٤؛ والحدثاني: ٢٠٨؛ والشافعي: ٣٩٤؛ وفي: ٤٢٤؛ وفي: ٤٣٠؛ وأبو داود: ١٥٥٨؛ والقابسي: ٤٠٢، كلهم عن مالك به.

(٣) ـ صحيح. أخرجه أبو مصعب الزهري: ٦٣٥؛ والحدثاني: ٢٠٨أ؛ والشيباني: ٣٢٥؛ والشافعي: ٣٩٢؛ وفي: ٣٩٤؛ وفي: ٤٢٣؛ وفي: ٤٢٤؛ والبخاري: ١٤٤٧، وفي: ١٤٥٩؛ والنسائي: ٢٤٧٤؛ والقابسي: ٩٢، كلهم عن مالك به.

قَالَ مَالِكٌ ﷺ: وَلاَ تَكُونُ الصَّدَقَةُ إِلاَّ فِي ثَلاَثَةِ أَشْيَاءَ: فِي الْحَرْثِ، وَالْعَيْنِ، وَالْمَاشِيَةِ[١].

واتە: لە ئیمامی مالیكەوە ﷺ گێڕدراوەتەوە پێی گەیشتووە عومەری كوڕی عەبدولعەزیز ﷺ دەربارەی زەكات بۆ فەرمانبەری خۆی كە (فەرمانبەر بوو) بەسەر دیمەشقەوە نووسی: زەكات تەنها لە كشتوكاڵ و زێڕ و زیو و پارە و وشتر و مانگا (و گامێش) و بزن و مەڕدا هەیە.

ئیمامی مالیك ﷺ گوتوویەتی: زەكات نییە تەنها لە سێ بابەتدا نەبێ: لە كشتوكاڵ، لە زێڕ و زیو و پارە، لە وشتر و مانگا (و گامێش) و بزن و مەڕ.

## ٢- زەكاتی كانزای زێڕ و زیو[٢]

٦٥٥- عَنْ مُحَمَّدِ بْنِ عُقْبَةَ، مَوْلَى الزُّبَيْرِ ﷺ، أَنَّهُ سَأَلَ الْقَاسِمَ بْنَ مُحَمَّدٍ ﷺ عَنْ مُكَاتَبٍ لَهُ، قَاطَعَهُ بِمَالٍ عَظِيمٍ، هَلْ عَلَيْهِ فِيهِ زَكَاةٌ؟ فَقَالَ الْقَاسِمُ بْنُ مُحَمَّدٍ ﷺ: إِنَّ أَبَا بَكْرٍ الصِّدِّيقَ ﷺ لَمْ يَكُنْ يَأْخُذُ مِنْ مَالٍ زَكَاةً، حَتَّى يَحُولَ عَلَيْهِ الْحَوْلُ.

قَالَ الْقَاسِمُ بْنُ مُحَمَّدٍ ﷺ: وَكَانَ أَبُو بَكْرٍ ﷺ إِذَا أَعْطَى النَّاسَ أَعْطِيَاتِهِمْ، يَسْأَلُ الرَّجُلَ: هَلْ عِنْدَكَ مِنْ مَالٍ وَجَبَتْ عَلَيْكَ فِيهِ الزَّكَاةُ؟ فَإِنْ قَالَ: نَعَمْ، أَخَذَ مِنْ عَطَائِهِ زَكَاةَ ذَلِكَ الْمَالِ، وَإِنْ قَالَ: لاَ، أَسْلَمَ إِلَيْهِ عَطَاءَهُ، وَلَمْ يَأْخُذْ مِنْهُ شَيْئًا[٣].

واتە: لە موحەممەدی كوڕی عوقبەی خزمەتكاری زوبەیرەوە ﷺ گێڕدراوەتەوە بەوەی پرسیاری لە قاسمی كوڕی موحەممەد ﷺ كردووە دەربارەی بەندەیەكی نووسراوپێدراوی خۆی كە ماڵێكی زۆری لێ وەرگرتووە بەر لە كاتی دیاریكراو تاوەكوو زوو ئازاد بێ، ئایا زەكاتی تێدا واجبە؟ قاسمی كوڕی موحەممەدیش ﷺ گوتی: ئەبو بەكری صدیق ﷺ زەكاتی لە هیچ ماڵ و سامانێك وەرنەدەگرت تاوەكوو ساڵی بەسەردا نەسوڕابایەوە.

---

(١) ـ مقطوع ضعيف. أخرجه أبو مصعب الزهري: ٦٣٦، عن مالك به.

(٢) ـ الزَّكَاةُ فِي الْعَيْنِ مِنَ الذَّهَبِ وَالْوَرِقِ.

(٣) ـ ضعيف. أخرجه أبو مصعب الزهري: ٦٣٨؛ والشيباني: ٣٢٧، عن مالك به.

قاسمی کوڕی موحەممەد ﷺ گوتوویەتی: ئەبو بەکر ﷺ کاتێ بەخشینەکانی دەدا بە خەڵکی پرسیاری لە کەسەکە دەکرد: ئایا سەروەتێکت هەیە زەکاتی لەسەرت واجب بێت تیایدا؟ جا ئەگەر بیگوتبایە: بەڵێ، ئەوە لە بەخششەکە زەکاتی سەروەتەکەی دەگێڕایەوە، وە ئەگەر بیگوتبایە: نەخێر، ئەوە بەخششەکەی تەسلیم دەکرد و هیچی لێ نەدەگێڕایەوە.

٦٥٦- عَنْ عَائِشَةَ بِنْتِ قُدَامَةَ ﷺ، عَنْ أَبِيهَا ﷺ، أَنَّهُ قَالَ: كُنْتُ إِذَا جِئْتُ عُثْمَانَ بْنَ عَفَّانَ ﷺ أَقْبِضُ عَطَائِي، سَأَلَنِي: هَلْ عِنْدَكَ مِنْ مَالٍ وَجَبَتْ عَلَيْكَ فِيهِ الزَّكَاةُ؟ قَالَ: فَإِنْ قُلْتُ: نَعَمْ، أَخَذَ مِنْ عَطَائِي زَكَاةَ ذَلِكَ الْمَالِ، وَإِنْ قُلْتُ: لاَ، دَفَعَ إِلَيَّ عَطَائِي[1].

واتە: لە عائیشەی کچی قودامەوە ﷺ گێڕدراوەتەوە، ئەویش لە باوکیەوە ﷺ گێڕاویەتەوە گوتوویەتی: کاتێ دەچووم بۆ لای عوسمانی کوڕی عەففان ﷺ تا بەخششەکەم وەربگرم، پرسیاری لێ دەکردم: ئایا سەروەتێکت هەیە زەکات تیایدا لەسەرت واجب بوویێت؟ دەڵێ: ئەگەر بمگوتبایە: بەڵێ، ئەوە لە بەخششەکە زەکاتی سەروەتەکەی وەردەگرت، وە ئەگەر بمگوتایە: نەخێر، ئەوە بەخششەکەی پێ دەدام.

٦٥٧- أَنَّ عَبْدَ اللهِ بْنَ عُمَرَ ﷺ كَانَ يَقُولُ: لاَ تَجِبُ فِي مَالٍ زَكَاةٌ حَتَّى يَحُولَ عَلَيْهِ الْحَوْلُ[2].

واتە: عەبدوڵڵای کوڕی عومەر ﷺ دەیگوت: لە هیچ سەروەتێکدا زەکات واجب نابێت تاوەکوو ساڵی بەسەردا نەسوڕێتەوە.

٦٥٨- عَنِ ابْنِ شِهَابٍ ﷺ، أَنَّهُ قَالَ: أَوَّلُ مَنْ أَخَذَ مِنَ الأَعْطِيَةِ الزَّكَاةَ، مُعَاوِيَةُ بْنُ أَبِي سُفْيَانَ ﷺ[3].

واتە: لە ئیبنو شیهابەوە ﷺ گێڕدراوەتەوە گوتوویەتی: یەکەم کەس کە زەکاتی وەرگرت لە دیاری و بەخشش، موعاویەی کوڕی ئەبو سوفیان ـ ﷺ ـ بوو (ئەو بۆچوونی وا بوو زەکات لە بەخششیشدا هەیە بەر لەوەی ساڵی بەسەردا بسوڕێتەوە).

---

(١) ـ صحيح. أخرجه أبو مصعب الزهري: ٦٣٩؛ والشيباني: ٣٢٨؛ والشافعي: ٤٠٥، كلهم عن مالك به.

(٢) ـ صحيح. أخرجه أبو مصعب الزهري: ٦٤٠؛ والحدثاني: ٢٠٨ب؛ والشيباني: ٣٢٦؛ والشافعي: ٤٠٤، كلهم عن مالك به.

(٣) ـ مقطوع صحيح. أخرجه أبو مصعب الزهري: ٦٤١؛ والحدثاني: ٢٠٨ج، عن مالك به.





٦٥٩- **[فتوى]** قَالَ مَالِكٌ ﷺ: السُّنَّةُ الَّتِي لاَ اخْتِلاَفَ فِيهَا عِنْدَنَا، أَنَّ الزَّكَاةَ تَجِبُ فِي عِشْرِينَ دِينَارًا، كَمَا تَجِبُ فِي مِائَتَيْ دِرْهَمٍ(١).

(فەتوا): واتە: ئیمامی مالیك ﷺ گوتوویەتی: ئەو بڕیارەی ڕاجیایی تیا نییە لەلای ئێمە (لە مەدینە)، بریتییە لەوەی زەکات واجبە لە بیست دیناردا (واتە لە بیست مسقاڵ زێڕدا)، وەك چۆن واجبە لە دوو سەد درهەمدا (واتە لە دوو سەد مسقاڵ زیودا).

٦٦٠- **[فتوى]** قَالَ مَالِكٌ ﷺ: وَلَيْسَ فِي عِشْرِينَ دِينَارًا نَاقِصَةً بَيِّنَةَ النُّقْصَانِ زَكَاةٌ، فَإِنْ زَادَتْ حَتَّى تَبْلُغَ بِزِيَادَتِهَا عِشْرِينَ دِينَارًا وَازِنَةً، فَفِيهَا الزَّكَاةُ، وَلَيْسَ فِيمَا دُونَ عِشْرِينَ دِينَارًا عَيْنًا زَكَاةٌ، وَلَيْسَ فِي مِائَتَيْ دِرْهَمٍ نَاقِصَةً بَيِّنَةَ النُّقْصَانِ زَكَاةٌ، فَإِنْ زَادَتْ حَتَّى تَبْلُغَ بِزِيَادَتِهَا مِائَتَيْ دِرْهَمٍ وَافِيَةً، فَفِيهَا الزَّكَاةُ، فَإِنْ كَانَتْ تَجُوزُ بِجَوَازِ الْوَازِنَةِ، رَأَيْتُ فِيهَا الزَّكَاةَ، دَنَانِيرَ كَانَتْ أَوْ دَرَاهِمَ(٢).

(فەتوا): واتە: ئیمامی مالیك ﷺ گوتوویەتی: کەمتر لە بیست دینار کە بەڕوونی بزانرێ کەمترە لە بیست دینار، زەکاتی تیا نییە، جا ئەگەر زیاد بوو تاوەکوو بە زیادەکە گەیشتە ئەندازەی بیست دینار بە پێی کێشان (واتە بیست مسقاڵ)، ئەوە زەکاتی تیایە، وە لە کەمتر لە بیست دیناری زێڕ (کە دەکاتە بیست مسقاڵ زێر) زەکات نییە، وە لە ئەندازەی کەمتر لە دوو سەد درهەمی زیو کە کەمترییەکەی ڕوون بێ، زەکات نییە، جا ئەگەر زیاد بوو تاوەکوو بە زیادەکەوە گەیشتە ئاستی دوو سەد درهەمی تەواو، ئەوە زەکاتی تیایە، وە ئەگەر پڕ دەبۆیەوە بەهۆی (هەندێك) لە تەرازووەکان (واتە لە هەندێك لە تەرازووەکان دوو سەت درهەم دەردەچوو و کەمتر دەرنەدەچوو، لە هەندێکیش کەمتر دەردەچوو)، ئەوە پێم وایە زەکاتی تێدا واجبە، جا دینار بێت یان درهەم بێت.

---

(١) ـ أخرجه أبو مصعب الزهري: ٦٤٢، عن مالك به.

(٢) ـ أخرجه أبو مصعب الزهري: ٦٤٣، عن مالك به.





٦٦١- **[فتوى]** قَالَ مَالِكٌ ﷺ: فِي رَجُلٍ كَانَتْ عِنْدَهُ سِتُّونَ وَمِئَةُ دِرْهَمٍ وَازِنَةً، وَصَرْفُ الدَّرَاهِمِ بِبَلَدِهِ ثَمَانِيَةُ دَرَاهِمَ بِدِينَارٍ: أَنَّهَا لاَ تَجِبُ فِيهَا الزَّكَاةُ، وَإِنَّمَا تَجِبُ فِي عِشْرِينَ دِينَارًا عَيْنًا، أَوْ مِائَتَيْ دِرْهَمٍ[1].

(فەتوا): واتە: ئیمامی مالیك ﷺ دەربارەی پیاوێك كە سەد و شێست درهەمی تەواوی هەیە و گۆڕینەوەی درهەم بە دینار لە شارەكەی ئەو بریتییە لە گۆڕینەوەی هەشت درهەم بە یەك دیناری زێڕ (كە سەد و شێست درهەمەكە بۆ ئەو دەكاتە بیست دینار) گوتوویەتی: زەكاتی تیا نییە (مادەم نەیگۆڕیبێتەوە بە دینار)، چونكە زەكات تەنها لە خودی بیست دینار، یان خودی دوو سەد درهەمدا واجبە (نەك لە نرخەكەیان بەراورد بەوەی دیكە، كەواتە ئەوەی بەمەرج گیراوە وەزنەكەیەتی نەك نرخەكەی).

٦٦٢- **[فتوى]** قَالَ مَالِكٌ ﷺ: فِي رَجُلٍ كَانَتْ لَهُ خَمْسَةُ دَنَانِيرَ مِنْ فَائِدَةٍ، أَوْ غَيْرِهَا، فَتَجَرَ فِيهَا، فَلَمْ يَأْتِ الْحَوْلُ حَتَّى بَلَغَتْ مَا تَجِبُ فِيهِ الزَّكَاةُ: أَنَّهُ يُزَكِّيهَا، وَإِنْ لَمْ تَتِمَّ إِلاَّ قَبْلَ أَنْ يَحُولَ عَلَيْهَا الْحَوْلُ بِيَوْمٍ وَاحِدٍ، أَوْ بَعْدَ مَا يَحُولُ عَلَيْهَا الْحَوْلُ بِيَوْمٍ وَاحِدٍ، ثُمَّ لاَ زَكَاةَ فِيهَا حَتَّى يَحُولَ عَلَيْهَا الْحَوْلُ مِنْ يَوْمَ زُكِّيَتْ[2].

(فەتوا): واتە: ئیمامی مالیك ﷺ دەربارەی كەسێك كە پێنج دیناری هەبێ لە قازانج یان شتێكی دیكە دەستی كەوتبێ، جا بازرگانی پێوە بكات و ساڵ نەسوڕێتەوە بەسەری تا دەگات بەو ئەندازەیەی زەكاتی تێدا واجبە، گوتوویەتی: زەكاتی لێ دەدات، وە ئەگەر ئەندازەكە تەواو نەبوو تەنها ڕۆژێك بەر لە سوڕانەوەی ساڵ یان ڕۆژێك دوای سوڕانەوەی ساڵ (ئەوە بەهەمان شێوە زەكاتی لێ دەدات)، دواتر زەكاتی تیا نییە تاوەكوو ساڵی بەسەردا دەسوڕێتەوە لەو ڕۆژەوەی زەكاتی لێدراوە.

٦٦٣- **[فتوى]** وقَالَ مَالِكٌ ﷺ: فِي رَجُلٍ كَانَتْ لَهُ عَشَرَةُ دَنَانِيرَ، فَتَجَرَ فِيهَا، فَحَالَ عَلَيْهَا الْحَوْلُ، وَقَدْ بَلَغَتْ عِشْرِينَ دِينَارًا، أَنَّهُ يُزَكِّيهَا مَكَانَهَا، وَلاَ يَنْتَظِرُ بِهَا أَنْ يَحُولَ عَلَيْهَا الْحَوْلُ

---

(١) ـ أخرجه أبو مصعب الزهري: ٦٤٤، عن مالك به.

(٢) ـ أخرجه أبو مصعب الزهري: ٦٤٥، عن مالك به.

مِنْ يَوْمَ بَلَغَتْ مَا تَجِبُ فِيهِ الزَّكَاةُ، لأَنَّ الْحَوْلَ قَدْ حَالَ عَلَيْهَا وَهِيَ عِنْدَهُ عِشْرُونَ دِينَارًا، ثُمَّ لاَ زَكَاةَ فِيهَا حَتَّى يَحُولَ عَلَيْهَا الْحَوْلُ مِنْ يَوْمَ زُكِّيَتْ[1].

(فەتوا): واتە: ئیمامی مالیك ﷺ دەربارەی کەسێك کە دە دیناری هەبێت و بازرگانی پێوە بکات و ساڵی بەسەردا بسوڕێتەوە و بگات بە بیست دینار (واتە ساڵ بسوڕێتەوە بەسەر کاتی دەستپێکردنی بازرگانیەکەیدا تا ڕۆژی پەیدابونی ئەندازەی زەکات واجببون)، گوتوویەتی: زەکاتی لێ دەدات و چاوەڕێ ناکات تا ساڵ دەسوڕێتەوە بەسەر ئەو ڕۆژەی تیایدا گەیشتۆتە ئەندازەی زەکات (واتە نابێ دوای پەیدابونی ئەندازەی زەکاتەکە ساڵێك بوەستێت)، چونکە ساڵی بەسەردا سوڕاوەتەوە لە کاتێکدا بیست دیناری هەبووە (لەو ساڵەدا واجبە زەکات بدات)، دواتر زەکاتی تیا نیە تاوەکوو ساڵی بەسەردا دەسوڕێتەوە لەو ڕۆژەوەی زەکاتی لێ دراوە.

٦٦٤- **[فتوى]** قَالَ مَالِكٌ ﷺ: الأَمْرُ الْمُجْتَمَعُ عَلَيْهِ عِنْدَنَا فِي إِجَارَةِ الْعَبِيدِ، وَخَرَاجِهِمْ وَكِرَاءِ الْمَسَاكِينِ، وَكِتَابَةِ الْمُكَاتَبِ: أَنَّهُ لاَ يَجِبُ فِي شَيْءٍ مِنْ ذَلِكَ، الزَّكَاةُ، قَلَّ ذَلِكَ أَوْ كَثُرَ، حَتَّى يَحُولَ عَلَيْهِ الْحَوْلُ مِنْ يَوْمِ يَقْبِضُهُ صَاحِبُهُ[2].

(فەتوا): واتە: لە ئیمامی مالیکەوە ﷺ گێڕدراوەتەوە گوتوویەتی: ئەو بابەتەی لەلای ئێمە کۆدەنگی لەسەرە لە بەکرێدانی کۆیلە و خەراجەکەیان (واتە ئەو پارەی مانگانە لە کۆیلە وەردەگیرێ) و بەکرێدانی خانوو و وەرگرتنی پارەی کۆیلەی نووسراوپێدراو (بریتییە لەوەی): زەکات لە هیچ شتێك لەمانە واجب نییە، کەم بێت یان زۆر، تاوەکوو ساڵی بەسەردا دەسوڕێتەوە لەو ڕۆژەوەی خاوەنەکەی وەریدەگرێت.

٦٦٥- **[فتوى]** وقَالَ مَالِكٌ ﷺ: فِي الذَّهَبِ وَالْوَرِقِ يَكُونُ بَيْنَ الشُّرَكَاءِ: إِنَّ مَنْ بَلَغَتْ حِصَّتُهُ مِنْهُمْ عِشْرِينَ دِينَارًا عَيْنًا، أَوْ مِائَتَيْ دِرْهَمٍ، فَعَلَيْهِ فِيهَا الزَّكَاةُ، وَمَنْ نَقَصَتْ حِصَّتُهُ عَمَّا تَجِبُ فِيهِ الزَّكَاةُ، فَلاَ زَكَاةَ عَلَيْهِ، وَإِنْ بَلَغَتْ حِصَصُهُمْ جَمِيعًا، مَا تَجِبُ فِيهِ الزَّكَاةُ، وَكَانَ بَعْضُهُمْ فِي ذَلِكَ أَفْضَلَ نَصِيبًا مِنْ بَعْضٍ، أُخِذَ مِنْ كُلِّ إِنْسَانٍ بِقَدْرِ حِصَّتِهِ، إِذَا كَانَ فِي حِصَّةِ كُلِّ إِنْسَانٍ

---

(١) ـ أخرجه أبو مصعب الزهري: ٦٤٦، عن مالك به.

(٢) ـ أخرجه أبو مصعب الزهري: ٦٤٧، عن مالك به.

مِنْهُمْ مَا تَجِبُ فِيهِ الزَّكَاةُ، وَذَلِكَ أَنَّ رَسُولَ اللهِ ﷺ قَالَ: لَيْسَ فِيمَا دُونَ خَمْسِ أَوَاقٍ مِنَ الْوَرِقِ صَدَقَةٌ.

قَالَ مَالِكٌ رَحِمَهُ اللهُ: وَهَذَا أَحَبُّ مَا سَمِعْتُ إِلَيَّ[١].

(فەتوا): واتە: ئیمامی مالیك رَحِمَهُ اللهُ دەربارەی زێڕ و زیو کە (بەشەریکایەتی بێت) لە نێوان چەند شەریکێك، گوتوویەتی: هەر کەسێك لەوان پشکەکەی بگاتە بیست دینار یان دوو سەد درهەم، ئەوە زەکاتی لەسەر واجبە تیایدا، وە هەر کەسێك پشکەکەی کەمتر بێت لەوەی زەکاتی تێدا واجبە، ئەوە زەکاتی لەسەر نییە، وە ئەگەر پشکی گشتیان بگاتە ئەندازەی زەکات لە کاتێکدا پشکی هەندێکیان زیاتر بێت لە هەندێکی دیکەیان، ئەوە هەر کەسەو بەپێی پشکی خۆی لێی وەردەگیرێت (بەمەرجێك) ئەگەر پشکی هەر یەکەیان بگاتە ئەو ئەندازەی زەکاتی تێدا واجبە، ئەمەش لەبەر ئەوەیە پێغەمبەری خوا ﷺ فەرموویەتی: لە کەمتر لە پێنج ئۆقیە زیو (واتە کەمتر لە دوو سەد درهەم زیو) زەکات نییە.

ئیمامی مالیك رَحِمَهُ اللهُ گوتوویەتی: ئەوە خۆشەویستترینی ئەوەیە کە گوێم لێ بووە (لەو بابەتەدا).

**٦٦٦- [فتوى]** قَالَ مَالِكٌ رَحِمَهُ اللهُ: وَإِذَا كَانَتْ لِرَجُلٍ ذَهَبٌ أَوْ وَرِقٌ مُتَفَرِّقَةٌ بِأَيْدِي أُنَاسٍ شَتَّى، فَإِنَّهُ يَنْبَغِي لَهُ أَنْ يُحْصِيَهَا جَمِيعًا، ثُمَّ يُخْرِجَ مَا وَجَبَ عَلَيْهِ مِنْ زَكَاتِهَا كُلِّهَا[٢].

(فەتوا): واتە: ئیمامی مالیك رَحِمَهُ اللهُ گوتوویەتی: ئەگەر کەسێك زێڕ یان زیوی پەرشوبڵاوی هەبوو بە دەستی چەندین کەسەوە بوو، ئەوە پێویستە گشتی حیساب بکات، دواتر ئەو زەکاتەی واجب بووە لە کۆی گشتی دەریدەکات.

**٦٦٧- [فتوى]** قَالَ مَالِكٌ رَحِمَهُ اللهُ: وَمَنْ أَفَادَ مَالاً ذَهَبًا أَوْ وَرِقًا، فَإِنَّهُ لاَ زَكَاةَ عَلَيْهِ فِيهَا حَتَّى يَحُولَ عَلَيْهَا الْحَوْلُ مِنْ يَوْمَ أَفَادَهَا[٣].

---

(١) ـ أخرجه أبو مصعب الزهري: ٦٤٨، عن مالك به.

(٢) ـ أخرجه أبو مصعب الزهري: ٦٤٩، عن مالك به.

(٣) ـ أخرجه أبو مصعب الزهري: ٦٥٠، عن مالك به.



(فەتوا): واتە: ئیمامی مالیك ﷺ گوتوویەتی: هەروەها هەر كەسێك سەروەتێكی زێڕ یان زیوی دەستكەوتبێ (جا بەهۆی میرات بێ، یان دیاری یان صەدەقە)، ئەوە هیچ زەكاتی تیا نییە تاوەكوو ساڵی بەسەردا دەسوڕێتەوە لەو ڕۆژەوەی دەستی كەوتووە.

## ٣- زەكات لە كانزاكاندا[١]

**٦٦٨-** عَنْ رَبِيعَةَ بْنِ أَبِي عَبْدِ الرَّحْمَنِ ﷺ، عَنْ غَيْرِ وَاحِدٍ، أَنَّ رَسُولَ اللهِ ﷺ قَطَعَ لِبِلاَلِ بْنِ الْحَارِثِ الْمُزَنِيِّ مَعَادِنَ الْقَبَلِيَّةِ، وَهِيَ مِنْ نَاحِيَةِ الْفُرُعِ، فَتِلْكَ الْمَعَادِنُ لاَ يُؤْخَذُ مِنْهَا إِلَى الْيَوْمِ إِلاَّ الزَّكَاةُ[٢].

واتە: لە ڕەبیعەی كوڕی ئەبو عەبدوڕڕەحمانەوە ﷺ گێڕدراوەتەوە، ئەویش لە زیاتر لە كەسێكەوە گێڕاویەتەوە (گوتوویانە): پێغەمبەری خوا ﷺ سوودوەرگرتن لە كانزاكانی قەبەلی بۆ بیلالی كوڕی حاریسی موزەنی دابڕی و دای بەو، كە ناوچەیەكە لەلای فوروع (بە سواری وڵاغ پێنج ڕۆژ لە مەدینەوە دوورە)، جا ئەم كانزایانە تا ئەمڕۆ هیچ شتێكیان لێ وەرناگیرێ جگە لە زەكات (واتە پێنجیەكی لەسەر نییە، تەنها چارەگی دەیەكی زەكاتی لەسەرە).

**٦٦٩- [فتوى]** قَالَ مَالِكٌ ﷺ: أَرَى وَاللهُ أَعْلَمُ، أَنْ لاَ يُؤْخَذُ مِنَ الْمَعَادِنِ مِمَّا يَخْرُجُ مِنْهَا شَيْءٌ، حَتَّى يَبْلُغَ مَا يَخْرُجُ مِنْهَا قَدْرَ عِشْرِينَ دِينَارًا عَيْنًا، أَوْ مِائَتَيْ دِرْهَمٍ، فَإِذَا بَلَغَ ذَلِكَ، فَفِيهِ الزَّكَاةُ مَكَانَهُ، وَمَا زَادَ عَلَى ذَلِكَ، أُخِذَ بِحِسَابِ ذَلِكَ، مَا دَامَ فِي الْمَعْدِنِ نَيْلٌ، فَإِذَا انْقَطَعَ عِرْقُهُ، ثُمَّ جَاءَ بَعْدَ ذَلِكَ نَيْلٌ، فَهُوَ مِثْلُ الأَوَّلِ، يُبْتَدَأُ فِيهِ الزَّكَاةُ، كَمَا ابْتُدِئَتْ فِي الأَوَّلِ[٣].

(فەتوا): واتە: ئیمامی مالیك ﷺ گوتوویەتی: پێم وایە ـ والله أعلم ـ هیچ شتێك وەرنەگیرێت لەوەی لە كانزا دەردەچێت و پەیدا دەبێت (لە سەروەت و سامان)

---

(١) ـ الزَّكَاةُ فِي الْمَعَادِنِ.

(٢) ـ ضعيف. أخرجه أبو مصعب الزهري: ٦٥١؛ والشيباني: ٣٣٩؛ وأبو داود: ٣٠٦١، كلهم عن مالك به.

(٣) ـ أخرجه أبو مصعب الزهري: ٦٥٢، عن مالك به.





تاوەکوو ئەوەی لێوەی دەردەچێت و پەیدا دەبێت دەگاتە ئەندازەی بیست دینار، یان دوو سەد درهەم، جا ئەگەر گەیشتە ئەو ئەندازەیە، ئەوە زەکاتی تیایە لە کاتی خۆیدا، وە ئەوەی زیاد دەبێت بەو حیسابە وەردەگیرێت مادەم بەدەستهێنان بەردەوام بێت لە کانزادا، جا ئەگەر دەماری کانزاکە پچڕا (ماوەیەك بەدەست نەهات)، پاشان دوای ئەوە بەدەستهێنان گەڕایەوە، ئەوە وەکوو یەکەم وایە دەست بە زەکات دەکرێتەوە تیایدا، وەك چۆن لە سەرەتادا دەست پێکرا (واتە تا دەگاتە بیست میسقاڵ زێڕ یان دوو سەت میسقاڵ زیو).

**٦٧٠- [فتوى]** قَالَ مَالِكٌ ﷺ: وَالْمَعْدِنُ بِمَنْزِلَةِ الزَّرْعِ، يُؤْخَذُ مِنْهُ مِثْلُ مَا يُؤْخَذُ مِنَ الزَّرْعِ يُؤْخَذُ مِنْهُ إِذَا خَرَجَ مِنَ الْمَعْدِنِ مِنْ يَوْمِهِ ذَلِكَ، وَلاَ يُنْتَظَرُ بِهِ الْحَوْلُ، كَمَا يُؤْخَذُ مِنَ الزَّرْعِ، إِذَا حُصِدَ الْعُشْرُ، وَلاَ يُنْتَظَرُ أَنْ يَحُولَ عَلَيْهِ الْحَوْلُ.

(فەتوا): واتە: ئیمامی مالیك ﷺ گوتوویەتی: کانزا وەك کشتوکاڵ وایە، چۆن زەکات لە کشتوکاڵدا وەردەگیرێ لە کانزاش بە هەمان شێوە وەردەگیرێ، (واتە) زەکاتەکەی وەردەگیرێ لەو ڕۆژەی بەدەست دێت، چاوەڕێی سوڕانەوەی ساڵی تێدا ناکرێ، وەك چۆن دەیەك زەکات لە کشتوکاڵ وەردەگیرێ کاتێ دروێنە دەکرێت و چاوەڕێ ناکرێت ساڵی بەسەردا بسوڕێتەوە.

## ٤- زەکاتی گەنجینە[1]

**٦٧١-** عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ ﷺ، أَنَّ رَسُولَ اللهِ ﷺ قَالَ: فِي الرِّكَازِ الْخُمُسُ[2].

واتە: لە ئەبو هوڕەیڕەوە ﷺ گێڕدراوەتەوە (گوتوویەتی): پێغەمبەری خوا ﷺ فەرموویەتی: لە گەنجینەدا یەك لەسەر پێنج زەکات واجبە (جا گەیشتبێتە ئەندازەی زەکات یان نا، دەبێت ئەو کاتەی گەنجینەکە دەدۆزرێتەوە بکرێتە پێنج بەش و بەشێکیان بکرێتە زەکات، نابێت ساڵی بەسەردا بسوڕێتەوە).

---

(١) ـ زَكَاةُ الرِّكَازِ.

(٢) ـ صحيح. أخرجه الشافعي: ٤٤١؛ والترمذي: ١٦؛ وشرح معاني الآثار: ٥٣٥٤، كلهم عن مالك به.




٦٧٢- **[فتوى]** قَالَ مَالِكٌ ﷺ: الأَمْرُ الَّذِي لاَ اخْتِلاَفَ فِيهِ عِنْدَنَا، وَالَّذِي سَمِعْتُ أَهْلَ الْعِلْمِ يَقُولُونَ: إِنَّ الرِّكَازَ إِنَّمَا هُوَ دِفْنٌ يُوجَدُ مِنْ دِفْنِ الْجَاهِلِيَّةِ، مَا لَمْ يُطْلَبْ بِمَالٍ، وَلَمْ يُتَكَلَّفْ فِيهِ نَفَقَةٌ، وَلاَ كَبِيرُ عَمَلٍ، وَلاَ مَؤُونَةٍ، فَأَمَّا مَا طُلِبَ بِمَالٍ، وَتُكُلِّفَ فِيهِ كَبِيرُ عَمَلٍ، فَأُصِيبَ مَرَّةً، وَأُخْطِئَ مَرَّةً، فَلَيْسَ بِرِكَازٍ[١].

(فەتوا): واتە: ئیمامی مالیك ﷺ گوتوویەتی: ئەوەی ڕاجیایی تیا نییە لەلای ئێمە و ئەوەی گوێم لێ بووە لە زانایان ئەوەیە دەیانگوت: گەنجینە تەنها ئەو شتانەیە کە لە سەردەمی نەفامی (پێشی ئیسلام) شاردراونەتەوە و (لە سەردەمی ئیسلام) دۆزراونەتەوە (ئەوە زەکاتی تیایە)، مادەم بە ماڵ و سەروەت و کولفە بەدوایدا نەگەڕێن و خەرجی لێ نەکەن و کاری زۆر و مەسرەفی زۆری بۆ نەکەن، جا هەرچی ئەوەیە کە بە ماڵ و سەروەت بەدەست دێت و کارکردنی زۆری پێویستە و جارێك دەدۆزرێتەوە و جارێك نادۆزرێتەوە، ئەوە ئەو گەنجینە نییە کە زەکاتی تێدایە.

### ٥- ئەوەی زەکاتی تێدانییە لە خشڵ و زێڕی خام و گیای دەریا[٢]

٦٧٣- أَنَّ عَائِشَةَ ﷺ، زَوْجَ النَّبِيِّ ﷺ كَانَتْ تَلِي بَنَاتَ أَخِيهَا يَتَامَى فِي حَجْرِهَا لَهُنَّ الْحَلْيُ، فَلاَ تُخْرِجُ مِنْ حُلِيِّهِنَّ الزَّكَاةَ[٣].

واتە: عائیشەی ﷺ خێزانی پێغەمبەر ﷺ سەرپەرشتی کچەکانی براکەی دەکرد کە هەتیو بوون لەژێر دەستی عائیشە بوون (واتە عائیشە ـ ﷺ ـ مامەڵە و کاروباری بۆ بەڕێوە دەبردن، قەدەغە بوو خۆیان کاروباری خۆیان بەڕێوە ببەن، چونکە بچووك بوون) جا خشڵی خۆپێڕازاندنەوەیان هەبوو، عائیشەش ﷺ زەکاتی دەرنەدەکرد لە خشڵەکانیان.

---

(١) ـ أخرجه أبو مصعب الزهري: ٦٥٥، عن مالك به.

(٢) ـ مَا لَا زَكَاةَ فِيهِ مِنَ الْحُلِيِّ وَالتِّبْرِ وَالْعَنْبَرِ.

(٣) ـ صحيح. أخرجه أبو مصعب الزهري: ٦٥٦؛ والحدثاني: ٢٠٩؛ والشيباني: ٣٢٩؛ والشافعي: ٤٣٣، كلهم عن مالك به.

**٦٧٤**- أَنَّ عَبْدَ اللهِ بْنَ عُمَرَ ﷺ كَانَ يُحَلِّي بَنَاتَهُ وَجَوَارِيَهُ الذَّهَبَ، ثُمَّ لاَ يُخْرِجُ مِنْ حُلِيِّهِنَّ الزَّكَاةَ(١).

واتە: عەبدوڵڵای کوڕی عومەر ﷺ خشڵی زێڕی بە کچەکانی و جارییەکانی دەبەخشی، زەکاتیشی لە خشڵەکانیان نەدەدا.

**٦٧٥- [فتوى]** قَالَ مَالِكٌ ﷺ: مَنْ كَانَ عِنْدَهُ تِبْرٌ، أَوْ حَلْيٌ مِنْ ذَهَبٍ، أَوْ فِضَّةٍ، لاَ يُنْتَفَعُ بِهِ لِلُبْسٍ، فَإِنَّ عَلَيْهِ فِيهِ الزَّكَاةَ فِي كُلِّ عَامٍ، يُوزَنُ فَيُؤْخَذُ رُبُعُ عُشْرِهِ، إِلاَّ أَنْ يَنْقُصَ مِنْ وَزْنِ عِشْرِينَ دِينَارًا عَيْنًا، أَوْ مِائَتَيْ دِرْهَمٍ، فَإِنْ نَقَصَ مِنْ ذَلِكَ، فَلَيْسَ فِيهِ زَكَاةٌ، وَإِنَّمَا تَكُونُ فِيهِ الزَّكَاةُ إِذَا كَانَ إِنَّمَا يُمْسِكُهُ لِغَيْرِ اللُّبْسِ، فَأَمَّا التِّبْرُ وَالْحُلِيُّ الْمَكْسُورُ الَّذِي يُرِيدُ أَهْلُهُ إِصْلاَحَهُ وَلُبْسَهُ، فَإِنَّمَا هُوَ بِمَنْزِلَةِ الْمَتَاعِ الَّذِي يَكُونُ عِنْدَ أَهْلِهِ، فَلَيْسَ عَلَى أَهْلِهِ فِيهِ زَكَاةٌ(٢).

(فەتوا): واتە: ئیمامی مالیك ﷺ گوتوویەتی: هەر کەسێك زێڕی خامی هەیە یان خشڵی زێڕ یان خشڵی زیوی هەیە سوودی لێ نابینێ بۆ بەخۆوەکردن و پۆشینی، ئەوە گشت ساڵێك زەکاتی لەسەر واجبە تیایدا، دەکێشرێت و چارەگێك لە دەیەك وەردەگیرێت، تەنها لە کاتێکدا نەبێت کە کەمتر بێت لە کێشی بیست دیناری زێڕ (کە دەکاتە بیست مسقاڵ) یان کەمتر بێت لە دوو سەد درهەمی زیو (کە دەکاتە دوو سەد مسقاڵ)، جا ئەگەر کەمتر بوو لەوە ئەوە زەکاتی تێدا نییە، تەنها لەو کاتە زەکاتی تێدا واجبە ئەگەر بۆ جگە لە پۆشین دەستی پێوە گرتبێ (جا ئەوە دەربارەی ئەو خشڵە بوو کە لەبەر نەکرێت و نەپۆشرێت)، وە هەرچی زێڕی خام و خشڵی شکاوە کە خاوەنەکەی دەیەوێت چاکی بکاتەوە و بیپۆشێ، ئەوە وەك ئەو کاڵا و کەلوپەلە وایە کە لەلای خاوەنەکەی بێ، زەکات لەسەر خاوەنەکەی واجب نییە.

**٦٧٦**- قَالَ مَالِكٌ ﷺ: لَيْسَ فِي اللُّؤْلُؤِ، وَلاَ فِي الْمِسْكِ، وَلاَ الْعَنْبَرِ زَكَاةٌ(٣).

واتە: ئیمامی مالیك ﷺ گوتوویەتی: مرواری و میسك و گیای دەریا زەکاتیان تێدا نییە.

---

(١) ـ صحيح. أخرجه أبو مصعب الزهري: ٦٥٧؛ والشيباني: ٣٣٠؛ والشافعي: ٤٣٥، كلهم عن مالك به.

(٢) ـ أخرجه أبو مصعب الزهري: ٦٥٨، عن مالك به.

(٣) ـ أخرجه أبو مصعب الزهري: ٦٥٩، عن مالك به.

## ٦- زەکاتی ماڵی هەتیو و بازرگانیکردن بە ماڵەکە بۆیان[١]

**٦٧٧-** أَنَّ عُمَرَ بْنَ الْخَطَّابِ ﷺ قَالَ: اتَّجِرُوا فِي أَمْوَالِ الْيَتَامَى، لاَ تَأْكُلُهَا الزَّكَاةُ[٢].

واتە: عومەری کوڕی خەتتاب ﷺ گوتوویەتی: بازرگانی بە ماڵ و سامانی هەتیوان بکەن، با زەکات نەیخوات و لەناوی نەبات (چونکە ئەگەر بازرگانی پێوە نەکرێت و هەموو ساڵێکیش زەکاتی لێ دەربکرێت نامێنێت و تەواو دەبێت).

**٦٧٨-** عَنْ عَبْدِ الرَّحْمَنِ بْنِ الْقَاسِمِ ﷺ، عَنْ أَبِيهِ ﷺ، أَنَّهُ قَالَ: كَانَتْ عَائِشَةُ ﷺ تَلِينِي أَنَا وَأَخًا لِي يَتِيمَيْنِ فِي حَجْرِهَا، فَكَانَتْ تُخْرِجُ مِنْ أَمْوَالِنَا الزَّكَاةَ[٣].

واتە: لە عەبدوڕڕەحمانی کوڕی قاسمەوە ﷺ گێڕدراوەتەوە، ئەویش لە باوکیەوە ﷺ گێڕاویەتەوە گوتوویەتی: عائیشە ﷺ سەرپەرشتی من و برایێکی منی دەکرد کە هەتیو بووین، لەژێر چاودێری ئەو بووین، جا زەکاتی لە ماڵەکەی ئێمە دەردەکرد.

**٦٧٩-** أَنَّ عَائِشَةَ ﷺ، زَوْجَ النَّبِيِّ ﷺ كَانَتْ تُعْطِي أَمْوَالَ الْيَتَامَى، مَنْ يَتَّجِرُ لَهُمْ فِيهَا[٤].

واتە: عائیشەی خێزانی پێغەمبەر ﷺ ماڵ و سامانی هەتیوانی دەدا بەو کەسەی بازرگانی پێوە بکات بۆیان.

**٦٨٠-** عَنْ يَحْيَى بْنِ سَعِيدٍ ﷺ، أَنَّهُ اشْتَرَى لِبَنِي أَخِيهِ يَتَامَى فِي حَجْرِهِ مَالاً، فَبِيعَ ذَلِكَ الْمَالُ بَعْدُ بِمَالٍ كَثِيرٍ[٥].

واتە: لە یەحیای کوڕی سەعیدەوە ﷺ گێڕدراوەتەوە بەوەی شتێکی بۆ کوڕەکانی براکەی کڕیوە، کە هەتیو بوون، جا دواتر ئەو شتە بە ماڵ و سەروەتێکی زۆر فرۆشرا (واتە پارەی هەتیوەکانی خستە گەڕ و بووژاندیەوە و نەیهێشت زەکات بیخوات و کەم بکات، بەڵکوو زۆر زیادی کرد).

---

(١) ـ زَكَاةُ أَمْوَالِ الْيَتَامَى وَالتِّجَارَةِ لَهُمْ فِيهَا.

(٢) ـ صحيح. أخرجه أبو مصعب الزهري: ٦٦٠، عن مالك به.

(٣) ـ صحيح. أخرجه أبو مصعب الزهري: ٦٦١؛ والشافعي: ٤١٣؛ والشافعي: ٩٩١، كلهم عن مالك به.

(٤) ـ صحيح. أخرجه أبو مصعب الزهري: ٦٦٢، عن مالك به.

(٥) ـ مقطوع صحيح. أخرجه أبو مصعب الزهري: ٦٦٣، عن مالك به.




٦٨١- **[فتوى]** قَالَ مَالِكٌ ﵀: لاَ بَأْسَ بِالتِّجَارَةِ فِي أَمْوَالِ الْيَتَامَى لَهُمْ، إِذَا كَانَ الْوَلِيُّ مَأْمُونًا، فَلاَ أَرَى عَلَيْهِ ضَمَانًا[1].

(فەتوا): واتە: ئیمامی مالیك ﵀ گوتوویەتی: هیچ کێشە نییە لە بازرگانیکردن بۆ هەتیوان بە سامانەکەیان، ئەگەر سەرپەرشتیارەکە جێی متمانە بێ، بۆچوونم وایە زامنایەتی لەسەر نییە (ئەگەر زەرەری کرد).

## ٧- زەکاتی میرات[2]

٦٨٢- **[فتوى]** عَنْ مَالِكٍ ﵀، أَنَّهُ قَالَ: إِنَّ الرَّجُلَ إِذَا هَلَكَ، وَلَمْ يُؤَدِّ زَكَاةَ مَالِهِ، إِنِّي أَرَى أَنْ يُؤْخَذَ ذَلِكَ مِنْ ثُلُثِ مَالِهِ، وَلاَ يُجَاوَزُ بِهَا الثُّلُثُ، وَتُبَدَّى عَلَى الْوَصَايَا، وَأَرَاهَا بِمَنْزِلَةِ الدَّيْنِ عَلَيْهِ، فَلِذَلِكَ رَأَيْتُ أَنْ تُبَدَّى عَلَى الْوَصَايَا.

قَالَ مَالِكٌ ﵀: وَذَلِكَ إِذَا أَوْصَى بِهَا الْمَيِّتُ، قَالَ: فَإِنْ لَمْ يُوصِ بِذَلِكَ الْمَيِّتُ فَفَعَلَ ذَلِكَ أَهْلُهُ، فَذَلِكَ حَسَنٌ، وَإِنْ لَمْ يَفْعَلْ ذَلِكَ أَهْلُهُ، لَمْ يَلْزَمْهُمْ ذَلِكَ[3].

(فەتوا): واتە: لە ئیمامی مالیکەوە ﵀ گێڕدراوەتەوە گوتوویەتی: ئەگەر کەسێك مرد و زەکاتی ماڵەکەی نەدابوو، من بۆچوونم وایە زەکاتەکە لە سێیەکی ماڵەکەی وەربگیرێت و لە سێیەك تێ نەپەڕێنرێت (چونکە نەوەك بەهۆی دواخستنی زەکات بۆ دوای مردنی مەبەستی بوویێت میراتگرەکانی مەحرووم بکات لە میرات)، بەپێش وەسیەتەکان دەخرێت (ئەگەر وەسیەتی هەبێت)، وە پێم وایە زەکات وەك قەرز وایە لەسەری (بەوەی دەبێ پێش هەموو شتێك بخرێت)، بۆیە پێم وایە دەبێ پێشی وەسیەتەکان بخرێت.

ئیمامی مالیك ﵀ گوتوویەتی: ئەوەی باس کرا لە کاتێکدا بوو ئەگەر مردووەکە وەسیێتی کردبێت (بەوەی زەکاتەکەی دەربکرێت)، گوتوویەتی: جا ئەگەر

---

(١) ـ أخرجه أبو مصعب الزهري: ٦٦٤، عن مالك به.

(٢) ـ زَكَاةُ الْمِيرَاثِ.

(٣) ـ أخرجه أبو مصعب الزهري: ٦٦٥، عن مالك به.




مردووەکە وەسیێتی نەکردبێت و خانەوادەکەی خۆیان ئەنجامیان دا، ئەوە چاکە، وە ئەگەر خانەوادەکەی ئەوەیان ئەنجام نەدا، ئەوە لەسەریان نییە و پابەند ناکرێن.

٦٨٣- **[فتوى]** قَالَ مَالِكٌ ﷺ: السُّنَّةُ عِنْدَنَا الَّتِي لاَ اخْتِلاَفَ فِيهَا، أَنَّهُ لاَ يَجِبُ عَلَى وَارِثٍ زَكَاةٌ، فِي مَالٍ وَرِثَهُ فِي دَيْنٍ، وَلاَ عَرْضٍ، وَلاَ دَارٍ، وَلاَ عَبْدٍ، وَلاَ وَلِيدَةٍ، حَتَّى يَحُولَ عَلَى ثَمَنِ مَا بَاعَ مِنْ ذَلِكَ، أَوِ اقْتَضَى، الْحَوْلُ مِنْ يَوْمَ بَاعَهُ وَقَبَضَهُ[١].

(فەتوا): واتە: ئیمامی مالیك ﷺ گوتوویەتی: ئەو ڕێبازەی لەلای ئێمە هەیە کە هیچ ڕاجیایی تیا نییە ئەوەیە: هیچ زەکاتێك لەسەر میراتگر نییە لەو ماڵەی بەمیرات وەریگرتووە، جا (میراتەکە) قەرز بێت یان زەوی یان خانوو یان عەبد یان کەنیزەك، تاوەکوو ساڵ دەسوڕێتەوە بەسەر پارەی ئەو شتەی لە میراتەکە فرۆشتوویەتی یان وەریگرتووە، (ساڵەکەش) لەو ڕۆژەوەی فرۆشتوویەتی و وەریگرتووە (حیساب دەکرێت).

٦٨٤- **[فتوى]** وقَالَ مَالِكٌ ﷺ: السُّنَّةُ عِنْدَنَا، أَنَّهُ لاَ يَجِبُ عَلَى وَارِثٍ فِي مَالٍ وَرِثَهُ، الزَّكَاةُ، حَتَّى يَحُولَ عَلَيْهِ الْحَوْلُ.

(فەتوا): واتە: ئیمامی مالیك ﷺ گوتوویەتی: لای ئێمە وایە: زەکات واجب نییە لەسەر هیچ میراتگرێك لە هیچ ماڵێك کە بە میرات وەریدەگرێ، تا ساڵی بەسەردا دەسوڕێتەوە.

## ٨- زەکات لە قەرزدا[٢]

٦٨٥- عَنِ السَّائِبِ بْنِ يَزِيدَ ﷺ، أَنَّ عُثْمَانَ بْنَ عَفَّانَ ﷺ كَانَ يَقُولُ: هَذَا شَهْرُ زَكَاتِكُمْ، فَمَنْ كَانَ عَلَيْهِ دَيْنٌ فَلْيُؤَدِّ دَيْنَهُ، حَتَّى تَحْصُلَ أَمْوَالُكُمْ، فَتُؤَدُّونَ مِنْهَا الزَّكَاةَ[٣].

واتە: لە سائیبی کوڕی یەزیدەوە ﷺ گێڕدراوەتەوە (گوتوویەتی): عوسمانی کوڕی عەففان ﷺ دەیگوت: ئەوە مانگی زەکاتەکەتانە (مەبەستی مانگی ڕەجەب

---

(١) ـ أخرجه أبو مصعب الزهري: ٦٦٦، عن مالك به.

(٢) ـ الزَّكَاةُ فِي الدَّيْنِ.

(٣) ـ صحيح. أخرجه أبو مصعب الزهري: ٦٦٨؛ والشيباني: ٣٢٣؛ والشافعي: ٤٤٨، كلهم عن مالك به.





بوو)، جا هەر کەسێك قەرزی لەسەرە، ئەوە با قەرزەکەی بداتەوە، تا ماڵەکەتان دیار بێت و زەکاتی لێ بدەن.

**٦٨٦-** عَنْ أَيُّوبَ بْنِ أَبِي تَمِيمَةَ السَّخْتِيَانِيِّ ﷺ، أَنَّ عُمَرَ بْنَ عَبْدِ الْعَزِيزِ ﷺ كَتَبَ فِي مَالٍ قَبَضَهُ بَعْضُ الْوُلاَةِ ظُلْمًا، يَأْمُرُ بِرَدِّهِ إِلَى أَهْلِهِ، وَتُؤْخَذُ زَكَاتُهُ لِمَا مَضَى مِنَ السِّنِينَ، ثُمَّ عَقَّبَ بَعْدَ ذَلِكَ بِكِتَابٍ، أَلاَّ يُؤْخَذَ مِنْهُ إِلاَّ زَكَاةٌ وَاحِدَةٌ، فَإِنَّهُ كَانَ ضِمَارًا[١].

واتە: لە ئەیوبی کوڕی ئەبو تەمیمەی سەختیانییەوە ﷺ گێڕدراوەتەوە (گوتوویەتی): عومەری کوڕی عەبدولعەزیز ﷺ دەربارەی ماڵ و سەروەتێك کە یەکێك لە کاربەدەستان بەستەم دەستی بەسەردا گرتبوو، نووسراوێکی نووسی (تیایدا): فەرمانی پێکرد بە گێڕانەوەی سامانەکە بۆ خاوەنەکەی و وەرگرتنی زەکاتی هەموو ئەو ساڵانەی تێپەڕیوە (کە زەکاتی لێ نەدراوە چونکە داگیرکراو بووە)، پاشان دوای ئەوە نووسراوێکی دیکەی نارد (نووسی): زەکاتی لێ وەرناگیرێ تەنها یەك زەکات نەبێ (واتە زەکاتی گشت ساڵەکان نادات)، چونکە (لەژێر دەستی خاوەنەکەی) وجودی نەبووە.

**٦٨٧-** عَنْ يَزِيدَ بْنِ خُصَيْفَةَ ﷺ، أَنَّهُ سَأَلَ سُلَيْمَانَ بْنَ يَسَارٍ ﷺ عَنْ رَجُلٍ لَهُ مَالٌ، وَعَلَيْهِ دَيْنٌ مِثْلُهُ، أَعَلَيْهِ زَكَاةٌ؟ فَقَالَ: لاَ[٢].

واتە: لە یەزیدی کوڕی حوصەیفەوە ﷺ گێڕدراوەتەوە بەوەی پرسیاری لە سولەیمانی کوڕی یەسار ﷺ کردووە دەربارەی پیاوێك کە پارە و سامانی هەبێ، لە کاتێکدا هەمان ئەندازەی سامانەکە قەرزی لەسەر بێ، ئایا زەکاتی لەسەرە؟ گوتی: نەخێر[٣].

---

(١) ـ ضعيف. أخرجه أبو مصعب الزهري: ٦٦٩، عن مالك به.

(٢) ـ مقطوع صحيح. أخرجه أبو مصعب الزهري: ٦٧٠؛ والحدثاني: ٢٠٩أ، عن مالك به.

(٣) ـ تێبینی: لە یەکێك لە قەولەکانی ئیمامی شافیعی ئەوەیە دەبێ هەر زەکات بدات با قەرزداریش بێ، چونکە قەرز نابێتە ڕێگر لە زەکات و لە کۆتاییدا خۆ کەسەکە هەر خاوەنی ئەو پارەیە کە لەژێر دەستیدایە و دەتوانێ تەصەڕوفی پێوە بکات و خۆی مالیکی تەواوە، با قەرزداریش بێ، مادەم ئەندازەی زەکاتی هەبێت دەبێ زەکاتی لێ بدات، مەزهەبی شافیعیش لەسەر ئەو فەتوایە دەڕوات.

٦٨٨- **[فتوى]** قَالَ مَالِكٌ ﷺ: الأَمْرُ الَّذِي لاَ اخْتِلاَفَ فِيهِ عِنْدَنَا فِي الدَّيْنِ، أَنَّ صَاحِبَهُ لاَ يُزَكِّيهِ حَتَّى يَقْبِضَهُ، وَإِنْ أَقَامَ عِنْدَ الَّذِي هُوَ عَلَيْهِ سِنِينَ ذَوَاتِ عَدَدٍ، ثُمَّ قَبَضَهُ صَاحِبُهُ، لَمْ تَجِبْ عَلَيْهِ إِلاَّ زَكَاةٌ وَاحِدَةٌ، فَإِنْ قَبَضَ مِنْهُ شَيْئًا، لاَ تَجِبُ فِيهِ الزَّكَاةُ، فَإِنَّهُ إِنْ كَانَ لَهُ مَالٌ، سِوَى الَّذِي قُبِضَ، تَجِبُ فِيهِ الزَّكَاةُ، فَإِنَّهُ يُزَكِّ مَعَ مَا قَبَضَ مِنْ دَيْنِهِ ذَلِكَ.

قَالَ: وَإِنْ لَمْ يَكُنْ لَهُ نَاضٌّ غَيْرُ الَّذِي اقْتَضَى مِنْ دَيْنِهِ، وَكَانَ الَّذِي اقْتَضَى مِنْ دَيْنِهِ لاَ تَجِبُ فِيهِ الزَّكَاةُ، فَلاَ زَكَاةَ عَلَيْهِ فِيهِ، وَلَكِنْ لِيَحْفَظْ عَدَدَ مَا اقْتَضَى، فَإِنِ اقْتَضَى بَعْدَ ذَلِكَ مَا تَتِمُّ بِهِ الزَّكَاةُ، مَعَ مَا قَبَضَ قَبْلَ ذَلِكَ، فَعَلَيْهِ فِيهِ الزَّكَاةُ، فَإِنْ كَانَ قَدِ اسْتَهْلَكَ مَا اقْتَضَى أَوَّلاً، أَوْ لَمْ يَسْتَهْلِكْهُ، فَالزَّكَاةُ وَاجِبَةٌ عَلَيْهِ مَعَ مَا اقْتَضَى مِنْ دَيْنِهِ، فَإِذَا بَلَغَ مَا اقْتَضَى عِشْرِينَ دِينَارًا عَيْنًا، أَوْ مِائَتَيْ دِرْهَمٍ، فَعَلَيْهِ فِيهِ الزَّكَاةُ، ثُمَّ مَا اقْتَضَى بَعْدَ ذَلِكَ مِنْ قَلِيلٍ أَوْ كَثِيرٍ، فَعَلَيْهِ فِيهِ الزَّكَاةُ بِحَسَبِ ذَلِكَ[1].

قَالَ مَالِكٌ ﷺ: وَالدَّلِيلُ عَلَى أَنَّ الدَّيْنِ يَغِيبُ أَعْوَامًا، ثُمَّ يُقْتَضَى فَلاَ يَكُونُ فِيهِ إِلاَّ زَكَاةٌ وَاحِدَةٌ، أَنَّ الْعُرُوضَ تَكُونُ عِنْدَ الرَّجُلِ لِلتِّجَارَةِ أَعْوَامًا، ثُمَّ يَبِيعُهَا، فَلَيْسَ عَلَيْهِ فِي أَثْمَانِهَا إِلاَّ زَكَاةٌ وَاحِدَةٌ، وَذَلِكَ أَنَّهُ لَيْسَ عَلَى صَاحِبِ الدَّيْنِ أَوِ الْعُرُوضِ، أَنْ يُخْرِجَ زَكَاةَ ذَلِكَ الدَّيْنِ أَوِ الْعُرُوضِ مِنْ مَالٍ سِوَاهُ، وَإِنَّمَا يُخْرِجُ زَكَاةَ كُلِّ شَيْءٍ مِنْهُ، وَلاَ يُخْرِجُ الزَّكَاةَ مِنْ شَيْءٍ عَنْ شَيْءٍ غَيْرِهِ.

واتە: ئیمامی مالیك ﷺ گوتوویەتی: ئەو بابەتەی لەلای ئێمە هیچ ڕاجیایی تیا نییە دەربارەی قەرز ئەوەیە: خاوەنەکەی زەکاتی لێ نادات تاوەکوو وەریدەگرێتەوە، ئەگەرچی چەندین ساڵ لەلای ئەو کەسە بمێنێتەوە کە قەرزەکەی لەسەرە، دواتر وەریبگرێتەوە، ئەوە لە یەك زەکات زیاتر هیچی لەسەر نییە، جا ئەگەر بەشێك لە پارەکەی وەرگرتەوە زەکاتی تێدا واجب نابێ (ئەگەر ئەوەندەی وەریگرتۆتەوە نەگەیشتبێتە ئەندازەی زەکات)، ئینجا ئەگەر ماڵی دیکەی هەبوو جگە لەو بەشەقەرزەی وەریگرتۆتەوە، ئەوە زەکاتی تێدا واجب دەبێ و لەگەڵ ئەوەی وەرگیراوەتەوە لە قەرزەکەی زەکاتی لێ دەدرێ.

---

(١) ـ أخرجه أبو مصعب الزهري: ٦٧١، عن مالك به.




گوتوویەتی: وە ئەگەر پارەی لەسکەدراوی نەبوو تەنها ئەوەندە نەبێ كە لە قەرزەكەی وەریگرتۆتەوە، جا ئەوەی لە قەرزەكەش وەریگرتبۆیەوە زەكاتی تێدا واجب نەبوو (واتە نەگەیشتبووە ئەندازەی زەكات)، زەكاتی تیادا لەسەر واجب نییە، بەڵكوو با ئەو ژمارە پارەیەی وەریگرتۆتەوە بیپارێزێ، جا ئەگەر لەپاشان ئەندازەیەكی وای وەرگرتەوە كە ئەندازەی زەكاتی پێ تەواو دەبوو لەگەڵ ئەوەی پێشتر وەریگرتبوو، ئەوە زەكاتی تیادا لەسەر واجبە، جا ئەگەر ئەو پارەیەی كە یەكەم جار وەریگرتبۆیەوە سەرفی كردبوو یان سەرفیشی نەكردبوو، ئەوە هەر زەكات واجبە لەو پارەی وەریگرتۆتەوە (بەتێكڕا)، جا ئەگەر ئەوەی وەریگرتبۆیەوە گەیشتە بیست دینار یان دوو سەد درهەم، ئەوە زەكاتی تیادا لەسەر واجبە، دواتر ئەوەی وەریدەگرێتەوە دوای ئەوە لە زۆر و كەم، ئەوە تیایدا زەكاتی لەسەر واجبە بەو پێیەی باس كرا (واتە بەگوێرەی زۆری و كەمی ئەو پارەی وەریدەگرێتەوە).

ئیمامی مالیك ﷺ گوتوویەتی: بەڵگە لەسەر ئەوەی قەرز چەند ساڵێك دوا بكەوێت و دواتر وەربگیرێتەوە لە یەك زەكات زیاتری تێدا نییە، ئەوەیە: كەلوپەلی بازرگانی جاری وا هەیە چەندین ساڵ لەلای خاوەنەكەی دەمێنێتەوە، دواتر دەیفرۆشێ، لە یەك زەكات زیاتر واجب نییە لە پارەی شتومەكەكان، لەبەر ئەوەی لەسەر خاوەنی قەرز و خاوەنی شتومەكی بازرگانی واجب نییە زەكاتی قەرز و زەكاتی كەلوپەلی بازرگانی لە ماڵی دیكە دەربكات، بەڵكوو زەكاتی گشت شتێك لە خودی شتەكە دەردەكرێت و زەكاتی هیچ شتێك لە شتێكی دیكە دەرناكرێت.

**٦٨٩- [فتوى]** قَالَ مَالِكٌ ﷺ: الأَمْرُ عِنْدَنَا فِي الرَّجُلِ يَكُونُ عَلَيْهِ دَيْنٌ، وَعِنْدَهُ مِنَ الْعُرُوضِ مَا فِيهِ وَفَاءٌ لِمَا عَلَيْهِ مِنَ الدَّيْنِ، وَيَكُونُ عِنْدَهُ مِنَ النَّاضِّ سِوَى ذَلِكَ مَا تَجِبُ فِيهِ الزَّكَاةُ، فَإِنَّهُ يُزَكِّي مَا بِيَدِهِ مِنْ نَاضٍّ تَجِبُ فِيهِ الزَّكَاةُ، وَإِنْ لَمْ يَكُنْ عِنْدَهُ مِنَ الْعُرُوضِ وَالنَّقْدِ إِلاَّ وَفَاءُ دَيْنِهِ، فَلاَ زَكَاةَ عَلَيْهِ، حَتَّى يَكُونَ عِنْدَهُ مِنَ النَّاضِّ فَضْلٌ عَنْ دَيْنِهِ، مَا تَجِبُ فِيهِ الزَّكَاةُ، فَعَلَيْهِ أَنْ يُزَكِّيَهُ[١].

---

(١) ـ أخرجه أبو مصعب الزهري: ٦٧٢، عن مالك به.

(فەتوا): واتە: ئیمامی مالیك ﷺ گوتوویەتی: فەتواكە لای ئێمە ئاوایە: دەربارەی ئەو كەسەی قەرزی لەسەرە و هێندە كەلوپەلەشی هەیە بەشی ئەو قەرزە بكات كە لەسەریەتی، وە هێندەش زێڕ و زیوی لەسكەدراو و (پارەی) هەیە زەكاتی تێدا واجب ببێ، جیا لە كەلوپەلەكان، ئەوە زەكات دەدات لەوەی لە دەستیەتی لە زێڕ و زیوی لەسكەدراو و (پارەكە) كە زەكاتی تێدا واجبە، وە ئەگەر ئەوەندە كەلوپەل و پارەوپولەی نەبوو تەنها بەئەندازەی قەرزەكەی نەبێ، ئەوە زەكاتی لەسەر واجب نییە، تاوەكوو زێڕ و زیوی لەسكەدراو و پارەی زیاد لە قەرزەكەی دەبێت كە زەكاتی تێدا واجب بێ، ئەو كات لەسەری واجبە زەكاتی لێ بدات.

## ٩- زەكاتی كەلوپەلی بازرگانی[1]

٦٩٠- عَنْ رُزَيْقِ بْنِ حَيَّانَ ﷺ، وَكَانَ رُزَيْقٌ عَلَى جَوَازِ مِصْرَ، فِي زَمَانِ الْوَلِيدِ، وَسُلَيْمَانَ، وَعُمَرَ بْنِ عَبْدِ الْعَزِيزِ، فَذَكَرَ أَنَّ عُمَرَ بْنَ عَبْدِ الْعَزِيزِ ﷺ كَتَبَ إِلَيْهِ: أَنِ انْظُرْ مَنْ مَرَّ بِكَ مِنَ الْمُسْلِمِينَ، فَخُذْ مِمَّا ظَهَرَ مِنْ أَمْوَالِهِمْ، مِمَّا يُدِيرُونَ مِنَ التِّجَارَاتِ، مِنْ كُلِّ أَرْبَعِينَ دِينَارًا، دِينَارًا، فَمَا نَقَصَ، فَبِحِسَابِ ذَلِكَ، حَتَّى تَبْلُغَ عِشْرِينَ دِينَارًا، فَإِنْ نَقَصَتْ ثُلُثَ دِينَارٍ، فَدَعْهَا وَلاَ تَأْخُذْ مِنْهَا شَيْئًا، وَمَنْ مَرَّ بِكَ مِنْ أَهْلِ الذِّمَّةِ، فَخُذْ مِمَّا يُدِيرُونَ مِنَ التِّجَارَاتِ، مِنْ كُلِّ عِشْرِينَ دِينَارًا، دِينَارًا، فَمَا نَقَصَ فَبِحِسَابِ ذَلِكَ، حَتَّى تَبْلُغَ عَشَرَةَ دَنَانِيرَ، فَإِنْ نَقَصَتْ ثُلُثَ دِينَارٍ، فَدَعْهَا وَلاَ تَأْخُذْ مِنْهَا شَيْئًا، وَاكْتُبْ لَهُمْ بِمَا تَأْخُذُ مِنْهُمْ كِتَابًا إِلَى مِثْلِهِ مِنَ الْحَوْلِ[2].

واتە: لە ڕوزەیقی كوڕی حەییانەوە ﷺ گێردراوەتەوە لە كاتێكدا ڕوزەیق لە شوێنێكی میسڕ بووە (بۆ وەرگرتنی زەكات) لە سەردەمی وەلید و سولەیمان و عومەری كوڕی عەبدولعەزیز (رحمهم الله)، جا باسی كردووە بەوەی عومەری كوڕی عەبدولعەزیز ﷺ بۆی نووسیوە: ئاگادار بە هەر كەسێك لە مسوڵمانان بەلاتدا تێپەڕ بوو، لەو ماڵەی دیار و لەبەرچاوە لە سەروەتەكانیان لەو شتانەی بازرگانی پێوە دەكەن لە هەر چل دینارێك دینارێك وەربگرە، جا ئەوەی كەمتر بوو بەو حیسابەیە (بەپێی كەمتر كەمتر وەربگرە بە پێوەری یەك دینار بەرانبەر چل دینار)،

---

(١) ـ زَكَاةُ الْعُرُوضِ.

(٢) ـ مقطوع حسن. أخرجه أبو مصعب الزهري: ٦٧٣؛ والشافعي: ٤٤٧، عن مالك به.

تا دەگاتە بیست دینار، جا ئەگەر ئەو بیست دینارە سێیەکی دینارێکی لێ کەم بۆیەوە (واتە بیست دیناری تەواو نەبوو)، ئەوە وازی لێ بێنە و هیچی تیا وەرمەگرە، وە هەر کەسێك لە ئەهلی زیممە ـ کافری خاوەن پەیمان ـ بەلاتدا تێپەڕ بوو، ئەوە لەو شتانەی بازرگانی پێوە دەکەن لە هەر بیست دینارێك دینارێك وەربگرە، جا ئەگەر لەو ئەندازەیە کەمتر بوو ئەوە بەو حیسابە کەمتر وەربگرە، تا دەگاتە دە دینار، جا ئەگەر ئەو دە دینارە سێیەکی دینارێکی لێ کەم بۆیەوە، ئەوە وازی لێ بێنە هیچی تیا وەرمەگرە، وە نووسراویان بۆ بنووسە (واتە وەسڵیان بۆ بکە) تا بەرواری هەمان کاتی ساڵ لە ساڵێکی دیکە (واتە با بەڵگەی دانی زەکاتەکەیان لەلا بێت تاوەکوو لە ساڵێکدا لە یەك زەکات زیاتریان لێ وەرنەگیرێت).

٦٩١- **[فتوى]** قَالَ مَالِكٌ ﷬: الأَمْرُ عِنْدَنَا فِيمَا يُدَارُ مِنَ الْعُرُوضِ لِلتِّجَارَاتِ، أَنَّ الرَّجُلَ إِذَا صَدَّقَ مَالَهُ، ثُمَّ اشْتَرَى بِهِ عَرْضًا، بَزًّا، أَوْ رَقِيقًا، أَوْ مَا أَشْبَهَ ذَلِكَ، ثُمَّ بَاعَهُ قَبْلَ أَنْ يَحُولَ عَلَيْهِ الْحَوْلُ، مِنْ يَوْمِ أَخْرَجَ زَكَاتَهُ، فَإِنَّهُ لاَ يُؤَدِّي مِنْ ذَلِكَ الْمَالِ زَكَاةً، حَتَّى يَحُولَ عَلَيْهِ الْحَوْلُ مِنْ يَوْمَ صَدَّقَهُ، وَأَنَّهُ إِنْ لَمْ يَبِعْ ذَلِكَ الْعَرْضَ سِنِينَ، لَمْ يَجِبْ عَلَيْهِ فِي شَيْءٍ مِنْ ذَلِكَ الْعَرْضِ زَكَاةٌ، وَإِنْ طَالَ زَمَانُهُ، فَإِذَا بَاعَهُ، فَلَيْسَ عَلَيْهِ فِيهِ إِلاَّ زَكَاةٌ وَاحِدَةٌ[1].

(فەتوا): واتە: ئیمامی مالیك ﷬ گوتوویەتی: لای ئێمە دەربارەی ئەو کەلوپەلەی بازرگانی پێوە دەکرێت فەتوا ئاوایە: کەسەکە ئەگەر زەکاتی ماڵەکەی دا، دواتر بە پارە زەکاتلێدراوەکە شتومەکێکی کڕی، جا قوماش بێ یان کۆیلە بێ یان هەر شتێکی ئاوا، دواتر بیفرۆشێ پێش ئەوەی ساڵی بەسەردا بسوڕێتەوە لەو ڕۆژەوەی زەکاتەکەی دەرکردووە، ئەوە لەو ماڵەدا زەکات نادات تا ساڵی بەسەردا دەسوڕێتەوە لەو ڕۆژەوەی زەکاتەکەی داوە (چونکە ئەوە هی قۆناغێکی نوێیە)، وە ئەگەر چەندین ساڵ تێپەڕی و لەو شتومەك و ماڵەی نەفرۆشت، ئەوە لەو شتەدا هیچ زەکاتی لەسەر نییە، هەرچەندە کاتەکەی درێژ بێتەوە، وە ئەگەر (دوای چەند ساڵێك) فرۆشتی، ئەوە هیچی لەسەر نییە جگە لە یەك زەکات[2].

---

(١) ـ أخرجه أبو مصعب الزهري: ٦٧٤، عن مالك به.

(٢) ـ تێبینی: بەڵام لەلای سێ ئیمامەکەی دیکە دەبێ هەموو ساڵێ زەکاتی لێ بدات.

٦٩٢- **[فتوى]** قَالَ مَالِكٌ ﷺ: الأَمْرُ عِنْدَنَا فِي الرَّجُلِ يَشْتَرِي بِالذَّهَبِ أَوِ الْوَرِقِ حِنْطَةً أَوْ تَمْرًا لِلتِّجَارَةِ، ثُمَّ يُمْسِكُهَا حَتَّى يَحُولَ عَلَيْهَا الْحَوْلُ، ثُمَّ يَبِيعُهَا: أَنَّ عَلَيْهِ فِيهَا الزَّكَاةَ حِينَ يَبِيعُهَا، إِذَا بَلَغَ ثَمَنُهَا مَا تَجِبُ فِيهِ الزَّكَاةُ، وَلَيْسَ ذَلِكَ مِثْلَ الْحَصَادِ يَحْصُدُهُ الرَّجُلُ مِنْ أَرْضِهِ، وَلاَ مِثْلَ الْجِدَادِ[1].

(فەتوا): واتە: ئیمامی مالیك ﷺ گوتوویەتی: بابەتەكە لای ئێمە دەربارەی ئەو كەسەی گەنم یان خورما بە زێڕ یان بە زیو دەكڕێ، دواتر لای خۆی دەیهێڵێتەوە تا ساڵی بەسەردا دەسوڕێتەوە، دواتر دەیفرۆشێ، فەتواكەی ئاوایە: زەكاتی لەسەر واجبە لەو كاتەی دەیفرۆشێت ئەگەر پارە و بەهاكەی گەیشتە ئەو ئەندازەی زەكاتی تێدا واجبە، جا ئەوە وەك دروێنەی دانەوێڵە نییە كە مرۆڤ لە زەوییەكەی دەیدورێتەوە، وە وەك ڕنینەوەی بەروبوومی درەختیش نییە (تا بگوترێ لە كاتی بەدەستهێنان زەكاتی تێدا واجب دەبێ).

٦٩٣- **[فتوى]** قَالَ مَالِكٌ ﷺ: وَمَا كَانَ مِنْ مَالٍ عِنْدَ رَجُلٍ يُدِيرُهُ لِلتِّجَارَةِ، وَلاَ يَنِضُّ لِصَاحِبِهِ مِنْهُ شَيْءٌ تَجِبُ عَلَيْهِ فِيهِ الزَّكَاةُ، فَإِنَّهُ يَجْعَلُ لَهُ شَهْرًا مِنَ السَّنَةِ يُقَوِّمُ فِيهِ مَا كَانَ عِنْدَهُ مِنْ عَرْضٍ لِلتِّجَارَةِ، وَيُحْصِي فِيهِ مَا كَانَ عِنْدَهُ مِنْ نَقْدٍ أَوْ عَيْنٍ، فَإِذَا بَلَغَ ذَلِكَ كُلُّهُ مَا تَجِبُ فِيهِ الزَّكَاةُ، فَإِنَّهُ يُزَكِّيهِ[2].

(فەتوا): واتە: ئیمامی مالیك ﷺ گوتوویەتی: هەر ماڵ و سەروەتێك هەبێت لەلای كەسێك و بازرگانی پێوە بكات و هەر شتێكی لێ بەدەست بهێنێت كە زەكاتی تێدا واجب ببێت (لەو شتانە بێت كە زەكاتی تێدا واجبە)، ئەوە دەبێ مانگێك دابنێت لە ساڵدا كە تیایدا ئەو كەلوپەلانەی لەلایەتی بۆ بازرگانی بیقرسێنێت و جەردی بكات و بینرخێنێ، وە لەگەڵیشیدا ئەوەی هەیەتی و لەلایەتی حیساب و ئەژماری دەكات لە پارە و زێڕ و زیو، جا ئەگەر بە گشتیان گەیشتە ئەو ئەندازەیەی كە زەكاتی تێدا واجبە ئەوە زەكاتەكەی دەدات.

---

(١) ـ أخرجه أبو مصعب الزهري: ٦٧٥، عن مالك به.

(٢) ـ أخرجه أبو مصعب الزهري: ٦٧٦، عن مالك به.

٦٩٤- **[فتوی]** قَالَ مَالِكٌ ﷺ: وَمَنْ تَجَرَ مِنَ الْمُسْلِمِينَ، وَمَنْ لَمْ يَتْجُرْ سَوَاءٌ، لَيْسَ عَلَيْهِمْ إِلاَّ صَدَقَةٌ وَاحِدَةٌ فِي كُلِّ عَامٍ، تَجَرُوا فِيهِ أَوْ لَمْ يَتْجُرُوا[١].

(فەتوا): واتە: ئیمامی مالیك ﷺ گوتوویەتی: ئەو كەسەی بازرگانی دەكات لە مسوڵمانان و ئەوەشی كە بازرگانی ناكات وەكوو یەكن، لە هەر ساڵێكدا لە یەك زەكاتدان زیاتریان لەسەر نییە، (وەكوو یەكن) بازرگانی بە ماڵەكەوە بكەن یان بازرگانی پێوە نەكەن (مادەم مەرجەكانی واجببوونی هاتۆتە جێ، دەبێ زەكات بدەن، نابێ ئەو كەسەی بازرگانی پێوە ناكات بڵێت: زەكاتم لەسەر نییە خۆ بازرگانی پێوە ناكەم).

## ١٠- ئەوەی هاتووە دەربارەی كەنز (كە لە قورئان هەڕەشەی لێ كراوە)[٢]

٦٩٥- عَنْ عَبْدِ اللهِ بْنِ دِينَارٍ ﷺ، أَنَّهُ قَالَ: سَمِعْتُ عَبْدَ اللهِ بْنَ عُمَرَ ﷺ وَهُوَ يُسْأَلُ عَنِ الْكَنْزِ مَا هُوَ؟ فَقَالَ: هُوَ الْمَالُ الَّذِي لاَ تُؤَدَّى مِنْهُ الزَّكَاةُ[٣].

واتە: لە عەبدوڵڵای كوڕی دینارەوە ﷺ گێڕدراوەتەوە گوتوویەتی: گوێم لە عەبدوڵڵای كوڕی عومەر ﷺ بوو لە كاتێكدا پرسیاری لێكرا دەربارەی كەنز كە چییە؟ (واتە ماڵی گڵدراوە كە سزای سەختی قیامەتی لەدواوەیە و زەمكراوە)، ئەویش گوتی: (كەنز) بریتییە لەو ماڵ و سەروەتەی زەكاتی لێ نادرێت.

٦٩٦- عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ ﷺ، أَنَّهُ كَانَ يَقُولُ: مَنْ كَانَ عِنْدَهُ مَالٌ لَمْ يُؤَدِّ زَكَاتَهُ، مُثِّلَ لَهُ يَوْمَ الْقِيَامَةِ شُجَاعًا أَقْرَعَ، لَهُ زَبِيبَتَانِ، يَطْلُبُهُ حَتَّى يُمْكِنَهُ، يَقُولُ: أَنَا كَنْزُكَ[٤].

---

(١) ـ أخرجه أبو مصعب الزهري: ٦٧٧، عن مالك به.

(٢) ـ مَا جَاءَ فِي الْكَنْزِ.

(٣) ـ صحيح. أخرجه أبو مصعب الزهري: ٦٧٨؛ والشافعي: ٤٥١، عن مالك به.

(٤) ـ صحيح. أخرجه أبو مصعب الزهري: ٦٧٩؛ والحدثاني: ٢٠٩ب؛ والشيباني: ٣٤٢؛ والشافعي: ٣٩٠، وفي: ٤٥٢، كلهم عن مالك به.

واتە: لە ئەبو هورەیرەوە ﷺ گێردراوەتەوە دەیگوت: هەر کەسێك ماڵ و سەروەتی هەبێت و زەکاتی لێ نەدابێ، ئەوە لە ڕۆژی دوایی لێی دەبێتە مار و عەزیایێکی یەجگار ژەهراوی، دوو دزە و ددانی هەیە، لەدوای نابێتەوە تا خۆی تەسلیم دەکات (جا هەر پێوەی دەدات و) دەڵێت: من پوڵ و خەزێنەکەتم (کە زەکاتت لێ نەدەدا).

## ١١- زەکاتی مەڕ و بزن[1]

**٦٩٧-** عَنْ مَالِكٍ ﷺ، أَنَّهُ قَرَأَ كِتَابَ عُمَرَ بْنِ الْخَطَّابِ ﷺ فِي الصَّدَقَةِ، قَالَ: فَوَجَدْتُ فِيهِ:

بِسْمِ اللهِ الرَّحْمَنِ الرَّحِيمِ، هَذَا كِتَابُ الصَّدَقَةِ: فِي أَرْبَعٍ وَعِشْرِينَ مِنَ الإِبِلِ، فَدُونَهَا الْغَنَمُ فِي كُلِّ خَمْسٍ شَاةٌ، وَفِيمَا فَوْقَ ذَلِكَ إِلَى خَمْسٍ وَثَلاَثِينَ، ابْنَةُ مَخَاضٍ، فَإِنْ لَمْ تَكُنِ ابْنَةُ مَخَاضٍ، فَابْنُ لَبُونٍ ذَكَرٌ، وَفِيمَا فَوْقَ ذَلِكَ إِلَى خَمْسٍ وَأَرْبَعِينَ، بِنْتُ لَبُونٍ، وَفِيمَا فَوْقَ ذَلِكَ إِلَى سِتِّينَ، حِقَّةٌ طَرُوقَةُ الْفَحْلِ، وَفِيمَا فَوْقَ ذَلِكَ إِلَى خَمْسٍ وَسَبْعِينَ، جَذَعَةٌ، وَفِيمَا فَوْقَ ذَلِكَ إِلَى تِسْعِينَ، ابْنَتَا لَبُونٍ، وَفِيمَا فَوْقَ ذَلِكَ إِلَى عِشْرِينَ وَمِئَةٍ، حِقَّتَانِ طَرُوقَتَا الْفَحْلِ، فَمَا زَادَ عَلَى ذَلِكَ مِنَ الإِبِلِ، فَفِي كُلِّ أَرْبَعِينَ، بِنْتُ لَبُونٍ، وَفِي كُلِّ خَمْسِينَ، حِقَّةٌ، وَفِي سَائِمَةِ الْغَنَمِ، إِذَا بَلَغَتْ أَرْبَعِينَ، إِلَى عِشْرِينَ وَمِئَةٍ، شَاةٌ، وَفِيمَا فَوْقَ ذَلِكَ إِلَى مِائَتَيْنِ، شَاتَانِ، وَفِيمَا فَوْقَ ذَلِكَ إِلَى ثَلاَثِمِئَةٍ، ثَلاَثُ شِيَاهٍ، فَمَا زَادَ عَلَى ذَلِكَ، فَفِي كُلِّ مِئَةٍ، شَاةٌ، وَلاَ يُخْرَجُ فِي الصَّدَقَةِ تَيْسٌ، وَلاَ هَرِمَةٌ، وَلاَ ذَاتُ عَوَارٍ، إِلاَّ مَا شَاءَ الْمُصَّدِّقُ، وَلاَ يُجْمَعُ بَيْنَ مُفْتَرِقٍ، وَلاَ يُفَرَّقُ بَيْنَ مُجْتَمِعٍ، خَشْيَةَ الصَّدَقَةِ، وَمَا كَانَ مِنْ خَلِيطَيْنِ، فَإِنَّهُمَا يَتَرَاجَعَانِ بَيْنَهُمَا بِالسَّوِيَّةِ، وَفِي الرِّقَةِ إِذَا بَلَغَتْ، خَمْسَ أَوَاقٍ رُبُعُ الْعُشْرِ[2].

واتە: لە ئیمامی مالیکەوە ﷺ گێردراوەتەوە بەوەی لە نووسراوەکەی ئیمامی عومەر ﷺ خوێندوویەتەوە دەربارەی زەکات تیایدا (ئاوا) هاتووە: بە ناوی خوای بەبەزەیی میهرەبان، ئەوە نووسراوی زەکاتە: لە بیست و چوار وشتر بەرەوخوار لە هەر پێنج وشترێك مەڕێك یان بزنێك دەدرێ، وە لەو ژمارە بەرەوسەر تا دەگاتە سی و پێنج دانە، وشترێکی مێی یەکساڵە دەدرێ، جا ئەگەر ئەو وشترەی نەبوو، ئەوە

---

(١) ـ صَدَقَةُ الْمَاشِيَةِ.

(٢) ـ صحيح. أخرجه أبو مصعب الزهري: ٦٨٠، عن مالك به.

با وشترێکی نێری سێساڵە بدات، وە لەو ژمارە زیاتر تا دەگاتە چل و پێنج دانە، وشترێکی مێی سێساڵە دەدرێ، وە لەوە زیاتر تا دەگاتە شێست دانە، وشترێکی مێ دەدرێت کە چووبێتە ناو ساڵی چوارەمەوە و کاتی ئەوە هاتبێ بۆ زاوزێ بشێ، وە لەوە زیاتر تا دەگاتە حەفتا و پێنج دانە، وشترێك دەدرێت کە چووبێتە ناو ساڵی پێنجەمەوە، وە لەوە زیاتر تا دەگاتە نەوەد دانە، دوو وشتری مێی سێساڵە دەدرێ، وە لەوە زیاتر تا دەگاتە سەد و بیست دانە، دوو وشتری چوارساڵە دەدرێت کە شایستەی زاوزێ بن، جا ئەگەر لەوە زیاتر بوو، ئەوە (ئەو یاسایە جێبەجێ دەکرێت): لە هەر چل وشترێکدا وشترێکی مێی سێساڵە دەدرێ، وە لە هەر پەنجا دانەیەکدا وشترێکی چوارساڵە دەدرێت (جا کەسەکە بەئارەزووی خۆیەتی چل چل یان پەنجا پەنجا حیسابیان دەکات).

وە دەربارەی ئەو مەڕ و بزنەی بە گژ و گیای خۆڕسك بەخێو کراون و مەسرەفی زۆریان لێ نەکراوە، ئەگەر گەیشتن بە چل دانە تا سەد و بیست دانە، یەك مەڕ یان یەك بزن دەکات بە زەکات، وە لەوە زیاتر تا دەگات بە دوو سەت، دوو مەڕ یان بزن دەدات، وە لەوە زیاتر تا دەگات بە سێ سەد دانە، سێ مەڕ یان سێ بزن دەبێتە زەکات، جا لەو ژمارە زیاتر، لە هەر سەد دانەیەك، یەك مەڕ یان بزن دەدرێ، جا لە زەکاتدا ئاژەڵی نێر و پیر و کوێر نادرێ، تەنها لەو کاتە نەبێت کە زەکاتوەرگر بە ئیجتیهادی خۆی (لەبەر قەڵەوی و بەهێزی و بەسوودی پێی چاك دەبێت بۆ مسوڵمانان) ئەو کات دروستە وەریبگرێ، وە ئاژەڵی جیا کۆ ناکرێتەوە و ئاژەڵی کۆکراوە جیاناکرێتەوە لە ترسی زەکات (بۆ نموونە: وەك ئەو کەسەی چل مەڕ و بزنی هەبێت و خۆی بکات بە شەریکی کەسێك تا بە هەردووکیان یەك ئاژەڵ لە زەکات بدەن، لە کاتێکدا ئەگەر تێکەڵی نەکات بەتەنها خۆی دەبێ ئاژەڵێك بدات، نموونەی دووەمیشیان: وەك کەسێك کە بیست دانە ئاژەڵی هەیە لەگەڵ کەسێکی دیکە شەریکە ئەویش بیستی هەیە، جا دەبێ بە هەردووکیان ئاژەڵێك بە زەکات بدەن، بەڵام دەچێت لەگەڵ کەسەکە جیای دەکاتەوە تا نەبنە چل دانە و زەکاتیان لەسەر واجب نەبێ، ئەوە حەرامە و هەر زەکاتیان لەسەر واجب دەبێ، چونکە دەیانەوێت بەفێڵ لە زەکات ڕابکەن)، وە لە ماڵی تێکەڵدا (وەك هاوبەشی نێوان




دوو كەس یان زیاتر) هەر كەسە و بەپێی ژمارەی ئاژەڵەكانی (واتە لە زەكاتی كۆی گشتی بەپێی پشكی خۆی زەكاتی دەكەوێتە سەر)، وە لە زیودا ئەگەر گەیشتە پێنج ئۆقیە (واتە ٢٠٠ مسقال) چارەگی دەیەك دەبێتە زەكات.

## ١٢- ئەوەی هاتووە دەربارەی زەكاتی مانگا[١]

٦٩٨- عَنْ طَاوُوسٍ الْيَمَانِيِّ ﷺ، أَنَّ مُعَاذَ بْنَ جَبَلٍ الأَنْصَارِيَّ ﷺ أَخَذَ مِنْ ثَلاَثِينَ بَقَرَةً، تَبِيعًا، وَمِنْ أَرْبَعِينَ بَقَرَةً، مُسِنَّةً، وَأُتِيَ بِمَا دُونَ ذَلِكَ، فَأَبَى أَنْ يَأْخُذَ مِنْهُ شَيْئًا، وَقَالَ: لَمْ أَسْمَعْ مِنْ رَسُولِ اللهِ ﷺ فِيهِ شَيْئًا، حَتَّى أَلْقَاهُ فَأَسْأَلَهُ، فَتُوُفِّيَ رَسُولُ اللهِ ﷺ قَبْلَ أَنْ يَقْدُمَ مُعَاذُ بْنُ جَبَلٍ ﷺ [٢].

واتە: لە تاوسی یەمانییەوە ﷺ گێڕدراوەتەوە (گوتوویەتی): موعازی كوڕی جەبەلی ئەنصاری ﷺ (كە كرابوو بە كاربەدەستی یەمەن) لە سی مانگا گۆلكێكی نێری وەردەگرت بە زەكات، وە لە چل مانگادا مێنگینێكی وەردەگرت، جا كەمتر لەوە دەهێنرا بۆ لای (واتە دەگوترا كەمتر لە سی مانگا زەكاتی چەندە)، ئەویش ڕەتی دەكردەوە هیچ شتێك لەو ئەندازەیە وەربگرێت و دەیگوت: هیچ شتێكم لە پێغەمبەری خواوە ﷺ نەبیستووە دەربارەی ئەوە (كە فەرموویێتی ئەو ئەندازەیە زەكاتی تێدا واجبە) تا پێی دەگەم و پرسیاری لێ دەكەم، جا پێغەمبەری خوا ﷺ وەفاتی كرد بەر لەوەی موعازی كوڕی جەبەل ﷺ بگەڕێتەوە بۆ لای.

٦٩٩- **[فتوى]** قَالَ مَالِكٌ ﷺ: أَحْسَنُ مَا سَمِعْتُ فِيمَنْ كَانَتْ لَهُ غَنَمٌ عَلَى رَاعِيَيْنِ مُفْتَرِقَيْنِ، أَوْ عَلَى رِعَاءٍ مُفْتَرِقِينَ، فِي بُلْدَانٍ شَتَّى، أَنَّ ذَلِكَ يُجْمَعُ كُلُّهُ عَلَى صَاحِبِهِ، فَيُؤَدِّي صَدَقَتَهُ، وَمِثْلُ ذَلِكَ، الرَّجُلُ يَكُونُ لَهُ الذَّهَبُ أَوِ الْوَرِقُ مُتَفَرِّقَةً، فِي أَيْدِي نَاسٍ شَتَّى، أَنَّهُ يَنْبَغِي لَهُ أَنْ يَجْمَعَهَا، فَيُخْرِجَ مِنْهَا مَا وَجَبَ عَلَيْهِ فِي ذَلِكَ مِنْ زَكَاتِهَا[٣].

---

(١) ـ مَا جَاءَ فِي صَدَقَةِ الْبَقَرِ.

(٢) ـ ضعيف. أخرجه أبو مصعب الزهري: ٦٨١؛ والشيباني: ٣٤٠؛ والشافعي: ٤٠١، كلهم عن مالك به.

(٣) ـ أخرجه أبو مصعب الزهري: ٦٨٢، عن مالك به.




(فەتوا): واتە: ئیمامی مالیك ﷺ گوتوویەتی: چاکترینی ئەوەی گوێبیستی بووم دەربارەی ئەو کەسەی مەڕومالاتی هەیە بەسەر دوو شوان دابەشی کردوون، یان بەسەر چەندین شوان دابەشی کردوون، لە چەندین ناوچە و مەملەکەت، گشت ئەوانە کۆدەکرێنەوە بەسەر خاوەنەکەی و زەکاتی گشتیان بەیەکەوە دەدات، بەهەمان شێوە ئەو کەسەی زێر یان زیوی پەرشوبلاوی هەیە بەدەستی چەندین کەسەوەیە، ئەوە لەسەری واجبە کۆیان بکاتەوە و ئەو زەکاتەی تیایدا واجبە دەریبکات.

٧٠٠- **[فتوى]** قَالَ مَالِكٌ ﷺ فِي الرَّجُلِ يَكُونُ لَهُ الضَّأْنُ وَالْمَعْزُ: أَنَّهَا تُجْمَعُ عَلَيْهِ فِي الصَّدَقَةِ، فَإِنْ كَانَ فِيهَا مَا تَجِبُ فِيهِ الصَّدَقَةُ، صُدِّقَتْ، وَقَالَ: إِنَّمَا هِيَ غَنَمٌ كُلُّهَا، وَفِي كِتَابِ عُمَرَ بْنِ الْخَطَّابِ ﷺ: وَفِي سَائِمَةِ الْغَنَمِ، إِذَا بَلَغَتْ أَرْبَعِينَ شَاةً، شَاةٌ.

(فەتوا): واتە: ئیمامی مالیك ﷺ دەربارەی ئەو کەسەی مەڕ و بزنی هەیە گوتوویەتی: لە زەکاتدا (گشت) ئاژەڵەکانی بەسەر کۆ دەکرێتەوە (واتە هەر چەندە جۆر و شوێن و شوانیان جیا بێ، مادەم گشتیان موڵکی ئەون گشتیانی بە یەك پارچە بەسەر حیساب دەکرێ)، جا ئەگەر زەکاتیان تیادا واجب بوو، ئەوە زەکاتی لێ دەدرێ، وە گوتوویەتی: چونکە گشتیان ئاژەڵی بچووکن (بزن و مەڕ یەك حوکمیان هەیە)، وە لە نووسراوەکەی عومەری کوڕی خەتتابدا ﷺ هاتووە: لە ئاژەڵی بچووکی کەممەسرەف و لەوەڕێندراو بە گژوگیای خۆڕسك کە ژمارەیان بگات بە چل ئاژەڵ، ئاژەڵێك زەکاتە.

٧٠١- **[فتوى]** قَالَ مَالِكٌ ﷺ: فَإِنْ كَانَتِ الضَّأْنُ هِيَ أَكْثَرَ مِنَ الْمَعْزِ، وَلَمْ يَجِبْ عَلَى رَبِّهَا إِلاَّ شَاةٌ وَاحِدَةٌ، أَخَذَ الْمُصَدِّقُ تِلْكَ الشَّاةَ الَّتِي وَجَبَتْ عَلَى رَبِّ الْمَالِ مِنَ الضَّأْنِ، وَإِنْ كَانَتِ الْمَعْزُ أَكْثَرَ، أُخِذَ مِنْهَا، فَإِنِ اسْتَوَى الضَّأْنُ وَالْمَعْزُ، أَخَذَ مِنْ أَيَّتِهِمَا شَاءَ[1].

(فەتوا): واتە: ئیمامی مالیك ﷺ گوتوویەتی: ئەگەر مەڕ زیاتر بوو لە بزن و لە یەك سەر ئاژەڵیش زیاتر (زەکاتی تیادا) واجب نەبوو، ئەوە دەبێ زەکاتوەرگرەکە ئەو

---

(١) ـ أخرجه أبو مصعب الزهري: ٦٨٣، عن مالك به.

سەر ئاژەڵەی کە واجب بووە لەسەر خاوەن ئاژەڵەکە لە جۆری مەڕ وەربگرێ، وە ئەگەر بزن زیاتر بوو، ئەوە لە بزنەکە وەردەگیرێ، وە ئەگەر ژمارەی مەڕ و بزنەکان وەکوو یەك بوون، ئەوە کامیانی ئارەزوو کرد دەتوانێ وەریبگرێ (جیاوازی نییە).

٧٠٢- **[فتوى]** قَالَ مَالِكٌ ﷺ: وَكَذَلِكَ الإِبِلُ الْعِرَابُ، وَالْبُخْتُ، يُجْمَعَانِ عَلَى رَبِّهِمَا فِي الصَّدَقَةِ، وَقَالَ: إِنَّمَا هِيَ إِبِلٌ كُلُّهَا، فَإِنْ كَانَتِ الْعِرَابُ هِيَ أَكْثَرَ مِنَ الْبُخْتِ، وَلَمْ يَجِبْ عَلَى رَبِّهَا إِلاَّ بَعِيرٌ وَاحِدٌ، فَلْيَأْخُذْ مِنَ الْعِرَابِ صَدَقَتَهَا، فَإِنْ كَانَتِ الْبُخْتُ أَكْثَرَ، فَلْيَأْخُذْ مِنْهَا، فَإِنِ اسْتَوَتْ، فَلْيَأْخُذْ مِنْ أَيَّتِهِمَا شَاءَ[1].

(فەتوا): واتە: ئیمامی مالیك ﷺ گوتوویەتی: بەهەمان شێوە وشتری عەرەبی و وشتری عەجەمی بەیەکەوە لەسەر خاوەن ماڵ کۆدەکرێتەوە (گشتیان بەیەکەوە حیساب دەکرێن)، گوتوویەتی: چونکە گشتیان وشترن، جا ئەگەر وشترە عەرەبییەکان زۆرتر بوون لە وشترە عەجەمییەکان و لە یەك وشتریش زیاتری لەسەر واجب نەبوو، ئەوە با (زەکاتوەرگرەکە) زەکاتەکە لە وشترە عەرەبییەکان وەربگرێ، وە ئەگەر وشترە عەجەمییەکان زیاتر بوون، ئەوە با زەکاتەکە لەوان وەربگرێ، وە ئەگەر وەکوو یەکدی بوون، ئەوە با بەئارەزووی خۆی لە هەر کامەیان ویستی وەریبگرێت.

٧٠٣- **[فتوى]** قَالَ مَالِكٌ ﷺ: وَكَذَلِكَ الْبَقَرُ، وَالْجَوَامِيسُ، تُجْمَعُ فِي الصَّدَقَةِ عَلَى رَبِّهَا، وَقَالَ: إِنَّمَا هِيَ بَقَرٌ كُلُّهَا، فَإِنْ كَانَتِ الْبَقَرُ هِيَ أَكْثَرَ مِنَ الْجَوَامِيسِ، وَلاَ يَجِبُ عَلَى رَبِّهَا إِلاَّ بَقَرَةٌ وَاحِدَةٌ، فَلْيَأْخُذْ مِنَ الْبَقَرِ صَدَقَتَهُمَا، وَإِنْ كَانَتِ الْجَوَامِيسُ أَكْثَرَ، فَلْيَأْخُذْ مِنْهَا، فَإِنِ اسْتَوَتْ، فَلْيَأْخُذْ مِنْ أَيَّتِهِمَا شَاءَ، فَإِذَا وَجَبَتْ فِي ذَلِكَ الصَّدَقَةُ، صُدِّقَ الصِّنْفَانِ جَمِيعًا.

(فەتوا): واتە: ئیمامی مالیك ﷺ گوتوویەتی: مانگا و گامێشیش بەهەمان شێوە لە زەکاتدا بەسەر خاوەنەکەی کۆ دەکرێتەوە، گوتوویەتی: چونکە گشتیان لە جۆری مانگان، جا ئەگەر مانگاکان زیاتر بوون لە گامێشەکان و لە یەك دانە زیاتر زەکاتی لەسەر واجب نەبوو، ئەوە با (زەکاتوەرگر) زەکاتەکە لە جۆری مانگا وەربگرێ،

---

(١) ـ أخرجه أبو مصعب الزهري: ٦٨٤، عن مالك به.

وە ئەگەر گامێشەکان زیاتر بوون، ئەوە با لە جۆری گامێشەکان وەربگرێ، وە ئەگەر ژمارەیان وەکوو یەکدی بوو، ئەوە با لە هەر کامێکیان دەیەوێت وەریبگرێ، ئەگەر زەکاتەکە لە یەك دانە زیاتر بوو، ئەوە زەکات لە هەردوو جۆرەکە دەدرێت.

**٧٠٤- [فتوى]** قَالَ مَالِكٌ ﷺ: مَنْ أَفَادَ مَاشِيَةً مِنْ إِبِلٍ، أَوْ بَقَرٍ، أَوْ غَنَمٍ، فَلاَ صَدَقَةَ عَلَيْهِ فِيهَا حَتَّى يَحُولَ عَلَيْهَا الْحَوْلُ مِنْ يَوْمَ أَفَادَهَا، إِلاَّ أَنْ يَكُونَ لَهُ قَبْلَهَا نِصَابُ مَاشِيَةٍ، وَالنِّصَابُ مَا تَجِبُ فِيهِ الصَّدَقَةُ، إِمَّا خَمْسُ ذَوْدٍ مِنَ الإِبِلِ، وَإِمَّا ثَلاَثُونَ بَقَرَةً، وَإِمَّا أَرْبَعُونَ شَاةً، فَإِذَا كَانَ لِلرَّجُلِ خَمْسُ ذَوْدٍ مِنَ الإِبِلِ، أَوْ ثَلاَثُونَ بَقَرَةً، أَوْ أَرْبَعُونَ شَاةً، ثُمَّ أَفَادَ إِلَيْهَا إِبِلاً، أَوْ بَقَرًا، أَوْ غَنَمًا، بِاشْتِرَاءٍ، أَوْ هِبَةٍ، أَوْ مِيرَاثٍ، فَإِنَّهُ يُصَدِّقُهَا مَعَ مَاشِيَتِهِ حِينَ يُصَدِّقُهَا، وَإِنْ لَمْ يَحُلْ عَلَى الْفَائِدَةِ الْحَوْلُ، وَإِنْ كَانَ مَا أَفَادَ مِنَ الْمَاشِيَةِ إِلَى مَاشِيَتِهِ، قَدْ صُدِّقَتْ قَبْلَ أَنْ يَشْتَرِيَهَا بِيَوْمٍ وَاحِدٍ، أَوْ قَبْلَ أَنْ يَرِثَهَا بِيَوْمٍ وَاحِدٍ، فَإِنَّهُ يُصَدِّقُهَا مَعَ مَاشِيَتِهِ حِينَ يُصَدِّقُ مَاشِيَتَهُ[1].

قَالَ مَالِكٌ ﷺ: وَإِنَّمَا مَثَلُ ذَلِكَ، مَثَلُ الْوَرِقِ يُزَكِّيهَا الرَّجُلُ ثُمَّ يَشْتَرِي بِهَا مِنْ رَجُلٍ آخَرَ عَرْضًا، وَقَدْ وَجَبَتْ عَلَيْهِ فِي عَرْضِهِ ذَلِكَ، إِذَا بَاعَهُ، الصَّدَقَةُ، فَيُخْرِجُ الرَّجُلُ الآخَرُ صَدَقَتَهَا، فَيَكُونُ الأَوَّلُ قَدْ صَدَّقَهَا هَذَا الْيَوْمَ، وَيَكُونُ الآخَرُ قَدْ صَدَّقَهَا مِنَ الْغَدِ.

(فەتوا): واتە: ئیمامی مالیك ﷺ گوتوویەتی: هەر کەسێك ئاژەڵی وشتر یان مانگا یان مەڕ و بزنی بەدەست هێنا، ئەوە زەکاتی لەسەر واجب نییە تیایدا، تاوەکوو ساڵی بەسەردا دەسوڕێتەوە لەو ڕۆژەوەی بەدەستی هێناوە، تەنها لەو حاڵەتەدا نەبێت کە پێشتر نیصابی زەکاتی هەبووبێ، جا ئەو نیصابەی کە زەکاتی تێدا کە زەکاتی تێدا واجب دەبێت (کە بەم شێوەیەیە): یان پێنج دانەیە لە وشتر، یان سی دانەیە لە مانگا، یان چل دانەیە لە مەڕ و بزن، دواتر وشتر یان مانگا یان مەڕ یان بزنی دیکەی بەدەست هێنا، بەکڕین بێت یان بەدیاری بێت یان بەمیرات، ئەوە دەبێ زەکاتی لێ بدات لەگەڵ ئاژەڵەکانی حیسابی بکات کاتێ زەکات دەدات، هەرچەندە ساڵیش نەسوڕابێتەوە بەسەر ئەو ئاژەڵەی بەدەستی هێناوە، هەرچەندە ئەو ئاژەڵەی بەدەستی هێناوە زەکاتیشی لێ درابێت (لەلایەن خاوەنەکەی پێشووی) ڕۆژێك بەر لەوەی ئەو بیکڕێت یان ڕۆژێك بەر لەوەی بەمیرات وەریبگرێ، ئەوە دەبێ هەر

---

(١) ـ أخرجه أبو مصعب الزهري: ٦٨٥، عن مالك به.

زەكاتی لێ بدات لەگەڵ ئاژەڵەكانی خۆی كاتێ زەكاتی ئاژەڵەكانی دەردەكات (چونكە پەیوەندی بە زەكاتی كەسانی دیكەوە نییە).

جا ئیمامی مالیك ﷺ گوتوویەتی: نموونەی ئەوە وەك نموونەی زیو وایە، خاوەنەكەی زەكاتی لێ دەدات دواتر (بەو درهەمە زیوەی زەكاتی لێ دراوە) لە كەسێكی دیكە شتێكی پێ دەكرێ، لە كاتێكدا لەو شتومەكەدا زەكات واجبە (لەسەر خاوەنەكەی) كاتێ دەیفرۆشێ، بۆیە كەسەكە (فرۆشیارەكە لە هەمان پارە زەكاتلێدراوەكە) زەكات دەردەكات، جا (جاری وا هەیە) كەسەكەی یەكەم ئەمڕۆ زەكاتی لێداوەو ئەوەی دیكەش بەیانی زەكاتی لێ دەدات (هەمان پارەشە دەستاودەست دەكات، زەكاتی كەسیان بە پارەكەوە نالكێن و جێگای زەكاتی ئەویتر ناگرێتەوە).

٧٠٥- **[فتوى]** قَالَ مَالِكٌ ﷺ: فِي رَجُلٍ كَانَتْ لَهُ غَنَمٌ لاَ تَجِبُ فِيهَا الصَّدَقَةُ، فَاشْتَرَى إِلَيْهَا غَنَمًا كَثِيرَةً، تَجِبُ فِي دُونِهَا الصَّدَقَةُ، أَوْ وَرِثَهَا، أَنَّهُ لاَ تَجِبُ عَلَيْهِ فِي الْغَنَمِ كُلِّهَا صَدَقَةٌ، حَتَّى يَحُولَ عَلَيْهَا الْحَوْلُ مِنْ يَوْمَ أَفَادَهَا بِاشْتِرَاءٍ أَوْ مِيرَاثٍ، وَذَلِكَ أَنَّ كُلَّ مَا كَانَ عِنْدَ الرَّجُلِ مِنْ مَاشِيَةٍ لاَ تَجِبُ فِيهَا الصَّدَقَةُ، مِنْ إِبِلٍ، أَوْ بَقَرٍ، أَوْ غَنَمٍ، فَلَيْسَ يُعَدُّ ذَلِكَ نِصَابَ مَالٍ، حَتَّى يَكُونَ فِي كُلِّ صِنْفٍ مِنْهَا مَا تَجِبُ فِيهِ الصَّدَقَةُ، فَذَلِكَ النِّصَابُ الَّذِي يُصَدِّقُ مَعَهُ مَا أَفَادَ إِلَيْهِ صَاحِبُهُ، مِنْ قَلِيلٍ، أَوْ كَثِيرٍ مِنَ الْمَاشِيَةِ[١].

(فەتوا): واتە: ئیمامی مالیك ﷺ دەربارەی كەسێك كە چەندین مەڕ و بزنی هەیە و زەكاتیان تێدا واجب نابێ، جا چوو زۆر مەڕ و بزنی كڕین یان بە میرات وەریگرتن و وەگەڵی خستن، بەشێوەیەك زەكات واجب دەبوو لە ژمارەیەكی كەمتر لەو ژمارەیەی ئەو، گوتوویەتی: زەكاتی لەسەر واجب نییە لە هیچ لە ئاژەڵەكان تا ساڵی بەسەردا نەسوڕێتەوە لەو ڕۆژەوەی بە كڕین یان میرات بەدەستی هێناون، چونكە ئەو ئاژەڵانەی كەسەكە هەیەتی لە وشتر و مانگا و مەڕ و بزن كە هەر یەكەیان زەكاتی تێدا واجب نەبێ، ئەوە (كۆی جۆرە جیاوازەكان) بە نیصاب دانانرێ، تاوەكوو هەر جۆرێك لەوان دەگاتە ئەندازەی زەكات و زەكاتی تێدا

---

(١) ـ أخرجه أبو مصعب الزهري: ٦٨٦، عن مالك به.

واجب دەبێ، جا ئەوە ئەو ئەندازە حیساب بۆ کراوەیە کە زەکاتی لێ دەدات ئەو کەسەی ئاژەڵی دیکەی بەدەست هێناوە لە کەم و زۆر.

٧٠٦- **[فتوى]** قَالَ مَالِكٌ ﷺ: وَلَوْ كَانَتْ لِرَجُلٍ إِبِلٌ أَوْ بَقَرٌ أَوْ غَنَمٌ، تَجِبُ فِي كُلِّ صِنْفٍ مِنْهَا الصَّدَقَةُ، ثُمَّ أَفَادَ إِلَيْهَا بَعِيراً، أَوْ بَقَرَةً، أَوْ شَاةً، صَدَّقَهَا مَعَ مَاشِيَتِهِ حِينَ يُصَدِّقُهَا.

قَالَ مَالِكٌ ﷺ: وَهَذَا أَحَبُّ مَا سَمِعْتُ إِلَيَّ فِي هَذَا[1].

(فەتوا): واتە: ئیمامی مالیك ﷺ گوتوویەتی: ئەگەر کەسێك وشتر یان مانگا یان مەر و بزنی هەبوو و لە گشت جۆرێکیان زەکات واجب دەبوو، دواتر وشتر یان مانگا یان مەڕ یان بزنی دیکەی بەدەست هێنا، ئەوە دەبێ زەکاتی لێ بدات لەگەڵ ئاژەڵەکانی تری کاتێ زەکات دەردەکات.

ئیمامی مالیك ﷺ گوتوویەتی: جا ئەوەیان باشترین شتێکە کە دەربارەی ئەو بابەتە بیستوومە.

٧٠٧- **[فتوى]** قَالَ مَالِكٌ ﷺ: فِي الْفَرِيضَةِ تَجِبُ عَلَى الرَّجُلِ، فَلاَ تُوجَدُ عِنْدَهُ: أَنَّهَا إِنْ كَانَتِ بِنْتَ مَخَاضٍ فَلَمْ تُوجَدْ، أُخِذَ مَكَانَهَا ابْنُ لَبُونٍ ذَكَرٌ، وَإِنْ كَانَتْ بِنْتَ لَبُونٍ، أَوْ حِقَّةً، أَوْ جَذَعَةً، وَلَمْ يَكُنْ عِنْدَهُ، كَانَ عَلَى رَبِّ الإِبِلِ أَنْ يَبْتَاعَهَا لَهُ حَتَّى يَأْتِيَهُ بِهَا.

قَالَ مَالِكٌ ﷺ: وَلاَ أُحِبُّ أَنْ يُعْطِيَهُ قِيمَتَهَا[2].

(فەتوا): واتە: ئیمامی مالیك ﷺ دەربارەی ئەو جۆرە زەکاتەی واجب بووە لەسەر کەسێك و لەو جۆرەشی لەلا نییە (بۆ نموونە پێنج وشتری هەیە و بزنێکی لەسەر واجب بووە، کەسەکەش بزنی نییە)، گوتوویەتی: ئەگەر زەکاتەکە بریتی بێت لە وشتری مێی یەکساڵە، ئەوە لە جێگەی ئەو وشترێکی نێری دووساڵە وەردەگیرێ، وە ئەگەر زەکاتە واجبووەکە بریتی بێت لە وشترێکی مێی دووساڵە یان وشترێکی مێی سێساڵە یان وشترێکی مێی چوارساڵە و ئەوانەشی نەبێ، ئەوە لەسەر خاوەنەکە واجبە بیانکڕێ هەتا جێبەجێیان بکات (و بڕی زەکاتەکە بدات).

---

(١) ـ أخرجه أبو مصعب الزهري: ٦٨٧، عن مالك به.

(٢) ـ أخرجه أبو مصعب الزهري: ٦٨٨، عن مالك به.




ئیمامی مالیك ﷺ گوتوویەتی: پێم خۆش و چاك نییە نرخەکەی بدات (بەڵکوو دەبێت خودی ئاژەڵەکان پەیدا بکات).

**٧٠٨- [فتوى]** قَالَ مَالِكٌ ﷺ، فِي الإِبِلِ النَّوَاضِحِ، وَالْبَقَرِ السَّوَانِي، وَبَقَرِ الْحَرْثِ: إِنِّي أَرَى أَنْ يُؤْخَذَ مِنْ ذَلِكَ كُلِّهِ، إِذَا وَجَبَتْ فِيهِ الصَّدَقَةُ[1].

(فەتوا): واتە: ئیمامی مالیك ﷺ دەربارەی وشتری ئاودەر (کە ئاوی باغ و بێستانی پێ دەدەن)، وە دەربارەی مانگای ئاوهەڵکێش (کە ئاو دەردەهێنێ لە بیر)، وە دەربارەی مانگای جۆتکردن و کێڵان گوتوویەتی: من بۆچوونم وایە زەکات لە گشت لەوانە وەردەگیرێ، ئەگەر بگەن بە ئەندازەی زەکات.

## ١٣- زەکاتی شەریك و هاوبەشەکان (زەکاتی ماڵی تێکەڵ)[2]

**٧٠٩- [فتوى]** قَالَ مَالِكٌ ﷺ، فِي الْخَلِيطَيْنِ إِذَا كَانَ الرَّاعِي وَاحِدًا، وَالْفَحْلُ وَاحِدًا، وَالْمُرَاحُ وَاحِدًا، وَالدَّلْوُ وَاحِدًا: فَالرَّجُلاَنِ خَلِيطَانِ، وَإِنْ عَرَفَ كُلُّ وَاحِدٍ مِنْهُمَا مَالَهُ مِنْ مَالِ صَاحِبِهِ.

قَالَ: وَالَّذِي لاَ يَعْرِفُ مَالَهُ مِنْ مَالِ صَاحِبِهِ، لَيْسَ بِخَلِيطٍ، إِنَّمَا هُوَ شَرِيكٌ.

قَالَ مَالِكٌ ﷺ: وَلاَ تَجِبُ الصَّدَقَةُ عَلَى الْخَلِيطَيْنِ، حَتَّى يَكُونَ لِكُلِّ وَاحِدٍ مِنْهُمَا مَا تَجِبُ فِيهِ الصَّدَقَةُ.

قَالَ مَالِكٌ ﷺ: وَتَفْسِيرُ ذَلِكَ، أَنَّهُ إِذَا كَانَ لأَحَدِ الْخَلِيطَيْنِ أَرْبَعُونَ شَاةً فَصَاعِدًا، وَلِلآخَرِ أَقَلُّ مِنْ أَرْبَعِينَ شَاةً، كَانَتِ الصَّدَقَةُ عَلَى الَّذِي لَهُ الأَرْبَعُونَ، شَاةً، وَلَمْ تَكُنْ عَلَى الَّذِي لَهُ أَقَلُّ مِنْ ذَلِكَ، صَدَقَةٌ.

قَالَ مَالِكٌ ﷺ: فَإِنْ كَانَ لِكُلِّ وَاحِدٍ مِنْهُمَا مَا تَجِبُ فِيهِ الصَّدَقَةُ جُمِعَا فِي الصَّدَقَةِ، وَوَجَبَتِ الصَّدَقَةُ عَلَيْهِمَا جَمِيعًا، فَإِنْ كَانَ لأَحَدِهِمَا أَلْفُ شَاةٍ، أَوْ أَقَلُّ مِنْ ذَلِكَ، مِمَّا تَجِبُ فِيهِ الصَّدَقَةُ، وَلِلآخَرِ أَرْبَعُونَ شَاةً أَوْ أَكْثَرُ، فَهُمَا خَلِيطَانِ يَتَرَادَّانِ الْفَضْلَ بَيْنَهُمَا بِالسَّوِيَّةِ، عَلَى قَدْرِ عَدَدِ أَمْوَالِهِمَا، عَلَى الأَلْفِ بِحِصَّتِهَا، وَعَلَى الأَرْبَعِينَ بِحِصَّتِهَا.

---

(١) ـ أخرجه أبو مصعب الزهري: ٦٩٠، عن مالك به.

(٢) ـ صَدَقَةُ الْخُلَطَاءِ.





(فەتوا): واتە: ئیمامی مالیك ﷺ دەربارەی دووماڵی تێكەڵ گوتوویەتی: ئەگەر ئاژەڵەكان شوانیان یەك بوو، وە بەران و نێریان یەك بوو، وە شوێنی مانەوەی شەوانەیان یەك بوو، وە ئاودانییان یەك بوو، ئەوە (كاری ئەو دوو كەسەكە) بریتییە لە ماڵی تێكەڵ (واتە: لە شەرعدا پێی دەگوترێ ماڵی تێكەڵ)، ئەگەر هەر یەكەیان بزانێ ماڵی خۆی چەندە و لە ماڵی هاوڕێكەی جیای بكاتەوە (بەوەی بزانێ چەندە).

گوتوویەتی: ئەو كەسەی نازانێت و ماڵی خۆی پێ جیاناكرێتەوە لە ماڵی هاوڕێكەی، ئەوە ماڵی تێكەڵ نین، بەڵكوو شەریك و هاوبەشن.

ئیمامی مالیك ﷺ گوتوویەتی: زەكات واجب نییە لەسەر هەردوو خاوەنی ماڵە تێكەڵەكە، تاوەكوو هەر یەكەیان ئەوەندەی نەبێ كە زەكاتی تێدا واجبە.

ئیمامی مالیك ﷺ گوتوویەتی: ڕوونكردنەوەی ئەوە بەم شێوەیەیە: ئەگەر یەكێك لە خاوەنی ماڵە تێكەڵەكە چل مەڕ یان بزنی هەبوو، وە ئەوەی دیكەیان كەمتر لە چل دانەی هەبوو، ئەوە زەكاتەكە لەسەر ئەو كەسەیە كە چل دانەی هەیە، دەبێ مەڕێك یان بزنێك بە زەكات بدات، ئەوەی دیكەیان كە كەمتر لەو ژمارەی هەیە زەكاتی لەسەر واجب نییە.

ئیمامی مالیك ﷺ گوتوویەتی: وە ئەگەر هەر یەكێك لە دوو خاوەن ماڵە تێكەڵەكە ئەو ئەندازەیەی هەبوو كە زەكات تێیدا واجب دەبێ، ئەوە زەكات لەسەر هەردووكیان واجبە بەیەكەوە، جا ئەگەر یەكێكیان هەزار دانەی هەبوو یان كەمتر لەوە كە زەكاتی تێدا واجب بێ، وە ئەوەی دیكە چل دانەی هەبێت یان زیاتر، ئەوە بریتییە لە ماڵی تێكەڵ و هەر یەكەیان زیادەكە بۆ خۆیان دەگەڕێننەوە بەپێی ژمارەی ئاژەڵەكانیان، ئەوەی هەزارە بەپێی پشكی خۆی، ئەوەی چلیشە بەپێی پشكی خۆی (واتە: بە هەردووكیان یازدە مەڕ یان بزن دەدەن بە زەكات، ئەوەی خاوەنی هەزار دانەیە دە دانە دەدات، چونكە لە هەر سەد دانەیەك یەك دانە زەكاتی لێ دەكەوێ، وە ئەوەی خاوەنی چل دانەیە یەك دانە دەدات).[1]

---

(١) ـ تێبینی: بەڵام لەلای ئیمامی شافیعی و ئیمامی ئەحمەد ماڵی تێكەڵ ئەگەر بە كۆی گشتی بگاتە ئەندازەی زەكات دەبێ زەكاتی لێ بدرێ، نابێ پشكی هەر كەسێك بەجیا حیساب بكرێت.

**٧١٠- [فتوى]** قَالَ مَالِكٌ ﵀: الْخَلِيطَانِ فِي الإِبِلِ بِمَنْزِلَةِ الْخَلِيطَيْنِ فِي الْغَنَمِ، يَجْتَمِعَانِ فِي الصَّدَقَةِ جَمِيعًا، إِذَا كَانَ لِكُلِّ وَاحِدٍ مِنْهُمَا مَا تَجِبُ فِيهِ الصَّدَقَةُ، وَذَلِكَ أَنَّ رَسُولَ اللهِ ﷺ قَالَ: لَيْسَ فِيمَا دُونَ خَمْسِ ذَوْدٍ مِنَ الإِبِلِ صَدَقَةٌ، وقَالَ عُمَرُ بْنُ الْخَطَّابِ ﵁: وَفِي سَائِمَةِ الْغَنَمِ إِذَا بَلَغَتْ أَرْبَعِينَ شَاةً، شَاةٌ.

قَالَ مَالِكٌ ﵀: وَهَذَا أَحَبُّ مَا سَمِعْتُ إِلَيَّ فِي هذا[1].

(فەتوا): واتە: ئیمامی مالیك ﵀ گوتوویەتی: ماڵی تێکەڵ لە وشتردا وەك ماڵی تێکەڵە لە مەڕ و بزندا، بەیەکەوە کۆدەبنەوە بۆ زەکات، (بە مەرجێك) ئەگەر هەر یەکێك لە خاوەنی ماڵە تێکەڵەکە ئەوەندەی هەبێت کە زەکاتی تێدا واجبە، ئەوەش لەبەر ئەوەیە پێغەمبەری خوا ﷺ فەرموویەتی: لە کەمتر لە پێنج وشتر زەکات نییە، وە عومەری کوڕی خەتتابیش ﵁ گوتوویەتی: لە مەڕ و بزنی بەخێوکراو بە گژوگیای خواڕسك ئەگەر گەیشت بە چل دانە، ئەوە یەك مەڕ یان یەك بزن دەبێتە زەکات (بۆیە هەر یەکێکیان بەپێی ئەو ڕێسایە مامەڵەیان لەگەڵ دەکرێت).

ئیمامی مالیك ﵀ گوتوویەتی: ئەوە خۆشەویسترینی ئەوەیە کە گوێم لێ بووە دەربارەی ئەو بابەتە.

**٧١١- [فتوى]** قَالَ مَالِكٌ ﵀: وقَالَ عُمَرُ بْنُ الْخَطَّابِ ﵁: لاَ يُجْمَعُ بَيْنَ مُفْتَرِقٍ، وَلاَ يُفَرَّقُ بَيْنَ مُجْتَمِعٍ، خَشْيَةَ الصَّدَقَةِ، أَنَّهُ إِنَّمَا يَعْنِي بِذَلِكَ أَصْحَابَ الْمَوَاشِي.

قَالَ مَالِكٌ ﵀: وَتَفْسِيرُ قَوْلِهِ: لاَ يُجْمَعُ بَيْنَ مُفْتَرِقٍ: أَنْ يَكُونَ النَّفَرُ الثَّلاَثَةُ الَّذِينَ يَكُونُ لِكُلِّ وَاحِدٍ مِنْهُمْ أَرْبَعُونَ شَاةً، قَدْ وَجَبَتْ عَلَى كُلِّ وَاحِدٍ مِنْهُمْ فِي غَنَمِهِ الصَّدَقَةُ، فَإِذَا أَظَلَّهُمُ الْمُصَدِّقُ جَمَعُوهَا، لِئَلاَّ يَكُونَ عَلَيْهِمْ فِيهَا إِلاَّ شَاةٌ وَاحِدَةٌ، فَنُهُوا عَنْ ذَلِكَ، وَتَفْسِيرُ قَوْلِهِ: وَلاَ يُفَرَّقُ بَيْنَ مُجْتَمِعٍ: أَنَّ الْخَلِيطَيْنِ يَكُونُ لِكُلِّ وَاحِدٍ مِنْهُمَا مِئَةُ شَاةٍ وَشَاةٌ، فَيَكُونُ عَلَيْهِمَا فِيهَا ثَلاَثُ شِيَاهٍ، فَإِذَا أَظَلَّهُمَا الْمُصَدِّقُ، فَرَّقَا غَنَمَهُمَا، فَلَمْ يَكُنْ عَلَى كُلِّ وَاحِدٍ مِنْهُمَا إِلاَّ شَاةٌ وَاحِدَةٌ، فَنُهِيَ عَنْ ذَلِكَ، فَقِيلَ: لاَ يُجْمَعُ بَيْنَ مُفْتَرِقٍ، وَلاَ يُفَرَّقُ بَيْنَ مُجْتَمِعٍ، خَشْيَةَ الصَّدَقَةِ.

---

(١) ـ أخرجه أبو مصعب الزهري: ٦٩٢، عن مالك به.




قَالَ مَالِكٌ ﵀: فَهَذَا الَّذِي سَمِعْتُ فِي ذَلِكَ.

(فەتوا): واتە: ئیمامی مالیك ﵀ گوتوویەتی: عومەری کوڕی خەتتاب ﵁ گوتوویەتی: ماڵی جیا کۆناکرێتەوە و ماڵی کۆکراوەش جیاناکرێتەوە لە ترسی زەکات، مەبەستی بەوە خاوەن ئاژەڵەکانە.

ئیمامی مالیك ﵀ گوتوویەتی: ڕوونکردنەوەی قسەکەی (ئیمامی عومەر ﵁) کە گوتی: جیا کۆ ناکرێتەوە، ئەوەیە: سێ کەس هەر یەکەیان چل مەڕ و بزنیان هەبێ، هەر یەکێك لەوان (بەو چل مەڕ و بزنەی هەیەتی) زەکات واجب بووە لە ئاژەڵەکانی، جا کاتێ فەرمانبەری زەکاتوەرگرتن دێتە لایان هەرسێکیان ئاژەڵەکان کۆ بکەنەوە تاوەکوو لە یەك ئاژەڵ زیاتر زەکاتیان نەکەوێتە سەر، نەهی لەوە کراوە (چونکە ئەگەر تێکەڵی بکەن بە هەمووان دانەیەك زەکات دەدەن، بەڵام ئەگەر بەجیا بێت هەر یەکەیان دانەیەکی لەسەر واجب دەبێت).

وە ڕوونکردنەوەی ئەو قسەی گوتی: کۆکراوە جیا ناکرێتەوە، ئەوەیە: دوو ئاژەڵی تێکەڵ کە هی دوو کەس بن ژمارەی ئاژەڵی هەر یەکێکیان سەد و یەك دانە بێ، جا (بە هەردووکیان) سێ ئاژەڵیان دەکەوێتە سەر لە زەکاتدا، جا کاتێ فەرمانبەری زەکاتوەرگرتن دێت بۆ لایان ئاژەڵەکانیان جیا بکەنەوە، ئەو کات هەر یەکەیان لە یەك ئاژەڵ زیاتری ناکەوێتە سەر، جا نەهی لەوە کراوە، بۆیە گوتراوە: جیا کۆ ناکرێتەوە و کۆکراوەش جیا ناکرێتەوە، لە ترسی زەکات.

ئیمامی مالیك ﵀ گوتوویەتی: ئەوە بریتی بوو لەوەی گوێم لێ ببوو دەربارەی ئەو بابەتە.

## ١٤- ئەوەی هاتووە دەربارەی ئەو کاریلانەی لە زەکاتدا حیساب دەکرێن(١)

٧١٢- عَنِ ابْنٍ لِعَبْدِ اللهِ بْنِ سُفْيَانَ الثَّقَفِيِّ ﷺ، عَنْ جَدِّهِ سُفْيَانَ بْنِ عَبْدِ اللهِ ﷺ، أَنَّ عُمَرَ بْنَ الْخَطَّابِ ﷺ بَعَثَهُ مُصَدِّقًا، فَكَانَ يَعُدُّ عَلَى النَّاسِ بِالسَّخْلِ، فَقَالُوا: أَتَعُدُّ عَلَيْنَا بِالسَّخْلِ، وَلاَ تَأْخُذُ مِنْهُ شَيْئًا؟ فَلَمَّا قَدِمَ عَلَى عُمَرَ بْنِ الْخَطَّابِ ﷺ، ذَكَرَ لَهُ ذَلِكَ، فَقَالَ عُمَرُ ﷺ: نَعَمْ تَعُدُّ عَلَيْهِمْ بِالسَّخْلَةِ، يَحْمِلُهَا الرَّاعِي، وَلاَ تَأْخُذُهَا، وَلاَ تَأْخُذُ الأَكُولَةَ، وَلاَ الرُّبَّى، وَلاَ الْمَاخِضَ، وَلاَ فَحْلَ الْغَنَمِ، وَتَأْخُذُ الْجَذَعَةَ، وَالثَّنِيَّةَ، وَذَلِكَ عَدْلٌ بَيْنَ غِذَاءِ الْغَنَمِ وَخِيَارِهِ(٢).

قَالَ مَالِكٌ ﷺ: وَالسَّخْلَةُ، الصَّغِيرَةُ حِينَ تُنْتَجُ، وَالرُّبَّى، الَّتِي قَدْ وَضَعَتْ، فَهِيَ تُرَبِّي وَلَدَهَا، وَالْمَاخِضُ هِيَ الْحَامِلُ، وَالأَكُولَةُ، هِيَ شَاةُ اللَّحْمِ الَّتِي تُسَمَّنُ لِتُؤْكَلَ.

واتە: لە کوڕێکی عەبدوڵڵای کوڕی سوفیانی سەقەفییەوە ﷺ گێڕدراوەتەوە، ئەویش لە سوفیانی کوڕی عەبدوڵڵای باپیرەوە ﷺ گێڕاویەتەوە بەوەی عومەری کوڕی خەتتاب ﷺ بە زەکاتوەرگر (بە فەرمانبەری زەکات) ناردوویەتی، جا «سەخل»ی حیساب دەکرد لە زەکاتدا، خەڵکیش گوتیان: ئایا «سەخل»مان بەسەردا حیساب دەکەی و لە زەکاتیش وەریناگری؟ جا کاتێ هاتەوە بۆ لای عومەری کوڕی خەتتاب ﷺ ئەوەی بۆ باس کرد، ئیمامی عومەریش ﷺ گوتی: بەڵێ «سەخل»یان بەسەردا حیساب بکە (هەرچەندە هێندە بچووکیش بێت) شوان هەڵیبگرێ، لە زەکاتیش وەریمەگرە (واتە لە زەکات حیساب دەکرێ، بەڵام بە زەکات وەرناگیرێ)، وە ئاژەڵی «ئەکولە»ش وەرمەگرە، وە «ڕوبا»ش وەرمەگرە، وە «ماخیزی»ش وەرمەگرە، وە نێری مەڕ و بزنیش وەرمەگرە، (بەڵکو) جەزەعەیان لێ وەربگرە (کە لە مەڕ و بزندا بریتییە لە ئاژەڵی شەش مانگی)، وە سەنییەیان لێ وەربگرە (کە بریتییە لەو مەڕ و بزنەی دوو ساڵی تەواو کردووە و چۆتە ناو ساڵی سێیەم)، کە ئەوەش بریتییە لە ناوەندگیری لە نێوان ئاژەڵی خراپ و نایاب.

---

(١) ـ مَا جَاءَ فِيماَ يُعْتَدُّ بِهِ مِنَ السَّخْلِ فِي الصَّدَقَةِ.

(٢) ـ موقوف حسن. أخرجه أبو مصعب الزهري: ٦٩٤، عن مالك به.




ئیمامی مالیك ﷺ گوتوویەتی: «سەخلە» بریتییە لەو كاریلە بچووكەی لەدایك دەبێ، «ڕوبا»ش بریتییە لەو ئاژەڵەی بێچووی بووە و بەخێوی دەكات، «ماخیز»یش بریتییە لە ئاژەڵی ئاوس، «ئوكول»ـەش بریتییە لەو ئاژەڵەی بۆ گۆشت دادەبەسترێ بۆ ئەوەی بخورێ.

**٧١٣- [فتوى]** قَالَ مَالِكٌ ﷺ: فِي الرَّجُلِ تَكُونُ لَهُ الْغَنَمُ لاَ تَجِبُ فِيهَا الصَّدَقَةُ، فَتَوَالَدُ قَبْلَ أَنْ يَأْتِيَهَا الْمُصَدِّقُ بِيَوْمٍ وَاحِدٍ، فَتَبْلُغُ مَا تَجِبُ فِيهِ الصَّدَقَةُ بِوِلاَدَتِهَا، قَالَ مَالِكٌ: إِذَا بَلَغَتِ الْغَنَمُ بِأَوْلاَدِهَا مَا تَجِبُ فِيهِ الصَّدَقَةُ، فَعَلَيْهِ فِيهَا الصَّدَقَةُ، وَذَلِكَ أَنَّ وِلاَدَةَ الْغَنَمِ مِنْهَا، وَذَلِكَ مُخَالِفٌ لِمَا أُفِيدَ مِنْهَا بِاشْتِرَاءٍ، أَوْ هِبَةٍ، أَوْ مِيرَاثٍ، وَمِثْلُ ذَلِكَ، الْعَرْضُ، لاَ يَبْلُغُ ثَمَنُهُ مَا تَجِبُ فِيهِ الصَّدَقَةُ، ثُمَّ يَبِيعُهُ صَاحِبُهُ، فَيَبْلُغُ بِرِبْحِهِ مَا تَجِبُ فِيهِ الصَّدَقَةُ، فَيُصَدِّقُ رِبْحَهُ مَعَ رَأْسِ الْمَالِ، وَلَوْ كَانَ رِبْحُهُ فَائِدَةً أَوْ مِيرَاثًا، لَمْ تَجِبْ فِيهِ الصَّدَقَةُ، حَتَّى يَحُولَ عَلَيْهِ الْحَوْلُ مِنْ يَوْمَ أَفَادَهُ أَوْ وَرِثَهُ[1].

قَالَ مَالِكٌ ﷺ: فَغِذَاءُ الْغَنَمِ مِنْهَا، كَمَا رِبْحُ الْمَالِ مِنْهُ، غَيْرَ أَنَّ ذَلِكَ يَخْتَلِفُ فِي وَجْهٍ آخَرَ، أَنَّهُ إِذَا كَانَ لِلرَّجُلِ مِنَ الذَّهَبِ أَوِ الْوَرِقِ مَا تَجِبُ فِيهِ الزَّكَاةُ، ثُمَّ أَفَادَ إِلَيْهِ مَالاً تَرَكَ مَالَهُ الَّذِي أَفَادَ فَلَمْ يُزَكِّهِ مَعَ مَالِهِ الأَوَّلِ حِينَ يُزَكِّيهِ، حَتَّى يَحُولَ عَلَى الْفَائِدَةِ الْحَوْلُ مِنْ يَوْمَ أَفَادَهَا، وَلَوْ كَانَتْ لِرَجُلٍ غَنَمٌ، أَوْ بَقَرٌ، أَوْ إِبِلٌ، تَجِبُ فِي كُلِّ صِنْفٍ مِنْهَا الصَّدَقَةُ، ثُمَّ أَفَادَ إِلَيْهَا بَعِيرًا، أَوْ بَقَرَةً، أَوْ شَاةً، صَدَّقَهَا مَعَ صِنْفِ مَا أَفَادَ مِنْ ذَلِكَ حِينَ يُصَدِّقُهُ، إِذَا كَانَ عِنْدَهُ مِنْ ذَلِكَ الصِّنْفِ الَّذِي أَفَادَ، نِصَابُ مَاشِيَةٍ.

قَالَ مَالِكٌ ﷺ: وَهَذَا أَحْسَنُ مَا سَمِعْتُ فِي هَذَا كُلِّهِ.

(فەتوا): واتە: ئیمامی مالیك ﷺ دەربارەی كەسێك كە مەڕ و بزنی هەبن و زەكاتیان تێدا واجب نەبێ، جا ڕۆژێك بەر لەوەی فەرمانبەری زەكات بێ بێچوویان ببێ و بگەنە ئەو ئەندازەیەی زەكاتی تێدا واجبە بەهۆی زاوزێكەیان، ئیمامی مالیك ﷺ گوتوویەتی: ئەگەر مەڕ و بزن بە هۆی زاوزێكەیان گەیشتن بەو ئەندازەیەی زەكاتی تێدا واجبە، ئەوە زەكاتی تێدا واجبە، ئەوەش لەبەر ئەوەیە چونكە بێچووی

---

(١) ـ أخرجه أبو مصعب الزهري: ٦٩٥، عن مالك به.

مەڕ و بزن بەشێكە لە خۆیان (وەك ماڵ و سەروەتێك وایە كە زیاد بكات)، وە ئەوە جیایە لەوەی بەدەست بێ بەكڕین یان بەدیاری یان بەمیرات، جا كەلوپەلی بازرگانیش بەهەمان شێوەیە، (پێشی فرۆشتن) كە بەهاكەی ناگات بەو ئەندازەیەی كە زەكاتی تێدا واجبە، دواتر خاوەنەكەی دەیفرۆشێ و بەهۆی قازانجەكەی دەگات بەو ئەندازەیەی زەكاتی تێدا واجبە، ئەوە زەكات لە قازانجەكەی دەدرێ لەگەڵ سەرمایەكەش، وە ئەگەر بەدەستهێنانەكەی دیاری بوو یان میرات بوو، ئەوە زەكاتی تێدا واجب نییە (چونكە بۆ بازرگانی نەبووە)، تاوەكوو ساڵی بەسەردا دەسوڕێتەوە لەو ڕۆژەوەی بەدەستی هێناوە یان بە میرات وەریگرتووە.

ئیمامی مالیك ﷺ گوتوویەتی: جا ئاژەڵی خراپ (كە مەبەستی پێ كاریلەكانە) بەشێكن لە ئاژەڵەكان، وەك چۆن قازانجی ماڵ بەشێكە لە ماڵەكە، تەنها ئەوەندە نەبێت جیاوازە لە ڕوویێكی دیكەوە، ئەویش ئەوەیە: ئەگەر كەسێك ئەوەندە لە زێڕ و زیوی هەبێت كە زەكاتی تێدا واجب بێت (بگاتە ئەندازەی زەكات)، دواتر ماڵی دیكەی بەدەست هێنا، ئەوە واز لەو ماڵە دێنێت كە بەدەستی هێناوە و زەكاتی لێ نادات لەگەڵ ماڵە یەكەمەكەی كاتێ زەكاتی لێ دەدات، تاوەكوو ساڵ دەسوڕێتەوە بەسەر ماڵە بەدەستهاتووەكە لەو ڕۆژەوەی بەدەست هاتووە، بەڵام ئەگەر كەسێك مەڕ و بزن یان مانگا یان وشتری هەبوو، ئەوە لە گشت جۆرێك لەوانە زەكات واجبە، دواتریش وشترێك یان مانگایەك یان مەڕێك یان بزنێكی بەدەستهێنا، ئەوە زەكاتی لێ دەدات لەگەڵ ئەو جۆرە ئاژەڵەی بەدەستی هێناوە لەو كاتەی زەكاتی لێ دەدات، ئەگەر هاتوو لەو جۆرەی ئاژەڵەكەی لێ بەدەست هێناوە ئەندازەی زەكات هاتبووە جێ.

ئیمامی مالیك ﷺ گوتویەتی: ئەوە چاكترینی ئەوەیە كە گوێم لێ بووە لە گشت ئەو شتانە.




## ١٥- چۆنیەتی زەکاتدانی دوو ساڵ کاتێ بەیەکەوە کۆ دەبنەوە[١]

**٧١٤- [فتوى]** قَالَ مَالِكٌ ﷺ: الأَمْرُ عِنْدَنَا فِي الرَّجُلِ تَجِبُ عَلَيْهِ الصَّدَقَةُ، وَإِبِلُهُ مِئَةُ بَعِيرٍ، فَلاَ يَأْتِيهِ السَّاعِي حَتَّى تَجِبَ عَلَيْهِ صَدَقَةٌ أُخْرَى، فَيَأْتِيهِ الْمُصَدِّقُ وَقَدْ هَلَكَتْ إِبِلُهُ إِلاَّ خَمْسَ ذَوْدٍ.

قَالَ مَالِكٌ ﷺ: يَأْخُذُ الْمُصَدِّقُ مِنَ الْخَمْسِ ذَوْدٍ، الصَّدَقَتَيْنِ اللَّتَيْنِ وَجَبَتَا عَلَى رَبِّ الْمَالِ، شَاتَيْنِ: فِي كُلِّ عَامٍ شَاةٌ، لأَنَّ الصَّدَقَةَ إِنَّمَا تَجِبُ عَلَى رَبِّ الْمَالِ يَوْمَ يُصَدِّقُ مَالَهُ، فَإِنْ هَلَكَتْ مَاشِيَتُهُ أَوْ نَمَتْ، فَإِنَّمَا يُصَدِّقُ الْمُصَدِّقُ مَا يَجِدُ يَوْمَ يُصَدِّقُ، وَإِنْ تَظَاهَرَتْ عَلَى رَبِّ الْمَالِ صَدَقَاتٌ غَيْرُ وَاحِدَةٍ، فَلَيْسَ عَلَيْهِ أَنْ يُصَدِّقَ إِلاَّ مَا وَجَدَ الْمُصَدِّقُ عِنْدَهُ، فَإِنْ هَلَكَتْ مَاشِيَتُهُ، أَوْ وَجَبَتْ عَلَيْهِ فِيهَا صَدَقَاتٌ، فَلَمْ يُؤْخَذْ مِنْهَا شَيْءٌ حَتَّى هَلَكَتْ مَاشِيَتُهُ كُلُّهَا، أَوْ صَارَتْ إِلَى مَا لاَ تَجِبُ فِيهِ الصَّدَقَةُ، فَإِنَّهُ لاَ صَدَقَةَ عَلَيْهِ وَلاَ ضَمَانَ فِيمَا هَلَكَ وَمَضَى مِنَ مَالِهِ[٢].

(فەتوا): ئیمامی مالیك ﷺ گوتوویەتی: لەلای ئێمە دەربارەی ئەو کەسەی زەکاتی لەسەر واجب دەبێت و وشترەکانی سەد دانەن و فەرمانبەری زەکات ناچێتە لای تاوەکوو زەکاتێکی دیکەشی لەسەر واجب دەبێت (واتە تا زەکاتی دوو ساڵ کۆ دەبێتەوە)، ئینجا فەرمانبەری زەکات دەچێتە لای لە کاتێکدا وشترەکانی مردوون تەنها پێنج دانە نەبێت.

ئیمامی مالیك ﷺ گوتوویەتی: فەرمانبەری زەکات لەسەر پێنج وشترەکە کە ماونەتەوە ئەو دوو زەکاتە وەردەگرێ کە لەسەر خاوەن ماڵەکە واجب بووە، کە بریتییە لە دوو بزن: بۆ هەر ساڵێك بزنێك، چونکە زەکات کە واجب دەبێت لەسەر خاوەن ماڵەکە لەو ڕۆژەوەیە کە زەکاتی ماڵەکەی دەکەوێتە سەر، جا (وەکوو یەکە) ئاژەڵەکانی بمرن یان زیاد بکەن، جا کەسی زەکاتدەر زەکات دەدات لەوەی هەیەتی لەو ڕۆژەی زەکاتەکە تەسلیم دەکات، هەرچەندە جگە لە یەك زەکاتیش کۆ ببنەوە لەسەر خاوەن ماڵەکە، جا لەسەری واجب نییە زەکات بدات تەنها لەوە نەبێت کە زەکاتوەرگرەکە لەلای دەستی دەکەوێت (ئەو جۆرە ئاژەڵە دەدات کە ماویەتی)،

---

(١) ـ الْعَمَلُ فِي صَدَقَةِ عَامَيْنِ إِذَا اجْتَمَعَتَا.

(٢) ـ أخرجه أبو مصعب الزهري: ٦٩٦، عن مالك به.

جا ئەگەر گشت ئاژەڵەکانی مردن، یان تیایدا چەندین زەکاتی لەسەر واجب بوو، هیچی لێ وەرنەگیرا تاوەکوو گشت ئاژەڵەکانی مردن، یان ئەوەندە کەم بوونەوە کە زەکاتی تێدا واجب نەدەبوو، ئەوە زەکاتی لەسەر نییە و زامنیایەتیشی لەسەر نییە لەوەی لەناو چوون و ڕۆیشتوون لەماڵەکەیدا.

## ١٦- نەهیکردن لە زەحمەت و بەرتەسکی دروستکردن لەسەر خەڵکی لە زەکاتدا[1]

**٧١٥-** عَنْ عَائِشَةَ ﵂، زَوْجِ النَّبِيِّ ﷺ، أَنَّهَا قَالَتْ: مُرَّ عَلَى عُمَرَ بْنِ الْخَطَّابِ ﵁ بِغَنَمٍ مِنَ الصَّدَقَةِ، فَرَأَى فِيهَا شَاةً حَافِلاً ذَاتَ ضَرْعٍ عَظِيمٍ، فَقَالَ عُمَرُ ﵁: مَا هَذِهِ الشَّاةُ؟ فَقَالُوا: شَاةٌ مِنَ الصَّدَقَةِ، فَقَالَ عُمَرُ ﵁: مَا أَعْطَى هَذِهِ أَهْلُهَا وَهُمْ طَائِعُونَ، لاَ تَفْتِنُوا النَّاسَ، لاَ تَأْخُذُوا حَزَرَاتِ الْمُسْلِمِينَ، نَكِّبُوا عَنِ الطَّعَامِ[2].

واتە: لە عائیشەی ﵂ خێزانی پێغەمبەرەوە ﷺ گێڕدراوەتەوە گوتوویەتی: مەڕ وماڵاتی زەکات بەلای ئیمامی عومەری کوڕی خەتتاب ﵁ تێپەڕێندرا و لە ناویاندا بزنێکی پڕشیری بینی کە گوانی زۆر گەورە بوو، جا ئیمامی عومەر ﵁ گوتی: ئەو بزنە چییە؟ گوتیان: بزنێکە لە بزنەکانی زەکات، ئیمامی عومەر ﵁ گوتی: (دڵنیام) خاوەنەکەی ئەم بزنەی بەپێخۆشی خۆی نەداوە، خەڵکی تووشی فیتنە و (دڵنەخۆشی مەکەن لە ئایینەکەیاندا)، چاکترین شتەکانی مسوڵمانان لە زەکاتدا وەرمەگرن، دوور کەونەوە لە خۆراك (واتە ئاژەڵی زۆر بەشیر و زۆر بەرهەم وەرمەگرن کە دەبێتە هۆی کەمکردنەوەی خۆراك لەسەر خاوەنەکەی).

**٧١٦-** عَنْ مُحَمَّدِ بْنِ يَحْيَى بْنِ حَبَّانَ ﵀ أَنَّهُ قَالَ: أَخْبَرَنِي رَجُلاَنِ مِنْ أَشْجَعَ، أَنَّ مُحَمَّدَ بْنَ مَسْلَمَةَ الأَنْصَارِيَّ كَانَ يَأْتِيهِمْ مُصَدِّقًا، فَيَقُولُ لِرَبِّ الْمَالِ: أَخْرِجْ إِلَيَّ صَدَقَةَ مَالِكَ، فَلاَ يَقُودُ إِلَيْهِ شَاةً فِيهَا وَفَاءٌ مِنْ حَقِّهِ إِلاَّ قَبِلَهَا[3].

---

(١) ـ النَّهْيُ عَنِ التَّضْيِيقِ عَلَى النَّاسِ فِي الصَّدَقَةِ.

(٢) ـ صحيح. أخرجه أبو مصعب الزهري: ٦٩٧؛ والشافعي: ٤٤٩، عن مالك به.

(٣) ـ ضعيف. أخرجه أبو مصعب الزهري: ٦٩٨؛ والشافعي: ٤٥٠، عن مالك به.

واتە: موحەممەدی كوڕی یەحیای كوڕی حەببان ﷺ گوتوویەتی: دوو پیاو لە هۆزی ئەشجەع پێیان ڕاگەیاندم گوتیان: موحەممەدی كوڕی مەسلەمەی ئەنصاری بە زەكاتوەرگر دەهاتە لایان (واتە فەرمانبەری زەكاتوەرگرتن بوو) جا بە خاوەن ماڵەكەی دەگوت: زەكاتی ماڵەكەتم بۆ دەربكە، جا هەر ئاژەڵێكیان هێنابایە دەرەوە كە زەكاتەكەی پێ جێبەجێ ببووایە (نەخۆش و كوێر و بێكەڵك نەبووایە) وەریدەگرت (نەیدەگوت: وەرناگرم هی چاكتر وەردەگرم).

**٧١٧- [فتوى] قَالَ مَالِكٌ ﷺ: السُّنَّةُ عِنْدَنَا، وَالَّذِي أَدْرَكْتُ عَلَيْهِ أَهْلَ الْعِلْمِ بِبَلَدِنَا، أَنَّهُ لاَ يُضَيَّقُ عَلَى الْمُسْلِمِينَ فِي زَكَاتِهِمْ، وَأَنْ يُقْبَلَ مِنْهُمْ مَا دَفَعُوا مِنْ أَمْوَالِهِمْ[١].**

(فەتوا): واتە: ئیمامی مالیك ﷺ گوتوویەتی: ڕێبازی حەق وایە لای ئێمە و ئەوەیشی كە لەسەری گەیشتووم بە زانایان لە ناوچەكەمان بریتییە لەوەی: نابێ بەرتەسكی و زەحمەتی دروست بكرێ لەسەر مسوڵمانان لە زەكاتەكانیاندا، وە دەبێ ئەوەیان لێ وەربگیرێ لە سەروەتەكەیان كە دەیدەن.

## ١٧- وەرگرتنی زەكات و ئەو كەسەش كە دروستە وەریبگرێت[٢]

**٧١٨- عَنْ عَطَاءِ بْنِ يَسَارٍ ﷺ، أَنَّ رَسُولَ اللهِ ﷺ قَالَ: لاَ تَحِلُّ الصَّدَقَةُ لِغَنِيٍّ إِلاَّ لِخَمْسَةٍ: لِغَازٍ فِي سَبِيلِ اللهِ، أَوْ لِعَامِلٍ عَلَيْهَا، أَوْ لِغَارِمٍ، أَوْ لِرَجُلٍ اشْتَرَاهَا بِمَالِهِ، أَوْ رَجُلٍ لَهُ جَارٌ مِسْكِينٌ، فَتُصُدِّقَ عَلَى الْمِسْكِينِ، فَأَهْدَى الْمِسْكِينُ لِلْغَنِيِّ[٣].**

واتە: عەتائی كوڕی یەسار ﷺ گوتوویەتی: پێغەمبەری خوا ﷺ فەرموویەتی: زەكات حەڵاڵ نییە بۆ كەسی دەوڵەمەند تەنها بۆ پێنج كەس نەبێت: بۆ موجاهید و تێكۆشەرێك لە پێناوی خوا بجەنگێ، یان بۆ فەرمانبەری زەكاتكۆكردنەوە، یان بۆ قەرزارێك، یان بۆ كەسێك ماڵی زەكاتی بە پارەی خۆی لە هەژارێك كڕیوەتەوە (بەو

---

(١) ـ أخرجه أبو مصعب الزهري: ٦٩٩، عن مالك به.

(٢) ـ أَخْذُ الصَّدَقَةِ وَمَنْ يَجُوزُ لَهُ أَخْذُهَا.

(٣) ـ صحيح. أخرجه أبو مصعب الزهري: ٧٠٠؛ والشيباني: ٣٤٣؛ وأبو داود: ١٦٣٥، كلهم عن مالك به.




جۆرەماڵی زەکاتی دەکەوێتە لا)، یان بۆ کەسێك کە دراوسێیەکی هەژاری هەیە و زەکات بە هەژارەکە بەخشراوە، هەژارەکەش دەیکاتە دیاری بۆ دەوڵەمەندەکە.

**٧١٩- [فتوى]** قَالَ مَالِكٌ ﷺ: الأَمْرُ عِنْدَنَا فِي قَسْمِ الصَّدَقَاتِ: أَنَّ ذَلِكَ لاَ يَكُونُ إِلاَّ عَلَى وَجْهِ الاِجْتِهَادِ مِنَ الْوَالِي، فَأَيُّ الأَصْنَافِ كَانَتْ فِيهِ الْحَاجَةُ وَالْعَدَدُ، أُوثِرَ ذَلِكَ الصِّنْفُ، بِقَدْرِ مَا يَرَى الْوَالِي، وَعَسَى أَنْ يَنْتَقِلَ ذَلِكَ إِلَى الصِّنْفِ الآخَرِ بَعْدَ عَامٍ أَوْ عَامَيْنِ أَوْ أَعْوَامٍ، فَيُؤْثَرُ أَهْلُ الْحَاجَةِ وَالْعَدَدِ، حَيْثُمَا كَانَ ذَلِكَ، وَعَلَى هَذَا أَدْرَكْتُ مَنْ أَرْضَى مِنْ أَهْلِ الْعِلْمِ[1].

قَالَ مَالِكٌ ﷺ: وَلَيْسَ لِلْعَامِلِ عَلَى الصَّدَقَاتِ فَرِيضَةٌ مُسَمَّاةٌ، إِلاَّ عَلَى قَدْرِ مَا يَرَى الإِمَامُ.

(فەتوا): واتە: ئیمامی مالیك ﷺ گوتوویەتی: فەتوا لای ئێمە دەربارەی ئەو کۆمەڵانەی زەکاتیان پێدەشێ، بریتییە لەوەی: ئەو بابەتە تەنها بە ئیجتیهادی والی و فەرمانڕەوا دەبێ، کام جۆر و بەش لەو جۆرە کەسانەی زەکاتیان پێ دەشێت پێویستی زیاتر و ژمارەی زیاتر بێ، ئەو بەشە زەکاتیان پێ دەدرێ، بەو ئەندازەیەی فەرمانڕەوا بە باشی دەزانێ، دەکرێ بۆ ساڵێکی دیکە یان دوو ساڵی دیکە یان چەند ساڵی دیکە پێویستییەکە بگوازرێتەوە بۆ جۆرێك و کۆمەڵەیەکی دیکە، خاوەنی پێویستی و ژمارەی پێویستان لەبەرچاو دەگیرێت لە هەر کاتێك بێ، جا لەسەر ئەو بۆچوونە گەیشتووم بەو زانایانەی لە زانستەکەیان ڕازیم.

ئیمامی مالیك ﷺ گوتوویەتی: فەرمانبەری زەکاتکۆکردنەوە هیچ پشکێکی دیاریکراوی نییە، تەنها ئەوەندە نەبێت کە گەورەی باوەڕداران بە چاکی دەزانێت و ئەو خۆی ئەندازەکەی دیاری دەکات (وەك موچەیەك بۆ کارەکەی).

---

(١) ـ أخرجه أبو مصعب الزهري: ٧٠١، عن مالك به.

## ١٨- ئەوەی هاتووە دەربارەی وەرگرتنی زەکات و هەڕەشەی توند تیایدا[١]

**٧٢٠-** عَنْ مَالِكٍ ﵀؛ أَنَّهُ بَلَغَهُ، أَنَّ أَبَا بَكْرٍ الصِّدِّيقَ قَالَ: لَوْ مَنَعُونِي عِقَالاً لَجَاهَدْتُهُمْ عَلَيْهِ[٢].

واتە: لە ئیمامی مالیك ﵀ گێڕدراوەتەوە بەوەی پێی گەیشتووە ئەبو بەکری صدیق ﵁ گوتوویەتی: ئەگەر (خەڵکی) پەت و گوریسم پێ نەدەن و تەسلیمم نەکەن (واتە کەمترین ئەندازەی زەکات نەدەن و نەهێڵن لێیان وەربگرم) ئەوە جیهادیان لەسەر لەگەڵ دەکەم.

**٧٢١-** عَنْ زَيْدِ بْنِ أَسْلَمَ ﵁، أَنَّهُ قَالَ: شَرِبَ عُمَرُ بْنُ الْخَطَّابِ ﵁ لَبَنًا، فَأَعْجَبَهُ، فَسَأَلَ الَّذِي سَقَاهُ، مِنْ أَيْنَ هَذَا اللَّبَنُ؟ فَأَخْبَرَهُ أَنَّهُ وَرَدَ عَلَى مَاءٍ، قَدْ سَمَّاهُ، فَإِذَا نَعَمٌ مِنْ نَعَمِ الصَّدَقَةِ وَهُمْ يَسْقُونَ، فَحَلَبُوا لِي مِنْ أَلْبَانِهَا، فَجَعَلْتُهُ فِي سِقَائِي، فَهُوَ هَذَا، فَأَدْخَلَ عُمَرُ بْنُ الْخَطَّابِ يَدَهُ، فَاسْتَقَاءَهُ[٣].

واتە: لە زەیدی کوڕی ئەسلەمەوە ﵁ گێڕدراوەتەوە گوتوویەتی: عومەری کوڕی خەتتاب ﵁ شیرێکی خواردەوە و زۆری پێ خۆش بوو و پرسیاری لەو کەسە کرد کە شیرەکەی پێ دا گوتی: ئەو شیرە هی کوێیە؟ ئەویش هەواڵی پێ دا و گوتی: من چووم بۆ لای فلان ئاو و سەرچاوە، جا لەوێ هەندێك ئاژەڵ لە ئاژەڵەکانی زەکات لەوێ بوون ئاویان دەخواردەوە، جا (کەسەکانی ئەوێ) لە شیرەکەیان بۆ دۆشیم، منیش خستمە ناو مەتارەکەمەوە، ئا ئەوە ئەو شیرەیە، جا عومەری کوڕی خەتتاب ﵁ پەنجەی خستە ناو دەمی و خۆی ڕشاندەوە (چونکە شیری وشتری ماڵی گشتی بوو)!

**٧٢٢- [فتوى]** قَالَ مَالِكٌ ﵀: الأَمْرُ عِنْدَنَا أَنَّ كُلَّ مَنْ مَنَعَ فَرِيضَةً مِنْ فَرَائِضِ اللهِ، فَلَمْ يَسْتَطِعِ الْمُسْلِمُونَ أَخْذَهَا، كَانَ حَقًّا عَلَيْهِمْ جِهَادُهُ حَتَّى يَأْخُذُوهَا مِنْهُ[٤].

---

(١) ـ مَا جَاءَ فِي أَخْذِ الصَّدَقَاتِ وَالتَّشْدِيدِ فِيهَا.

(٢) ـ صحيح. أخرجه أبو مصعب الزهري: ٧٠٣، عن مالك به.

(٣) ـ ضعيف. أخرجه أبو مصعب الزهري: ٧٠٤، عن مالك به.

(٤) ـ أخرجه أبو مصعب الزهري: ٧٠٥، عن مالك به.

(فەتوا): واتە: ئیمامی مالیك ﷺ گوتوویەتی: لەلای ئێمە هەر کەسێك ڕێگری بکات لە فەرزێك لە فەرزەکانی خوا و مسوڵمانان نەتوانن (بەئاشتی) لێی وەربگرن، ئەوە لەسەریان واجبە جیهاد بکەن لە پێناوی تا لێی وەردەگرن.

**٧٢٣- عَنْ مَالِكٍ ﷺ؛ أَنَّهُ بَلَغَهُ، أَنَّ عَامِلاً لِعُمَرَ بْنِ عَبْدِ الْعَزِيزِ ﷺ كَتَبَ إِلَيْهِ يَذْكُرُ: أَنَّ رَجُلاً مَنَعَ زَكَاةَ مَالِهِ، فَكَتَبَ إِلَيْهِ عُمَرُ ﷺ: أَنْ دَعْهُ وَلاَ تَأْخُذْ مِنْهُ زَكَاةً مَعَ الْمُسْلِمِينَ، قَالَ: فَبَلَغَ ذَلِكَ الرَّجُلَ، فَاشْتَدَّ عَلَيْهِ، وَأَدَّى بَعْدَ ذَلِكَ زَكَاةَ مَالِهِ، فَكَتَبَ عَامِلُ عُمَرَ ﷺ إِلَيْهِ يَذْكُرُ لَهُ ذَلِكَ، فَكَتَبَ إِلَيْهِ عُمَرُ أَنْ خُذْهَا مِنْهُ[1].**

واتە: لە ئیمامی مالیکەوە ﷺ گێردراوەتەوە بەوەی پێی گەیشتووە فەرمانبەرێکی عومەری کوڕی عەبدولعەزیز ﷺ کە زەکاتی کۆدەکردەوە بۆی نووسی: پیاوێك زەکاتی ماڵەکەی نادات، عومەریش ﷺ بۆی نووسی: وازی لێ بێنن لەگەڵ مسوڵمانان زەکاتی لێ وەرمەگرە، دەڵێ: جا ئەو هەواڵە گەیشت بە پیاوەکە و زۆر قورس بوو لەسەری و دوای ئەوە زەکاتی ماڵەکەی دا، جا فەرمانبەرەکە نووسراوێکی بۆ عومەر ﷺ نووسی و باسی ئەوەی کرد، عومەریش ﷺ نووسراوێکی نووسی گوتی: لێی وەربگرە (مادەم پەشیمان بۆتەوە).

## ١٩- زەکاتی ئەوەی دەخەمڵێنرێت لە خورما و ترێ[2]

**٧٢٤- عَنْ سُلَيْمَانَ بْنِ يَسَارٍ ﷺ، وَعَنْ بُسْرِ بْنِ سَعِيدٍ ﷺ، أَنَّ رَسُولَ اللهِ ﷺ قَالَ: فِيمَا سَقَتِ السَّمَاءُ وَالْعُيُونُ، وَالْبَعْلُ: الْعُشْرُ، وَفِيمَا سُقِيَ بِالنَّضْحِ: نِصْفُ الْعُشْرِ[3].**

واتە: لە سولەیمانی کوڕی یەسار ﷺ لە بوسری کوڕی سەعیدەوە ﷺ گێردراوەتەوە (گوتوویانە): پێغەمبەری خوا ﷺ فەرموویەتی: لەو دانەوێڵە و میوەیەی بە باران و کانی و سەرچاوە بێمەسرەفەکان ئاودراون یان دێمین و بە ڕەگەکانیان ئاویان

---

(١) ـ مقطوع ضعيف. أخرجه أبو مصعب الزهري: ٧٠٢، عن مالك به.

(٢) ـ زَكَاةُ مَا يُخْرَصُ مِنْ ثِمَارِ النَّخِيلِ وَالْأَعْنَابِ.

(٣) ـ صحيح لغيره. أخرجه أبو مصعب الزهري: ٧٠٦، عن مالك به.




خواردۆتەوە بەبێ ئاودان، ئەوە یەك لەسەر دە دەبێتە زەکات، وە لەوەی بە مەسرەفی زۆر ئاوی بۆ هێندراوە و ئاو دراوە، نیوەی دەیەك دەبێتە زەکات.

**٧٢٥-** عَنِ ابْنِ شِهَابٍ ﷺ، أَنَّهُ قَالَ: لاَ يُؤْخَذُ فِي صَدَقَةِ النَّخْلِ الْجُعْرُورُ، وَلاَ مُصْرَانُ الْفَارَةِ، وَلاَ عَذْقُ ابْنِ حُبَيْقٍ، قَالَ: وَهُوَ يُعَدُّ عَلَى صَاحِبِ الْمَالِ، وَلاَ يُؤْخَذُ مِنْهُ فِي الصَّدَقَةِ(١).

قَالَ مَالِكٌ ﷺ: وَإِنَّمَا مِثْلُ ذَلِكَ، الْغَنَمُ، تُعَدُّ عَلَى صَاحِبِهَا بِسِخَالِهَا، وَالسَّخْلُ لاَ يُؤْخَذُ مِنْهُ فِي الصَّدَقَةِ، وَقَدْ يَكُونُ فِي الأَمْوَالِ ثِمَارٌ لاَ تُؤْخَذُ الصَّدَقَةُ مِنْهَا، مِنْ ذَلِكَ الْبُرْدِيُّ وَمَا أَشْبَهَهُ، لاَ يُؤْخَذُ مِنْ أَدْنَاهُ، كَمَا لاَ يُؤْخَذُ مِنْ خِيَارِهِ.

قَالَ: وَإِنَّمَا تُؤْخَذُ الصَّدَقَةُ مِنْ أَوْسَاطِ الْمَالِ.

واتە: لە ئیبنو شیهابەوە ﷺ گێڕدراوەتەوە گوتوویەتی: لە زەکاتی خورمادا جوعرورڕ و موصڕانی فاڕە و عەزقی بنو حوبەیق وەرناگیرێ (کە سێ جۆری خراپی خورمان)، گوتوویەتی: لەسەر خاوەنەکەی حیساب دەکرێ (بۆ زەکات لێوەرگرتن)، بەڵام لە زەکاتدا وەرناگیرێن.

ئیمامی مالیك ﷺ گوتوویەتی: مەڕ و بزنیش بەم شێوەیەیە، مەڕ و بزنەکان بە کاریلەکانیشەوە لەسەر خاوەنەکەی حیساب دەکرێن، لە کاتێکدا کاریلە لە زەکاتدا وەرناگیرێ، جا جاری وا هەیە لەناو سەروەت و سامانداا بەروبوومی وا هەیە لە زەکات وەرناگیرێ، وەك خورمای بوردی و هاوشێوەکانی (ئەوەیان لەبەر زۆر چاکی وەرناگیرێن)، کەواتە ماڵە خراپەکە وەرناگیرێت وەك لە ماڵە زەریف و زۆر چاکەکەش وەرناگیرێت.

گوتوویەتی: بەڵکوو زەکات تەنها لە ماڵە مامناوەندییەکە وەردەگیرێت.

**٧٢٦- [فتوى]** قَالَ مَالِكٌ ﷺ: الأَمْرُ الْمُجْتَمَعُ عَلَيْهِ عِنْدَنَا: أَنَّهُ لاَ يُخْرَصُ مِنَ الثِّمَارِ إِلاَّ النَّخِيلُ، وَالأَعْنَابُ، فَإِنَّ ذَلِكَ يُخْرَصُ حِينَ يَبْدُو صَلاَحُهُ، وَيَحِلُّ بَيْعُهُ، وَذَلِكَ أَنَّ ثَمَرَ النَّخِيلِ، وَالأَعْنَابِ يُؤْكَلُ رُطَبًا وَعِنَبًا، فَيُخْرَصُ عَلَى أَهْلِهِ لِلتَّوْسِعَةِ عَلَى النَّاسِ، وَلِئَلاَّ يَكُونَ عَلَى أَحَدٍ فِي ذَلِكَ ضِيقٌ،

---

(١) ـ مقطوع صحيح.

فَيُخْرَصُ ذَلِكَ عَلَيْهِمْ، ثُمَّ يُخَلَّى بَيْنَهُمْ وَبَيْنَهُ يَأْكُلُونَهُ كَيْفَ شَاؤُوا، ثُمَّ يُؤَدُّونَ مِنْهُ الزَّكَاةَ عَلَى مَا خُرِصَ عَلَيْهِمْ[1].

(فەتوا): واتە: ئیمامی مالیك ﷺ گوتوویەتی: ئەوەی لەلای ئێمە کۆدەنگی لەسەرە، ئەوەیە: هیچ میوەیەك تەخمین ناکرێ و ناخەمڵێندرێ جگە لە خورما و ترێ، ئەوانە تەخمین دەکرێن ئەو کاتەی پێ دەگەن و دروست دەبێت بفرۆشرێن، ئەوەش لەبەر ئەوەیە خورما و ترێ بەتەڕی دەخورێ (و دەفرۆشرێ، ئەگەر لەو کاتە تەخمین نەکرێ لێی دەفرۆشن و هەژار زەرەر دەکات)، جا تەخمین دەکرێ بەسەر خاوەنەکانیان تا دەرگای ڕۆزی فرانتر بێت بەسەر خەڵکییەوە، وە بۆ ئەوەی تەنگەبەری بۆ کەس دروست نەبێت لەوەدا، بۆ ئەو مەبەستەیە بەسەریاندا دەخەمڵێنرێ، دواتر (دوای خەملاندن) ڕێگەیان دەدرێت چۆن و چەند حەز دەکەن لێی بخۆن، دواتر ئەو زەکاتەی لێ دەدەن کە بەسەریاندا خەمڵێندراوە.

٧٢٧- **[فتوى]** قَالَ مَالِكٌ ﷺ: فَأَمَّا مَا لاَ يُؤْكَلُ رَطْبًا، وَإِنَّمَا يُؤْكَلُ بَعْدَ حَصَادِهِ مِنَ الْحُبُوبِ كُلِّهَا، فَإِنَّهُ لاَ يُخْرَصُ، وَإِنَّمَا عَلَى أَهْلِهَا فِيهَا إِذَا حَصَدُوهَا وَدَقُّوهَا وَطَيَّبُوهَا، وَخَلُصَتْ حَبًّا، فَإِنَّمَا عَلَى أَهْلِهَا فِيهَا الأَمَانَةُ، يُؤَدُّونَ زَكَاتَهَا، إِذَا بَلَغَ ذَلِكَ مَا تَجِبُ فِيهِ الزَّكَاةُ.

قَالَ مَالِكٌ ﷺ: وَهَذَا الأَمْرُ الَّذِي لاَ اخْتِلاَفَ فِيهِ عِنْدَنَا[2].

(فەتوا): واتە: ئیمامی مالیك ﷺ گوتوویەتی: بەڵام هەرچی ئەوەیە کە بەتەڕی ناخورێ، بەڵکوو دوای دروێنە دەخورێت لە گشت دانەوێڵەکاندا، ئەوە ناخەمڵێنرێ، بەڵکوو لەسەر خاوەنەکەی حیساب دەکرێت کاتێ دەیدروێتەوە و دەیهاڕن و پاڵفتەی دەکەن و بەتەنها دەنك دەمێنێتەوە، جا لەلای خاوەنەکەی دەمێنێتەوە و دەبێتە ئەمانەت، زەکاتی لێ دەدەن کاتێ دەگاتە ئەو ئەندازەیەی کە زەکاتی تێدا واجب دەبێت.

ئیمامی مالیك ﷺ گوتوویەتی: ئەوە لەو بابەتەیە کە ڕاجیایی تیا نییە لەلای ئێمە.

---

(١) ـ أخرجه أبو مصعب الزهري: ٧٠٨، عن مالك به.

(٢) ـ أخرجه أبو مصعب الزهري: ٧٠٩، عن مالك به.

**٧٢٨- [فتوى]** قَالَ مَالِكٌ ﵀: الأَمْرُ الْمُجْتَمَعُ عَلَيْهِ عِنْدَنَا أَنَّ النَّخِيلَ تُخْرَصُ عَلَى أَهْلِهَا، وَثَمَرُهَا فِي رُؤُوسِهَا، إِذَا طَابَ وَحَلَّ بَيْعُهُ، وَيُؤْخَذُ مِنْهُ صَدَقَتُهُ تَمْرًا عِنْدَ الْجِدَادِ، فَإِنْ أَصَابَ الثَّمَرَةَ جَائِحَةٌ، بَعْدَ أَنْ تُخْرَصَ عَلَى أَهْلِهَا، وَقَبْلَ أَنْ تُجَذَّ، فَأَحَاطَتِ الْجَائِحَةُ بِالثَّمَرِ كُلِّهِ، فَلَيْسَ عَلَيْهِمْ صَدَقَةٌ، فَإِنْ بَقِيَ مِنَ الثَّمَرِ شَيْءٌ، يَبْلُغُ خَمْسَةَ أَوْسُقٍ فَصَاعِدًا، بِصَاعِ النَّبِيِّ ﷺ، أُخِذَ مِنْهُمْ زَكَاتُهُ، وَلَيْسَ عَلَيْهِمْ فِيمَا أَصَابَتِ الْجَائِحَةُ زَكَاةٌ.

قَالَ مَالِكٌ ﵀: وَكَذَلِكَ الْعَمَلُ فِي الْكَرْمِ أَيْضًا[١].

(فەتوا): ئیمامی مالیك ﵀ گوتوویەتی: ئەو بابەتەی لەلای ئێمە كۆدەنگی لەسەرە ئەوەیە: خورمای دارخورماكان بەسەر خاوەنەكانیان تەخمین و مەزەندە دەكرێن لە كاتێكدا بەرهەمەكان بەسەر درەختەكانەوەن، كاتێ پێ دەگەن و فرۆشتنی دروست دەبێ، وە زەكاتەكەی بە خورمای وشك وەردەگیرێ لە كاتی چنینەوەی، جا ئەگەر ئافاتێك تووشی بەروبوومەكە بوو دوای ئەوەی خەمڵێنرا و تەخمین كرا بەسەر خاوەنەكەی و بەر لەوەی ببڕدرێتەوە، ئافاتەكەش گشت بەروبوومەكەی گرتەوە (گشتی لەناو چوو)، ئەوە هیچ زەكاتێكیان لەسەر واجب نییە، وە ئەگەر بەشێك لە بەروبوومەكە مابۆیەوە و دەشگەیشتە پێنج وەسق و زیاتر بە صاعی پێغەمبەری خوا ﷺ (كە دەكاتە شەشت صاع، بە كیلۆش دەكاتە ١٤٥ كیلۆ)، ئەوە زەكاتەكەیان (لەو ئەندازەیە) لێ وەردەگیرێت و هیچ زەكاتێكیان لەسەر واجب نییە لەوەی ئافات لێی دەدات.

ئیمامی مالیك ﵀ گوتوویەتی: كارەكە لە دار مێویش بەهەمان شێوەیە.

**٧٢٩- [فتوى]** قَالَ مَالِكٌ ﵀: وَإِذَا كَانَتْ لِرَجُلٍ قِطَعُ أَمْوَالٍ مُتَفَرِّقَةٌ، أَوِ اشْتِرَاكٌ فِي أَمْوَالٍ مُتَفَرِّقَةٍ، لاَ يَبْلُغُ كُلُّ مَالِ شَرِيكٍ مِنْهُمْ، أَوْ قِطَعُهُ مَا تَجِبُ فِيهِ الزَّكَاةُ، وَكَانَتْ إِذَا جُمِعَ بَعْضُ ذَلِكَ إِلَى بَعْضٍ، يَبْلُغُ مَا تَجِبُ فِيهِ الزَّكَاةُ، فَإِنَّهُ يَجْمَعُهَا وَيُؤَدِّي زَكَاتَهَا[٢].

---

(١) ـ أخرجه أبو مصعب الزهري: ٧١٠، عن مالك به.

(٢) ـ أخرجه أبو مصعب الزهري: ٧١١، عن مالك به.




(فەتوا): ئیمامی مالیك ﷺ گوتوویەتی: ئەگەر هاتوو کەسێك چەند بەشە ماڵێکی جیا جیای هەبوو یان شەریکایەتی هەبوو لە چەندین ماڵ و سەروەتی جیا جیا، هەر یەك لە ماڵە شەریکایەتییەکان یان ماڵە جیا جیاکانی نەدەگەیشتنە ئەندازەی زەکات و ئەگەر هەندێکیان لەگەڵ ئەوەی دیکە کۆکرابایەوە ئەوە دەگەیشت بەو ئەندازەیەی زەکاتی تێدا واجب دەبێ، ئەوە دەبێ کۆیان بکاتەوە و زەکاتیان لێ بدات.

## ٢٠- زەکاتی دانەوێڵە و زەیتون[1]

**٧٣٠-** عَنْ مَالِكٍ ﷺ؛ أَنَّهُ سَأَلَ ابْنَ شِهَابٍ ﷺ عَنِ الزَّيْتُونِ؟ فَقَالَ: فِيهِ الْعُشْرُ[2].

واتە: لە ئیمامی مالیکەوە ﷺ گێڕدراوەتەوە پرسیاری لە ئیبنو شیهاب ﷺ کردووە دەربارەی زەیتون (کە ئاخۆ چەند زەکاتی تیایە)؟ ئەویش گوتی: یەك لەسەر دە زەکاتی تیایە.

**٧٣١- [فتوى]** قَالَ مَالِكٌ ﷺ: وَإِنَّمَا يُؤْخَذُ مِنَ الزَّيْتُونِ الْعُشْرُ، بَعْدَ أَنْ يُعْصَرَ، وَيَبْلُغَ زَيْتُونُهُ خَمْسَةَ أَوْسُقٍ، فَمَا لَمْ يَبْلُغْ زَيْتُونُهُ خَمْسَةَ أَوْسُقٍ، فَلاَ زَكَاةَ فِيهِ[3].

(فەتوا): واتە: ئیمامی مالیك ﷺ گوتوویەتی: لە زەیتوندا یەك لەسەر دە زەکات وەردەگیرێ دوای ئەوەی دەگوشرێ (دەکرێتە زەیت) و زەیتونەکەی (کە گوشراوە و کراوەتە زەیت) بگاتە پێنج بار (چل تەنەکە)، جا ئەوەی زەیتونەکەی نەگاتە پێنج بار (چل تەنەکە)، ئەوە زەکاتی تێدا واجب نییە.

**٧٣٢- [فتوى]** قَالَ مَالِكٌ ﷺ: وَالزَّيْتُونُ بِمَنْزِلَةِ النَّخِيلِ، مَا كَانَ مِنْهُ سَقَتْهُ السَّمَاءُ وَالْعُيُونُ، أَوْ كَانَ بَعْلاً، فَفِيهِ الْعُشْرُ، وَمَا كَانَ يُسْقَى بِالنَّضْحِ، فَفِيهِ نِصْفُ الْعُشْرِ، وَلاَ يُخْرَصُ شَيْءٌ مِنَ الزَّيْتُونِ فِي شَجَرِهِ[4].

---

(١) ـ زَكَاةُ الْحُبُوبِ وَالزَّيْتُونِ.

(٢) ـ مقطوع صحيح. أخرجه أبو مصعب الزهري: ٧١٢، عن مالك به.

(٣) ـ أخرجه أبو مصعب الزهري: ٧١٣، عن مالك به.

(٤) ـ أخرجه أبو مصعب الزهري: ٧١٣، عن مالك به.




(فەتوا): واتە: ئیمامی مالیك ﷫ گوتوویەتی: زەیتون وەك خورما وایە، ئەوەی باران و کانی و سەرچاوە بێمەسرەفەکان ئاویان داوە، یان بە ڕەگەکانی ئاوی خواردۆتەوە و پێویستی بە ئاودان نەبووە، ئەوە یەك لەسەر دە زەکاتی تێدایە، وە ئەوەی بە مەسرەف ئاوی بۆ هێنراوە، ئەوە نیوەی یەك لەسەر دە زەکاتی تێدایە، وە هیچ زەیتونێك بەسەر دارەوە ناخەملێنرێ.

**٧٣٣- [فتوى]** قَالَ مَالِكٌ ﷫: وَالسُّنَّةُ عِنْدَنَا فِي الْحُبُوبِ الَّتِي يَدَّخِرُهَا النَّاسُ وَيَأْكُلُونَهَا: أَنَّهُ يُؤْخَذُ مِمَّا سَقَتِ السَّمَاءُ مِنْ ذَلِكَ، وَالْعُيُونُ، وَمَا كَانَ بَعْلاً الْعُشْرُ، وَمَا سُقِيَ بِالنَّضْحِ نِصْفُ الْعُشْرِ، إِذَا بَلَغَ ذَلِكَ خَمْسَةَ أَوْسُقٍ بِالصَّاعِ الأَوَّلِ، صَاعِ النَّبِيِّ ﷺ، وَمَا زَادَ عَلَى خَمْسَةِ أَوْسُقٍ، فَفِيهِ الزَّكَاةُ بِحِسَابِ ذَلِكَ[١].

(فەتوا): واتە: ئیمامی مالیك ﷫ گوتوویەتی: فەتوا لای ئێمە دەربارەی ئەو دانەوێلەی خەڵك هەڵیدەگرێ و دەیخوات، ئاوایە: لەوەی باران و کانیاو ئاویان داوە یان ڕەگی دارەکان خۆیان ئاوی خواردۆتەوە و پێویستی بە ئاودان نەبووە، یەك لەسەر دە زەکات واجبە، وە ئەوەی بە ئاوبۆهێنان و مەسرەف ئاو دراوە، نیوەی دەیەك زەکات هەیە، کاتێ گەیشتە پێنج وەسق بە صاعی یەکەم، واتە صاعی پێغەمبەری خوا ﷺ، وە ئەوەی لە پێنج وەسق زیاتر بێت بەپێی زیادەکە زەکاتی تێدایە[٢].

**٧٣٤- [فتوى]** قَالَ مَالِكٌ ﷫: وَالْحُبُوبُ الَّتِي تَجِبُ فِيهَا الزَّكَاةُ: الْحِنْطَةُ، وَالشَّعِيرُ، وَالسُّلْتُ، وَالذُّرَةُ، وَالدُّخْنُ، وَالأَرْزُ، وَالْعَدَسُ، وَالْجُلْبَانُ، وَاللُّوبِيَا، وَالْجُلْجُلاَنُ، وَمَا أَشْبَهَ ذَلِكَ مِنَ الْحُبُوبِ الَّتِي تَصِيرُ طَعَامًا، فَالزَّكَاةُ تُؤْخَذُ مِنْهَا كُلِّهَا، بَعْدَ أَنْ تُحْصَدَ وَتَصِيرَ حَبًّا.

قَالَ مَالِكٌ ﷫: وَالنَّاسُ مُصَدَّقُونَ فِي ذَلِكَ، وَيُقْبَلُ مِنْهُمْ فِي ذَلِكَ مَا دَفَعُوا[٣].

(فەتوا): واتە: ئیمامی مالیك ﷫ گوتوویەتی: ئەو دانەوێڵانەی زەکاتیان تێدا واجبە (بریتین لەمانە): گەنم و جۆ و جۆی کێوی و گەنمەشامی و هەرزن و برنج

---

(١) ـ أخرجه أبو مصعب الزهري: ٧١٤، عن مالك به.

(٢) ـ پێنج وەسق دەکاتە شەست صاع، بە کیلۆش دەکاتە ١٤٥ کیلۆ.

(٣) ـ أخرجه أبو مصعب الزهري: ٧١٥، عن مالك به.



و نیسك و بیقیە و لۆبیا و كونجی و ئەو دانەوێڵانەی وەك ئەمانە دەبن بە خۆراك، ئەوە لە گشتیان زەكات وەردەگیرێ دوای ئەوەی دروێنە دەكرێت و دەبن بە دەنك.

ئیمامی مالیك رحمه الله گوتوویەتی: خەڵك دەربارەی زەكاتەكەیان بە ڕاستگۆ و متمانەپێكراو دادەنرێن و ئەوەیان لێ وەردەگیرێ كە دەیدەن.

**٧٣٥- [فتوى]** قَالَ يَحْيَى رحمه الله: وَسُئِلَ مَالِكٌ رحمه الله، مَتَى يُخْرَجُ مِنَ الزَّيْتُونِ الْعُشْرُ، أَقَبْلَ النَّفَقَةِ أَمْ بَعْدَهَا؟ فَقَالَ: لاَ يُنْظَرُ إِلَى النَّفَقَةِ، وَلَكِنْ يُسْأَلُ عَنْهُ أَهْلُهُ، كَمَا يُسْأَلُ أَهْلُ الطَّعَامِ عَنِ الطَّعَامِ، وَيُصَدَّقُونَ بِمَا قَالُوا، فَمَنْ رُفِعَ مِنْ زَيْتُونِهِ خَمْسَةُ أَوْسُقٍ فَصَاعِدًا، أُخِذَ مِنْ زَيْتِهِ الْعُشْرُ بَعْدَ أَنْ يُعْصَرَ، وَمَنْ لَمْ يُرْفَعْ مِنْ زَيْتُونِهِ خَمْسَةُ أَوْسُقٍ، لَمْ تَجِبْ عَلَيْهِ فِي زَيْتِهِ الزَّكَاةُ[1].

(فەتوا): واتە: یەحیا رحمه الله گوتوویەتی: ئیمامی مالیك رحمه الله پرسیاری لێكرا: كەی یەك لەسەر دە زەكات دەدرێت لە زەیتون، ئایا پێش مەسرەف یان دوای مەسرەف؟ ئەویش گوتی: سەیری مەسرەف ناكرێ، بەڵكوو پرسیار لە خاوەنەكەی دەكرێ وەك چۆن خاوەنی خۆراك پرسیاریان لێ دەكرێ دەربارەی خۆراك، وە بەڕاست دادەنرێن بەوەی دەیڵێن، ئەوەی زەیتونەكەی گەیشتبێتە پێنج بار (چل تەنەكە) و زیاتر، ئەوە لە ڕۆنەكەی یەك لەسەر دە وەردەگیرێت دوای ئەوەی دەگوشرێ، وە ئەوەی زەیتونەكەی نەگەیشتبێتە پێنج بار (چل تەنەكە)، ئەوە زەكاتی لەسەر واجب نییە لە ڕۆنەكەی.

**٧٣٦- [فتوى]** قَالَ مَالِكٌ رحمه الله: وَمَنْ بَاعَ زَرْعَهُ، وَقَدْ صَلَحَ وَيَبِسَ فِي أَكْمَامِهِ، فَعَلَيْهِ زَكَاتُهُ، وَلَيْسَ عَلَى الَّذِي اشْتَرَاهُ زَكَاةٌ[2].

(فەتوا): واتە: ئیمامی مالیك رحمه الله گوتوویەتی: هەر كەسێك كشتوكاڵەكەی بفرۆشێت لە كاتێكدا بەرهەمەكەی پێگەیشتووە و لەناو گوڵەكەی خۆیەتی، ئەوە زەكاتەكە لەسەر خاوەنەكەیەتی، لەسەر ئەو كەسە نییە كە كڕیویەتی.

---

(١) ـ أخرجه أبو مصعب الزهري: ٧١٧، عن مالك به.

(٢) ـ أخرجه أبو مصعب الزهري: ٧١٩، عن مالك به.

٧٣٧- **[فتوى]** قَالَ مَالِكٌ ﷺ: وَلاَ يَصْلُحُ بَيْعُ الزَّرْعِ، حَتَّى يَيْبَسَ فِي أَكْمَامِهِ، وَيَسْتَغْنِيَ عَنِ الْمَاءِ(١).

(فەتوا): واتە: ئیمامی مالیك ﷺ گوتوویەتی: فرۆشتنی کشتوکاڵ دروست نییە تاوەکوو لە گوڵ و پەلکی خۆی وشك و ڕەق دەبێت و پێویستی بە ئاو نامێنێ(٢).

٧٣٨- **[فتوى]** قَالَ مَالِكٌ ﷺ: فِي قَوْلِ اللهِ تَعَالَى: ﴿ وَءَاتُوا۟ حَقَّهُۥ يَوْمَ حَصَادِهِۦ ۝١٤١ ﴾ الأنعام: ١٤١ أَنَّ ذَلِكَ، الزَّكَاةُ وَاللهُ أَعْلَمُ، وَقَدْ سَمِعْتُ مَنْ يَقُولُ ذَلِكَ(٣).

(فەتوا): واتە: ئیمامی مالیك ﷺ دەربارەی وتەی خوای پەروەردگار: ﴿ وَءَاتُوا۟ حَقَّهُۥ يَوْمَ حَصَادِهِۦ ﴾، واتە: (لە ڕۆژی دروێنە حەقی خۆی لێ بدەن) گوتوویەتی: بریتییە لە زەکات ـ والله أعلم ـ، لە کەسانێکم گوێ لێ بووە ئاوایان گوتووە.

٧٣٩- **[فتوى]** قَالَ مَالِكٌ ﷺ: وَمَنْ بَاعَ أَصْلَ حَائِطِهِ أَوْ أَرْضَهُ، وَفِي ذَلِكَ زَرْعٌ أَوْ ثَمَرٌ لَمْ يَبْدُ صَلاَحُهُ، فَزَكَاةُ ذَلِكَ عَلَى الْمُبْتَاعِ، وَإِنْ كَانَ قَدْ طَابَ وَحَلَّ بَيْعُهُ، فَزَكَاةُ ذَلِكَ الثَّمَرِ أَوِ الزَّرْعِ عَلَى الْبَائِعِ، إِلاَّ أَنْ يَشْتَرِطَهُ عَلَى الْمُبْتَاعِ(٤).

(فەتوا): واتە: ئیمامی مالیك ﷺ گوتوویەتی: هەر کەسێك باخەکەی خۆی یان زەوییەکەی خۆی فرۆشت، لە کاتێکدا کشتوکاڵ یان میوەی تیا بوو پێ نەگەیشتبوو، ئەوە زەکاتی (کشتوکاڵ و میوەکە) لەسەر کڕیارەکەیە، وە ئەگەر پێ گەیشتبوو و فرۆشتنەکەی دروست بوو، ئەوە زەکاتی ئەو میوە و کشتوکاڵە لەسەر فرۆشیارەکەیە، تەنها لەو کاتە نەبێ کە فرۆشیارەکە مەرج دابنێ لەسەر کڕیارەکە کە دەبێ ئەو زەکاتەکە بدات (ئەو کات زەکاتەکە دەکەوێتە سەر کڕیارەکە).

---

(١) ـ أخرجه أبو مصعب الزهري: ٧٢٠، عن مالك به.

(٢) ـ تێبینی: لەلای ئیمامی مالیك کاتێ دانەوێڵە ڕەق دەبێت و پێدەگات، دروستە بفرۆشرێ هەرچەندە لەناو گوڵ و پەلکی خۆشی بێ، بەڵام لەلای ئیمامی شافیعی لەگەڵ ئەوە دەبێ بشدوورێتەوەو پاك بکرێتەوە ئینجا دروستە.

(٣) ـ أخرجه أبو مصعب الزهري: ٧٢١، عن مالك به.

(٤) ـ أخرجه أبو مصعب الزهري: ٢٤٩٧، عن مالك به.

## ٢١- ئەوەی زەكاتی تێدا نییە لە بەروبوومدا[١]

**٧٤٠- [فتوى]** قَالَ مَالِكٌ ﵀: إِنَّ الرَّجُلَ إِذَا كَانَ لَهُ مَا يَجُدُّ مِنْهُ أَرْبَعَةَ أَوْسُقٍ مِنَ التَّمْرِ، وَمَا يَقْطُفُ مِنْهُ أَرْبَعَةَ أَوْسُقٍ مِنَ الزَّبِيبِ، وَمَا يَحْصُدُ مِنْهُ أَرْبَعَةَ أَوْسُقٍ مِنَ الْحِنْطَةِ، وَمَا يَحْصُدُ مِنْهُ أَرْبَعَةَ أَوْسُقٍ مِنَ الْقُطْنِيَّةِ، إِنَّهُ لاَ يُجْمَعُ عَلَيْهِ بَعْضُ ذَلِكَ إِلَى بَعْضٍ، وَإِنَّهُ لَيْسَ عَلَيْهِ فِي شَيْءٍ مِنْ ذَلِكَ زَكَاةٌ، حَتَّى يَكُونَ فِي الصِّنْفِ الْوَاحِدِ مِنَ التَّمْرِ، أَوْ فِي الزَّبِيبِ، أَوْ فِي الْحِنْطَةِ، أَوْ فِي الْقُطْنِيَّةِ، مَا يَبْلُغُ الصِّنْفُ الْوَاحِدُ مِنْهُ خَمْسَةَ أَوْسُقٍ، بِصَاعِ النَّبِيِّ ﷺ، كَمَا قَالَ رَسُولُ اللهِ ﷺ: لَيْسَ فِيمَا دُونَ خَمْسَةِ أَوْسُقٍ مِنَ التَّمْرِ صَدَقَةٌ.

(فەتوا): واتە: ئیمامی مالیك ﵀ گوتوویەتی: ئەگەر كەسێك چوار بار خورما ببڕێتەوە و، چوار بار مێوژ ببڕێتەوە و، چوار بار گەنم بدروێتەوە و، چوار بار لۆكە بدروێتەوە (واتە هیچیان بەتەنیا نەگەن بە پێنج بار)، ئەوانەی بەسەریەك بۆ كۆناكرێتەوە (تا بگات بە پێنج بار و سەروتر بۆئەوەی زەكاتی لێ بكەوێ)، ئەوە لە هیچێك لەوانە زەكاتی لەسەر نییە، تاوەكوو لە یەكێك لە جۆرەكانی خورما یان مێوژ یان گەنم یان لۆكە نەگاتە پێنج بار بە صاعی پێغەمبەر ﷺ، وەك پێغەمبەری خوا ﷺ فەرموویەتی: لە كەمتر لە پێنج بار زەكات نییە.

**٧٤١- [فتوى]** قَالَ: وَإِنْ كَانَ فِي الصِّنْفِ الْوَاحِدِ مِنْ تِلْكَ الأَصْنَافِ مَا يَبْلُغُ خَمْسَةَ أَوْسُقٍ، فَفِيهِ الزَّكَاةُ، فَإِنْ لَمْ يَبْلُغْ خَمْسَةَ أَوْسُقٍ، فَلاَ زَكَاةَ فِيهِ، قَالَ مَالِكٌ ﵀: وَتَفْسِيرُ ذَلِكَ: أَنْ يَجُذَّ الرَّجُلُ مِنَ التَّمْرِ خَمْسَةَ أَوْسُقٍ، وَإِنِ اخْتَلَفَتْ أَسْمَاؤُهُ وَأَلْوَانُهُ، فَإِنَّهُ يُجْمَعُ بَعْضُهُ إِلَى بَعْضٍ، ثُمَّ يُؤْخَذُ مِنْ ذَلِكَ الزَّكَاةُ، فَإِنْ لَمْ يَبْلُغْ ذَلِكَ، فَلاَ زَكَاةَ فِيهِ.

(فەتوا): واتە: (ئیمامی مالیك ﵀) گوتوویەتی: ئەگەر لە یەك جۆر لەو جۆرانەی باسكرا بگات بە پێنج بار، ئەوە زەكاتی تێدایە، وە ئەگەر نەگەیشت بە پێنج بار، ئەوە زەكاتی تێدا نییە، ئیمامی مالیك ﵀ گوتوویەتی: ڕوونكردنەوەی ئەوە (بەم شێوەیەیە): گرنگ ئەوەیە كەسەكە پێنج بار لە خورما ببڕێتەوە، هەرچەندە ناوەكان و ڕەنگەكانیان جیاواز بێ، چونكە لەگەڵ یەكدی كۆدەكرێنەوە (و حیساب

---

(١) ـ مَا لَا زَكَاةَ فِيهِ مِنَ الثِّمَارِ.




دەکرێن)، دواتر زەکات لەوە وەردەگیرێ، وە ئەگەر نەگەیشت بەو ئەندازەیە، ئەوە زەکاتی تێدا نییە.

**٧٤٢- [فتوى]** قَالَ مَالِكٌ ﷺ: وَكَذَلِكَ الْحِنْطَةُ كُلُّهَا، السَّمْرَاءُ، وَالْبَيْضَاءُ، وَالشَّعِيرُ، وَالسُّلْتُ، كُلُّ ذَلِكَ صِنْفٌ وَاحِدٌ، فَإِذَا حَصَدَ الرَّجُلُ مِنْ ذَلِكَ كُلِّهِ خَمْسَةَ أَوْسُقٍ، جُمِعَ عَلَيْهِ بَعْضُ ذَلِكَ إِلَى بَعْضٍ، وَوَجَبَتْ فِيهِ الزَّكَاةُ، فَإِنْ لَمْ يَبْلُغْ ذَلِكَ، فَلاَ زَكَاةَ فِيهِ(١).

(فەتوا): واتە: ئیمامی مالیك ﷺ گوتوویەتی: گەنمیش بەهەمان شێوە هەموو جۆرەکانی: ڕەشەکەی و سپییەکەی، هەروەها جۆ و جۆی کێوی، هەموو ئەمانە یەك جۆرن (واتە گەنمەکان یەك جۆر حیسابن، جۆیەکانیش یەك جۆر حیسابن)، جا ئەگەر مرۆڤ بە گشت لەمانە پێنج باری دوورییەوە (واتە چل تەنەکەی دروێنە کرد)، ئەوە لەگەڵ یەکدی کۆدەکرێتەوە و زەکاتی تێدا واجبە، جا ئەگەر نەگەیشت بەو ئەندازەیە، ئەوە زەکاتی تێدا نییە.

**٧٤٣- [فتوى]** قَالَ مَالِكٌ ﷺ: وَكَذَلِكَ الزَّبِيبُ كُلُّهُ، أَسْوَدُهُ وَأَحْمَرُهُ، فَإِذَا قَطَفَ الرَّجُلُ مِنْهُ خَمْسَةَ أَوْسُقٍ، وَجَبَتْ فِيهِ الزَّكَاةُ، فَإِنْ لَمْ يَبْلُغْ ذَلِكَ، فَلاَ زَكَاةَ فِيهِ(٢).

(فەتوا): واتە: ئیمامی مالیك ﷺ گوتوویەتی: هەموو مێوژێك بەهەمان شێوەیە، ڕەشەکەی و سوورەکەی، ئەگەر خاوەنەکەی پێنج باری لێ کردەوە زەکاتی تێدا واجبە، جا ئەگەر نەگەیشتە ئەو ئەندازەیە، ئەوە زەکاتی تێدا نییە.

**٧٤٤- [فتوى]** قَالَ مَالِكٌ ﷺ: وَكَذَلِكَ الْقُطْنِيَّةُ هِيَ صِنْفٌ وَاحِدٌ، مِثْلُ الْحِنْطَةِ، وَالتَّمْرِ، وَالزَّبِيبِ، وَإِنِ اخْتَلَفَتْ أَسْمَاؤُهَا وَأَلْوَانُهَا، وَالْقُطْنِيَّةُ: الْحِمَّصُ، وَالْعَدَسُ، وَاللُّوبِيَا، وَالْجُلْبَانُ، وَكُلُّ مَا ثَبَتَ مَعْرِفَتُهُ عِنْدَ النَّاسِ أَنَّهُ قِطْنِيَّةٌ، فَإِذَا حَصَدَ الرَّجُلُ مِنْ ذَلِكَ خَمْسَةَ أَوْسُقٍ بِالصَّاعِ الأَوَّلِ، صَاعِ النَّبِيِّ ﷺ، وَإِنْ كَانَ مِنْ أَصْنَافِ الْقِطْنِيَّةِ كُلِّهَا، لَيْسَ مِنْ صِنْفٍ وَاحِدٍ مِنَ الْقِطْنِيَّةِ فَإِنَّهُ يُجْمَعُ ذَلِكَ بَعْضُهُ إِلَى بَعْضٍ، وَعَلَيْهِ فِيهِ الزَّكَاةُ(٣).

---

(١) ـ أخرجه أبو مصعب الزهري: ٧٢٦، عن مالك به.

(٢) ـ أخرجه أبو مصعب الزهري: ٧٢٥، عن مالك به.

(٣) ـ أخرجه أبو مصعب الزهري: ٧٢٧، عن مالك به.




(فەتوا): واتە: ئیمامی مالیك ﷬ گوتوویەتی: ئەو دانەوێڵانەی بە لێنان و كوڵان دەخورێن یەك جۆر ئەژمار دەكرێن، بەهەمان شێوەی: گەنم و خورما و مێوژ، جا هەرچەندە ناوەكانیان و ڕەنگەكانیان جیاواز بێ، جا ئەو دانەوێڵانەی دەكوڵێنرێن بریتین لە: نۆك و نیسك و لۆبیا و بیقیە و هەموو ئەو دانەوێڵانەی لای خەڵكی ناسراوە بەوەی بەكوڵاوی دەخورێن، جا ئەگەر كەسەكە لەوانە پێنج باری دووریيەوە بە صاعی زەمانی یەكەم كە بریتییە لە صاعی پێغەمبەر ﷺ، هەرچەندە لە گشت جۆرەكانی دانەوێڵە كوڵێنراوەكان بێت و لە یەك جۆر نەبێ، ئەوە بەسەر خاوەنەكەی لەگەڵ یەكدی كۆدەكرێنەوە و تیایدا زەكاتی لەسەر واجبە.

**٧٤٥- [فتوى]** قَالَ مَالِكٌ ﷬: وَقَدْ فَرَّقَ عُمَرُ بْنُ الْخَطَّابِ بَيْنَ الْقُطْنِيَّةِ وَالْحِنْطَةِ، فِيمَا أُخِذَ مِنَ النَّبَطِ، وَرَأَى أَنَّ الْقِطْنِيَّةَ صِنْفٌ وَاحِدٌ، فَأَخَذَ مِنْهَا الْعُشْرَ، وَأَخَذَ مِنَ الْحِنْطَةِ وَالزَّبِيبِ نِصْفَ الْعُشْرِ.

قَالَ مَالِكٌ ﷬: فَإِنْ قَالَ قَائِلٌ: كَيْفَ تُجْمَعُ الْقِطْنِيَّةُ بَعْضُهَا إِلَى بَعْضٍ فِي الزَّكَاةِ، حَتَّى تَكُونَ صَدَقَتُهَا وَاحِدَةً، وَالرَّجُلُ يَأْخُذُ مِنْهَا اثْنَيْنِ بِوَاحِدٍ يَدًا بِيَدٍ، وَلاَ يُؤْخَذُ مِنَ الْحِنْطَةِ اثْنَانِ بِوَاحِدٍ يَدًا بِيَدٍ؟ قِيلَ لَهُ: فَإِنَّ الذَّهَبَ وَالْوَرِقَ يُجْمَعَانِ فِي الصَّدَقَةِ، وَقَدْ يُؤْخَذُ بِالدِّينَارِ أَضْعَافُهُ، فِي الْعَدَدِ مِنَ الْوَرِقِ يَدًا بِيَدٍ.

(فەتوا): واتە: ئیمامی مالیك ﷬ گوتوویەتی: عومەری كوڕی خەتتاب ﷺ جیاوازی كردووە لە نێوان گەنم و ئەو دانەوێڵانەی بەكوڵاوی دەخورێن، لەوەی وەرگیراوە لە بازرگانە گاورەكان (لە سەردەمی پێش خۆی)، وە پێی وابووە ئەو دانەوێڵانەی بەكوڵاوی دەخورێن (گشتیان) یەك جۆر حیسابن، جا یەك لەسەر دەی وەرگرت تیایدا، وە لە گەنم و مێوژ نیوەی دەیەكی وەرگرت.

ئیمامی مالیك ﷬ گوتوویەتی: ئەگەر كەسێك گوتی: چۆن ئەو دانەوێڵانەی بەكوڵاوی دەخورێن جۆرەكانیان لەگەڵ یەكدی كۆدەكرێنەوە لە زەكات، تاوەكوو زەكاتەكەیان ببێتە یەك لە كاتێكدا خەڵك دوو بەرانبەر یەك وەردەگرێ دەست بە دەست (واتە لە كاتی گۆڕینەوە بێنرخترە)، بەڵام لە گەنمدا دوو بەرانبەر یەك




وەرناگیرێ دەست بە دەست؟ (بۆ وەڵامی ئەوە) پێی دەگوترێ: زێر و زیو لە زەکاتدا کۆدەکرێنەوە، لە کاتێکدا بەرانبەر دینارێك چەندەها ئەوەندەی دینارەکە لە زیو وەردەگیرێ دەست بە دەست.

**٧٤٦- [فتوى]** قَالَ مَالِكٌ ﷺ: فِي النَّخِيلِ يَكُونُ بَيْنَ الرَّجُلَيْنِ فَيَجُذَّانِ مِنْهَا ثَمَانِيَةَ أَوْسُقٍ مِنَ التَّمْرِ: إِنَّهُ لاَ صَدَقَةَ عَلَيْهِمَا فِيهَا، وَإِنَّهُ إِنْ كَانَ لأَحَدِهِمَا مِنْهَا مَا يَجُذُّ مِنْهُ خَمْسَةَ أَوْسُقٍ، وَلِلآخَرِ مَا يَجُذُّ أَرْبَعَةَ أَوْسُقٍ، أَوْ أَقَلَّ مِنْ ذَلِكَ فِي أَرْضٍ وَاحِدَةٍ، كَانَتِ الصَّدَقَةُ عَلَى صَاحِبِ الْخَمْسَةِ الأَوْسُقِ، وَلَيْسَ عَلَى الَّذِي جَذَّ أَرْبَعَةَ أَوْسُقٍ أَوْ أَقَلَّ مِنْهَا، صَدَقَةٌ(١).

(فەتوا): واتە: ئیمامی مالیك ﷺ گوتوویەتی: دەربارەی ئەو دارخورمایانەی لە نێوان دوو کەسدایە بە شەریکایەتی و هەردووکیان بەیەکەوە هەشت بار خورمای لێ لێدەکەنەوە، ئەوە زەکات لەسەر هیچیان نییە (چونکە پشکی هیچیان نەگەیشتۆتە پێنج بار)، وە ئەگەر هاتوو یەکێکیان پشکی بەو ئەندازەیە بوو کە پێنج بار لێ بکاتەوە، پشکی ئەوەی دیکەشیان بەو ئەندازەیە بوو چوار بار لێبکاتەوە یان کەمتر لەوە، لە یەك زەویدا، ئەوە زەکات لەسەر خاوەن پێنج بارەکەیە، زەکات لەسەر ئەو کەسە نییە کە چوار بار یان کەمتری لێ کردۆتەوە.

**٧٤٧- [فتوى]** قَالَ مَالِكٌ ﷺ: وَكَذَلِكَ الْعَمَلُ فِي الشُّرَكَاءِ كُلِّهِمْ، فِي كُلِّ زَرْعٍ مِنَ الْحُبُوبِ كُلِّهَا يُحْصَدُ، أَوِ نَخْلٍ يُجَدُّ، أَوِ كَرْمٍ يُقْطَفُ، فَإِنَّهُ إِذَا كَانَ كُلُّ رَجُلٍ مِنْهُمْ يَجُذُّ مِنَ التَّمْرِ، أَوْ يَقْطِفُ مِنَ الزَّبِيبِ، خَمْسَةَ أَوْسُقٍ، أَوْ يَحْصُدُ مِنَ الْحِنْطَةِ خَمْسَةَ أَوْسُقٍ، فَعَلَيْهِ فِيهِ الزَّكَاةُ، وَمَنْ كَانَ حَقُّهُ أَقَلَّ مِنْ خَمْسَةِ أَوْسُقٍ، فَلاَ صَدَقَةَ عَلَيْهِ، وَإِنَّمَا تَجِبُ الصَّدَقَةُ عَلَى مَنْ بَلَغَ جُدَادُهُ أَوْ قِطَافُهُ أَوْ حَصَادُهُ خَمْسَةَ أَوْسُقٍ(٢).

(فەتوا): واتە: ئیمامی مالیك ﷺ گوتوویەتی: کارەکە بەم شێوەیەیە دەربارەی گشت شەریکەکان لە گشت کشتوکاڵێك لە گشت ئەو دانەوێڵانەی دەدروێنەوە، یان گشت ئەو خورمایەی لێ دەکرێتەوە (دەچنرێتەوە)، یان گشت ئەو میوەی

---

(١) ـ أخرجه أبو مصعب الزهري: ٧٢٩، عن مالك به.

(٢) ـ أخرجه أبو مصعب الزهري: ٧٣٠، عن مالك به.

دەرئرێتەوە، لەوەدا ئەگەر هەر کەسێك لە شەریکەکان پێنج بار (چل تەنەکە) لە خورمایان بڕیەوە، یان لە مێوژیان لێکردەوە، یان لە گەنمیان دوورییەوە، ئەوە زەکاتی لەسەر واجبە، وە ئەگەر بەشەکەی کەمتر بوو لە پێنج بار، ئەوە زەکاتی لەسەر نییە، چونکە زەکات تەنها لەسەر ئەو کەسەیە کە بەروبوومی بڕینەوەکەی یان لێکردنەوەکەی یان دروێنەکەی گەیشتبێتە پێنج بار (چل تەنەکە)[١].

٧٤٨- **[فتوى]** قَالَ مَالِكٌ ﷺ: السُّنَّةُ عِنْدَنَا، أَنَّ كُلَّ مَا أُخْرِجَتْ زَكَاتُهُ مِنْ هَذِهِ الأَصْنَافِ كُلِّهَا، الْحِنْطَةِ، وَالتَّمْرِ، وَالزَّبِيبِ، وَالْحُبُوبِ كُلِّهَا، ثُمَّ أَمْسَكَهُ صَاحِبُهُ بَعْدَ أَنْ أَدَّى صَدَقَتَهُ سِنِينَ، ثُمَّ بَاعَهُ، أَنَّهُ لَيْسَ عَلَيْهِ فِي ثَمَنِهِ زَكَاةٌ، حَتَّى يَحُولَ عَلَى ثَمَنِهِ الْحَوْلُ مِنْ يَوْمَ بَاعَهُ، إِذَا كَانَ أَصْلُ تِلْكَ الأَصْنَافِ مِنْ فَائِدَةٍ أَوْ غَيْرِهَا، وَلَمْ يَكُنْ لِلتِّجَارَةِ، وَإِنَّمَا ذَلِكَ بِمَنْزِلَةِ الطَّعَامِ وَالْحُبُوبِ وَالْعُرُوضِ، يُفِيدُهَا الرَّجُلُ ثُمَّ يُمْسِكُهَا سِنِينَ، ثُمَّ يَبِيعُهَا بِذَهَبٍ أَوْ وَرِقٍ، فَلاَ يَكُونُ عَلَيْهِ فِي ثَمَنِهَا زَكَاةٌ، حَتَّى يَحُولَ عَلَيْهَا الْحَوْلُ مِنْ يَوْمَ بَاعَهَا، فَإِنْ كَانَ أَصْلُ تِلْكَ الْعُرُوضِ لِلتِّجَارَةِ، فَعَلَى صَاحِبِهَا فِيهَا الزَّكَاةُ حِينَ يَبِيعُهَا، إِذَا كَانَ قَدْ حَبَسَهَا سَنَةً، مِنْ يَوْمَ زَكَّى الْمَالَ الَّذِي ابْتَاعَهَا بِهِ[٢].

(فەتوا): واتە: ئیمامی مالیك ﷺ گوتوویەتی: فەتوا لەلای ئێمە ئاوایە: گشت شتێك کە زەکاتی لێ دەرکرابێت لە هەر یەك لەم جۆرانە: گەنم و خورما و مێوژ و دانەوێڵە، گشتیان، دواتر خاوەنەکەی دوای ئەوەی زەکاتەکەی لێ دەدات لای خۆی بیهێڵێتەوە بە چەندین ساڵ، دواتر بیفرۆشێ، ئەوە لە نرخ و بەرهەمی فرۆشتنەکە زەکاتی لەسەر نییە تاوەکوو ساڵ دەسوڕێتەوە بەسەر پارەکەی لەو ڕۆژەوەی فرۆشتوویەتی، ئەگەر هاتوو ئەو جۆرانە لە ڕێگەی وەدەستهێنان بن (وەك دیاری و میرات) بۆ بازرگانی نەبن، چونکە ئەوە وەك خواردن و دانەوێڵە و کەلوپەل وایە کە مرۆڤ بەدەستیان بێنێت و دواتر چەندین ساڵ لای خۆی بیانهێڵێتەوە و دواتر بە زێڕ یان بە زیو بیانفرۆشێ، ئەوە زەکاتی لەسەر نییە لە

---

(١) ـ بەڵام لەلای ئیمامی شافیعی شەریکەکانماڵەکەیان بەجیا حیساب ناکرێ، بەڵکوو بەیەکەوە حیساب دەکرێ و یەك زەکاتی لێدەدرێ، جا دواتر هەر یەکەیان بەپێی پشکی خۆی دەکەوێتە سەر.

(٢) ـ أخرجه أبو مصعب الزهري: ٧٣١، عن مالك به.




پارەکەی تاوەکوو ساڵی بەسەردا دەسوڕێتەوە لەو ڕۆژەوەی فرۆشتوویەتی، جا ئەگەر ئەو شتانە بۆ بازرگانی بوون، ئەوە زەکات واجبە لەسەر خاوەنەکەی لەو کاتەی دەیفرۆشێ، ئەگەر ساڵێك هێشتیەوە، لەو ڕۆژەی زەکاتی ئەو ماڵەی داوە کە شتی بازرگانی پێ کڕیوە.

### ٢٢- ئەوەی زەکاتی تیا نییە لە میوە و گیای لەوەڕ و سەوزە[1]

**٧٤٩- [فتوى]** قَالَ مَالِكٌ ﷺ: السُّنَّةُ الَّتِي لاَ اخْتِلاَفَ فِيهَا عِنْدَنَا، وَالَّذِي سَمِعْتُ مِنْ أَهْلِ الْعِلْمِ، أَنَّهُ لَيْسَ فِي شَيْءٍ مِنَ الْفَوَاكِهِ كُلِّهَا صَدَقَةٌ: الرُّمَّانِ، وَالْفِرْسِكِ، وَالتِّينِ، وَمَا أَشْبَهَ ذَلِكَ، وَمَا لَمْ يُشْبِهْهُ، إِذَا كَانَ مِنَ الْفَوَاكِهِ[2].

(فەتوا): واتە: ئیمامی مالیك ﷺ گوتوویەتی: ئەو ڕێباز و بۆچوونەی لای ئێمە هیچ ڕاجیایی تیا نییە، وە ئەوەی گوێم لێبووە دەربارەی بابەتەکە لە زانایان (بریتییە لەوەی): لە هیچ میوەیەك زەکات واجب نییە (وەك): هەنار و خۆخ و هەنجیر و ئەوانەی لەمانە دەچن و ئەوانەشی کە لەمانە ناچن، (هیچیان زەکاتیان تیا نییە) ئەگەر لە میوەکان بن.

**٧٥٠- [فتوى]** قَالَ: وَلاَ فِي الْقَضْبِ، وَلاَ فِي الْبُقُولِ كُلِّهَا صَدَقَةٌ، وَلاَ فِي أَثْمَانِهَا إِذَا بِيعَتْ صَدَقَةٌ، حَتَّى يَحُولَ عَلَى أَثْمَانِهَا الْحَوْلُ مِنْ يَوْمِ بَيْعِهَا، وَيَقْبِضُ صَاحِبُهَا ثَمَنَهَا[3].

(فەتوا): واتە: (ئیمامی مالیك ﷺ) گوتوویەتی: نە لە گیای لەوەڕ و نە لە هیچ سەوزەیەك زەکات واجب نییە، تاوەکوو (دەیفرۆشێ) و ساڵ دەسوڕێتەوە بەسەر پارەکەی لە ڕۆژی فرۆشتنەکەی و خاوەنەکەشی پارەکەی وەردەگرێ.

---

(١) ـ مَا لَا زَكَاةَ فِيهِ مِنَ الْفَوَاكِهِ وَالْقَضْبِ وَالْبُقُولِ.

(٢) ـ أخرجه أبو مصعب الزهري: ٧٣٢، عن مالك به.

(٣) ـ أخرجه أبو مصعب الزهري: ٧٣٣، عن مالك به.

## ٢٣- ئەوەی هاتووە دەربارەی زەکاتی کۆیلە و ئەسپ و هەنگوین[١]

**٧٥١-** عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ ﷺ، أَنَّ رَسُولَ اللهِ ﷺ قَالَ: لَيْسَ عَلَى الْمُسْلِمِ فِي عَبْدِهِ وَلاَ فِي فَرَسِهِ صَدَقَةٌ[٢].

واتە: لە ئەبو هورەیرەوە ﷺ گێڕدراوەتەوە (گوتوویەتی): پێغەمبەری خوا ﷺ فەرموویەتی: مسوڵمان لە کۆیلەکەی و لە ئەسپەکەی زەکاتی لەسەر واجب نییە.

**٧٥٢-** عَنْ سُلَيْمَانَ بْنِ يَسَارٍ ﷺ، أَنَّ أَهْلَ الشَّامِ قَالُوا لأَبِي عُبَيْدَةَ بْنِ الْجَرَّاحِ ﷺ: خُذْ مِنْ خَيْلِنَا وَرَقِيقِنَا صَدَقَةً، فَأَبَى، ثُمَّ كَتَبَ إِلَى عُمَرَ بْنِ الْخَطَّابِ ﷺ، فَأَبَى عُمَرُ ﷺ، ثُمَّ كَلَّمُوهُ أَيْضًا، فَكَتَبَ إِلَى عُمَرَ ﷺ، فَكَتَبَ إِلَيْهِ عُمَرُ ﷺ: إِنْ أَحَبُّوا، فَخُذْهَا مِنْهُمْ، وَارْدُدْهَا عَلَيْهِمْ، وَارْزُقْ رَقِيقَهُمْ[٣].

قَالَ مَالِكٌ ﷺ: مَعْنَى قَوْلِهِ: وَارْدُدْهَا عَلَيْهِمْ، يَقُولُ: عَلَى فُقَرَائِهِمْ.

واتە: لە سولەیمانی کوڕی یەسارەوە ﷺ گێڕدراوەتەوە (گوتوویەتی): خەڵکی شام بە ئەبو عوبەیدەی کوڕی جەڕاحیان ﷺ گوت: زەکاتمان لێ وەربگرە لە ئەسپ و بەندەکانمان، ئەو ڕازی نەبوو و ڕەتی کردەوە، دواتر نووسراوێکی بۆ عومەری کوڕی خەتتاب ﷺ نووسی (کە ئاخۆ وەریبگرم): ئەویش ڕەتی کردەوە، دواتر خەڵکەکە دووبارە قسەیان لەگەڵ ئەبو عوبەیدە ﷺ کرد (کە دەبێ لێیان وەربگرێ)، ئەویش نووسراوی بۆ ئیمامی عومەر ﷺ نووسی (دووبارە داوای خەڵکەکەی پێ گەیاند)، جا ئیمامی عومەر ﷺ بۆی نووسی: ئەگەر خۆیان حەزیان لێیە ئەوە لێیان وەربگرە و سوودەکە بگەڕێنەوە سەر خۆیان و مەسرەف و ڕۆزی کۆیلەکانیان پێ جێبەجێ بکە.

---

(١) ـ مَا جَاءَ فِي صَدَقَةِ الرَّقِيقِ وَالْخَيْلِ وَالْعَسَلِ.

(٢) ـ صحيح. أخرجه أبو مصعب الزهري: ٧٣٤؛ والشيباني: ٣٣٦؛ ومسلم: الزكاة: ٨؛ والنسائي: ٢٤٧١؛ وأبو داود: ١٥٩٥؛ والقابسي: ٢٩٩، كلهم عن مالك به.

(٣) ـ ضعيف. أخرجه أبو مصعب الزهري: ٧٣٥؛ والشيباني: ٣٣٨، عن مالك به.




ئیمامی مالیك ﷺ گوتوویەتی: مانای قسەکەی کە گوتی: «بیگەڕێنەوە سەریان» مەبەستی ئەوەیە بیداتەوە بە هەژارەکانیان.

**٧٥٣-** عَنْ عَبْدِ اللهِ بْنِ أَبِي بَكْرِ بْنِ مُحَمَّدِ بْنِ عَمْرِو بْنِ حَزْمٍ ﷺ، أَنَّهُ قَالَ: جَاءَ كِتَابٌ مِنْ عُمَرَ بْنِ عَبْدِ الْعَزِيزِ ﷺ إِلَى أَبِي وَهُوَ بِمِنًى، أَنْ لاَ يَأْخُذَ مِنَ الْعَسَلِ وَلاَ مِنَ الْخَيْلِ صَدَقَةً[1].

واتە: لە عەبدوڵڵای کوڕی ئەبو بەکری کوڕی موحەممەدی کوڕی عەمری کوڕی حەزمەوە ﷺ گێڕدراوەتەوە گوتوویەتی: لە نووسراوەکەی عومەری کوڕی عەبدولعەزیز ﷺ هاتووە کە بۆ باوکمی نووسی لە کاتێکدا لە مینا بوو (تیایدا هاتبوو): لە هەنگوین و ئەسپ زەکات وەرنەگرێ.

**٧٥٤-** عَنْ عَبْدِ اللهِ بْنِ دِينَارٍ ﷺ، أَنَّهُ قَالَ: سَأَلْتُ سَعِيدَ بْنَ الْمُسَيَّبِ ﷺ عَنْ صَدَقَةِ الْبَرَاذِينِ؟ فَقَالَ سَعِيدٌ ﷺ: وَهَلْ فِي الْخَيْلِ مِنْ صَدَقَةٍ[2].

واتە: لە عەبدوڵڵای کوڕی دینارەوە ﷺ گێڕدراوەتەوە گوتوویەتی: پرسیارم لە سەعیدی کوڕی موسەیەب ﷺ کرد دەربارەی زەکاتی بارگین (ئەسپی بار و ئیشوکار)؟ سەعیدیش ﷺ گوتی: بۆ مەگەر ئەسپ زەکاتی تێدایە؟

## ٢٤- سەرانەی ئەهلی کیتاب و مەجوس[3]

**٧٥٥-** عَنِ ابْنِ شِهَابٍ ﷺ قَالَ: بَلَغَنِي أَنَّ رَسُولَ اللهِ ﷺ أَخَذَ الْجِزْيَةَ مِنْ مَجُوسِ الْبَحْرَيْنِ، وَأَنَّ عُمَرَ بْنَ الْخَطَّابِ ﷺ أَخَذَهَا مِنْ مَجُوسِ فَارِسَ، وَأَنَّ عُثْمَانَ بْنَ عَفَّانَ ﷺ أَخَذَهَا مِنَ الْبَرْبَرِ[4].

واتە: لە ئیبنو شیهابەوە ﷺ گێڕدراوەتەوە گوتوویەتی: پێم گەیشتووە پێغەمبەری خوا ﷺ سەرانەی لە مەجوسەکانی بەحرێن وەرگرتووە و عومەری کوڕی

(١) ـ مقطوع صحيح. أخرجه أبو مصعب الزهري: ٧٣٦؛ والشيباني: ٣٣٧، عن مالك به.

(٢) ـ مقطوع صحيح. أخرجه أبو مصعب الزهري: ٧٣٧؛ والشيباني: ٣٣٥؛ والشافعي: ٤١٠، كلهم عن مالك به.

(٣) ـ جِزْيَةُ أَهْلِ الْكِتَابِ وَالْمَجُوسِ.

(٤) ـ صحيح لغيره. أخرجه أبو مصعب الزهري: ٧٤١؛ والشيباني: ٣٣٢؛ والترمذي: ١٥٨٨، كلهم عن مالك به.

خەتتابیش ﷺ لە مەجوسەکانی فارسی وەرگرتووە و عوسمانی کوڕی عەففانیش ﷺ لە بەربەرەکانی وەرگرتووە.

٧٥٦- عَنْ جَعْفَرِ بْنِ مُحَمَّدِ بْنِ عَلِيٍّ ﷺ، عَنْ أَبِيهِ، أَنَّ عُمَرَ بْنَ الْخَطَّابِ ﷺ ذَكَرَ الْمَجُوسَ، فَقَالَ: مَا أَدْرِي كَيْفَ أَصْنَعُ فِي أَمْرِهِمْ؟ فَقَالَ عَبْدُ الرَّحْمَنِ بْنُ عَوْفٍ ﷺ: أَشْهَدُ لَسَمِعْتُ رَسُولَ اللهِ ﷺ يَقُولُ: سُنُّوا بِهِمْ سُنَّةَ أَهْلِ الْكِتَابِ(١).

واتە: لە جەعفەری کوڕی موحەممەدی کوڕی عەلییەوە ﷺ گێڕدراوەتەوە، ئەویش لە باوکیەوە گێڕاویەتەوە (گوتوویەتی): عومەری کوڕی خەتتاب ﷺ باسی مەجوس و ئاگرپەرستەکانی کرد و گوتی: نازانم چی بکەم دەربارەیان؟! جا عەبدوڕڕەحمانی کوڕی عەوف ﷺ گوتی: شاهێدی دەدەم بەوەی بەدڵنیایی گوێم لە پێغەمبەری خوا ﷺ بوو دەیفەرموو: ڕێچکەی مامەڵەکردنی ئەهلی کیتابیان لەگەڵ بگرنە بەر (واتە ئەحکامی وەك ئەهلی کیتابیان بۆ دابنێن لە تەعامول و سەرانە و هەندێ بابەت، نەك بابەتی هاوسەرگیری و سەربڕاوەکانیان).

٧٥٧- عَنْ أَسْلَمَ، مَوْلَى عُمَرَ بْنِ الْخَطَّابِ ﷺ، أَنَّ عُمَرَ بْنَ الْخَطَّابِ ﷺ ضَرَبَ الْجِزْيَةَ عَلَى أَهْلِ الذَّهَبِ أَرْبَعَةَ دَنَانِيرَ، وَعَلَى أَهْلِ الْوَرِقِ أَرْبَعِينَ دِرْهَمًا، مَعَ ذَلِكَ أَرْزَاقُ الْمُسْلِمِينَ، وَضِيَافَةُ ثَلَاثَةِ أَيَّامٍ(٢).

واتە: لە ئەسلەمی خزمەتکاری عومەری کوڕی خەتتابەوە ﷺ گێڕدراوەتەوە (گوتوویەتی): عومەری کوڕی خەتتاب ﷺ لە سەرانەدا چوار دیناری زێڕی لەسەر ئەو خەڵك و ناوچانە دانا کە کار بە دراوی زێڕ دەکەن و چل درهەمیشی لەسەر ئەو خەڵك و ناوچانە دانا کە کار بە دراوی زیو دەکەن، لەگەڵ خواردنپێدان و یارمەتیدانی مسوڵمانان و سێ ڕۆژ میوانداریکردنیان (کاتێ لەلایان دەبن بە میوان).

٧٥٨- عَنْ زَيْدِ بْنِ أَسْلَمَ ﷺ، عَنْ أَبِيهِ، أَنَّهُ قَالَ لِعُمَرَ بْنِ الْخَطَّابِ ﷺ: إِنَّ فِي الظَّهْرِ نَاقَةً عَمْيَاءَ، فَقَالَ عُمَرُ ﷺ: ادْفَعْهَا إِلَى أَهْلِ بَيْتٍ يَنْتَفِعُونَ بِهَا، قَالَ: فَقُلْتُ: وَهِيَ عَمْيَاءُ؟ فَقَالَ

---

(١) ـ ضعيف بهذا اللفظ. أخرجه أبو مصعب الزهري: ٧٤٢؛ والشافعي: ١٠١٣، عن مالك به.

(٢) ـ صحيح. أخرجه أبو مصعب الزهري: ٧٤٣؛ والحدثاني: ٢٠٩ج؛ والشيباني: ٣٣٣، كلهم عن مالك به.




عُمَرُ ﷺ: يَقْطُرُونَهَا بِالإِبِلِ، قَالَ: فَقُلْتُ: كَيْفَ تَأْكُلُ مِنَ الأَرْضِ؟ قَالَ: فَقَالَ عُمَرُ ﷺ: أَمِنْ نَعَمِ الْجِزْيَةِ هِيَ، أَمْ مِنْ نَعَمِ الصَّدَقَةِ؟ فَقُلْتُ: بَلْ مِنْ نَعَمِ الْجِزْيَةِ، فَقَالَ عُمَرُ ﷺ: أَرَدْتُمْ، وَاللَّهِ، أَكْلَهَا، فَقُلْتُ: إِنَّ عَلَيْهَا وَسْمَ نَعَمِ الْجِزْيَةِ، فَأَمَرَ بِهَا عُمَرُ، فَنُحِرَتْ، وَكَانَ عِنْدَهُ صِحَافٌ تِسْعٌ، فَلاَ تَكُونُ فَاكِهَةٌ وَلاَ طُرَيْفَةٌ، إِلاَّ جَعَلَ مِنْهَا فِي تِلْكَ الصِّحَافِ، فَبَعَثَ بِهَا إِلَى أَزْوَاجِ النَّبِيِّ ﷺ، وَيَكُونُ الَّذِي يَبْعَثُ بِهِ إِلَى حَفْصَةَ ابْنَتِهِ، مِنْ آخِرِ ذَلِكَ، فَإِنْ كَانَ فِيهِ نُقْصَانٌ، كَانَ فِي حَظِّ حَفْصَةَ ﷺ، قَالَ: فَجَعَلَ فِي تِلْكَ الصِّحَافِ مِنْ لَحْمِ تِلْكَ الْجَزُورِ، فَبَعَثَ بِهِ إِلَى أَزْوَاجِ النَّبِيِّ ﷺ، وَأَمَرَ بِمَا بَقِيَ مِنْ لَحْمِ تِلْكَ الْجَزُورِ، فَصُنِعَ، فَدَعَا عَلَيْهِ الْمُهَاجِرِينَ وَالأَنْصَارَ[1].

واتە: لە زەیدی کوڕی ئەسلەمەوە ﷺ گێردراوەتەوە، ئەویش لە باوکیەوە گێڕاویەتەوە بەوەی بە عومەری کوڕی خەتتابی ﷺ گوتووە: لەناو وشترەکان وشترێکی کوێر هەیە، ئیمامی عومەریش ﷺ گوتی: بیدە بە ماڵێك با سوودی لێ وەربگرن، دەڵێ: منیش گوتم: لە کاتێکدا کوێرە؟ ئیمامی عومەریش ﷺ گوتی: وەگەڵ وشترانی دەدەن، دەڵێ: منیش گوتم: چۆن گژوگیا لە زەوی دەخوات (خۆ کوێرە)؟ دەڵێ: جا عومەر گوتی: ئایا لە ئاژەڵی سەرانەیە یان لە ئاژەڵی زەکاتە؟ منیش گوتم: لە ئاژەڵی سەرانەیە، ئیمامی عومەریش ﷺ گوتی: بەخوا مەبەستتان خواردنیەتی، منیش گوتم: (بەڵگەم هەیە) مۆر و نیشانەی سەرانەی بەسەرەوەیە، جا ئیمامی عومەر ﷺ فەرمانی کرد و سەربڕا، جا نۆ سینی (خوانچە)ی لەلا بوو، هیچ میوە و شتی خۆش نەبوو حەتمەن بەشێکی لەناو سینییەکان دانا و، ناردنی بۆ خێزانەکانی پێغەمبەری خوا ﷺ (وە لەناو خێزانەکانی پێغەمبەر ﷺ کۆتاییەکەی) بۆ حەفصەی کچی دەنارد، جا ئەگەر کەم و کورتیەکی تێ کەوتبا دەبووە پشکی حەفصە ﷺ دەڵێ: جا لە گۆشتی ئەم وشترەی خستە سەر سینییەکان و ناردی بۆ خێزانەکانی پێغەمبەری خوا ﷺ وە فەرمانی کرد ئەو گۆشتەی ماوەتەوە بکرێت بە چێشت و ئەنصار و موهاجیرەکانی بۆ بانگێشت کرد.

---

(١) ـ صحيح. أخرجه أبو مصعب الزهري: ٧٤٨؛ والحدثاني: ٢١٠؛ والشيباني: ٩٩٠؛ والشافعي، ٤٥٧، كلهم عن مالك به.

**٧٥٩-** قَالَ مَالِكٌ ﵀: لاَ أَرَى أَنْ تُؤْخَذَ النَّعَمُ مِنْ أَهْلِ الْجِزْيَةِ إِلاَّ فِي جِزْيَتِهِمْ[١].

واته: ئیمامی مالیك ﵀ گوتوویەتی: بۆچوونم وا نییە ئاژەڵ لە ئەهلی سەرانە وەربگیرێ تەنها لە جزیە نەبێ (ئەگەر ئیمام پێی باش بوو دەتوانێ ئاژەڵ لە جزیە وەربگرێ).

**٧٦٠-** عَنْ مَالِكٍ ﵀؛ أَنَّهُ بَلَغَهُ، أَنَّ عُمَرَ بْنَ عَبْدِ الْعَزِيزِ ﵀ كَتَبَ إِلَى عُمَّالِهِ: أَنْ يَضَعُوا الْجِزْيَةَ عَمَّنْ أَسْلَمَ مِنْ أَهْلِ الْجِزْيَةِ حِينَ يُسْلِمُونَ[٢].

واته: ئیمامی مالیك ﵀ پێی گەیشتووە عومەری کوڕی عەبدولعەزیز ﵀ بۆ فەرمانبەرەکانی نووسی: سەرانە لابەرن لەسەر ئەو کەسانەی دەبنە مسوڵمان لە ئەهلی کیتاب، لەو ساتەوەی دەبن بە مسوڵمان.

**٧٦١-** قَالَ مَالِكٌ ﵀: مَضَتِ السُّنَّةُ: أَنْ لاَ جِزْيَةَ عَلَى نِسَاءِ أَهْلِ الْكِتَابِ، وَلاَ عَلَى صِبْيَانِهِمْ، وَأَنَّ الْجِزْيَةَ لاَ تُؤْخَذُ إِلاَّ مِنَ الرِّجَالِ الَّذِينَ قَدْ بَلَغُوا الْحُلُمَ[٣].

واته: ئیمامی مالیك ﵀ گوتوویەتی: لای ئێمە وا هاتووە: سەرانە لەسەر ئافرەتانی ئەهلی کیتاب نییە، وە لەسەر مناڵەکانیشیان نییە، (چونکە) سەرانە تەنها لەو نێرینانە وەردەگیرێ کە باڵغ بوون.

**٧٦٢-** قَالَ مَالِكٌ ﵀: وَلَيْسَ عَلَى أَهْلِ الذِّمَّةِ، وَلاَ عَلَى الْمَجُوسِ فِي نَخِيلِهِمْ، وَلاَ كُرُومِهِمْ، وَلاَ زُرُوعِهِمْ، وَلاَ مَوَاشِيهِمْ صَدَقَةٌ، لأَنَّ الصَّدَقَةَ إِنَّمَا وُضِعَتْ عَلَى الْمُسْلِمِينَ تَطْهِيرًا لَهُمْ، وَرَدًّا عَلَى فُقَرَائِهِمْ، وَوُضِعَتِ الْجِزْيَةُ عَلَى أَهْلِ الْكِتَابِ صَغَارًا لَهُمْ، فَهُمْ مَا كَانُوا بِبَلَدِهِمِ الَّذِي صَالَحُوا عَلَيْهِ، لَيْسَ عَلَيْهِمْ شَيْءٌ سِوَى الْجِزْيَةِ فِي شَيْءٍ مِنْ أَمْوَالِهِمْ، إِلاَّ أَنْ يَتَّجِرُوا فِي بِلاَدِ الْمُسْلِمِينَ، وَيَخْتَلِفُوا فِيهَا، فَيُؤْخَذُ مِنْهُمُ الْعُشْرُ، فِيمَا يُدِيرُونَ مِنَ التِّجَارَاتِ، وَذَلِكَ أَنَّهُمْ إِنَّمَا وُضِعَتْ عَلَيْهِمُ الْجِزْيَةُ، وَصَالَحُوا عَلَيْهَا، عَلَى أَنْ يُقَرُّوا بِبِلاَدِهِمْ، وَيُقَاتَلُ عَنْهُمْ عَدُوُّهُمْ، فَمَنْ خَرَجَ مِنْهُمْ مِنْ بِلاَدِهِ إِلَى غَيْرِهَا يَتْجُرُ إِلَيْهَا، فَعَلَيْهِ الْعُشْرُ، مَنْ تَجَرَ مِنْهُمْ مِنْ أَهْلِ مِصْرَ إِلَى الشَّامِ،

---

(١) ـ أخرجه أبو مصعب الزهري: ٧٤٩، عن مالك به.

(٢) ـ مقطوع ضعيف. أخرجه أبو مصعب الزهري: ٧٤٤، عن مالك به.

(٣) ـ أخرجه أبو مصعب الزهري: ٧٤٥، عن مالك به.

وَمِنْ أَهْلِ الشَّامِ إِلَى الْعِرَاقِ، وَمِنْ أَهْلِ الْعِرَاقِ إِلَى الْمَدِينَةِ، أَوِ الْيَمَنِ، أَوْ مَا أَشْبَهَ هَذَا مِنَ الْبِلاَدِ، فَعَلَيْهِ الْعُشْرُ، وَلاَ صَدَقَةَ عَلَى أَهْلِ الْكِتَابِ، وَلاَ الْمَجُوسِ فِي شَيْءٍ مِنْ مَوَاشِيهِمْ، وَلاَ ثِمَارِهِمْ، وَلاَ زُرُوعِهِمْ، مَضَتْ بِذَلِكَ السُّنَّةُ، وَيُقَرُّونَ عَلَى دِينِهِمْ، وَيَكُونُونَ عَلَى مَا كَانُوا عَلَيْهِ، وَإِنِ اخْتَلَفُوا فِي الْعَامِ الْوَاحِدِ مِرَارًا إِلاَ بِلاَدِ الْمُسْلِمِينَ، فَعَلَيْهِمْ كُلَّمَا اخْتَلَفُوا الْعُشْرُ، لأَنَّ ذَلِكَ لَيْسَ مِمَّا صَالَحُوا عَلَيْهِ، وَلاَ مِمَّا شُرِطَ لَهُمْ، وَهَذَا الَّذِي أَدْرَكْتُ عَلَيْهِ أَهْلَ الْعِلْمِ بِبَلَدِنَا[1].

واتە: ئیمامی مالیك ﷺ گوتوویەتی: نە ئەهلی زیممە و نە مەجوسەکان زەکاتیان لەسەر واجب نییە لە خورما و ترێ و کشتوکاڵ و ئاژەڵەکانیان، چونکە زەکات کە لەسەر مسوڵمانان واجب کراوە بۆ پاکبوونەوەیانە، وە بۆ ئەوەیە زەکاتەکە بدرێتەوە هەژارەکانیان، سەرانەش کە واجب کراوە لەسەر ئەهلی کیتاب بۆ بچووکبوونەوە و دەرخستنی بێدەسەڵاتی ئەوانە، جا تا ئەو کاتەی لە ناوچەی خۆیان بن کە پەیمانیان بەستووە (بەوەی زیان بە دەوڵەتی ئیسلامی نەگەیەنن و مسوڵمانانیش ئەوان بپارێزن، جا مادەم خاوەن ئەو پەیمانە بن) هیچیان لەسەر نییە لە سەروەتەکەیان جگە لە سەرانە، تەنها لەو کاتەدا نەبێت کە بازرگانی لەناو دەوڵەتی ئیسلامی بکەن و تیایدا بێن و بچن، ئەو کات یەك لەسەر دەیان لێ وەردەگیرێ لەو شتانەی بازرگانی پێوە دەکەن، ئەوەش لەبەر ئەوەیە کاتێ سەرانەیان لەسەر دانراوە و لەسەر ئەوە پێکهاتنیان لەگەڵ کراوە بەوەی لە ناوچەکانی خۆیان بمێننەوە و شەڕیان لەجیاتی بکرێ لەگەڵ دوژمنەکانیان (واتە دەوڵەتی ئیسلامی شەڕیان بۆ بکات و بیانپارێزێ)، جا هەر کەسێك لەوان لە ناوچەکەی خۆی دەربچێت بۆ ناوچەیەکی ئیسلامی و بازرگانی تێدا بکات، ئەوە یەك لەسەر دەی بازرگانییەکەی لەسەرە (دەبێت بیدات بە دەوڵەتی ئیسلامی)، هەر کەسێك لەوان خەڵکی میصر بێت و بچێتە شام، وە خەڵکی شام بێت و بچێتە عێراق، وە خەڵکی عێراق بێت و بچێتە مەدینە یان یەمەن یان ناوچەیەکی وەکوو ئەمانە، ئەوە یەك لەسەر دەی لەسەرە، جا زەکات واجب نییە نە لەسەر ئەهلی کیتاب و نە لەسەر مەجوس لە ئاژەڵ و ماڵاتەکانیان و بەروبوومەکانیان و دانەوێڵەکانیان، ڕێبازەکە بەو شێوەیە

---

(١) ـ أخرجه أبو مصعب الزهري: ٧٤٦، عن مالك به.

هاتووە، وە لەسەر دینی خۆیان دەمێننەوە وە لەسەر ئەوە دەمێننەوە کە لەسەری بوون، جا ئەگەر لە یەك ساڵدا چەند جارێك تێکەڵ بوون و هاتنە ناوچەکانی مسوڵمانان (بۆ بازرگانی)، ئەوە هەر جارێك تێکەڵ بن و بێنە ناوچەکان یەك لەسەر دەیان لەسەرە، چونکە لەسەر ئەوە پێکهاتنیان لەگەڵ نەکراوە (بەوەی لە یەك جار زیاتریان لێ وەرنەگیرێ)، وە لەو مەرجانەش نییە کە بۆیان داندراوە، جا لەسەر ئەوە گەیشتووم بە زانایان لە شارەکەمان[١].

## ٢٥- دەیەکی ئەهلی زیممە (پەیمانلەئەستۆ)[٢]

**٧٦٣**- عَنْ سَالِمِ بْنِ عَبْدِ اللهِ ﵀، عَنْ أَبِيهِ ﵀، أَنَّ عُمَرَ بْنَ الْخَطَّابِ ﵁ كَانَ يَأْخُذُ مِنَ النَّبَطِ مِنَ الْحِنْطَةِ وَالزَّيْتِ، نِصْفَ الْعُشْرِ، يُرِيدُ بِذَلِكَ أَنْ يَكْثُرَ الْحَمْلُ إِلَى الْمَدِينَةِ، وَيَأْخُذُ مِنَ الْقِطْنِيَّةِ الْعُشْرَ[٣].

واتە: لە سالمی کوڕی عەبدوڵڵاوە ﵀ گێڕدراوەتەوە، ئەویش لە باوکیەوە ﵀ گێڕاویەتەوە (گوتوویەتی): عومەری کوڕی خەتتاب ﵁ نیوەی دەیەکی وەردەگرت لە گەنم و ڕۆن لەو جوتیارە گاورانەی عەجەم کە بۆ بازرگانی دەهاتن و پەیمانلەئەستۆ بوون، مەبەستی بەوە زۆرکردنی گەنم و زەیت بوو لە مەدینە، وە دەیەکی وەردەگرت لەو دانەوێڵانەی بەکوڵان دەکرێنە چێشت (وەك نیسك و نۆك و ... هتد).

**٧٦٤**- عَنِ السَّائِبِ بْنِ يَزِيدَ ﵁، أَنَّهُ قَالَ: كُنْتُ غُلاَمًا عَامِلاً مَعَ عَبْدِ اللهِ بْنِ عُتْبَةَ بْنِ مَسْعُودٍ ﵀ عَلَى سُوقِ الْمَدِينَةِ، فِي زَمَانِ عُمَرَ بْنِ الْخَطَّابِ ﵁، فَكُنَّا نَأْخُذُ مِنَ النَّبَطِ الْعُشْرَ[٤].

---

(١) ـ تێبینی: بەڵام ئیمامی ئەبو حەنیفە و ئیمامی شافیعی پێیان وایە لە ساڵێکدا تەنها یەك جار لێیان وەردەگیرێ، هەرچەندە چەندین جاریش بۆ بازرگانی بێن.

(٢) ـ عُشُورُ أَهْلِ الذِّمَّةِ.

(٣) ـ صحيح. أخرجه أبو مصعب الزهري: ٧٣٨؛ والشيباني: ٣٣١؛ والشافعي: ١٠١٩، كلهم عن مالك به.

(٤) ـ صحيح. أخرجه أبو مصعب الزهري: ٧٣٩؛ والشافعي: ١٠٢٠، عن مالك به.

واتە: لە سائیبی کوڕی یەزیدەوە ﷺ گێڕدراوەتەوە گوتوویەتی: من هەرزەکارێکی فەرمانبەر بووم لەگەڵ عەبدوڵڵای کوڕی عوتبەی کوڕی مەسعود ﷺ بەسەر بازاڕی مەدینەوە، لە سەردەمی عومەری کوڕی خەتتاب ﷺ، جا یەك لەسەر دەمان وەردەگرت لەو جوتیارە گاورانەی عەجەم کە بۆ بازرگانی دەهاتن و پەیماننەئەستۆ بوون.

**٧٦٥-** عَنْ مَالِكٍ ﷺ، أَنَّهُ سَأَلَ ابْنَ شِهَابٍ: عَلَى أَيِّ وَجْهٍ كَانَ يَأْخُذُ عُمَرُ بْنُ الْخَطَّابِ ﷺ مِنَ النَّبَطِ الْعُشْرَ؟ فَقَالَ ابْنُ شِهَابٍ ﷺ: كَانَ ذَلِكَ يُؤْخَذُ مِنْهُمْ فِي الْجَاهِلِيَّةِ، فَأَلْزَمَهُمْ ذَلِكَ عُمَرُ ﷺ (١).

واتە: لە ئیمامی مالیکەوە ﷺ گێڕدراوەتەوە پرسیاری لە ئیبنو شیهاب کردووە (گوتوویەتی): لەسەر چ بنەمایەك عومەری کوڕی خەتتاب ﷺ یەك لەسەر دەی وەردەگرت لە جوتیارە گاورەکانی عەجەم کە بۆ بازرگانی دەهاتن و پەیماننەئەستۆ بوون؟ ئیبنو شیهاب ﷺ گوتی: لە سەردەمی پێشی ئیسلام ئەوەیان لێ وەردەگیرا، جا ئیمامی عومەر ﷺ لەسەر ئەوە پەیوەستی کردن.

## ٢٦- کڕینەوەی زەکات و گەڕانەوە بۆی (لەلایەن ئەو کەسەی زەکاتەکەی داوە)(٢)

**٧٦٦-** عَنْ زَيْدِ بْنِ أَسْلَمَ ﷺ، عَنْ أَبِيهِ ﷺ، أَنَّهُ قَالَ: سَمِعْتُ عُمَرَ بْنَ الْخَطَّابِ ﷺ وَهُوَ يَقُولُ: حَمَلْتُ عَلَى فَرَسٍ عَتِيقٍ فِي سَبِيلِ اللهِ، وَكَانَ الرَّجُلُ الَّذِي هُوَ عِنْدَهُ قَدْ أَضَاعَهُ، فَأَرَدْتُ أَنْ أَشْتَرِيَهُ مِنْهُ، وَظَنَنْتُ أَنَّهُ بَائِعُهُ بِرُخْصٍ، فَسَأَلْتُ عَنْ ذَلِكَ رَسُولَ اللهِ ﷺ فَقَالَ: لَا تَشْتَرِهِ، وَإِنْ أَعْطَاكَهُ بِدِرْهَمٍ وَاحِدٍ، فَإِنَّ الْعَائِدَ فِي صَدَقَتِهِ، كَالْكَلْبِ يَعُودُ فِي قَيْئِهِ(٣).

---

(١) ـ مقطوع صحيح. أخرجه أبو مصعب الزهري: ٧٤٠، عن مالك به.

(٢) ـ اشْتِرَاءُ الصَّدَقَةِ وَالْعَوْدِ فِيهَا.

(٣) ـ صحيح. أخرجه أبو مصعب الزهري: ٩٦٧؛ وابن حنبل: ٢٨١؛ والبخاري: ١٤٩٠، وفي: ٢٦٢٣، وفي: ٢٩٧٠، وفي: ٣٠٠٣؛ ومسلم: الهبات: ١؛ والنسائي: ٢٦١٥؛ وابن حبان: ٥١٢٥؛ والقابسي: ١٦٨، كلهم عن مالك به.

واتە: لە زەیدی کوڕی ئەسلەمەوە ﷺ گێڕدراوەتەوە، ئەویش لە باوکیەوە ﷺ گێڕاویەتەوە گوتوویەتی: گوێم لە عومەری کوڕی خەتتاب ﷺ بوو دەیگوت: کەسێکم سواری ئەسپێکی چاك و ناوازە کرد (و پێم بەخشی) لە پێناوی خوا بۆ جیهاد، جا ئەو پیاوەی ئەسپەکەی کەوتە لا زایەی کردبوو و باش قەدری نەدەزانی، ویستم لێی بکڕمەوە، پێم وابوو بە هەرزان دەیفرۆشێ، جا پرسیارم دەربارەی ئەوە لە پێغەمبەری خوا ﷺ کرد (کە ئاخۆ بیکڕمەوە)؟ ئەویش فەرمووی: مەیکڕەوە هەرچەندە بە یەك درهەمیش پێت بفرۆشێ، چونکە ئەو کەسەی دەگەڕێتەوە بۆ بەخشینەکەی وەك سەگ وایە کە دەگەڕێتەوە سەر ڕشانەوەکەی.

**٧٦٧-** عَنْ عَبْدِ اللهِ بْنِ عُمَرَ ﷺ؛ أَنَّ عُمَرَ بْنَ الْخَطَّابِ ﷺ حَمَلَ عَلَى فَرَسٍ فِي سَبِيلِ اللهِ، فَأَرَادَ أَنْ يَبْتَاعَهُ، فَسَأَلَ عَنْ ذَلِكَ رَسُولَ اللهِ ﷺ فَقَالَ: لاَ تَبْتَعْهُ، وَلاَ تَعُدْ فِي صَدَقَتِكَ[1].

واتە: لە عەبدوڵڵای کوڕی عومەرەوە ﷺ گێڕدراوەتەوە (گوتوویەتی): عومەری کوڕی خەتتاب ﷺ ئەسپێکی بەخشی بە جەنگاوەرێك کاتێك جەنگاوەرەکە پێویستی پێ بوو بۆ ئەوەی خۆی و شتومەکەکانی جەنگی سوار بکات، دواتر (پاشی جەنگەکە خاوەنەکەی بۆ فرۆشتن دابنابوو) ئیمامی عومەریش ﷺ ویستی بیکڕێتەوە، جا دەربارەی ئەوە پرسیاری لە پێغەمبەری خوا ﷺ کرد، ئەویش فەرمووی: مەگەڕێوە بۆ بەخشین و صەدەقەکەت (مەیکڕەوە).

**٧٦٨- [فتوى]** قَالَ يَحْيَى ﷺ: سُئِلَ مَالِكٌ ﷺ عَنْ رَجُلٍ تَصَدَّقَ بِصَدَقَةٍ، فَوَجَدَهَا مَعَ غَيْرِ الَّذِي تَصَدَّقَ بِهَا عَلَيْهِ تُبَاعُ، أَيَشْتَرِيهَا؟ فَقَالَ: تَرْكُهَا أَحَبُّ إِلَيَّ.

(فەتوا): واتە: یەحیا ﷺ گوتوویەتی: ئیمامی مالیك ﷺ پرسیاری لێکرا دەربارەی پیاوێك کە زەکاتێك بدات، دواتر شتەکەی زەکات ببینێتەوە لەلای جگە لەو کەسەی زەکاتەکەی پێ بەخشیوە و دەفرۆشرێ، ئایا بیکڕێت؟ ئەویش گوتی: وازلێهێنان و نەکڕینی چاکتر و خۆشەویستترە لەلام.

---

(١) ـ صحيح. أخرجه أبو مصعب الزهري: ٩٦٦؛ والبخاري: ٢٩٧١، وفي: ٣٠٠٢؛ ومسلم: الهبات: ٣؛ وأبو داود: ١٥٩٣؛ وابن حبان: ٥١٢٤؛ والقابسي: ٢١٤، كلهم عن مالك به.




## ٢٧- کێ زەکاتی سەرفیترەی لەسەر واجبە[١]

**٧٦٩-** عَنْ نَافِعٍ ﷺ، أَنَّ عَبْدَ اللهِ بْنَ عُمَرَ ﷺ كَانَ يُخْرِجُ زَكَاةَ الْفِطْرِ عَنْ غِلْمَانِهِ الَّذِينَ بِوَادِي الْقُرَى وَبِخَيْبَرَ[٢].

واتە: لە نافیعەوە ﷺ گێڕدراوەتەوە (گوتوویەتی): عەبدوڵڵای کوڕی عومەر ﷺ زەکاتی سەرفیترەی ئەو کۆیلانەی خۆی دەدا کە لە «وادی قوڕا» و «خەیبەر» بوون.

**٧٧٠- [فتوى]** عَنْ مَالِكٍ ﷺ، أَنَّ أَحْسَنَ مَا سَمِعَ فِيمَا يَجِبُ عَلَى الرَّجُلِ مِنْ زَكَاةِ الْفِطْرِ، أَنَّ الرَّجُلَ يُؤَدِّي ذَلِكَ عَنْ كُلِّ مَنْ يَضْمَنُ نَفَقَتَهُ، وَلاَ بُدَّ لَهُ مِنْ أَنْ يُنْفِقَ عَلَيْهِ، وَالرَّجُلُ يُؤَدِّي عَنْ مُكَاتَبِهِ، وَمُدَبَّرِهِ، وَرَقِيقِهِ كُلِّهِمْ، غَائِبِهِمْ، وَشَاهِدِهِمْ، مَنْ كَانَ مِنْهُمْ مُسْلِمًا وَمَنْ كَانَ مِنْهُمْ لِتِجَارَةٍ أَوْ لِغَيْرِ تِجَارَةٍ، وَمَنْ لَمْ يَكُنْ مِنْهُمْ مُسْلِمًا، فَلاَ زَكَاةَ عَلَيْهِ فِيهِ[٣].

(فەتوا): واتە: لە ئیمامی مالیکەوە ﷺ گێڕدراوەتەوە (گوتوویەتی): چاکترینی ئەوەی گوێم لێ بووە لەوەی لەسەر پیاو واجبە لە زەکاتی سەرفیترە (ئەوەیە): پیاو زەکاتی سەرفیترە بدات لەبری گشت ئەو کەسانەی بژێوییان دەگرێتە ئەستۆ و لەسەری واجبە مەسرەفیان بکێشێ، جا پیاو زەکاتی سەرفیترەی لەسەر واجبە لەبری کۆیلەی نووسراوپێدراو و کۆیلەی چاوەڕوانکراو و گشت کۆیلەکانی غائیب و ئامادەبوو، لەوانەی مسوڵمانن، جا بۆ بازرگانی بن یان بۆ بازرگانی نەبن، وە لەناو کۆیلەکان ئەو کەسەی مسوڵمان نییە، زەکاتی سەرفیترەی لەسەر خاوەنەکەی واجب نییە (چونکە سەرفیترە تەنها بۆ مسوڵمانە).

**٧٧١- [فتوى]** قَالَ مَالِكٌ ﷺ: فِي الْعَبْدِ الآبِقِ: إِنَّ سَيِّدَهُ إِنْ عَلِمَ مَكَانَهُ، أَوْ لَمْ يَعْلَمْ، وَكَانَتْ غَيْبَتُهُ قَرِيبَةً، وَهُوَ تَرْجَى حَيَاتَهُ وَرَجْعَتَهُ، فَإِنِّي أَرَى أَنْ يُزَكِّيَ عَنْهُ، وَإِنْ كَانَ إِبَاقُهُ قَدْ طَالَ، وَيَئِسَ مِنْهُ، فَلاَ أَرَى أَنْ يُزَكِّيَ عَنْهُ[٤].

---

(١) ـ مَنْ تَجِبُ عَلَيْهِ زَكَاةُ الْفِطْرِ.

(٢) ـ صحيح. أخرجه أبو مصعب الزهري: ٧٥٠؛ والحدثاني: ٢١٠، عن مالك به.

(٣) ـ أخرجه أبو مصعب الزهري: ٧٥١، عن مالك به.

(٤) ـ أخرجه أبو مصعب الزهري: ٧٥٣؛ وأبو مصعب الزهري: ٧٥٢، كلهم عن مالك به.

(فەتوا): واتە: ئیمامی مالیك ﷺ دەربارەی كۆیلەی هەڵاتوو: ئەگەر گەورەكەی شوێنی بزانێ، یان شوێنەكەی نەزانێ و ماوەی ونبوونەكەی نزیك بوو (ماوەیەكی زۆر نەبوو هەڵاتبوو)، لە كاتێكدا گەورەكەی ئومێدی لەژیاندامان و گەڕانەوەی هەبوو، گوتوویەتی: من پێم وایە دەبێ گەورەكەی زەكاتی سەرفیترەی ئەو بدات، وە ئەگەر هەڵاتنەكەی درێژەی كێشا بوو و ماوەیەكی زۆر بەسەر چووبوو و بێئومێد بوو لێی (كە لە ژیاندا مابێ یان بگەڕێتەوە)، ئەوە پێم وا نییە واجب بێت زەكاتی سەرفیترەی ئەو بدات.

**٧٧٢- [فتوى]** قَالَ مَالِكٌ ﷺ: تَجِبُ زَكَاةُ الْفِطْرِ عَلَى أَهْلِ الْبَادِيَةِ، كَمَا تَجِبُ عَلَى أَهْلِ الْقُرَى، وَذَلِكَ أَنَّ رَسُولَ اللهِ ﷺ فَرَضَ زَكَاةَ الْفِطْرِ مِنْ رَمَضَانَ عَلَى النَّاسِ، عَلَى كُلِّ حُرٍّ أَوْ عَبْدٍ، ذَكَرٍ أَوْ أُنْثَى، مِنَ الْمُسْلِمِينَ.

(فەتوا): واتە: ئیمامی مالیك ﷺ گوتوویەتی: زەكاتی سەرفیترە لەسەر خەڵكی گوند واجبە، وەك چۆن لەسەر خەڵكی شار واجبە، ئەوەش لەبەر ئەوەی پێغەمبەری خوا ﷺ زەكاتی سەرفیترەی لەسەر گشت خەڵكی واجب كرد لە ڕەمەزاندا، لەسەر ئازاد و كۆیلە و نێر و مێ لە مسوڵمانان.

## ٢٨- ئەندازەی زەكاتی سەرفیترە[١]

**٧٧٣-** عَنْ عَبْدِ اللهِ بْنِ عُمَرَ ﷺ؛ أَنَّ رَسُولَ اللهِ ﷺ فَرَضَ زَكَاةَ الْفِطْرِ مِنْ رَمَضَانَ، عَلَى النَّاسِ، صَاعًا مِنْ تَمْرٍ، أَوْ صَاعًا مِنْ شَعِيرٍ، عَلَى كُلِّ حُرٍّ أَوْ عَبْدٍ، ذَكَرٍ أَوْ أُنْثَى، مِنَ الْمُسْلِمِينَ[٢].

واتە: لە عەبدوڵڵای كوڕی عومەرەوە ﷺ گێڕدراوەتەوە (گوتوویەتی): پێغەمبەری خوا ﷺ زەكاتی سەرفیترەی لەسەر خەڵكی واجب كرد لە ڕەمەزاندا،

---

(١) ـ مَكِيلَةُ زَكَاةِ الْفِطْرِ.

(٢) ـ صحيح. أخرجه أبو مصعب الزهري: ٧٥٥؛ والشافعي: ٤١٤؛ وفي: ٤١٧؛ وابن حنبل: ٥٣٠٣؛ والبخاري: ١٥٠٤؛ ومسلم: الزكاة: ١٢؛ والنسائي: ٢٥٠٢، وفي: ٢٥٠٣، وفي: ٢٥٠٣؛ وأبو داود: ١٦١١؛ والترمذي: ٦٧٦؛ وابن ماجه: ١٨٣٠؛ والدارمي: ١٦٦١؛ والقابسي: ٢١١، كلهم عن مالك به.

صاعێك لە خورما یان صاعێك لە جۆ، لەسەر گشت کەسێکی ئازاد و کۆیلە و نێر و مێ لە مسوڵمانان[١].

**٧٧٤-** عَنْ عِيَاضِ بْنِ عَبْدِ اللهِ بْنِ سَعْدِ بْنِ أَبِي سَرْحٍ الْعَامِرِيِّ ﷺ، أَنَّه سَمِعَ أَبَا سَعِيدٍ الْخُدْرِيَّ ﷺ يَقُولُ: كُنَّا نُخْرِجُ زَكَاةَ الْفِطْرِ صَاعًا مِنْ طَعَامٍ، أَوْ صَاعًا مِنْ شَعِيرٍ، أَوْ صَاعًا مِنْ تَمْرٍ، أَوْ صَاعًا مِنْ أَقِطٍ، أَوْ صَاعًا مِنْ زَبِيبٍ، وَذَلِكَ بِصَاعِ النَّبِيِّ ﷺ[٢].

واتە: لە عیازی کوڕی عەبدوڵڵای کوڕی سەعدی کوڕی ئەبو سەرحی عامیرییەوە ﷺ گێڕدراوەتەوە بەوەی گوێی لە ئەبو سەعیدی خودریی ﷺ بووە دەیگوت: ئێمە زەکاتی سەرفیترەمان دەردەکرد، صاعێك لە خواردن، یان صاعێك لە جۆ، یان صاعێك لە خورما، یان صاعێك لە کەشك، یان صاعێك لە مێوژ، ئەو ئەندازەیەش بە پێی صاعی پێغەمبەری خوا ﷺ دەبێت.

**٧٧٥-** عَنْ نَافِعٍ ﷺ، أَنَّ عَبْدَ اللهِ بْنَ عُمَرَ ﷺ كَانَ لاَ يُخْرِجُ فِي زَكَاةِ الْفِطْرِ إِلاَّ التَّمْرَ، إِلاَّ مَرَّةً وَاحِدَةً، فَإِنَّهُ أَخْرَجَ شَعِيرًا[٣].

واتە: لە نافیعەوە ﷺ گێڕدراوەتەوە (گوتوویەتی): عەبدوڵڵای کوڕی عومەر ﷺ لە زەکاتی سەرفیترەدا هیچ شتێکی نەدەدا جگە لە خورما، تەنها جارێك نەبێ، جۆی بەخشی.

**٧٧٦- [فتوى]** قَالَ مَالِكٌ ﷺ: وَالْكَفَّارَاتُ كُلُّهَا، وَزَكَاةُ الْفِطْرِ، وَزَكَاةُ الْعُشُورِ، كُلُّ ذَلِكَ بِالْمُدِّ الأَصْغَرِ، مُدِّ النَّبِيِّ ﷺ، إِلاَّ الظِّهَارَ، فَإِنَّ الْكَفَّارَةَ فِيهِ بِمُدِّ هِشَامٍ، وَهُوَ الْمُدُّ الأَعْظَمُ[٤].

(فەتوا): واتە: ئیمامی مالیك ﷺ گوتوویەتی: لە گشت کەفارەتەکان و زەکاتی سەرفیترە و زەکاتی ئەو دانەوێڵانەی دەیەکیان زەکات تێدایە، گشت ئەوانە بە مودە بچووکەکە دەبێت (کە جۆرە پێوانەیەکە لەلای مالیکییەکان دەکاتە ٥٠٦ گرام)، کە

---

(١) ـ تێبینی: صاع بە کیلۆ دەکاتە: دوو کیلۆ و ٤٢٠ گرام.

(٢) ـ صحيح. أخرجه أبو مصعب الزهري: ٧٥٦؛ والشافعي: ٤١٦؛ وفي: ٤١٨؛ وفي: ١٣٨٦؛ والبخاري: ١٥٠٦؛ ومسلم: الزكاة: ١٧؛ والدارمي: ١٦٦٤؛ والقابسي: ١٧٦، كلهم عن مالك به.

(٣) ـ صحيح. أخرجه أبو مصعب الزهري: ٧٥٧؛ والحدثاني: ٢١٠ب؛ والشافعي: ٤٢٢، كلهم عن مالك به.

(٤) ـ أخرجه أبو مصعب الزهري: ٧٥٨؛ والحدثاني: ٢١٠ج، كلهم عن مالك به.



بریتییە لە مودی پێغەمبەری خوا ﷺ، تەنها کەفارەتی زیهار نەبێ، کەفارەت تیایدا بە مودی هیشامە، کە مودە گەورەکەیە (کە دەکاتە نزیکەی دوو مودی بچووك).

## ٢٩- کاتی ناردنی زەکاتی سەرفیترە[١]

**٧٧٧**- عَنْ نَافِعٍ ﷺ، أَنَّ عَبْدَ اللهِ بْنَ عُمَرَ ﷺ كَانَ يَبْعَثُ بِزَكَاةِ الْفِطْرِ إِلَى الَّذِي تُجْمَعُ عِنْدَهُ قَبْلَ الْفِطْرِ، بِيَوْمَيْنِ أَوْ ثَلاَثَةٍ[٢].

واتە: لە نافیعەوە ﷺ گێڕدراوەتەوە (گوتوویەتی): عەبدوڵڵای کوڕی عومەر ﷺ زەکاتی سەرفیترەی دەنارد بۆ لای ئەو کەسەی زەکاتی لەلا کۆ دەکرایەوە (واتە سەرفیترەکەی دەدا و دەینارد بۆ لای فەرمانبەری زەکات)، پێش ڕۆژی جەژنی ڕەمەزان بە دوو ڕۆژ یان سێ ڕۆژ.

**٧٧٨- [فتوى]** عَنْ مَالِكٍ ﷺ؛ أَنَّهُ رَأَى أَهْلَ الْعِلْمِ يَسْتَحِبُّونَ أَنْ يُخْرِجُوا زَكَاةَ الْفِطْرِ، إِذَا طَلَعَ الْفَجْرُ مِنْ يَوْمِ الْفِطْرِ، قَبْلَ أَنْ يَغْدُوا إِلَى الْمُصَلَّى.

(فەتوا): واتە: لە ئیمامی مالیکەوە ﷺ گێڕدراوەتەوە بەوەی زانایانی بینیوە بەسوننەت و چاکیان زانیوە زەکاتی سەرفیترە دەربکەن کاتێ بەیان هەڵدێ لە ڕۆژی جەژنی ڕەمەزاندا، بەر لەوەی بچن بۆ شوێنی نوێژکردنی جەژن.

**٧٧٩- [فتوى]** قَالَ مَالِكٌ ﷺ: وَذَلِكَ وَاسِعٌ إِنْ شَاءَ اللهُ تَعَالَى، أَنْ يُؤَدُّوا قَبْلَ الْغُدُوِّ مِنْ يَوْمِ الْفِطْرِ أَوْ بَعْدَهُ[٣].

(فەتوا): واتە: ئیمامی مالیك ﷺ گوتوویەتی: بەخشینی زەکاتی سەرفیترە کاتەکەی فراوانە إن شاْ الله تعالى، (دەتوانن) پێشی بەیان لە ڕۆژی جەژن یان دوای بەیان بیدەن.

---

(١) ـ وَقْتُ إِرْسَالِ زَكَاةِ الْفِطْرِ.

(٢) ـ صحيح. أخرجه أبو مصعب الزهري: ٧٥٩؛ والحدثاني: ٢١٠د؛ والشيباني: ٣٤٤؛ والشافعي: ٤٢١، كلهم عن مالك به.

(٣) ـ أخرجه أبو مصعب الزهري: ٧٦٠؛ وفي: ٧٦١، عن مالك به.

## ٣٠- ئەوانەی واجب نییە زەکاتی سەرفیترەیان بۆ بدرێت (واتە لەسەریان نییە)[١]

**٧٨٠- [فتوى]** قَالَ مَالِكٌ ﷺ: لَيْسَ عَلَى الرَّجُلِ فِي عَبِيدِ عَبِيدِهِ، وَلاَ فِي أَجِيرِهِ، وَلاَ فِي رَقِيقِ امْرَأَتِهِ، زَكَاةٌ، إِلاَّ مَنْ كَانَ مِنْهُمْ يَخْدِمُهُ، وَلاَ بُدَّ لَهُ مِنْهُ، فَتَجِبُ عَلَيْهِ، وَلَيْسَ عَلَيْهِ زَكَاةٌ فِي أَحَدٍ مِنْ رَقِيقِهِ الْكَافِرِ، مَا لَمْ يُسْلِمْ لِتِجَارَةٍ كَانُوا، أَوْ لِغَيْرِ تِجَارَةٍ[٢].

(فەتوا): واتە: ئیمامی مالیك ﷺ گوتوویەتی: مرۆڤ بەخشینی زەکاتی سەرفیترەی لەسەر واجب نییە: نە لە بەندەی بەندەکەی و نە لە کرێچییەکەی و نە لە کۆیلەی خێزانەکەی، تەنها ئەوەیان نەبێت کە خزمەتی دەکات، ئەویان واجبە و زەکاتی سەرفیترەی لەسەر واجب دەبێت (دەبێ سەرفیترەکەی لەجیاتی بدات)، وە زەکاتی سەرفیترەی لەسەر واجب نییە لە هیچێك لە کۆیلە کافرەکانی مادەم مسوڵمان نەبووبن، جا بۆ بازرگانی بن یان بۆ بازرگانی نەبن (جیاوازی نییە).

---

(١) ـ مَنْ لَا تَجِبُ عَلَيْهِ زَكَاةُ الْفِطْرِ.

(٢) ـ أخرجه أبو مصعب الزهري: ٧٥٤، عن مالك به.

## ١- ئەوەی هاتووە دەربارەی بینینی مانگی یەکشەوە بۆ کەسی ڕۆژووەوان، هەروەها بینینی مانگ بۆ کۆتاییهێنان بە ڕەمەزان[١]

**٧٨١-** عَنْ عَبْدِ اللهِ بْنِ عُمَرَ ﵄؛ أَنَّ رَسُولَ اللهِ ﷺ ذَكَرَ رَمَضَانَ، فَقَالَ: لاَ تَصُومُوا حَتَّى تَرَوُا الْهِلاَلَ، وَلاَ تُفْطِرُوا حَتَّى تَرَوْهُ، فَإِنْ غُمَّ عَلَيْكُمْ، فَاقْدُرُوا لَهُ[٢].

واتە: لە عەبدوڵڵای کوڕی عومەرەوە ﵄ گێڕدراوەتەوە (گوتوویەتی): پێغەمبەری خوا ﷺ باسی ڕەمەزانی کرد و فەرمووی: بە ڕۆژوو مەبن تاوەکوو مانگی یەکشەوەی ڕەمەزان دەبینن، وە ڕۆژووش مەشکێنن (مەیکەن بە جەژن) تاوەکوو مانگ (ی شەوال) دەبینن، جا ئەگەر هەور کەوتە نێوانی ئێوە و نێوانی مانگ (نەتانتوانی ببینن)، ئەوە ژمارەی تەواوی مانگ بژمێرن (واتە سی ڕۆژ تەواو بکەن).

**٧٨٢-** عَنْ عَبْدِ اللهِ بْنِ عُمَرَ ﵄؛ أَنَّ رَسُولَ اللهِ ﷺ قَالَ: الشَّهْرُ تِسْعٌ وَعِشْرُونَ، فَلاَ تَصُومُوا حَتَّى تَرَوُا الْهِلاَلَ، وَلاَ تُفْطِرُوا حَتَّى تَرَوْهُ، فَإِنْ غُمَّ عَلَيْكُمْ، فَاقْدُرُوا لَهُ[٣].

واتە: لە عەبدوڵڵای کوڕی عومەرەوە ﵄ گێڕدراوەتەوە (گوتوویەتی): پێغەمبەری خوا ﷺ فەرموویەتی: مانگ (کەمترینی) بیست و نۆ ڕۆژە، جا (پەلە مەکەن و) بەڕۆژوو مەبن تاوەکوو مانگی یەکشەوەی ڕەمەزان دەبینن، وە ڕۆژووش مەشکێنن (مەیکەن بە جەژن) تاوەکوو مانگ (ی شەوال) دەبینن، جا ئەگەر هەور کەوتە نێوانی ئێوە و نێوانی مانگ (نەتانتوانی ببینن)، ئەوە ژمارەی تەواوی مانگ بژمێرن (واتە سی ڕۆژ تەواو بکەن، لە سی ڕۆژیش زیاتر بەڕۆژوو مەبن چونکە زۆرترینی مانگی ئیسلامی سییە).

---

(١) ـ مَا جَاءَ فِي رُؤْيَةِ الْهِلَالِ لِلصَّائِمِ وَالْفِطْرِ فِي رَمَضَانَ.

(٢) ـ صحيح. أخرجه أبو مصعب الزهري: ٧٦٢؛ والحدثاني: ٤٥٣؛ والشيباني: ٣٤٦؛ وابن حنبل: ٥٢٩٤؛ والبخاري: ١٩٠٦؛ ومسلم: الصيام: ٣؛ والنسائي: ٢١٢١؛ وابن حبان: ٣٤٤٥ في م٨؛ والدارمي: ١٦٨٤؛ والقابسي: ٢٠٨، كلهم عن مالك به.

(٣) ـ صحيح. أخرجه أبو مصعب الزهري: ٧٦٣؛ والحدثاني: ٤٥٣أ؛ والشافعي: ٤٦٨؛ والبخاري: ١٩٠٧؛ وابن حبان: ٣٤٤٩؛ والقابسي: ٢٨٢، كلهم عن مالك به.

٧٨٣- عَنْ عَبْدِ اللهِ بْنِ عَبَّاسٍ ﵄؛ أَنَّ رَسُولَ اللهِ ﷺ ذَكَرَ رَمَضَانَ فَقَالَ: لاَ تَصُومُوا حَتَّى تَرَوُا الْهِلاَلَ، وَلاَ تُفْطِرُوا حَتَّى تَرَوْهُ، فَإِنْ غُمَّ عَلَيْكُمْ، فَأَكْمِلُوا الْعَدَدَ ثَلاَثِينَ[١].

واتە: لە عەبدوڵڵای کوڕی عەبباسەوە ﵄ گێڕدراوەتەوە (گوتوویەتی): پێغەمبەری خوا ﷺ باسی ڕەمەزانی کرد و فەرمووی: بەڕۆژوو مەبن تاوەکوو مانگی یەك شەوەی ڕەمەزان دەبینن، وە ڕۆژووش مەشکێنن (مەیکەن بە جەژن) تاوەکوو مانگ (ی شەوال) دەبینن، جا ئەگەر هەور کەوتە نێوانی ئێوە و نێوانی مانگ (نەتانتوانی ببینن)، ئەوە سی ڕۆژ تەواو بکەن.

٧٨٤- عَنْ مَالِكٍ ﵀؛ أَنَّهُ بَلَغَهُ، أَنَّ الْهِلاَلَ رُئِيَ فِي زَمَانِ عُثْمَانَ بْنِ عَفَّانَ ﵁ بِعَشِيٍّ، فَلَمْ يُفْطِرْ عُثْمَانُ حَتَّى أَمْسَى وَغَابَتِ الشَّمْسُ[٢].

واتە: لە ئیمامی مالیکەوە ﵀ گێڕدراوەتەوە بەوەی پێی گەیشتووە: مانگ (ی شەوال) لە سەردەمی ئیمامی عوسمانی کوڕی عەففان ﵁ لە دوای نیوەڕۆ بینراوە، جا ڕۆژووی نەشکاند (و نەیکرد بە جەژن) تاوەکوو بوو بە شەو و خۆر ئاوا بوو (چونکە بینینی مانگ بەڕۆژ هی شەوی داهاتووە).

٧٨٥- **[فتوى]** قَالَ يَحْيَى ﵀: سَمِعْتُ مَالِكًا ﵀ يَقُولُ، فِي الَّذِي يَرَى هِلاَلَ رَمَضَانَ وَحْدَهُ: أَنَّهُ يَصُومُ، لاَ يَنْبَغِي لَهُ أَنْ يُفْطِرَ، وَهُوَ يَعْلَمُ أَنَّ ذَلِكَ الْيَوْمَ مِنْ رَمَضَانَ.

(فەتوا): واتە: یەحیا ﵀ گوتوویەتی: گوێم لە ئیمامی مالیك ﵀ بوو دەربارەی ئەو کەسەی بەتەنها مانگی یەکشەوەی ڕەمەزان دەبینێ دەیگوت: بەڕۆژوو دەبێ، بۆی نییە ڕۆژوو بشکێنێت یان نەیگرێت لە کاتێکدا دەزانێ ئەو ڕۆژە بەشێکە لە ڕەمەزان (کەواتە بۆ خۆی بەڕۆژوو دەبێت هەر چەندە خەڵك و دەوڵەت قەناعەت بە بینینەکەی نەکەن).

---

(١) ـ صحيح. أخرجه أبو مصعب الزهري: ٧٦٤؛ والحدثاني: ٤٥٣ب، عن مالك به.

(٢) ـ ضعيف. أخرجه أبو مصعب الزهري: ٧٦٥، عن مالك به.




٧٨٦- **[فتوى]** وَمَنْ رَأَى هِلاَلَ شَوَّالٍ وَحْدَهُ، فَإِنَّهُ لاَ يُفْطِرُ، لأَنَّ النَّاسَ يَتَّهِمُونَ عَلَى أَنْ يُفْطِرَ مِنْهُمْ مَنْ لَيْسَ مَأْمُونًا، وَيَقُولُ أُولَئِكَ إِذَا ظَهَرَ عَلَيْهِمْ: قَدْ رَأَيْنَا الْهِلاَلَ، وَمَنْ رَأَى هِلاَلَ شَوَّالٍ نَهَارًا، فَلاَ يُفْطِرْ، وَلِيُتِمَّ صِيَامَ يَوْمِهِ ذَلِكَ، فَإِنَّمَا هُوَ هِلاَلُ اللَّيْلَةِ الَّتِي تَأْتِي(١).

(فەتوا): واتە: هەروەها هەر كەسێك بەتەنها خۆی مانگی شەوالی بینی، ئەوە ڕۆژوو ناشكێنێت (نایكات بە جەژن)، چونكە خەڵك تۆمەت دەبەخشنەوە بەسەر ئەو كەسەی جێگەی دڵنیایی نییە كاتێ لە ناویاندا ڕۆژوو بشكێنێ (هەر چەندە ڕاستیش بكات)، وە دەیگوت: ئەمانە ئەگەر مانگیان بۆ دەركەوت و گوتیان مانگمان بینیوە نابێت ڕۆژوو بشكێنن (لەبەر تۆمەتەكە)، وە هەر كەسێك بەڕۆژ مانگی شەوالی بینی، ئەوە ڕۆژوو ناشكێنێت و دەبێ ڕۆژووی ئەو ڕۆژە تەواو بكات، چونكە ئەوە مانگی شەوی داهاتووە (نەك هی ڕۆژەكە)(٢).

٧٨٧- **[فتوى]** قَالَ يَحْيَى ﵀: وسَمِعْتُ مَالِكًا ﵀ يَقُولُ: إِذَا صَامَ النَّاسُ يَوْمَ الْفِطْرِ، وَهُمْ يَظُنُّونَ أَنَّهُ مِنْ رَمَضَانَ، فَجَاءَهُمْ ثَبَتٌ أَنَّ هِلاَلَ رَمَضَانَ قَدْ رُئِيَ قَبْلَ أَنْ يَصُومُوا بِيَوْمٍ، وَأَنَّ يَوْمَهُمْ ذَلِكَ أَحَدٌ وَثَلاَثُونَ، فَإِنَّهُمْ يُفْطِرُونَ فِي ذَلِكَ الْيَوْمِ، أَيَّةَ سَاعَةٍ جَاءَهُمُ الْخَبَرُ، غَيْرَ أَنَّهُمْ لاَ يُصَلُّونَ صَلاَةَ الْعِيدِ، إِنْ كَانَ ذَلِكَ جَاءَهُمْ بَعْدَ زَوَالِ الشَّمْسِ(٣).

(فەتوا): واتە: یەحیا ﵀ گوتوویەتی: گوێم لە ئیمامی مالیك ﵀ بوو دەیگوت: ئەگەر خەڵكی لە ڕۆژی جەژن بەڕۆژوو بوون لە كاتێكدا وایاندەزانی ئەو ڕۆژەش هەر ڕەمەزانە، جا كەسێكی جێی متمانە هات بۆ لایان و (گوتی): مانگی یەكشەوەی ڕەمەزان بینرابوو ڕۆژێك پێش ئەوەی ئێوە بەڕۆژوو بن، وە ئەو ڕۆژەتان سی و یەكەمین ڕۆژە، ئەوە خەڵكەكە لەم ڕۆژەدا ڕۆژووەكانیان دەشكێنن جا (جیاوازی نییە) لە هەر كاتێك هەواڵەكەیان بۆ بێ، تەنها ئەوەندە هەیە نوێژی جەژن ناكەن

---

(١) ـ أخرجه أبو مصعب الزهري: ٧٦٦؛ وفي: ٧٦٧، كلهم عن مالك به.

(٢) ـ تێبینی: بەڵام ئیمامی شافیعی گوتوویەتی: مادەم خۆی مانگی شەوالی بینیوە ڕۆژوو دەشكێنێ، تەنها لەو كاتەدا نەبێ كە بترسێ تۆمەتی بۆ بكرێ.

(٣) ـ أخرجه أبو مصعب الزهري: ٧٦٨، عن مالك به.

ئەگەر کەسەکە دوای لادانی خۆر لە ناوەڕاستی ئاسمان (دوای نیوەڕۆ) هات بۆ لایان و هەواڵی پێ دان، (چونکە کاتی نوێژی جەژن بەسەر چووە).

## ٢- ئەو کەسەی نییەتی ڕۆژوو دەهێنێت پێش بەیان[١]

٧٨٨- عَنْ عَبْدِ اللهِ بْنِ عُمَرَ ﵄؛ أَنَّهُ كَانَ يَقُولُ: لاَ يَصُومُ إِلاَّ مَنْ أَجْمَعَ الصِّيَامَ قَبْلَ الْفَجْرِ[٢].

واتە: لە عەبدوڵڵای کوڕی عومەرەوە ﵄ گێڕدراوەتەوە بەوەی دەیگوت: بەڕۆژوو نییە (واتە ڕۆژووی دروست نییە) تەنها ئەو کەسە نەبێت کە پێش کاتی بەیان نییەت لەگەڵ ڕۆژوو دەهێنێ[٣].

٧٨٩- عَنْ عَائِشَةَ، وَحَفْصَةَ ﵄، زَوْجَيِ النَّبِيِّ ﷺ، مِثْلَ ذَلِكَ[٤].

واتە: لەم ڕێگەیەشەوە هەمان فەرموودە لە عائیشە و حەفصەی ﵄ خێزانەکانی پێغەمبەرەوە ﷺ گێڕدراوەتەوە.

## ٣- ئەوەی هاتووە دەربارەی زوو ڕۆژووشکاندن (زوو فتارکردنەوە)[٥]

٧٩٠- عَنْ سَهْلِ بْنِ سَعْدٍ السَّاعِدِيِّ ﵁، أَنَّ رَسُولَ اللهِ ﷺ قَالَ: لاَ يَزَالُ النَّاسُ بِخَيْرٍ مَا عَجَّلُوا الْفِطْرَ[٦].

---

(١) ـ مَنْ أَجْمَعَ الصِّيَامَ قَبْلَ الْفَجْرِ.

(٢) ـ صحيح. أخرجه أبو مصعب الزهري: ٧٧٥؛ والحدثاني: ٤٥٦؛ والشيباني: ٣٧٢؛ والنسائي: ٢٣٤٣، كلهم عن مالك به.

(٣) ـ جا لەلای ئیمامی مالیك ئەو کەسەی پێش کاتی بەیان نییەتی ڕۆژوو نەهێنێ، ڕۆژووەکەی دروست نییە، جا ڕۆژووەکە واجب بێت یان سوننەت، بەڵام لەلای ئیمامی شافیعی ڕۆژووی سوننەت تا نیوەڕۆ کاتی نییەتهێنانی دەمێنێ، ئەگەر کەسەکە هیچ ئەو شتانەی ئەنجام نەدابێت کە ڕۆژوو دەشکێنن.

(٤) ـ ضعيف.

(٥) ـ مَا جَاءَ فِي تَعْجِيلِ الْفِطْرِ.

(٦) ـ صحيح. أخرجه أبو مصعب الزهري: ٧٧٢؛ والحدثاني: ٤٥٥؛ والشيباني: ٣٦٤؛ والشافعي: ٤٧١؛ وابن حنبل: ٢٢٩١٠، وفي: ٢٢٩٢١؛ والبخاري: ١٩٥٧؛ والترمذي: ٦٩٩؛ وابن حبان: ٣٥٠٢؛ والقابسي: ٤١٠، كلهم عن مالك به.

واتە: لە سەهلی کوڕی سەعدی ساعیدییەوە ﷺ گێڕدراوەتەوە (گوتوویەتی): پێغەمبەری خوا ﷺ فەرموویەتی: خەڵکی بەردەوام لە خێر و چاکەدان مادەم زوو ڕۆژوو بشکێنن.

**٧٩١-** عَنْ سَعِيدِ بْنِ الْمُسَيَّبِ ﷺ، أَنَّ رَسُولَ اللهِ ﷺ قَالَ: لاَ يَزَالُ النَّاسُ بِخَيْرٍ مَا عَجَّلُوا الْفِطْرَ[1].

واتە: لە سەعیدی کوڕی موسەیەبەوە ﷺ گێڕدراوەتەوە (گوتوویەتی): پێغەمبەری خوا ﷺ فەرموویەتی: خەڵکی بەردەوام لە خێر و چاکەدان مادەم زوو ڕۆژوو بشکێنن.

**٧٩٢-** عَنْ حُمَيْدِ بْنِ عَبْدِ الرَّحْمَنِ ﷺ، أَنَّ عُمَرَ بْنَ الْخَطَّابِ، وَعُثْمَانَ بْنَ عَفَّانَ ﷺ كَانَا يُصَلِّيَانِ الْمَغْرِبَ حِينَ يَنْظُرَانِ إِلَى اللَّيْلِ الأَسْوَدِ، قَبْلَ أَنْ يُفْطِرَا، ثُمَّ يُفْطِرَانِ بَعْدَ الصَّلاَةِ، وَذَلِكَ فِي رَمَضَانَ[2].

واتە: لە حومەیدی کوڕی عەبدوڕڕەحمانەوە ﷺ گێڕدراوەتەوە (گوتوویەتی): عومەری کوڕی خەتتاب و عوسمانی کوڕی عەففان ﷺ هەموو جار نوێژی مەغریبیان دەکرد کاتێ سەیری شەوی تاریکیان دەکرد (واتە کاتێ سەیری خۆرئاوایان دەکرد و دەیانبینی خۆر بەتەواوی ئاوا بووە)، بەر لەوەی ڕۆژوویان بشکێنن، دواتر دوای نوێژ ڕۆژوویان دەشکاند، لە ڕەمەزاندا (چونکە ئەوەندە دواخستنی ڕۆژووشکاندن نابێتە ناپەسەند و لەدەستدانی پاداشتی زوو فتارکردنەوە).

---

(١) ـ ضعيف بهذا اللفظ. أخرجه أبو مصعب الزهري: ٧٧٣؛ والحدثاني: ٤٥٥أ؛ والشيباني: ٣٦٤؛ وابن حنبل: ٢٢٩١٠، وفي: ٢٢٩٢١؛ والبخاري: ١٩٥٧؛ والترمذي: ٦٩٩؛ وابن حبان: ٣٥٠٢؛ والقابسي: ٤١٠، كلهم عن مالك به.

(٢) ـ ضعيف. أخرجه أبو مصعب الزهري: ٧٧٤؛ والحدثاني: ٤٥٥ب؛ والشيباني: ٣٦٥؛ والشافعي: ٤٧٢، كلهم عن مالك به.

## ٤- ئەوەی هاتووە دەربارەی ڕۆژووی ئەو کەسەی بەلەشگرانی بەیان دەکاتەوە[1]

**٧٩٣-** عَنْ عَائِشَةَ ﵂ زَوْجِ النَّبِيِّ ﷺ، أَنَّ رَجُلاً قَالَ لِرَسُولِ اللهِ ﷺ، وَهُوَ وَاقِفٌ عَلَى الْبَابِ، وَأَنَا أَسْمَعُ: يَا رَسُولَ اللهِ، إِنِّي أُصْبِحُ جُنُبًا، وَأَنَا أُرِيدُ الصِّيَامَ، فَقَالَ ﷺ: وَأَنَا أُصْبِحُ جُنُبًا، وَأَنَا أُرِيدُ الصِّيَامَ، فَأَغْتَسِلُ وَأَصُومُ، فَقَالَ لَهُ الرَّجُلُ: يَا رَسُولَ اللهِ، إِنَّكَ لَسْتَ مِثْلَنَا، قَدْ غَفَرَ اللهُ لَكَ مَا تَقَدَّمَ مِنْ ذَنْبِكَ وَمَا تَأَخَّرَ، فَغَضِبَ رَسُولُ اللهِ ﷺ وَقَالَ: وَاللَّهِ إِنِّي لأَرْجُو أَنْ أَكُونَ أَخْشَاكُمْ لِلَّهِ، وَأَعْلَمَكُمْ بِمَا أَتَّقِي[2].

واتە: لە عائیشەی ﵂ خێزانی پێغەمبەرەوە ﷺ گێڕدراوەتەوە (گوتوویەتی): پیاوێك لە کاتێکدا لەناو دەرگاکە وەستابوو و منیش گوێم لێ بوو بە پێغەمبەری خوای ﷺ گوت: ئەی پێغەمبەری خوا ﷺ من (جاری وا هەیە) بەلەشگرانی بەیانی دەکەمەوە لە کاتێکدا دەمەوێ بەڕۆژوو بم (ئایا دەستپێکردنی ڕۆژوو بەلەشگرانی دروستە)؟ پێغەمبەری خواش ﷺ فەرمووی: منیش (جاری وا هەیە) بەلەشگرانی بەیانی دەکەمەوە و مەبەستیشم هەیە بەڕۆژوو بم، جا خۆم دەشۆرم (دوای نییەتهێنان و پارشێوخواردن و بانگدان) و بەڕۆژووش دەبم (واتە بەڵام لە بانگدان بەولاوە خۆم لەو شتانە دەگرمەوە کە ڕۆژووی پێ دەشکێت)، جا پیاوەکە گوتی: تۆ وەکوو ئێمە نیت، خوای پەروەردگار لە تاوانەکانی پێشوو و دواترت خۆش بووە (ڕەنگە زۆر پێویستیت بە خۆپارێزی نەبێ)، پێغەمبەری خواش ﷺ توڕە بوو و فەرمووی: سوێند بە خوا من ئومێدەوارم لە گشتتان لە خواترستر بم و لە گشتتان زاناتر بم بەوەی دەبێ خۆمی لێ بپارێزم.

**٧٩٤-** عَنْ عَائِشَةَ، وَأُمِّ سَلَمَةَ ﵄، زَوْجَيِ النَّبِيِّ ﷺ، أَنَّهُمَا قَالَتَا: كَانَ رَسُولُ اللهِ ﷺ يُصْبِحُ جُنُبًا مِنْ جِمَاعٍ، غَيْرِ احْتِلَامٍ فِي رَمَضَانَ، ثُمَّ يَصُومُ[3].

---

(١) ـ مَا جَاءَ فِي صِيَامِ الَّذِي يُصْبِحُ جُنُبًا.

(٢) ـ صحيح. أخرجه أبو مصعب الزهري: ٧٧٧؛ وفي: ٧٧٨؛ والحدثاني: ٤٥٧؛ والشيباني: ٣٥٠؛ والشافعي: ٤٧٦؛ وفي: ٨٧٠؛ وابن حنبل: ٢٥٢٦٧، وفي: ٢٦١٢٥؛ وأبو داود: ٢٣٨٩؛ والقابسي: ٣٠٢، كلهم عن مالك به.

(٣) ـ صحيح. أخرجه أبو مصعب الزهري: ٧٧٩؛ والحدثاني: ٤٥٧أ؛ وابن حنبل: ٢٤١٢٠، وفي: ٢٦٥٢٧؛ ومسلم:

واتە: لە عائیشە و ئوم سەلەمەی ﷺ خێزانی پێغەمبەرەوە ﷺ گێردراوەتەوە گوتویانە: پێغەمبەری خوا ﷺ لە ڕەمەزاندا بەهۆی جیماع لەشگران دەبوو، نەك بەهۆی خەوبینین، دواتر بەڕۆژوو دەبوو ( بەلەشگرانی).

**٧٩٥-** عَنْ سُمَيٍّ، مَوْلَى أَبِي بَكْرِ بْنِ عَبْدِ الرَّحْمَنِ بْنِ الْحَارِثِ بْنِ هِشَامٍ ﷺ، أَنَّهُ سَمِعَ أَبَا بَكْرِ بْنَ عَبْدِ الرَّحْمَنِ بْنِ الْحَارِثِ بْنِ هِشَامٍ ﷺ يَقُولُ: كُنْتُ أَنَا وَأَبِي عِنْدَ مَرْوَانَ بْنِ الْحَكَمِ ﷺ، وَهُوَ أَمِيرُ الْمَدِينَةِ، فَذُكِرَ لَهُ أَنَّ أَبَا هُرَيْرَةَ ﷺ يَقُولُ: مَنْ أَصْبَحَ جُنُبًا أَفْطَرَ ذَلِكَ الْيَوْمَ، فَقَالَ مَرْوَانُ ﷺ: أَقْسَمْتُ عَلَيْكَ يَا عَبْدَ الرَّحْمَنِ، لَتَذْهَبَنَّ إِلَى أُمَّيِ الْمُؤْمِنِينَ، عَائِشَةَ ﷺ، وَأُمِّ سَلَمَةَ ﷺ، فَلْتَسْأَلَنَّهُمَا عَنْ ذَلِكَ، فَذَهَبَ عَبْدُ الرَّحْمَنِ، وَذَهَبْتُ مَعَهُ، حَتَّى دَخَلْنَا عَلَى عَائِشَةَ ﷺ، فَسَلَّمَ عَلَيْهَا، ثُمَّ قَالَ: يَا أُمَّ الْمُؤْمِنِينَ، إِنَّا كُنَّا عِنْدَ مَرْوَانَ بْنِ الْحَكَمِ، فَذُكِرَ لَهُ أَنَّ أَبَا هُرَيْرَةَ ﷺ يَقُولُ: مَنْ أَصْبَحَ جُنُبًا أَفْطَرَ ذَلِكَ الْيَوْمَ، فَقَالَتْ عَائِشَةُ ﷺ: لَيْسَ كَمَا قَالَ أَبُو هُرَيْرَةَ ﷺ، يَا عَبْدَ الرَّحْمَنِ، أَتَرْغَبُ عَمَّا كَانَ رَسُولُ اللهِ ﷺ يَصْنَعُ؟ قَالَ عَبْدُ الرَّحْمَنِ: لاَ وَاللَّهِ، قَالَتْ عَائِشَةُ ﷺ: فَأَشْهَدُ عَلَى رَسُولِ اللهِ ﷺ، أَنَّهُ كَانَ يُصْبِحُ جُنُبًا مِنْ جِمَاعٍ، غَيْرِ احْتِلاَمٍ، ثُمَّ يَصُومُ ذَلِكَ الْيَوْمَ، قَالَ: ثُمَّ خَرَجْنَا، حَتَّى دَخَلْنَا عَلَى أُمِّ سَلَمَةَ، فَسَأَلَهَا عَنْ ذَلِكَ، فَقَالَتْ مِثْلَ مَا قَالَتْ عَائِشَةُ، قَالَ: فَخَرَجْنَا حَتَّى جِئْنَا مَرْوَانَ بْنَ الْحَكَمِ، فَذَكَرَ لَهُ عَبْدُ الرَّحْمَنِ مَا قَالَتَا، فَقَالَ مَرْوَانُ ﷺ: أَقْسَمْتُ عَلَيْكَ يَا أَبَا مُحَمَّدٍ، لَتَرْكَبَنَّ دَابَّتِي، فَإِنَّهَا بِالْبَابِ، فَلْتَذْهَبَنَّ إِلَى أَبِي هُرَيْرَةَ ﷺ، فَإِنَّهُ بِأَرْضِهِ بِالْعَقِيقِ، فَلْتُخْبِرَنَّهُ ذَلِكَ، فَرَكِبَ عَبْدُ الرَّحْمَنِ، وَرَكِبْتُ مَعَهُ، حَتَّى أَتَيْنَا أَبَا هُرَيْرَةَ ﷺ، فَتَحَدَّثَ مَعَهُ عَبْدُ الرَّحْمَنِ سَاعَةً، ثُمَّ ذَكَرَ لَهُ ذَلِكَ، فَقَالَ لَهُ أَبُو هُرَيْرَةَ ﷺ: لاَ عِلْمَ لِي بِذَاكَ، إِنَّمَا أَخْبَرَنِيهِ مُخْبِرٌ[1].

واتە: لە سومەیی خزمەتکاری ئەبو بەکری کوڕی عەبدوڕڕەحمانی کوڕی حاریسی کوڕی هیشامەوە ﷺ گێردراوەتەوە بەوەی گوێی لە ئەبو بەکری کوڕی عەبدوڕڕەحمانی کوڕی حاریسی کوڕی هیشام بووە دەیگوت: من و باوکم لەلای مەڕوانی کوڕی حەکەم ﷺ بووین، لە کاتێکدا کاربەدەستی مەدینە بوو، جا بۆی باس کرا بەوەی

الصيام: ٧٨؛ وأبو داود: ٢٣٨٨؛ وابن حبان: ٣٤٨٩؛ والقابسي: ٣٩٥، كلهم عن مالك به.

(١) ـ صحيح. أخرجه أبو مصعب الزهري: ٧٨٠؛ والحدثاني: ٤٥٨؛ والشيباني: ٣٥١؛ والشافعي: ٨٧١؛ والبخاري: ١٩٣١؛ والقابسي: ٤٣٧، كلهم عن مالك به.





ئەبو هورەیرە ﷺ دەیگوت: هەر کەسێك بەلەشگرانی بەیانی بکاتەوە ڕۆژووی ئەو ڕۆژە دەشکێنێ، مەڕوانیش ﷺ گوتی: سوێندت لەسەر دەخۆم ئەی عەبدوڕڕەحمان دەبێ بچیت بۆ لای دوو دایکەکەی بڕواداران کە عائیشە و ئوممو سەلەمەن ﷺ و دەبێ پرسیاریان لێ بکەیت دەربارەی ئەوە، جا عەبدوڕڕەحمان ڕۆیشت و منیش لەگەڵی ڕۆیشتم تا چووینە لای عائیشە ﷺ و سەلامی لێ کرد، دواتر گوتی: ئەی دایکی بڕواداران ئێمە لەلای مەڕوانی کوڕی حەکەم بووین و لای ئەو باس کرا کە ئەبو هورەیرە ﷺ دەڵێ: هەر کەسێك بەلەشگرانی بەیانی بکاتەوە ڕۆژووی ئەو ڕۆژە دەشکێنێ، عائیشەش ﷺ گوتی: ئاوا نییە وەك ئەبو هورەیرە ﷺ گوتوویەتی، ئەی عەبدوڕڕەحمان ئایا پشت دەکەیت لەوەی پێغەمبەری خوا ﷺ ئەنجامی داوە؟ عەبدوڕڕەحمانیش گوتی: نە واللە، عائیشەش ﷺ گوتی: دە کەواتە من شاهێدم لەسەر ئەوەی پێغەمبەری خوا ﷺ بەلەشگرانیی جیماع بەیانی کردۆتەوە، نەك بە ئیحتیلام (واتە نەك بەهۆی خەوبینین)، دواتریش لەو ڕۆژەدا بەڕۆژوو بووە، دەڵێ: دواتر دەرچووین، تاوەکوو چووین بۆ لای ئوممو سەلەمە ﷺ، پرسیاری لەویش کرد دەربارەی ئەوە، ئەویش هەمان ئەوەی گوت کە عائیشە ﷺ گوتی، دەڵێ: جا دەرچووین تا چووین بۆ لای مەڕوانی کوڕی حەکەم، جا عەبدوڕڕەحمان ئەوەی بۆ باس کرد کە عائیشە و ئوممو سەلەمە ﷺ گوتیان، جا مەڕوان گوتی: سوێندت لەسەر دەخۆم ئەی ئەبو موحەممەد دەبێ سواری وڵاغەکەم بیت کە لەلای دەرگاکەوەیە و دەبێ بچیت بۆ لای ئەبو هورەیرە ﷺ کە لە ناوچەی خۆیەتی لە عەقیق، دەبێ ئەو هەواڵەی بدەیتێ، جا عەبدوڕڕەحمان سواری وڵاغەکە بوو و منیش لەگەڵی سوار بووم، (ڕۆیشتین) تا چووین بۆ لای ئەبو هورەیرە ﷺ، جا عەبدوڕڕەحمان ماوەیەك قسەی لەگەڵ کرد، دواتر بۆی باس کرد، ئەبو هورەیرەش ﷺ گوتی: من زانیاریم لەسەر ئەوە نییە، تەنها ئەوە نەبێت کەسێك هەواڵی ئەوەی پێدام (ئینجا لە بۆچوونەکەی پاشگەز بۆیەوە).

**٧٩٦**- عَنْ عَائِشَةَ، وَأُمِّ سَلَمَةَ ﷺ، زَوْجَيِ النَّبِيِّ ﷺ، أَنَّهُمَا قَالَتَا: إِنْ كَانَ رَسُولُ اللهِ ﷺ لَيُصْبِحُ جُنُبًا مِنْ جِمَاعٍ، غَيْرِ احْتِلَامٍ، ثُمَّ يَصُومُ[١].

---

(١) ـ صحيح.




واتە: لە عائیشە و ئوممو سەلەمەی ﵄ خێزانی پێغەمبەر ﷺ گێردراوەتەوە گوتوویانە: پێغەمبەری خوا ﷺ بەهۆی جیماع لەشگران دەبوو، نەك بەهۆی خەوبینین، دواتر (بەلەشگرانی) بەڕۆژوو دەبوو.

## ٥- ئەوەی هاتووە دەربارەی مۆڵەتدان بە ماچکردن بۆ کەسی ڕۆژووەوان[1]

**٧٩٧-** عَنْ عَطَاءِ بْنِ يَسَارٍ ﵀، أَنَّ رَجُلاً قَبَّلَ امْرَأَتَهُ وَهُوَ صَائِمٌ فِي رَمَضَانَ، فَوَجَدَ مِنْ ذَلِكَ وَجْدًا شَدِيدًا، فَأَرْسَلَ امْرَأَتَهُ تَسْأَلُ لَهُ عَنْ ذَلِكَ، فَدَخَلَتْ عَلَى أُمِّ سَلَمَةَ ﵂، زَوْجِ النَّبِيِّ ﷺ، فَذَكَرَتْ ذَلِكَ لَهَا، فَأَخْبَرَتْهَا أُمُّ سَلَمَةَ، أَنَّ رَسُولَ اللهِ ﷺ يُقَبِّلُ وَهُوَ صَائِمٌ، فَرَجَعَتْ، فَأَخْبَرَتْ زَوْجَهَا بِذَلِكَ، فَزَادَهُ ذَلِكَ شَرًّا، وَقَالَ: لَسْنَا مِثْلَ رَسُولِ اللهِ ﷺ، اللهُ يُحِلُّ لِرَسُولِ اللهِ ﷺ مَا شَاءَ، ثُمَّ رَجَعَتِ امْرَأَتُهُ إِلَى أُمِّ سَلَمَةَ، فَوَجَدَتْ عِنْدَهَا رَسُولَ اللهِ ﷺ، فَقَالَ رَسُولُ اللهِ ﷺ: مَا لِهَذِهِ الْمَرْأَةِ؟ فَأَخْبَرَتْهُ أُمُّ سَلَمَةَ ﵂، فَقَالَ رَسُولُ اللهِ ﷺ: أَلاَ أَخْبَرْتِيهَا أَنِّي أَفْعَلُ ذَلِكَ، فَقَالَتْ: قَدْ أَخْبَرْتُهَا، فَذَهَبَتْ إِلَى زَوْجِهَا فَأَخْبَرَتْهُ، فَزَادَهُ ذَلِكَ شَرًّا، وَقَالَ: لَسْنَا مِثْلَ رَسُولِ اللهِ ﷺ، اللهُ يُحِلُّ لِرَسُولِهِ ﷺ مَا شَاءَ، فَغَضِبَ رَسُولُ اللهِ ﷺ وَقَالَ: وَاللَّهِ، إِنِّي لأَتْقَاكُمْ لِلَّهِ، وَأَعْلَمُكُمْ بِحُدُودِهِ[2].

واتە: لە عەتائی کوڕی یەسارەوە ﵀ گێردراوەتەوە (گوتوویەتی): پیاوێك خێزانەکەی ماچ کرد لە کاتێکدا بەڕۆژوو بوو لە ڕەمەزاندا، جا هەستی بە ترسێکی زۆر کرد (بەوەی تووشی تاوان بووبێت و ڕۆژووەکەی شکابێ)، بۆیە خێزانەکەی نارد تا پرسیاری ئەو باباتەی بۆ بکات، ئافرەتەکەش چوو بۆ لای ئوم سەلەمەی خێزانی پێغەمبەری خوا ﷺ و ئەوەی بۆ باس کرد، ئوم سەلەمەش ﵂ هەواڵی پێدا بەوەی پێغەمبەری خوا ﷺ ماچی کردووە لە کاتێکدا بەڕۆژووی بووە، جا ئافرەتەکە گەڕایەوە و هەواڵی ئەوەی دا بە مێردەکەی، جا مێردەکەی زیاتر کارەکەی خۆی

---

(١) ـ مَا جَاءَ فِي الرُّخْصَةِ فِي الْقُبْلَةِ لِلصَّائِمِ.

(٢) ـ صحيح. أخرجه أبو مصعب الزهري: ٧٨٢؛ والحدثاني: ٤٥٩؛ والشيباني: ٣٥٢؛ والشافعي: ١١٩٨، كلهم عن مالك به.

بە خەراپ زانی (قەناعەتی نەکرد بۆ خەڵك دروست بێت) و گوتی: ئێمە وەکوو پێغەمبەری خوا ﷺ نین، خوای پەروەردگار ﷻ چی بیەوێ بۆ پێغەمبەرەکەی ﷺ حەڵاڵی دەکات (ئەو وەکوو ئێمە نییە)، جا ئافرەتەکە گەڕایەوە بۆ لای ئوممو سەلەمە ﵂ و بینی پێغەمبەری خوا ﷺ لەلایەتی، پێغەمبەری خواش ﷺ فەرمووی: ئەو ئافرەتە چ کاری هەیە؟ ئوممو سەلەمەش ﵂ پێی ڕاگەیاند، پێغەمبەری خواش ﷺ فەرمووی: پێت ڕانەگەیاندووە کە من ئەنجامی دەدەم؟ ئەویش گوتی: پێم ڕاگەیاندووە و چووە بۆ لای مێردەکەی و هەواڵی پێداوە و زیاتر تووشی نەگبەتی بووە (قەناعەتی نەکردووە) و گوتوویەتی: ئێمە وەکوو پێغەمبەری خوا ﷺ نین، خوای پەروەردگار ﷻ چی بیەوێ بۆ پێغەمبەرەکەی ﷺ حەڵاڵی دەکات، جا پێغەمبەری خوا ﷺ توڕە بوو و فەرمووی: سوێند بەخوا ﷻ من لە گشتتان لە خواترسترم و زاناترینتان و شارەزاترینتانم بە سنوورەکانی.

**٧٩٨**- عَنْ عَائِشَةَ، أُمِّ الْمُؤْمِنِينَ ﵂، أَنَّهَا قَالَتْ: إِنْ كَانَ رَسُولُ اللهِ ﷺ لَيُقَبِّلُ بَعْضَ أَزْوَاجِهِ وَهُوَ صَائِمٌ، ثُمَّ ضَحِكَتْ[١].

واتە: لە عائیشەی دایکی بڕوادارانەوە ﵂ گێڕدراوەتەوە گوتوویەتی: پێغەمبەری خوا ﷺ یەکێك لە خێزانەکانی ماچ دەکرد لە کاتێکدا خۆی بەڕۆژوو بوو، دواتر عائیشە ـ ﵂ ـ پێکەنی (واتە بەپێکەنینەکەی دیار بوو ئەو خێزانەی ماچی کردووە ئەو بووە و خۆی خاوەنی بەسەرهاتەکەیە).

**٧٩٩**- عَنْ يَحْيَى بْنِ سَعِيدٍ ﵀، أَنَّ عَاتِكَةَ ابْنَةَ زَيْدِ بْنِ عَمْرِو بْنِ نُفَيْلٍ، امْرَأَةَ عُمَرَ بْنِ الْخَطَّابِ ﵁، كَانَتْ تُقَبِّلُ رَأْسَ عُمَرَ بْنِ الْخَطَّابِ ﵁ وَهُوَ صَائِمٌ، فَلاَ يَنْهَاهَا[٢].

واتە: لە یەحیای کوڕی سەعیدەوە ﵀ گێڕدراوەتەوە (گوتوویەتی): عاتیکەی کچی زەیدی کوڕی عەمری کوڕی نوفەیلی خێزانی عومەری کوڕی خەتتاب ﵁

---

(١) ـ صحيح. أخرجه أبو مصعب الزهري: ٧٨٢؛ والحدثاني: ٤٥٩؛ والشيباني: ٣٥٢؛ والشافعي: ١١٩٨، كلهم عن مالك به.

(٢) ـ ضعيف.

أخرجه أبو مصعب الزهري: ٧٨٤؛ والحدثاني: ٤٦٠أ، عن مالك به.




هەموو جار سەری عومەری کوڕی خەتتابی ماچ دەکرد لە کاتێکدا ئیمامی عومەر ﷺ بەڕۆژوو بوو و نەهیشی لێ نەدەکرد.

٨٠٠- عَنْ أَبِي النَّضْرِ، مَوْلَى عُمَرَ بْنِ عُبَيْدِ اللهِ ﷺ، أَنَّ عَائِشَةَ بِنْتَ طَلْحَةَ ﷺ أَخْبَرَتْهُ: أَنَّهَا كَانَتْ عِنْدَ عَائِشَةَ ﷺ، زَوْجِ النَّبِيِّ ﷺ، فَدَخَلَ عَلَيْهَا زَوْجُهَا هُنَالِكَ، وَهُوَ عَبْدُ اللهِ بْنُ عَبْدِ الرَّحْمَنِ بْنِ أَبِي بَكْرٍ الصِّدِّيقِ وَهُوَ صَائِمٌ، فَقَالَتْ لَهُ عَائِشَةُ: مَا يَمْنَعُكَ أَنْ تَدْنُوَ مِنْ أَهْلِكَ فَتُقَبِّلَهَا وَتُلاَعِبَهَا؟ فَقَالَ: أُقَبِّلُهَا وَأَنَا صَائِمٌ؟ قَالَتْ: نَعَمْ[1].

واتە: لە ئەبو نەزڕی خزمەتکاری عومەری کوڕی عوبەیدوڵاوە ﷺ گێڕدراوەتەوە (گوتوویەتی): عائیشەی کچی تەڵحە ﷺ پێی ڕاگەیاندووە و گوتوویەتی: (جارێکیان) لەلای عائیشەی ﷺ خێزانی پێغەمبەری خوا ﷺ بووم (لە کۆتایی فەرموودەکەدا دەردەکەوێ بۆ گلەییکردن لە پیاوەکەی چۆتە لای عائیشە ـ ﷺ ـ، بەوەی لە ڕەمەزاندا بە هیچ شێوەیەك لێی نزیك ناکەوێتەوە)، جا هاوسەرەکەم لەوێ هاتە ژوورەوە کە عەبدوڵڵای کوڕی عەبدوڕڕەحمانی کوڕی ئەبو بەکری صدیق بوو (کە دەکاتە برازای عائیشە و ئەو پوریەتی)، جا عائیشە ﷺ پێی گوت: چی ڕێگریت لێ دەکات لەوەی لە خێزانەکەت نزیك ببیتەوە و ماچی بکەیت و دەستگەمەی لەگەڵ بکەیت و خۆشەویستی کرداری بۆ دەربڕی؟ ئەویش گوتی: ماچی بکەم لە کاتێکدا بەڕۆژوو بم (مەگەر شتی وا دروستە)؟ عائیشە ـ ﷺ ـ گوتی: بەڵێ.

٨٠١- أَنَّ أَبَا هُرَيْرَةَ، وَسَعْدَ بْنَ أَبِي وَقَّاصٍ ﷺ كَانَا يُرَخِّصَانِ فِي الْقُبْلَةِ لِلصَّائِمِ[2].

واتە: ئەبو هورەیرەو سەعدی کوڕی ئەبو وەقاص ﷺ ڕێگەیان بە ماچ دەدا بۆ ڕۆژووەوان.

---

(١) ـ صحيح. أخرجه أبو مصعب الزهري: ٧٨٥؛ والحدثاني: ٤٦٠ب؛ والشيباني: ٣٥٣، كلهم عن مالك به.

(٢) ـ صحيح. أخرجه أبو مصعب الزهري: ٧٨٦؛ والحدثاني: ٤٦١، عن مالك به

## ٦- ئەوەی هاتووە دەربارەی توندکردن و ڕێگەنەدان بە ماچ بۆ ڕۆژووەوان[١]

٨٠٢- أَنَّ عَائِشَةَ ﵂، زَوْجَ النَّبِيِّ ﷺ، كَانَتْ إِذَا ذَكَرَتْ أَنَّ رَسُولَ اللهِ ﷺ يُقَبِّلُ وَهُوَ صَائِمٌ، تَقُولُ: وَأَيُّكُمْ أَمْلَكُ لِنَفْسِهِ مِنْ رَسُولِ اللهِ ﷺ[٢].

واتە: عائیشەی ﵂ خێزانی پێغەمبەر ﷺ کاتێ باسی ئەوەی بکردبا کە پێغەمبەری خوا ﷺ ماچی کردووە لە کاتێکدا بەڕۆژوو بووە، دەیگوت: (ئاگاداربن خۆتان قیاس مەکەن بە پێغەمبەری خوا ﷺ) کێتان جڵەوگیرتر و خۆڕاگرترە لە پێغەمبەری خوا ﷺ؟!

٨٠٣- قَالَ عُرْوَةُ بْنُ الزُّبَيْرِ ﵀: لَمْ أَرَ الْقُبْلَةَ لِلصَّائِمِ تَدْعُو إِلَى خَيْرٍ[٣].

واتە: عوڕوەی کوڕی زوبەیر ﵀ گوتوویەتی: پێم وا نییە ماچ بۆ کەسی ڕۆژووەوان هیچ چاکەیەکی بەدواوە بێت (چونکە بەزاندنی سنووری ڕۆژوو دوور نییە، ڕەنگە سەربکێشێت بۆ شکاندنی ڕۆژوو و تووشبوونی جیماع و ... هتد).

٨٠٤- عَنْ عَطَاءِ بْنِ يَسَارٍ ﵀، أَنَّ عَبْدَ اللهِ بْنَ عَبَّاسٍ ﵄ سُئِلَ عَنِ الْقُبْلَةِ لِلصَّائِمِ؟ فَأَرْخَصَ فِيهَا لِلشَّيْخِ، وَكَرِهَهَا لِلشَّابِّ[٤].

واتە: لە عەتائی کوڕی یەسارەوە ﵀ گێڕدراوەتەوە (گوتوویەتی): عەبدوڵڵای کوڕی عەبباس ﵄ پرسیاری لێ کرا دەربارەی ماچکردن بۆ کەسی ڕۆژووەوان؟ جا ڕێگەی دا بۆ کەسی بەتەمەن، وە بە ناپەسەند و خراپی دانا بۆ کەسی گەنج.

٨٠٥- عَنْ نَافِعٍ ﵀، أَنَّ عَبْدَ اللهِ بْنَ عُمَرَ ﵄ كَانَ يَنْهَى عَنِ الْقُبْلَةِ وَالْمُبَاشَرَةِ لِلصَّائِمِ[٥].

---

(١) ـ مَا جَاءَ فِي التَّشْدِيدِ فِي الْقُبْلَةِ لِلصَّائِمِ.

(٢) ـ صحيح. أخرجه أبو مصعب الزهري: ٧٨٧، عن مالك به.

(٣) ـ مقطوع صحيح. أخرجه أبو مصعب الزهري: ٧٨٨؛ والحدثاني: ٤٦١أ، عن مالك به.

(٤) ـ صحيح. أخرجه أبو مصعب الزهري: ٧٨٩؛ والحدثاني: ٤٦١ب؛ والشافعي: ٤٧٨، كلهم عن مالك به.

(٥) ـ صحيح. أخرجه أبو مصعب الزهري: ٧٩٠؛ والحدثاني: ٤٦١ج؛ والشيباني: ٣٥٤، كلهم عن مالك به.

واتە: لە نافیعەوە ﷺ گێڕدراوەتەوە (گوتوویەتی): عەبدوڵڵای کوڕی عومەر ﷺ نەهی دەکرد لە ماچ و دەستەگەمە بۆ کەسی ڕۆژووەوان.

## ٧- ئەوەی هاتووە دەربارەی ڕۆژوو لە سەفەردا[1]

٨٠٦- عَنْ عَبْدِ اللهِ بْنِ عَبَّاسٍ ﷺ، أَنَّ رَسُولَ اللهِ ﷺ خَرَجَ إِلَى مَكَّةَ عَامَ الْفَتْحِ فِي رَمَضَانَ، فَصَامَ حَتَّى بَلَغَ الْكَدِيدَ، ثُمَّ أَفْطَرَ، فَأَفْطَرَ النَّاسُ، وَكَانُوا يَأْخُذُونَ بِالأَحْدَثِ، فَالأَحْدَثِ، مِنْ أَمْرِ رَسُولِ اللهِ ﷺ[2].

واتە: لە عەبدوڵڵای کوڕی عەبباسەوە ﷺ گێڕدراوەتەوە (گوتوویەتی): پێغەمبەری خوا ﷺ لە ساڵی ئازادکردنی مەککە لە ڕەمەزاندا دەرچوو بۆ مەککە، جا بەڕۆژوو بوو تاوەکوو گەیشت بە کەدید (کە شوێنێکە لە نێوان مەککە و مەدینە) لەوێ ڕۆژووەکەی شکاند، خەڵکیش ڕۆژوویان شکاند، جا حوکم و بڕیاری نوێتر و نوێتریان وەردەگرت لە کاروباری پێغەمبەری خواوە ﷺ (واتە لێرەدا چونکە نوێترین کرداری پێغەمبەری خوا ﷺ شکاندنی ڕۆژوو بووە لە سەفەردا، نەك گرتنی، بۆیە نەگرتنیان پێ ڕەواترە لە سەفەردا).

٨٠٧- عَنْ أَبِي بَكْرِ بْنِ عَبْدِ الرَّحْمَنِ ﷺ عَنْ بَعْضِ أَصْحَابِ رَسُولِ اللهِ ﷺ، أَنَّ رَسُولَ اللهِ ﷺ أَمَرَ النَّاسَ فِي سَفَرِهِ عَامَ الْفَتْحِ بِالْفِطْرِ، وَقَالَ: تَقَوَّوْا لِعَدُوِّكُمْ، وَصَامَ رَسُولُ اللهِ ﷺ.

قَالَ أَبُو بَكْرٍ ﷺ: قَالَ الَّذِي حَدَّثَنِي: لَقَدْ رَأَيْتُ رَسُولَ اللهِ ﷺ بِالْعَرْجِ، يَصُبُّ الْمَاءَ عَلَى رَأْسِهِ مِنَ الْعَطَشِ أَوْ مِنَ الْحَرِّ، ثُمَّ قِيلَ لِرَسُولِ اللهِ ﷺ: يَا رَسُولَ اللهِ، إِنَّ طَائِفَةً مِنَ النَّاسِ قَدْ صَامُوا حِينَ صُمْتَ، قَالَ: فَلَمَّا كَانَ رَسُولُ اللهِ ﷺ بِالْكَدِيدِ، دَعَا بِقَدَحٍ، فَشَرِبَ، فَأَفْطَرَ النَّاسُ[3].

---

(١) ـ مَا جَاءَ فِي الصِّيَامِ فِي السَّفَرِ.

(٢) ـ صحيح. أخرجه أبو مصعب الزهري: ٧٩١؛ والحدثاني: ٤٦٢؛ والشيباني: ٣٦٠؛ والشافعي: ٧٦١؛ والبخاري: ١٩٤٤؛ وابن حبان: ٣٥٦٣؛ والدارمي: ١٧٠٨؛ وشرح معاني الآثار: ٣٢٢٢؛ والقابسي: ٥٠، كلهم عن مالك به.

(٣) ـ صحيح. أخرجه أبو مصعب الزهري: ٧٩٢؛ والحدثاني: ٤٦٢أ؛ والشافعي: ٧٦٤؛ وابن حنبل: ١٥٩٤٤، وفي: ٢٣٢٣٩، وفي: ٢٣٦٩٩؛ وأبو داود: ٢٣٦٥؛ وشرح معاني الآثار: ٣٢٣٢؛ ومصنف ابن أبي شيبة: ٩٢١٧؛ والقابسي: ٤٣٨، كلهم عن مالك به.

واتە: لە ئەبو بەکری کوڕی عەبدوڕڕەحمانەوە ﷺ گێڕدراوەتەوە، ئەویش لە یەکێك لە هاوەڵانی پێغەمبەری خوای ﷺ گێڕاوەتەوە (گوتوویەتی): پێغەمبەری خوا ﷺ لە سەفەرەکەی ساڵی ئازادکردنی مەککە فەرمانی ڕۆژووشکاندنی بە خەڵکی کرد و فەرمووی: (بە خواردن) خۆتان بەهێز بکەن بۆ (بەرەنگاربوونەوەی) دوژمنەکانتان، پێغەمبەری خواش ﷺ خۆی بەڕۆژوو بوو.

ئەبو بەکر ﷺ گوتوویەتی: ئەوەی بۆی گێڕامەوە گوتی: پێغەمبەری خوام ﷺ لە عەرج بینی (کە گوندێکە سێ مەڕحەلە لە مەدینەوە دوورە)، ئاوی دەڕشت بەسەر سەریدا بەهۆی تێنوێتی یان بەهۆی گەرما، دواتر بە پێغەمبەری خوا ﷺ گوترا: ئەی پێغەمبەری خوا ﷺ کۆمەڵێك لە خەڵکی بەڕۆژوو بوون کاتێ تۆ بەڕۆژوو بوویت (واتە کاتێ بینیان تۆ ڕۆژووت نەشکاند ئەوانیش نەیانشکاند)، دەڵێ: جا کاتێ پێغەمبەری خوا ﷺ گەیشتە کەدید (کە شوێنێکە حەوت مەڕحەڵە لە مەدینەوە دوورە)، داوای پەرداغە ئاوێکی کرد و خواردیەوە و خەڵکیش ڕۆژووەکەیان شکاند.

٨٠٨- عَنْ أَنَسِ بْنِ مَالِكٍ ﷺ؛ أَنَّهُ قَالَ: سَافَرْنَا مَعَ رَسُولِ اللهِ ﷺ فِي رَمَضَانَ، فَلَمْ يَعِبِ الصَّائِمُ عَلَى الْمُفْطِرِ، وَلاَ الْمُفْطِرُ عَلَى الصَّائِمِ[1].

واتە: لە ئەنەسی کوڕی مالیکەوە ﷺ گێڕدراوەتەوە گوتوویەتی: لەگەڵ پێغەمبەری خوادا ﷺ لە ڕەمەزاندا سەفەرمان کرد، جا ئەوەی بەڕۆژوو بوو ڕەخنەی لەوە نەگرت کە بەڕۆژوو نەبوو، وە ئەوەشی کە بەڕۆژوو نەبوو ڕەخنەی لەوە نەگرت کە بەڕۆژوو بوو (کەواتە هەردوو کۆمەڵە هەبوون، بابەتەکە فراوانی تێدایە).

٨٠٩- عَنْ هِشَامِ بْنِ عُرْوَةَ ﷺ، عَنْ أَبِيهِ ﷺ، أَنَّ حَمْزَةَ بْنَ عَمْرٍو الأَسْلَمِيَّ ﷺ قَالَ لِرَسُولِ اللهِ ﷺ: يَا رَسُولَ اللهِ، إِنِّي رَجُلٌ أَصُومُ، أَفَأَصُومُ فِي السَّفَرِ؟ فَقَالَ لَهُ رَسُولُ اللهِ ﷺ: إِنْ شِئْتَ فَصُمْ، وَإِنْ شِئْتَ فَأَفْطِرْ[2].

---

(١) ـ صحيح. أخرجه أبو مصعب الزهري: ٧٩٣؛ والحدثاني: ٤٦٢ج؛ والشافعي: ٤٨٢؛ والبخاري: ١٩٤٧؛ والقابسي: ١٤٧، كلهم عن مالك به.

(٢) ـ صحيح. أخرجه أبو مصعب الزهري: ٧٩٤؛ والحدثاني: ٤٦٣؛ والشافعي: ٤٨١؛ والبخاري: ١٩٤٣؛ والنسائي: ٢٣٠٦؛ والقابسي: ٤٦٥، كلهم عن مالك به.

واتە: لە هیشامی كوڕی عوڕوەوە ﷺ گێڕدراوەتەوە، ئەویش لە باوكیەوە ﷺ گێڕاویەتەوە (گوتوویەتی): حەمزەی كوڕی عەمری ئەسلەمی ﷺ بە پێغەمبەری خوای ﷺ گوت: ئەی پێغەمبەری خوا ﷺ من پیاوێكم زۆر بەڕۆژوو دەبم، جا ئایا لە سەفەریشدا بەڕۆژوو ببم؟ پێغەمبەری خواش ﷺ پێی فەرموو: ئەگەر ویستت (بەڕۆژوو بی) ئەوە بەڕۆژوو بە، وە ئەگەر ویستیشت (بەڕۆژوو نەبی) ئەوە بەڕۆژوو مەبە.

٨١٠- عَنْ نَافِعٍ ﷺ، أَنَّ عَبْدَ اللهِ بْنَ عُمَرَ ﷺ كَانَ لاَ يَصُومُ فِي السَّفَرِ[١].

واتە: لە نافیعەوە ﷺ گێڕدراوەتەوە (گوتوویەتی): عەبدوڵڵای كوڕی عومەر ﷺ لە سەفەردا بەڕۆژوو نەدەبوو.

٨١١- عَنْ هِشَامِ بْنِ عُرْوَةَ ﷺ، عَنْ أَبِيهِ ﷺ، أَنَّهُ كَانَ يُسَافِرُ فِي رَمَضَانَ، وَنُسَافِرُ مَعَهُ، فَيَصُومُ عُرْوَةُ ﷺ، وَنُفْطِرُ نَحْنُ، فَلاَ يَأْمُرُنَا بِالصِّيَامِ[٢].

واتە: لە هیشامی كوڕی عوڕوەوە ﷺ گێڕدراوەتەوە، ئەویش لە باوكیەوە ﷺ گێڕاویەتەوە بەوەی لە ڕەمەزاندا سەفەری كردووە، ئێمەش لەگەڵی بووین سەفەرمان كرد، جا عوڕوە ﷺ بەڕۆژوو بوو و ئێمە بەڕۆژوو نەبووین، كەچی عوڕوە ﷺ فەرمانی پێ نەكردین بەوەی (وەكوو ئەو) بەڕۆژوو بین.

## ٨- ئەو كەسەی لە ڕەمەزاندا لە سەفەر دەگەڕێتەوە یان دەیەوێ بچێ بۆ سەفەر (ئایا چی دەكات)؟[٣]

٨١٢- عَنْ مَالِكٍ ﷺ؛ أَنَّهُ بَلَغَهُ، أَنَّ عُمَرَ بْنَ الْخَطَّابِ ﷺ كَانَ إِذَا كَانَ فِي سَفَرٍ فِي رَمَضَانَ، فَعَلِمَ أَنَّهُ دَاخِلٌ الْمَدِينَةَ مِنْ أَوَّلِ يَوْمِهِ، دَخَلَ وَهُوَ صَائِمٌ[٤].

---

(١) ـ صحيح. أخرجه أبو مصعب الزهري: ٧٩٥؛ والشيباني: ٣٥٩، عن مالك به.

(٢) ـ مقطوع صحيح. أخرجه أبو مصعب الزهري: ٧٩٦؛ والحدثاني: ٤٦٣أ، عن مالك به.

(٣) ـ مَا يَفْعَلُ مَنْ قَدِمَ مِنْ سَفَرٍ أَوْ أَرَادَهُ فِي رَمَضَانَ.

(٤) ـ ضعيف. أخرجه أبو مصعب الزهري: ٧٩٩؛ والحدثاني: ٤٦٣ج، عن مالك به.

واتە: لە ئیمامی مالیکەوە ﷺ گێڕدراوەتەوە پێی گەیشتووە عومەری کوڕی خەتتاب ﷺ هەموو جار ئەگەر لە سەفەرێکدا بووایە لە ڕەمەزان، جا بیزانیایە لە سەرەتای ڕۆژەوە دەگاتەوە مەدینە، ئەوە (لە سەفەرەکەدا نییەتی ڕۆژووی دەهێنا) جا دەچووە ناو مەدینە لە کاتێکدا بەڕۆژوو بوو.

٨١٣- **[فتوى]** قَالَ يَحْيَى ﷺ: قَالَ مَالِكٌ ﷺ: مَنْ كَانَ فِي سَفَرٍ، فَعَلِمَ أَنَّهُ دَاخِلٌ عَلَى أَهْلِهِ مِنْ أَوَّلِ يَوْمِهِ، وَطَلَعَ لَهُ الْفَجْرُ قَبْلَ أَنْ يَدْخُلَ، دَخَلَ وَهُوَ صَائِمٌ[1].

قَالَ مَالِكٌ ﷺ: وَإِذَا أَرَادَ أَنْ يَخْرُجَ فِي رَمَضَانَ، فَطَلَعَ لَهُ الْفَجْرُ وَهُوَ بِأَرْضِهِ، قَبْلَ أَنْ يَخْرُجَ، فَإِنَّهُ يَصُومُ ذَلِكَ الْيَوْمَ[2].

(فەتوا): واتە: یەحیا ﷺ گوتوویەتی: ئیمامی مالیك ﷺ گوتوویەتی: هەر کەسێك لە سەفەرێکدا بوو و دەیزانی لە سەرەتای ڕۆژەوە دەگاتەوە ناو ماڵ و منداڵی، «بەیان»یش هەڵدێت بەر لەوەی بگاتەوە جێ، ئەوە دەبێ کە دەگاتەوە جێ بەڕۆژوو بێ، (واتە دەبێ لە سەفەرەکەیدا نییەتی ڕۆژوو بێنێت و بەڕۆژوو بێ، نابێت بڵێت لە سەفەرم، چونکە سەفەرەکەی زۆر لاواز بووە بە هۆی نزیککەوتنەوە لە ماڵەوە).

ئیمامی مالیك ﷺ گوتوویەتی: هەروەها کاتێ ویستی لە ڕەمەزاندا دەربچێ بۆ سەفەرێك و دەیزانی بەیان هەڵدێ لە کاتێکدا ئەو هێشتا لە ناوچەکەی خۆیەتی پێش ئەوەی دەربچێ، ئەوە ئەو ڕۆژە بەڕۆژوو دەبێ (چونکە ڕۆژووەکەی لەسەر واجب دەبێ و حوکمی موسافیری بەسەردا جێبەجێ نابێ).

٨١٤- **[فتوى]** قَالَ مَالِكٌ ﷺ: فِي الرَّجُلِ يَقْدَمُ مِنْ سَفَرِهِ وَهُوَ مُفْطِرٌ، وَامْرَأَتُهُ مُفْطِرَةٌ، حِينَ طَهُرَتْ مِنْ حَيْضَتِهَا فِي رَمَضَانَ: أَنَّ لِزَوْجِهَا أَنْ يُصِيبَهَا إِنْ شَاءَ[3].

(فەتوا): واتە: ئیمامی مالیك ﷺ دەربارەی ئەو کەسەی لە سەفەر دەگەڕێتەوە لە کاتێکدا بەڕۆژوو نییە، خێزانەکەشی بەڕۆژوو نییە، کاتێ (دوای هەڵاتنی بەیان

---

(١) - أخرجه أبو مصعب الزهري: ٨٠٠، عن مالك به.

(٢) - أخرجه أبو مصعب الزهري: ٨٠٠، عن مالك.

(٣) - أخرجه أبو مصعب الزهري: ٨٠١، عن مالك به.

بەولاوە) لە سوڕی مانگانەکەی پاك بۆتەوە (تازە ڕۆژووی ئەو ڕۆژەی لەسەر نییە)، لە ڕەمەزاندا، ئیمامی مالیك ﷺ گوتوویەتی: پیاوەکەی ئەگەر ویستی بۆی هەیە لەگەڵی جووت بێت.

### ٩- کەفارەتی ئەو کەسەی لە ڕەمەزاندا ڕۆژوو دەشکێنێ[١]

**٨١٥-** عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ ﷺ، أَنَّ رَجُلاً أَفْطَرَ فِي رَمَضَانَ، فَأَمَرَهُ رَسُولُ اللهِ ﷺ أَنْ يُكَفِّرَ بِعِتْقِ رَقَبَةٍ، أَوْ صِيَامِ شَهْرَيْنِ مُتَتَابِعَيْنِ، أَوْ إِطْعَامِ سِتِّينَ مِسْكِينًا، فَقَالَ: لاَ أَجِدُ، فَأُتِيَ رَسُولُ اللهِ ﷺ بِعَرَقِ تَمْرٍ، فَقَالَ: خُذْ هَذَا فَتَصَدَّقْ بِهِ، فَقَالَ: يَا رَسُولَ اللهِ، مَا أَجِدُ أَحَدًا أَحْوَجَ إِلَيْهِ مِنِّي، فَضَحِكَ رَسُولُ اللهِ ﷺ، حَتَّى بَدَتْ أَنْيَابُهُ، ثُمَّ قَالَ: كُلْهُ[٢].

واتە: لە ئەبو هورەیرەوە ﷺ گێڕدراوەتەوە (گوتوویەتی): پیاوێك لە ڕەمەزاندا (بەجیماع) ڕۆژووی شکاند، پێغەمبەری خواش ﷺ فەرمانی پێکرد بە ئازادکردنی کۆیلەیەك یان بەڕۆژووبوونی دوو مانگ بەسەر یەکەوە یان ناندان بە شەست هەژار، کابراش گوتی: نیمە، جا سەبەتەیەك لە خورما هێنرا بۆ لای پێغەمبەری خوا ﷺ، پێغەمبەری خواش ﷺ فەرمووی: ئەوە ببە و ببەخشە، ئەویش گوتی: ئەی پێغەمبەری خوا ﷺ کەسم دەستناکەوێ لە من زیاتر پێویستی پێی بێ، پێغەمبەری خواش ﷺ پێکەنی تاوەکوو ددانەکانی دەرکەوتن، دواتر فەرمووی: خۆت بیخۆ (واتە ببیە بۆ خانەوادەکەت و خۆتان بیخۆن).

**٨١٦-** عَنْ سَعِيدِ بْنِ الْمُسَيَّبِ ﷺ، أَنَّهُ قَالَ: جَاءَ أَعْرَابِيٌّ إِلَى رَسُولِ اللهِ ﷺ يَضْرِبُ نَحْرَهُ، وَيَنْتِفُ شَعْرَهُ، وَيَقُولُ: هَلَكَ الأَبْعَدُ، فَقَالَ لَهُ رَسُولُ اللهِ ﷺ: وَمَا ذَاكَ؟ فَقَالَ: أَصَبْتُ أَهْلِي، وَأَنَا صَائِمٌ فِي رَمَضَانَ، فَقَالَ لَهُ رَسُولُ اللهِ ﷺ: هَلْ تَسْتَطِيعُ أَنْ تُعْتِقَ رَقَبَةً؟ فَقَالَ: لاَ، فَقَالَ:

---

(١) ـ كَفَّارَةُ مَنْ أَفْطَرَ فِي رَمَضَانَ.

(٢) ـ صحيح. أخرجه أبو مصعب الزهري: ٨٠٢؛ والحدثاني: ٤٦٤؛ والشيباني: ٣٤٩؛ والشافعي: ٤٧٩؛ وابن حنبل: ١٠٦٩٨؛ ومسلم: الصيام: ٨٣؛ وأبو داود: ٢٣٩٢؛ وابن حبان: ٣٥٢٣؛ والدارمي: ١٧١٧؛ وشرح معاني الآثار: ٣١٩٧؛ والقابسي: ٣٠، كلهم عن مالك به.

فَهَلْ تَسْتَطِيعُ أَنْ تُهْدِيَ بَدَنَةً، قَالَ: لاَ، قَالَ: فَاجْلِسْ، فَأُتِيَ رَسُولُ اللهِ ﷺ بِعَرَقِ تَمْرٍ، فَقَالَ: خُذْ هَذَا فَتَصَدَّقْ بِهِ، فَقَالَ: مَا أَحَدٌ أَحْوَجَ مِنِّي، فَقَالَ: كُلْهُ، وَصُمْ يَوْمًا مَكَانَ مَا أَصَبْتَ[1].

قَالَ مَالِكٌ رحمه الله: قَالَ عَطَاءٌ رحمه الله: فَسَأَلْتُ سَعِيدَ بْنَ الْمُسَيَّبِ رحمه الله: كَمْ فِي ذَلِكَ الْعَرَقِ مِنَ التَّمْرِ؟ فَقَالَ: مَا بَيْنَ خَمْسَةَ عَشَرَ صَاعًا إِلَى عِشْرِينَ.

واتە: لە سەعیدی کوڕی موسەیەبەوە رحمه الله گێردراوەتەوە گوتوویەتی: پیاوێکی دەشتەکی هات بۆ لای پێغەمبەری خوا ﷺ لە گەردەنی خۆی دەدا و قژی خۆی دەردەهێنا و دەیگوت: ئەو کەسەی (لە لێخۆشبوون) دوورترینە لەناو چوو (مەبەستی خۆی بوو)، پێغەمبەری خواش ﷺ پێی فەرموو: چیە (لەبەر چی لەناو چووی)؟ ئەویش گوتی: تووشی جیماع بووم لەگەڵ خێزانم لە کاتێکدا من بەڕۆژوو بووم لە ڕەمەزاندا، پێغەمبەری خواش ﷺ پێی فەرموو: ئایا دەتوانیت کۆیلەیەك ئازاد بکەیت (ئایا پارەی کڕینی کۆیلەت هەیە)؟ ئەویش گوتی: نەخێر، پێغەمبەری خواش ﷺ فەرمووی: کەواتە ئایا دەتوانی وشترێك بکەیتە خێر؟ گوتی: نەخێر، فەرمووی: کەواتە دانیشە، جا سەبەتە خورمایێك هێنرا بۆ لای پێغەمبەری خوا ﷺ، پێغەمبەری خواش ﷺ فەرمووی: ئەوە ببە و ببیبەخشە، کابراش گوتی: هیچ کەسێك لە من پێویستتر و موحتاجتر نییە، پێغەمبەری خواش ﷺ فەرمووی: (کەواتە خۆت) بیخۆ، ڕۆژێکیش بەڕۆژوو بە لە شوێنی ئەو ڕۆژووەی شکاندووتە.

ئیمامی مالیك رحمه الله گوتوویەتی: عەتا رحمه الله گوتوویەتی: جا پرسیارم لە سەعیدی کوڕی موسەیەب رحمه الله کرد (گوتم): سەبەتەکە چەند خورمای تیا بوو؟ ئەویش گوتی: لە نێوان پازدە بۆ بیست صاع.

٨١٧- **[فتوى]** قَالَ مَالِكٌ رحمه الله: سَمِعْتُ أَهْلَ الْعِلْمِ يَقُولُونَ: لَيْسَ عَلَى مَنْ أَفْطَرَ يَوْمًا مِنْ قَضَاءِ رَمَضَانَ بِإِصَابَةِ أَهْلِهِ نَهَارًا أَوْ غَيْرِ ذَلِكَ، الْكَفَّارَةُ الَّتِي تُذْكَرُ عَنْ رَسُولِ اللهِ ﷺ فِيمَنْ أَصَابَ أَهْلَهُ نَهَارًا فِي رَمَضَانَ، وَإِنَّمَا عَلَيْهِ قَضَاءُ ذَلِكَ الْيَوْمِ.

---

(١) ـ ضعيف. أخرجه أبو مصعب الزهري: ٨٠٣؛ والحدثاني: ٤٦٥؛ وفي: ٤٦٥أ؛ والشافعي: ٤٨٠، كلهم عن مالك به.




قَالَ مَالِكٌ ﷺ: وَهَذَا أَحَبُّ مَا سَمِعْتُ إِلَيَّ فِيهِ[١].

(فەتوا): واتە: ئیمامی مالیك ﷺ گوتوویەتی: گوێم لە زانایان بووە دەیانگوت: ئەو کەسەی ڕۆژووێکی قەزاکردنەوەی ڕەمەزان بە جیماعکردن لەگەڵ خێزانەکەی یان بە هەر شتێکی دیکە دەشکێنێ، ئەو کەفارەتەی لەسەر نییە کە لە پێغەمبەری خواوە ﷺ باسکراوە دەربارەی ئەو کەسەی بەڕۆژ لە ڕەمەزاندا جیماع لەگەڵ ئافرەتەکەی دەکات، بەڵکوو تەنها قەزاکردنەوەی ڕۆژەکەی لەسەرە (واتە قەزاکردنەوەی ڕەمەزان حوکمی ڕەمەزان وەرناگرێ).

ئیمامی مالیك ﷺ گوتوویەتی: ئەوە خۆشەویستترینی ئەوەیە کە گوێبیستی بووم لەو بابەتەدا.

## ١٠- ئەوەی هاتووە دەربارەی کەڵەشاخکردنی ڕۆژووەوان[٢]

٨١٨- عَنْ عَبْدِ اللهِ بْنِ عُمَرَ ﷺ؛ أَنَّهُ كَانَ يَحْتَجِمُ وَهُوَ صَائِمٌ، قَالَ: ثُمَّ تَرَكَ ذَلِكَ بَعْدُ، فَكَانَ إِذَا صَامَ لَمْ يَحْتَجِمْ حَتَّى يُفْطِرَ[٣].

واتە: لە عەبدوڵلای کوڕی عومەرەوە ﷺ گێردراوەتەوە بەوەی کەڵەشاخی کردووە لە کاتێکدا بە ڕۆژوو بووە، (نافیع ﷺ) دەڵێ: دواتر وازی لەوە هێنا، کاتێ بەڕۆژوو بووایە کەڵەشاخی نەدەکرد تاوەکوو فتاری دەکردەوە یان تا ئەو ڕۆژەی بێڕۆژوو دەبوو (ئینجا ئەنجامی دەدا).

٨١٩- أَنَّ سَعْدَ بْنَ أَبِي وَقَّاصٍ، وَعَبْدَ اللهِ بْنَ عُمَرَ ﷺ كَانَا يَحْتَجِمَانِ وَهُمَا صَائِمَانِ[٤].

---

(١) - أخرجه أبو مصعب الزهري: ٨٠٦؛ والحدثاني: ٤٦٦ب، عن مالك به.

(٢) ـ مَا جَاءَ فِي حِجَامَةِ الصَّائِمِ.

(٣) ـ صحيح. أخرجه أبو مصعب الزهري: ٨٣٨؛ والحدثاني: ٤٧٤؛ والشيباني: ٣٥٥؛ والشافعي: ٤٧٣، كلهم عن مالك به.

(٤) ـ ضعيف. أخرجه أبو مصعب الزهري: ٨٣٩؛ والحدثاني: ٤٧٤أ؛ والشيباني: ٣٥٦؛ والشافعي: ١٠٣٦، كلهم عن مالك به.




واته: سەعدی کوڕی ئەبی وەقاص و عەبدوڵلای کوڕی عومەر ﷺ کەڵەشاخیان دەکرد لە کاتێکدا بەڕۆژوو بوون.

٨٢٠- عَنْ هِشَامِ بْنِ عُرْوَةَ ﷺ، عَنْ أَبِيهِ ﷺ، أَنَّهُ كَانَ يَحْتَجِمُ وَهُوَ صَائِمٌ، ثُمَّ لاَ يُفْطِرُ، قَالَ: وَمَا رَأَيْتُهُ احْتَجَمَ قَطُّ إِلاَّ وَهُوَ صَائِمٌ[١].

واته: لە هیشامی کوڕی عوڕوەوە ﷺ گێڕدراوەتەوە، ئەویش لە باوکیەوە ﷺ گێڕاویەتەوە کە کەڵەشاخی کردووە (حیجامەی کردووە) لە کاتێکدا بەڕۆژوو بووە، دواتریش ڕۆژووی نەشکاندووە (واتە نەیگوتووە بە هۆی حیجامەکەم ڕۆژووم بەتاڵ بۆتەوە)، هیشام ﷺ دەڵێ: هەرگیز نەمبینیوە کەڵەشاخ بکات حەتمەن بەڕۆژوو بووە.

٨٢١- [فتوى] قَالَ مَالِكٌ ﷺ: لاَ تُكْرَهُ الْحِجَامَةُ لِلصَّائِمِ إِلاَّ خَشْيَةً مِنْ أَنْ يَضْعُفَ، وَلَوْلاَ ذَلِكَ لَمْ تُكْرَهْ، وَلَوْ أَنَّ رَجُلاً احْتَجَمَ فِي رَمَضَانَ، ثُمَّ سَلِمَ مِنْ أَنْ يُفْطِرَ، لَمْ أَرَ عَلَيْهِ شَيْئًا، وَلَمْ آمُرْهُ بِالْقَضَاءِ لِذَلِكَ الْيَوْمِ الَّذِي احْتَجَمَ فِيهِ، لأَنَّ الْحِجَامَةَ إِنَّمَا تُكْرَهُ لِلصَّائِمِ لِمَوْضِعِ التَّغْرِيرِ بِالصِّيَامِ، فَمَنِ احْتَجَمَ وَسَلِمَ مِنْ أَنْ يُفْطِرَ حَتَّى يُمْسِيَ، فَلاَ أَرَى عَلَيْهِ شَيْئًا، وَلَيْسَ عَلَيْهِ قَضَاءُ ذَلِكَ الْيَوْمِ[٢].

(فەتوا): واته: ئیمامی مالیك ﷺ گوتوویەتی: کەڵەشاخکردن ناپەسەند نییە بۆ کەسی ڕۆژووەوان تەنها لەو کاتەدا نەبێت کە ترسی بێتاقەتی هەبێ، جا ئەگەر لەبەر ئەوە نەبێت ناپەسەند نەدەبوو، وە ئەگەر پیاوێك کەڵەشاخ بکات لە ڕەمەزاندا، دواتر سەلامەت بێت لە ڕۆژووشکاندن، ئەوە پێم وا نییە هیچی لەسەر بێ، وە فەرمانی پێ ناکەم بە گێڕانەوەی ئەو ڕۆژووەی کەڵەشاخی تێدا کردووە، چونکە کەڵەشاخکردن کە ناپەسەندە تەنها لەبەر زەرەرگەیاندن و لەناوچوونی ڕۆژووەکەیە، جا هەر کەسێك کەڵەشاخی کرد و سەلامەت بوو لە ڕۆژووشکاندن تاوەکوو ئێوارە، ئەوە پێم وا نییە هیچی لەسەر بێت و قەزاکردنەوەی ئەو ڕۆژەی لەسەر نییە.

---

(١) ـ مقطوع صحيح. أخرجه أبو مصعب الزهري: ٨٤٠؛ والحدثاني: ٤٧٤ب، عن مالك به.

(٢) - أخرجه أبو مصعب الزهري: ٨٤١؛ والحدثاني: ٤٧٤ج، عن مالك به.

## ١١- ڕۆژووگرتنی ڕۆژی عاشوڕا[١]

**٨٢٢-** عَنْ عَائِشَةَ ﵂، زَوْجِ النَّبِيِّ ﷺ أَنَّهَا قَالَتْ: كَانَ يَوْمُ عَاشُورَاءَ يَوْمًا تَصُومُهُ قُرَيْشٌ فِي الْجَاهِلِيَّةِ، وَكَانَ رَسُولُ اللهِ ﷺ يَصُومُهُ فِي الْجَاهِلِيَّةِ، فَلَمَّا قَدِمَ رَسُولُ اللهِ ﷺ الْمَدِينَةَ صَامَهُ، وَأَمَرَ بِصِيَامِهِ، فَلَمَّا فُرِضَ رَمَضَانُ، كَانَ هُوَ الْفَرِيضَةَ، وَتُرِكَ يَوْمُ عَاشُورَاءَ، فَمَنْ شَاءَ صَامَهُ، وَمَنْ شَاءَ تَرَكَهُ[٢].

واتە: لە عائیشەی خێزانی پێغەمبەرەوە ﷺ گێڕدراوەتەوە گوتوویەتی: ڕۆژی عاشوڕا ڕۆژێك بوو خەڵكی لە سەردەمی پێش ئیسلام تیایدا بەڕۆژوو دەبوون، وە پێغەمبەری خواش ﷺ تیایدا بەڕۆژوو دەبوو لە سەردەمی پێش ئیسلام، جا كاتێ پێغەمبەری خوا ﷺ هات بۆ مەدینە بەڕۆژوو دەبوو و فەرمانیشی بە ڕۆژووگرتنی كرد (بە فەرمانێكی واجب)، جا كاتێ ڕۆژووی ڕەمەزان واجب كرا، هەر ئەو بوو بە واجب و ڕۆژووی ڕۆژی عاشوڕا واجبییەكەی واز لێ هێنرا (بوو بە سوننەت)، جا هەر كەسێك ویستی ڕۆژووگرتنی هەبووایە بەڕۆژوو دەبوو، وە هەر كەسێكیش ویستی نەگرتنی هەبووایە نەیدەگرت.

**٨٢٣-** عَنْ حُمَيْدِ بْنِ عَبْدِ الرَّحْمَنِ بْنِ عَوْفٍ ﵁، أَنَّهُ سَمِعَ مُعَاوِيَةَ بْنَ أَبِي سُفْيَانَ ﵄ يَوْمَ عَاشُورَاءَ عَامَ حَجَّ، وَهُوَ عَلَى الْمِنْبَرِ يَقُولُ: يَا أَهْلَ الْمَدِينَةِ، أَيْنَ عُلَمَاؤُكُمْ؟ سَمِعْتُ رَسُولَ اللهِ ﷺ يَقُولُ لِهَذَا الْيَوْمِ: هَذَا يَوْمُ عَاشُورَاءَ، وَلَمْ يَكْتُبِ اللهُ عَلَيْكُمْ صِيَامَهُ، وَأَنَا صَائِمٌ، فَمَنْ شَاءَ فَلْيَصُمْ، وَمَنْ شَاءَ فَلْيُفْطِرْ[٣].

واتە: لە حومەیدی كوڕی عەبدوڕڕەحمانی كوڕی عەوفەوە ﵁ گێڕدراوەتەوە بەوەی گوێی لە موعاویەی كوڕی ئەبو سوفیان ﵄ بووە لە ڕۆژی عاشوڕا لەو ساڵەی حەجی تێدا كرد، لە كاتێكدا لەسەر مینبەر بوو دەیگوت: ئەی خەڵكی

---

(١) ـ صِيَامُ يَوْمِ عَاشُورَاءَ.

(٢) ـ صحيح. أخرجه أبو مصعب الزهري: ٨٤٢؛ والحدثاني: ٤٧٥؛ والشافعي: ٧٨٤؛ والبخاري: ٢٠٠٢؛ وأبو داود: ٢٤٤٢؛ وابن حبان: ٣٦٢١؛ والقابسي: ٤٦٦، كلهم عن مالك به.

(٣) ـ صحيح. أخرجه أبو مصعب الزهري: ٨٤٣؛ والحدثاني: ٤٧٥أ؛ والشيباني: ٣٧٤؛ والشافعي: ٧٨٦؛ والبخاري: ٢٠٠٣؛ وشرح معاني الآثار: ٣٢٩٨؛ والقابسي: ٢٧، كلهم عن مالك به.




مەدینە، زاناکانتان لەکوێن؟ گوێم لە پێغەمبەری خوا ﷺ بوو دەربارەی ئەو ڕۆژە دەیفەرموو: ئەوە ڕۆژی عاشوڕایە، خوای پەروەردگار ﷻ ڕۆژووی ئەو ڕۆژەی لەسەر واجب نەکردوون، منیش بەڕۆژووم (ڕۆژووەکە سونەتە)، جا هەر کەسێك ویستی بەڕۆژوو بێت با بەڕۆژوو بێ، وە هەر کەسێك ویستی بەڕۆژوو نەبێت با بەڕۆژوو نەبێت.

**٨٢٤-** أَنَّ عُمَرَ بْنَ الْخَطَّابِ ﷺ أَرْسَلَ إِلَى الْحَارِثِ بْنِ هِشَامٍ ﷺ: أَنَّ غَدًا يَوْمُ عَاشُورَاءَ، فَصُمْ، وَأْمُرْ أَهْلَكَ أَنْ يَصُومُوا[١].

واتە: عومەری کوڕی خەتتاب ﷺ (کەسێکی) نارد بۆ لای حاریسی کوڕی هیشام ﷺ (تا پێی بڵێت): بەیانی ڕۆژی عاشوڕایە، جا بەڕۆژوو بە و فەرمان بە خانەوادەکەشت بکە بەڕۆژوو بن.

## ١٢- ڕۆژووی ڕۆژی جەژنی ڕەمەزان و قوربان و ڕۆژووی سەرتاسەری ساڵ[٢]

**٨٢٥-** عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ ﷺ، أَنَّ رَسُولَ اللهِ ﷺ نَهَى عَنْ صِيَامِ يَوْمَيْنِ: يَوْمِ الْفِطْرِ، وَيَوْمِ الأَضْحَى[٣].

واتە: لە ئەبو هورەیرەوە ﷺ گێڕدراوەتەوە (گوتوویەتی): پێغەمبەری خوا ﷺ نەهی کردووە لە بەڕۆژووبونی دوو ڕۆژ (واتە حەڕامی کردووە، کە بریتییە لە): ڕۆژی جەژنی ڕەمەزان و ڕۆژی جەژنی قوربان.

**٨٢٦-** (بلاغ) عَنْ مَالِكٍ ﷺ؛ أَنَّهُ سَمِعَ أَهْلَ الْعِلْمِ يَقُولُونَ: لاَ بَأْسَ بِصِيَامِ الدَّهْرِ إِذَا أَفْطَرَ الأَيَّامَ الَّتِي نَهَى رَسُولُ اللهِ ﷺ عَنْ صِيَامِهَا، وَهِيَ أَيَّامُ مِنًى، وَيَوْمُ الأَضْحَى، وَيَوْمُ الْفِطْرِ فِيمَا بَلَغَنَا.

---

(١) ـ ضعيف. أخرجه أبو مصعب الزهري: ٨٤٤؛ والحدثاني: ٤٧٥ب، عن مالك به.

(٢) ـ صِيَامُ يَوْمِ الْفِطْرِ وَالأَضْحَى وَالدَّهْرِ.

(٣) ـ صحيح. أخرجه أبو مصعب الزهري: ٨٤٤؛ والحدثاني: ٤٧٥ب، عن مالك به.

قَالَ: وَذَلِكَ أَحَبُّ مَا سَمِعْتُ إِلَيَّ فِي ذَلِكَ[١].

(بەلاغ): واتە: لە ئیمامی مالیکەوە ﷺ گێڕدراوەتەوە بەوەی گوێی لە زانایان بووە دەیانگوت: بەڕۆژووبوونی سەرتاسەری ساڵ کێشەی تیا نییە ئەگەر ئەو چەند ڕۆژانە بەڕۆژوو نەبێت کە پێغەمبەری خوا ﷺ بەڕۆژووبوونی تیادا حەڕام کردوون، کە بریتین لە ڕۆژەکانی مینا (واتە سێ ڕۆژەکانی تەشریق، بە عادەتی کوردەواری دەکاتە ڕۆژی دووەم و سێیەم و چوارەمی جەژنی قوربان)، هەروەها ڕۆژی جەژنی قوربان و ڕۆژی جەژنی ڕەمەزان، بەپێی ئەوەی پێیان گەیشتووە (واتە تەنها ئەو پێنج ڕۆژە بەڕۆژوو نەبێت ناکاتە ڕۆژووی سەرتاسەری ساڵ کە حەڕام کراوە).

ئیمامی مالیك ﷺ گوتوویەتی: ئەوە لەلام خۆشەویستترینی ئەوەیە کە گوێم لێ بووە دەربارەی ئەو بابەتە.

## ١٣- نەهیکردن لە ڕۆژووی ویصال (واتە فتارنەکردنەوەی ڕۆژوو بەدرێژایی چەند ڕۆژێك)[٢]

**٨٢٧**- عَنْ عَبْدِ اللهِ بْنِ عُمَرَ ﷺ: أَنَّ رَسُولَ اللهِ ﷺ نَهَى عَنِ الْوِصَالِ، فَقَالُوا: يَا رَسُولَ اللهِ، فَإِنَّكَ تُوَاصِلُ؟ فَقَالَ: إِنِّي لَسْتُ كَهَيْئَتِكُمْ، إِنِّي أُطْعَمُ وَأُسْقَى[٣].

واتە: لە عەبدوڵلای کوڕی عومەرەوە ﷺ گێڕدراوەتەوە (گوتوویەتی): پێغەمبەری خوا ﷺ نەهی کرد لە ویصال (واتە نەهی کرد لە بەڕۆژووبوونی چەند ڕۆژێك بەسەر یەکەوە بەبێ فتارکردنەوە)، ئەوانیش گوتیان ئەی پێغەمبەری خوا ﷺ خۆ تۆ ویصال دەکەیت؟ ئەویش فەرمووی: من وەکوو ئێوە نیم، من هێزی خواردن و خواردنەوەم پێ دەدرێت.

---

(١) ـ بلاغ. أخرجه أبو مصعب الزهري: ٨٥٩؛ وفي: ٨٩٤؛ والحدثاني: ٤٨٢أ، عن مالك به.

(٢) ـ النَّهْيُ عَنِ الْوِصَالِ فِي الصِّيَامِ.

(٣) ـ صحيح. أخرجه أبو مصعب الزهري: ٨٥٠؛ والحدثاني: ٤٧٩؛ والشيباني: ٣٦٧؛ وابن حنبل: ٥٩١٧، وفي: ٦١٢٥؛ والبخاري: ١٩٦٢؛ ومسلم: الصيام: ٥٥؛ وأبو داود: ٢٣٦٠؛ والقابسي: ٢٠٩، كلهم عن مالك به.

**٨٢٨-** عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ ﷺ، أَنَّ رَسُولَ اللهِ ﷺ قَالَ: إِيَّاكُمْ وَالْوِصَالَ، إِيَّاكُمْ وَالْوِصَالَ، قَالُوا: فَإِنَّكَ تُوَاصِلُ يَا رَسُولَ اللهِ، قَالَ: إِنِّي لَسْتُ كَهَيْئَتِكُمْ، إِنِّي أَبِيتُ يُطْعِمُنِي رَبِّي وَيَسْقِينِي[1].

واتە: لە ئەبو هورەیرەوە ﷺ گێردراوەتەوە (گوتوویەتی): پێغەمبەری خوا ﷺ فەرموویەتی: خۆتان بپارێزن لە ویصال، خۆتان بپارێزن لە ویصال (واتە لە ڕۆژووگرتنی چەند ڕۆژێك بەبێ فتارکردنەوە)، گوتیان: خۆ تۆ ویصال دەکەیت ئەی پێغەمبەری خوا ﷺ؟ فەرمووی: من وەکوو ئێوە نیم، من شەو دەکەمەوە خوای پەروەردگار (هێزی) خواردن و خواردنەوەم پێدەدات.

## ١٤- ڕۆژووی ئەو کەسەی: بەهەڵە کەسێك دەکوژێ، یان زیهاڕ دەکات[2]

**٨٢٩- [فتوى]** حَدَّثَنِي يَحْيَى ﷺ، وسَمِعْتُ مَالِكًا ﷺ يَقُولُ: أَحْسَنُ مَا سَمِعْتُ فِيمَنْ وَجَبَ عَلَيْهِ صِيَامُ شَهْرَيْنِ مُتَتَابِعَيْنِ، فِي قَتْلِ خَطَأٍ، أَوْ تَظَاهُرٍ، فَعَرَضَ لَهُ مَرَضٌ يَغْلِبُهُ وَيَقْطَعُ عَلَيْهِ صِيَامَهُ، أَنَّهُ إِنْ صَحَّ مِنْ مَرَضِهِ، وَقَوِيَ عَلَى الصِّيَامِ، فَلَيْسَ لَهُ أَنْ يُؤَخِّرَ ذَلِكَ، وَهُوَ يَبْنِي عَلَى مَا قَدْ مَضَى مِنْ صِيَامِهِ[3].

(فەتوا): واتە: یەحیا ﷺ گوتوویەتی: گوێم لە ئیمامی مالیك ﷺ بوو دەیگوت: چاکترینی ئەوەی گوێم لێ بووە ـ دەربارەی ئەو کەسەی ڕۆژووی دوو مانگی لەسەر یەکی لەسەر واجب بووە بەهۆی کەفارەتی کوشتنی بەهەڵە یان زیهاڕکردن، جا نەخۆشییەکی بۆ پێش هات و بەسەریدا زاڵ بوو و ڕۆژووەکەی لێ پچڕاند ـ (فەتوا چاکەکە) ئەوەیە: کاتێ لە نەخۆشییەکەی چاکبۆیەوە و توانای بەسەر ڕۆژووگرتندا شکا، ئەوە بۆی نییە کارەکە دوابخات، وە لەکوێوە ڕۆژووەکانی پچڕاوە لەوێ دەست پێ دەکاتەوە.

---

(١) ـ صحيح. أخرجه أبو مصعب الزهري: ٨٥١؛ والحدثاني، ٤٧٩أ؛ والشيباني: ٣٦٨؛ وابن حنبل: ٧٢٢٨؛ والدارمي: ١٧٠٣؛ والقابسي: ٣٤٤، كلهم عن مالك به.

(٢) ـ صِيَامُ الَّذِي يَقْتُلُ خَطَأً أَوْ يَتَظَاهَرُ.

(٣) - أخرجه أبو مصعب الزهري: ٨١٣؛ وفي: ٨١٤؛ وفي: ٨١٥، عن مالك به.

**٨٣٠- [فتوى]** وَكَذَلِكَ الْمَرْأَةُ الَّتِي يَجِبُ عَلَيْهَا الصِّيَامُ فِي قَتْلِ النَّفْسِ خَطَأً، إِذَا حَاضَتْ بَيْنَ ظَهْرَيْ صِيَامِهَا، أَنَّهَا إِذَا طَهُرَتْ، لاَ تُؤَخِّرُ الصِّيَامَ، وَهِيَ تَبْنِي عَلَى مَا قَدْ صَامَتْ[١].

(فەتوا): بە هەمان شێوە ئەو ئافرەتەی ڕۆژووی (کەفارەتی) کوشتنی بەهەڵەی لەسەرە، کاتێ لەناو ڕۆژووەکەی تووشی حەیز دەبێ، (کارەکەی ئاوایە): کاتێ پاك بۆیەوە ڕۆژووەکە دواناخات، وە ڕۆژووگرتنەوەکانی لەسەر ڕۆژووەکانی پێشووی بینا دەکات (بۆ نمونە ئەگەر بیست ڕۆژووی گرتبێت لە بیست و یەکەوە دەست پێدەکات و ئەوەی پێشووی بۆ ئەژمار دەکرێ).

**٨٣١- [فتوى]** وَلَيْسَ لأَحَدٍ وَجَبَ عَلَيْهِ صِيَامُ شَهْرَيْنِ مُتَتَابِعَيْنِ فِي كِتَابِ اللهِ، أَنْ يُفْطِرَ إِلاَّ مِنْ عِلَّةٍ: مَرَضٍ أَوْ حَيْضَةٍ، وَلَيْسَ لَهُ أَنْ يُسَافِرَ فَيُفْطِرَ.

قَالَ مَالِكٌ ﵀: وَهَذَا أَحْسَنُ مَا سَمِعْتُ فِي ذَلِكَ[٢].

(فەتوا): واتە: هەر کەسێك کە (بەهۆی کەفارەت) ڕۆژووی دوو مانگ بەسەر یەکەوەی لەسەر واجب کرابێت لە پەرتووکی خوادا (کە بریتییە لە کەفارەتی زیهارِ و کوشتن)، بۆی نییە ڕۆژوو بشکێنێ، تەنها بە هۆکارێك نەبێت (وەك): نەخۆشی یان حەیز، هەروەها بۆی نییە سەفەر بکات و بەڕۆژوو نەبێت.

ئیمامی مالیك ﵀ گوتوویەتی: ئەوە چاکترینی ئەوەیە کە گوێم لێ بووە دەربارەی ئەو بابەتە.

## ١٥- ئەوەی نەخۆش ئەنجامی دەدات دەربارەی ڕۆژووەکەی[٣]

**٨٣٢- [فتوى]** قَالَ يَحْيَى ﵀: سَمِعْتُ مَالِكًا ﵀ يَقُولُ: الأَمْرُ الَّذِي سَمِعْتُ مِنْ أَهْلِ الْعِلْمِ، أَنَّ الْمَرِيضَ إِذَا أَصَابَهُ الْمَرَضُ الَّذِي يَشُقُّ عَلَيْهِ الصِّيَامُ مَعَهُ، وَيُتْعِبُهُ، وَيَبْلُغُ ذَلِكَ مِنْهُ، فَإِنَّ لَهُ

---

(١) - أخرجه أبو مصعب الزهري: ٨١٣؛ وفي: ٨١٤؛ وفي: ٨١٥، عن مالك به.

(٢) - أخرجه أبو مصعب الزهري: ٨١٣؛ وفي: ٨١٤؛ وفي: ٨١٥، عن مالك به.

(٣) ـ مَا يَفْعَلُ الْمَرِيضُ فِي صِيَامِهِ.

أَنْ يُفْطِرَ، وَكَذَلِكَ الْمَرِيضُ إِذَا اشْتَدَّ عَلَيْهِ الْقِيَامُ فِي الصَّلاَةِ، وَبَلَغَ مِنْهُ، وَمَا اللهُ أَعْلَمُ بِعُذْرِ ذَلِكَ مِنَ الْعَبْدِ، وَمِنْ ذَلِكَ مَا لاَ تَبْلُغُ صِفَتُهُ، فَإِذَا بَلَغَ ذَلِكَ مِنْهُ، صَلَّى وَهُوَ جَالِسٌ، وَدِينُ اللهِ يُسْرٌ.

وَقَدْ أَرْخَصَ اللهُ لِلْمُسَافِرِ فِي الْفِطْرِ فِي السَّفَرِ، وَهُوَ أَقْوَى عَلَى الصِّيَامِ مِنَ الْمَرِيضِ، قَالَ اللهُ تَعَالَى فِي كِتَابِهِ: ﴿ فَمَن كَانَ مِنكُم مَّرِيضًا أَوْ عَلَىٰ سَفَرٍ فَعِدَّةٌ مِّنْ أَيَّامٍ أُخَرَ ﴿١٨٤﴾ ﴾ البقرة، فَأَرْخَصَ اللهُ لِلْمُسَافِرِ فِي الْفِطْرِ فِي السَّفَرِ، وَهُوَ أَقْوَى عَلَى الصَّوْمِ مِنَ الْمَرِيضِ، فَهَذَا أَحَبُّ مَا سَمِعْتُ إِلَيَّ، وَهُوَ الأَمْرُ الْمُجْتَمَعُ عَلَيْهِ[1].

(فەتوا): واتە: لە یەحیاوە ﷺ گێڕدراوەتەوە گوتوویەتی: گوێم لە ئیمامی مالیك ﷺ بوو دەیگوت: ئەو بابەتەی لە زانایانەوە گوێبیستی بووم ئەوەیە: نەخۆش کاتێ نەخۆشی تووش دەبێ کە ڕۆژوو زەحمەت دەبێ لەگەڵ نەخۆشییەکە و هیلاکی دەکات و هیلاکییەکە دەگاتە ئاستێکی بەرز، ئەوە بۆی هەیە بەڕۆژوو نەبێ، بەهەمان شێوەیە کاتێ نەخۆش بۆی زەحمەت بێت لە نوێژدا بەپێوە بوەستێت و (زەحمەتییەکەش) بگاتە ئاستێکی بەرز، جا خوای پەروەردگار لە عەبدەکە باشتر ئاگای لە عوزرەکە هەیە کە ئاخۆ دەگات بەو ئاستە یان ناگات بەو ئاستە، جا ئەگەر گەیشت بەو ئاستە، ئەوە بەدانیشتنەوە نوێژ دەکات، ئایینی خوا ئاسانە و ئاسانکاری تێدایە.

خوای پەروەردگار لە سەفەردا مۆڵەتی بە گەشتیار داوە بە نەگرتنی ڕۆژوو لە کاتێکدا ئەو لە نەخۆش بەتواناترە بەسەر ڕۆژووگرتندا، خوای پەروەردگار ﷻ لە پەرتووکەکەی فەرموویەتی: ﴿ فَمَن كَانَ مِنكُم مَّرِيضًا أَوْ عَلَىٰ سَفَرٍ فَعِدَّةٌ مِّنْ أَيَّامٍ أُخَرَ ﴿١٨٤﴾ ﴾ البقرة، مۆڵەتی داوە بە گەشتیار بەوەی لە سەفەردا بەڕۆژوو نەبێت لە کاتێکدا لە نەخۆش بەتواناترە بەسەر ڕۆژووگرتندا، جا ئەوە لەلام خۆشەویستترینی ئەوەیە کە گوێبیستی بووم (لەو بابەتەدا)، وە ئەوە بریتییە لەو بابەتەی کۆدەنگی زانایانی لەسەرە.

---

(١) أخرجه أبو مصعب الزهري: ٨١٧، عن مالك به.

## ١٦- نەزری ڕۆژووگرتن، وە ڕۆژووگرتنەوە لەجیاتی مردوو[1]

**٨٣٣-** عَنْ سَعِيدِ بْنِ الْمُسَيَّبِ ﷺ، أَنَّهُ سُئِلَ عَنْ رَجُلٍ نَذَرَ صِيَامَ شَهْرٍ، هَلْ لَهُ أَنْ يَتَطَوَّعَ؟ فَقَالَ سَعِيدٌ ﷺ: لِيَبْدَأْ بِالنَّذْرِ قَبْلَ أَنْ يَتَطَوَّعَ[2].

واتە: لە سەعیدی کوڕی موسەیەبەوە ﷺ گێڕدراوەتەوە پرسیاری لێکراوە دەربارەی کەسێك کە نەزری کردبێت مانگێك بەڕۆژوو بێ، ئایا بۆی هەیە ڕۆژووی سوننەت بگرێ (کاتێ هێشتا نەزرەکەی بەجێ نەهێناوە)؟ سەعیدیش ﷺ گوتی: با سەرەتا بە نەزرەکە دەست پێبکات پێش ئەوەی ڕۆژووی سوننەت بگرێ.

**٨٣٤- (بلاغ)** قَالَ مَالِكٌ ﷺ: وَبَلَغَنِي عَنْ سُلَيْمَانَ بْنِ يَسَارٍ ﷺ مِثْلُ ذَلِكَ.

(بەلاغ): واتە: ئیمامی مالیك ﷺ گوتوویەتی: لە سولەیمانی کوڕی یەساریشەوە ﷺ هەمان شتم پێ گەیشتووە.

**٨٣٥- [فتوى]** قَالَ مَالِكٌ ﷺ: مَنْ مَاتَ وَعَلَيْهِ نَذْرٌ مِنْ رَقَبَةٍ يُعْتِقُهَا، أَوْ صِيَامٍ، أَوْ صَدَقَةٍ، أَوْ بَدَنَةٍ، فَأَوْصَى بِأَنْ يُوَفَّى ذَلِكَ عَنْهُ مِنْ مَالِهِ، فَإِنَّ الصَّدَقَةَ وَالْبَدَنَةَ فِي ثُلُثِهِ، وَهُوَ يُبَدَّى عَلَى مَا سِوَاهُ مِنَ الْوَصَايَا، إِلاَّ مَا كَانَ مِثْلَهُ، وَذَلِكَ أَنَّهُ لَيْسَ الْوَاجِبُ عَلَيْهِ مِنَ النُّذُورِ وَغَيْرِهَا، كَهَيْئَةِ مَا يَتَطَوَّعُ بِهِ مِمَّا لَيْسَ بِوَاجِبٍ، وَإِنَّمَا يُجْعَلُ ذَلِكَ فِي ثُلُثِهِ خَاصَّةً، دُونَ رَأْسِ مَالِهِ، لأَنَّهُ لَوْ جَازَ لَهُ ذَلِكَ فِي رَأْسِ مَالِهِ لأَخَّرَ الْمُتَوَفَّى مِثْلَ ذَلِكَ مِنَ الأُمُورِ الْوَاجِبَةِ عَلَيْهِ، حَتَّى إِذَا حَضَرَتْهُ الْوَفَاةُ، وَصَارَ الْمَالُ لِوَرَثَتِهِ، سَمَّى مِثْلَ هَذِهِ الأَشْيَاءِ الَّتِي لَمْ يَكُنْ يَتَقَاضَاهَا مِنْهُ مُتَقَاضٍ، فَلَوْ كَانَ ذَلِكَ جَائِزًا لَهُ، أَخَّرَ هَذِهِ الأَشْيَاءَ، حَتَّى إِذَا كَانَ عِنْدَ مَوْتِهِ سَمَّاهَا، وَعَسَى أَنْ يُحِيطَ بِجَمِيعِ مَالِهِ، فَلَيْسَ ذَلِكَ لَهُ[3].

(فەتوا): ئیمامی مالیك ﷺ گوتوویەتی: هەر کەسێك مرد و نەزری ئازادکردنی بەندەی لەسەر بوو، یان نەزری ڕۆژووی لەسەر بوو، یان نەزری صەدەقەی لەسەر بوو، یان نەزری ئاژەڵی لەسەر بوو (ئەو نەزرانەی لەسەر بوو)، جا وەسییەتی

---

(١) ـ النَّذْرُ فِي الصِّيَامِ، وَالصِّيَامُ عَنِ الْمَيِّتِ.

(٢) ـ مقطوع ضعيف. أخرجه أبو مصعب الزهري: ٨٣٢؛ والحدثاني: ٤٧٢، عن مالك به.

(٣) - أخرجه أبو مصعب الزهري: ٨٣٣، عن مالك به.

کرد بەوەی لە ماڵەکەی خۆی بۆی جێبەجێ بکرێ، ئەوە صەدەقە و ئاژەڵەکە لە سێیەکی ماڵەکەی دەبێ، ئەوەش پێش گشت وەسیێتەکانی دیکەی دەخرێت (ئەگەر وەسیێتی دیکەی هەبێ)، تەنها ئەوە نەبێت کە وەکوو ئەوە (لە ئاستی ئەو وەسیێتە بێت)، ئەو پێشخستنەش لەبەر ئەوەیە ئەو شتەی لەسەری بۆتە واجب جا بەهۆی نەزر بێت یان بە جگە لە نەزر، وەك ئەوە نییە کە بە سوننەت ئەنجامی دەدات لەو شتانەی کە واجب نین، وە کە (جێبەجێکردنەکەشی) تەنها لە سێیەکی ماڵەکەی داندراوە نەك لە کۆی گشتی ماڵەکەی، تەنها لەبەر ئەوەیە چونکە ئەگەر بۆی دروست بێت لە کۆی گشتی ماڵەکەی ئەنجام بدرێت ئەوە کەسەکە ئەو شتانە دوا دەخات کە لەسەری واجبن تا کاتێ مردن دەیگاتێ و ماڵەکە دەبێت بە موڵکی میراتگرانی، (ئەو کات) ناوی ئەو شتانە دێنێت کە هیچ کەسێك ناتوانێ بۆی قەزا بکاتەوە، جا ئەگەر ئەوەی بۆ دروست بووایە ئەو شتانەی دوا دەخست تا کاتێ مردن دەیگەیشتێ و ئەو کات ناوی دەهێنا و باسی دەکرد (بەمەش میراتگرانی لە میرات بێبەش دەکرد)، وە ڕەنگە (وەسیێتی وا بکات) گشت سەروەتەکەی بگرێتەوە، (بۆیە) ئەوەی بۆ نییە.

**٨٣٦-** أَنَّ عَبْدَ اللهِ بْنَ عُمَرَ ﭭ كَانَ يُسْأَلُ: هَلْ يَصُومُ أَحَدٌ عَنْ أَحَدٍ، أَوْ يُصَلِّي أَحَدٌ عَنْ أَحَدٍ؟ فَيَقُولُ: لاَ يَصُومُ أَحَدٌ عَنْ أَحَدٍ، وَلاَ يُصَلِّي أَحَدٌ عَنْ أَحَدٍ[1].

واتە: عەبدوڵڵای کوڕی عومەر ﭭ پرسیاری لێ دەکرا: ئایا هیچ کەسێك بۆ کەسی دیکە بەڕۆژوو بێ، یان هیچ کەسێك بۆی دروستە نوێژ بۆ کەسی دیکە بکات؟ ئەویش دەیگوت: هیچ کەس بەڕۆژوو نابێت لەجیاتی هیچ کەس، وە هیچ کەس نوێژ ناکات لەجیاتی هیچ کەس.

---

(١) ـ صحيح. أخرجه أبو مصعب الزهري: ٨٣٥، عن مالك به.

## ١٧- ئەوەی هاتووە دەربارەی قەزاكردنەوەی ڕەمەزان و كەفارەتەكان[١]

**٨٣٧**- عَنْ خَالِدِ بْنِ أَسْلَمَ ﷺ، أَنَّ عُمَرَ بْنَ الْخَطَّابِ ﷺ أَفْطَرَ ذَاتَ يَوْمٍ فِي رَمَضَانَ، فِي يَوْمٍ ذِي غَيْمٍ، وَرَأَى أَنَّهُ قَدْ أَمْسَى وَغَابَتِ الشَّمْسُ، فَجَاءَهُ رَجُلٌ فَقَالَ: يَا أَمِيرَ الْمُؤْمِنِينَ، طَلَعَتِ الشَّمْسُ، فَقَالَ عُمَرُ: الْخَطْبُ يَسِيرٌ وَقَدِ اجْتَهَدْنَا.

قَالَ مَالِكٌ ﷺ: يُرِيدُ بِقَوْلِهِ: الْخَطْبُ يَسِيرٌ الْقَضَاءَ، فِيمَا نُرَى، وَاللهُ أَعْلَمُ، وَخِفَّةَ مَؤُونَتِهِ وَيَسَارَتِهِ، يَقُولُ: نَصُومُ يَوْمًا مَكَانَهُ[٢].

واتە: لە خالیدی كوڕی ئەسلەمەوە ﷺ گێڕدراوەتەوە، گوتوویەتی: عومەری كوڕی خەتتاب ﷺ لە ڕەمەزاندا لە ڕۆژێكی هەوراویدا ڕۆژووی شكاند، وایزانی ئێوارە هاتووە و خۆر ئاوا بووە، جا پیاوێك هات بۆ لای و گوتی: ئەی گەورەی باوەڕداران خۆر دەركەوتەوە، ئیمامی عومەریش ﷺ گوتی: كارەكە ئاسانە ئیجتیهادمان كرد.

ئیمامی مالیك ﷺ گوتوویەتی: مەبەستی بە قسەكەی كە گوتی: كارەكە ئاسانە، مەبەستی قەزاكردنەوە بوو، ئەوەی ئێمە لێی تێدەگەین والله أعلم هەروەها مەبەستی بێمەسرەفی و ئاسانییە (واتە ڕۆژووگرتنەوە بێ مەسرەف و ئاسانە)، دەیگوت: لە شوێنی ئەو ڕۆژێك بەڕۆژوو دەبین.

**٨٣٨**- أَنَّ عَبْدَ اللهِ بْنَ عُمَرَ ﷺ كَانَ يَقُولُ: يَصُوم قَضاءَ رَمَضَانَ مُتَتَابِعًا، مَنْ أَفْطَرَهُ مِنْ مَرَضٍ أَوْ فِي سَفَرٍ[٣].

واتە: عەبدوڵڵای كوڕی عومەر ﷺ هەموو جار دەیگوت: ئەو كەسەی لە ڕەمەزان ڕۆژوو ناگرێت بەهۆی نەخۆشی یان سەفەر، ئەوە ڕۆژووەكان بەدوای یەكدا قەزا دەكاتەوە.

---

(١) ـ مَا جَاءَ فِي قَضَاءِ رَمَضَانَ وَالْكَفَّارَاتِ.

(٢) ـ صحيح. أخرجه أبو مصعب الزهري: ٨٢٠؛ والحدثاني: ٤٦٩؛ والشيباني: ٣٦٦؛ والشافعي: ٤٧٠، كلهم عن مالك به.

(٣) ـ صحيح. أخرجه أبو مصعب الزهري: ٨١٩، عن مالك به.

**٨٣٩-** عَنِ ابْنِ شِهَابٍ ﷺ، أَنَّ عَبْدَ اللهِ بْنَ عَبَّاسٍ، وَأَبَا هُرَيْرَةَ ﷺ اخْتَلَفَا فِي قَضَاءِ رَمَضَانَ، فَقَالَ أَحَدُهُمَا: يُفَرِّقُ بَيْنَهُ، وَقَالَ الآخَرُ: لاَ يُفَرِّقُ بَيْنَهُ، لاَ أَدْرِي أَيُّهُمَا قَالَ: يُفَرِّقُ بَيْنَهُ، وَلاَ أَيُّهُمَا قَالَ: لاَيُفَرِّقُ بَيْنَهُ[١].

واتە: لە ئیبنو شیهابەوە ﷺ گێڕدراوەتەوە (گوتوویەتی): عەبدوڵڵای کوڕی عەبباس و ئەبو هوڕەیرە ﷺ بۆچوونیان جیاواز بوو دەربارەی چۆنییەتی قەزاکردنەوەی ڕەمەزان، یەکێکیان دەیگوت: دروستە نێوانیان هەبێ، ئەوەی دیکەشیان دەیگوت: نابێ نێوانیان هەبێ، جا نازانم (لەو دووانە) کامیان بوو گوتی: دروستە نێوانیان هەبێ، وە ناشزانم کامیان بوو گوتی: نابێت نێوانیان هەبێت.

**٨٤٠-** عَنْ عَبْدِ اللهِ بْنِ عُمَرَ ﷺ، أَنَّهُ كَانَ يَقُولُ: مَنِ اسْتَقَاءَ وَهُوَ صَائِمٌ، فَعَلَيْهِ الْقَضَاءُ، وَمَنْ ذَرَعَهُ الْقَيْءُ، فَلَيْسَ عَلَيْهِ الْقَضَاءُ[٢].

واتە: لە عەبدوڵڵای کوڕی عومەرەوە ﷺ گێڕدراوەتەوە دەیگوت: هەر کەسێك خۆی بڕشێنێتەوە لە کاتێکدا بەڕۆژووە، ئەوە قەزاکردنەوەی لەسەرە، وە هەر کەسێك (بەبێ ویستی خۆی) ڕشانەوە زۆری بۆ هێنا و بەسەریدا زاڵ بوو و ڕشایەوە، ئەوە هیچی لەسەر نییە (با بەردەوامی بە ڕۆژووەکەی خۆی بدات و قەزاکردنەوەی لەسەر نییە).

**٨٤١-** عَنْ يَحْيَى بْنِ سَعِيدٍ ﷺ، أَنَّهُ سَمِعَ سَعِيدَ بْنَ الْمُسَيَّبِ ﷺ يُسْأَلُ عَنْ قَضَاءِ رَمَضَانَ، فَقَالَ سَعِيدٌ ﷺ: أَحَبُّ إِلَيَّ أَنْ لاَ يُفَرَّقَ قَضَاءُ رَمَضَانَ، وَأَنْ يُوَاتَرَ[٣].

واتە: لە یەحیای کوڕی سەعیدەوە ﷺ گێڕدراوەتەوە بەوەی گوێی لە سەعیدی کوڕی موسەیەب ﷺ بووە پرسیاری لێ کراوە دەربارەی قەزاکردنەوەی ڕەمەزان، سەعیدیش ﷺ گوتی: پێم چاکە نێوان نەخاتە قەزاکردنەوەی ڕۆژووەکانی ڕەمەزان و بەدوای یەکەوە بیانگرێتەوە.

---

(١) ـ ضعيف. أخرجه أبو مصعب الزهري: ٨١٨؛ والشيباني: ٣٦٢، عن مالك به.

(٢) ـ صحيح. أخرجه أبو مصعب الزهري: ٨٢١؛ والحدثاني: ٤٦٩ب؛ والشيباني: ٣٥٨؛ وشرح معاني الآثار: ٣٤١١، كلهم عن مالك به.

(٣) ـ مقطوع صحيح. أخرجه أبو مصعب الزهري: ٨٢٢؛ والحدثاني: ٤٧٠، عن مالك به.

٨٤٢- [فتوى] قَالَ يَحْيَى ﷺ: سَمِعْتُ مَالِكًا ﷺ يَقُولُ: فِيمَنْ فَرَّقَ قَضَاءَ رَمَضَانَ، فَلَيْسَ عَلَيْهِ إِعَادَةٌ، وَذَلِكَ مُجْزِئٌ عَنْهُ، وَأَحَبُّ ذَلِكَ إِلَيَّ أَنْ يُتَابِعَهُ[1].

(فەتوا): واتە: یەحیا ﷺ گوتوویەتی: گوێم لە ئیمامی مالیك ﷺ بوو دەربارەی ئەو کەسەی نێوان دەخاتە قەزاکردنەوەی ڕۆژووەکانی ڕەمەزان دەیگوت: هیچ دووبارەکردنەوەی لەسەر نییە و بۆی بەردەکەوێ، (بەڵام) پێم خۆشتر و چاکترە بەدوای یەکترەوە قەزایان بکاتەوە.

٨٤٣- [فتوى] قَالَ مَالِكٌ ﷺ: مَنْ أَكَلَ أَوْ شَرِبَ فِي رَمَضَانَ، سَاهِيًا أَوْ نَاسِيًا، أَوْ مَا كَانَ مِنْ صِيَامٍ وَاجِبٍ عَلَيْهِ، أَنَّ عَلَيْهِ قَضَاءَ يَوْمٍ مَكَانَهُ[2].

(فەتوا): واتە: ئیمامی مالیك ﷺ گوتوویەتی: هەر کەسێك خواردی یان خواردیەوە جا بەهەڵە بێت یان بەلەبیرچوونەوە، لە ڕەمەزاندا یان لە ڕۆژوێکی واجبدا (وەك ڕۆژووی زیهارِ و کەفارەتەکانی دیکە)، ئەوە لەسەری واجبە ڕۆژووێك بگرێتەوە لەجیاتی ئەو ڕۆژە (واتە ڕۆژووەکەی بەتاڵ دەبێتەوە بەڵام تاوانبار نابێت).

٨٤٤- عَنْ حُمَيْدِ بْنِ قَيْسٍ الْمَكِّيِّ ﷺ، أَنَّهُ أَخْبَرَهُ قَالَ: كُنْتُ مَعَ مُجَاهِدٍ ﷺ وَهُوَ يَطُوفُ بِالْبَيْتِ، فَجَاءَهُ إِنْسَانٌ فَسَأَلَهُ عَنْ صِيَامِ أَيَّامِ الْكَفَّارَةِ، أَمُتَتَابِعَاتٍ أَمْ يَقْطَعُهَا؟ قَالَ حُمَيْدٌ ﷺ: فَقُلْتُ لَهُ: نَعَمْ، يَقْطَعُهَا إِنْ شَاءَ، قَالَ مُجَاهِدٌ ﷺ: لاَ يَقْطَعُهَا، فَإِنَّهَا فِي قِرَاءَةِ أُبَيِّ بْنِ كَعْبٍ ﷺ ثَلاَثَةِ أَيَّامٍ مُتَتَابِعَاتٍ[3].

واتە: لە حومەیدی کوڕی قەیسی مەکییەوە ﷺ گێردراوەتەوە بەوەی هەواڵی بە ئیمامی مالیك ﷺ داوە گوتوویەتی: من لەگەڵ موجاهید ﷺ بووم لە کاتێکدا تەوافی بەدەوری بەیتدا دەکرد، جا کەسێك هات بۆ لای و پرسیاری لێکرد دەربارەی ڕۆژووی ڕۆژانی کەفارەت، کە ئاخۆ واجبە بەدوای یەکدا بن یان دروستە نێوانیان هەبێت؟ حومەید ﷺ دەڵێ: منیش گوتم: بەڵێ، ئەگەر ویستی دەتوانێ نێوانیان

---

(١) - أخرجه أبو مصعب الزهري: ٨٢٣؛ والحدثاني: ٤٧٠أ، كلهم عن مالك به.

(٢) - أخرجه أبو مصعب الزهري: ٨٢٤، عن مالك به.

(٣) ـ موقوف حسن. أخرجه أبو مصعب الزهري: ٨٠٤؛ والحدثاني: ٤٦٦، عن مالك به.





بخاتە بەین، موجاهید ﷺ گوتی: نێوانیان ناخاتە بەین، چونكە لە قیرائەتی ئوبەی كوڕی كەعبدا ـ ﷺ ـ (ئایەتەكە بەم شێوەیە هاتووە: [**ثَلاَثَةِ أَيَّامٍ مُتَتَابِعَاتٍ**] واتە: [سێ ڕۆژی بەدوای یەكدا].

**٨٤٥- [فتوى]** قَالَ مَالِكٌ ﷺ: وَأَحَبُّ إِلَيَّ أَنْ يَكُونَ مَا سَمَّى اللهُ فِي الْقُرْآنِ، يُصَامُ مُتَتَابِعًا[١].

(فەتوا): واتە: لە ئیمامی مالیكەوە ﷺ گێڕدراوەتەوە گوتوویەتی: لام خۆشەویستتر و چاكترە ئەوەی لە قوڕئاندا هاتووە (كە بریتییە لە كەفاڕەتی سوێند) ڕۆژووەكان بە دوای یەك بگیرێن.

**٨٤٦- [فتوى]** وَسُئِلَ مَالِكٌ ﷺ، عَنِ الْمَرْأَةِ تُصْبِحُ صَائِمَةً فِي رَمَضَانَ، فَتَدْفَعُ دَفْعَةً مِنْ دَمٍ عَبِيطٍ فِي غَيْرِ أَوَانِ حَيْضَتِهَا، ثُمَّ تَنْتَظِرُ حَتَّى تُمْسِيَ أَنْ تَرَى مِثْلَ ذَلِكَ، فَلاَ تَرَى شَيْئًا، ثُمَّ تُصْبِحُ يَوْمًا آخَرَ، فَتَدْفَعُ دَفْعَةً أُخْرَى وَهِيَ دُونَ الأُولَى، ثُمَّ يَنْقَطِعُ ذَلِكَ عَنْهَا قَبْلَ حَيْضَتِهَا بِأَيَّامٍ، فَسُئِلَ مَالِكٌ ﷺ: كَيْفَ تَصْنَعُ فِي صِيَامِهَا وَصَلاَتِهَا؟ قَالَ مَالِكٌ ﷺ: ذَلِكَ الدَّمُ مِنَ الْحَيْضَةِ، فَإِذَا رَأَتْهُ فَلْتُفْطِرْ، وَلْتَقْضِ مَا أَفْطَرَتْ، فَإِذَا ذَهَبَ عَنْهَا الدَّمُ فَلْتَغْتَسِلْ، وَلِتَصُمْ[٢].

(فەتوا): واتە: ئیمامی مالیك ﷺ پرسیاری لێكرا دەربارەی ئەو ئافرەتەی بەڕۆژووەوە بەیانی دەكاتەوە، جا یەك جار خوێنێكی (بێگومان) تەواو خوێن دەردەدات لە كاتێكی جگە لە كاتی سووڕی مانگانەكەی، دواتر تا ئێوارە چاوەڕێ دەكات تاوەكوو دووبارە شتێكی ئاوا ببینێتەوە، كەچی هیچ نابینێ، دواتر ڕۆژێكی دیكە بەیانی دەكاتەوە و جارێكی دیكە خوێنەكە دەردەدات كە كەمترە لە هی جاری یەكەم، دواتر لەسەری دەپچڕێت تاوەكوو چەند ڕۆژێك پێش كاتی عادەتی سووڕی مانگانەكەی، جا پرسیار لە ئیمامی مالیك ﷺ كرا (گوترا): چی دەكات لە ڕۆژوو و نوێژەكانی؟ ئیمامی مالیكیش ﷺ گوتی: ئەو خوێنە بە حەیز حیسابە، جا ئەگەر بینی با بەڕۆژوو نەبێت و ئەوە قەزا بكاتەوە كە (بەو هۆیەوە) بەڕۆژوو نەبووە، وە ئەگەر خوێنەكەی نەما با خۆی بشۆرێت و بەڕۆژوو بێت.

---

(١) - أخرجه أبو مصعب الزهري: ٨٠٥، عن مالك به.

(٢) - أخرجه أبو مصعب الزهري: ٨٢٥، عن مالك به.




**٨٤٧- [فتوى]** وسُئِلَ مَالِكٌ ﷺ، عَمَّنْ أَسْلَمَ فِي آخِرِ يَوْمٍ مِنْ رَمَضَانَ: هَلْ عَلَيْهِ قَضَاءُ رَمَضَانَ كُلِّهِ، أَوْ هَلْ يَجِبُ عَلَيْهِ قَضَاءُ الْيَوْمِ الَّذِي أَسْلَمَ فِيهِ؟ فَقَالَ: لَيْسَ عَلَيْهِ قَضَاءُ مَا مَضَى، وَإِنَّمَا يَسْتَأْنِفُ الصِّيَامَ فِيمَا يُسْتَقْبَلُ، وَأَحَبُّ إِلَيَّ أَنْ يَقْضِيَ الْيَوْمَ الَّذِي أَسْلَمَ فِي بَعْضِهِ[1].

(فەتوا): واتە: هەروەها ئیمامی مالیك ﷺ پرسیاری لێکرا دەربارەی ئەو کەسەی لە کۆتا ڕۆژ لە ڕەمەزاندا مسوڵمان دەبێ: ئایا قەزاکردنەوەی گشت ڕەمەزانی لەسەرە یان تەنها قەزاکردنەوەی ئەو ڕۆژەی لەسەر واجبە کە تیایدا مسوڵمان بووە؟ ئەویش گوتی: قەزاکردنەوەی ئەوەی لەسەر نییە کە تێ پەڕیوە، بەڵکوو دەست بە ڕۆژوو دەکات لەوەی دێتە پێشەوە لەمەودوا، وە پێم خۆشتر و چاکترە ئەو ڕۆژە قەزا بکاتەوە کە تیایدا دوای تێپەڕینی بەشێکی مسوڵمان بووە.

## ١٨- قەزاکردنەوە و گێڕانەوەی سوننەت[2]

**٨٤٨-** عَنِ ابْنِ شِهَابٍ ﷺ، أَنَّ عَائِشَةَ، وَحَفْصَةَ ﷺ، زَوْجَيِ النَّبِيِّ ﷺ أَصْبَحَتَا صَائِمَتَيْنِ مُتَطَوِّعَتَيْنِ، فَأُهْدِيَ لَهُمَا طَعَامٌ، فَأَفْطَرَتَا عَلَيْهِ، فَدَخَلَ عَلَيْهِمَا رَسُولُ اللهِ ﷺ، قَالَتْ عَائِشَةُ ﷺ: فَقَالَتْ حَفْصَةُ، وَبَدَرَتْنِي بِالْكَلَامِ، وَكَانَتْ بِنْتَ أَبِيهَا: يَا رَسُولَ اللهِ، إِنِّي أَصْبَحْتُ أَنَا وَعَائِشَةُ صَائِمَتَيْنِ مُتَطَوِّعَتَيْنِ، فَأُهْدِيَ إِلَيْنَا طَعَامٌ، فَأَفْطَرْنَا عَلَيْهِ، فَقَالَ رَسُولُ اللهِ ﷺ: اقْضِيَا مَكَانَهُ يَوْمًا آخَرَ[3].

واتە: لە ئیبنو شیهابەوە ﷺ گێڕدراوەتەوە (گوتوویەتی): عائیشە و حەفصەی ﷺ خێزانی پێغەمبەر ﷺ بەبەڕۆژووبوونی ڕۆژووی سوننەت بەیانیان کردەوە و، خواردنێکیان بۆ کرایە دیاری، ئەوانیش بە خواردنەکە ڕۆژووەکەیان شکاند، (دواتر) پێغەمبەری خوا ﷺ هاتە ژوورەوە بۆ لایان، عائیشە ﷺ دەڵێ: حەفصە ﷺ پێشم کەوت لە قسەکردندا ـ واتە لەوەدا کچی باوکیەتی وەك ئەو پەلەی دەکرد بۆ خێر و چاکە ـ گوتی: ئەی پێغەمبەری خوا ﷺ من و عائیشە ﷺ بە ڕۆژووگرتنی سوننەت

---

(١) - أخرجه أبو مصعب الزهري: ٨٢٦، عن مالك به.

(٢) ـ قَضَاءُ التَّطَوُّعِ.

(٣) ـ منكر. أخرجه أبو مصعب الزهري: ٨٢٧؛ والحدثاني: ٤٧١؛ والشيباني: ٣٦٣، كلهم عن مالك به.



بەیانیان کردەوە، جا خواردنێکمان بۆ کرا بەدیاری و ڕۆژووەکەمان پێ شکاند، پێغەمبەری خواش ﷺ فەرمووی: لە شوێنی ئەو ڕۆژە ڕۆژێك قەزا بکەنەوە[١].

**٨٤٩- [فتوى] قَالَ يَحْيَى ﷺ: سَمِعْتُ مَالِكًا ﷺ يَقُولُ: مَنْ أَكَلَ أَوْ شَرِبَ سَاهِيًا أَوْ نَاسِيًا فِي صِيَامِ تَطَوُّعٍ، فَلَيْسَ عَلَيْهِ قَضَاءٌ، وَلْيُتِمَّ يَوْمَهُ الَّذِي أَكَلَ فِيهِ أَوْ شَرِبَ وَهُوَ مُتَطَوِّعٌ، وَلاَ يُفْطِرْهُ، وَلَيْسَ عَلَى مَنْ أَصَابَهُ أَمْرٌ يَقْطَعُ صِيَامَهُ وَهُوَ مُتَطَوِّعٌ، قَضَاءٌ، إِذَا كَانَ إِنَّمَا أَفْطَرَ مِنْ عُذْرٍ، غَيْرَ مُتَعَمِّدٍ لِلْفِطْرِ، وَلاَ أَرَى عَلَيْهِ قَضَاءَ صَلاَةِ نَافِلَةٍ، إِذَا هُوَ قَطَعَهَا مِنْ حَدَثٍ لاَ يَسْتَطِيعُ حَبْسَهُ، مِمَّا يَحْتَاجُ فِيهِ إِلَى الْوُضُوءِ[٢].**

(فەتوا): واتە: لە یەحیاوە ﷺ گێڕدراوەتەوە (گوتوویەتی): گوێم لە ئیمامی مالیك ﷺ بوو دەیگوت: هەر کەسێك بە هەڵە یان بەلەبیرچوونەوە شت بخوات یان بخواتەوە، ئەوە هیچ قەزاکردنەوەیەکی لەسەر نییە و با ئەو ڕۆژەی تەواو بکات کە تیایدا خواردوویەتی یان خواردوویەتەوە لە کاتێکدا ڕۆژووەکە سوننەت بێ، (ئەو کارە) نایشکێنێ، ئەو کەسەش کە شتێکی تووش دەبێت و بەهۆیەوە ڕۆژووەکەی دەپچڕێنێت لە کاتێکدا ڕۆژووەکە سوننەتە، ئەوە قەزاکردنەوەی لەسەر نییە، (بە مەرجێك) ئەگەر هاتو بەعوزر ڕۆژووەکەی شکاند، بە ئەنقەست شکاندنی مەبەست نەبوو، وە پێم وا نییە قەزاکردنەوەی نوێژی سوننەتی لەسەر بێت ئەگەر پچڕاندی بەهۆی پیسیێك کە نەتوانێت پێشی لێ بگرێ، لەو شتانەی پێویستییان بە دەستنوێژ هەیە (وەك میز و پیسایی و بالێبەربوون).

**٨٥٠- [فتوى] قَالَ مَالِكٌ ﷺ: وَلاَ يَنْبَغِي أَنْ يَدْخُلَ الرَّجُلُ فِي شَيْءٍ مِنَ الأَعْمَالِ الصَّالِحَةِ: الصَّلاَةِ، وَالصِّيَامِ، وَالْحَجِّ، وَمَا أَشْبَهَ ذَلِكَ مِنَ الأَعْمَالِ الصَّالِحَةِ الَّتِي يَتَطَوَّعُ بِهَا النَّاسُ، فَيَقْطَعَهُ حَتَّى يُتِمَّهُ عَلَى سُنَّتِهِ: إِذَا كَبَّرَ لَمْ يَنْصَرِفْ حَتَّى يُصَلِّيَ رَكْعَتَيْنِ، وَإِذَا صَامَ لَمْ يُفْطِرْ حَتَّى يُتِمَّ**

---

(١) ـ لەلای ئیمامی مالیك واجبە ڕۆژووی سوننەت قەزا بکرێتەوە ئەگەر کەسەکە شکاندی، بە بەڵگەی ئەو فەرموودەیە، بەڵام لەلای ئیمامی شافیعی واجب نییە قەزای بکاتەوە، بەڵکوو سوننەتە، بە بەڵگەی فەرموودەی ئوم هانێ کە ڕۆژووی لەلای پێغەمبەری خوا ﷺ شکاند بۆ ئەوەی خواردنی پێغەمبەری خوا ﷺ بخوات، پێغەمبەری خواش ﷺ پێی فەرموو: ئەگەر قەزای ڕەمەزان بوو ئەوە بیگرەوە، ئەگەر قەزای ڕەمەزانیش نەبوو بە کەیفی خۆت بکە دەیگریتەوە یان نایگریتەوە.

(٢) - أخرجه أبو مصعب الزهري: ٨٢٨؛ وفي: ٨٢٩، عن مالك به.




صَوْمَ يَوْمِهِ، وَإِذَا أَهَلَّ لَمْ يَرْجِعْ حَتَّى يُتِمَّ حَجَّهُ، وَإِذَا دَخَلَ فِي الطَّوَافِ لَمْ يَقْطَعْهُ حَتَّى يُتِمَّ سُبُوعَهُ، وَلاَ يَنْبَغِي لَهُ أَنْ يَتْرُكَ شَيْئًا مِنْ هَذَا إِذَا دَخَلَ فِيهِ حَتَّى يَقْضِيَهُ، إِلاَّ مِنْ أَمْرٍ يَعْرِضُ لَهُ، مِمَّا يَعْرِضُ لِلنَّاسِ، مِنَ الأَسْقَامِ وَالأُمُورِ الَّتِي يُعْذَرُونَ بِهَا، وَذَلِكَ أَنَّ اللهَ ﷻ يَقُولُ فِي كِتَابِهِ: ﴿ وَكُلُواْ وَاشْرَبُواْ حَتَّىٰ يَتَبَيَّنَ لَكُمُ الْخَيْطُ الْأَبْيَضُ مِنَ الْخَيْطِ الْأَسْوَدِ مِنَ الْفَجْرِ ثُمَّ أَتِمُّواْ الصِّيَامَ إِلَى الَّيْلِ ﴿١٨٧﴾ ﴾البقرة، فَعَلَيْهِ إِتْمَامُ الصِّيَامِ، كَمَا قَالَ اللهُ، وَقَالَ اللهُ تَعَالَى:﴿ وَأَتِمُّواْ الْحَجَّ وَالْعُمْرَةَ لِلَّهِ ﴿١٩٦﴾ ﴾البقرة، فَلَوْ أَنَّ رَجُلاً أَهَلَّ بِالْحَجِّ تَطَوُّعًا وَقَدْ قَضَى الْفَرِيضَةَ، لَمْ يَكُنْ لَهُ أَنْ يَتْرُكَ الْحَجَّ بَعْدَ أَنْ دَخَلَ فِيهِ، وَيَرْجِعَ حَلاَلاً مِنَ الطَّرِيقِ، وَكُلُّ أَحَدٍ دَخَلَ فِي نَافِلَةٍ فَعَلَيْهِ إِتْمَامُهَا إِذَا دَخَلَ فِيهَا، كَمَا يُتِمُّ الْفَرِيضَةَ، وَهَذَا أَحْسَنُ مَا سَمِعْتُ فِي ذَلِكَ[1].

(فەتوا): واتە: ئیمامی مالیك ﷺ گوتوویەتی: نابێت و دروست نییە مرۆڤی مسوڵمان بچێتە ناو هیچ کردارێکی عیبادەت (وەك): نوێژ و ڕۆژوو و حەج و هاوشێوەی ئەوانەش لە کردارە چاکەکان کە خەڵك بەسوننەت ئەنجامیان دەدات، نابێت بیانپچڕێنێت تاوەکوو تەواویان دەکات وەك چۆن بەسوننەت دانراوە: ئەگەر «الله أکبر»ی کرد و دەستی بە نوێژ کرد نابێ کۆتایی پێ بێنێت تاوەکوو (بەلانی کەم) دوو ڕکات تەواو دەکات، وە ئەگەر بەڕۆژوو بوو نایشکێنێ تاوەکوو ڕۆژەکەی تەواو دەکات، وە ئەگەر ئیحرامی بەستا ئەوە ناگەڕێتەوە تاوەکوو حەجەکەی تەواو دەکات، وە ئەگەر چووە ناو تەوافکردن ئەوە نایپچڕێنێ تاوەکوو حەوتەکەی تەواو دەکات، وە ناکرێت شتێك لەمانە واز لێ بهێنێ ئەگەر چووە ناویەوە تاوەکوو تەواوی دەکات، تەنها بە هۆکارێك نەبێت کە تووشی ببێ، لەو هۆکارانەی تووشی خەڵکی دەبن، لە نەخۆشی و ئەو شتانەی بۆیان بە عوزر دادەنرێن، لەبەر ئەوەی خوای پەروەردگار لە پەرتووکەکەیدا دەفەرموێت: ﴿ وَكُلُواْ وَاشْرَبُواْ حَتَّىٰ يَتَبَيَّنَ لَكُمُ الْخَيْطُ الْأَبْيَضُ مِنَ الْخَيْطِ الْأَسْوَدِ مِنَ الْفَجْرِ ثُمَّ أَتِمُّواْ الصِّيَامَ إِلَى الَّيْلِ ﴿١٨٧﴾ ﴾ البقرة، واتە: (جا بخۆن و بخۆنەوە هەتا بەڕوونی بەرەبەیان و سپێدەتان بۆ دەردەکەوێت و لە ڕۆژهەڵاتەوە دەردەکەوێت و تاریکی شەو لادەدات، لەمەبەدوا ڕۆژوەکەتان ببەنە سەر تا شەو دادێ)، کەواتە لەسەری واجبە ڕۆژووەکە تەواو بکات، وەك خوای پەروەردگار لە ئایەتەکە فەرمووی، وە خوای پەروەردگار

[1] - أخرجه أبو مصعب الزهري: ٨٣١، عن مالك به.




فەرموویەتی: ﴿ وَأَتِمُّواْ ٱلْحَجَّ وَٱلْعُمْرَةَ لِلَّهِ ﴿١٩٦﴾ ﴾ البقرة، واتە: (حەج و عومرە بۆ خوا تەواو بکەن) جا ئەگەر کەسێك ئیحرامی حەجی سوننەتی بەست لە کاتێکدا حەجی واجبی تەواو کردبوو، ئەوە بۆی نییە حەجەکە واز لێ بهێنێت دوای ئەوەی چۆتە ناویەوە، وە نابێ لەو ڕێگەیەوە بە ئیحرامشکاوی بگەڕێتەوە، وە گشت کەسێك ئەگەر چووە ناو سوننەتێکەوە ئەوە لەسەری واجبە تەواوی بکات ئەگەر چووە ناویەوە، هەر وەك چۆن واجب تەواو دەکرێ، جا ئەوە چاکترینی ئەوەیە کە گوێم لێ بووە دەربارەی ئەو بابەتە.

## ١٩- فیدیەی ئەو کەسەی لە ڕەمەزاندا لەبەر هۆکارێکی شەرعی ڕۆژوو ناگرێت[١]

**٨٥١-** أَنَّ أَنَسَ بْنَ مَالِكٍ ﷺ كَبِرَ حَتَّى كَانَ لاَ يَقْدِرُ عَلَى الصِّيَامِ، فَكَانَ يَفْتَدِي[٢].

واتە: ئەنەسی کوڕی مالیك ﷺ ئەوەندە بەتەمەندا چوو و پیر ببوو نەیدەتوانی بەڕۆژوو بێ، فیدیەی دەدا.

**٨٥٢-** قَالَ مَالِكٌ ﷺ: وَلاَ أَرَى ذَلِكَ وَاجِبًا، وَأَحَبُّ إِلَيَّ أَنْ يَفْعَلَهُ إِذَا كَانَ قَوِيًّا عَلَيْهِ، فَمَنْ فَدَى، فَإِنَّمَا يُطْعِمُ مَكَانَ كُلِّ يَوْمٍ مُدًّا، بِمُدِّ النَّبِيِّ ﷺ[٣].

واتە: ئیمامی مالیك ﷺ گوتوویەتی: من پێم وا نییە (فیدیەدان) واجب بێ، بەڵام پێم خۆش و چاکە ئەنجامی بدات ئەگەر توانای هەبوو، جا هەر کەسێك ویستی فیدیە بدات، ئەوە لە شوێنی هەر ڕۆژێك یەك مود بە موددی پێغەمبەر ﷺ خواردن دەبەخشێت (کە دەکاتە: ٥٠٦ گرام).

**٨٥٣-** أَنَّ عَبْدَ اللهِ بْنَ عُمَرَ ﷺ سُئِلَ عَنِ الْمَرْأَةِ الْحَامِلِ، إِذَا خَافَتْ عَلَى وَلَدِهَا، وَاشْتَدَّ عَلَيْهَا الصِّيَامُ؟ فَقَالَ: تُفْطِرُ، وَتُطْعِمُ مَكَانَ كُلِّ يَوْمٍ مِسْكِينًا، مُدًّا مِنْ حِنْطَةٍ، بِمُدِّ النَّبِيِّ ﷺ[٤].

---

(١) ـ فِدْيَةُ مَنْ أَفْطَرَ فِي رَمَضَانَ مِنْ عِلَّةٍ.

(٢) ـ صحيح. أخرجه أبو مصعب الزهري: ٨٠٩؛ وفي: ٨١٠، عن مالك به.

(٣) ـ صحيح. أخرجه أبو مصعب الزهري: ٨٠٩؛ وفي: ٨١٠، عن مالك به.

(٤) ـ أخرجه أبو مصعب الزهري: ٨٠٧؛ والحدثاني: ٤٦٧؛ والشافعي: ١١٣٣، عن مالك به.




واتە: عەبدوڵڵای كوڕی عومەر ﷺ پرسیاری لێكرا دەربارەی ئەو ئافرەتەی دووگیانە، ئەگەر ترسی لە دەستدانی منداڵەكەی هەبوو و ڕۆژووش لەسەری قورس بوو (چی بكات)؟ گوتی: ڕۆژوو ناگرێت و لە شوێنی هەر ڕۆژێك خواردن دەبەخشێت بە هەژارێك، (ئەندازەكەشی بریتییە لە) موددێك لە گەنم بە موددی پێغەمبەر ﷺ (كە دەكاتە: ٥٠٦ گرام).

٨٥٤- قَالَ مَالِكٌ ﷺ: وَأَهْلُ الْعِلْمِ يَرَوْنَ عَلَيْهَا الْقَضَاءَ، كَمَا قَالَ اللهُ: ﴿فَمَن كَانَ مِنكُم مَّرِيضًا أَوْ عَلَىٰ سَفَرٍ فَعِدَّةٌ مِّنْ أَيَّامٍ أُخَرَ ﴿١٨٤﴾﴾ البقرة، وَيَرَوْنَ ذَلِكَ مَرَضًا مِنَ الْأَمْرَاضِ، مَعَ الْخَوْفِ عَلَى وَلَدِهَا[1].

واتە: ئیمامی مالیك ﷺ گوتوویەتی: زانایان پێیان وایە ئافرەتی دووگیان قەزاكردنەوەی لەسەر واجبە، وەك خوا فەرموویەتی: ﴿فَمَن كَانَ مِنكُم مَّرِيضًا أَوْ عَلَىٰ سَفَرٍ فَعِدَّةٌ مِّنْ أَيَّامٍ أُخَرَ ﴿١٨٤﴾﴾البقرة، واتە: (جا هەر كەسێك لە ئێوە نەخۆش بوو یان لە سەفەر بوو، ئەوە با لە ڕۆژانی دیكەدا بەو ئەندازەیە بیگرێتەوە)، پێیان وایە دووگیانی نەخۆشییێكە لە نەخۆشییەكان (كە دەبێتە عوزر) لەگەڵ هەبوونی ترس لە فەوتانی منداڵەكە.

٨٥٥- عَنْ عَبْدِ الرَّحْمَنِ بْنِ الْقَاسِمِ ﷺ، عَنْ أَبِيهِ ﷺ، أَنَّهُ كَانَ يَقُولُ: مَنْ كَانَ عَلَيْهِ قَضَاءُ رَمَضَانَ، فَلَمْ يَقْضِهِ، وَهُوَ قَوِيٌّ عَلَى صِيَامِهِ، حَتَّى جَاءَ رَمَضَانُ آخَرُ، فَإِنَّهُ يُطْعِمُ مَكَانَ كُلِّ يَوْمٍ مِسْكِينًا، مُدًّا مِنْ حِنْطَةٍ، وَعَلَيْهِ مَعَ ذَلِكَ الْقَضَاءُ[2].

واتە: لە عەبدوڕڕەحمانی كوڕی قاسمەوە ﷺ گێڕدراوەتەوە، ئەویش لە باوكیەوە ﷺ گێڕاویەتەوە دەیگوت: هەر كەسێك قەزاكردنەوەی ڕەمەزانی لەسەر بێت و قەزای نەكاتەوە تاوەكوو ڕەمەزانێكی دیكە دێت لە كاتێكدا بەهێزە لەسەر گرتنەوەی ڕۆژووەكەی، ئەوە لە شوێنی هەر ڕۆژێك دەبێ خواردن بدات بە هەژارێك، (ئەندازەكەشی بریتییە لە) مودێك لە گەنم (كە دەكاتە: ٥٠٦ گرام)، وە لەگەڵ ئەوەشدا قەزاكردنەوەی هەر لەسەرە.

---

(١) ـ أخرجه أبو مصعب الزهري: ٨٠٨؛ والحدثاني: ٤٦٧أ، عن مالك به.

(٢) ـ مقطوع صحيح. أخرجه أبو مصعب الزهري: ٨١١؛ والحدثاني: ٤٦٧ب، عن مالك به.

**٨٥٦-** عَنْ مَالِكٍ ﷺ؛ أَنَّهُ بَلَغَهُ عَنْ سَعِيدِ بْنِ جُبَيْرٍ ﷺ، مِثْلُ ذَلِكَ[١].

واته: له ئیمامی مالیکەوه ﷺ گێڕدراوەتەوه بەوەی پێی گەیشتووه سەعیدی کوڕی جوبەیریش ﷺ هەمان شتی گوتووه.

## ٢٠- بابەتی جۆراوجۆری پەیوەست بە قەزاکردنەوەی ڕۆژوو[٢]

**٨٥٧-** عَنْ أَبِي سَلَمَةَ بْنِ عَبْدِ الرَّحْمَنِ ﷺ، أَنَّهُ سَمِعَ عَائِشَةَ ﷺ، زَوْجَ النَّبِيِّ ﷺ تَقُولُ: إِنْ كَانَ لَيَكُونُ عَلَيَّ الصِّيَامُ مِنْ رَمَضَانَ، فَمَا أَسْتَطِيعُ أَصُومُهُ حَتَّى يَأْتِيَ شَعْبَانُ[٣].

واته: له ئەبو سەلەمەی کوڕی عەبدوڕڕەحمانەوه ﷺ گێڕدراوەتەوه بەوەی گوێی له عائیشەی ﷺ خێزانی پێغەمبەر ﷺ بووه دەیگوت: جاری وا هەبووه ڕۆژووی قەرزی ڕەمەزانم لەسەر بووه و، نەمتوانیوه بیگرمەوه تاوەکوو مانگی شەعبان (واته تاوەکوو گەیشتووم بە مانگی پێش ڕەمەزانی داهاتوو، کەواته گرنگ ئەوەیە نەگاتەوه ڕەمەزان، بەڵام بەبێ عوزر باش نییه دەبێ پەله بکرێ، چونکه ئەجەل دیار نییه).

## ٢١- ڕۆژووی ئەو ڕۆژەی گومانی تیایه (کە ئاخۆ یەکەم ڕۆژی ڕەمەزانە یان نا)[٤]

**٨٥٨-** [فتوى] عَنْ مَالِكٍ ﷺ، أَنَّهُ سَمِعَ أَهْلَ الْعِلْمِ يَنْهَوْنَ أَنْ يُصَامَ الْيَوْمُ الَّذِي يُشَكُّ فِيهِ مِنْ شَعْبَانَ، إِذَا نُوِيَ بِهِ صِيَامَ رَمَضَانَ، وَيَرَوْنَ أَنَّ عَلَى مَنْ صَامَهُ عَلَى غَيْرِ رُؤْيَةٍ، ثُمَّ جَاءَ الثَّبَتُ أَنَّهُ مِنْ رَمَضَانَ، أَنَّ عَلَيْهِ قَضَاءَهُ، وَلاَ يَرَوْنَ بِصِيَامِهِ تَطَوُّعًا بَأْسًا.

---

(١) ـ صحيح.

(٢) ـ جَامِعُ قَضَاءِ الصِّيَامِ.

(٣) ـ صحيح. أخرجه أبو مصعب الزهري: ٨٣٤؛ والحدثاني، ٤٧٣؛ والشافعي: ٨٢٨؛ وأبو داود: ٢٣٩٩، كلهم عن مالك به.

(٤) ـ صِيَامُ الْيَوْمِ الَّذِي يُشَكُّ فِيهِ.

قَالَ مالِكٌ ﷺ: وَهَذَا الأَمْرُ عِنْدَنَا، وَالَّذِي أَدْرَكْتُ عَلَيْهِ أَهْلَ الْعِلْمِ بِبَلَدِنَا[١].

(فەتوا): واتە: لە ئیمامی مالیکەوە ﷺ گێردراوەتەوە بەوەی گوێی لە زانایان بووە بە حەڕامیان داناوە و نەهییان کردووە لەوەی (مسوڵمان) ئەو ڕۆژە بەڕۆژوو بێت کە گومانی تیایە لە مانگی شەعبان (کە نازانرێ ئاخۆ ڕۆژی کۆتایی شەعبانە یان یەکەم ڕۆژی ڕەمەزانە)، ـ نەهییەکە لەو کاتەیە ـ ئەگەر نییەتی ڕۆژووی ڕەمەزانی لێ بێنێ، وە پێیان وا بووە ئەو کەسەی لەو ڕۆژە بەڕۆژوو دەبێت بەبێ بینینی مانگ و بەبێ زانیاری، دواتریش دەرچوو کە (ڕاست بووە) ڕۆژێك بووە لە ڕەمەزان، ئەوە قەزاکردنەوەی ئەو ڕۆژەی هەر لەسەرە (هەر چەندە بەڕۆژوووش بووە، چونکە بە زانیاری و نییەتێکی یەکلاکەرەوە بەڕۆژوو نەبووە)، وە پێیان وا نەبووە هیچ کێشەیەکی هەبێت ئەگەر بەنییەتی سوننەت بەڕۆژوو بێت تیایدا.

ئیمامی مالیك ﷺ گوتوویەتی: کارەکە لای ئێمەش هەر بەو شێوەیەیە و لەسەر ئەو بۆچوونە گەیشتووم بە زانایانی شارەکەمان (مەدینە).

## ٢٢- بابەتی جۆراوجۆری پەیوەست بە ڕۆژوو[٢]

**٨٥٩-** عَنْ عَائِشَةَ ﷺ، زَوْجِ النَّبِيِّ ﷺ، أَنَّهَا قَالَتْ: كَانَ رَسُولُ اللهِ ﷺ يَصُومُ، حَتَّى نَقُولَ لاَ يُفْطِرُ، وَيُفْطِرُ، حَتَّى نَقُولَ لاَ يَصُومُ، وَمَا رَأَيْتُ رَسُولَ اللهِ ﷺ اسْتَكْمَلَ صِيَامَ شَهْرٍ قَطُّ إِلاَّ رَمَضَانَ، وَمَا رَأَيْتُهُ فِي شَهْرٍ أَكْثَرَ صِيَامًا مِنْهُ فِي شَعْبَانَ[٣].

واتە: لە عائیشەی ﷺ خێزانی پێغەمبەرەوە ﷺ گێردراوەتەوە گوتوویەتی: پێغەمبەری خوا ﷺ (مانگی وا هەبوو) ئەوەندە بەڕۆژوو دەبوو، تاوەکوو دەمانگوت هیچی لێ ناخوات، وە (مانگی وا هەبوو) ئەوەندە بێڕۆژوو دەبوو، تاوەکوو

---

(١) ـ أخرجه أبو مصعب الزهري: ٨٣٦، عن مالك به.

(٢) ـ جَامِعُ الصِّيَامِ.

(٣) ـ صحيح. أخرجه أبو مصعب الزهري: ٨٥٢؛ والحدثاني: ٤٨٠؛ والشيباني: ٣٧٣؛ وابن حنبل: ٢٤٨٠١، وفي: ٢٦٠٩٥؛ والبخاري: ١٩٦٩؛ ومسلم: الصيام: ١٧٥؛ وأبو داود: ٢٤٣٤؛ وابن حبان: ٣٦٤٨؛ والقابسي: ٤٢٤، كلهم عن مالك به.

دەمانگوت هیچی لێ ناگرێت (کەچی لە هەردووکیاندا لە کۆتاییەکەی پێچەوانەی دەکردەوە)، جا هەرگیز پێغەمبەری خوام ﷺ نەبینیوە هیچ مانگێك بەتەواوی و تاسەر بەڕۆژوو بووبێت جگە لە ڕەمەزان، وە نەمبینیوە لە هیچ مانگێکدا ئەوەندە بەڕۆژوو بێت وەك مانگی شەعبان (مانگی پێش ڕەمەزان).

٨٦٠- عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ ﵁، أَنَّ رَسُولَ اللهِ ﷺ قَالَ: الصِّيَامُ جُنَّةٌ، فَإِذَا كَانَ أَحَدُكُمْ صَائِمًا، فَلاَ يَرْفُثْ، وَلاَ يَجْهَلْ، فَإِنِ امْرُؤٌ قَاتَلَهُ أَوْ شَاتَمَهُ، فَلْيَقُلْ: إِنِّي صَائِمٌ، إِنِّي صَائِمٌ[1].

واتە: لە ئەبو هورەیرەوە ﵁ گێڕدراوەتەوە (گوتوویەتی): پێغەمبەری خوا ﷺ فەرموویەتی: ڕۆژوو پارێزەر و قەڵغانە (لە دۆزەخ و خراپە و بێحیکمەتی و ... هتد)، جا کاتێ یەکێك لە ئێوە بەڕۆژوو بوو، ئەوە با قسەی نابەجێ و پڕوپوچ نەکات و کرداری نەزانانە ئەنجام نەدات، جا ئەگەر کەسێك لەگەڵی بەشەڕ هات یان جنێوی پێ دا، ئەوە با بڵێت: من بەڕۆژووم، من بەڕۆژووم.

٨٦١- عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ ﵁، أَنَّ رَسُولَ اللهِ ﷺ قَالَ: وَالَّذِي نَفْسِي بِيَدِهِ، لَخُلُوفُ فَمِ الصَّائِمِ أَطْيَبُ عِنْدَ اللهِ مِنْ رِيحِ الْمِسْكِ، إِنَّمَا يَذَرُ شَهْوَتَهُ وَطَعَامَهُ وَشَرَابَهُ مِنْ أَجْلِي، فَالصِّيَامُ لِي وَأَنَا أَجْزِي بِهِ، كُلُّ حَسَنَةٍ بِعَشْرِ أَمْثَالِهَا، إِلَى سَبْعِ مِئَةِ ضِعْفٍ، إِلاَّ الصِّيَامَ، فَهُوَ لِي وَأَنَا أَجْزِي بِهِ[2].

واتە: لە ئەبو هورەیرەوە ﵁ گێڕدراوەتەوە (گوتوویەتی): پێغەمبەری خوا ﷺ فەرموویەتی: سوێند بەو کەسەی گیانی منی بەدەستە گۆڕانی بۆنی دەمی ڕۆژووەوان لای خوای پەروەردگار ﷻ چاکترە لە بۆنی مسك، تەنها لە پێناوی من وازی هێناوە لە ئارەزووەکانی و خواردن و خواردنەوەی، ڕۆژوو بۆ منە و منیش پاداشتی دەدەمەوە، هەر چاکەیەك (پاداشتەکەی) بە دە ئەوەندەی خۆیەتی، تاوەکوو حەوت سەد ئەوەندە، تەنها ڕۆژوو نەبێ، بۆ منە و خۆم پاداشتی دەدەمەوە (بە پاداشتێکی بێشوماری لەناکاوی سەرسامکەر).

---

(١) ـ صحيح. أخرجه أبو مصعب الزهري: ٨٥٣؛ والحدثاني: ٤٨٠أ؛ وابن حنبل: ٩٩٩٩؛ وأبو داود: ٢٣٦٣؛ والقابسي: ٣٤٢، كلهم عن مالك به.

(٢) ـ صحيح. أخرجه أبو مصعب الزهري: ٨٥٤؛ والحدثاني: ٤٨١؛ وابن حنبل: ١٠٠٠٠، وفي: ١٠٧٠٤؛ والبخاري: ١٨٩٤؛ والقابسي: ٣٤٣، كلهم عن مالك به.




**٨٦٢-** عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ ﷺ، أَنَّهُ قَالَ: إِذَا دَخَلَ رَمَضَانُ، فُتِّحَتْ أَبْوَابُ الْجَنَّةِ، وَغُلِّقَتْ أَبْوَابُ النَّارِ، وَصُفِّدَتِ الشَّيَاطِينُ[١].

واتە: لە ئەبو هورەیرەوە ﷺ گێردراوەتەوە گوتوویەتی: کاتێ ڕەمەزان دێ، دەرگاکانی بەهەشت دەکرێنەوە و دەرگاکانی دۆزەخ دادەخرێن و شەیتانەکان کۆت و زنجیر دەکرێن.

**٨٦٣- [فتوى]** عَنْ مالِكٍ ﷺ، أَنَّهُ سَمِعَ أَهْلَ الْعِلْمِ لاَ يَكْرَهُونَ السِّوَاكَ لِلصَّائِمِ فِي رَمَضَانَ، فِي سَاعَةٍ مِنْ سَاعَاتِ النَّهَارِ، لاَ فِي أَوَّلِهِ وَلاَ فِي آخِرِهِ، وَلَمْ أَسْمَعْ أَحَدًا مِنْ أَهْلِ الْعِلْمِ يَكْرَهُ ذَلِكَ، وَلاَ يَنْهَى عَنْهُ[٢].

(فەتوا): واتە: لە ئیمامی مالیکەوە ﷺ گێردراوەتەوە بەوەی گوێی لە زانایان بووە سیواکیان بە ناپەسەند نەزانیوە بۆ کەسی ڕۆژووەوان لە ڕەمەزاندا، لە هیچ کاتێك لە کاتەکانی ڕۆژ، نە لە سەرەتاکەی و نە لە کۆتاییەکەی، وە گوێم لە هیچ یەکێك لە زانایان نەبووە ئەوەیان پێ ناپەسەند بێت یان نەهی لێ بکەن[٣].

**٨٦٤- [فتوى]** قَالَ يَحْيَى ﷺ: وسَمِعْتُ مَالِكًا ﷺ يَقُولُ فِي صِيَامِ سِتَّةِ أَيَّامٍ بَعْدَ الْفِطْرِ مِنْ رَمَضَانَ: إِنَّهُ لَمْ يَرَ أَحَدًا مِنْ أَهْلِ الْعِلْمِ وَالْفِقْهِ يَصُومُهَا، وَلَمْ يَبْلُغْنِي ذَلِكَ عَنْ أَحَدٍ مِنَ السَّلَفِ، وَإِنَّ أَهْلَ الْعِلْمِ يَكْرَهُونَ ذَلِكَ، وَيَخَافُونَ بِدْعَتَهُ، وَأَنْ يُلْحِقَ بِرَمَضَانَ مَا لَيْسَ مِنْهُ أَهْلُ الْجَهَالَةِ وَالْجَفَاءِ، لَوْ رَأَوْا فِي ذَلِكَ رُخْصَةً عِنْدَ أَهْلِ الْعِلْمِ، وَرَأَوْهُمْ يَعْمَلُونَ ذَلِكَ[٤].

(فەتوا): واتە: یەحیا ﷺ گوتوویەتی: گوێم لە ئیمامی مالیك ﷺ بوو دەربارەی شەش ڕۆژووەکانی دوای جەژنی ڕەمەزان (کە لە کوردەواری پێی دەگوترێ شەشەڵان یان شەشەران) دەیگوت: هیچ کەسێك لە زانایان و شەرعزانانی نەبینیوە بەڕۆژوو بن، وە پێم نەگەیشتووە لە هیچ یەکێك لە پێشینە چاکەکان، وە زانایان

---

(١) ـ صحيح. أخرجه أبو مصعب الزهري: ٨٥٥؛ والحدثاني: ٤٨٢، عن مالك به.

(٢) ـ أخرجه أبو مصعب الزهري: ٨٥٦، عن مالك به.

(٣) ـ تێبینی: ئیمامی نەوەویش دەڵێ: ناپەسەند نییە، فەتوای مەزهەبی شافیعیش لەسەر ئەوەیە.

(٤) ـ أخرجه أبو مصعب الزهري: ٨٥٧، عن مالك به.




ئەوەیان پێ ناپەسەند بووە و ترساون بیدعە بێت و خەڵکی نەزان و داخراو و وشك بیلکێنن بە ڕەمەزانەوە (واتە ترساون جەژنیش بەڕۆژوو بن) ئەگەر ببینن ڕێپێدان (بۆ شەشەران) هەیە لەلایەن زانایانەوە و ببینن ئەوان ئەنجامی دەدەن.

٨٦٥- **[فتوى]** قَالَ يَحْيَى ﷺ: سَمِعْتُ مَالِكًا ﷺ يَقُولُ: لَمْ أَسْمَعْ أَحَدًا مِنْ أَهْلِ الْعِلْمِ وَالْفِقْهِ، وَمَنْ يُقْتَدَى بِهِ، يَنْهَى عَنْ صِيَامِ يَوْمِ الْجُمُعَةِ، وَصِيَامُهُ حَسَنٌ، وَقَدْ رَأَيْتُ بَعْضَ أَهْلِ الْعِلْمِ يَصُومُهُ، وَأُرَاهُ كَانَ يَتَحَرَّاهُ[1].

(فەتوا): واتە: یەحیا ﷺ گوتوویەتی: گوێم لە ئیمامی مالیك ﷺ بوو دەیگوت: گوێم لە هیچ یەکێك لە زانایان و شەرعزانان و ئەو کەسانەی پێشەنگن نەبووە نەهی بکات لە ڕۆژووی ڕۆژی هەینی، وە ڕۆژووگرتنەکەی چاکە، وە یەکێك لە زانایانم بینیوە گرتوویەتی، پێم وایە بەئەنقەست ڕۆژووی هەینی دەگرت.

---

(١) ـ أخرجه أبو مصعب الزهري: ٨٥٨، عن مالك به.




## ١- باسی ئیعتیکاف[(١)]

**٨٦٦-** عَنْ عَائِشَةَ ﵂، زَوْجِ النَّبِيِّ ﷺ، أَنَّهَا قَالَتْ: كَانَ رَسُولُ اللهِ ﷺ إِذَا اعْتَكَفَ يُدْنِي إِلَيَّ رَأْسَهُ، فَأُرَجِّلُهُ، وَكَانَ لاَ يَدْخُلُ الْبَيْتَ إِلاَّ لِحَاجَةِ الإِنْسَانِ[(٢)].

واتە: لە عائیشەی ﵂ خێزانی پێغەمبەرەوە ﷺ گێردراوەتەوە گوتوویەتی: پێغەمبەری خوا ﷺ کاتێ ئیعتیکافی دەکرد سەری (لە دەلاقەی مزگەوتەوە) بۆ نزیك دەکردمەوە، منیش بۆم شانە دەکرد و دادەهێنا، جا نەدەهاتە ماڵەوە تەنها بۆ پێویستییەکی زەروری مرۆیی نەبێت.

**٨٦٧-** عَنْ عَمْرَةَ بِنْتِ عَبْدِ الرَّحْمَنِ ﵀، أَنَّ عَائِشَةَ ﵂ كَانَتْ إِذَا اعْتَكَفَتْ لاَ تَسْأَلُ عَنِ الْمَرِيضِ، إِلاَّ وَهِيَ تَمْشِي لاَ تَقِفُ[(٣)].

واتە: لە عەمرەی کچی عەبدوڕڕەحمانەوە ﵀ گێردراوەتەوە (گوتوویەتی): عائیشە ﵂ هەموو جار کاتێ ئیعتیکافی دەکرد حاڵی کەسانی نەخۆشی نەدەپرسی (تا بە سەردان حیساب نەبێت)، تەنها لەو حاڵەتەدا نەبێت کە لە ڕۆیشتندا بوو و نەدەوەستا، (چونکە وەستان بۆ نەخۆش بە سەردانیکردن حیسابە و سەردانیکردنیش ئیعتیکاف دەپچڕێنێ و بەتاڵی دەکاتەوە).

**٨٦٨- [فتوى]** قَالَ مَالِكٌ ﵀: لاَ يَأْتِي الْمُعْتَكِفُ حَاجَتَهُ، وَلاَ يَخْرُجُ لَهَا، وَلاَ يُعِينُ أَحَدًا، إِلاَّ أَنْ يَخْرُجَ لِحَاجَةِ الإِنْسَانِ، وَلَوْ كَانَ خَارِجًا لِحَاجَةِ أَحَدٍ، لَكَانَ أَحَقَّ مَا يُخْرَجُ إِلَيْهِ عِيَادَةُ الْمَرِيضِ، وَالصَّلاَةُ عَلَى الْجَنَائِزِ، وَاتِّبَاعُهَا[(٤)].

---

(١) ـ ذِكْرُ الِاعْتِكَافِ.

(٢) ـ صحيح. أخرجه أبو مصعب الزهري: ٨٦٠؛ والحدثاني: ٤٤٧؛ والشيباني: ٣٧٧؛ وابن حنبل: ٢٤٧٧٥، وفي: ٢٥٥٢٣، وفي: ٢٦٣٠٤؛ ومسلم: المقدمة: ٨٨٧؛ ومسلم، الحيض: ٦؛ وأبو داود: ٢٤٦٧؛ والترمذي: ٨٠٤؛ وابن حبان: ٣٦٧٢؛ والقابسي: ٤٦، كلهم عن مالك به.

(٣) ـ صحيح. أخرجه أبو مصعب الزهري: ٨٦١؛ والحدثاني: ٤٤٧أ، كلهم عن مالك به.

(٤) ـ أخرجه أبو مصعب الزهري: ٨٦٣، عن مالك به.

(فەتوا): واتە: ئیمامی مالیك ﷺ گوتوویەتی: ئەو کەسەی لە ئیعتیکافدایە بەدەم پێویستیەکانییەوە ناچێت و بۆ پێویستییەکانی دەرناچێت و یارمەتی کەس نادات، تەنها بۆی هەیە دەربچێت بۆ پێویستییە مرۆییە زەرورییەکان و واجبە عەینییەکان (وەك خۆشۆردنی واجب و چوونە سەرئاو و ... هتد)، جا ئەگەر (بۆی دروست بووایە) دەربچێت بۆ پێویستی خەڵکی، ئەوە شایستەترین شت بۆ دەرچوون بریتی دەبوو لە سەردانی نەخۆش و نوێژکردن لەسەر جەنازە و شوێنکەوتنی (کەچی دروست نییە و ئیعتیکافەکە دەپچڕێنێت).

**٨٦٩- [فتوى] قَالَ مَالِكٌ ﷺ: وَلاَ يَكُونُ الْمُعْتَكِفُ مُعْتَكِفًا حَتَّى يَجْتَنِبَ مَا يَجْتَنِبُ الْمُعْتَكِفُ مِنْ عِيَادَةِ الْمَرِيضِ، وَالصَّلاَةِ عَلَى الْجَنَائِزِ، وَدُخُولِ الْبَيْتِ، إِلاَّ لِحَاجَةِ الإِنْسَانِ[1].**

(فەتوا): واتە: ئیمامی مالیك ﷺ گوتوویەتی: کەسی ئیعتیکافکار نابێتە ئیعتیکافکار تاوەکوو خۆی دوور نەگرێت لەوەی کەسی ئیعتیکافکار خۆی لێ بەدوور دەگرێت لە: سەردانیکردنی نەخۆش و نوێژکردن لەسەر جەنازە و چوونەوە ماڵەوە، تەنها بۆ پێویستییە مرۆییەکان و واجبە عەینییەکان نەبێت (وەك خۆشۆردنی واجب و چوونە سەرئاو و ... هتد).

**٨٧٠- عَنْ مَالِكٍ ﷺ، أَنَّهُ سَأَلَ ابْنَ شِهَابٍ ﷺ عَنِ الرَّجُلِ يَعْتَكِفُ، هَلْ يَدْخُلُ لِحَاجَتِهِ تَحْتَ سَقْفٍ؟ فَقَالَ: نَعَمْ، لاَ بَأْسَ بِذَلِكَ[2].**

واتە: لە ئیمامی مالیکەوە ﷺ گێڕدراوەتەوە پرسیاری لە ئیبنو شیهاب ﷺ کردووە دەربارەی ئەو کەسەی ئیعتیکاف دەکات، کە ئاخۆ دروستە بۆ پێویستییەکانی دەربچێت (بۆ شوێنی دیکە) لەژێر یەك سەقف؟ ئەویش گوتی: بەڵێ، هیچ کێشەی نییە (چونکە بە هەمان شوێن حیسابە).

**٨٧١- [فتوى] قَالَ مَالِكٌ ﷺ: الأَمْرُ عِنْدَنَا الَّذِي لاَ اخْتِلاَفَ فِيهِ، أَنَّهُ لاَ يُكْرَهُ الاعْتِكَافُ فِي كُلِّ مَسْجِدٍ يُجَمَّعُ فِيهِ، وَلاَ أُرَاهُ كُرِهَ الاعْتِكَافُ فِي الْمَسَاجِدِ الَّتِي لاَ يُجَمَّعُ فِيهَا، إِلاَّ كَرَاهِيَةَ أَنْ**

---

(١) ـ أخرجه أبو مصعب الزهري: ٨٦٤، عن مالك به.

(٢) ـ مقطوع صحيح. أخرجه أبو مصعب الزهري: ٨٦٢؛ والحدثاني: ٤٤٧ب؛ والشيباني: ٣٧٩، كلهم عن مالك به.




يَخْرُجَ الْمُعْتَكِفُ مِنْ مَسْجِدِهِ الَّذِي اعْتَكَفَ فِيهِ، إِلَى الْجُمُعَةِ أَوْ يَدَعَهَا، فَإِنْ كَانَ مَسْجِدًا لاَ تُجَمَّعُ فِيهِ الْجُمُعَةُ، وَلاَ يَجِبُ عَلَى صَاحِبِهِ إِتْيَانُ الْجُمُعَةِ فِي مَسْجِدٍ سِوَاهُ، فَإِنِّي لاَ أَرَى بَأْسًا بِالاعْتِكَافِ فِيهِ، لأَنَّ اللهَ ﷻ قَالَ: ﴿وَأَنتُمْ عَٰكِفُونَ فِى ٱلْمَسَٰجِدِ ﴿١٨٧﴾﴾البقرة، فَعَمَّ اللهُ الْمَسَاجِدَ كُلَّهَا، وَلَمْ يَخَصَّصْ شَيْئًا مِنْهَا[1].

قَالَ مَالِكٌ ﷺ: فَمِنْ هُنَالِكَ جَازَ لَهُ أَنْ يَعْتَكِفَ فِي الْمَسَاجِدِ الَّتِي لاَ تُجَمَّعُ فِيهَا الْجُمُعَةُ، إِذَا كَانَ لاَ يَجِبُ عَلَيْهِ أَنْ يَخْرُجَ مِنْهُ إِلَى الْمَسْجِدِ الَّذِي تُجَمَّعُ فِيهِ الْجُمُعَةُ.

قَالَ مَالِكٌ ﷺ: وَلاَ يَبِيتُ الْمُعْتَكِفُ إِلاَّ فِي الْمَسْجِدِ الَّذِي اعْتَكَفَ فِيهِ، إِلاَّ أَنْ يَكُونَ خِبَاؤُهُ فِي رَحَبَةٍ مِنْ رِحَابِ الْمَسْجِدِ.

قَالَ مَالِكٌ ﷺ: وَلَمْ أَسْمَعْ أَنَّ الْمُعْتَكِفَ يَضْرِبُ بِنَاءً يَبِيتُ فِيهِ، إِلاَّ فِي الْمَسْجِدِ، أَوْ فِي رَحَبَةٍ مِنْ رِحَابِ الْمَسْجِدِ.

وَمِمَّا يَدُلُّ عَلَى أَنَّهُ لاَ يَبِيتُ إِلاَّ فِي الْمَسْجِدِ، قَوْلُ عَائِشَةَ: كَانَ رَسُولُ اللهِ ﷺ إِذَا اعْتَكَفَ لاَ يَدْخُلُ الْبَيْتَ، إِلاَّ لِحَاجَةِ الإِنْسَانِ[2].

(فەتوا): واتە: ئیمامی مالیك ﷺ گوتوویەتی: ئەو بابەتەی لەلای ئێمە ڕاجیایی تیا نییە ئەوەیە: ئیعتیكاف كەڕاهەتی نییە لە هەر مزگەوتێك بێت كە هەینی تێدا ئەنجام بدرێ، وە پێم وا نییە ئیعتیكاف كەڕاهەتی هەبێت لەو مزگەوتانەش كە هەینییان تێدا ئەنجام نادرێ، تەنها كەڕاهەتی ئەوە نەبێت كە كەسی ئیعتیكافكار لەو مزگەوتەی ئیعتیكافی تێدا كردووە دەربچێت و بۆ هەینی بڕوات (بۆ مزگەوتێكی دیكە، بەمەش ئیعتیكافەكەی بەتاڵ دەبێتەوە) یان واز لە هەینی بێنێ (كە ئەوەش حەڕامە و گوناهێكی گەورەیە)، جا ئەگەر ئیعتیكافەكە لە مزگەوتێك بوو هەینی تێدا ئەنجام نەدەدرا و خاوەنەكەشی لەسەری واجب نەبوو بچێتە هەینی بۆ مزگەوتی دیكە (وەك ئەوەی موسافیر بێ)، ئەوە من هیچ كێشەیەك نابینم بەوەی ئیعتیكافی تێدا بكرێ، چونكە خوای پەروەردگار فەرموویەتی: ﴿وَأَنتُمْ عَٰكِفُونَ

---

(١) ـ أخرجه أبو مصعب الزهري: ٨٧١، عن مالك به.

(٢) ـ أخرجه أبو مصعب الزهري: ٨٧٢، عن مالك به.

فِي ٱلْمَسَٰجِدِ ﴿١٨٧﴾ البقرة، خوای پەروەردگار مزگەوتەکانی گشتاندووە و هیچی تایبەت نەکردووە.

ئیمامی مالیك ﷺ گوتوویەتی: لەو ڕوانگەیەوە بۆی دروستە ئیعتیکاف لە مزگەوتێك ئەنجام بدات کە هەینی تێدا ئەنجام نەدرێت ئەگەر لەسەری واجب نەبێت لێیەوە دەربچێت بۆ مزگەوتێکی دیکە کە هەینی تێدا ئەنجام دەدرێت.

ئیمامی مالیك ﷺ گوتوویەتی: کەسی ئیعتیکافکار شەو لە هیچ جێگەیەك نامێنێتەوە تەنها لەناو ئەو مزگەوتە نەبێت کە ئیعتیکافی تێدا ئەنجام داوە، مەگەر خێمەکەی لە شوێنێکی حەوشەی مزگەوت بێت (واتە ئەگەر لەناو مزگەوتەکەش نەبێ، بەڵکوو هەندێ کات لەناو خێمەکەی بێت لە حەوشەی مزگەوتەکە هەر دروستە، چونکە هەر بە مزگەوت حیسابە، بەڵام لە دەرەوەی حەوشە دروست نییە و ئیعتیکافەکە بەتاڵ دەبێتەوە).

وە یەکێك لە بەڵگەکان کە دەلالەت دەکەن لەسەر ئەوەی نابێ شەو بمێنێتەوە لە مزگەوتدا نەبێ، قسەی عائیشەیە ﷺ کە گوتوویەتی: پێغەمبەری خوا ﷺ کاتێ ئیعتیکافی دەکرد نەدەهاتەوەماڵەوە تەنها بۆ پێویستییەکی مرۆیی نەبووایە.

**٨٧٢- [فتوى]** قَالَ مَالِكٌ ﷺ: وَلاَ يَعْتَكِفُ فَوْقَ ظَهْرِ الْمَسْجِدِ، وَلاَ فِي الْمَنَارِ، يَعْنِي: الصَّوْمَعَةَ[١].

(فەتوا): واتە: ئیمامی مالیك ﷺ گوتوویەتی: (کەسی ئیعتیکافکار) ئیعتیکاف ناکات لە سەربانی مزگەوت و لەناو منارە (چونکە نوێژی تێدا ئەنجام نادرێ و بە حەرەمی مزگەوت حیساب نییە، کەواتە لەلای ئیمامی مالیك ﷺ بۆ ئیعتیکاف ناشێت).

**٨٧٣- [فتوى]** قَالَ مَالِكٌ ﷺ: يَدْخُلُ الْمُعْتَكِفُ الْمَكَانَ الَّذِي يُرِيدُ أَنْ يَعْتَكِفَ فِيهِ، قَبْلَ غُرُوبِ الشَّمْسِ مِنَ اللَّيْلَةِ الَّتِي يُرِيدُ أَنْ يَعْتَكِفَ فِيهَا، حَتَّى يَسْتَقْبِلَ بِاعْتِكَافِهِ أَوَّلَ اللَّيْلَةِ الَّتِي يُرِيدُ أَنْ يَعْتَكِفَ فِيهَا[٢].

---

(١) ـ أخرجه أبو مصعب الزهري: ٨٧٢، عن مالك به.

(٢) ـ أخرجه أبو مصعب الزهري: ٨٦٦، عن مالك به.

(فەتوا): واتە: ئیمامی مالیك ﷺ گوتوویەتی: کەسی ئیعتیکافکار (ئەگەر نیازی وا بوو بەشەو ئیعتیکاف بکات) دەبێ بچێتە ئەو شوێنەی دەیەوێ ئیعتیکافی تێدا بکات پێش ئەوەی خۆر ئاوا بێت بۆ ئەو شەوەی دەیەوێ ئیعتیکافی تێدا بکات، تاوەکوو دەست بە ئیعتیکافەکەی بکات لە سەرەتای ئەو شەوەی دەیەوێت ئیعتیکافی تێدا بکات.

٨٧٤- **[فتوى]** قَالَ مَالِكٌ ﷺ: وَالْمُعْتَكِفُ مُشْتَغِلٌ بِاعْتِكَافِهِ، لاَ يَعْرِضُ لِغَيْرِهِ مِمَّا يَشْتَغِلُ بِهِ مِنَ التِّجَارَاتِ، أَوْ غَيْرِهَا، وَلاَ بَأْسَ بِأَنْ يَأْمُرَ الْمُعْتَكِفُ بِبَعْضِ حَاجَتِهِ بِضَيْعَتِهِ، وَمَصْلَحَةِ أَهْلِهِ، وَأَنْ يَأْمُرَ بِبَيْعِ مَالِهِ، أَوْ بِشَيْءٍ لاَ يَشْغَلُهُ فِي نَفْسِهِ، فَلاَ بَأْسَ بِذَلِكَ إِذَا كَانَ خَفِيفًا، أَنْ يَأْمُرَ بِذَلِكَ مَنْ يَكْفِيهِ إِيَّاهُ[1].

(فەتوا): واتە: ئیمامی مالیك ﷺ گوتوویەتی: کەسی ئیعتیکافکار دەبێ سەرقاڵ بێت بە ئیعتیکافەکەیەوە، نابێ خۆی سەرقاڵ بکات بە شتی جگە لە ئیعتیکاف لەو شتانەی (ڕۆژانە) پێیەوە سەرقاڵە: لە (کار و کەسابەت) و بازرگانی و شتی دیکە، وە کێشەی تێدا نییە بەوەی کەسی ئیعتیکافکار فەرمان بکات بە جێبەجێکردنی پیشەکەی و بەرژەوەندی و پێویستی خانەوادەکەی و بە فەرمانکردنی بە فرۆشتنی ماڵەکەی یان بە شتێك کە خۆی سەرقاڵ نەکات پێوەی، ئەوانە هیچ کێشەیان تێدا نییە ئەگەر سووك و کەم بن بەوەی فەرمان بە کەسێك بکات بۆی جێبەجێ بکات.

٨٧٥- **[فتوى]** قَالَ مَالِكٌ ﷺ: لَمْ أَسْمَعْ أَحَدًا مِنْ أَهْلِ الْعِلْمِ يَذْكُرُ فِي الاعْتِكَافِ شَرْطًا، وَإِنَّمَا الاعْتِكَافُ عَمَلٌ مِنَ الأَعْمَالِ مِثْلُ: الصَّلاَةِ، وَالصِّيَامِ، وَالْحَجِّ، وَمَا أَشْبَهَ ذَلِكَ مِنَ الأَعْمَالِ، مَا كَانَ مِنْ ذَلِكَ فَرِيضَةً أَوْ نَافِلَةً، فَمَنْ دَخَلَ فِي شَيْءٍ مِنْ ذَلِكَ، فَإِنَّمَا يَعْمَلُ بِمَا مَضَى مِنَ السُّنَّةِ، وَلَيْسَ لَهُ أَنْ يُحْدِثَ فِي ذَلِكَ غَيْرَ مَا مَضَى عَلَيْهِ الْمُسْلِمُونَ، لاَ مِنْ شَرْطٍ يَشْتَرِطُهُ وَلاَ يَبْتَدِعُهُ، وَقَدِ اعْتَكَفَ رَسُولُ اللهِ ﷺ، وَعَرَفَ الْمُسْلِمُونَ سُنَّةَ الاعْتِكَافِ[2].

(فەتوا): واتە: لە ئیمامی مالیکەوە ﷺ گێڕدراوەتەوە گوتوویەتی: گوێم لە هیچ یەکێك لە زانایان نەبووە مەرجێك لە ئیعتیکافدا باس بکات، چونکە ئیعتیکاف

---

(١) ـ أخرجه أبو مصعب الزهري: ٨٦٥؛ وفي: ٨٧٠، كلهم عن مالك به.

(٢) ـ أخرجه أبو مصعب الزهري: ٨٦٧، عن مالك به.

عیبادەت و كردارێكە لە كردارەكانی وەك: نوێژ و ڕۆژوو و حەج و هاوشێوەی ئەو كردارانە، واجب بێت یان سوننەت، جا هەر كەسێك چووە ناو جێبەجێكردنی شتێك لەمانە، ئەوە دەبێ جێبەجێی بكات (بەو شێوەیەی) ئەنجام دراوە بەپێی ڕێباز و شێوازی پێغەمبەری خوا ﷺ، وە بۆی نییە لەوەدا شتێك دابهێنێت جگە لەوەی مسوڵمانان لەسەری ڕۆیشتوون، نە دەبێت مەرجێك دابنێت و نە بیدعەیەك زیاد بكات، پێغەمبەری خوا ﷺ ئیعتیكافی كردووە و مسوڵمانانیش شێوازی ئیعتیكافەكە دەزانن (بابەتەكە ڕوونە).

**٨٧٦- [فتوى]** قَالَ مَالِكٌ ﷺ: وَالاِعْتِكَافُ وَالْجِوَارُ سَوَاءٌ، وَالاِعْتِكَافُ لِلْقَرَوِيِّ وَالْبَدَوِيِّ سَوَاءٌ[١].

(فەتوا): واتە: ئیمامی مالیك ﷺ گوتوویەتی: شوێنی ئیعتیكاف و تەنیشتی شوێنەكە وەكوو یەكن (بەمەرجێك ئەگەر موڵكی كەسەكە بێ، وەك خانوو، واتە دروستە بۆ پێویستییە مرۆییە زەرورییەكان بچێتە ئەوێ و بگەڕێتەوە)، وە ئیعتیكاف بۆ كەسی شارنشین و گوندنشین و كەسی ڕەشماڵنشین وەكوو یەكە (لە ڕووی ئەحكامەوە).

## ٢- ئەو شتەی بەبێ ئەو ئیعتیكاف دروست نییە[٢]

**٨٧٧-** عَنْ مَالِكٍ ﷺ؛ أَنَّهُ بَلَغَهُ، أَنَّ الْقَاسِمَ بْنَ مُحَمَّدٍ، وَنَافِعًا، مَوْلَى عَبْدِ اللهِ بْنِ عُمَرَ ﷺ قَالاَ: لاَ اعْتِكَافَ إِلاَّ بِصِيَامٍ، لِقَوْلِ اللهِ ﷻ فِي كِتَابِهِ: ﴿ وَكُلُوا۟ وَٱشْرَبُوا۟ حَتَّىٰ يَتَبَيَّنَ لَكُمُ ٱلْخَيْطُ ٱلْأَبْيَضُ مِنَ ٱلْخَيْطِ ٱلْأَسْوَدِ مِنَ ٱلْفَجْرِ ۖ ثُمَّ أَتِمُّوا۟ ٱلصِّيَامَ إِلَى ٱلَّيْلِ ۚ وَلَا تُبَٰشِرُوهُنَّ وَأَنتُمْ عَٰكِفُونَ فِى ٱلْمَسَٰجِدِ ﴿١٨٧﴾ ﴾ البقرة، فَإِنَّمَا ذَكَرَ اللهُ الاِعْتِكَافَ مَعَ الصِّيَامِ[٣].

قَالَ مَالِكٌ ﷺ: وَعَلَى ذَلِكَ الأَمْرُ عِنْدَنَا أَنَّهُ لاَ اعْتِكَافَ إِلاَّ بِصِيَامٍ[٤].

---

(١) ـ أخرجه أبو مصعب الزهري: ٨٦٨، عن مالك به.

(٢) ـ مَا لَا يَجُوزُ الاِعْتِكَافُ إِلاَّ بِهِ.

(٣) ـ مقطوع ضعيف. أخرجه أبو مصعب الزهري: ٨٧٣ في الصيام: عن مالك به.

(٤) ـ أخرجه أبو مصعب الزهري: ٨٧٣ في الصيام: عن مالك به.

واتە: لە ئیمامی مالیكەوە ﷺ گێڕدراوەتەوە پێی گەیشتووە قاسمی كوڕی موحەممەد و نافیعی خزمەتكاری عەبدوڵڵای كوڕی عومەر ﷺ گوتوویانە: هیچ ئیعتیكافێك دروست نابێت تەنها بەڕۆژووەوە نەبێ، لەبەر وتەی خوای پەروەردگار لە پەرتووكەكەیدا كە فەرموویەتی: ﴿ وَكُلُوا وَاشْرَبُوا حَتَّىٰ يَتَبَيَّنَ لَكُمُ الْخَيْطُ الْأَبْيَضُ مِنَ الْخَيْطِ الْأَسْوَدِ مِنَ الْفَجْرِ ۖ ثُمَّ أَتِمُّوا الصِّيَامَ إِلَى اللَّيْلِ ۚ وَلَا تُبَاشِرُوهُنَّ وَأَنتُمْ عَاكِفُونَ فِي الْمَسَاجِدِ ﴿١٨٧﴾ ﴾ البقرة، واتە: (جا بخۆن و بخۆنەوە هەتا بەڕوونی بەرەبەیان و سپێدەتان بۆ دەردەكەوێت و لە ڕۆژهەڵاتەوە دەردەكەوێت و تاریكی شەو لادەدات، لەوێ بەولاوە ڕۆژووەكەتان ببەنە سەر تا شەو دادێ، وە لە هاوسەرانتان نزیك مەكەونەوە ـ جیماعیان لەگەڵ مەكەن ـ لە كاتێكدا ئیعتیكافتان كردووە لە مزگەوتەكاندا) خوای پەروەردگار تەنها ئیعتیكافی لەگەڵ ڕۆژوو باس كردووە.

ئیمامی مالیك ﷺ گوتوویەتی: بابەتەكە لەلای ئێمە لەسەر ئەو بۆچوونەیە كە هیچ ئیعتیكافێك بەبێ ڕۆژوو بوونی نییە.

### ٣- دەرچوونی كەسی ئیعتیكافكار بۆ نوێژی جەژن[١]

**٨٧٨- عَنْ سُمَيٍّ، مَوْلَى أَبِي بَكْرِ بْنِ عَبْدِ الرَّحْمَنِ ﷺ، أَنَّ أَبَا بَكْرِ بْنَ عَبْدِ الرَّحْمَنِ ﷺ اعْتَكَفَ، فَكَانَ يَذْهَبُ لِحَاجَتِهِ تَحْتَ سَقِيفَةٍ فِي حُجْرَةٍ مُغْلَقَةٍ، فِي دَارِ خَالِدِ بْنِ الْوَلِيدِ، ثُمَّ لاَ يَرْجِعُ حَتَّى يَشْهَدَ الْعِيدَ مَعَ الْمُسْلِمِينَ[٢].**

واتە: لە سومەیی خزمەتكاری ئەبو بەكری كوڕی عەبدوڕڕەحمانەوە ﷺ گێڕدراوەتەوە (گوتوویەتی): ئەبو بەكری كوڕی عەبدوڕڕەحمان ﷺ ئیعتیكافی كرد، جا دەهات و دەچوو بۆ پێویستییە زەرورییەكانی لەژێر یەك سەقف لە ژوورێكی داخراو، لە خانووی خالیدی كوڕی وەلید، دواتریش نەدەگەڕایەوە بۆماڵەوە تاوەكوو لەگەڵ مسوڵمانان ئامادەی نوێژی جەژن دەبوو.

---

(١) ـ خُرُوجُ الْمُعْتَكِفِ لِلْعِيدِ.

(٢) ـ مقطوع صحيح. أخرجه أبو مصعب الزهري: ٨٧٤؛ والحدثاني: ٤٤٨، عن مالك به.

**٨٧٩- [فتوى]** عَنْ زِيَادٍ ﷺ، عَنْ مَالِكٍ ﷺ، أَنَّهُ رَأَى بَعْضَ أَهْلِ الْعِلْمِ إِذَا اعْتَكَفُوا الْعَشْرَ الْأَوَاخِرَ مِنْ رَمَضَانَ، لاَ يَرْجِعُونَ إِلَى أَهَالِيهِمْ حَتَّى يَشْهَدُوا الْفِطْرَ مَعَ النَّاسِ[1].

قَالَ زِيَادٌ ﷺ: قَالَ مَالِكٌ ﷺ: وَبَلَغَنِي ذَلِكَ عَنْ أَهْلِ الْفَضْلِ الَّذِينَ مَضَوْا.

قَالَ زِيَادٌ ﷺ: قَالَ مَالِكٌ ﷺ: وَهَذَا أَحَبُّ مَا سَمِعْتُ إِلَيَّ فِي ذَلِكَ.

(فەتوا): واتە: لە زیادەوە ﷺ گێڕدراوەتەوە، ئەویش لە ئیمامی مالیکەوە ﷺ گێڕاویەتەوە کە هەندێك لە زانایانی بینیوە کاتێ لە دە شەوەکانی کۆتایی لە ڕەمەزان ئیعتیکافیان دەکرد، نەدەگەڕانەوە لای خانەوادەکانیان تاوەکوو ئامادەی نوێژی جەژن دەبوون لەگەڵ خەڵکی.

زیاد ﷺ گوتوویەتی: ئیمامی مالیك ﷺ گوتوویەتی: ئەوەم لە خەڵکی چاك پێ گەیشتووە کە وەفاتیان کردووە و نەماون.

زیاد ﷺ گوتوویەتی: ئیمامی مالیك ﷺ گوتوویەتی: ئەوە چاکترین و خۆشەویستترینی ئەوەیە لەلام کە گوێم لێ بووە دەربارەی ئەو بابەتە.

### ٤- قەزاکردنەوەی ئیعتیکاف[2]

**٨٨٠-** عَنْ عَمْرَةَ بِنْتِ عَبْدِ الرَّحْمَنِ ﷺ، أَنَّ رَسُولَ اللهِ ﷺ أَرَادَ أَنْ يَعْتَكِفَ، فَلَمَّا انْصَرَفَ إِلَى الْمَكَانِ الَّذِي أَرَادَ أَنْ يَعْتَكِفَ فِيهِ، وَجَدَ أَخْبِيَةً: خِبَاءَ عَائِشَةَ، وَخِبَاءَ حَفْصَةَ، وَخِبَاءَ زَيْنَبَ، فَلَمَّا رَآهَا سَأَلَ عَنْهَا، فَقِيلَ لَهُ: هَذَا خِبَاءُ عَائِشَةَ، وَحَفْصَةَ، وَزَيْنَبَ، فَقَالَ رَسُولُ اللهِ ﷺ: آلْبِرَّ تَقُولُونَ بِهِنَّ؟ ثُمَّ انْصَرَفَ، فَلَمْ يَعْتَكِفْ، حَتَّى اعْتَكَفَ عَشْرًا مِنْ شَوَّالٍ[3].

واتە: لە عەمرەی کچی عەبدوڕڕەحمانەوە ﷺ گێڕدراوەتەوە (گوتوویەتی): پێغەمبەری خوا ﷺ ویستی ئیعتیکاف بکات، جا کاتێ چوو بۆ ئەو شوێنەی کە

---

(١) ـ أخرجه أبو مصعب الزهري: ٨٧٥؛ والحدثاني: ٤٤٨أ، عن مالك به.

(٢) ـ قَضَاءُ الِاعْتِكَافِ.

(٣) ـ شاذ، وهو صحيح بطريقة أخرى. أخرجه أبو مصعب الزهري: ٨٧٦؛ والبخاري: ٢٠٣٤، عن مالك به.




دەیەویست ئیعتیکافی تێدا بکات، چەند خێمەیەکی بینی: خێمەی عائیشە و خێمەی حەفصە و خێمەی زەینەب (خوا لێیان ڕازی بێ)، جا کاتێ خێمەکانی بینی پرسیاری دەربارە کردن (کە ئاخۆ هی کێن)؟ جا پێی گوترا: خێمەی عائیشە و حەفصە و زەینەبە ﷺ، پێغەمبەری خواش ﷺ فەرمووی: ئایا گومانی چاکەیان پێ دەبەن (واتە ترسا لەوەی لە چاولێکەری یەکدی ئیعتیکافیان کردبێ)؟! جا پێغەمبەری خوا ﷺ ئیعتیکافی نەکرد (لەو ڕەمەزانەدا)، تاوەکوو مانگی شەوال هات، ئینجا دە شەو لە مانگی شەوال ئیعتیکافی کرد (بۆ قەرەبووکردنەوەی ئیعتیکافی ڕەمەزان).

٨٨١- **[فتوى]** وَسُئِلَ مَالِكٌ ﷺ عَنْ رَجُلٍ دَخَلَ الْمَسْجِدَ لِعُكُوفٍ فِي الْعَشْرِ الأَوَاخِرِ مِنْ رَمَضَانَ، فَأَقَامَ يَوْمًا أَوْ يَوْمَيْنِ، ثُمَّ مَرِضَ فَخَرَجَ مِنَ الْمَسْجِدِ، أَيَجِبُ عَلَيْهِ أَنْ يَعْتَكِفَ مَا بَقِيَ مِنَ الْعَشْرِ إِذَا صَحَّ، أَمْ لاَ يَجِبُ ذَلِكَ عَلَيْهِ؟ وَفِي أَيِّ شَهْرٍ يَعْتَكِفُ إِنْ وَجَبَ عَلَيْهِ ذَلِكَ؟ فَقَالَ مَالِكٌ ﷺ: يَقْضِي مَا وَجَبَ عَلَيْهِ مِنْ عُكُوفٍ، إِذَا صَحَّ فِي رَمَضَانَ أَوْ غَيْرِهِ، وَقَدْ بَلَغَنِي أَنَّ رَسُولَ اللهِ ﷺ أَرَادَ الْعُكُوفَ فِي رَمَضَانَ، ثُمَّ رَجَعَ، فَلَمْ يَعْتَكِفْ، حَتَّى إِذَا ذَهَبَ رَمَضَانُ اعْتَكَفَ عَشْرًا مِنْ شَوَّالٍ[(١)].

(فەتوا): واتە: ئیمامی مالیك ﷺ دەربارەی کەسێك کە دەچێتە مزگەوت بۆ ئیعتیکاف لە دە شەوەکانی کۆتایی ڕەمەزان، جا ڕۆژێك یان دوو ڕۆژ (لەناو مزگەوت) مایەوە، دواتر نەخۆشکەوت و چووە دەرەوە لە مزگەوت، ئایا لەسەری واجبە ئەو ماوەیەی لە دە شەو و ڕۆژەکە دەمێنێتەوە تەواوی بکات (کە لەبەر نەخۆشی نەیتوانی تەواوی بکات) ـ ئایا لەسەری واجبە ـ تەواوی بکات؟ وە ئەگەر لەسەری واجبە لە کام مانگ ئیعتیکاف بکات؟ ئیمامی مالیکیش ﷺ گوتی: ئەوەی لەسەری واجب بووە لە ئیعتیکاف قەزای دەکاتەوە، ئەگەر چاك بۆیەوە لە ڕەمەزان یان جگە لە ڕەمەزان، وە پێم گەیشتووە کە پێغەمبەری خوا ﷺ ویستوویەتی لە ڕەمەزاندا ئیعتیکاف بکات، دواتر گەڕاوەتەوە و ئیعتیکافی نەکردووە تاوەکوو ڕەمەزان ڕۆیشتووە (دواتر) دە ڕۆژ لە مانگی شەوالدا ئیعتیکافی کردووە.

---

(١) ـ أخرجه أبو مصعب الزهري: ٨٧٧، عن مالك به.

٨٨٢- [فتوى] قَالَ مَالِكٌ ﷺ: وَالْمُتَطَوِّعُ فِي الاِعْتِكَافِ، وَالَّذِي عَلَيْهِ الاِعْتِكَافُ، أَمْرُهُمَا وَاحِدٌ، فِيمَا يَحِلُّ لَهُمَا، وَيَحْرُمُ عَلَيْهِمَا، وَلَمْ يَبْلُغْنِي أَنَّ رَسُولَ اللهِ ﷺ كَانَ اعْتِكَافُهُ إِلاَّ تَطَوُّعًا[1].

(فەتوا): واتە: ئیمامی مالیك ﷺ گوتوویەتی: ئەو کەسەی ئیعتیکافی سوننەت ئەنجام دەدات و ئەوەشی کە ئیعتیکافی لەسەر واجبە (واتە بە هۆی نەزر ئیعتیکافی لەسەر واجب بووە)، بابەتەکەیان وەکوو یەکە، لەو شتانەی حەڵاڵە بۆیان و لەوەی حەرامە لەسەریان، وە پێم نەگەیشتووە پێغەمبەری خوا ﷺ ئیعتیکافی کردبێت جگە لە ئیعتیکافی سوننەت.

٨٨٣- [فتوى] قَالَ مَالِكٌ ﷺ: فِي الْمَرْأَةِ، إِنَّهَا إِذَا اعْتَكَفَتْ ثُمَّ حَاضَتْ فِي اعْتِكَافِهَا، إِنَّهَا تَرْجِعُ إِلَى بَيْتِهَا، فَإِذَا طَهُرَتْ رَجَعَتْ إِلَى الْمَسْجِدِ، أَيَّةَ سَاعَةٍ طَهُرَتْ، وَلاَ تُؤَخِّرُ ذَلِكَ، ثُمَّ تَبْنِي عَلَى مَا مَضَى مِنَ اعْتِكَافِهَا.

قَالَ مَالِكٌ ﷺ: وَمِثْلُ ذَلِكَ الْمَرْأَةُ يَجِبُ عَلَيْهَا صِيَامُ شَهْرَيْنِ مُتَتَابِعَيْنِ، فَتَحِيضُ، ثُمَّ تَطْهُرُ فَتَبْنِي عَلَى مَا مَضَى مِنْ صِيَامِهَا، وَلاَ تُؤَخِّرُ ذَلِكَ[2].

(فەتوا): واتە: ئیمامی مالیك ﷺ دەربارەی ئافرەت کاتێ ئیعتیکاف دەکات (لە مزگەوت)، دواتر تووشی سووڕی مانگانە دەبێت لە ئیعتیکافەکەیدا، گوتوویەتی: دەگەڕێتەوە بۆ ماڵەوەی (چونکە مانەوەی لە مزگەوتدا حەرامە)، جا کاتێ پاکبۆیەوە دەگەڕێتەوە بۆ مزگەوت لە هەر کاتێك پاك بۆیەوە، ئەوە خۆی دوا ناخات (دەبێ ڕاستەوخۆ بگەڕێتەوە بۆ ئیعتیکافەکەی)، دواتر لەو شوێنەوە دەست بە ئیعتیکافەکە دەکاتەوە کە ڕابوریوە (بۆ نموونە بڕیاری دابوو دە ڕۆژ ئیعتیکاف بکات جا لە ڕۆژی چوارەم تووشی حەیز بوو، ئەوە لە ڕۆژی چوارەم دەست پێ دەکاتەوە کاتێ دەگەڕێتەوە).

ئیمامی مالیك ﷺ گوتوویەتی: نموونەی ئەو ئافرەتەش کە ڕۆژووی دوو مانگی بەسەر یەکەوە لەسەر واجبە (کە بەدڵنیایی حەیز دەیپچڕێنێ ئەو ماوەیە درێژە) جا

---

(١) ـ أخرجه أبو مصعب الزهري: ٨٧٨، عن مالك به.

(٢) ـ أخرجه أبو مصعب الزهري: ٨٧٩؛ والحدثاني: ٤٤٩، كلهم عن مالك به.




حوكمی وەك ئافرەتەكەی ئیعتیكافە، دەكەوێتە حەیز، دواتر پاك دەبێتەوە و لەسەر ئەوەی كە پێشتر ڕابوریوە دەست پێ دەكاتەوە، دواشی ناخات (هەر پاك بۆیەوە ڕاستەوخۆ دەست بە ڕۆژووەكانی دەكاتەوە).

**٨٨٤- عَنِ ابنِ شِهَابٍ ﷺ، أَنَّ رَسُولَ اللهِ ﷺ كَانَ يَذْهَبُ لِحَاجَةِ الإِنْسَانِ فِي الْبُيُوتِ وَهُوَ مُعْتَكِفٌ[١].**

واتە: لە ئیبنو شیهابەوە ﷺ گێڕدراوەتەوە (گوتوویەتی): پێغەمبەری خوا ﷺ بۆ پێویستییە مرۆییەكان (وەك سەرئاوكردن ... هتد) دەچوو بۆ ماڵەوە، لە كاتێكدا لە ئیعتیكافدا بوو.

**٨٨٥- [فتوى] قَالَ مَالِكٌ ﷺ: لاَ يَخْرُجُ الْمُعْتَكِفُ مَعَ جَنَازَةِ أَبَوَيْهِ، وَلاَ مَعَ غَيْرِهَا.**

(فەتوا): واتە: ئیمامی مالیك ﷺ گوتوویەتی: كەسی ئیعتیكافكار لەگەڵ جەنازەی باوكی و جەنازەی هیچ كەسی جگە لەویش ناچێتە دەرەوە (چونكە ئیعتیكافەكەی بەتاڵ دەبێتەوە).

## ٥- هاوسەرگیری لە كاتی ئیعتیكافدا[٢]

**٨٨٦- [فتوى] قَالَ مَالِكٌ ﷺ: لاَ بَأْسَ بِنِكَاحِ الْمُعْتَكِفِ، نِكَاحَ الْمِلْكِ، مَا لَمْ يَكُنِ الْمَسِيسُ[٣].**

(فەتوا): واتە: ئیمامی مالیك ﷺ گوتوویەتی: هاوسەرگیریكردنی كەسی ئیعتیكافكار كێشەی تیا نییە، (تەنها) گرێبەستی مارەكردنەكە، مادەم جیماعكردن و دەستگەمەی تیا نەبێت.

**٨٨٧- [فتوى] قَالَ: وَالْمَرْأَةُ الْمُعْتَكِفَةُ أَيْضًا، تُنْكَحُ نِكَاحَ الْخِطْبَةِ، مَا لَمْ يَكُنِ الْمَسِيسُ[٤].**

---

(١) ـ صحيح.

(٢) ـ النِّكَاحُ فِي الاِعْتِكَافِ.

(٣) ـ أخرجه أبو مصعب الزهري: ٨٨٠؛ وفي: ٨٨١، عن مالك به.

(٤) ـ ـ أخرجه أبو مصعب الزهري: ٨٨٠؛ وفي: ٨٨١، عن مالك به.

(فەتوا): واتە: گوتوویەتی: ئافرەتی ئیعتیکافکاریش بەهەمان شێوە، هاوسەرگیری لەگەڵ دەکرێ، (تەنها) گرێبەستی مارەکردنەکە، مادەم جیماعکردن و دەستگەمەی تیا نەبێت.

**٨٨٨-** قَالَ: وَيَحْرُمُ عَلَى الْمُعْتَكِفِ مِنْ أَهْلِهِ بِاللَّيْلِ، مَا يَحْرُمُ عَلَيْهِ مِنْهُنَّ بِالنَّهَارِ[(١)].

واتە: گوتوویەتی: هەروەها کەسی ئیعتیکافکار لەسەری حەرامە بەشەو نزیکی هاوسەرەکەی بکەوێتەوە (بە جیماع و دەستگەمە)، وەك چۆن لەسەری حەرامە لێیان نزیك بکەوێتەوە بەڕۆژ (لە کاتی ئیعتیکافدا، واتە شەو و ڕۆژ جیاوازی نییە).

**٨٨٩- [فتوى]** قَالَ مَالِكٌ ﷺ: وَلاَ يَحِلُّ لِرَجُلٍ أَنْ يَمَسَّ امْرَأَتَهُ وَهُوَ مُعْتَكِفٌ، وَلاَ يَتَلَذَّذُ مِنْهَا بِقُبْلَةٍ وَلاَ غَيْرِهَا، وَلَمْ أَسْمَعْ أَحَدًا يَكْرَهُ لِلْمُعْتَكِفِ وَلاَ لِلْمُعْتَكِفَةِ أَنْ يَنْكِحَا فِي اعْتِكَافِهِمَا، مَا لَمْ يَكُنِ الْمَسِيسُ، فَيُكْرَهُ، وَلاَ يُكْرَهُ لِلصَّائِمِ أَنْ يَنْكِحَ فِي صِيَامِهِ، وَفَرْقٌ بَيْنَ نِكَاحِ الْمُعْتَكِفِ، وَنِكَاحِ الْمُحْرِمِ، أَنَّ الْمُحْرِمَ يَأْكُلُ وَيَشْرَبُ، وَيَعُودُ الْمَرِيضَ، وَيَشْهَدُ الْجَنَائِزَ، وَلاَ يَتَطَيَّبُ، وَالْمُعْتَكِفُ وَالْمُعْتَكِفَةُ يَدَّهِنَانِ، وَيَتَطَيَّبَانِ، وَيَأْخُذُ كُلُّ وَاحِدٍ مِنْهُمَا مِنْ شَعَرِهِ، وَلاَ يَشْهَدَانِ الْجَنَائِزَ، وَلاَ يُصَلِّيَانِ عَلَيْهَا، وَلاَ يَعُودَانِ الْمَرْضَى، فَأَمْرُهُمَا فِي النِّكَاحِ مُخْتَلِفٌ.

قَالَ مَالِكٌ ﷺ: وَذَلِكَ الْمَاضِي مِنَ السُّنَّةِ فِي نِكَاحِ الْمُحْرِمِ وَالْمُعْتَكِفِ وَالصَّائِمِ[(٢)].

(فەتوا): واتە: ئیمامی مالیك ﷺ گوتوویەتی: بۆ هیچ پیاوێك حەڵاڵ نییە بەشەهوەت دەست لە خێزانەکەی بدات لە کاتێکدا لە ئیعتیکافدا بێ، وە نابێ چێژی لێ ببینێ بە ماچ و شتی دیکە، هەروەها گوێم لە هیچ کەسێك (لە زانایان) نەبووە بۆ پیاو و ئافرەتی ئیعتیکافکار پێی ناپەسەند بێت زەواج بکەن لە ئیعتیکافەکەیان، مادەم جیماع و شەهوەتبازی ڕوو نەدات، (بەڵام ئەگەر شەهوەت ڕوو بدات) ئەوە حەرامە (ئیعتیکافەکە بەتاڵ دەبێتەوە)، وە ناپەسەند نییە بۆ کەسی ڕۆژووەوان لەوەی هاوسەرگیری بکات لە کاتی بەڕۆژووبوون، وە جیاوازی زۆر هەیە لە نێوان هاوسەرگیری کەسی ئیعتیکافکار و هاوسەرگیری کەسی موحریم، بەوەی: کەسی

---

(١) ـ ـ أخرجه أبو مصعب الزهري: ٨٨٠؛ وفي: ٨٨١، عن مالك به.

(٢) ـ أخرجه أبو مصعب الزهري: ٨٨٢، عن مالك به.




موحریم دەخوات و دەخواتەوە و سەردانی نەخۆش دەکات و ئامادەی نوێژی جەنازە دەبێ، بەڵام خۆی بۆنخۆش ناکات، بەڵام پیاو و ئافرەتی ئیعتیکافکار ڕۆن لە قژیان دەدەن و خۆیان بۆنخۆش دەکەن و قژیان دەبڕن (و شانەی دەکەن و دەستکاری دەکەن)، بەڵام ئامادەی نوێژی مردوو نابن و نوێژی لەسەر ناکەن و سەردانی نەخۆش ناکەن، جا حوکمیان لە هاوسەرگیریشدا جیاوازە (بۆ کەسی ئیعتیکافکار دروستە گرێبەستی هاوسەرگیری بکات، بەڵام بۆ کەسی موحریم دروست نییە).

ئیمامی مالیك ﷺ گوتوویەتی: جا ئەوەی باس کرا ڕێبازی پێغەمبەری خوا ﷺ بوو دەربارەی هاوسەرگیری کەسی موحریم و کەسی ئیعتیکافکار و کەسی ڕۆژووەوان.

## ٦- ئەوەی هاتووە دەربارەی شەوی قەدر[1]

**٨٩٠-** عَنْ أَبِي سَعِيدٍ الْخُدْرِيِّ ﷺ، أَنَّهُ قَالَ: كَانَ رَسُولُ اللهِ ﷺ يَعْتَكِفُ الْعَشْرَ الْوُسُطَ مِنْ رَمَضَانَ، فَاعْتَكَفَ عَامًا، حَتَّى إِذَا كَانَ لَيْلَةَ إِحْدَى وَعِشْرِينَ، وَهِيَ اللَّيْلَةُ الَّتِي يَخْرُجُ فِيهَا مِنْ صُبْحِهَا مِنِ اعْتِكَافِهِ، قَالَ: مَنِ اعْتَكَفَ مَعِيَ، فَلْيَعْتَكِفِ الْعَشْرَ الْأَوَاخِرَ، وَقَدْ رَأَيْتُ هَذِهِ اللَّيْلَةَ، ثُمَّ أُنْسِيتُهَا، وَقَدْ رَأَيْتُنِي أَسْجُدُ مِنْ صُبْحِهَا فِي مَاءٍ وَطِينٍ، فَالْتَمِسُوهَا فِي الْعَشْرِ الْأَوَاخِرِ، وَالْتَمِسُوهَا فِي كُلِّ وِتْرٍ.

قَالَ أَبُو سَعِيدٍ ﷺ: فَأُمْطِرَتِ السَّمَاءُ تِلْكَ اللَّيْلَةَ، وَكَانَ الْمَسْجِدُ عَلَى عَرِيشٍ، فَوَكَفَ الْمَسْجِدُ، قَالَ أَبُو سَعِيدٍ: فَأَبْصَرَتْ عَيْنَايَ رَسُولَ اللهِ ﷺ، انْصَرَفَ وَعَلَى جَبْهَتِهِ وَأَنْفِهِ أَثَرُ الْمَاءِ وَالطِّينِ، مِنْ صُبْحِ لَيْلَةِ إِحْدَى وَعِشْرِينَ[2].

واتە: لە ئەبو سەعیدی خودرییەوە ﷺ گێڕدراوەتەوە گوتوویەتی: پێغەمبەری خوا ﷺ لە دە شەوەکانی ناوەڕاستی ڕەمەزان ئیعتیکافی دەکرد، جا ساڵێکیان

---

(١) ـ مَا جَاءَ فِي لَيْلَةِ الْقَدْرِ.

(٢) ـ صحيح. أخرجه أبو مصعب الزهري: ٨٨٣؛ والحدثاني: ٤٥٠؛ والشيباني: ٣٧٨؛ والبخاري: ٢٠٢٧؛ والنسائي: ١٠٩٥؛ وأبو داود: ١٣٨٢؛ وابن حبان: ٣٦٧٣؛ والقابسي: ٥١٦، كلهم عن مالك به.

ئیعتیکافی کرد تا بوو بە شەوی بیست و یەك، کە بریتی بوو لەو شەوەی بەیانییەکەی لە ئیعتیکافەکەی دەردەچوو و تەواو دەبوو، فەرمووی: کێ لەگەڵ من ئیعتیکاف دەکات با لە دە شەوەکانی کۆتایی ئیعتیکاف بکات، بەدڵنیایی شەوی قەدرم بینی و هاتە بەرچاوم، دواتر لەبیرم برایەوە، وە خۆمم بینی لە نوێژی بەیانی شەوی قەدر سوژدەم برد لەناو ئاو و قوڕدا، جا بەدوایدا بگەڕێن لە دە شەوەکانی کۆتایی، وە بەدوایدا بگەڕێن لە گشت شەوە تاکەکان.

ئەبو سەعید ﷺ دەڵێ: جا لەو شەوەدا باران باری، سەقفی مزگەوتیش لە گەڵای دارخورما بوو (مەحکەم نەبوو) و مزگەوت ئاوی لەبەر دەڕۆیشت، ئەبو سەعید ﷺ دەڵێ: جا چاوەکانم پێغەمبەری خوایان ﷺ بینی سەلامی دایەوە لە کاتێکدا شوێنەواری ئاو و قوڕ بە ناوچەوان و لووتیەوە بوو، لە نوێژی بەیانی شەوی بیست و یەك.

**٨٩١- عَنْ هِشَامِ بْنِ عُرْوَةَ ﷺ، عَنْ أَبِيهِ ﷺ، أَنَّ رَسُولَ اللهِ ﷺ قَالَ: تَحَرَّوْا لَيْلَةَ الْقَدْرِ فِي الْعَشْرِ الأَوَاخِرِ مِنْ رَمَضَانَ[1].**

واتە: لە هیشامی کوڕی عورووەوە ﷺ گێڕدراوەتەوە، ئەویش لە باوکیەوە ﷺ گێڕاویەتەوە (گوتوویەتی): پێغەمبەری خوا ﷺ فەرموویەتی: لە دە شەوەکانی کۆتایی ڕەمەزان بەدوای شەوی قەدردا بگەڕێن.

**٨٩٢- عَنْ عَبْدِ اللهِ بْنِ عُمَرَ ﷺ؛ أَنَّ رَسُولَ اللهِ ﷺ قَالَ: تَحَرَّوْا لَيْلَةَ الْقَدْرِ فِي السَّبْعِ الأَوَاخِرِ[2].**

واتە: لە عەبدوڵڵای کوڕی عومەرەوە ﷺ گێڕدراوەتەوە (گوتوویەتی): پێغەمبەری خوا ﷺ فەرموویەتی: لە حەوت شەوەکانی کۆتایی (ڕەمەزان) بەدوای شەوی قەدردا بگەڕێن.

---

(١) ـ صحيح. أخرجه أبو مصعب الزهري: ٨٨٤؛ والحدثاني: ٤٥١؛ والشيباني: ٣٧٦، كلهم عن مالك به.

(٢) ـ صحيح. أخرجه أبو مصعب الزهري: ٨٨٨؛ والشيباني: ٣٧٥؛ وابن حنبل: ٥٩٣٢؛ ومسلم: الصيام: ٢٠٦؛ وأبو داود: ١٣٨٥؛ والقابسي: ٢٨٣، كلهم عن مالك به.

٨٩٣- عَنْ أَبِي النَّضْرِ، مَوْلَى عُمَرَ بْنِ عُبَيْدِ اللهِ ﷺ، أَنَّ عَبْدَ اللهِ بْنَ أُنَيْسٍ الْجُهَنِيَّ ﷺ قَالَ لِرَسُولِ اللهِ ﷺ: يَا رَسُولَ اللهِ، إِنِّي رَجُلٌ شَاسِعُ الدَّارِ، فَمُرْنِي لَيْلَةً أَنْزِلُ لَهَا، فَقَالَ لَهُ رَسُولُ اللهِ ﷺ: انْزِلْ لَيْلَةَ ثَلَاثٍ وَعِشْرِينَ مِنْ رَمَضَانَ[1].

واتە: لە ئەبو نەزری خزمەتکاری عومەری کوڕی عوبەیدوڵاوە ﷺ گێڕدراوەتەوە (گوتوویەتی): عەبدوڵڵای کوڕی ئونەیسی جوهەنی ﷺ بە پێغەمبەری خوای ﷺ گوت: ئەی پێغەمبەری خوا من پیاوێکم ماڵەکەم زۆر دووره (ناتوانم هەموو شەوێك بێم بۆ مزگەوت)، جا فەرمانم بە یەك شەو پێ بکە تا بێم بۆ مزگەوت بۆ شەوی قەدر، پێغەمبەری خواش ﷺ پێی فەرموو: شەوی بیست و سێی ڕەمەزان وەره.

٨٩٤- عَنْ أَنَسِ بْنِ مَالِكٍ ﷺ؛ أَنَّهُ قَالَ: خَرَجَ عَلَيْنَا رَسُولُ اللهِ ﷺ فِي رَمَضَانَ، فَقَالَ: إِنِّي أُرِيتُ هَذِهِ اللَّيْلَةَ فِي رَمَضَانَ، حَتَّى تَلَاحَى رَجُلَانِ، فَرُفِعَتْ، فَالْتَمِسُوهَا فِي التَّاسِعَةِ وَالسَّابِعَةِ وَالْخَامِسَةِ[2].

واتە: لە ئەنەسی کوڕی مالیکەوە ﷺ گێڕدراوەتەوە گوتوویەتی: پێغەمبەری خوا ﷺ لە ڕەمەزاندا (لە ماڵەوە) هاتە دەرەوە بۆ ناومان و فەرمووی: من ئەو شەوەم پێ نیشان درا لە ڕەمەزان (واتە شەوی قەدر)، (هەر لەبیرم بوو) تاوەکوو دوو پیاو کێشە و دەمەقاڵێیان لەگەڵ یەکدی دروست کرد، جا زانیارییەکە هەڵگیرایەوە و لەبیرم برایەوە، جا بەدوایدا بگەڕێن لە نۆیەم و حەوتەم و پێنجەم (واتە بیست و نۆ و بیست و حەوت و بیست و پێنج).

٨٩٥- عَنْ مَالِكٍ ﷺ، أَنَّهُ بَلَغَهُ؛ أَنَّ رِجَالاً مِنْ أَصْحَابِ رَسُولِ اللهِ ﷺ أُرُوا لَيْلَةَ الْقَدْرِ فِي الْمَنَامِ، فِي السَّبْعِ الأَوَاخِرِ، فَقَالَ رَسُولُ اللهِ ﷺ: إِنِّي أَرَى رُؤْيَاكُمْ قَدْ تَوَاطَأَتْ فِي السَّبْعِ الأَوَاخِرِ، فَمَنْ كَانَ مُتَحَرِّيَهَا، فَلْيَتَحَرَّهَا فِي السَّبْعِ الأَوَاخِرِ[3].

واتە: لە ئیمامی مالیکەوە ﷺ گێڕدراوەتەوە پێی گەیشتووە کەسانێك لە هاوەڵانی پێغەمبەری خوا ﷺ لە خەودا شەوی قەدریان پێ نیشان دراوە، بەوەی لە حەوت

---

(١) ـ صحيح. أخرجه أبو مصعب الزهري: ٨٨٦؛ والحدثاني: ٤٥١أ، عن مالك به.

(٢) ـ صحيح. أخرجه أبو مصعب الزهري: ٨٨٥؛ والحدثاني: ٤٥١ب؛ والقابسي: ١٤٨، كلهم عن مالك به.

(٣) ـ صحيح. أخرجه القابسي: ٢١٠، عن مالك به.

شەوەکەی کۆتایی بێ، جا پێغەمبەری خوا ﷺ فەرمووی: من دەبینم خەونەکانتان کۆکە لەسەر حەوت شەوەکەی کۆتایی، جا هەر کەسێك بەدوایدا دەگەڕێ، ئەوە با لە حەوت شەوەکەی کۆتاییدا بەدوایدا بگەڕێت.

**٨٩٦-** عَنْ مَالِكٍ ﷺ، أَنَّهُ سَمِعَ مَنْ يَثِقُ بِهِ مِنْ أَهْلِ الْعِلْمِ يَقُولُ: إِنَّ رَسُولَ اللهِ ﷺ أُرِيَ أَعْمَارَ النَّاسِ قَبْلَهُ، أَوْ مَا شَاءَ اللهُ مِنْ ذَلِكَ، فَكَأَنَّهُ تَقَاصَرَ أَعْمَارَ أُمَّتِهِ، أَنْ لاَ يَبْلُغُوا مِنَ الْعَمَلِ مِثْلَ الَّذِي بَلَغَ غَيْرُهُمْ فِي طُولِ الْعُمْرِ، فَأَعْطَاهُ اللهُ لَيْلَةَ الْقَدْرِ، خَيْرٌ مِنْ أَلْفِ شَهْرٍ[١].

واتە: لە ئیمامی مالیکەوە ﷺ گێڕدراوەتەوە گوێی لە یەکێك لە زانایان بووە کە متمانەی پێیەتی، گوتوویەتی: پێغەمبەری خوا ﷺ تەمەنی خەڵکی پێشووی پێ نیشان درا، یان ئەوەی خوا ویستی لێ بوو لەو ڕووەوە (پێی نیشان درا)، جا پێغەمبەری خوا ﷺ وەك بڵێی تەمەنی ئوممەتەکەی پێ کورت بوو لە خەمی ئەوەی نەوەك نەگەن بەو کردەوانەی کە ئوممەتەکانی دیکە (بەهۆی تەمەندرێژییان) پێی گەیشتوون، جا خوای پەروەردگار ﷻ شەوی قەدری پێ درا، کە چاکترە لە هەزار مانگ (بەمەش دەتوانن بە تەمەنێکی کورت کردەوەی زۆر ئەنجام بدەن).

**٨٩٧-** أَنَّ سَعِيدَ بْنَ الْمُسَيَّبِ ﷺ كَانَ يَقُولُ: مَنْ شَهِدَ الْعِشَاءَ مِنْ لَيْلَةِ الْقَدْرِ، فَقَدْ أَخَذَ بِحَظِّهِ مِنْهَا[٢].

واتە: سەعیدی کوڕی موسەیەب ﷺ دەیگوت: هەر کەسێك ئامادەی نوێژی عیشا بێت لە شەوی قەدردا، ئەوە پشکی خۆی لە قەدر وەرگرتووە.

---

(١) ـ ضعيف. أخرجه أبو مصعب الزهري: ٨٨٩؛ والحدثاني: ٤٥٢أ، عن مالك به.

(٢) ـ مقطوع ضعيف. أخرجه أبو مصعب الزهري: ٨٩٠؛ والحدثاني: ٤٥٢ب، عن مالك به.

# ناوەڕۆك

**پەرتووکی دوو جەژنەکان** 

**پەرتووکی نوێژی ترس** 

**پەرتووکی ڕۆژوو**...................................................................٤٦٧

